www.iqra.ahlamontada.com
منتدى اقرأ الثقافي

هێرۆدۆت

# مێژووی جەنگی پارسەکان

لە یۆنانییەوە
عەلی فەتحی

بەرگی یەکەم




خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

- مێژووی جەنگی پارسەکان (بەرگی یەکەم)
- هێرۆدۆت
- وەرگێڕانی لە یۆنانییەوە: عەلی فەتحی
- نەخشەسازی ناوەوە: ڕێدار جەعفەر
- بەرگ: ڕێمان
- نرخ: (٢٠٠٠٠) دینار بۆ هەردوو بەرگ
- چاپی یەکەم : ٢٠١٣
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- چاپخانە: موکریانی (هەولێر)
- لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٧٤٩)ساڵی (٢٠١٣)ی پێ دراوە

زنجیرەی کتێب (٧٨٩)

ماڵپەڕ: www.mukiryani.com
ئیمەیل: info@mukiryani.com

# پێرست

١_ پێشەکی.................................................... ٧
٢_ کتێبی یەکەم، کلیۆ.................................................... ٩
٣_ کتێبی دووهەم، ئێڤتێرپی.................................................... ١٦٣
٤_ کتێبی سێهەم، تالیا.................................................... ٣٩٩

# پێشەکی

مێژوو بەباوەڕی من تەنیا گێڕانەوەی چیرۆک و بەسەرهاتی رابردوی مرۆڤ نییە، بەڵکوو کۆڵێک ئەزموون و بەڵگە بۆ داهاتوویە و بۆیە وەک سەرچاوەیەکی بەوەج سەیری دەکەم. حەزدەکەم زانیارییم لەمەر رەوتی ئاڵوگۆڕی چارەنووسی گەلان و وڵاتەکانیان دەسکەوێ و کەند و کۆسپی دواکەوتنی ئێمەی کورد و بێ کیانیی نەتەوەکەم لێ‌روونبێتەوە.

ئەو کتێبەی لەبەر دەستی تۆی خوێنەری بەڕێزدا، هەرچەند سەبارەت بە شەڕی پارسەکان لە سەردەمی دێرین (باستان)دا، بەڵام وەک مێژووی هێرۆدۆت ناسراوە. مێژووی هێرۆدۆت، پڕە لە زانیاری و بەڵگەی مێژوویی و هاوڵاتیانم دەتوانن وەک سەرچاوەی توێژینەوە کەڵکی لێوەرگرن. سەرجەمی بەرهەمەکە لە نۆ کتێب پێکهاتووە. هێرۆدۆت هەرکام لە کتێبەکانی پێشکەش بە خواوەندێکی سەردەمی دێرین (باستان) کردوە و منیش وەرگێڕاوەکەی خۆم بەتەواوی خەڵاتی شەهیدانی گەلم دەکەم.

ئەگەر بەهەڵە نەچووبم، خوێنەر و توێژەری کورد تا ئێستا پتر سەیری ئەو مێژووەیان بە زمانەکانی بێگانە کردوە. وەرگێڕاوی فارسییەکەی بەلای منەوە جێگای متمانە نییە و تەواو دەسکاری کراوە. فارسەکان پێیانوایە مێژوونووسانی بێگانە دەبێ بەخواست و حەزی ئەوانەوە بنووسن، ئەگینا ئەوە مێژووی راستەقینە نییە و بۆ هەر پاراگرافێک کۆڵێک بۆچوونی دەسکردی خۆیان بە کتێبەکانەوە• زیاد کردوە. من خۆم ئەو دەسکارییەی خەڵکانی وەرگێڕی فارسم پتر لەو کتێبە و لە کتێبی ئاناباسی گزنفۆن‌دا بەدی‌کرد. گشت مێژوونووس و توێژەر و خوێنەری‌تر هێرۆدۆت وەک باوکی مێژوو دەناسن، لەحاڵێکدا فارسەکان لەو بارەوە گومانیان هەیە، چونکە

بەحەزی ئەوان سەیری رووداوەکانی نەکردوە. سەبارەت بە زمانەکانیتر وەک تورکی و عەرەبی ناتوانم بۆچوونم هەبێ. هەربۆیە، من خۆم هەستم بەو پێویستییە کرد کە ئەو سەرچاوە مێژووییە، لەبەر ئەوەی گەلێک دەوڵەمەندە، راستەوخۆ لە زمانی یۆنانییەوە وەرگێڕمەوە سەر زمانی کوردی.

خوێنەری بەڕێز! لەکاتی خوێندنەوەدا ژمارەیەکی زۆر ناو بەرچاو دەکەون. من بەنۆرەی خۆم هەوڵم داوە ئەوەندەی بکرێ، لە پاراگرافەکاندا روونکردنەوەی کورت و پێویست سەبارەت بەو ناوانە بنووسم، هەڵبەت ئەوانەی گرینگن. رەنگە جاروبار بەسەر شوێنێکی نەناسراودا کەوتبم کە کوێرە کانییەک لەوسەری قارەی ئەفریقیا بووبێ و ئەمڕۆ نە ئاسەواری مابێ و نە لەباری مێژوویی و جۆغرافییەوە گرینگییەکی ئەوتۆی هەبێ، ئیتر نە خۆم بەو شوێنەوە ماندوو کردوە و نە لە هیچ سەرچاوەیەکیتریش ناوی هاتووە تا من وەک زانیاری بیخەمە بەرچاوی خوێنەر.

مەبەستێکیترم لەو وەرگێڕانە ئەوە بوو کە زۆربەی سەرچاوە مێژووییەکانی هێرۆدۆت، گزنفۆن، ستراڤۆن، پلوتارخیس و چەندێکیتر، لە زمانی رەسەنی یۆنانییەوە وەک خۆیان وەرگێڕمەوە سەر زمانی کوردی و کتێبخانەی کوردیان پێ دەوڵەمەندتر بکەم و خوێنەر و توێژەرانی کورد چاو لەدەستی زمانەکانی بێگانە نەبن. هیوادارم بەرهەمێکی بەکەڵک بێ و تۆی بەڕێزیش چێژی لێوەرگری. بێشک هیچ بەرهەمێک بێ کەموکوڕی نابێ و بە تێبینی و هەڵسەنگاندن و لێوردبوونەوەت شادم بکە. هەر لێرەشدا دەسخۆشی بە کاک سۆران عەلیپور دەڵێم کە ئەرکی پێداچوونەوەی بەرهەمەکەی وەستۆگرت و بەدڵەوە سپاسی دەکەم.

**عەلی فەتحی**
**١٩ی مای ٢٠١٢**
**ستۆکهۆڵم**

# کتێبی یەکەم:

## کلیۆ، خواوەندی مێژوو

### هێرۆدۆت

هێرۆدۆت خەڵکی ئالیکارناسۆ، بۆیە ئەو لێکۆڵینەوەیەی خستوەتەڕوو، بۆوەی بە تێپەڕبوونی رۆژگار بەرهەمی مرۆڤەکان، دوای شەڕە سرنجڕاکێشەکانی نێوان یۆنانییەکان و بەربەرەکان لەبیر نەچنەوە، بەتایبەت، نابێ هۆیەکانی پێکدادانی ئەو دوو لایەنە فەرامۆش بکرێن.

### هۆیە ئەفسانەییەکانی ئەو شەڕانە

[١] مێژوونووسە پارسەکان لەو باوەڕەدان کە هۆکاری رکەبەرایەتی یۆنانییەکان و پارسەکان دەگەڕێتەوە بۆ کێشەی فینیقییەکان. فینیقییەکان لە رۆخەکانی بەحری ئێریترەوە[١] هاتبوون و لە کەنار ئاوەکانی رۆژهەڵاتی مەدیترانە نیشتەجێ ببوون و بە پیشەی بازرگانی و راگواستنەوە مژوڵ بوون. ئەوان کەرستە بازرگانییەکانیان لە وڵاتانی میسر و ئاسیریاوە دەگەیاندە یۆنان و بەرەو ناوچەی ئارغۆس‌یش دەچوون. ناوچەی ئارغۆس ئەو سەردەمە یەکێک لە گەورەترین نێوەندەکانی بازرگانی ئەو هەرێمە بوو و ئەمڕۆ ناسراوە بە هێلاس (وڵاتی یۆنان). فینیقییەکان لە یەکێک لە

---

١- ئێریترە مانای سوور دەدا.

سەفەرەکانیاندا بەمەبەستی فرۆشتنی کەرستەکانیان چوونە ئارغۆس. رۆژی پێنجەم یا شەشەمی دوای ئەو سەفەرە، راست ئەو کاتەی کە ئیتر کەرستەکانیان بۆ فرۆشتن تەواو ببوو، خاتوو یۆ، شازادەی هەرێمی ئیناخۆ و کۆمەڵێک ژن بۆ شتومەک کڕین هاتنە بەندەر. وەختێک ژنەکان گەیشتنە تەنیشت گەمی، تاوێک بەمەبەستی کڕینی چەند پێداویستییەکی خۆیان وێستان. پیاوانی فینیقی لەنێوخۆیاندا راوێژیان کرد کە چۆن ئەو ژنانە بڕفێنن و یەکتریان بۆ ئەنجامی ئەو کارە هاندا. ژمارەیەکی زۆر لە ژنەکان رایانکرد. فینیقی‌یەکان خاتوو یۆ و چەند خزمەتکارێکی ئەویان رەپێچەکدا و بەزۆر لەنێو کەشتیان ئاخنین و بەرەو وڵاتی میسر رۆیشتن.

[٢] ئەوە زانیاری پارسەکان سەبارەت بە رفاندن و چوونی شازادە یۆ بۆ وڵاتی میسر بوو، هەرچەند یۆنانییەکان باوەڕیان بەو قسەیە نییە.[١] رفاندنی شازادە یۆ یەکەم کاری ناشایست و ناهەق بوو کە بە ئەنجام گەیشت. کۆمەڵێک یۆنانی کە پارسەکان ناویان ناهێنن، چوونەتە قەراخ ئاوەکانی شاری تیرۆ لە وڵاتی فینیقی‌یە و شازادە خاتوو ئێڤرۆپی، کچی پاشای ئەوێیان رفاندوە. ئەوانەی ئەو شازادە خاتوونەیان رفاند، خەڵکی کرێت بوون. لەو چەشنە رووداوانە بەردەوام لەنێوان یۆنانییەکان و فینیقی‌یەکان قەوماون. هەڵبەت یۆنانییەکان خەراپەکاری دووهەمیشیان بە ئەنجام گەیاند. ئەوان بە گەمییەکی مەزنی جەنگی رێگای دەریایان بڕی و بە رووباری فاسی‌دا خۆیان گەیاندە ناوچەی ئاییا لە وڵاتی کۆلخیدا و چی گەرەکیان بوو کردیان و پاشان شازادە میدیا، کچی پاشای ئەو حوکمڕانییەشیان رفاند. پاشای کۆلخیدی راسپاردەی ناردە لای یۆنانییەکان و داوای رادەستکردنەوەی کچەکەی و سزادانی تاوانبارانی کرد. یۆنانییەکان وڵامیان داوە کە کۆلخیدی‌یەکان کاتی خۆی یارمەتی ئازادکردنی شازادە خاتوو یۆی

---

١- بەپێی چیرۆکە ئەفسانەییەکان خواوەند ئیرا ئێرەیی بە خاتوو یۆ بردوە و بۆیە کردویە بە گوێرەکە. خاتوو یۆ دوای ماوەیەک سەرگەردانی بە ئاوەکانی ئازاددا دەرباز بووە و گەیشتوەتە وڵاتی میسر. وشەی یونیۆ لە ناوی ئەو ژنەوە سەرچاوەی گرتوە.

ئارغۆسیی‌یان نەداوە، بۆیەئەوانیش ئێستا ئامادەنین کۆمەک بە رزگاربوونی شازادە خاتوو میدیای کۆلخیدی بکەن.

[۳] هەروەها بە گوتەی پارسەکان، وەچەیەک دواتر، ئەسکەندەر کوڕی پریامۆ[1] لە زمانی پیر و قەدیمی‌یەکانی سەردەمی خۆی بیستبووی کە رەوتی رفاندنی ئەو ژنانە چۆن بووە. ئەویش تێگەیی سزایەک بۆ ئەو کردەوانە لەگۆڕێدا نییە و بەبێ گرینگی‌دان بە سکاڵا و تاوانی ئەو کارە،بڕیاری خۆی‌دا و شازادە خاتوو هێلێنی یۆنانی رفاند. یۆنانییەکان راسپاردەیان نارد و داوای گەڕاندنەوەی هێلێنی‌یان لە ئەسکەندەر کرد. ناوبراو لە وڵامی راسپاردەکاندا گوتی، یۆنانییەکان بۆیان نییە داوای یارمەتی لە خەڵکانی‌تر بکەن، چونکە خۆیان سەبارەت بە رفاندنی شازادە خاتوو میدیا، کۆمەکیان بە پاشای کۆلخیدی نەکردوە.

[٤] رفاندنی ژنان بەو شێوەیە لەنێوان ئەو دوو لایەنەدا، بۆ ماوەیەکی زۆر بەردەوام بووە. دواتر یۆنانییەکان پتر هەوایان رەگوێیان کەوتووە و بۆ یەکەمجار پەلاماری ئاسیای بچووک و وڵاتی پارس و ئەوروپایان داوە. هەڵبەت رفاندنی ژنان، ناهەقی و کردەوەیەکی ناشایستە، بەڵام تۆڵەسەندنەوە لەویش ناماقوڵترە. بەرژەوەندیخوزانەترین هەڵوێست سەبارەت بە رفاندنی ئەو ژنانە ئەوە بوو کە هەردوو لایەن بێدەنگیان لێکردبا. چونکە ئەگەر ژنەکان خۆیان خوازیاری رەدواکەوتن نەبوایەن، کەس نەیدەتوانی بیان‌ڕفێنێ. هەر بەو پێیە پارسەکان و گەلانی‌تری ئاسیای بچووک لەمەر ئەو ژنانە داخوازییەکی ئەوتۆیان لەبەردەم یونانییەکان دانەنا. لەحاڵێکدا یۆنانییەکان بەپێچەوانەوە بۆ ژنێکی لاکێدێمۆنی، کەشتیگەلیەکی گەورە لە کەشتی‌یەکانیان ئامادە کرد و پەلاماری ئاسیای بچووکیان‌دا، و پاشایەتی پریامۆیان روخاند. راست لەو سەردەمەوە پارسەکان بە چاوی دوژمنایەتییەوە سەیری یۆنانییەکان دەکەن. پارسەکان لەسەر ئەو باوەڕەن کە ئاسیا و گەلانی دانیشتووی ئەوێ لەسەر بیچمی پارس هەڵکەوتوون و ملکی ئەوانە و

---

١- پریامۆ هەمان پاشایە کە لە ئەفسانەکاندا بە پاریس ناسراوە.

ئەوروپا و یۆنانیش لە بەشێکی جیا لە خاکی ژێر دەسەڵاتی ئەوان جێیان‌گرتووە.

**[٥]** پارسەکان بەو چەشنە باسی رەوتی رووداوەکانیان کردوە. ئەوان پێیانوایە داگیرکرانی شاری تریا (ئیلییۆن)، سەرەتای دەسپێکی دوژمنایەتی ئەوان و یۆنانییەکانە. سەبارەت بە چۆنییەتی رفاندنی شازادە خاتوو یۆ، بۆچوونی فینیقی‌یەکان جیاواز لە زانیاری پارسەکانە. فینیقی‌یەکان دەڵێن رفاندنی ئەو شازادەیە بۆ وڵاتی میسر بەزۆر نەبووە و لەڕووی ناچاری ئەو کارەیان کردوە. ئەو خاتوونە پێوەندی دڵداری لەگەڵ کاپیتانی کەشتی‌یەکە لە شاری ئارغۆس هەبووە و کاتێک هەستی کردوە کە زگپڕە ، لەبەر حەیا بەخۆ بوون بڕیاری داوە بە کەشتی فینیقی‌یەکان بەرەو وڵاتی میسر رابکا و کەس نەتوانێ وەدوای بکەوێ.[١] بەهەرحاڵ پارسەکان و فینیقی‌یەکان بەوجۆرە باسی رووداوەکانیان کردوە و منیش حەزناکەم درێژەدادڕی بکەم و بڵێم کام بۆچوون راستە یا هەڵەیە. من تەنیا ئەو زانیارییە دێنمەگۆڕێ کە کامیان یەکەمجار ئەو ناهەقییەی دەرهەق بە یۆنانییەکان کردوە و پێشتر گوتوومە.

ئێستا لێکۆڵینەوەکەم بە تێبینی‌یەوە درێژە پێدەدەم و باسی شارە گەورە و بچووکەکانی ئەو جیهانە دەکەم. کۆمەڵێک لەو شارانە بچووک بوونەتەوە یا هەرنەماون و بەپێچەوانەوە ئەوانەی بچووکیش گەشەیان سەندوە و مەزنتر بوونە. من بە یەک چاو سەیری هەردوو دەستەیان دەکەم، چونکە ئەوە دەزانم کە پێشکەوتنی مرۆڤ تەنیا بە یەک شوێن و مەکان نەبەستراوەتەوە.

---

١- بابەتێکی لەو چەشنە لە شێعرەکانی ئۆدیسەدا هاتووە و دەڵێ: خزمەتکاری ئومی‌ئا پێوەندی لەگەڵ کەشتیوانێکی فینیقی دەگرێ و رەدوای دەکەوێ. بابەتی هاوبەش لەو دوو رووداوەدا ئەوەیە کە خزمەتکاری ئومی‌ئا، خەڵکی وڵاتی فینیقی بووە و لەڕاستیدا خۆی لەدەست کۆیلەتی رزگار کردوە و وەک خاتوو یۆ نەبووە کە حەزی لە کابرای کەشتیوان کردبێ و لێی ئاوس بووبێ.

## مێژووی لیدی‌یەکان

[٦] کریسۆس لەدایکبووی وڵاتی لیدی بوو. ناوبراو کوڕی ئالی‌ئاتیس و پاشایەتی ئەو گەلانەی دەکرد کە لە ڕۆژئاوای ڕووباری ئالی[١] نیشتەجێ بوون. ڕووباری ئالی لە باشوور، لە هەرێمەکانی نێوان سووریە[٢] و پاڤلاغۆنیاوە دەستپێدەکا و لە باکوور دەڕژێتە دەریای ڕەش.

بەپێی زانیارییەکانی ئێمە کریسۆس یەکەم بیانی بووە کە هێندێک لە یۆنانییەکانی ناچار بە دانی ماڵیات کردوە و لەگەڵ بەشێکیشیان دۆستایەتی پاراستووە. ناوبراو هەرێمەکانی یوونی، ئێئۆلی و دووری سەربە ئاسیای بچووکی داگیرکردوە و هاوکات پێوەندی دۆستانەی لەگەڵ لاکێدێمۆنی‌یەکان دامەزراندوە. یۆنانییەکان بەر لە هاتنەسەر دەسەڵاتی کریسۆس، تەواو ئازاد بوون. دیارە کیمێریەکان بەرلە کریسۆس هێرشیان کردبووە سەر هەرێمەکانی یوونی، بەڵام نەیانتوانیبوو داگیر و وێرانی بکەن و تەنیا تاڵانیان کردبوو.

[٧] هەروەک دواتر باسی‌دەکەم، حوکمڕانی کردنی ئەو گەلانە لە خانەدانی ئێراکلیدی‌یەکانەوە[٣] کەوتە دەست مێرماندی‌یەکان و کریسۆس سەر بەو بنەماڵەیە بوو. حوکمڕانی زۆرداری شاری سارد کەسێک بوو بەناوی کانداڤلیس، وەچەی ئالکی‌ئۆس و کوڕی ئێراکلیس و بەلای یۆنانییەکانەوە ناسراوە بە میرسیلۆ.[٤] یەکەم پاشای خانەدانی ئێراکلیس کە لە شاری سارد

---

١- ئەمڕۆ ناسراوە بە قزڵئیرماق.

٢- مەبەست لەو خەڵکە سووری‌یەی لە هەرێمی کاپادۆکی نیشتەجێن.

٣- بەپێی بۆچوونی یەکێک لە ئەندامانی خانەدانی ئێراکلیس، ئەوانە سەر بە خواوەند خۆرن. ئیراکلیس وەک تیرهاوێژ، بەردەوام مژوڵی ڕامکردنی شێر بووە. ئەو خوایە لەلای لیدی‌یەکان بە ساندۆن ناسراوە و ئاشوورییەکان بەناوی بێل دەیناسن و یۆنانییەکان بە ئێراکلیس ناوی دەبەن.

٤- میرسیلوس، ناسناوێک بۆ پاشاکانی خانەدانی ساندۆن بەکار هاتووە.

دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت، ناوی ئاغرۆس و کوڕی نینۆس و نەوەی ڤیلۆس[1] و نەتیجەی ئالکیئۆس بوو. دوایین دەسەڵاتداریش خوودی کانداڤلیس، کوڕی میرسۆس بوو. ئەو کەسانەی بەر لە ئاغرۆس پاشایەتی وڵاتی لیدییان کرد، لە خانەدانی لیدۆس، کوڕی ئاتیئۆس[2] و وڵاتەکەش لەوڕا ناوی لیدی بەخۆوە گرت. ناوی قەدیمی ئەو وڵاتە و خەڵکی لیدی، بەر لە دەسپێکی لیدۆس، ناسراو بوو بە میئۆنا. ئیراکلیدییەکان سەرەتا کاروباری حکوومی خانەدانی میئۆنییان وەستۆگرت و لەبەر ئەوە کەسانی لێهاتوو و بەوەج بوون، دواتر بوونە خاوەن دەسەڵاتی پاشایەتی وڵاتەکە. بە گوتەی کاهێنی مەزنی یەکێک لە مەعبەدەکان، باوکی ئەوانە ئیراکلیس[3] و دایکیان یاردانۆسی کەنیز بووە و بیست و دوو وەچە، واتە سەرجەم پێنسەد و پێنجساڵی رێک فەرمانڕەواییان کردوە و دەسەڵات لە باوکەوە بۆ کوڕ گوێزراوەتەوە، تا گەیشتۆتە دەست کانداڤلیسی کوڕی میرسۆس.[4]

[٨] کانداڤلیس ئەوەندە عاشقی ژنەکەی خۆی بوو کە لە هەموو ژنێکی ئەو جیهانەی پێجوانتر بوو. ناوبراو راوێژکارێکی هەبوو و گەلێکی خۆشدەویست، ناوی ئەو راوێژکارە ییغیس،[5] کوڕی داسکیلۆس[6] بوو. ییغیس ییغیس جێگای باوەڕی تەواوی کانداڤلیس بوو. کانداڤلیس گەرەکی بوو راوێژکارەکەی جوانی ئەو ژنە ببینێ. پاش ماوەیەکی کورت، کانداڤلیس ـ چونکە لە نێوچاوانی نووسرابوو کە پایانێکی ناخۆشی هەبێ ـ رۆژێکیان بە

---

١- لەو شەجەرەیەدا ڤیلۆس هەرچەند لە بنەماڵەیەکی خواییە، بەڵام دوای نینۆس وەک مرۆڤ سەیردەکرێ.

٢- ئاتیئۆس کوڕی یەک لە خواکان بەناوی مانێس بووە.

٣- بەپێی هێندێک رەوایەتی ئەفسانەیی، ئیراکلیس لەبەر کوشتنی ئیفیتۆس ناچار بە کۆیلەتی کرابوو و بەدەست ئێرمیس لە وڵاتی لیدی فرۆشرا.

٤- وێدەچێ نێونجی تەمەنی پیاوانی خانەدانی ساندۆن، بەلای هێرۆدۆتەوە ٢٣ ساڵ بەراورد کراوە.

٥- ییغیس دەبێ ساڵی ٦٨٧ی پێش زایین هاتبێتە سەر تەختی پاشایەتی. ناوبراو دواتر دەبێتە کەسایەتییەک کە لە فەلسەفە و رەوشتدا. ئاڵقەی ییغیس بەناوبانگە. ناوبراو هەرجارێ گرێی ئەو ئاڵقەیەی راکێشاوە، خۆی لەبەر چاوی خەڵک ونبووە. دەگێڕنەوە ئەو بەو شێوەیە پاشای لیدی کوشت.

٦- ییغیس و خانەدانەکەی دانیشتووی شاری داسکیلۆس لە هەرێمی ڤیتینیای ئاسیای بچووک بوونە.

بیغیسی گوت: "بیغیس! کاتێک پێتدەڵێم کە ژنەکەم جوانێکی بێوێنەیە، هەست دەکەم باوەڕ بە قسەی من ناکەی، هەڵبەت پیاو بە روانین باشتر تێدەگا تا بە بیستن، پێتچۆنە ژنەکەم بە رووتی ببینی ". بیغیس تووشی سەرسوڕمان هات و وڵامی کانداڤلیسی داوە: "گەورەم! کاتێک ژن جلەکانی داکەند، حەیاکەشی لەگەڵ دەتکێ، زانا قەدیمییەکان لەمێژە یاساکانی کردار و رەفتاریان دەسنیشانکردوە و دەڵێن پیاو دەبێ چاوی بەسەر حەیا و سامانی خۆیەوە بێ. پێویستە رەوشتی باش لەوان فێر بین. باوەڕم بە قسەکانی تۆ هەیە و دەزانم ژنەکەت لە گشت ئافرەتانی دنیا جوانترە، بۆیە داوات لێدەکەم تووشی کاری ناماقوڵم مەکە ".

[٩] بیغیس بەو شێوەیە وڵامی نەرێنی بە خواستی کانداڤلیس داوە، چونکە لەوە دەترسا پێشنیاری پاشاکەی تووشی چارەنووسێکی خەراپی بکا. کانداڤلیس پێداگر بوو: "بیغیس! مەترسێ، من ئەو پێشنیارەم بۆیە نەکرد کە تۆ بەتاقی بکەمەوە، لەوەش نیگەران مەبە کە ژنەکەم بەڵایەکت بەسەر بێنێ. من خۆم هەموو کارەکان جێبەجێی دەکەم، بەچەشنێک کە نەزانێ تۆ سەیرت کردوە. تۆ لە پشت درگای ژووری خەوەکەمان دادەنێم. کاتێک من وەژوور دەکەوم، ژنەکەشم خێرا دێت، بۆوەی لەسەر تەختی خەو راکشێ. لە نیزیک درگای ژووری خەو، کورسیلەیەک هەیە و خانم یەکیەکی جلەکانی دادەکەنێ و لەسەر ئەویان دادەنێ. کاتێک خەریکی رووتبونەوەیە تۆ بە خەیاڵی راحەتەوە دەتوانی چاوی لێبکەی. دواتر، وەختێک وەردەسوڕێتەوە و پشت لە تۆ دەکا بۆوەی بێتە سەر تەختی خەو، تۆ وەدەرکەوە، بەبێ ئەوەی کەس بتبینێ ".

[١٠] دوای ئەو باسە، بیغیس نەیتوانی خۆی لە پێشنیاری پاشا بدزێتەوە. کاتێک وەختی خەو هات، کانداڤلیس راوێژکارەکەی لە پشت درگای ژووری خەو دانا. ئەوجار ژنە هات و وەژوورْ کەوت. ژنە جلەکانی یەکیەک داکەند و لەسەر کورسیلە دانیان و بیغیس بێ گرفت سەیری کرد. دواتر، وەختێک شاژن وەرسوڕایەوە و پشتی تێکرد و بەرەو تەختی خەو چوو، بیغیس خێرا وەدەرکەوت. ژنی کانداڤلیس کاتی دەرچوونی بیغیس هەستی بە رۆیشتی ئەو

کرد و وەسەر خۆی نەهێنا. ئەو دەیزانی کە گشت پیلانەکە لەژێر سەری مێردەکەیدا. شەرمی بەخۆی بوو و هیچی نەگوت و خۆی لێ گێل کرد. ئەو تەنیا بیری لەوە کردەوە کە پێویستە مێردەکەی بکوژرێ، چوونکە لیدییەکان وەک گەلانیتری بیانی(بەربەر)، بە لایانەوە قەباحەتێکی گەورەیە یەکێک بە رووتی ببیندرێ، تەنانەت ئەگەر پیاویش بێ.

[١١] ژنی کانداڤلیس ئەو کاتە هیچی نەگوت و وەسەرخۆی نەهێنا. هەرکە رۆژ بۆوە، بەدوای خزمەتکارەکانی جێگای باوەڕی خۆیدا نارد و پاشان ییغیسی بانگکرد. ییغیس ئامادە بوو و باوەڕی نەدەکرد کە شاژن بە کارەکەی ئەوی زانیوە ، دیارە شاژن بەردەوام بەدوایدا دەنارد کە بێتەلای و تۆزێک هاودەمی بێ.[١] کاتێک ییغیس هات، شاژن پێیگوت: "ییغیس! ئێستا دوو رێگا چارە لەبەردەم تۆدا دادەنێم و دەبێ یەکیان رەچاو بکەی. هەر کام لەوانەت پێ باشە بیکە! یا کانداڤلیس دەکوژی و من، ژنی پاشای لیدییەکان دەکەی بە هاوسەری خۆت، یا هەر ئێستا خێرا خۆت دەکوژی، ئەویش لەبەر چاوەکانی من، بۆوەی جارێکیتر نەتوانی ئەمری کانداڤلیس بەجێ بگەیێنی و ئەوەی هەقی تۆ نییە، ببینی. ئێستا یا ئەو کەسەی بیری لەو کارە قەباحەتە کردۆتەوە، دەبێ بمرێ یا تۆ کە ئیزنت بە خۆت داوە من بە رووتی ببینی ". ییغیس بە بیستنی قسەکانی شاژن، بێدەنگی پاراست. دوایی لەبەری پاڕاوە کە ناچار بە هەڵبژاردنێکی ئەوتۆی نەکات. نەیتوانی قەناعەت بە شاژن بێنێ. خێرا لێیحاڵی بوو یا دەبێ پاشا بکوژێ، یا خۆی بەدەست خزمەتکارەکانی شاژن بکوژرێ. ئەو دەیەویست بژی و بۆیە بە شاژنی گوت: "چون تۆ داوام لێدەکەی بەبێ خواستی خۆم، پاشاکەم بکوژم، تکات لێدەکەم پێمبڵێ چۆن ئەو کارە جێبەجێ بکەم". شاژن وڵامی داوە: "راست لەو شوێنەوە پەلاماری کانداڤلیس دەدەی کە منی بە رووتی نیشانی تۆدا و لە خەودا بیکوژە ".

---

١- لە شوێنیتر ئەو دوو کەسە وەک عاشق و مەعشوق دەردەکەون و بۆ رووخانی دەسەڵاتی پاشا و کوژرانی مێردی مەلەکە پیلان دەگێڕن.

[١٢] وەختێک پیلانی کوشتنی کانداڤلیس‌یان دارشت، ییغیس ئیتر ڕێگای هەڵاتنی بۆ نەما، یا دەبوایە بەکوشتن بچێ، یا کانداڤلیس بکوژێ. شەو داهات و ییغیس بەدوای شاژن‌دا چووە دیوی خەو. شاژن خەنجەری دایەدەست و لە پشت درگا شاردییەوە. کانداڤلیس هەرکە خەوی لێکەوت، ییغیس لە حەشارگە وەدەر کەوت و کوشتی.

ییغیس بەو کارەی هەم تاج و تەختی دەسکەوت و هەم شاژن. ئەو زانیارییانە لە شێعرێکی خاوەن ئاهەنگی تایبەتیی سەردەمی دێرین (دێرین (باستان))ەوە هاتوون کە لەلایەن ئارخیلۆغۆسی خەڵکی دوورگەی پاریۆس نووسراوە و خۆی لەو سەردەمەدا ژیاوە.

[١٣] ییغیس، لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت و پێشگۆیی مەعبەدی دێلفوس، هاتنەسەر دەسەڵاتی ناوبراوی پەسندکرد. لیدی‌یەکان بۆخاتری کوژرانی کانداڤلیس، بە چەکەوە پەلاماری بارەگایاندا، بەڵام لاینگرانی ییغیس بەرگریان کرد و بەو مەرجە لەگەڵیان پێکهاتن کە ئەگەر نێوەندی تاڵەبینی دێلفوس پەسندی پاشایەتی ییغیس بکات، ئەوان ئیتر قسەیەکیان بۆ کردن نامێنێ و پێچەوانەی ئەوە، دەبوایە دەسەڵات بدرێتەوە بە ئیراکلیدی‌یەکان. کاهێنی دێلفوس پاشایەتی ییغیسی قبوڵکرد. لەو نێوەدا، پیتیا (ڕاسپاردەی نێوان خواوەند ئاپۆلۆنا و خەڵک) ئەوەشی لێ‌زیاد کرد کە دەسەڵاتدارێتی ئیراکلیدی‌یەکان پاش وەچەی پێنجەمی خانەدانی پاشایەتی ییغیس دەگەڕێتەوە دەست خۆیان. ئەو کاتە نە پاشاکان و نە خەڵکی لیدی هیچ بایخێکیان بەو پێشبینی‌یە نەدا، کەچی وەختی خۆی وەڕاستگەڕا.

[١٤] خانەدانی مێرماندی بەو شێوەیە بوونە خاوەن تاج و تەختی پاشایەتی. ییغیس وەختێک حوکمڕانی دەستپێکرد، کۆمەڵێک دیاری پێشکەشی دێرەکانی دێلفوس کرد. زۆربەی دیارییەکانی زێو کە لە مەعبەدەکانی دێلفوس هەن، ئەوانن کە ناوبراو خەڵاتی کردون. هەڵبەت جیا لە زێو، گەلێک دیاری ئاڵتوونیشی پێشکەش کردن. لەوانە شەش جامی زێڕ (تایبەت بۆ تێکەڵکردنی ئاو وشەڕاب) سرنجڕاکێشن. گشت ئەو دیارییانە،

*ئێستا لە خەزێنەی کۆرینتۆ پارێزراون و قورسایی سێ تالاند دەبن.* بۆوەی ڕاستیم گوتبێ، ئەو خەزێنەیە هی کۆرینتیەکان نییە، بەڵکوو ملکی کیپسیلوسی کوڕی هێتیۆس بووە. ئەوەندەی ئێمە بزانین، ییغیس یەکەم بیانییە کە خەڵاتی پێشکەش بە مەعبەدەکانی دێلفوس کردوە، هەڵبەت دوای میداس، کوڕ و جێنشینی غۆردیۆس کە پاشای فریژیەکان بووە. میداس تەختی پاشایەتی کە لەسەری دادەنیشت و حوکمڕانی وڵاتی دەکرد، بە شوێنە پیرۆزەکانی دێلفوس بەخشی کە ئێجگار بە نرخ و جوانە. ئەو تەختە ئێستا لەو شوێنە پارێزراوە کە دیارییەکانی ییغیسی لێیە. ئەو کۆمەڵە زێڕ و زیوەش کە ییغیس پێشکەشی کردوە، ناوی نراوە ییغادا، وەرگیراو لە ناوی بەخشەندە. کاتێک ییغیس هاتە سەر تەخت، لەشکری نارده سەر ناوچەکانی میلیتۆ و سمیرنی(ئیزمیر) و شاری کۆلۆفۆنای داگیرکرد. لەدوای سی و هەشت ساڵ تەمەنی پاشایەتی ییغیس‌دا، هیچ ڕووداوێکی ئەوتۆ بەرچاو نەقەوما و بۆیە لێرە ماڵئاوایی لە ناوبراو دەکەین و ئەوەندەش کە باسمان کرد، کیفایەتە. حەزدەکەم پتر باسی کوڕەکەی ییغیس، واتە ئاردیس بکەم کە دوای باوکی دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت.

[١٥] ئاردیس هەرێمی پری‌ئینی هێنایە ژێر دەسەڵاتی خۆی و پەلاماری دەڤەری میلیتۆی‌دا و ئەویشی گرت. لەو سەردەمەدا کە ناوبراو لە شاری سارد پاشایەتی دەکرد، کیمێریەکان کەوتنەبەر هێرشی هۆزەکانی سکیتی و ناچار بوون وڵاتی خۆیان جێبهێڵن. ئەوانە هاتنە ئاسیای بچووک و هێرشیان کردە سەر شاری سارد و ناوچەکانی دەوروبەری شاریان گرت، بەڵام دەگەڵ قەڵاکەی هیچیان بۆنەکرا.

[١٦] دوای چل و نۆ ساڵ پاشایەتی ئاردیس، کوڕەکەی بە ناوی سادی‌ئاتیس هاتە سەر حوکم و دوازدە ساڵ فەرمانڕەوایی کرد و دوای مەرگی ئەو، ئالی‌ئاتیس هاتە سەر تەخت. ئالی‌ئاتیس شەڕی دژی کیاکساری(خەشایار) کوڕی دییوکی(دیاکۆ)، پاشای میدیا ڕاگەیاند. ئالی‌ئاتیس

توانی کیمێریەکان لە ئاسیای بچووک دەربکات[1] و شاری سمیرنی(ئەزمیر) داگیر بکات کە بەدەست کۆچبەرانی کۆلۆفۆلۆسی بنیاتنرابوو. ناوبراو لەوێشەوە پەلاماری وڵاتی کلازۆمێنی‌دا. دیارە لێرە، رەوتی پێشوەچوونی شەڕ بەدڵی ئالی‌ئاتیس نەچووە پێش و لەڕووی ناچاری و بە خەسارێکی زۆرەوە پاشەکشەی کرد.

[١٧] ئالی‌ئاتیس چەند کارێکی لە دەورانی حوکمڕانی خۆیدا بەئەنجام گەیاند کە بۆ وەبیرهێنانەوە دەبن: دژی میلیتی‌یەکان شەڕی کرد. ئەو شەڕە لە راستیدا باوکی دەستی پێکردبوو و ئەویش درێژەی پێدا. ناوبرا گەرەکی بوو ناوچەی میلیتۆ داگیربکات. بۆ جێبەجێ کردنی ئەو داگیرکارییە خۆیشی بەشدار بوو و بەو چەشنە هەڵسوکەوتی کرد: کاتێک دەغڵ و دان پێگەیی و بەرەکەتی تێکەوت، هێرشی دەسپێکرد. لەشکری ناوبراو بە دەنگی مۆسیقای ژەنیارانی ژن و پیاو پەلاماری‌دا.[2] ئەوانە بەدەم ژەنینی فلووت و پیکتی لیدیایی بەرەو شار چوون.[3] کاتێک گەیشتنە ناوچەی میلیتۆ، نە ماڵی خەڵکیان وێران کرد و نە هیچ درگایەکیشیان شکاند و گشتیان وەک خۆی هێشتەوە. بەڵام، کاتی گەڕانەوە، میوەی باغات و دەغڵ و دانی مەزرای دەڤەرەکەیان لەگەڵ خۆیان برد. بۆیە ئەو کارەیان کرد، چونکە میلیتی‌یەکان خاوەن ناوگانی دەریایی بەهێز بوون و گەمارۆدانیش تەنیا لەلای وشکاییەوە کاریگەر نەبوو. حوکمڕانی لیدی‌یایی ماڵەکانی وێران نەکرد، بۆوەی میلیتی‌یەکان بتوانن تێیاندا بژین و درێژە بە زراعەتی خۆیان بدەن و ئەویش ئەو ئیمکانەی هەبێ پەلامار بداتەوە و حاسڵی دەسترەنجی ئەوان بخوا.

[١٨] یازدە ساڵ بەو شێوەیە شەڕی کرد. لەو نێوەدا میلیتی‌یەکان تووشی دوو وێرانی گەورە هاتن: یەکەمجار ئەوە بوو کە لە خاکی خۆیاندا واتە لە لیمێنیۆ، ناچار بە شەڕی دەشتایی بوون و جاری دووهەمیش لە دەشتی

١- بەرلە ئالی‌ئاتیس، ئاسوربانیپال پاشای ئاسراوی ئاشووری جەماوەرێکی فرەی لە کیمێرییەکان کوشتبوو وکاری ئالی‌ئاتیس تەواوکەری کردەوەی ئەو بوو.

٢- پیاوەکان بە دەنگی نزمەوە و ژنان بە دەنگی بەرزەوە.

٣- ئامێرێک بە بیست داو و دوو کومەڵە نۆتی هەشت دانیی مۆسیقا.

مێئاندرۆ دووباره شەڕیان بەسەردا سەپا. لەو یازده ساڵەدا، شەش ساڵ حوکمڕانیی وڵات بەردەوام بەدەست سادیئاتیس کوڕی ئاردیسەوە بوو. لەڕاستیدا ئەو بوو کە پەیتاپەیتا لەشکری دەهێنا سەر شاری میلیتۆ. دەبێ بڵێین کە هەر ئەویش ئەو شەڕەی دەست پێکردبوو. پێنج ساڵی دوایی، کوڕەکەی سادیئاتیس بە ناوی ئالیئاتیس درێژەی بەو ململانێیەدا و پێشتر باسم لێوە کردوە. ئالیئاتیس ئەو شەڕەی وەک میراتی باوکی پێگەیی و بە تامەزرۆیی فرەتر درێژەی پێدا. لە خەڵکانی هەرێمی یوونی، هیچکەس یارمەتی میلیتییەکانی نەدا، تەنیا دانیشتووانی دوورگەی خیۆس بە هانایانەوە چوون، ئەوانیش لەبەر باری ئەخلاقییەوە ناچاربوون بە هاواری میلیتییەکانەوە بچن، چونکە کاتی خۆی لەگەڵ خەڵکانی ئێریتری تووشی شەڕ هاتبوون و میلیتییەکان یارمەتییان دابوون.

**[١٩]** ساڵی دوازدەهەمی شەڕ، کاتێک لەشکری لیدیایی ئاگری لە زەوی و زار بەردا، ئەو رووداوە قەوما: بڵێسەی ئاگر بە هۆی بای توند گەیشتە مەعبەدی ئاتینا لە ئاسیسو و بەتەواوی سووتا. ئەو وەختە بایخێکی ئەوتۆ بەو رووداوە نەدرا، بەڵام هەرکە لەشکر گەڕایەوە شاری سارد، ئالیئاتیس لەجێوە نەخۆش کەوت. نەساغی ناوبراو ماوەیەکی زۆری کێشا و ناچار بوو راسپاردە بنێرێتە نێوەندەکانی ئایینی دێلفوس. هەڵبەت بۆیە ئەو کارەی کرد، رەنگە کەسانێک پێشنیارێکی لەو جۆرەیان پێکردبێ، یا ئەوە کە خۆی سەربەخۆ بڕیارێکی ئەوتۆی دابێ، واتە راستەوخۆ پرسیاری نەخۆشییەکەی لە خواوەندی دێلفوس بکات. وەختێک راسپاردەکان گەیشتنە مەعبەدەکانی دێلفوس، پیتیا،[١] وتەبێژ و نوێنەری خواوەند وڵامی دانەوە کە هیچ چەشنە

---

١- پیتیا وتەبێژ و ئاڵقەی پێوەندی نێوان خواوەندی پەرستگە و خەڵک لەمەڕ کاری تاڵەبینی و ئامۆژگاری بووە. هێرۆدۆت لە زۆر شوێنی کتێبەکەیدا وەک خواوەند پیتیا ناوی دەبا. لە هێندێک شوێن وەک کاهێنی مەزن نەخشی گێڕاوە، من ناچار بوومە رەوتی نووسینەکە وەبەرچاو بگرم. ئەوەی گرینگە، ئەوەیە کە پیتیا بەردەوام ژن بووە و فاڵی گرتووەتەوە و پێشگۆییەکان بەهۆی ئەوەوە دراونە خەڵک و هەر ئەویش پارێزگاری لەو پێشگۆییانە کردوە و تەنیا کەس بووە کە هاتووچۆی ژووری پیرۆزی کردوە، واتە ئەو شوێنەی پەیکەرەی خوایەکەی لێداندراوە.

پەند و ئامۆژگارییەک ناداتە دەست، مەگەر دانیشتووانی هەرێمی لیدی، بەر لە هەر کارێک مەعبەدی ئاتینا لە ئاسیسوی سەر بە ناوچەی میلیتۆ دووبارە بنیات بنێنەوە کە پێشتر ئاگریان تێبەرداوە. دیارە منیش بە نۆرەی خۆم ئەو باسەم لە زمانی دێلفوسی‌یەکان بیست.

[٢٠] هەڵبەت میلیتی‌یەکان هێندێک زانیاری‌تری پێوە زیاد دەکەن و دەڵێن: پێری‌ئاندرۆس، کوڕی کیپسێلو و دۆستی تراسی‌ڤولۆسی پاشای ئەوکاتی میلیتۆ، وڵامی نێوەندی نجوومی و تاڵەبینی پێگەیی، خێرا تراسی‌ڤولۆسی لێ ئاگادار کردەوە و داوای لێکرد بەپێی ڕەوتی ڕووداوەکان هەڵسوکەوت بکا.

[٢١] کاتێک ئالی‌ئاتیس وڵامی تاڵەبینەکانی پێگەیی، لەجێوە راسپاردەی ناردە شاری میلیتۆ و پێشنیاری ئاگربەسی بە تراسی‌ڤولۆس کرد، تا ئەو کاتەی مەعبەدی ئاتینا دروست دەکاتەوە، شەڕ بوێستێ. تراسی‌ڤولۆس خەبەری پێگەیی کە نوێنەری ئالی‌ئاتیس بەرەو شاری میلیتۆ بەڕێوەیە. ئەو هەروەها لە مەبەستی ئالی‌ئاتیسی حاڵی ببوو و بۆیە خێرا وەخۆکەوت. هەرچی خواردەمەنی و ئازوقەی خۆی و دانیشتووانی ناوچە هەبوو، کۆی‌کردەوە و هێنایە نێوەندی بازاری شاری میلیتۆ، پاشان بە خەڵکی راگەیاند کە هەرکات فەرمانی پێدان، گشت لایەک بیکەنە شایی و سەردانی هەڤدوو.

[٢٢] تراسی ڤولۆس بۆیە ئەو کارەی کرد بۆوەی کابرای راسپاردەی ئالی‌ئاتیس ببینێ کە قەیاسێکی زۆر خواردەمەنی لە شاری میلیتۆدا هەیە و بۆیە دانیشتووان جێژن دەگرن و دواتر بۆ پاشای خۆی باسی‌بکات. ئەو کارە کرا و راسپاردە گشتی بینی. پێشنیارەکانی بە تراسی‌ڤولۆس راگەیاند و گەڕایەوە شاری سارد. ئەوە تەنیا هۆکار بۆ سەقامگیرکردنی ئاشتی بەردەوام لە ناوچەکەدا بوو. چونکە ئالی‌ئاتیس بە پێچەوانەوە لە ڕەوشەکە حاڵی ببوو و پێیوابوو میلیتی‌یەکان خەریکن لەبرسان‌دەمرن. لەحاڵێکدا بەهۆی نوێنەرەکەیە ئاگادارکرایەوە کە ڕەوشەکە بەو شێوەیە خەراپ نییە و ئەوان بەهەڵە چوونە. دوای ئەو رووداوە هەردوو گەلی دراوسێ ئاشتبوونەوە و بوونە هاوپەیمانی یەکتر. ئالی‌ئاتیس، ئەویش بەنۆرەی خۆی

لەجیات بیناکردنی یەک مەعبەدی خواوەند ئاتینا، دوو مەعبەدی لە ئاسیسو دروستکرد و بەدەست نەخۆشییەکەی رزگاری هات. ئەوە کورتە باسێک لەمەر شەڕی ئالیئاتیس دژی میلیتییەکان و تراسیڤولۆس بوو.

[٢٣] پێریئاندرۆس، کوڕی کیپسێلوس، ئەو کەسەی وڵامی تاڵەبینی مەعبەدی دێلفوسی بە تراسیڤولۆس راگەیاند، خۆی حوکمڕانی هەرێمی کۆرینتۆ بوو. کۆرینتییەکان باسدەکەن و دانیشووانی دوورگەی لێسڤۆسیش لەگەڵیان هاوڕان و دەڵێن لە سەردەمی فەرمانڕەوایی پێریئاندرۆسدا، رووداوێکی زۆر گرینگ قەوماوە. ئاریۆن خەڵکی شاری میتیمنا، سەر بە دوورگەی میتیلینی بووە. ناوبراو، ناسراوترین ژەنیاری چەنگ لە سەردەمی خۆیدا بە سواری دۆلفینێک گەیشتووەتە تاینارۆ.[1] ئەوەندەی ئێمە بزانین، یەکەم کەس بووە کە ئاهەنگی سەمای ئایینی داناوە ( لەڕاستیدا بۆ دیۆنیسیس،[2] کوڕی خواوەند دیا گوتراوە). ئاریۆن ناوی ئەو هەوایەی نا، دیتیرامبۆ و بۆ خەڵکی کۆرینتۆی ژەنیوە.

[٢٤] ئەو جۆرەی دانیشتووانی کۆرینتی باسدەکەن، گۆیا ئاریۆن ماوەیەکی زۆر لە دەرباری پێریئاندرۆسدا ژیاوە. ناوبراو سەفەری ئیتالیا و سیکێلیای کردوە و لەو وڵاتانە کاری کردوە و پارەیەکی زۆری دەستکەوتوە و دواتر ویستوویەتی بگەڕێتەوە کۆرینتۆ. ئەو کاتێک لە شاری تاراندا رۆیشتووە، لەبەر ئەوەی جیا لە خەڵکی کۆرینتۆ، باوەڕی بە هیچکەسیتر نەکردوە، سواری کەشتیەکی کۆرینتیی بووە. لەماوەی سەفەردا، بەپێچەوانەی باوەڕەکانی ئەو بە هاوشارییەکانی، کۆرینتییەکان بڕیاریانداوە ئاریۆن فڕێبدەنە نێو ئاوی بەحر بۆوەی دەست بەسەر پارەکەیدا بگرن. ئاریۆن بە پیلانی ئەو نەیارانەی خۆی زانیوە. سەرەتا داوایان لێدەکا نەیکوژن و چی پارەی دەخوازن بیانداتێ و حەولێکی فرە دەدا و ناتوانێ بە قەناعەتیان بگەیێنێ. کارگێڕانی گەمیی داوا لە ئاریۆن دەکەن لەنێو گەمی و لەبەر چاوی

---

١- بەرزایی خاکی یۆنان لە باشووری هەرێمی لاکۆنی.

٢- خوای شەڕاب.

ئەوان خۆی بکوژێ و هەروەها بەڵێنی پێدەدەن پاش گەیشتنەوەیان بۆ کۆرینتۆ جەنازەکەی دەنێژن. ئەگەر کارە نەکا دەبێ خۆی فڕێبداتە نێو ئاوی بەحرەوە. ئاریۆن نازانی چبکات، ناچار دەبێ مل بۆ خواستی ئەوان ڕاکێشێ، بەڵام بۆ دوایین جار داوایەکیان لێدەکا. دەخوازێ جوانترین جلەکانی لەبەر خۆی بکا و لە سەر عەرشەی گەمی بەپێوە بوێستێ و گۆرانی بڵێ. بەڵێنیش دەدا هەرکات گۆرانییەکەی تەواوبێ، خۆی لەنێو ئاو بهاوێ. کارگێڕانی گەمی گەلێک خۆشحاڵ لەوە کە خۆشترین گۆرانی ئەو جیهانەیان گوێ لێدەبێ، هەر هەموویان لە نێوەندی گەمیدا کۆدەبنەوە. ئاریۆن جوانترین جلوبەرگ لەبەرخۆیدەکا. چەنگ بەدەستەوە دەگرێ و گۆرانییەکی قەدیمی دەچڕێ. وەختێک تەواو دەبێ، بە جلە نوێیەکانییەوە خۆی فڕێدەداتە نێو ئاوی بەحر. پیاوانی گەمی درێژە بە سەفەر دەدەن و دەگەنەوە کۆرینتۆ.

سەبارەت بە ئاریۆن، ئەو جۆرەی دەگێڕنەوە، دۆلفینێک ناوبراو سواری پشتی خۆی دەکا و دەیگەیێنێتەوە تایناڕۆ. ئاریۆن لەوێ دێتەوە سەر خاک و بە هەمان جلوبەرگەوە بەرەو کۆرینتۆ وەڕێدەکەوێ. کاتێک دەگاتەوە، گشت بەسەرهاتەکەی بێ کەموزیاد دەگێڕێتەوە. پێری‌ئاندرۆس سەرەتا باوەڕی پێناکا و لە حەپسی تاکەکەسی دەخا و چاوەڕوانی گەڕانەوەی گەمییەکە دەکا. کاتێک ئەو گەمییە دەگاتەجێ و لەنگەر دەگرێ، کارگێڕان بانگ‌دەکا و لێیان‌دەپرسێ ئاخۆ هیچ زانیارییەکیان سەبارەت بە ئاریۆن هەیە. ئەوانیش وڵام دەدەنەوە کە ناوبراویان لە ئیتالیا دیتوە و وەزعی باش بووە و لەگەڵ خۆیان هێناویانەتە تاراندا و لەوێ کارەکەی گرتوویەتی. ڕاست لەو کاتەدا ئاریۆن وەدیار دەکەوێ و ڕووبەڕو دەبێتەوە. هەمان جلوبەرگیشی لەبەردا دەبێ کە لەکاتی خۆفڕێدانی بۆ نێو ئاوەکەدا پۆشیبووی. کارگێڕانی گەمی سەریان سوڕدەمێنێ و ناتوانن درۆی‌تر هەڵبەستن و دان بە جینایەتەکەیان دەنێن. کۆرینتی‌یەکان و لێسقی‌یەکان بەو شێوەیە باسی ئەو ڕووداوەیان کردوە و ئێستاش لە شاری تایناڕۆ پەیکەرەیەک هەیە کە کەسێک نیشان دەدا، سواری دۆلفین بووە.

[٢٥] ئالیئاتیسی لیدیایی دوای تەواوکردنی شەڕ لەگەڵ وڵاتی میلیتۆ، پاش پەنجا و حەوت ساڵ پاشایەتی ئەوسا مرد. لەبەر ئەوەی کە جاری پێشوو خەڵاتی بە مەعبەدەکانی دێلفوس بەخشیبوو، چاک ببۆوە. ناوبراو جارێکیتریش دیاری پێشکەش بە نێوەندی ئایینی دێلفوس کرد و دووهەمین کەس لە خانەدانی مێرماندی بوو کە پەیکەرەیەکی گەورەی خاوەن پایەی ئاسنی دەستکردی غلاڤکۆسی خەڵکی دوورگەی خیۆسی بەو نێوەندە پیرۆزە بەخشی. غلاڤکۆس یەکەم کەس بوو کە شێوەی جۆشدانی ئاسنی دۆزییەوە.

## مێژووی کریسۆس[١]

[٢٦] دوای مەرگی ئالیئاتیس، کوڕەکەی بەناوی کریسۆس لە تەمەنی سی و پێنج ساڵیدا حوکمڕانی بەدەستەوەگرت. یەکەم وەجبەی یۆنانییەکان کە دژی ناوبراو راپەڕین، ئێفێسییەکان بوون. لەشکری کریسۆس ئەوانەی گەمارۆدا. ئێفێسییەکان خێرا شارەکەی[٢] خۆیان پێشکەش بە خواوەند ئارتێمیس کرد و بە تەنافێک شاریان لە پەرستگەی ئارتێمیس بەستەوە.[٣] مەودای نێوان شاری گەمارۆدراوی کۆن تا دێری ئارتێمیس دەگەیشتە حەوت ستادیۆ. سەرەتا کریسۆس پەلاماری ئێفێسییەکانیدا و دواتریش بەردەوام شەڕی دژی یوونییەکان و ئیئۆلیکییەکان کرد. هێندێک جار ئەو شەڕانە مەبەستدار بوون و جاروباریش بۆ چاوترساندن.

---

١- کریسۆس هەمان کراسۆسە

٢- ئێفێسۆس، شارێکە لە داوێنی بەرزاییەکانی باشووری کایستۆر هەڵکەوتووە.

٣- ئارتێمیس یا مارس، خوای شەڕ و پێکدادان.

[٢٧] کریسۆس پاش ئەوەی یۆنانییەکانی ئاسیای بچووکی بە تەواوی هێنایە ژێر دەسەڵاتی خۆی، ئەوجار بیری لە چەکدارکردنی کەشتیگەلی دەریایی و هێرش بۆسەر دوورگەکان کردەوە. بەردەوام خەریکی دروست کردنی گەمییە جەنگیەکان و ئامادەکردنی کەشتیگەلی بەمەبەستی پێشڕەوی بوو. ڕاست لەو سەردەمەدا، ڤیاس پریئینیڤیس یا وەک هێندێک کەسیتر دەڵێن پیتاکۆسی میتیلینی، هاتووەتە شاری سارد.[1] کریسۆس لێی پرسیوە کە زانیاری نوێی سەبارەت بە ڕەوشی یۆنان پێیە،[2] ناوبراو تەنیا یەک وڵامی داوەتەوە و ئەو جوابەش بووەتە هۆی ڕاگرتنی ئامادەکارییەکانی کەشتیگەلی دەریایی. ئەو گوتوویەتی: "پاشا، دوورگەنشینان بە هەزاران ئەسپیان کڕیوە و دەخوازن بە ڕێگای ویشکاییدا هێرش بکەنە سەر شاری سارد و وڵاتەکەت ". کریسۆس باوەڕی بەو قسەیە کردوە و وڵامی داوەتەوە: "خۆزگە خواوەند ئەو دوورگەنشینانە ڕێنوێنی بکا، بە سوارە نیزامەوە پەلاماری وڵاتی لیدی بدەن ". کابرا ئەوسا گوتوویەتی: "وێدەچێ ئارەزووی شەڕ لەگەڵ دوورگەنشینانی خاوەن هێزی سوارە بکەی و گەرەکتە لە ویشکاییدا شکستیان بدەی. هەق بەتۆیە و شەڕی ویشکایی بە قازانجتە، بەڵام لەبیرت نەچێ، ئەوانیش کاتێک خەبەریان پێگەیی کە جەنابت خەریکی ئامادەکردنی کەشتیگەلی دەریایی و هێرش بۆسەر دورگەکانی ئەوانی، گەلێک خۆشحاڵ بوون و بە ئامانجی خۆیان گەیشتن، چونکە ئەوانیش دەخوازن لە دەریاوە بەربەرەکانی توند دژی لیدیەکان بکەن و تۆڵەی یۆنانییەکانی ئاسیای بچووک بستێننەوە کە کۆیلەی جەنابتن! ". ئەو گوتەیە وێدەچێ کاریگەرییەکی فرەی لەسەر ورەی کریسۆس دانا، بۆیە ناوبراو دەستی لە ئامادەکردنی ناوگانی دەریایی هەڵگرت و پەیمانی ئاشتی لەگەڵ دانیشتووانی یوونی دوورگەکان مۆرکرد.

---

١- ڤیاس و پیتاکۆس، هەردووکیان سەربە کۆمەڵی ناسراوی " حەوت ردێن سپی ماقوڵ"ی یۆنان بوونە.

٢- هێرۆدۆت لێرە مەبەستی لە یۆنان، تەواوی دورگەکانی ڕۆژئاوای دەریای ناوەڕاستە.

[٢٨] بە تێپەڕبوونی زەمان نیزیک بە تەواوی گەلانی نیشتەجێ لەوبەرەی چۆمی ئالی کەوتنە ژێر دەسەڵاتی لیدی‌یەکان. ، کریسۆس جیا لە دانیشتووانی کیلیکیا و لیکیا، گشت ئەوانی‌تری هێنایە بندەستی خۆی. ئەو خەڵکانە بریتی بوون لە: لیدی، فریژی، میسی، ماریاندینی، خالیڤی[١]، پافلاغۆنی، تراکی‌یەکانی تینی و ڤیتینی، کاری، یوونی، دووری، ئێئۆلی و پامفیلی.

[٢٩] کاتێک کریسۆس سەرجەم ئەو گەلانەی هێنایە ژێر دەسەڵاتی خۆی و خاکی ئەو وڵاتانەی داگیرکرد و خستنیە سەر ئیمپراتۆریەتی لیدی، ساردی‌یەکان سەرکەوتنێکی فرەیان بەخۆوە بینی و بوونە خاوەن سەروەت و سامانێکی زۆر و تەواوی فەیلەسوفەکانی یۆنانی ئەو سەردەمە روویان لە وڵاتی لیدی کرد. لەنێو ئەوانەدا، سۆلۆنۆس خەڵکی ئاتێن، دوای ئەوە کە قانوونی نوێی بۆ ئاتێنی‌یەکان نووسی، هەڵبەت داوای لێکرابوو ئەو قانوونە بنووسێ. ناوبراو بۆ ماوەی دە ساڵ بەرەو وڵاتانی جۆراوجۆر رۆیشت. ئەو کارەی ئەو بە مەبەستی گەڕان بوو. سۆلۆنۆس بۆیە دوای نووسینی قانوون ئەو سەفەرەی کرد بۆوەی ناچاری نەکەن هیچکام لە بەندەکانی قانوون بگۆڕێ. ئاتێنی‌یەکان خۆیان نەیاندەتوانی دەستکاری قانوونەکە بکەن، چونکە سوێندیان خواردبوو دە ساڵی رێک رێز و حورمەت بۆ قانوونی سۆلۆنۆس دابنێن.

[٣٠] لەبەر ئەو هۆیە یا حەز لە سەفەرکردن، سۆلۆنۆس بەرەو وڵاتی میسر رۆیشت بۆوەی بتوانێ چاوی بە ئاماسیس بکەوێ و دواتریش بچێتە شاری سارد بۆلای کریسۆس.[٢] کاتێک سۆلۆنۆس گەیشتە ئەو شارە، کریسۆس لە بارەگای خۆی میوانداری لێکرد. رۆژی سێهەم یا چوارەم، خزمەتکارەکانی بارەگا لەسەر فەرمانی کریسۆس، رێنمایی سۆلۆنۆس‌یان کرد و گشت خەزێنەی پاشایان نیشاندا. ئەو خەزێنەیە لە ژماردن نەدەهات. سۆلۆنۆس وەختێک بە هێمنی چاوی بە هەموو سامانەکە کەوت، ئەوسا

---

١- هێندێک لە مێژووناسانی باستان، بەپێچەوانەی هێرۆدۆت، هۆزەکانی خالیڤی بە دانیشتووانی ئەوبەری چۆمی ئالی دەزانن، نەک بەو بەرەی.

٢- بەپێی هێندێک بۆچوون، کاتێک یاساکانی سۆلۆنۆس لە یۆنان بەڕێوە چوونە، نە ئاماسیس لە میسر فەرمانڕەوا بووە و نە کریسۆس لە وڵاتی لیدی.

کریسۆس لێیپرسی:[1] "ئەی میوانی ئاتێنی، ناوبانگی تۆ لەمەڕ زانست و سەفەرەکانت گەیشتۆتە ئێرە، ئارەزوت بۆ فێربوون تۆی هانداوە کە چاوت بە زۆر وڵاتان بکەوێ، بۆوەی پتر بتوانی ئەو جیهانە بناسی. ئێستا من گەرەکمە لە تۆ بپرسم کە بەختەوەرترین مرۆڤی ئەو جیهانە کێیە؟ ". کریسۆس بۆیە ئەو پرسیارەی لە سۆلۆنۆس کرد، پێیوابوو خۆی بەختەوەرترین کەس لەو دنیایەدا. سۆلۆنۆس بەبێ تاریف کردن لە پاشا، بە رووهەڵماڵاوییەوە وڵامی داوە: "عەرزی پاشای خۆم بکەم، تیلۆسی ئاتێنی ". کریسۆس بەو جوابە هەڵبەزییەوە و خێرا لێی پرسی: "بۆچی پێتوایە تیلۆس بەختەوەرترین مرۆڤە؟ ". سۆلۆنۆس لە وڵامدا گوتی: "تیلۆس لە کۆمەڵگایەکی بەختەوەردا ژیا. ئەو بوو بە خاوەن منداڵی باش و دڵسۆز و بەچاوەکانی خۆی نەوەکانیشی بینی. هەرهەموویان پێکەوە ژیان. بەپێی پێوەرەکانی لای ئێمە، مرۆڤێکی سادە بوو و بە ئیفتیخاریشەوە مەرگی هەڵبژارد. لە شەڕێکی نێوان ئاتێنییەکان و ئێلێفسینییەکانی دراوسێدا، تیلۆس پەلاماری دوژمنیدا و ناچار بە پاشەکشەی کردن و خۆیشی جوامێرانە کوژرا. ئاتێنییەکان بە قەدر و حورمەتێکی فرەوە ناوبراویان لە شوێنی کوژرانی بە خاک سپارد".

[31] بەهەرحاڵ سۆلۆنۆس سەبارەت بە تیلۆس و هۆکارەکانی بەختەوەری ناوبراو قسەی خۆی کرد. کریسۆس ئەوجار لێی پرسی کە دوای تیلۆس، خۆشبەختترین کەس کێیە؟ کریسۆس متمانەی تەواوی بوو کە ئەو دەبێ دووهەمین کەس بێ. سۆلۆنۆس لە وڵامدا گوتی: "کلێئۆڤیس و ڤیتۆناس. ئەوانە خەڵکی ئارغۆس و خاوەن ژیانێکی تێروتەسل، لەشساغ و بەهێز و لە کێبەرکێکانی وەرزیشیدا سەرکەوتوو بوون. ئەوانە بۆ جێژنی رێزگرتن لە خواوەند ئیرا،[2] لە شاری ئارغۆس بوونە. دایکی ئەو جووتە کوڕە پێویست بووە بە سواری عارەبەی کەڵان بچێتە شوێنی بەڕێوەچوونی رێورەسمەکە. کەڵەکان

---

١- سەرچاوەیتر دەڵێن کریسۆس ساڵی ٥٦٠ی پێش زایین بەدەسڵاتی وڵاتی لیدی گەیشتووە، لەحاڵێکدا سۆلۆنۆس زۆر پێشتر لەو مێژووە، واتە لە ساڵی ٥٩٤ی پێش زایین خاوەن پلەی بەرز بووە.

٢- ئیرا، یەک لە خواکانی یۆنانی باستان.

له مەزرایێ بوونە و نەگەڕاونەوە ماڵ. وەختێکی زۆریان نەبووە و وێڕانەگەیشتوون بەدوای کەڵەکاندا بگەڕێن. ئەو دوو کوڕانە دایکیان سوار کردوە و لەجیات کەڵەکان چوونەتە ژێر نیری عارەبە. بە مەودای چل و پێنج ستادیۆ عارەبەکەیان راکیشاوە، تا گەیشتوونەتە مەعبەدی خواوەند ئیرا[1]. دواتر، ئەو لاوانە مەرگێکی جوانیشیان بەنسیب بووە. بە زەلیلی نەمردوون و خواوەند رەحمێکی زۆری پێکردون. پیاوانی ناوچەی ئارغۆس بە رێز و حورمەتەوە یادی ئەو لاوانەیان کردوە و ژنانیش رەحمەتیان بۆ دایکی کوڕەکان ناردوە، چونکە خاوەن دوو جگەرگۆشەی ئاوا جوامێر بووە.

دایکی کوڕەکان هەم لەمەر جوامێری و باری تەندروستی و هەمیش بۆخاتری ناوبانگیان، هەستی بە بەختەوەری خۆی کردوە. ئەو لە بەرانبەر پەیکەرەی خواوەند (ئیرا)دا وێستاوە و لەبەری پاڕاوەتەوە کە سەبارەت بە چاکە و حورمەت گرتنی کوڕەکان، واتە کلیئۆڤیس و ڤیتۆناس لە دایکیان، چی بە نرخ و باش هەیە پێیان ببەخشی. دوای ئەو دوعایە، کاتێک قوربانی کراوە و جێژن دەستیپێکردوە، دوو براکان لە نێو پەرستگە خەوتوون و ئیتر وەخەبەر نەهاتونەوە. ژیانیان هەر لەوێ کۆتایی پێهاتوە. خەڵکی ناوچەی ئارغۆس پەیکەرەیان لێ دروست کردون و بە نیشانەی باشترین مرۆڤ بە پەرستگەکانی دێلفوس‌یان بەخشیون ".[2]

**[٣٢]** سۆلۆنۆس بەو شێوەیە ئەو لاوانەی وەک بەختەوەرترین ئینسان لە ریزی دووهەم دانا. کریسۆس بە قەڵسییەوە گوتی: "ئەی باشە بەختەوەری من بەکوێ گەیی؟ ئەی میوانی ئاتێنی. خۆشبەختی من ئەوەندە بە کەم دەگری کە ناتوانی تەنانەت لەگەڵ خەڵکی ئاساییش هەڵیسەنگێنی ". سۆلۆنۆس وڵامی داوە: "کریسۆس، تۆ سەبارەت بە مرۆڤ پرسیار لە من دەکەی. ئەوەندەی من بزانم خواکانیش ئێرەیی بە بەختەوەری ئینسان دەبەن و بەردەوام لێی دەشێوێنن. لە درێژایی ژیانی دوور و درێژی مرۆڤدا،

---

١- ناسراوە بە پەرستگەی ئیرێئۆن لەسەر رێگای میسینی بووە.

٢- ئەو دوو پەیکەرەیە هی سەدەی ٦ی پێشزایین و لە موزەی دێلفوس پارێزراون.

شتگەلێک دەقەومێن کە ئینسان گەرەکی نەبووە تووشیان بێ و بیانبینێ. من بۆ ژیانی مرۆڤ حەفتا ساڵ تەمەن دادەنێم.[1] ئەو حەفتا ساڵە دەبنە بیست و پێنج هەزار و دووسەد رۆژ. هەڵبەت مانگەکانی نێوئاخن حیساب نەکراون. ئەگەر ئێستا، هەر دووهەم ساڵ یەک مانگی پێوە زیاد بکرێ بۆوەی رەوتی هاتنی وەرزەکان بپارێزین، مانگەکانی نێوئاخن دەبنە سی و پێنج، بە واتایەک دەبێ هەزار و پەنجا رۆژیتری بێتە سەر. لە سەرجەمی ئەو بیست و شەش هەزار و دووسەد و پەنجا رۆژە کە کۆی حەفتا ساڵ تەمەنە، رۆژەکان هیچکامیان وێکناچن.[2] باشە کریسۆس، لەبیرت نەچێ، وەختێک ژیان بەو جۆرەیە، پڕە لە بەختەوەری و نەهامەتی و شک و گومان و بێ متمانەیی. من جەنابت دەناسم کە پاشایەتی خەڵکێکی فرە دەکەی و گەلێکیش سامانداری، بەڵام سەبارەت بەو پرسیارەت، ناتوانم وڵامت بدەمەوە، بەر لەوەی ژیانت بە بەختەوەری کۆتایی پێهێنابێ. مرۆڤێکی خاوەن دەوڵەت و سامان کاتێک بەختەوەرە کە بەخت لەگەڵی سازگار بێ و بتوانێ دوارۆژی خۆشی هەبێ، ئەگینا مرۆڤێکی ئاسایی کە تەنیا بژێوی رۆژانەی خۆی دابین دەکا،بەختەوەرتر دەژی. زۆر کەسی دەوڵەمەند هەن کە هەست بە خۆشی ژیان ناکەن و بەپێچەوانەوە زۆر کەسی خاوەن دەراماتی ئاسایی لەوان باشتر دەژین. ساماندار تەنیا لە دوو بواردا لە کابرای بەختەوەر دەوڵەمەندترە، بەڵام پیاوی خۆشبەخت لە زۆر باریترەوە راحەتتر لە مرۆڤی دەوڵەمەندی لێقەوماو دەژی. ساماندار رەنگە بتوانێ حەز و خۆزگەکانی بە

---

١- بنەمای ساڵی یۆنانی لەسەر خولانەوەی مانگ داندرابوو و دوازدە مانگی لەخۆوە دەگرت. مانگەکان یەک بەدوای یەکدا سی رۆژ و بیست و نۆ رۆژ بوون. سەرجەمی رۆژەکانی ساڵ دەبوونە ٣٥٤، واتە ١٥ رۆژ کەمتر لە ساڵی هەتاوی. یۆنانییەکان بۆ چارەسەری ئەو گرفتە، هەردوو ساڵ جارێک، ١ مانگیان بە مانگەکانی ساڵەوە زیاد کرد. ئەو مانگە ناسراو بوو بە " مانگی زیادە". مەبەستیان لەو کارە ئەوە بوو کە رەوتی مانگ و ساڵەکان تێکنەچێ. دیارە لە سەدەی پێنجی میلادیدا رێوشوێنیتریان گرتەبەر.

٢- لە زۆربەی پارچە نووسراوەکانی سۆلۆنۆس‌دا کە رزگاریان هاتووە، ژمارەکانی ٧٠ و ٨٠ وەک " قەیاسی باش" سەیرکراون.

ماڵی دنیا دابین‌بکا و لەمەر گرفتی گەورەدا باشتر تاقەت بێنێ، بەڵام مرۆڤی ئاسایی ئەویش لەجێی خۆیدا هێندێک تایبەتمەندی هەن کە یارمەتی بە خۆراگرییەکەی دەدەن. رەنگە بەرگەی رووداوی دڵتەزێن نەگرێ و نەتوانێ خۆزگەکانیشی  بە ماڵ و سەروەت دابین بکا، بەڵام بەختەوەری ئەو لە زۆر نەهامەتی دەپارێزێ و ناهێڵێ لەهەمبەر رووداوی مەترسیداردا ئەوەندە تووشی ئازارکێشان بێ. دەکرێ بڵێم کە لەش‌ساغە و کەمتر تووشی نەخۆشی دێت و خاوەن منداڵی رێکوپێکە و خۆیشی مرۆڤێکی خۆشەویستی خەڵکە و ساحێبی دوارۆژی خۆشە. ئەوە ئەو کەسەیە کە بۆ جەنابیشت جێگای پرسیار بوو و کەسێکی ئەوتۆ دەبێ وەک بەختەوەر و خۆشبەخت ناوی‌بەرین. ئینسان تا ئەو کاتەی لە ژیاندا و نەمردوە، نابێ وەک بەختەوەر سەیری‌بکەین و بڵێین خۆشبەختە، تەنیا ئەوەندە دەتوانین بڵێین کە خۆشی رۆژگار رووی خۆشی پێ‌نیشانداوە.

مرۆڤ ناتوانێ خاوەنی هەموو شتێک بێ، راست وەک وڵاتێک کە ناتوانێ گشت پێداویستییەکانی خۆی دابین‌بکا. رەنگە هێندێک ئیمکاناتی پتری هەبێ، بەڵام بەو حاڵەش بۆ گەلێک بابەتی‌تر کەمی دێنێ. ئەو وڵاتەی پتری ئیمکانات هەبێ رەوشی باشترە. مرۆڤ، ئەویش هەر بەو چەشنە، زەحمەتە خاوەنی تەواوی ئیمکاناتی ژیان بێ، بەڵام ئەگەر دەست رۆیشتوو بێ، گرفتی ژیانی کەمترە. هەرچەند رەنگە لە زۆر بارەوە دەست‌ڕۆیشتوو بێ، بەڵام دیسانیش بێ کەموکوڕی نابێ. پاشاکەم، بە باوەڕی من بەختەوەر ئەو کەسەیە کە بۆوەی رۆژی مردن موحتاج نەبێ و مەرگێکی جوان و ئارامی بەنسیب بێ. مرۆڤ دەبێ چاوەروان بێ و بزانی پاشەڕۆژی ژیانی بەکوێ دەگات، چونکە خواوەند بەختەوەری بە زۆر کەس دەدات، بەڵام لە کۆتاییدا ماڵوێرانی دەکا ".

[٣٢] سۆلۆنۆس ئەوەی پێویست بوو بەبێ تاریف و پێهەڵاگوتن بە پاشای گوت. کریسۆس هیچ بایخێکی بەو قسانە نەدا و سۆلۆنۆسی شێت و نەفام هاتە بەرچاو و خێرا وەدەرینا. ئەوەش بۆیە بوو، چونکە سۆلۆنۆس سەروەت

و سامانی وەبەرچاو نەگرت و پێیوابوو مرۆڤ دەبێ چاوەروانی چارەنووس و دوارۆژی ژیانی ئینسان تا کاتی مردن بکا و ئەوجار هەڵیسەنگێنێ.

[٣٤] وەختێک سۆلۆنۆس رۆیی، خوای عەداڵەت کریسۆسی بە توندی سزادا، چونکە لەو باوەڕەدا بوو کە بەختەوەرترین مرۆڤە. کاتێک کریسۆس خەوت، خەونی بینی کە کوڕەکەی لە بارودۆخێکی ترسناک کەوتبوو. کریسۆس دوو کوڕی هەبوو. یەکیان نەخۆش و کەڕولاڵ و ئەوەی‌تریش لەنێو راوێژکارەکانیدا، لەلای خۆی کاری دەکرد. دووهەمیان ناوی ئاتیس بوو. کریسۆس خەونی بە ئاتیسەوە بینی کە بە کەرستەیەکی کوشەندەی ئاسن، چەشنی خەنجەر کوژرا.

وەختێک وەخەبەر هات، ترس سەرتاسەری جەستەی داگرت. لە فکرەوە رۆچوو و بڕیاریدا ژن بۆ کوڕەکەی بێنێ. ئاتیسی کوڕی هەرچەند فەرماندەی لەشکری لیدی بوو و لە زۆربەی شەڕەکاندا بەشداری دەکرد، باوکی بەدوای ئەو خەونەوە ئیتر لە ناردنی کوڕەکەی بۆ ئەرکی سەربازی خۆی پاراست و دەستووری‌دا هەرچی تیر و کەوان و نێزە و چەکی شەڕ کە لە ژوورەکانی نێو بارەگادا هەن و پیاوانی نیزامی تێیاندا دەژین، خێرا کۆکرێنەوە و تاقەت بکرێن. کریسۆس لەوە نیگەران بوو مەبادا یەکێک لەو کەرستە هەڵواسراوانە بەربێتەوە و ببێتە هۆی کوژرانی کوڕەکەی.

[٣٥] لەو کاتەدا کە کریسۆس ئامادەکاری زەماوەندی کوڕەکەی دەکرد، کابرایەک گەیشتە شاری سارد. ئەو کابرایە قوربانی چارەنووس ببوو و دەستەکانی بۆنی خوێنیان لێدەهات. خەڵکی ناوچەی فریژیا و لە بنەماڵەی پاشایەتی بوو. کاتێک لە قەسری کریسۆس وەژوور کەوت، دەستی بە پاڕانەوە کرد تا بە پێی داب و نەریتی هەرێمەکە لە تاوان و گوناهەکانی پاک بکرێتەوە. کریسۆس ئەو خواستەی کابرای بەجێ‌هێنا و ئەو سەردەمە یۆنانییەکان و لیدی‌یەکان رێورەسمی تایبەت و هاوشێوەیان بۆ پاککردنەوەی لەش و رووحی تاوانباران و پیاوکوژان هەبوو. پاش بەڕێوەچوونی مەراسیمی پاککردنەوە، کریسۆس لە کابرای پرسی کە خەڵکی کوێیە و چکارەیە. "تۆ کێی؟ "لێی‌پرسی.

"له کام دەڤەری وڵاتی فریژیەوە هاتوویە لای من؟ کێت کوشتووە؟ ژن بوو یا پیاو؟ ". کابرا لە وڵامدا گوتی: "پاشا، من کوڕی (غۆردیس)م و نەوەی میداس.[1] بەناوی ئادراستۆس بانگم دەکەن. بەبێ مەیل و خواستی خۆم، براکەی خۆمم کوشت و لەدەست باوکم رامکردوە و پەنام بۆ ئێرە هێناوە و لە هەموو شتێک بێبەش بوومە ". کریسۆس وڵامی داوە: "تۆ نەوەی دۆستانی منی و ئێستاش هاتوویە ماڵی دۆستەکانت و لە هیچت کەم نابێ. یارمەتیت دەدەین کە خەم و پەژارەکانت فەرامۆش بکەی ".

[٣٦] ئادراستۆس وەک میوان لە بارەگای کریسۆس مایەوە. راست لەو سەردەمەدا بەرازێکی وەحشی گەلێک زل، لە دەڤەری ئۆلیمبوسی سەر بە میسیاس وەدیارکەوت. لە چیاکانڕا داگەڕابووە خوار و زەوی‌وزاری خەڵکی وێراندەکرد. دانیشتووانی ناوچەکە زۆرجار لێی وەدەر دەکەوتن بۆوەی بیکوژن، بەڵام دەرەقەتی نەدەهاتن و بەدەست گرفتی ئەو بەرازەوە هاواریان لێ‌بەرز ببۆوە. کۆمەڵێک راسپاردەی ئاواییەکان هاتنە لای کریسۆس و پێیان‌گوت: "پاشا، بەرازێکی دڕندەی زۆر گەورە لە وڵاتەکەمان پەیدا بووە و گشت زراعەتەکەی لەنێو بردووین. خۆمان پێی‌ناوەستین. بۆیە هاتووین کە کوڕەکەت لەگەڵ هێندێک لاوی بەغیرەت و جوامێر بنێری تا دەڤەرەکە لەدەست ئەو بەرازە رزگار بکەن". ئەوە داوای راسپاردەکانی میسیایی بوو. کریسۆس خێرا وەبیر خەونەکەی کەوتەوە و وڵامی دانەوە: "سەبارەت بە ناردنی کوڕەکەم، تکایە هیچ قسەی لێ‌مەکەن. ئیمکانی نییە ئەوتان بۆ بنێرم. تازە زەماوەندی کردوە و کار و ئەرکی‌تری بەستۆوەیە، بەڵام ژمارەیەک لاوی هەڵبژاردەی لیدیایی‌تان دەدەمێ. ئەوانە گشتیان راوچی خۆمن و بە سەگەکانیانەوە دەتوانن یارمەتیتان بدەن بۆوەی ناوچەکە لەو بەرازە پاک بکەنەوە ".

[٣٧] کریسۆس بەو شێوەیە وڵامی راسپاردەکانی داوە و ئەوانیش گەلێک سپاسیان کرد. راست لە کاتی وەدەر کەوتنی راسپاردەکان لە بارەگا،

---

١- غۆردیس یا گۆردیس لەگەڵ میداس، هەردووکیان سەر بە خانەدانی پاشایەتی فریژی بوونە و بەدوای یەکتردا فەرمانڕەواییان کردوە.

کوڕەکەی کریسۆس وەڕوور کەوت. ئەو خەبەری بیستبوو کە میسی‌یەکان بۆچی هاتوون. لەبەر ئەوەی باوکی حەزی نەدەکرد ئەو لەگەڵیان بچێ، کوڕە بە باوکی گوت: "باوکە، کاتێک دەچوومە شەڕ و ڕاو و شکار، مەجالم هەبوو پتر خۆم بناسێنم. ئێستا تۆ منت لە هەردوو بابەت بێبەش کردوە. هەرچەند هیچ چەشنە ترس و بێ مەیلی‌یەک لە مندا بەدی‌ناکرێت. لەمەودوا من چۆن چاوم بە چاوی خەڵکی نێو بازاڕ بکەوێ. دانیشتووانی وڵات چ حیسابێک بۆ من دەکەن؟ ژنەکەم کە تازەبووکە، ناڵێ مێردی بە چۆن پیاوێک کردوە! ئێستا تکات لێدەکەم یا لێمگەڕێ بۆ ئەو ڕاوە بچم یا بە قەناعەتم بگەیێنە کە بەرگری کردنت چ قازانجێکی بۆ من هەیە".

[٣٨] کریسۆس وڵامی داوە: "کوڕم، من پێشت پێناگرم کە تۆ بچییە ڕاو، بە ترسەنۆکیشت نازانم و دەلیلێکی‌تریش لەگۆڕێدا نییە. تەنیا ئەوە کە خەونێکم دیتوە و پێموایە تۆ زۆر ناژی و بەهۆی کەرستەیەکی ئاسنینی چەشنی خەنجەر دەکوژرێی. ئەو خەونە هۆکارێک بوو کە منی ناچارکرد بەپەلە ژنت بۆ بێنم و نەهێڵم لە شەڕەکان و بەتایبەتی لەو ڕاوەدا بەشداربی. بڕیارم داوە ئەوەندەی زیندووم و لە دەستم بێ بتپارێزم. تۆ تەنیا تاقانەی منی، چونکە براکەت کەڕ و لاڵە و حیسابی بوون و نەبوونی بۆ ناکرێ ".

[٣٩] کوڕی پاشا لە وڵامی باوکیدا گوتی: "حاڵی بووم باوکە، دوای خەونێکی ئەوتۆ گەرەکتە من حەپس و دەسبەسەر بم. دەبێ بڵێم کە لە خەونەکەتدا شتێکی‌تریش هەیە و بیرت لێ‌نەکردۆتەوە و بەپێویستی دەزانم باسی بکەم. گوتت کە لە خەوندا دیتووتە من بە کەرستەیەکی ئاسنی وەک خەنجەر دەکوژرێم، باشە ئێستا خۆ قەرار نییە بۆ شەڕ بچم، ئیزنم پێبدە با بۆ ئەو ڕاوە بچم ".

[٤٠] کریسۆس گوتی: "کوڕم، لێکدانەوەی تۆ سەبارەت بە خەونەکە ڕاستترە، بۆیە بە قەناعەت گەیشتم و دەتوانی بۆ ئەو ڕاوە بەرازە بچی".

[٤١] کریسۆس کوڕەکەی نارد و بانگی ئادراستۆسی کرد و پێیگوت: "ئادراستۆس، من هیچکات سەبارەت بەو قەتڵەی لە دەستتدا قەوما، بە

تاوانبارم نەزانی. تۆم لە گوناهەکانت خاوێنکردەوە و ئاوی پاکم بەسەردا کردی. ڕێگام پێدای بێیە نێو بارەگاکەم و میواندارییم لێکردی و خەرج و مەخاریجی تۆم وەستۆ گرت. ئێستا بۆوەی وڵامی ئەو چاکەیەی من بدەیەوە، داوات لێدەکەم ئاگات لە کوڕەکەم بێ کە قەرارە لەگەڵ ئێوە بێتە ڕاو و شکار، مەبادا دز و ڕێگر بەهەڵکەوت پەلامارتان بدەنێ. جیا لەوەش، تۆ حەز دەکەی بە کردەوەکانت گرینگی و لێهاتوویی خۆت نیشان بدەی، چونکە ئەوە داب و نەریتی بنەماڵەکەتانە و دڵنیام لەو بارەوە خاوەن هێز و بەتوانای ".

[٤٢] سەبارەت بەو خواستەی پاشا، ئادراستۆس وڵامی دایەوە: "پاشا! لەهەر حاڵەتێکی‌تردا حازر نەبووم ئەرکێکی ئەوتۆ وەستۆ بگرم. کەسێکی وەک من کە بەبێ خواستی خۆی پیاوی لەدەستدا کوژرا، بۆوەی نابێ ئیزنی پێبدرێ لەگەڵ کەسانی هاوتەمەن و بەختەوەر هاوسەفەر بێ. هەرگیز گەرەکم نییە و زۆریش خۆم لەو خواستە بواردوە، بەڵام ئێستا کە جەنابت ئەو داوایەم لێدەکەی، دەبێ خاترت بگرم چونکە پێویستە منیش وڵامی چاکەی تۆ بدەمەوە. سەبارەت بەو داخوازییەی ئێوە چی لەدەستم بێت ئامادەم بیکەم و بە دڵنیاییەوە ئاگام لە کوڕەکەت دەبێ ".

[٤٣] ئادراستۆس دوای وڵامدانەوی کریسۆس، لەگەڵ دەستەی لاوانی هەڵبژێردراو و کۆمەڵێک سەگی دڕ وەڕێکەوتن. کاتێک گەیشتنە چیای ئۆلیمبوس لە ناوچەی میسیا، دەستیان بە پشکنینی وڵات کرد. بەدوای بەرازی گۆڕیندا گەڕان و هەرکە دۆزیانەوە، خێرا خەنجەر و نێزە بارانیان کرد. ڕاست لەو کاتەدا ئادراستۆس،[1] ئەو کابرایەی لە گوناهان پاککرابۆوە، بە نێزەی خۆی سێرەی لە بەراز گرتبوو و هاویشتی و بە هەڵە و بەبێ خواستی ئەو وەئاتیسی کوڕی کریسۆس کەوت.

بەو شێوەیە، بە ڤێکەوتنی ئەو نێزەیە، خەونی کریسۆس وەڕاستگەڕا. یەکێک لە ڕاوچییەکان بەغاردان بەرەو شاری سارد ڕایکرد، بۆوەی پاشا لە قەومانی ئەو ڕووداوە ئاگادار بکا.

---

١- ناتوانێ لەدەست چارەنووس ڕابکا، نێوچاوان ڕەش و بێبەختە.

[٤٤] کریسۆس بە خەبەری کوژرانی کوڕەکەی هەڵبەزییەوە و ناهومێدییەکی فرە دایگرت. پاشا پتر لەبەر ئەوە ناڕاحەت بوو کە ئەو کەسەی بە دەستەکانی خۆی لە گوناهانی پاککردبۆوە، ئێستا شازادەی کوشتوە. بە دەنگی بەرز بە کوڕەکەی و لیقەومانەکەی هەڵدەگوت و سەبارەت بەو رووداوە دڵتەزێنەی لەلایەن ئەو کابرایەوە تووشی هاتبوو و کاتی خۆی پەنای دابوو و میوانداری لێکردبوو و بەڵێنی لێوەرگرتبوو کە دۆستایەتی رەچاوبکا، خواوەند (دیا)ی بە شاهید دەهێنایەوە. خۆی بە تاوانبار دەزانی، چونکە کابرایەکی ئاوای رێگادابوو کە کوڕەکەی بکوژێ، بەبێ ئەوەی بیناسێ، کردبویە پارێزەری گیانی کوڕەکەی، باوەڕی پێکردبوو بێئەوەی بزانێ دوژمن و پیاوکوژە.

[٤٥] پاش ماوەیەک لیدیەکانیش گەیشتنەوە و جەنازەکەیان لەگەڵ خۆیان هێنابۆوە و بکوژی کوڕەش لەدواوە لەگەڵیان دەهات. کابرا لە حزووری تەرمی کوڕەکە وێستا و دەستەکانی بۆلای کریسۆس راداشت و داوای لە ناوبراو کرد، لەسەر جەنازەی کوڕەکەی سەری لێبدا و بیکوژێ. وەبیرهێنەرەوەی رەفتاری جاری پێشووی بوو و دەپاڕایەوە کە گەرەکی نییە لەوە زیاتر بژی، چونکە ببووە هۆکاری چارەڕەشی کەسێک کە خزمەتی پێکردبوو و پەنای دابوو. کریسۆس کاتێک گوێبیسی ئەو پاڕانەوەیە بوو، هەرچەند بکوژەکە خەراپییەکی زۆری دەرهەق کردبوو، بەزەیی بە کابرا داهات. کریسۆس پێیگوت: "کابرا لێت حاڵی بووم و بە قەناعەت گەیشتم، چونکە خۆت تاوانی کوشتنی کوڕەکەمت وەستۆگرت. تۆ هۆی ئەو نەهامەتییە نی، تۆ ئەو کارەت بەبێ مەیلی خۆت کرد، یەکێک لە خواکان چارەنووسی منی بەو شێوەیە دیاری کردوە ". کریسۆس تەرمی کوڕەکەی بە رێز و حورمەتەوە ناشت. ئادراستۆس، کوڕی غۆردیس، نەوەی میداس پاشا، براکوژ و قاتڵی خانەخوێی خۆی، کاتێک جەماوەر سەرقەبرانیان بەجێهێشت، لەبەر ئەوەی پێیوابوو چارەڕەشترین مرۆڤی ئەو جیهانەیە، لەسەر گۆڕی کوڕی پاشا خۆی کوشت.

[٤٦] کریسۆس دوو ساڵی ڕێک لە پرسەدا بوو و دەستی بۆ هیچ کارێک نەدەچوو. لەو نێوەدا فەرمانڕەوایی ئاستیاگی کوڕی خەشایارشا بە دەست کوروشی کوڕی کامبیز کۆتاییپێهات و هێز و دەسەلاتی پارسەکان پەرەیسەند.[١] لیدییەکان تازیەیان لەسەر کریسۆس هەلگرت و ناچاریان کرد حەول بۆ پێشگیری لە زێدەبوونی دەسەلاتی پارسەکان بدا و نەهێڵێ لەوە پتر گەشە بستێنێن. بەو بۆنەوە کریسۆس کۆتایی بە تازیەباری خۆی هێنا و بڕیاریدا نێوەندەکانی تاڵەبینی یۆنان و لیبی بەتاقی بکاتەوە. کۆمەڵێک ڕاسپاردەی بۆ دێلفوس و ئاڤیس لە هەرێمی فۆکیدۆس و دۆدۆنی نارد.[٢] چەند کەسێکیش لەو ڕاسپاردانە بەرەو نێوەندی پێشگۆیی ئەمفیارێئۆس[٣] لە ناوچەی ترۆفۆنیۆس[٤] و هەروەها فرانخیدا لە دەڤەری میلیتۆس چوون. ئەوانە چەند نێوەندێکی ئەستێرەناسی و پێشگۆیی یۆنانی بوون کە کریسۆس داوای پێشبینی لێکردبوون. هەروەک گوتم وەفدێکیش بەرەو پەرستگەی ئامۆنۆس لە لیبی وەڕێکەوت. کریسۆس بۆیە ئەو گشتە نوێنەرانەی بۆ نێوەندەکانی پێشگۆیی نارد، تا بزانێ زانایی و لێهاتوویی ئەوانە لە چ ئاستێکدایە و ئەگەر لەو بارەوە بەتوانا بن، ئەوجار سەبارەت بە پەلامار بۆ سەر پارسەکان پرسیان پێبکا.

[٤٧] کریسۆس بۆوەی لە ڕاستی و ناڕاستی ئامۆژگاری و پێشگۆیی ئەوپەرستگانە دڵنیا بێ، دەستووری بە ڕاسپاردەکانی لیدیاییدا، لەو ڕۆژەوە کە شاری سارد بەجێدەهێڵن، پێویستە حیسابی ڕۆژەکانیان لە زەیندابێ و ڕاست لە ڕۆژی سەتەمیندا چاویان بە پیتیا بکەوێ و ئەو پرسیارە بێننە

---

١- کوروش لەنێوان ساڵەکانی ٥٥٠ تا ٥٤٧ی پێشزایین دەسەلاتی خۆی بەسەر سەرتاسەری وڵاتی میدیادا سەپاند.

٢- دۆدۆنیس لە هەرێمی ئێپیر هەڵکەوتووە و شوێنی مانەوەی یەکێک لە کاهێنانی مەزنی خواوەند دیا (ژوپیتێر) بووە.

٣- هەمان پەرستگەی ناسراوی ئۆرۆپۆس و وێدەچێ لە شاری تیڤا بووبێ.

٤- پەرستگەی ترۆفۆنیۆس لە ناوچەی لیڤادیای هەرێمی ڤیئۆسییەکانە.

گۆڕێ : "هەر ئێستا کریسۆسی کوڕی ئالی‌ئاتیسی پاشای لیدی‌یەکان بە چکارێکەوە مژوڵە؟".

راسپاردەکان پێویست بوو وڵامی خۆیان بە نووسراوە بێننەوە. کەس نازانێ نێوەندەکانی‌تر چ وڵامێکیان بەو پرسیارە داوە. بەڵام، لە دێلفوس، راسپاردەکانی لیدیایی هەرکە وەژوور پەرستگە کەوتن و پرسیارەکەی کریسۆس‌یان هێنابەرباس، پیتیا بەو چەشنە وڵامی دانەوە:

"ژمارەی دەنکەکانی خیزەڵان و پانتایی بەحرەکان دەزانم. لە کەڕوالڵ و بێ زمان تێدەگەم و دەنگیان دەبیسم. هەستم بە بەرامەی کیسەڵی پشتڕەق کردوە کە لەنێو مەنجەڵی مس‌دا لەگەڵ گۆشت بەرخ دەکوڵێ. مس لەسەر و مس لەژێر."

[٤٨] لیدی‌یەکان، گوتەی پیتیایان نووسییەوە و بۆ شاری سارد گەڕانەوە. وەختێک گەیشتنەوە، راسپاردەکانی‌تریش بە کۆمەڵێک پێشگوویی و ئامۆژگارییەوە هاتبوونەوە. کریسۆس نامەکانی کردەوە و گشتیانی خوێندەوە. لە نێو پێشبینی‌یەکانی‌تردا، هیچکامیان سرنجی کریسۆس‌یان رانەکێشا، بەڵام هەرکە گوێی لە پێشگوویی نێوەندی دێلفوس گرت، خێرا دەستی بە دوعا و نوێژ کرد و ئامۆژگارییەکانی ئەوێی پەسندکرد، چونکە بە قەناعەت گەیی کە پێشبینی نێوەندی پێشگۆیی دێلفوس لە گشتیان راستترە. تەنیا ئەو شوێنە توانیبووی پێشگۆیی کردەوەکانی کریسۆس لەوکاتەدا بکا کە خۆی پرسیاری کردبوو. لەڕاستیدا کریسۆس دوای دەرێکەوتنی راسپاردەکان، گەرەکی بوو کارێک بکا کە هیچکەس بە خەیاڵیش نەتوانی بیری لێبکاتەوە. هەربۆیە لە رۆژی سەدومی پاش رۆیشتنی وەڤدەکان، خێرا کیسەڵێک و بەرخێکی سەر بڕی و گۆشتەکەیانی بەدەستەکانی خۆی لێکدا و لەنێو مەنجەڵی مسی ئاخنین و وەسەر ئاوری‌نان و سەری مەنجەڵیشی بە قەپاغی مس داپۆشی.

[٤٩] پێشگۆیی نێوەندی ئایینی دێلفوس ئەوە بوو کە باسم کرد. سەبارەت بە وڵامی نێوەندی تاڵەبینی ئامفیاریئۆ نازانم چ وڵامێکیان بە لیدی‌یەکان

دابۆوە، چونکە هیچ زانیارییەکی ئەوتۆ لەبەر دەستدا نییە، تەنیا ئەوەندە نەبێ کە کریسۆس ئامۆژگاری ئەو پەرستگەشی بەلاوە دروست بوو.

[٥٠] کریسۆس لەدرێژەدا، گەرەکی بوو قوربانییەکی زۆر پێشکەش بە خواکانی دێلفوس بکات و سێ هەزار سەر ئاژەڵی قوربانی سەر بڕێ. پاشان ژمارەیەکی بەرچاو لە تەختی خەو بە روکێشی زێڕ و زیو و پەرداخ و کاپ و جلوبەرگی سووری توندی حەقیق و شۆڕە و شتومەکیتری کۆکردەوە و هەرهەمووی ئاگر تێبەردا، بەو مەبەستەی کە بتوانێ دڵی خواکان لەخۆی رازی بکا. ناوبراو ئەوجار داوای لە دانیشتووانی لیدیایی کرد بەپێی توانا قوربانی پێشکەش بە خواکان بکەن. وەختێک رێورەسمی قوربانیکردن کۆتایی پێهات، کریسۆس فەرمانیدا بڕێکی زۆر زێڕ بتوێننەوە کە سەد و حەڤدە خشتی بچووک بە ئەستورایی یەک پەلام و درێژایی شەش پەلام و بەرینایی سێ پەلامیان لێدروست کردن.[1] لەو خشتە ئاڵتوونانە، چواریان لە زێڕی خالیس و قورسایی هەر کامەیان دەگەیشتە دوو تالاند[2] و نیو، ئەوانیتر تێکەلاوێک لە زێڕ و زیو بوون و هەرکامەیان کێشەکەیان بەرابەری دوو تالاند بوو. جیا لەوانە، کریسۆس فەرمانیدا یەک پەیکەرەی شێر لە زێڕی خالیس دروست بکرێت کە قورساییەکەی دە تالاند دەبوو. پایەی پەیکەرەی ئەو شێرە لە خشت سازکرابوو. کاتێک پەرستگەی دێلفوس ئاگری تێبەربوو،[3] پەیکەرەکە کەوتە خوارەوە و ئێستا لە خەزێنەی شاری کۆرینتۆ پارێزراوە و کێشەکەی دەگاتە شەش و نیو تالاند. باقی سێ و نیو تالاند زێڕەکەیتر لە ئاگرەکەدا توابۆوە.

[٥١] وەختێک داخوازییەکانی کریسۆس بەجێگەیشتن و کەرستەکان دروستکران، لەگەڵ کۆمەڵێک ئەشیای قیمەتی دیکە بۆ نێوەندی ئایینی دێلفوس بەرێکراڵ کە بریتی بوون لە: دوو دانە کراتیر (خومرە، کووپەی

---

١- پەلام، پێوانە بۆ درێژایی و بەرینایی کورت، بستی پیاو.

٢- تالاندی یۆنانی ٢٦ کیلۆگرەم، میسری ٢٧ کیلۆگرەم، بابیلی ٣٠.٣ کیلۆگرەم و رۆمی ٣٢.٣٠ کیلۆگرەم بووە.

٣- ساڵی ٥٤٨ی پێش زایین قەوماوە.

گەورە)، یەکیان دروستکراو لە زێڕ و دووهەمیشیان لە زیو. کراتیری یەکەم لەلای راستی درگاپەرستگە دامەزراوە و ئەوەی زیویش لەلای چەپەوە داندراوە. کاتێک پەرستگە ئاگری تێبەربوو، ئەو کراتیرانە جێگۆڕکێیان پێکرا، ئەوەی زێڕ لە خەزێنەی کلازۆمێنیۆ پارێزراوە و قورساییەکەی دەگاتە هەشت و نیو تالاند و دوازدە منا.[1] بەڵام ئەوەی زیو لە گۆشەیەکی بەرهەیوانی پەرستگە داندراوە و قەیاسی شەش سەد ئامفور ئاودەبا[2]. ئەوەیان ناسراوە، چونکە دانیشتوانی دێلفوس بۆ تێکەڵکردنی ئاو و شەراب و لە جێژنی تیئۆفانییۆن[3] کەڵکیان لێوەرگرتووە. لە دێلفوس دەڵێن کە وەستاکاری ئەو بەرهەمە گەورەیە، کەسێکە بە ناوی تیئۆدۆر لە دوورگەی سامۆس و منیش هەر لەو باوەڕەدام. چونکە بەلای منەوە شاکارێکە و دروست کردنی کاری هەرکەسێک نییە. کریسۆس هەروەها چوار خومرەی زیویشی ناردە پەرستگە

کانی دێلفوس کە ئێستا لە خەزێنەی کۆرینتۆ پارێزراون. دوو دانە زەرفی پێرپیاندیریا،[4] ئاوپرژێنی پیرۆز، یەک لەوانە زێڕ و ئەوەی‌تریش زیوە. لەسەر زێڕەکە نووسراوێک هەیە کە نیشان دەدا لەلایەن لاکێدێمۆنی‌یەکانەوە پێشکەش‌کراوە، کە دیارە دروست نییە و ئەوەشیان خەڵاتی کریسۆس خۆیەتی. ئەو نووسراوەیە لەلایەن یەکێک لە دانیشتووانی دێلفوس نووسراوە بۆوەی بەلای لاکێدێمۆنی‌یەکانەوە خۆی خۆشەویست بکا. من ناوی ئەو کەسە ناهێنم. خەڵاتی لاکێدێمۆنی‌یەکان پەیکەرەی ئەو مناڵەیە کە لە دەستی ئاو دەڕژێتەخوار و پێویستە ئەوەش بڵێم کە هیچکام لە حەوجۆشەکانیش هی

---

١- پێوەر بۆ قورسایی و بەپێی ناوچە جیاواز بووە و نیزیک بە ٦٠٠ تا ٦٣٧ گرەم بەراورد کراوە.

٢- ئامفور، گۆزەی هەنگڵدار، ١٩ لیتر ئاوی بردوە.

٣- جێژنی ئایینی یۆنانییەکانی سەردەمی باستان لە نیوەندی پیرۆزی دێلفوس بەڕێوە چووە. ئەو جێژنە لە سەرەتای وەرزی بەهاردا بەبۆنەی گەرانەوەی خواوەند ئاپۆلۆن پیرۆزکراوە. وەک خوای خور سەیری ئاپۆلۆن‌یان کردوە. ئاپۆلۆن ماوەیەک بۆ وڵاتانی باکوور چووە و لە بەهاردا گەڕاوەتەوە و بە گزینگی خۆی وڵاتی رۆشن کردوە و گەرما و رووناکی و شادی بە وڵات بەخشیوە.

٤- حەوجۆش.

ئەوان نین. کریسۆس گەلێک ئەشیای بەبەهای تری پێشکەش کردوە، بەبێ ئەوەی ناوی خۆی لەسەر نووسیبن، وەک چەند لەگەنێکی زێو، پەیکەرەی بچووکی ژنێک بە بەرزی سێ پیخیس[1]، کە ئەوانەش لەگەڵ ئەو کەرستە قیمەتی‌یانە بوونە. دانیشتووانی دێلفوس لەو باوەڕەدان ژنە، نانکەری تایبەتی کریسۆس بووە.[2] کریسۆس جیا لەوانە چەند ئەشیای بەنرخی‌تریشی پێشکەش بە پەرستگەکانی دێلفوس کرد، وەک کۆمەڵێک ملوانکە و دەستبەند و کەمەرە کە گشتیان هی ژنەکەی بوون.

[٥٢] ئەوانەی باسم لێوەکردن، کۆمەڵێک دیاری کریسۆس بۆ نێوەندەکانی پیرۆزی دێلفوس بوون. سەبارەت بە پەرستگەی ئامفیاریۆئۆس،[3] کریسۆس گوێبیسی لێهاتوویی و بوێری و زانایی ئەو پاڵەوانە بوو، بە مەبەستی ڕێزگرتن، یەک مەتاڵ و نێزەیەکی درێژ،[4] کە هەردووکیان لە زێڕی خالیس دروستکرابون، پێشکەش کرد. ئەو دوو خەڵاتەش ئێستا لە پەرستگەی ئیس‌مینیۆ ئاپۆلۆنۆس لە شاری تیڤا ماون.

[٥٣] کریسۆس فەرمانی بە لیدی‌یەکانی هەڵگری دیارییەکان بۆ ئەو دوو نێوەندە تاڵەبینی‌یەدا کە داوای پێشگۆیی لەمەر لەشکرکێشی بۆ سەر پارسەکان بکەن. هەروەها بزانن کە پێویستی بە هاوپەیمانی لەگەڵ کەسانی‌تریش لەوبوارەدا هەیە یان نا؟ کاتێک راسپاردەکان گەیشتنە ئەو نێوەندانە، سەرەتا دیارییەکانیان پێشکەش کرد و ئەوسا داوای پێشگۆییان بەو شێوەیە کرد: "کریسۆس، پاشای لیدی‌یەکان و گەلانی‌تر، پێیوایە کە ئێوە

---

١- پیخیس یا ئانیشک، ٤٤.٤ سانتی‌میتر یا ٤٤٤ میلیمیتر.

٢- ئەوە هەمان ئەو ژنە نانکەرەیە کاتێک زڕدایکی کریسۆس داوای لێدەکا دەرمان لەنێو نان بکا و دەرخواردی کریسۆسی بدا. ژنە خێرا کریسۆس لەو پیلانە ئاگادار دەکاتەوە و گیانی ئەو رزگاردەکا.

٣- ئامفیاریۆئۆس، پیاوێکی پیرۆز و زانا، بەبێ خواستی خۆی لەگەڵ چەند قارەمانی‌تر لە شەڕێکی براکوژیدا بەشدار بوو. لەو شەڕەدا حەوت قارەمان و پاڵەوان قەستی کوشتنی تیڤایان کرد. خواوەند ژوپیتێر بۆوەی ئامفیاریۆئۆس رزگاربکا، بە بروسک زەوی بەردەمی ناوبراوی قەڵاشت. زەوی ئامفیاریۆئۆسی هەڵلووشی و قووتی‌دا و بەو شێوەیە ژیانی نەمری بە ناوبراو بەخشی.

٤- مەبەست نێزەی قەدیمی دوو سەر بووە.

باوەڕپێکراوترین نێوەندی پێشگۆیی لە جیهاندان. دیاری بە نرخی پێشکێش کردون و ئێستاش داواتان لێدەکات ئەگەر مەسلەحەت بێ دژی پارسەکان لەشکرکێشی بکا و ئایا لەو بوارەدا پێویستی بە هاوپەیمان هەیە یان نا؟ ".
ئەوە پرسیاری راسپاردەکان بوو و هەردوو نێوەندی تاڵەبینی، وڵامی هاوشێوەیان بە کریسۆس دایەوە: ئەگەر هێرش بکاتە سەر پارسەکان، ئیمپراتۆرییەکی مەزن و بەهێز لەنێو دەبات. پێشنیار ئەوەیە کە هەوڵ بدا بەهێزترین یۆنانییەکان بکاتە هاوپەیمانی خۆی.

[٥٤] وەختێک وڵامی تاڵەبینەکان بە کریسۆس گەیشت، ئێجگار خۆشحاڵ و رازی بوو. هومێدوار بوو کە دەتوانێ پاشایەتی کوروش بڕوخێنێ. ئەوجار پیاوەکانی خۆی دووبارە ناردەوە نێوەندەکانی دێلفوس. هەڵبەت پێشەکی ژمارەی دانیشتووانی ئەو شوێنەی پرسیبوو، بۆیە بۆ هەر دانیشتوویەک دوو ستاتیری[1] زێڕی وەک دیاری بە راسپاردەکاندا نارد. دانیشتووانی دێلفوس، لەمەر پێزانن بەو خەڵاتانە و وڵامدانەوەی چاکەی کریسۆس و لیدییەکان، سێ هەنگاویان نایەوە: یەکەم هەنگاو ئەوە بوو کە کریسۆس و لیدیەکان هەرکات بخوازن، بۆیان هەبوو بەر لە خەڵکانیتر چاویان بە پیتیا بکەوێ و پرسیاری لێبکەن. دووهەم هەنگاو لابردنیماڵیات و خەراج لەسەر لیدییەکان بوو کە دەبوایە پێشکەش بەو نێوەندە بکەن. سێهەم هەنگاویش بەخشینی مافی دانیشتن لە ریزەکانی پێشەوە بە لیدییەکان لەکاتی بەڕێوەچوونی رێورەسمە ئایینییەکان بوو.

[٥٥] دوای پێشکەش کردنی ئەو خەڵاتانە بە نێوەندی دێلفوس، کریسۆس بۆ جاری سێهەم داوای پێشگۆیی کرد. چونکە لەو کاتەوە کە وڵامی دروستی لە نێوەندی تاڵەبینی وەرگرتبوو، بەلایەوە دیارییەکی بەنرخ بوو. ئەوجار پرسیاری لە نێوەند کرد ئاخۆ خانەدانی پاشایەتی کریسۆس ساڵانێکی فرە فەرمانڕەوایی دەکەن یان نا؟ پیتیا وڵامی ئەو پرسیارەی بەو شێوەیە داوە:

---

١- پارەی سەردەمی یۆنانی باستان، بەرابەری ٢ تا ٤ دراخم یا درهەم نرخی هەبووە.

*"کاتێک هێستر بوو بە پاشای میدیا، ئەوکاتە تۆی لیدیایی بەپێخاوسی لە نیزیک شاری ئێرمۆ بەسەر خیزەڵاندا هەڵێ، نەکەی راوەستی و شەرم بتگرێ و وەک کەسێکی ترساو خۆت نیشان بدەی".*

[٥٦] کریسۆس هەرکە ئەو پێشگۆییەی پێگەیی، پتر لە پێشوو خۆشحاڵ بوو. هەڵبەت ئەو دڵنیابوو کە هیچکات هێستر لەجیات مرۆڤ نابێتە پاشای میدییەکان و جیا لەوەش، ئەو خۆی دەیزانی کە نە خۆی و نە نەوەکانی قەرار نییە بەردەوام لەسەر دەسەڵات بمێننەوە.

کریسۆس ئەوجار هەولیدا کە بزانێ کام هۆزی یۆنانی بەهێزترە بۆوەی قەراری هاوپەیمانی لەگەڵ ببەستێ. لە لێکۆڵینەوەکانڕا بۆی دەرکەوت لاکێدیمۆنییەکان بە رەچەڵەک دووری و ئاتێنییەکان بە رەگەز یوونی بەوەجترینن. هەردوو لایەنیش ساماندارتر لە هۆزەکانیترن. ئاتێنییەکان و لاکێدیمۆنییەکان کۆنترین رەچەڵکی یۆنانین. ئاتێنییەکان هیچکات جێگۆڕکێیان نەکردوە و کۆمەڵی دووهەمیش بەپێچەوانەوە بەردەوام گەڕۆک بوونە.

لاکێدیمۆنییەکان لە سەردەمی پاشایەتی دێڤکالیۆن،[1] لە هەرێمی فتیۆتیدا[2] جێگیر بوونە و وەختێکیش دۆرۆس کە کوڕی ئێلینۆس[3] بوو و هاتووەتە سەر دەسەڵات، لە ناوچەکانی دەوروبەری ئۆسا[4] و ئۆلیمبوو نیشتەجێ بووە و پێیگوتراوە ئیستیئێئۆتیس. کادمییەکان ئەو پاشایە و خەڵکەکەیان لەو شوێنانە دەرکردوە و بۆیە چوونەتە ناوچەی پیندۆس[5] و ناوی مەقدونییان لەسەر داندراوە. ئەوانە لەوێشەوە رۆیشتوونە بۆ دریئۆپیدا[6] و دوایی لەوێڕا هاتوونەتە پێلۆپۆنیسۆ و ناوی (دووری)یان لەسەر داندراوە.

---

١- پاشای تیسالییەکان لەسەردەمی باستاندا.

٢- مەبەست هەمان فتیۆتیدا، لە باشووری رۆژهەلاتی تیسالییە.

٣- ئێلینۆس، کوڕی دێڤکالیۆن

٤- ئۆسا، یەک لە چیا ناسراوەکانی هەرێمی تیسالی.

٥- شارێکی دووریەکان لە دەڤەری پارناسۆس.

٦- ئەوە هەمان ناوچەیە کە دواتر بوو بە بەشێک لە وڵاتی دووریەکان.

[٥٧] پێلاسغی‌یەکان بە کام زمان قسەیان کردوە، بەداخەوە من ناتوانم زانیارییەکی ئەوتۆ بێنمە بەرباس. ئەگەر کەسێک گەرەکی بێ بزانێ کە پێلاسغی‌یەکان خاوەن کام زمان بوونە، پێویستە لەسەر ئەو کۆمەڵە پێلاسغی‌یانە توێژینەوە بکا کە هێشتا ماون. واتە ئەوانەی لە شاری کرۆتونا دەژین. شاری کرۆتونا لە باکووری ناوچەی تیری‌نییاس هەڵکەوتووە.[١] ئەو پێلاسغی‌یانە رۆژگارێک دراوسێی دووری‌یەکانی ئەمرۆ[٢] و لە تێسالیۆتیدا[٣] نیشتەجێ‌بوونە. هەروەها پێویستە لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو پێلاسغی‌یانە بکرێ کە لە هەرێمی ئێلیس‌پۆندۆس، شارەکانی پلاکیا و سکیلاکی‌یان بنیات‌ناوە و سەردەمێکیش لەگەڵ ئاتێنی‌یەکان ژیاون. گەرەکە ئاوڕێکیش لەو شارانە بدرێتەوە کە پێلاسغی‌یەکان دروستیان کردون و ناوەکانیان گۆڕاوە، ئەوسا مرۆڤ بە قەناعەتێک دەگا کە زمانی پێلاسغی بەربەری بووە. ئەگەر ئاوای‌دابنێین کە تەواوی پێلاسغی‌یەکان خاوەن یەک زمان بوونە، دەبێ رەگەزی ئەتیکی (ئاتێنی) کە لە ئەسڵدا پێلاسغی بووە، زمانی یۆنانیش فێربووبێ. چونکە نە کرۆتۆنی‌یەکان و نە پلاکی‌یەکان بەو زمانە لەگەڵ دراوسێکانی خۆیان قسەناکەن و هەردوکیان خاوەن یەک زمانی هاوبەشن. ئەوە بەڵگەیەکە کە نیشان دەدا پێلاسغی‌یەکان زمانی سەردەمی کۆچکردن و جێگۆڕکێ کردنیان پاراستوە.

[٥٨] من لەو باوەڕەدام کە نەتەوەی یۆنانی بەردەوام بەو زمانە قسەی کردوە کە ئەمرۆ پێی‌دەدوێ. کاتێک لە پێلاسغی‌یەکان دابڕاوە،[٤] سەرەتا بچووک و بێ‌هێز بووە، دواتر پەرەی ئەستاندوە و زۆربەی گەلانی‌تری هێناوەتە ژێر

---

١- مەبەست لە دانیشتووانی ناوچەی تیری‌نییاس، هۆزەکانی ئێتروسکی‌ین.

٢- هۆزەکانی یۆنانی سەرەتا، واتە ئەوانەی •هەرێمی پێلۆپۆنیسوس‌یان داگیرکرد و دەوڵەتی سپارت‌یان دامەزراند.

٣- ئەوە هەمان ئەو شوێنەیە کە پێلاسغۆتیداشی پێدەگوترێ و لە باکووری رۆژهەڵاتی هەرێمی تێسالی هەڵکەوتووە. لەو سەردەمەدا شارێک لێرە هەبووە بەناوی غیرتۆنی کە پێتەختی کرۆتۆنی بووە.

٤- ئەو رووداوە کاتێک قەوماوە کە منداڵانی دیۆکالیۆن لە فتیۆتیدا رۆیشتوون. ئەو شوێنە دراوسێی دراوسێی هەرێمی تێسالی و ناوچەی نیشتەجێیی هۆزەکانی پێلاسغی بووە.

دەسەڵاتی خۆی، بەتایبەت ئەو کاتەی ژمارەیەکی بەرچاو گەلانی بەربەر و پێلاسغی تێکەڵاویان بوونە. من هەروەها پێموایە هیچکام لە گەلانی پێلاسغی کە زمانی بەربەرییان بووە، نەیتوانیوە پەرەبستێنێ و بەهێز بێ.

**[٥٩]** بەپێی زانیارییەکانی بە کریسۆس گەیشت، هۆزەکانی ئەتیکی (ئاتێنییەکان) لەسەردەمی پاشایەتی پیسیستراتوسی[١] کوڕی ئیپۆکراتۆس تووشی شەڕی نێوخۆیی بوونە. ناوبراو وەک جارێکیان ئیپۆکراتۆس وەک شارۆمەندی ئاسایی دەچێتە سەیرکردنی کێبەرکێکانی ئۆلیمپیک. لەوێ تووشی ڕووداوێکی سەرسوڕهێنەر دەبێ.

ئیپۆکراتۆس پاش ئەوەی ئاژەڵەکانی قوربانی یەکیەک بۆ خواکان سەردەبڕێ و لەتوپەتیان دەکا. ئەوجار گۆشتەکە لەنێو چەند مەنجەڵێک دەخا دەی و ئاویان دەباڵ دەکا. مەنجەڵەکان بەبێ هیچ ئاگرێک قوڵتەیان وێدەکەوێ و دەکوڵێن و هەڵدەچن. خیلۆنۆسی لاکێدیمۆنی[٢] ئەودەمە بەهەڵکەوت لەوێ دەبێ و چاوی بەو عەجایباتە دەکەوێ. ناوبراو پێشنیار بە ئیپۆکراتۆس دەکا کە هیچکات لە ژیانیدا ژن نەهێنێ و ئەگەریش ژیانی هاوبەشی دامەزراند، نەهێڵێ ژنەکەی ئاوس بێ. ئەگەریش منالی هەیە خێرا دەریبکا و لەخۆی دوور بخاتەوە. ئەگەر هاتوو منالێکیش بەڕێوەبێ، بێدەنگی لێبکا و بیشێرێتەوە.

ئیپۆکراتۆس گرینگی بە ئامۆژگارییەکانی خیلۆنۆس نادا و دواتر بووەتە خاوەن کوڕێک و ناوی ناوە پیسیستراتۆس. وەختێک ئاتێنییەکانی دانیشتووی قەراخ بەحر تووشی شەڕی ناوەخۆیی لەگەڵ خەڵکی دەشتایی هاتوون ـ

---

١- پیسیستراتۆس سالی ٥٦١ی پێش زایین لە یۆنان بەدەسەلات گەیشت و لە سالەکانی ٥٥٥ و ٥٥٦ ی پێشزایین بەهۆی خانەدانی ئالکمێنۆس لە یۆنان دەرکرا و رووی لە شاری ئێڤڤیا کرد. ناوبراو سالی ٥٥٠ی پێش زایین ئەو شارەی جێهێشت و سالی ٥٢٧ی پێش زایین مرد. پیسیستراتۆس پشتیوانی شاعیر و نووسەران بوو و وەک یەکەم کەس شێعرەکانی هۆمێری بلاوکردەوە.

٢- خیلۆنۆس یەکێک لە حەوت کەسی "ردێن سپییەکانی ماقول"ی هۆز بوو.

ساحیلی‌یەکان میغاکلیس کوڕی ئالکمینۆس[1] وەک ڕێبەری خۆیان دیاری‌دەکەن و هۆزی دووهەمیش لیکورغۆسی[2] کوڕی ئاریستۆ لائیدی دەکەنە سەرکردەیان. ئەو کوڕە، واتە پیسی‌ستراتۆس بیری لە وەدەست خستنەوەی دەسەلات کردەوە و دەستەی سێهەمی دامەزراند. پیسی‌ستراتۆس توانی کۆمەڵێک لاینگر کۆبکاتەوە و بە گفتگۆ چیانشینەکان بە قەناعەت بگەیێنێ. ئەو بۆ گەیشتن بە ئامانجەکەی دواتر بەو چەشنە جولاوە. سەرەتا خۆی و هێسترەکانی بریندار کرد و بە فایتوون گەیشتە بازاڕی شار و هاواری کرد کە ویستوویەتی سەردانی مووچە و مەزراکانی بکا و لە ڕێگادا هەڕەشەی کوشتنی لێکراوە و لەدەست دوژمن رایکردوە. داوای لە حاکمی شار کرد کۆمەڵێک پاسەوانی بداتێ و خەڵک بە هاوارییەوە بچن و ئەوەشی وەبیر ئاتێنی‌یەکان هێناوە کە لەسەردەمی خۆیدا جوامێرانە دژی میغاری‌یەکان[3] شەڕی کردوە، چونکە ئەوان دەستیان بەسەر شاری نیسیا داگرتبوو و ئێجگار خەراپ لەگەڵ خەڵک هەڵسوکەوتیان کردبوو. حاکمی ئاتێنی‌یەکان فریوی خوارد و مافی ئەوەی پێدا کە پیسی‌ستراتۆس سێ سەد کەس لە خەڵکی شار هەڵبژێرێ. ئەوانە نەک وەک نێزەدار، بەڵکوو چەشنی تاقمێکی گۆپاڵ‌بەدەست و گوێ بە فەرمانی پیسی‌ستراتۆس بوون و لە جیات نێزە گورز و گۆپاڵیان پێبوو.[4] دواتر، ئەو تاقمە گۆپاڵدارە بە حوکمی ناوبراو ڕاپەڕی و قەڵای شار واتە ئاکرۆپۆلیسی داگیرکرد. پیسی‌ستراتۆس کاتێک حوکمڕانی شاری ئاتێنی بەدەستەوە گرت، هیچ قانوون و یاسا و دەزگایەکی ئیداری نەگۆڕی. پیسی‌ستراتۆس بە هەموو توانایەوە لەو

---

١- ئالکمینۆس، سەرۆک و گەورەی یەکێک لە مەزنترین بنەماڵەکانی یۆنانی باستان، ناسراو بە خانەدانی ئالکمینۆسی بوو.

٢- لیکورغۆس، وێژەرێکی ناسراوی یۆنانی باستان لە سەدەی چواری پێش‌زاییندا بووە. هەڵبەت یاسازانێکیش هەر بەو ناوە هەبووە.

٣- ئەو هۆزانەی لە ناوچەی کاناڵی کورینتۆ دەژیان.

٤- ئەوانە پاسەوانیان لە ئەفسەرانی حکوومی دەدا. ئەوانەی نێزە بەدەست پاسەوانی شا و شازادە و کەسایەتییەکانی ناسراو بوونە.

شاره خەریکی فەرمانڕەوایی بوو و ڕێزی لە یاساکان گرت و بەوجۆرەی نووسرابوون، بەڕێوەی بردن.

[٦٠] پاش ماوەیەک لایەنگرانی مێغاکلیس و لیکورغۆس پێکهاتن و پیسیستراتۆس‌یان وەدەرنا. ئەوە باسی پیسیستراتۆس بوو کە بۆ یەکەمجار دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت و بێ ئەوەی هێشتا جێیگرتبێ، حوکمڕانییەکەی لێڕووخا. ئەوانەی ناوبراویان وەلانا، خۆشیان پاش ماوەیەک تووشی کێشەی نێوخۆیی هاتن. مێغاکلیس بەدەست ناراحەتییەکانی دەروونی خۆی ئازاری دەکێشا و هەستی بە ماندوویی دەکرد، بۆیە لایەنگرەکانی لێیوەرسوڕانەوە و ئەویش ناچاربوو رووی لەلای پیسیستراتۆس بکا. ناوبراو پێشنیاری بە پیسیستراتۆس کرد ئەگەر بگەڕێتەوە سەر دەسەڵات، کچەکەی خۆی لێ مارە دەکات و پشتی دەگرێ. پیسیستراتۆس بۆوەی لە ئاوارەیی رزگاری بێ، ئەو پێشنیارەی پەسندکرد و پێکهاتن. پیسیستراتۆس بۆوەی بتوانی بێتەوە نێو شاری ئاتێن، حیللەیەکی سەیری دەکارکرد. بەربەرەکان لە قەدیمەوە یۆنانییەکانیان وەک مرۆڤی وشیار و زانا و بەئەزموون دەناسی، بەڵام بەو رووداوەی دوایی بۆیان دەرکەوت ئەوەندەی گەلێکی وشیارن، هێندەش کەمتەرخەم و کەمتەجرەبە و خۆشباوەڕن. ئەو فێڵبازییەی پیسیستراتۆس دژی ئاتێنییەکان بەڕێوەیبرد، واتە دژی ئەوانەی کە وشیارتر لە باقی یۆنانییەکانیتر بوون، من و خەڵکانیتری تووشی شک و گومان کرد.

ئەو حیللەیە بەو شێوەیە باسکراوە: لە ناوچەی پێئانیاس ژنێک دەژیا کە ناوی فیئا بوو. بەژنی چوار پیخیس[1] و سێ پەنجە و گەلێک جوان بوو. مێغاکلیس و پیسیستراتۆس جلوبەرگی جەنگییان لەبەر ئەو ژنە کرد. ژنە سواری فایتوون بوو و دوای ئەوەی پێیگوترا کە دەبێ چبکات و چۆن بەپێوە راوەستێ، بۆوەی باڵابەرزتر بەرچاو بکەوێ، بەرەو شاری ئاتێن بەڕێکرا. ئەوانە پێشتریش جارچی و پێشقەراوڵیان ناردبووە شار. جارچییەکان بەپێی فەرمانێک کە پێیاندرابوو، هاواریان دەکرد: "ئەی خەڵکی

---

١- پیخیسی سەردەمی باستان بەرابەری ٤٦ سانتیمیتر بووە.

ئاتێن! وەرن پێشوازی لە پیسیستراتۆس بکەن کە خواوەند ئاتینا[1] پتر لە هەرکەسیتر ڕێز و حورمەتی بۆ دادەنێ خەریکە بیباتە قەڵای خۆی ".
جارچییەکان بەو شێوەیە جاڕیاندا و خێرا ئەو دەنگۆیە لە ناوچەکانی دەوروبەری شاری ئاتێن بڵاوبۆوە کە خواوەند ئاتینا پیسیستراتۆسی بردوەتە ئاکرۆپۆلیس (قەڵای شار) و دانیشتوانی هەرێمەکە قەناعەتیان هێنا کە ئەو ژنەی سەر فایتوونەکە هەمان خواوەند ئاتینایە. ئاتێنییەکان لە بەرامبەر ئاتینا(ژنەی سەر فایتوون) سەری کڕنۆشیان دانەواند و پێشوازییان لە هاتنی پیسیستراتۆس کرد.

[٦١] پیسیستراتۆس دوای ئەوەی بەو فێڵبازییە حکوومەتی دووبارە دەسکەوتەوە، لەمەر ئەو پەیمانەی لەگەڵ مێغاکلیس بەستبووی، کچی ناوبراوی لەخۆی مارەکرد.

منداڵەکانی پیسیستراتۆس لە ژنی یەکەم و دووهەمی، گەورە بوون و ناوبراو ئیتر گەرەکی نەبوو لە ژنی تازە (کچی مێغاکلیس) ببێتە خاوەن منداڵیتر و هەروەها پێوەندییەکی نایاسایی لەگەڵ ئەو ژنە ڕاگرتبوو. دەگێڕنەوە کە خواوەند هۆزی ئاڵکمیئۆنیدی بەلەعنەت کردوە، بۆیە نەفرەتێکی فرەیان لەنێو دڵی خۆیاندا شاردوەتەوە.

ژنە سەرەتا ئەو ڕازەی شاردەوە، بەڵام دواتر خۆی ئاشکرای کرد یا ناچاریان کرد ئاشکرای بکا، لەهەرحاڵدا نهێنی ژیان و گوزەرانی خۆی لای دایکی باسکرد و ئەویش بۆ باوکی کچەی گێڕاوە. باوکی کچە واتە مێغاکلیس بەو خەبەرە گەلێک تێکچوو و پێیوابوو پیسیستراتۆس نیهایەتی بێحورمەتی پێکردوە و بۆیە خێرا لەگەڵ نەیارانی پیسیستراتۆس کەوتە ڕاوێژ و پێوەندی سازکردن. پیسیستراتۆس بەو هەوڵەی مێغاکلیسی زانی و هەستی کرد پیلانێک دژی ئەو بەڕێوەیە. بەپەلە ناوچەی ئەتیکی بەجێهێشت و ڕووی لە

---

١- خواوەندی هزر لە یۆنانی باستان.

دەڤەری ئێرێتریا[1] کرد و لەوێ کۆبوونەوەیەکی لەگەڵ کوڕەکانی خۆی سازکرد. بۆچوونەکانی ئیپیاس[2] لەمەر وەدست خستنەوەی دەسەڵات، پتر جێگای پەسند بوون و هەربۆیە بۆ جێبەجێ کردنی پێشنیارەکانی ئەو داوای یارمەتی ماڵی لەو ناوچانە کرا کە هێندێک قەرزدار بوون. جەماوەرێکی فرە بەدەنگیانەوە هاتن و پارەیەکی زۆریان پێشکەشکرد. دانیشتووانی ناوچەی تیڤیا[3] زۆرترین یارمەتیان بەڕێکرد. بۆوەی زۆری لەسەر نەڕۆیشتبم، کاتێک وەختی حەڕەکەت هات، گشت لایەک بەرەو شاری ئاتێن خۆیان سازکردبوو.

لە ناوچەی پێلۆپۆنیسۆس، ئارغۆسی‌یەکانی موچەخۆر و بەکرێگیراو هاتن، لە دورگەی ناکسۆس[4] کەسێکی خۆبەخش بەناوی لیغدامیس بە پارە و لەشکرەوە خۆیگەیاندێ.

[٦٢] دوای یازدە ساڵ ئاوارەیی، پیسی‌ستراتۆس لەگەڵ هێزی لەشکری لە ناوچەی (ئێرێتریا)وە وەڕێکەوتن و گەیشتنە ناوچەی ئەتیکی. سەرەتا دەڤەری (ماراتۆن)یان گرت.[5] کاتێک لەوێ ئۆردویان لێدا، ژمارەیەک لە ناڕازی و خەڵکی شاری ئاتێن و دەوروبەر هاتن و تێکەڵیان‌بوون. هەروەها لە جوتیارانی ناوچەکانی دەوروبەریش کە دیکتاتۆریان لەو چەشنە ئازادییەی هەیانبوو، بەلاوە گرینگتر بوو، روویان لە هێزەکانی پیسی‌ستراتۆس کرد. لە تەواوی ئەو ماوەیەدا کە پیسی‌ستراتۆس خەریکی کۆکردنەوەی پارە و هێزی لەشکری بوو، ئاتێنی‌یەکان گرینگییەکی ئەوتۆیان بە هەڵسوکەوتەکانی ناوبراو نەدا، تەنانەت کاتێک کە دەڤەری ماراتۆنیش کەوتە دەست هێزەکانی پیسی‌ستراتۆس، ئەوان باوەڕیان نەدەکرد. بەڵام وەختێک خەبەریان پێگەیی کە هێزەکانی پیسی‌ستراتۆس لە ماراتۆن‌ڕا بەرەو شاری ئاتێن بەڕێوەن، بڕیاریاندا دژی

---

١- یەکێک لە شارەکانی.دورگەی ئێڤـڤیا، هەڵکەوتوو لە بەرامبەر کەنارە ئاوییەکانی نیمچە دورگەی ئەتیکی.

٢- کوڕە گەورەی پیسی‌ستراتۆس

٣- پێتەختی کۆنی هەرێمی ڤیئۆسی لە یۆنانی باستاندا.

٤- یەک لە دورگە گەورەکانی یۆنان.

٥- دەشتێکی ناسراو هەڵکەوتوو لە رۆژهەڵاتی شاری ئاتێن.

راوەستن. ئاتێنییەکان شەڕێکی بەربڵاویان ڕاگەیاند بۆوەی بەرپەرچی پەلاماری هێزەکانی پیسیستراتۆس بدەنەوە، لایەنگرانی ناوبراو دژی ئاتێنییەکان وەخۆکەوتن. زۆری نەخایاند هێزەکانی پیسیستراتۆس گەیشتنە نیزیک مەعبەدی ئاتینا لە ناوچەی پالیندۆس و لەوێوە پەلاماریان دەستپێکرد. تاڵەبینێک بەناوی ئامفیلیتۆس خەڵکی ئاکارنانییا[1] لەو شوێنە هاتەلای پیسیستراتۆس و بە ئامۆژگارییەکی شێوە شێعری ئەو سەردەمە، بە ناوبراوی گوت:

*"تۆڕی ماسیگری هاوێژران، تۆڕ بڵاو بۆوە، باقۆکان لە مانگەشەوی ڕووناکدا پێوەدەبن."*

[٦٣] ئەوە پێشگۆیی ئامفیلیتۆس[2] بۆ پیسیستراتۆس بوو. ناوبراو لەو ئامۆژگارییانە حاڵی بوو و ڕایگەیاند کە گشتی قبوڵە و فەرمانی بە لەشکردا داخڵی نێوشار بن. خەڵکی شار لەوکاتەدا خەریکی ژەمی نیوەڕۆ بوون و ئەوانەش کە تەواو ببوون، کایەی تاس هاویشتنیان دەکرد و بەشێکیش خەوتبوون. سەربازەکانی پیسیستراتۆس خەڵکیان تووشی سەرسوڕمان و هەڵبەزینەوە کرد. کاتێک ئاتێنییەکان ڕوویان لە هەڵاتن کرد، پیسیستراتۆس فکرێکی باشی کردەوە بۆوەی پێش بە ڕاکردنیان بگرێ و بڵاوەشیان پێبکا. خێرا بە کوڕەکانی خۆی گوت کە سواری ئەسپەکانیان بن و خۆیان بگەیێننە خەڵکی فیرار و پێیان بڵێن کە پیسیستراتۆس نە پێویستی بە یارمەتی ئەوانە و نە کاریشی بەسەریانەوەیە و باشترە بگەڕێنەوە سەر ماڵ و مڵکی خۆیان.

[٦٤] ئاتێنییەکان بە قسەی ڕاسپاردەکانیان کرد و پیسیستراتۆس، ئەویش بۆ جاری سێهەم شاری ئاتێنی گرتەوە. ناوبراو حکوومەتی خۆی بە پشتیوانی لەشکرێکی مووچەخۆر دامەزراندەوە و لە ڕێگای وەرگرتنی ماڵیات، خەرج و مەخاریجی دابیندەکرد. ئەو ماڵیاتە بەشێکی لە ناوچەی ئەتیکی و

---

١- ئاکارنانییا، یەکێک لە ناوچەکانی یۆنانی باستان و خاوەن خەڵکێکی شەڕکەر.

٢- فاڵگر و غەیبگۆکان بەلای یۆنانییەکانی سەردەمی باستان، ئەو کەسانە بوون کە تەواوی پێشگۆییەکانیان لەبیر بوو و هەرکات پێویست بوایە بەگوێرەی هەلومەرج بەشێکیان دەردەخست. یۆنانییەکان خۆیان لەو باوەڕەدا بوون کە ئەو کارە پێویستی بە خواست و ئیزنی خواوە هەیە.

بەشێکیش لە دەڤەرەکانی قەراخ چۆمی ستریمۆنا[1] کۆدەکراوە. پیسیستراتۆس گەنجانی ئاتێنی کە پێشتر دژی ئەو شەڕیان کردبوو، گشتی کۆکردنەوە و بەڕێیکردنە دوورگەی ناکسۆس (پیسیستراتۆس ئەو دوورگەیەشی بە زەبری شەڕ گرت و تەحویلی لیغدامیسیدا).

هاوکات، بۆوەی ئامۆژگارییەکانی کابرای تاڵەبین واتە ئامفیلیتۆسی بەجێگەیاندبێ، لە ناوچەی دیلۆ پاکسازییەکی بە شێوەی خوارەوە بەڕێوەبرد: ناوبراو دەستووریدا کە لە مەعبەدەکانەوە بەبڕی هێزی چاو، واتە ئەوەندەی پیاو دەتوانێ ببینێ، هەرچی گۆڕی مردوان هەیە، هەڵدرێنەوە و جەنازەکان بۆ شوێنێکیتری دوورگە راگوێزرێن. پیسیستراتۆس هەرچەند حوکمڕانی شاری ئاتێنی دوبارە وەدەست خستەوە، بەڵام لەو نێوەدا کۆمەڵێک لە ئاتێنییەکان لە مەیدانی شەڕدا کوژران و بەشێکیش لەگەڵ ئالکمیئۆنیدییەکان ئاوارە بوون.

[٦٥] رەوشی شاری ئاتێن بەو جۆرە بوو کە بۆ کریسۆس باسی لێوەکرا. سەبارەت بە لاکێدێمۆنییەکان بە ناوبراو گوترا کە ئەوان پاش دەربازکردنی ئازار و ناخۆشییەکان، دوای بەربەرەکانی لەگەڵ تێیئاتییەکان ئیتر وەزعیان گەلێک باشبوو. لاکێدێمۆنییەکان لە سەردەمی پاشایەتی لیئۆندا و ئیغیسیکل، دوای ئەوەی لە گشت شەڕەکاندا سەرکەوتن، تەنیا بەدەست تێیئاتییەکان نەحەساونەوە. سپارتییەکان بە پێچەوانەی یۆنانییەکانیتر، لە قەدیمەوە خاوەن خەراپترین قانون و یاسا بوون، بەتایبەت لە پێوەندییە نێوەخۆییەکانیاندا. تەنانەت پێوەندیەکی ئەوتۆیان لەگەڵ خەڵکانی دراوسێ و بیانیش نەبوو.[2] دواتر یاسای باشتریان پەسند کرد کە بەو شێوەیە بوو:

---

١- ساڵانێک دواتر ئیستییئۆسی میلیتۆسی لەو شوێنە بوو بە خاوەن کانزای زێو.

٢- وێدەچێ مەبەستی هێرۆدۆت ئەوە بێ کە دانیشتووانی لاکێدیمۆنی نەتەنیا لەگەڵ خەڵکانیتری یۆنانی هاتووچۆیان نەبوو، بەڵکوو دێهات و شارەکانیشیان پێوەندییەکی گەرموگوڕیان پێکەوە نەبوو. خەڵکی ئەو گوندە نەیدەزانی لە گوندی دراوسێی چ دەگوزەرێ. وێژەی لاکێدیمۆنی و سپارت کە ئەمڕۆ وەک یەک پێکهاتە سەیری دەکرێت، لە سەردەمی خۆیدا جیاوازییان هەبووە و هێرۆدۆت دانیشتووانی لاکێدیمۆنی لە سپارتییەکان جیاکردوەتەوە.

جارێکیان گەورە پیاوێکی سپارتی بەناوی لیکورغۆس چووە نێوەندی تاڵەبینی دێلفوس بۆوەی چەند ئامۆژگارییەک وەرگرێ.[1] لیکورغۆس هەرکە پێی لە ژووری مەعبەد نا، پیتیا پێی‌گوت:

*"لیکورغۆس، تۆ هاتوویە مەعبەدی شکۆداری من، ئەو مەعبەدەی بەلای خواوەند دیا و دانیشتووانی چیاکانی ئۆلیمبووە گەلێک پیرۆزە. تۆ خوا بی یا مرۆڤ، من لێم روون نییە، بەڵام هیوادارم لیکورغۆس تۆ خوایەک بی".*

هێندێک کەس دەڵێن کە پیتیا چەند رێوشوێنێکی گشتی سەبارەت بە دامەزراندنی یاسا و قانوون دایە دەست لیکورغۆس. ئەو یاسایانە تا ئەمڕۆ لەلایەن لاکێدێمۆنی‌یەکانەوە بەڕێوە دەچن. لاکێدێمۆنی‌یەکان دیارە ئەوەش دەڵێن کە لیکورغۆس سەردەمێک ئەرکی پەروەردە و پێگەیاندنی (قەییمی) برازاکەی خۆی بەناوی لێئۆڤوتا پێسپێردرا کە ئەو سەردەمە پاشای سپارت بوو. راست لەو وەختەدا یاسای تازەی بۆ سپارتییەکان هێناگۆڕێ. ناوبراو ئەو یاسایەی لە دوورگەی کرێتڕا لەگەڵ خۆی هێنابوو.

لیکورغۆس کاتێک ئەرکی ئەمینداری وەرگرت، هێندێک ئاڵوگۆڕی لە قانوون و یاسادا پێکهێنا، کۆمەڵێک خاڵی لەمەر پێشگیری‌کردن لەمەر خەراپەکاری پەسندکرد بۆوەی خەڵک لە هەڵسوکەوتی ناحەز بپرینگێنەوە.[2] لیکورغۆس لە درێژەی ئاڵوگۆڕەکاندا، سەرەتا بەشی نیزامی رێکخستەوە و بەسەر دەستەی بچووکی سی کەسیدا رێکیخستن و جیرەی سەربازی دیاری‌کرد[3] و دەزگای ماڵیات و مەجلیسیشی[1] دامەزراند.[2]

---

١- بۆچوونێک دەڵێ کە لیکورغۆس بۆیە سەردانی مەعبەدی دێلفوسی کرد تا رەزامەندی خواوەند لەمەر یاسا و قانوونەکانی نووسراوی خۆی وەرگرێ.

٢- پلوتارخیس لەو باوەڕەدا کە ئەو یاسایانە هەمان قانوونی نووسراوی سۆلۆنۆس بوونە.

٣- گشت پیاوانی شاری سپارت لە تەمەنی ٢٠ ساڵیدا ناچار بە خزمەتی سەربازی دەکران و پێکەوە خۆراکیان دەخوارد و ئەو بەشە خواردەمەنییە پێیدەگووترا سیسیتیۆ. هەر ١٥ سەرباز خۆراکێکی هاوبەشیان پێدەبرا. لەبەر ئەوە بارودۆخە، هەرێمی سپارت وەک سەربازخانە دەچوو.

[٦٦] بەو شێوەیە دوای ئەو ئاڵوگۆڕانە لە شێوەی دەسەڵاتداریدا، لاکێدیمۆنی‌یەکان بوونە خاوەن حوکمڕانییەکی تەواو. وەختێک لیکورغۆس مرد، ئارامگەیان لەسەر گۆڕەکەی بیناکرد و ڕێزێکی تایبەتیان لێدەنێن. دواتر، لەبەر ئەوەی وڵاتی لاکێدیمۆنی‌یەکان دەوڵەمەند و پڕ نفووس بوو، ئابووری گەشەی کرد و ڕاحەتی و گوزەرانی خۆش ڕووی‌تێکردن. هەڵبەت دوای ئەو هەموو گەشەسەندنە، دیسانیش نەیانتوانی بە هێمنی بژین. ئەوان لەو بڕوایەدا بوون کە لە ئارکادی‌یەکان بەهێزترن، بۆیە داوای پێشگۆییان لە نێوەندەکانی ئایینی دێلفوس کرد کە چۆن دەتوانن سەرتاسەری وڵاتی ئارکادی داگیربکەن. پیتیا بەوجۆرە وڵامی ڕاسپاردەی لاکێدیمۆن داوە:

*"داوای ئارکادیا لەمن دەکەی؟ خواستێکی قورسە! من ئامۆژگاریت ناکەم. لە وڵاتی ئارکادیا گەلێک مازوخۆر هەن کە تۆ تێکدەشکێنن. بەڵام سەبارەت بە خۆم ناهومێدت ناکەم. ناوچەی تێیێ‌ئاس بە تۆ دەبەخشم و دەتوانی تێیدا هەڵبەزدابەزێن بکەی و دەشتە سەرسەوزەکەی بە سخینۆس[٣] بپێوی".*

وەختێک لاکێدیمۆنی‌یەکان گوێیان لەو پێشگۆییە بوو، ئیتر بیریان لە یەخسیری و کۆیلەیی باقی شوێنەکانی‌تری وڵاتی ئارکادی نەکردەوە، بەڵکوو بەرەو هەرێمی تێیێ‌ئاس وەڕێکەوتن. کاتێ بەرەو ئەو شوێنە چوون، کۆڵێک کەلەپچەیان لەگەڵ خۆیان برد، چونکە باوەڕیان بەو پێشگۆییە فێڵاوییە کرد

---

١- پارلەمان یا یێروسییا، مەجلیسی پیران یا سێنای ئەمڕۆ. ئەندامانی پارلەمان ٢٨ کەس بوون و نزمترین تەمەنی دیاریکراو بۆ ئەوانە ٦٠ ساڵ بوو و دوای هەڵبژاردنیان تا ڕۆژی مردن خاوەنی ئەو بەرپرسیارەتییە بوون.

٢- کۆمەڵێکی ١٠ تا ١٢ کەسی لە سەربازانی سوارە یا پیادەی لەشکری سپارتی‌یەکان ناسراو بە دەستەی ئێنۆمۆتیا کە گشتیان سوێنددراو بوون. ئەگەر دەستەکە لە ٣٠ بنەماڵە پێکهاتبوو، پێیدەگووترا تری‌ئیکاد.

٣- قەیاس بۆ پێوانی پانتایی خاک. هێرۆدۆت بۆ پێوانی پانتایی خاکی میسر بەکاری هێناوە و بەرابەری ١٠ کیلۆمیتر و ٦٥٦ میتر بووە.

و دڵنیا بوون کە گشت دانیشتووانی تێیێئاس یەخسیر دەکەن. ڕاست بە پێچەوانەوە، لاکیدێمۆنی‌یەکانی سپارتی خۆیان بەدیل‌گیران. تێیێئاسی‌یەکان ئەوانیان بەو گوریسانە لە یەکتر بەستەوە کە بۆ دابەش کردنی خاکی وڵاتی تێیێئاتی هێنابوویان. ئەو زنجیر و گوریسانەی کە ئەوکاتە کەڵکیان لێوەرگیرا، لە سەردەمی منیشدا لە وڵاتی تێیێئاسی‌یەکان ماون و هەموویان لەپەرستگەی ئاتینا لە ناوچەی ئالیێئاس هەڵواسراون.سپارتییەکان هەرچەند لە شەڕی یەکەمیان لەگەڵ تێیێئاتی‌یەکاندا، سەرکەوتنێکی ئەوتۆیان وەدەست نەهێنا، بەڵام لە سەردەمی دەسەڵاتداری کریسۆس‌دا، کاتێک پاشاکانی سپارتی بە ناوەکانی ئاناکساندریدیس و ئاریستۆن هاتنەسەرکار، سپارتییەکان هێندێک هێزیان وەبەرهاتەوە. سپارتییەکان لەبەر ئەوەی بەردەوام بەدەست تێیێئاتی‌یەکان تووشی شکست دەهاتن، ناچاربوون ڕاسپاردە بنێرنە نێوەندەکانی ئایینی دێلفوس و لە تاڵەبینەکان بپرسن کە دەبێ قوربانی بۆ کام یەک لە خواکان بکەن و لەبەری بپارێنەوە تا بتوانن بەسەر تێیێئاتی‌یەکاندا زاڵبن.

پیتیا لە وڵامیاندا گوتی کە پێویستە ئێسک و پرووسکی ئۆرێستی، کوڕی ئاغامێنۆن بێننەوە وڵاتی سپارت. گرفتی ئەوجاری سپارتییەکان ئەوە بوو کە بە شوێنی گۆڕی ئۆرێستی‌یان نەدەزانی. دووبارە ڕاسپاردەیان ناردەوە کە لە پیتیا بپرسن، ئاخۆ ئۆرێستی لەکوێ بە خاک سپێردراوە. پیتیا لە وڵامی ئەو پرسیارەدا بە ڕاسپاردەکانی گوت:

*"لە وڵاتی ئارکادیا، شاری تێیێئا لە دەشتێکی پان هەڵکەوتووە. لەو شارە دوو بای بەهێز دێن. لەبەرامبەر هەر کوتان و لێدانێک دژکردەوەیەک هەیە و هەر ڕەنجێک،ڕەنجێکی‌تری بەدواوەیە. خاکی ئەو شوێنە ژیانبەخشە، کوڕی ئاغامێنۆنی لە باوەش گرتوە. تۆ ئەو نێژراوە بدۆزەوە، ئەوسا دەبییە خاوەن دەسەڵاتی وڵاتی تێیێئا ".*

سپارتییەکانی لاکیدیمۆنی گوێیان لەو ئامۆژگارییە گرت و دەستیان بە پشکنین کرد. هیچ گۆڕێکیان نەدۆزییەوە، تا ئەو ڕۆژەی لیخاس کەسێکی سپارتی، لەوانەی پێیان‌دەگوترا ئاغاتۆئێرغی، گۆڕەکەی دۆزییەوە. ئاغاتۆئێرغی‌یەکان شارۆمەندی سەربە دەستەی ئەسپ‌سوار بوون و هەر ساڵێ پێنج کەسیان بەهۆی پیرییەوە خانەنشین دەکران. ئەوانە ئەو کاتەی خزمەتیان تەواو دەکرد و دەستەی سوارکارییان بەجێ‌دەهێشت، لەسەریان فەرز بوو هەر خزمەتێکی دیکەیان پێ‌بسپێردرێ، بەئەنجامی بگەیێنن.

[٦٨] یەک لەو کەسانەش هەمان لیخاسی گۆرین بوو. ناوبراو گۆڕی تێیێ‌ئاسی بە زیرەکی و خۆش‌شانسی خۆیەوە دۆزییەوە. ئەو سەردەمە پێوەندی سپارتییەکان لەگەڵ تێیێ‌ئاتی‌یەکان خورتتر ببوونەوە. لیخاس ڕۆژێک ڕوو لە کارگەیەکی ئاسنگەری دەکات. بە ئێشتیاوە دەڕوانێتە کارکردنی کابرای ئاسنگەر. ئاسنگەرەکە کاتێک دیتی لیخاس ئاوا بە تامەزرۆیی چاو لە ئیش‌کردنەکەی ئەو دەکا، ڕاوەستا و پێی‌گوت: تۆ کابرای لاکۆنی،[1] دەبینم زۆر بە تامەزرۆیی چاو لە کارەکەم دەکەی. باوەڕت بێ من دیاردەی سەیرتر لە چەکوشکاری و کوتانی ئاسنم بینیوە. ڕۆژێکیان لەو حەسارە مژوڵی هەڵکەندنی بیری ئاو بووم، لەنەکاو چاوم بە تابووتێک کەوت. ئەو تابووتە حەوت پیخیس[2] درێژ بوو. باوەڕم نەدەکرد کە ڕۆژگارێک مرۆڤی باڵابەرزتر لە ئینسانەکانی ئەوڕۆیی هەبووبن. سەری تابووتم کردەوە و چاوم بە جەنازەیەک کەوت. ئەویش بەقەدەر تابوتەکە درێژبوو. دوای پێوانی باڵای مردوەکە، سەری تابووتم نایەوە و گڵم وەسەرکردەوە ". ئەوە قسەی کابرای ئاسنگەر بوو.

لیخاس دوای تاوێک بیرکردنەوە، بەو قەناعەتە گەیشت کە ئەو قەبرە دەبێ هی ئۆرێستی بێ. ناوبراو لەبەرخۆیەوە وەزعەکەی بەو شێوەیە لێکدایەوە: جووتێک موشەدەمەی ئاسنگەری هەمان دوو بای دژ بە یەکن کە

---

١- سپارتی.

٢- پیخیسی سەردەمی باستان بەرابەری ٤٦ سانتی‌میتر بووە.

له دوو لاوه فوو له ئاگر دەکەن. کوتانی ئاسن، دژکردەوەی سندانی بەدواوەیە. ئاسنی چەکوشکاری کراو بۆ شمشێر، نیشانەی کوشتن و خوێنە، لەنێوان چەکوش و سندانە، واتە ئازار لەسەر ئازارە. ئەو لەو باوەڕەدا بوو کە ئاسن بۆ خەراپەکاری مرۆڤەکان دۆزراوەتەوە. دوای ئەو لێکدانەوەیە، لیخاس گەڕایەوە سپارت و رەوتی رووداوەکەی بۆ خەڵکی لاکێدێمۆنی گێڕاوە. لاکێدێمۆنی‌یەکان قسەیەکیان بۆ لیخاس هەڵبەست و شاربەدەریان کرد. لیخاس چووە شاری تێیێ‌ئاس بۆلای کابرای ئاسنگەر. داوای لە ناوبراو کرد، حەساری کارگەکەی بەکرێ بداتێ، بەڵام ئاسنگەرەکە قبووڵی نەکرد. پاش فەترەیەک، ئاسنگەر پەشیمان بۆوە و بەدوای لیخاسی‌دا نارد. لیخاس لە حەسارەکە دامەزرا. قەبرەکەی هەڵدایەوە و ئێسک و پرووسکی مردووی دەرهێنا و خێرا هێنایەوە وڵاتی سپارت. لەو کاتییەوە هەرجارێ تێیێ‌ئاتی و لاکێدێمۆنی بەشەڕ دەهاتن، لاکێدێمۆنی‌یەکان سەردەکەوتن. بەو شێوەیە زۆربەی ناوچەکانی (پێلۆپۆنیسۆس)یان خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیان.

[٦٩] وەختێک کریسۆس ئەو زانیارییانەی دەسکەوت، کۆمەڵێک راسپاردەی بە دیاری و خەڵاتەوە بۆ پێکهێنانی هاوپەیمانی ناردە سپارت. ئەو راسپاردانە پێیان‌گوترابوو کە دەبێ چۆن قسە بکەن. راسپاردەکان کاتێک گەیشتە سپارت، گوتیان: "کریسۆس کە پاشای لیدی‌یەکان و میللەتانی‌ترە، ئێمەی ناردوە ئەو داخوازییە لە زمانی ئەوەوە، بە ئێوە رابگەیێنین: ئەی لاکێدێمۆنی‌یەکان، خواوەند داوای لێکردم کە لەگەڵ یۆنانییەکان هاوپەیمانی دامەزرێنم. بەو حیسابەی کە ئێوە یەکەم نەتەوە لە یۆنانن. بۆیە بەپێی ئەو پێشگۆیییەوە، دەخوازم بەبێ درۆ و خەیانەت پێکەوە یەکبگرین ". ئەوە داخوازیی کریسۆس بوو. لاکێدێمۆنی‌یەکان‌یش کاتێک ئەو ئامۆژگارییەی خواوەندیان بیست کە بە کریسۆس گوترابوو، بە باوەشی ئاواڵەوە راسپاردەکانی لیدیاییان وەرگرت و لەگەڵیان پەیمانی دۆستایەتی و یەکێتی‌یان مۆرکرد.

جیا لەوە، کریسۆس پێشتریش لاکێدێمۆنی‌یەکانی خەڵات کردبوو. ئەوان کاتی‌خۆی خەڵکیان ناردبوو بۆ شاری سارد، بۆوەی زێڕ و ئاڵتوون بۆ

دروستکردنی پەیکەرەی ئاپۆلۆناس بکرن، واتە بۆ ئەو پەیکەرەیەی ئێستا لە پەرستگەی چیای تۆرناکامی[1] لە ناوچەی لاکۆنیا دامەزراوە. لاکیدێمۆنی‌یەکان کاتێک ویستیان زێڕ بۆ ئەو مەبەستە بکرن، کریسۆس بێ پارە وەرگرتن خەلاتی‌کردن.

[٧٠] لاکیدێمۆنی‌یەکان لەبەر ئەو هۆیانەی باسم لێوەکردن هاوپەیمانی‌یان پەسندکرد. کریسۆس دیارە لەنێو گشت یۆنانییەکاندا دۆستایەتی ئەوانی هەڵبژارد. لاکیدێمونی‌یەکان رایانگەیاند کە قبوڵی پێشنیارەکانی کریسۆس دەکەن و یەکدانە خومرەیان بۆ تێکەڵکردنی شەراب لە مس دروستکرد کە دیوی دەرەوەی بەشکڵ و شەمایلی جۆراوجۆر رازێندرابۆوە و سێسەد ئامفۆرێ‌ئا[2] شەرابی دەبرد و وەک دیاری پێشکەش بە کریسۆس‌یان کرد. هەڵبەت ئەو خومرەیە قەت نەگەیشتە شاری سارد. لەو بارەوە دوو هۆکار باسیان لێوەکراوە. لاکیدێمۆنی‌یەکان خۆیان دەڵێن کە سامۆسی‌یەکان ئەو خومرە گەورەیان دزیوە. ئەوان پێشتر ئاگاداری ناردنی خومرە بوونە و لە نیزیک دوورگەی سامۆس بۆسەیان بۆداناوە و چەکدارەکانیان پەلاماری کەشتی بازرگانی هەڵگری ئەو دەسکردەیان داوە. سامی‌یەکانیش بەلای خۆیانەوە دەگێرنەوە کە ئەوانەی پاسەوانییان لەو خومرەیە داوە، لاکیدێمۆنی بوونە و لە رێگادا وەدرەنگی کەوتوون و کاتێک خەبەریان پێگەیشتووە کە شاری سارد گیراوە و کریسۆس بەدیل‌گیراوە، خومرەکەیان بە سامۆسی‌یەکان فرۆشتووە و ئەوانیش دوای کڕینی، پێشکەش بە پەرستگەی (ئیرا)یان[3] کردوە. وێدەچی هەر ئەوانەی ئەو دەسکردەیان فرۆشتووە، وەختێک گەڕاونەوە ولاتی سپارت، رایانگەیاندبێ کە سامۆسی‌یەکان خومرەکەیان دزیوە.

[٧١] ئەوە باسێک سەبارەت بە خومرە بوو. کریسۆس بە هەڵە لە پێشگۆییەکە حاڵی‌ببوو و لەشکری دژی هەرێمی کاپادۆکی‌یا ئامادە کرد و

---

١- چیای تۆرناکامی یا تۆرناکس لە باکووری رۆژهەلات هەڵکەوتووە.

٢- پێوانە بۆ بابەتی ئاوەکی لە یۆنانی باستاندا و بەرابەری ١٩ لیتر و یەک دسی لیتر و ٤٤ سانتی لیتر.

٣- ئیلاهەی خۆشەویستی و ئەوین و پشتیوانی پێکهێنانی ژیانی هاوبەش.

بەو هیوایەی کە دەسەڵاتداری کوروش و هێزەکانی پارس لەوێ تێکبشکێنێ. وەختێک خۆی بۆ ئەو لەشکرکێشییە ئامادەدەکرد، کابرایەکی خەڵکی وڵاتی لیدی بەناوی ساندانیس کە وەک فەیلەسوف چاوی لێدەکرا و خاوەن ناوبانگێک لەنێو لیدییەکاندا بوو، هاتەلای کریسۆس و ئامۆژگاری ناوبراوی کرد و پێیگوت: "پاشاکەم، من سەبارەت بە خەڵکانێک لەگەڵ تۆ قسە دەکەم کە گەرەکتە پەلاماریان بدەی. ئەوانە پاتۆڵی چەرمی فشوفۆڵیان لەبەردا و گشت جلوبەرگیان چەرمە. هێندە ناخۆن کە تێربن، بەڵکوو ئەوەندە دەخۆن کە هەیانە، چونکە وڵاتەکەیان بە بەرهەم و دەوڵەمەند نییە. جیا لەوەش شەراب نانۆشن، بەڵکوو تەنیا ئاو دەخۆنەوە. ئەوانە تەنانەت هەنجیریشیان دەستناکەوێ کە بیخۆن. خاوەن سامان و پێشکەوتنیش نین. باشە ئەگەر بەسەریاندا زاڵبووی، چیت دەست دەکەوێ؟ ئەوە نییە بەدەست هەژاری خۆیانەوە دەناڵن! هەڵبەت لەبیرت نەچێ، وەختێک تووشی شکست بێی، هەرچی هەتە لە دەستی دەدەی. ئەوان ئەگەر سەرکەون، هیچمان پێوە ناهێڵن و تازە لەدەستیان نایەتەدەر و قەت ناتوانین لە یەخەی خۆمانیان بکەینەوە. من بەش بە حاڵی خۆم خێرێک بە خواکان قەرزدارم کە ئەو فکرەی لە مێشکی ئەواندا پەروەردە نەبێ کە رۆژێک بخوازن پەلاماری ئێمەی لیدی بدەن ". ساندانیس بە قسەکانی نەیتوانی کریسۆس رازی بکا. بەڕاستیش هەروا قەوما. پارسەکان توانیان وڵاتی لیدی داگیر بکەن و قەتیش بیریان لە خۆش رابواردن و ژیانی راحەت نەکردەوە.

**[٧٢]** یۆنانییەکانی سووری بەو خەڵکە دەڵێن کاپادۆکی. ئەو کۆمەڵگا سوورییە بەر لەوەی لە سەردەمی کوروش‌دا بکەوێتە ژێر دەسەڵاتی پارسەکان، لەلایەن میدییەکانەوە حوکمڕانی کراوە. سنووری نێوان میدیا و دەوڵەتی لیدی، چۆمی ئالیس بووە کە لە چیاکانی ئەرمەنیاوە سەرچاوە دەگرێ و بە هەرێمی کیلیکیادا[1]

---

١- لەو باسەدا دەردەکەوێ کە کیلیکیا لە سەردەمی هێرۆدۆت‌دا هەرێمێکی گەورەتر بووە و لە باکووری چیاکانی تاڤرۆس و رۆژئاوای رووباری فورات هەڵکەوتووە و دواتر بە کاتائۆنیا و میلیتێنۆ ناسراوە.

تێدەپەڕێ و لە قۆڵی ڕاست (ماتیئینوس)یەکان و لەلای چەپ فریژیەکان جێیانگرتووە. ئەو چۆمە پاش ئەوەی بەو وڵاتانەدا دەربازبوو، بەرەو باکوور دەڕوا و کاپادۆکییەکانی سووریا لە ڕۆخی چەپ و پاڤلاغۆنییەکان لە دەستی ڕاستی ڕووبار نیشتەجێن.

ڕووباری ئالیس لەڕاستیدا ئاسیای ژوورو و وڵاتانی ئاسیای بچووک بەتەواوی لەیەکتر جیادەکاتەوە، بەواتایەک لە دەریای قبرسەوە تا دەگاتە بەحری ڕەش. پانتایی ئەو شوێنە زۆر کەمە و مەوداکەی پێنج ڕۆژ بۆ کەسێکی خۆش ئاژۆ دەبێ.[١]

[٧٣] کریسۆس باوەڕی تەواوی بە پێشگۆیی تاڵەبینەکان هێنا و بۆیە پەلاماری هەرێمی کاپادۆکیدا و گەرەکی بوو ئەو ناوچەیە بێنێتە ژێر دەسەڵاتی خۆی. ئەو هەروەها دەیویست، تۆڵەی ئاستیاگ لە کوروش بستێنێتەوە. کوروش، کوڕی کامبیز پاشایەتی میدییەکانی ڕوخاندبوو. ئاستیاگ کوڕی کیاکسار ئەو سەردەمە پاشای میدیا و زاوای کریسۆس (مێردی خوشکی ناوبراو) بوو و بەدەست کوروش شکستیخواردبوو. کوروش ئاستیاگی یەخسیر کردبوو. ئەوە کە چۆن ئاستیاگ ببووە زاوای کریسۆس، دەگەڕێتەوە بۆ هێندێک ڕووداو. هۆزێکی سکیتی دوای سەرهەڵدان پەنای بۆ وڵاتی میدیا هێنابوو. ئەو سەردەمە کیاکسار کوڕی فرائۆرتی و نەوەی دییۆکی پاشای میدییەکان بوو. کیاکسار سەرەتا بە هێمنی لەگەڵ سکیتییەکانی موهاجیر جوڵایەوە کە داوای پەنابەرییان کردبوو. ناوبراو خزمەتی زۆری پێکردن. ئەوەندەی ڕێز لێنان کە تەنانەت چەند منداڵێکی میدی لەلای ئەوان دانا بۆوەی فێری زمانی سکیتی و هونەری تیرهاوێژی بن. سکیتییەکان بەردەوام دەچوونە ڕاو و هەرجارێ نێچیرێکیان دەهێناوە. ماوەیەک دەربازبوو و ئەوجار کە چوونە ڕاو، هیچ نێچیرێکیان دەستنەکەوت. خەشایارشا پیاوێکی ڕقئەستور و سەختگر بوو. زۆر

---

١- نووسەرانی نوێتر وەک پلینیۆس خەڵکی دەڤەری ئاخایی پێیانوایە مەودای نێوان شاری سینۆپی تا بەحری قیبریس لەوەی گووتراوە پێنج ڕۆژی سەفەری کەمترە.

بێبەزەیانە و بەچاوی سووکەوە لەگەڵ سکیتی‌یەکان هەڵسوکەوتی کرد. سکیتی‌یەکان رەفتاری خەشایار شایان وەک بێ حورمەتی‌یەکی گەورە بەخۆیانگرت و بۆیە بریاریاندا تۆڵەی لێبستێننەوە. ئەوان خێرا یەکێک لەو منالانەی ناوبراو ناردبوونی، لەتوپەتیان کرد و لەجیاتی گۆشتی نێچیر دەرخواردی پاشایاندا. قەراریشیان دانا دوای ئەو کارەیان، باروبنەیان تێکبنێن و ناوچەی شاری سارد جێهێڵن و پەنا بۆ ئالی‌ئاتیس، کوڕی سادی‌ئاتیس بەرن. سکیتی‌یەکان ئەو پیلانەیان گێڕا. خەشایارشا و پیاوەکانی لە دەوری سفرە دانیشتن و دەستیان بە خواردنی گۆشتی منالەکە کرد و سکیتی‌یەکانیش پەنایان بردە بەر ئالی‌ئاتیس.

**[٧٤]** دوای ئەو رووداوانە، لەبەر ئەوەی ئالی‌ئاتیس سکیتی‌یەکانی نەدایە دەست کیاکسار، لیدی‌یەکان و میدییەکان کەوتنە شەڕی هەڤدوو و پێنج ساڵی رێکی خایاند. لەو شەڕەدا هەر جارێ لایەنێک بەسەر ئەوەی‌تردا زاڵدەبوو. هەڵبەت جاروبار بە شەویش پێکیاندادەدا. هیچکامیان نەیتوانی بەسەر لایەنی‌تردا سەرکەوێ. ساڵی شەشەمی شەڕ دەستی‌پێکرد. لەو ساڵەدا و راست لە گەرمەی شەڕدا رۆژ گیرا و دنیا تاریک وەک شەوی لێهات. پێشگۆیی ئەو رۆژگیرانە لەلایەن تاڵەبین، تالیسی خەڵکی میلیتۆسی،[1] پێشتر بە دانیشتووانی یوونی گوترابوو. ناوبراو پێشتر پێشبینی کردبوو و مێژووی رووداوەکەی بە خەڵک گوتبوو.[2] کاتێک لیدی‌یەکان و میدییەکان دیتیان رۆژیان لێبووەتە شەو، خێرا روویان لە ئاشتی کرد. ئەو کەسانەی پەیمانی ئاشتی‌یان پەسند کرد، سی‌ئێنیسی خەڵکی کیلیکیا و لاڤینتۆسی بابێلی[3] بوون. ئەو دوو کەسە لەسەر ئەوە پێداگر بوون کە سوێندی بەرهەق بۆ یەکتر بخۆن و لە درێژەدا خزمایەتییان لەنێوان خۆیاندا دامەزرانێ. ئەوان بەو شێوەیە گەرەکیان بوو کچی ئالی‌ئاتیس بەناوی ئارینی لە ئاستیاگی کوڕی خەشایارشا مارەبکەن، چونکە

---

١- فەیلەسوفی ناسراوی یۆنانی لە سەدەی پێنجی پێش زایین.

٢- لەو ناوچەیە رۆژگیرانی‌تر جارێک لە ساڵی ٦١٠ و کەرەتێکی‌تریش لە ساڵی ٥٨٥دا قەوماوە.

٣- لاڤینیتۆس رەنگە هەمان نابونید پاشای ناسراوی بابێلی بێ.

بەبێ پێوەندی خزمایەتی بەهێز، پەیمان و قەرارەکان نەیاندەتوانی حوکمیان هەبێ و بەردەوام بن. سوێند خواردنی گەلانی نیشتەجێی ئەو ناوچانە وەک هی یۆنانییەکان دەچێ، بەو جیاوازییەی کە ئەوانە وەختێک سوێند بۆ یەکتر دەخۆن، دەستی خۆیان بریندار دەکەن و خوێنی هەڤدوو دەمژن.

[۷۵] وەک گوتمان کچی ئاستیاگ دایکی کوروش بوو. فەرمانڕەوایی ناوبراو بەدەستی ئەو نەوەیە تێکڕووخا و ئاستیاگ خۆیشی زیندانی کرا. دیارە دواتر باسی ئەو بەسەرهاتە دەکەم. هەڵبەت هەر لەبەر ئەو ڕووداوە بوو کە کریسۆس، کوروشی بە تاوانبار زانی و راسپادەکانی خۆی ناردە نێوەندەکانی پێشگۆیی، بۆوەی دڵنیا بێ کە ئایا پێویست بە لەشکرکێشی دژی پارسەکان دەکا یاننا. کاتێک پێشگۆیی نێوەندەکان ئەرێنی دەرچوون، کریسۆس هەلومەرجی پتر لەبار زانی و پەلاماری وڵاتی پارسی‌دا. کریسۆس کاتێک گەیشتە سەر چۆمی ئالیس، لەشکرەکەی پەڕاندەوە ئەوبەری. بە باوەڕی من ناوبراو ئەو پردانە پێشتر لەسەر چۆم دامەزرابوون. بەڵام بە پێچەوانەی بۆچوونی من، هێندێک لە زانایانی یۆنانی پێیان‌وایە کە تالیسی میلیسی یارمەتی کریسۆسی داوە. وەک دەگێڕنەوە، ئەو سەردەمە هیچ پردێک لە گۆڕێدا نەبووە و کریسۆس دەستەوەستان مابۆوە. تالیس ئەوکاتە لە ئۆردوگای نیزامی ناوبراودا خزمەتی کردوە. هەر ئەویش توانیویەتی ڕەوتی جەرەیانی ئاوی چۆم بگۆڕێ. تالیس ئاوی ئەو ڕووبارەی لە قۆڵی چەپی لەشکرەوە بۆ قۆڵی ڕاست ڕاگواست. ناوبراو لە سەرەوەی مۆڵگەی لەشکر، خەندەکێکی قووڵی چەشنی نیو بازنەی هەڵکەند، بۆوەی ئاوی چۆم بە پشت مۆڵگەدا ڕاگوێزێ و لە خوارووی ئۆردوگادا تێکەڵ بە ڕووباری ئەسلی بکاتەوە. تالیس بەو شێوەیە ئاوی چۆمی دابەش‌کرد و بواری پەڕینەوەی پێکهێنا. هێندێک لە مێژونووسان دەڵێن، بواری پێشوو خێرا ویشک هەڵگەڕا. بەڵام من لەو باوەڕەدا نیم. چونکە ئەگەر ئەوە ڕاست بوایە، سەربازانی لەشکر چۆن توانیویانە دووبارە لێی بپەڕنەوە.

[٧٦] کریسۆس وەختێک لە چۆمی ئالیس پەڕییەوە، گەیشتە ناوچەی پتێریا لە هەرێمی کاپادۆکی لە نیزیک شاری سینۆپی و دەریای رەش کە شاخاویترین و حاستەمترین شوێنی دەڤەرەکەیە. کریسۆس لەوێ ئۆردووی لێدا و دەغڵودان و بەروبوومی دانیشتووانی سوریایی ئەو هەرێمەی وێران کرد. ئەو شاری پتێریای داگیرکرد و کۆیلەکانی خەڵکی ئەو ناوچەیەی فرۆشت و دەستی بەسەر گشت دێهاتەکانی ئەو دەڤەرە داگرت و سووریاییەکانی بەبێ هیچ تاوانێک دەرکرد. کوروش، ئەویش بە نۆرەی خۆی لەشکری کۆکردەوە و دژی کریسۆس کەوتە رێ. لەسەر رێگا دەستی بە سەربازگیری کرد و سەرەتا راسپاردەی ناردە لای یوونییەکان تا دژی کریسۆس راپەڕن. یوونییەکان گرینگیان بەو داوایەی کوروش نەدا. کاتێک کوروش گەیشتە روبەڕوی کریسۆس، مۆڵگەی دامەزراند و لە دەڤەری پتێریا سەرژمێری ئەندامانی لەشکرەکەی خۆی کرد. شەڕێکی قورس روویدا و ژمارەیەکی ئێجگار زۆر لە هەردوو لایەن کوژران. کاتێ شەو داهات، بەبێ ئەوەی براوەی شەڕ دیار بێ، لەیەکتر جیا بوونەوە. ئەوە باسی شەڕی ئەو دوو لەشکرە بوو.

[٧٧] کریسۆس هۆی سەرنەکەوتنی خۆی بۆ کەمی پیاوانی شەڕکەری سپاکەی گێڕایەوە. دیارە لەشکری کریسۆس بە ژمارە لە هی کوروش کەمتر بوو. وەختێک رۆژی دوایی کوروش هیچ دژکردەوەیەکی لەخۆی نیشان نەدا، کریسۆس گەڕایەوە شاری سارد. ئەو گەرەکی بوو داوای یارمەتی لە هێزەکانی میسری بکا. کریسۆس بەرلەوەی لەگەڵ لاکێدیمۆنییەکان پێکبێ، توانیبووی پاشای میسر بەناوی ئاماسیس[١] بکاتە هاوپەیمان. کریسۆس لەو نێوەدا بانگهێشتی بابێلییەکانیشی کرد. ناوبراو لە سەردەمی حوکمڕانی لاڤینێتۆس[٢] لە بابێلدا، پێکەوە پەیمانی دۆستایەتییان مۆرکردبوو. کریسۆس لاکێدیمۆنییەکانیشی ئاگادار کردەوە کە لە وەختی دیاریکراودا لە شوێنی

١- پاشای میسری هاوسەردەمی کوروش.
٢- لاڤینیتۆس رەنگە هەمان نابونید پاشای ناسراوی بابێلی بێ.

خۆیان ئامادە بن. ئەو ئاوای دانابوو کە پاش کۆبوونەوەی گشت هێزەکان و لەشکری خۆی، چاوەڕوانی دەربازبوونی زستان بکەن و لە وەرزی بەهاردا پەلاماری پارسەکان بدەن. کریسۆس بەو فکر و بۆچوونەوە، راسپاردەی ناردە لای هاوپەیمانان تا پێیان رابگەیێنێ کە دوای چوار مانگی‌تر لە دەڤەری سارد کۆبنەوە. ئەو هەروەها هێزی بەکرێگیراوی لەشکرەکەی خۆی هەڵوەشاندەوە، چونکە پێیوانەبوو دوای شەڕێکی ئەوتۆ قورس، کوروش تازە بوێرێ پەلاماری دانیشتووانی شاری سارد بداتەوە.

[٧٨] راست لەو کاتەدا کە کریسۆس خەریکی ئامادەکاری بوو، دەوروبەری شار پڕ بوو لە مار و ئەسپەکانی دانیشتووانی ئەو دەڤەرە لە ترسی پێوەدان، ناوچە دەشتاییەکانیان بەجێهێشتبوو. کریسۆس وەختێک بەو رووداوەی زانی، بەلایەوە موعجیزە و قەومانێکی سەیر بوو. بەڕاستیش وەک موعجیزە دەچوو. ناوبراو بەپەلە چەند راسپاردەیەکی ناردە شاری تێلمیسۆس[١] بۆلای ئەو کەسانەی خاوەن لێکدانەوە لەسەر رووداوی سەیر و سەمەرەن. وەختێک راسپاردەکان گەیشتنە شوێنی تاڵەبینەکان و لێیان حاڵی بوو کە ئەو گشتە نیشانە و دێوەزمانە مانایان چییە، پێڕانەگەیشتن بەڕێگای دەریادا بگەڕێنەوە شاری سارد و کریسۆس لەو بارەوە ئاگادار بکەنەوە. چونکە بەر لە گەیشتنەوەی ئەوان بۆ شاری سارد، کریسۆس بە دیل گیرابوو. تاڵەبینەکانی تێلمیسۆس لەو باوەڕەدا بوون کە کریسۆس دەبێ چاوەڕوانی هێرشێکی لاوەکی دژی وڵاتەکەی بێ. ئەوان گوتبوویان کە مار مانای قەومان و هاتنە کایەی رووداوێک و ئەسپیش واتای بیانی و دوژمن دەدا. بەهەرحاڵ ئەوە لێکدانەوەی تێلمیسییەکان بۆ کریسۆسی بەدیل‌گیراو بوو، بەبێ ئەوەی بزانن چ بەسەر ناوبراو و ناوچەی سارد هاتووە.

[٧٩] وەختێک کوروش خەبەری پێگەیی کە کریسۆس دوای شەڕی پتێریا لەشکری بەکرێگیراوی هەڵوەشاندۆتەوە، بڕیاریدا هەرچی خێراتر پەلاماری

---

١- دانیشتووانی تێلمیسۆس لە ناوچەی کاریا یا ناوچەی لیکیا سەر بە هۆزی فالگیران بوون. ئەوان لەو باوەڕەدا بوون کە وەچەی یەکێک لە کوڕەکانی ئاپۆلۆناسن.

ناوچەی سارد بدا و پێش کۆبوونەوە و جێگیربوونی دوبارەی هێزەکانی لیدی بەسەریاندا زاڵبێ. وەختێک ئەو بڕیارەیدا، بەپەلە دەست بەکار بوو. پەلاماری دەسپێکرد. کریسۆس کاتێک بەو پەلامارەی زانی، تازە درەنگ ببوو و تا وەخۆکەوت، هێزەکانی کوروش گەیشتنە نیزیک شاری سارد. کریسۆس تەواو بێدەسەلات مایەوە، چونکە ڕووداوەکان بەپێچەوانەی ویستی ئەو چوونە پێش. بەو حاڵەش هێزەکانی لیدی ناردە شەڕ. ئەو سەردەمە لە ئاسیا خەڵکی بوێر و بەهێزی چەشنی لیدیەکان لە مەیداندا نەبوون. ئەسپ سوارەکانیان شەڕیان کرد و خاوەن نێزە و سوارکاری بە ئەزموون بوون.

[٨٠] هەر دوو لەشکر لە دەشتێکی پان و پۆڕ و ڕووتەندا کەوتنە بەر یەک. ئەو دەشتە لە روبەڕوی شاری سارد هەڵکەوتبوو. (لەنێوان ئەو دەشتە و شاری سارددا چۆمی ئیللۆس و چەند ڕووبارێکیتر هەن، ئاوی ئەو چۆمانە دەرژێتە ڕووباری ئێرمو کە ئەویش بەنۆرەی خۆی لە چیاکانی میتێرادیندیمێنیڕا[1] سەرچاوەدەگرێ[2] و لە نیزیک شاری فۆکیئا دەرژێتە نێو دەریا). لێرە، کاتێک کوروش چاوی بە لیدیەکان کەوت کە ئامادەی شەڕن، لە هێزی سوارەیان ترسا، بەڵام گوێی لە ڕێنوێنی ڕاوێژکاری میدی بە ناوی ئارپاغوس[3] ڕاگرت. خێرا باریان لە وشتران کردەوە کە ئازوقەی لەشکریان پێبوو و فەرمانی بە نیزامییەکاندا وەک سوارەی چەکدار سواری وشترەکان بن. کاتێک ئەو ڕێوشوێنەیان گرتەبەر، وشترەکان وەپێشکەوتن و لە بەرامبەر هێزی سوارە نیزامی کریسۆس دامەزران. لەپشت دەستەی وشترسواران، پیادەنیزام جێیگرت و لەدوای ئەوانیش ئەسپ سوارەکان ئامادە بوون. وەختێک تەواوی هێزەکانی پارس ڕێکخران، ئەوسا کوروش فەرمانی پەلاماری بە گشت لایەکدا کە دەست بە کوشتنی لیدیەکان بکەن و

١- مەبەست چیای دیندیمێنی لە وڵاتی فریژیە.

٢- دیندیمێن گرینگترین خوای دانیشتووانی فریژی و بە دایکی پیرۆز دیندیمۆن ناسراوە. دیندیمێن، کیڤێلیس، دیمیترا، ئیسیدا، ئیستار... کۆمەڵێک ناوی دایکانی پیرۆز و خوای مێیینەن.

٣- ئارپاغۆس هەمان ئەو کەسەیە کە نەخشی گرینگی لە پێگرتن و دامەزرانی پاشایەتی کوروشدا گێڕا.

خۆڕاگری نیشان بدەن. ئەوە دەستوراتی کوروش بە سپاکەی خۆی بوو. کوروش بۆیە ئەو کارەی کرد، چونکە دەیزانی کە ئەگەر وشترەکان لە ریزی پێشەوە و لە بەرامبەر هێزی سوارەی لیدی بن، ئەسپ لە وەشتر دەترسێ و حەزیش لە روخسار و بۆنی ئەو ئاژەڵە ناکات. کوروش بەو چەشنە هێزی سوارەی کریسۆسی لە کارخست.

لیدیی‌یەکان تەواو دڵنیا بوون کە بە زەبری هێزی سوارەیان سەرکەوتن مسۆگەر دەکەن. هەرکە شەڕ دەستی پێکرد، ئەسپەکانی لیدی چاویان بە وشتران کەوت و بۆنیان بۆ هات و گەڕانەوە دواوە و کریسۆس‌یان ناهومێدکرد. دیارە هێزەکانی لیدی بڵاوەیان نەکرد و لە ئەسپەکانیان دابەزین و دژی پارسەکان کەوتنە شەڕ. پاش کوژرانی ژمارەیەکی زۆر لە سەربازانی هەردوو لایەن، لیدیی‌یەکان پاشەکشەیان کرد و لەنێو شوورەی مەحکەمی شاردا حاسێبوون و پارسەکان گەمارۆیان‌دان.

[٨١] وەختێک گەمارۆ دەستیپێکرد، کریسۆس لەو باوەڕەدا بوو کە شەڕ بەردەوام دەبێ. هەر بۆیە ناوبراو هێندێک لە پاسەوانانی خۆی و چەند راسپاردەیەکی‌تری ناردە لای هاوپەیمانەکان. وەک پێشتر باسم لێوە کرد، ئەو هاوپەیمانانە دەبوایە دوای پێنج مانگ لە شاری سارد کۆبنەوە. بەهۆی ئەو راسپاردە نوێیانە، داوای کردبوو کە هێزەکانی هاوپەیمان هەرچی خێراتر بگەنەجێ، چونکە لە گەمارۆ کەوتبوو.

[٨٢] کریسۆس وەک گوتمان داوای لە هێزەکانی هاوپەیمان و بەتایبەتی لاکێدێمۆنیی‌یەکان کرد بە هانایەوە بێن. بەڵام راست لەو کاتەدا سپارتییەکان بە هەڵکەوت تووشی شەڕ لەگەڵ ئارغۆسیی‌یەکان، واتە دانیشتووانی هەرێمی تیرێئا هاتبوون. سپارتییەکان هەرێمی تیرێئای سەر بە (ئارغۆلیدا)یان داگیرکردبوو کە ملکی ئارغۆسیی‌یەکان بوو. بەشی رۆژئاوا هەتا دەڤەری مالێئا[١]، کیتیرا[١] و چەند دوورگەیەکی‌تریش،[٢] گشتیان سەر بە وڵاتی

---

١- هەمان کینۆسوریای قەدیمی، ناوچەیەک لە دەڤەری کینوریاوە دەست پێدەکا. لە سەردەمی کریسۆس سپارتی‌یەکان بەشێکی زۆری ئەو دەڤەرەیان داگیرکردبوو. ئەو ناوچە شاخاوییە لە روبەڕووی دورگەی

ئارغۆسی‌یەکان بوون. ئارغۆسی‌یەکان ئامادەکارییان بۆ رزگارکردنی ئەو خاکە لەدەست سپارتی‌یەکان دەکرد. پاش سەردەمێک کێشە، هەردوو لایەن رێککەوتن و بڕیاریاندا، هەرکامیان سێسەد شەڕکەر بنێرێتە مەیدانی ململانێ. هەر لایەنێک سەرکەوت، بۆی هەیە حوکمڕانی هەرێمە کێشەدارەکە وەستۆبگرێ. باقی هێزەکانی لەشکری دەبوایە بگەڕێنەوە شوێنەکانی پێشوو لە وڵاتی خۆیان. ئەوەش بۆوەی بوو مەبادا لەکاتی پێکهەڵپڕژانی ئەو سێسەد جەنگاوەرە، هێزەکانی نیزامی ئەو لایەنە تووشی ئیحساسات بێن و هەرکە چاویان بە شکستی لایەنی خۆیان کەوت، بە فریایان بگەن. وەختێک بەو قەناعەتە گەیشتن، لەشکرەکان گەڕانەوە و جەنگاوەرانی هەڵبژاردە شەڕێکیان دەست پێکرد کە هیچ براوەیەکی لێنەکەوتەوە. چونکە لە شەش‌سەد شەڕکەر تەنیا سێ کەس بە زیندوویی رزگاریان هات. ئەوانەش بریتی بوون لە ئالکینۆر و خرۆمیۆس لە ئارغۆسی‌یەکان و ئۆتری‌ئادیس لە لاکێدێمۆنی‌یەکان. وەختێک شەڕ تەواو بوو، هەردوو ئارغۆسی‌یەکان بەو حیسابەی کە براوەی شەڕن، بە راکردن چوونەوە وڵاتی ئارغۆس. بەڵام ئۆتری‌ئادیس، کابرای لاکێدێمۆنی کوژراوەکانی ئارغۆسی تاڵانکرد و چەک و چۆڵی کشتیانی هێنا بنکەی جەنگی خۆی و دووبارە گەڕایەوە شەڕگە. رۆژی دوایی لایەنەکانی شەڕ بۆ ئاگاداربوون لە بارودۆخەکە بەرەو مەیدان هاتن و گەرەکیان بوو بزانن چی و کێ ماوە. سەرەتا هەردوو لایەن ئیدیعای سەرکەوتنیان کرد. ئارغۆسی‌یەکان دەیانگوت کە ژمارەی پتری جەنگاوەری زیندوویان هەیە، واتە دوو کەس رزگاریان هاتووە، بۆیە براوەی شەڕن. لاکێدێمۆنی‌یەکانیش لە وڵامدا دەیانگوت کە ئەو دوو کەسە زیندووە رایانکردوە، لە حاڵێکدا شەڕکەی ئەوان وەک پاڵەوان لە مەیدان‌دا ماوەتەوە و

---

کیتیرا هەڵکەوتووە و لە بەشی کەناراوییەکانی باشووری رۆژهەڵاتی پێلۆپۆنیسە. هەروەها بەهۆی ریزە چیایەک لە قەراخەکانی چۆمی ئێفرۆتاس و کەنداوێک کە ئەو چۆمە لەوێوە دەڕژێتە نێو بەحر، جیا دەبێتەوە. ناوچەی تیرێئا باکوورترین بەشی ئەو هەرێمە پێکدێنێ.

١- کیتیرا، دورگەی عەشق و یەکێک لە دورگەکانی یۆنانە و ئەمڕۆ ناسراوە بە سێریگۆ.

٢- مەبەست ئەو کۆمەڵە دورگە بچووکانن کە لە دەوروبەری دورگەی کیتیرا هەڵکەوتوون.

چەک و سیلاحی جەنازەکانی کوژراوی کۆکردۆتەوە. بەهەر حاڵ ئەو گرفتە دووبارە تووشی جەنگێکی‌تری کردنەوە و ژمارەیەکی فرە لە هەردوو لایەن کوژران و لە ئاکامدا سپارتییەکان سەرکەوتن. سەر تاشینی ئارغۆسی‌یەکان لەو کاتەوە دەستی پێکردەوە، چونکە پێیانوابوو براوەی شەڕن، ئەگینا بەر لەو پێکهەڵپڕژانە خاوەن قژی درێژ بوون. ئەوان هەروەها کردبوویانە قانوون و نفرین کە لە ئارغۆسی‌یەکان هیچکەس بۆی نییە پێش بە درێژبوونی قژی بگرێ و ژنانیش بۆیان نییە بە زێڕ و ئاڵتوون خۆیان برازێننەوە، تا ئەو کاتەی هەرێمی تیرێئا[1] دووبارە لەدەست داگیرکەر دێننەدەر. لاکیدێمۆنی‌یەکان بەپێچەوانەوە بڕیارێکی‌تریاندا. ئەوان بەر لەو شەڕە نەیاندەهێشت سەر و ردێنیان بێ، دوای ئەو پێکدادانەی تیرێئا، ئەوجار کورتیان نەدەکردەوە.[2] ئۆتری‌ئادیس، ئەویش لەنێو جەماوەری سێسەدکەسی کوژراوانی سپارتی‌دا، چونکە هاورێکانی کوژرابوون و هەر ئەو زیندوو مابۆوە، شەرمی دەکرد بگەڕێتەوە وڵاتی سپارت. زۆری پێنەچوو لەشاری تیرێئا خۆی کوشت.

**[٨٣]** لەو کاتەدا کە سپارتییەکان تووشی گرفتی شەڕ لەگەڵ ئارغۆسی‌یەکان هاتبوون، راسپاردەکانی شاری سارد گەیشتنە لای سپارتییەکان و رایانگەیاند کە کریسۆس لە گەمارۆ کەوتووە و پێویستە بە هانایەوە بچن. لاکیدێمۆنی‌یەکان هەرکە گوێیان لە قسەی راسپاردەکان بوو، وەبیر دیاری و خەڵات و یارمەتی کریسۆس کەوتنەوە. راست لەو وەختەدا کە کۆببوونەوە و کاروانەکانیان ئامادەی حەڕەکەت دەکرد، خەبەر هات کە

---

١- ٤٢٠ی پێس زایین، واتە سەدەیەک دواتر، ئارغی‌یەکان هێشتا ئەو زیانەی لە دەڤەری تیرێئا پێیان‌گەیشتبوو، فەرامۆشیان نەکردبوو. ( توکیدیس، کتێبی ٥، پاراگرافی ٤١: ئارغی‌یەکان لە گفتوگۆ لەگەڵ لاکیدێمۆنی‌یەکان سەبارەت بە ناوچەی کینۆسۆریا، داوای بەشداری لایەنی سێهەمیش وەک حەکەم و دادوەر لەو دانیشتنەدا دەکەن.)

٢- پلوتارخیس لە کتێبی لیساندرۆدا دەڵێ ئەو نەریتە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی لیکورغۆس. دانیشتووانی ئارغۆسی تا ساڵی ٤٢٠ی پێش زایین، واتە یەک سەدە بەر لەو مێژووە، هێشتا ئامادەی لەدەستدانی ناوچەی تیرێئا نەبوون.

قەڵای لیدی‌یەکان داگیرکراوە و کریسۆس بەدیل گیراوە. لاکێدیمۆنی‌یەکان تەواوێک بەو شکستە دڵگران بوون و دەستیان لە ئامادەکاری هەڵگرت.

**[٨٤]** شاری سارد بەو چەشنە داگیرکرا. رۆژی چواردەهەمی گەمارۆ، کوروش بە تەواوی لەشکرەکەی راگەیاند، هەر سەربازێک یەکەم کەس بێ کە بتوانێ لە دیواری قەڵا وەسەر کەوێ، پاداشێکی بەوەجی دەدرێتێ. دوای ئەو راگەیاندنە، سەربازانی کوروش وەخۆ کەوتن و هیچ دەستکەوتێکی لێنەکەوتەوە و وازیان لێهێنا. سەبازێکی ماردی[1] بە ناوی ئیریادیس هەوڵیدا لە شوێنێکی دیوار کە پاسەوانی بۆ دانەندرابوو، وەسەرکەوێ. دیارە لیدی‌یەکانیش پێیانوانەبوو کە ئەو شوێنە پێویستی بە پارێزگاری هەیە، چونکە رەوەز و هەڵدێر بوو.

ئەو نوختەیە تەنیا جێگایەک بوو کە کاتی خۆی، پاشای دێرین (باستان)ی ساردی‌یەکان بە ناوی میلیس هەمان بێ‌مبالاتی کردبوو. میلیس پاشا خاوەن شێرێک بوو. ئەو شێرە وەک منالێکی بیژوو لە مەعشوقەکەی ئەو پاشایە لەدایکببوو(گوتەی پێشینیان). تاڵەبینەکانی باژێری تێلمیسوس پێشگۆییان کردبوو کە شاری سارد قەت داگیرناکرێ، ئەگەر شێر لە بەدەوری شاردا بخولێتەوە. میلیس پاشا دەستووری دابوو ئەو شێرە بەدەوری ئەو بەشە لە حەساری شاردا بگێرن کە لە بەرامبەر ئاکرۆپۆلیس دروستکراوە، بەڵام گرینگی بەو نوختەیە نەدابوو. ئەویش پێیوابوو ئەو شوێنە رەوەز و حاستەم و لەگیران نەهاتووە. ئەو رەوەزە بەرەورووی چیاکانی تمۆلۆس هەڵکەوتووە.

ئیریادیسی ماردی رۆژێکیان دیتی کە کەسێکی لیدی لەو شوێنەی قەڵارا بەرەو خوارەوە داگەرا بۆوەی کڵاوخودێک (کڵاوی ئاسن) هەڵگرێتەوە. کڵاوەکە بەربۆوە. کابرای لیدی کڵاوەکەی هەڵگرت و بەرەو قەڵا تێهەڵبۆوە. ئەو رووداوە سرنجی ئیریادیسی گەلێک راکێشا. هەربۆیە ئەویش بەو شوێنەدا سەرکەوت و پارسەکانیش بەدوایدا چوون. کاتێک ژمارەیەکی فرە لە

---

١- یەکێک لە هۆزەکانی فارسی سەحرانشین بوو

سەربازەکانی پارس بەو بەرزاییەدا بەرەو ژوور هەڵگەڕان، قەڵای ساردی‌یەکان داگیر و تاڵان کرا.[1]

[٨٥] بابگەڕێمەوە سەر گرفتی کریسۆس. ئەو بەو شێوەیەی خوارەوە دەسبەسەرکرا. ناوبراو منالێکی هەبوو کە پێشتر باسم لێوە کردوە. ئەو منالە وشیار، بەڵام لاڵ بوو. لە سەردەمی خۆشی و پاشایەتیدا، کریسۆس هەوڵی فرەی بۆ چاکبوونەوەی ئەو کوڕەدا. راسپاردەی ناردبووە دێلفوس و داوای رێنوێنی و ئامۆژگاری کردبوو. پیتیا بەو شێوەیە وڵامی کریسۆسی دابۆوە.

*"لیدیێ، ئەی کریسۆسی نەفام، تۆ کە پاشای کۆمەڵێک مرۆڤی، ئاواتی بیستنی دەنگی کوڕە خۆشەویستەکەت لەنێو بارەگادا مەخوازە.*
*باشتر وایە لە خۆتی دوور بکەیەوە، چونکە لە رۆژی لێقەومانی تۆ وەدەنگ دێت".*

کاتێک هێزی پاسەوانانی بارەگا تەسلیمبوون، یەک لە سەربازانی پارس کە کریسۆسی نەدەناسی، پەلاماری کوشتنی‌دا. کریسۆس لەو وەختەدا مەترسیدارەدا بۆی گرینگ نەبوو کە خەریکە بەدەست سەربازێک دەکوژرێ. وەختێک منالە لاڵەکە چاوی بەو شەڕکەرە پارسە کەوت کە پەلاماری باوکی دەدات، گەلێک ترسا و لەتاوان یەک بەخۆی هاواری لێ‌بەرزبۆوە: "کابرا، لەگەڵ تۆمە، کریسۆس مەکوژە! ". ئەوە یەکەم کۆپلە وشە بوون لە زاری کوڕە هاتنەدەر و لەو کاتەوە تا ئاخری عومری توانی قسە بکات.

[٨٦] هەروەک گوتم، پارسەکان شاری ساردیان داگیرکرد[2] و کریسۆس‌یان بەدیل‌گرت کە چوار ساڵ پاشایەتی کردبوو و چواردە رۆژیش لە گەمارۆ کەوتبوو. بەپێی پێشگۆیی تاڵەبینەکان، پاشایەتییەکی گەورە

١- مێژووەکەی ناروونە، بەڵام پۆلیڤیۆس لە کتێبی حەوتەم، لە پاراگرافی پازدەدا دەڵێ کە ساڵی ٢١٥ی پێش زایین شاری سارد بەهۆی قەڵشتێک لە دیوارەکەیدا داگیرکرا.

٢- بۆچوونی‌تر دەڵێن رەنگە ساڵی ٥٤٧ یا ٥٤٦ی پێش زایین بووبێ. هەرچەند پۆلیڤیۆس باس لە گیرانی ئەو شارە لە ساڵی ٢١٥ی پێش زایین دەکا.

لەنێوچوو کە مەبەست هەمان دەسەڵاتدارییەتی کریسۆس بوو. پارسەکان کاتێک کریسۆس‌یان بەدیل‌گرت، بردیانە لای کوروش. کوروش دەستووری‌دا ئاگرێکی گەورە داگیرسێنن و کریسۆس بە دەسبەستراوی لەسەر ئەو مەنجەنیقە هەڵواسن. لەگەڵ کریسۆس چواردەکەسی‌تری لیدی بە هەمان شێوە هەڵواسرابوون. کوروش لەمەر ئەو کارە، چەند مەبەستی سەرەکی هەبوو. ناوبراو دەیویست سەرەتا وەک یەکەم نێچیر، ئەوجار وەک نەزر و پەیمان، هەڵواسراوەکان چەشنی قوربانی پێشکەش بە یەکێک لە خواکان بکا. لەلایەکی‌تریشەوە، کوروش دەیزانی کە کریسۆس مرۆڤێکی لە خواترسە و بۆیە ویستی لێی‌ڕوون‌بێتەوە، ئاخۆ کەسێک لە خواکان لە فریای ئەو لێقەوماوە دەکەوێ یا بەزیندوویی لەنێو ئاگری مەنجەنیق‌دا دەسووتێ. کاتێک کریسۆس بە زیندوویی بیری لە نەهامەتی و چارەنووسی خۆی دەکردەوە، لەبەر ناهومێدی، وەبیر قسەکانی سۆلۆنۆس کەوتەوە. سۆلۆنۆس کاتێک میوانی کریسۆس بوو، قسەی خوایەکی بە ناوبراو گوتبوو، واتە هیچ مرۆڤێک تا ئەو ڕۆژەی نەمردوە، ناتوانرێ وەک کەسێکی بەختەوەر سەیربکرێ. ناوبراو خۆی کۆکردەوە و هەناسەیەکی هەڵکێشا و پاشان بۆ ماوەیەکی زۆر بێدەنگ بوو. تەنیا سێ جار هاواری کرد:

سۆلۆنۆس....سۆلۆنۆس....سۆلۆنۆس. کوروش گوێی لە هاواری کریسۆس بوو و ڕاوێژکارەکانی خۆی بانگ‌کرد تا لە ناوبراو بپرسن کە چی گوت و ئەو کەسە کێیە کە هاواری دەکاتێ. کریسۆس فەترەیەک بێدەنگ و هیچ وڵامێکی نەدایەوە. دواتر ناچاریان کرد و ئەویش وەقسە هات. "وەک گشت حوکمڕانە زاڵمەکان، گەرەکم بوو تەنیا لەگەڵ ئەو قسە بکەم، هەرچەند ئێستا خەریکم تاوانی هەڵسوکەوتی ئەو سەردەمی خۆم دەدەمەوە ". هیچکەس لە قسەکانی کریسۆس تێنەگەیی. لێیان پرسی مەبەستی لەو قسانە چییە؟ پاش زەختێکی زۆر، کریسۆس وڵامی‌داوە کە لە سەردەمی پاشایەتییەکەیدا، سۆلۆنۆس میوانی ئەو بووە. سۆلۆنۆس کابرایەکی ئاتێنی، بەبێ لەبەر چاوگرتن و پێهەڵگوتن بە سامانی کریسۆس، زۆر شتی بە ناوبراو گوتووە

که ئێستا وەڕاست گەڕاون. قسەکانی سۆلۆنۆس تەنیا سەبارەت بە کریسۆس نەبوون، بەڵکوو گشت مرۆڤەکانی گرتۆتەوە، بەتایبەت ئەو کەسانەی پێیانوابوو بەختەوەرن. بەدەم ئاخاوتنی کریسۆس، ئاگر خەریک بوو بڵێسەی دەگرت و دەوری ناوبراوی تەنیبوو. کورووش گوێی لە دیلمانجەکەی گرتبوو کە قسەکانی کریسۆسی وەردەگێڕایەوە، خێرا لەو کارەی خۆی پەشیمان بۆوە. کورووش بیری لەوە کردەوە کە خۆی مرۆڤە و ئینسانی نییە کە کەسێک بە زیندوویی وەسەر ئاگر بنێی، ئەویش پیاوێک کە رۆژگارێک وەک ئەو پاشا بووە. لەوە ترسا مەبادا لە داهاتوودا خۆیشی تووشی چارەنووسێکی هاوشیوە بێت و هیچ قەومانێک لەو جیهانەدا، نامومکین نییە. فەرمانیدا خێرا ئاگرەکە بکوژێننەوە و کریسۆس و چواردە کەسەکەی هاوڕێی دابەزێنن. خەڵکەکە دەرەقەتی کوژاندنەوەی ئاگرەکە نەهاتن.

[۸۷] لیدییەکان دەگێڕنەوە کە کریسۆس هەستی بە پەژیوانی کورووش کرد. خزمەتکارەکانی کورووش خەریکی کوژاندنەوەی ئاگربوون بەڵام هیچیان لەدەست نەهات. کریسۆس بانگی خواوەند ئاپۆلۆنی[۱] کرد، بە قیژاندن داوای لێکرد لە فریای کەوێ و دیاری و خزمەتەکانی خۆی وەبیر ئەو خوایە خستەوە. پاش سەردانواندن و ئیتاعەت لە خواوەند ئاپۆلۆن، ئاسمانی ساف و بێ پەڵە و با گۆڕا و لەناکاو هەوری رەش وەدیارکەوتن و دنیا تاریک بوو و رێژنەی بارانی بە خوڕێن دایکردێ و ئاگرەکەی کوژاندەوە. ئەو رووداوە کورووشی بە قەناعەت گەیاند کە کریسۆس چەندە بە لای خواکان و خەڵکەوە خۆشەویستە. کورووش فەرمانیدا کریسۆس دابەزێنن و ناوبراو بەو شێوەیە لە سووتان و برژان رزگاری هات. کورووش پێیگوت: "کریسۆس کێ تۆی رازی کرد کە پەلاماری وڵاتی من بدەی و لەجیات دۆستایەتی، دوژمنایەتی من بکەی؟ ". کریسۆس وڵامی داوە: "پاشا، من ئەو کارەم بۆخاتری بەدبەختی خۆم و بەختەوەری تۆ کرد. هەڵبەت هۆکاری گشت کارێک، تەنیا

---

۱- ئاپۆلۆن، خواوەندی رۆشنایی و نوور لە یۆنانی باستان و سەکەوتوو و ناسراو لە پێشگۆیی و ئامۆژگاریدا.

خوای یۆنانییەکانە. ئەو منی هاندا دژی تۆ لەشکرکێشی بکەم. هیچ کەس پێیوانییە شەڕ لە ئاشتی باشترە. ***لە کاتی ئاشتیدا، منال جەنازەی باوکی دەنێژێ، بەلام لە شەڕدا باوک تەرمی منال بە خاک دەسپێرێ.*** بۆیە دەڵێم، خواکان گەرەکیان بوو کە ئەو ڕووداوانە بقەومێن ".

[٨٨] ئەوە وڵامی کریسۆس بۆ کوروش بوو. وەختێک زنجیرەکان لە دەست و پێی کریسۆس کرانەوە، کوروش ناوبراوی لە تەنیشت خۆی دانا و گەلێک بە حورمەتەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵ کرد و خۆی و پیاوەکانی بە سەرسوڕمانێکی فرەوە چاویان لە کریسۆس بوو. کریسۆس دانیشتبوو و لە فکرەوە ڕۆچوبوو و بێدەنگ بوو، بەلام وەختێک دیتی سەربازانی لەشکری کوروش خەریکن پێتەختی وڵاتی لیدی تاڵاندەکەن، بە کوروشی گوت: "پاشا، من دەبێ چیبکەم، پێت بڵێم بیر لە چی دەکەمەوە یا بۆچی بێدەنگم؟ ". کوروش داوای لێکرد کە قسە بکا و چی دڵی دەخوازێ بیڵێ. کریسۆس ئەوسا ڕووی لە کوروش کرد و پرسی: "ئەو جەماوەرە ئاوا بەحەسرەت و بەپەلە خەریکی چین؟ ". کوروش وڵامیداوە کە هەر هەموویان مژوڵی تاڵانکردنی شارن و سامان و دارایی من زیاد دەکەن. کریسۆس دووبارە لێیپرسی: "نە شاری من و نە پارەی من بە تاڵان نابەن، چونکە ئەوانە ئیتر ملک و دارایی من نین. ئەوانە ئەو سەروەتە دەدزن کە ئیتر هی تۆیە ".

[٨٩] کوروش بە بیستنی قسەکانی کریسۆس لە فکرەوە ڕۆچوو. خێرا فەرمانی بە پیاوەکانی خۆیدا دەوری چۆل بکەن. لەجێوە لە کریسۆسی پرسی، بەو هەلومەرجەی خولقاوە، چارەنووسی من چۆن دەبینی. کریسۆس لە وڵامدا گوتی: "ئێستا کە خواکان منیان وەک دیل خستۆتە بەر دەستی تۆ، هەقوایە ئەگەر چاوم بە کردەوەیەکی ناشایست کەوت و سرنجی تۆی ڕانەکێشا، ئاگادارتان بکەمەوە. ئێستا دەبێ بڵێم پارسەکان خەڵکێکی نەدار و رقەستورن. ئەگەر ڕێگای تاڵانیان پێبدەی و خەزێنەکان بەسەر خۆیاندا بەشبکەن، دەستکەوتیان فرە دەبێ ئاکامەکەی ئەوەیە کە: ئەوەی پتر لەوانیتر تاڵانی دەسکەوێ، هەر ئەو دواتر دژی تۆ ڕادەپەڕێ. ئەگەر بە

قسەم بکەی پێویستە بەو چەشنە بجوڵێیەوە: پاسەوانەکانت لەبەردەم دەروازەکانی شار دابنێ بۆوەی پێش بە سەربازانی لەشکر بگرن و ئەو تاڵانەی پێیانە وەریگرنەوە و پێیان بڵێن کە یەک لە دەی ئەو تاڵانە پێشکەش بە خواوەند دیا[1] دەکرێت. بەو شێوەیە هەستی نارەزایەتی ناخوڵقێ و تۆش غەنیمەتەکانت بە زۆری لەوان وەرنەگرتووەتەوە و ئەو کارەی تۆیان بەلاوە دروست و بەرهەقە و بێ دژکردەوەیەک رادەستت دەکەنەوە".

[۹۰] کوروش سەبارەت بەو پێشنیارە سپاسی کریسۆسی کرد و بەلایەوە ئاقڵانە بوو. لەجێوە فەرمانی بە پاسەوانەکاندا پێشنیارەکە جێبەجێبکەن. کوروش ئەوجار رووی لە کریسۆس کرد و گوتی: "کریسۆس، لەبەر ئەوەی کە بە کردار و گوفتار، ئێستاش وەک پاشایەک هەڵسوکەوت دەکەی، هەر خواستێکت هەبێ من خێرا بەجێی دەگەیێنم ". کریسۆس وڵامیداوە: "پاشا، گەورەترین خزمەتی تۆ بە من ئەوەیە کە ئیزنم پێبدەی ئەو کەلەپچە و زنجیرانەی دەست و پێم بنێرمە لای خوای یۆنانییەکان، ئەو خوایەی کە پتر لە خواکانیتر رێزم بۆی هەیە و لێی بپرسم ئاخۆ عادەتیەتی کە هەرکەس رێزی لێبگرێ، خەیانەتی پێبکات! ". کوروش راست لەو کاتەدا لێی پرسی کە بۆچی ئەو داوایە لەو دەکات و گلەیی لە خوای یۆنانییەکان هەیە. کریسۆس لە جوابی کوروشدا، باسی نەخشە و پێشگۆیی تاڵەبینەکانی بەوردی بۆ کوروش کرد. ئەو هەروەها سەبارەت بە دیاری و خەڵاتەکانی خۆی قسەیکرد کە بۆ نێوەندەکانی ئایینی ناردبووی و چۆن فریوی ئەوانی خواردبوو و شەڕی دژی پارسەکان دەسپێکرد. لە کۆتایی قسەکانیدا دووبارە داوای لە کوروش کردوە کە ئیزنی پێبدا کەسێک بنێرێتە لای خواوەند و نارەزایەتی خۆی لەهەمبەر بەدرۆدەرچوونی پێشگۆییەکان رابگەیێنێ. کوروش دەستی بە پێکەنین کرد و گوتی: "کریسۆس، ئەو داوایەشت بەجێدەگەیێنم و ئەگەر خواستیتریشت هەبێ، پێمبڵێ ". وەختێک کریسۆس گوێی لەو بەڵێنانە بوو، چەند کەسێکی لە دانیشتووانی لیدی ناردە

---

۱- دیا، دیۆس یا ژوپیتێر، خوای خواکان، باوکی خواکان.

نێوەندەکانی دێلفوس بۆوەی زنجیرەکانی دەست و پێی ئەو بە سەردەرانەی درگاپەرستگەوە هەڵواسن و لە کاهێنی مەزن بپرسن کە ئاخۆ لەهەمبەر پێشگۆییەکانی کە کردویەتی، هەست بە شەرمەزاری ناکات کە ئاوا بەو شێوەیە کریسۆسی هاندا شەڕی پارسەکان بکا و دەسەڵاتداری کوروش بڕوخێنێ. ناوبراو هەروەها فەرمانی بە راسپاردەکاندا کە زنجیرەکان نیشانی کاهێنی مەزن (پیتیا) بدەن و پێی‌بڵێن کە کریسۆس ئەو دیارییەی بۆ ئەو ناردوە. لە کۆتاییدا نوێنەرانی کریسۆس دەبوایە لە خوای یۆنانییەکان بپرسن داخوا ناسپاسی بەشێک لە یاسا و قانوونی ئەو خوایانەیە.

[٩١] وەختێک راسپاردەکانی لیدی گەیشتنە دێلفوس، ئەوەی پێیان گوترابوو، گێڕایانەوە. دەڵێن پیتیا لە وڵامی راسپاردەکاندا گوتوویەتی: "کارەسات و چارەنووس، خواش ناتوانێ لەبەریان هەڵێ. کریسۆس تاوانی چوارەمین جەددی خۆی داوەتەوە. ئەو سەردەمە نیزامییەکی ئاسایی ئیراکلی‌یەکان، قبوڵی‌کردوە بە نەخشەیەکی حیلەکارانە و بە جلوبەرگی ژنانە، ئاغای خۆی بکوژێ و دەسەڵات بگرێتە دەست، بەبێ ئەوەی مافی ئەوەی هەبێ. خواوەند لۆکسی‌یاس[1] هەوڵی تەواوی داوە ژیان و ئاسایشی دانیشتووانی ناوچەی سارد لە زەمانی فەرمانڕەوایی کریسۆس‌دا تێکنەچێ، بەڵکوو ویستوویەتی ئەو وێرانییە لە کاتی حوکمڕانی منداڵەکان ئەودا بقەومێ، بەداخەوە ئەویش نەیتوانیوە پێش بە رەوتی چارەنووس بگرێ". وەختی گەڕانەوەی راسپاردەکان، ئاپۆلۆن ئەوەشی پێگوتن کە "ئەو چارەنووسەی بەسەر دانیشتووانی ناوچەی سارد هاتووە تەنیا بۆخاتری کریسۆس وەدرەنگی خستراوە، ئەگینا ئەوجۆرەی خوای قسمەت و نسیب دیاری کردبوو، ناوبراو دەبوایە سێ ساڵ پێشتر بەدیل بگیرێ. جیا لەوەش، وەختێک لەسەر مەنجەنیقی ئاگردا دەسووتا، خواوەند لە فریای کەوت. سەبارەت بەو رووداوانەش کە لەو ماوەیدا قەوماون، کریسۆس بە ناهەق نێوەندی تاڵەبینی تاوانبار دەکا. خواوەند لۆکسی‌یاس پێشتر ئاگاداری کردبۆوە کە ئەگەر

١- یەک لە ناوەکانی‌تری خواوەند دیا.

لەشکرکێشی دژی پارسەکان بکا، هێزێکی زۆر گەورە لەنێودەچێ. کریسۆس ئەگەر گەرەکی بوو کە بڕیاری دروست بدا، وەختێک ئەو ڕێنماییەی پێدەگەیی، پێویست بوو دووبارە راسپادرە بنێرێ و بپرسێ کە مەبەست لە تێداچوونی هێزێکی گەورە چییە، ئایا لەشکری ئەوە یا هی کوروشە. کەوابوو کریسۆس خۆی لەوبارەوە تاوانبارە. وەختێک بۆ دوایینجار داوای پێشگۆیی و ئامۆژگاری کرد، لۆکسییاس باسی لە هێسترکرد، کریسۆس لەوەش تێنەگەیی. لەڕاستیدا کوروش ئەو هێسترە بوو کە لە پێشگۆییەکاندا وەبەرچاو کەوتبوو. ناوبراو باب و دایکی لە رەچەڵەک و نیژادی جیاواز بوون دایکی لە چینی ئاریستۆکرات و باوکی لە چینی نزم بوو. دایکی میدی و کچی ئاستیاگی پاشای وڵاتی میدیا، لە حاڵێکدا باوکی پارس و دانیشتوویەکی وڵاتی میدیا بوو. وەختێک ناوبراو لەگشت بارێکەوە، لە نزمترین پلەدا بوو، زەماوەندی لەگەڵ کچی پاشای خۆی کرد ". ئەوە وڵامی پیتیا بە راسپاردەکانی لیدی بوو. ئەوانیش کاتێک گەیشتنەوە شاری سارد، ئەو قسانەیان بۆ کریسۆس گێڕاوە. کریسۆس وڵامەکانی بەلاوە دروست بوون و قبوڵی کرد کە خۆی هەڵەی کردوە نەک خواوەند(کاهێنی مەزن، واتە پیتیا).

**[٩٢]** ئەو ڕووداوانە لە سەردەمی پاشایەتی کریسۆس و لە یەکەم وەجبەی داگیرکرانی وڵاتی یوونیدا قەومان. لە یۆنان کۆمەڵێکی زۆر لە دیارییەکانی کریسۆس هەن، نەک هەر ئەوانەی تا ئێستا باسم لێوەکردن. لە شاری تیڤا، سەر بە هەرێمی ڤیۆتییا، یەکدانە سێ پایەی زێڕ هەیە کە کریسۆس وەک خەڵات بۆ پەرستگەی ئاپۆلۆنا لە ناوچەی ئیسمینێۆ ناردویەتی. لە ئێفێسۆ کۆمەڵێک پەیکەرەی مانگا دروست کراو لە زێڕ و ژمارەیەکی فرەش کۆڵەکە و ستوون هەن. لە نێوەندی ئایینی دێلفوس چاومان بە قەڵغانی زێڕی ئاتینای پرۆنێئی[١] دەکەوێ. ئەوانە گشتیان لەلایەن کریسۆسەوە وەک خەڵات بۆ دێلفوس ناردراون. ناوبراو ئەو دیارییانەی کە

---

١- ئیلاهەی یۆنانی باستان و خوای بیر و ئەندێشە.

پێشکەش بە پەرستگەی ئامفیاریئۆسی[1] کردوون، بە پارەیەک دروست کران کە میراتی باوکی بوو و بۆ ئەو بەجێمابوو. باقی خەڵاتەکانیتر بە پارە و سامانی کەسێکی نەیارەوە چاککران. ئەو کابرا نەیارە، بەرلەوەی کریسۆس ببێتە پاشا، لەگەڵ پادالیئۆن رێکەوتبوو و سەرهەڵدانی دژی پاشای لیدی سازکردبوو و گەرەکی بوو دەسەڵات بۆ پادالیئۆن مسۆگەربکا. پادالیئۆن کوڕی ئالیئاتیس و زڕبرای کریسۆس بوو. دایکی پادالیئۆن خەڵکی یوونیا بوو. کاتێک کریسۆس دەسەڵاتی لە باوکی وەرگرت، دژبەرەکەی خۆی بە زەبری شەی خوری کردن کوشت و لەتوپەتی کرد. ئەو هەروەها دەستی بەسەر سامان و دارایی ئەو نەیارەدا گرت. هەڵبەت ئەو پارە و سامانە پێشتر وەک خەڵات بۆ خواکان داندرابوو. کریسۆس خێرا ئەو سامانەشی بەسەر شوێنە ئایینییەکاندا بەشکرد و منیش پێشتر باسم لێوە کردوە. سەبارەت بە خەڵات و دیارییەکانی کریسۆس هەر ئەوەندە زانیارییەم دەسکەوتووە.

[۹۳] جیا لەو وردە زێڕەی کە لە چۆمی (تمۆلو)وە[2] دەرژێتەخوار، بابەتی زۆر سرنجڕاکێش کە بۆ نووسین ببن، لە وڵاتی لیدی دەسناکەون، وەک ئەوانەی لە وڵاتانیتر دەیانبینین. تەنیا شتێکی بەرچاو کە لە گشت کارە هونەرییەکانی دەسکردی مرۆڤ گەورەتر بێ، ئارامگەی ئالیئاتیسی باوکی کریسۆسە، هەڵبەت جیا لەوانەی میسر و بابێل. بناخەی ئەو ئارامگەیە لە بەردی گەورە و باقی دیوارەکانی بە قوڕ دروستکراون. ئێستا، پێنج کۆڵەکەی ئەو مەرقەدە ماون و لەسەر هەرکامیان ناوی ئەو وەستاکارانە هەڵکەندراوە کە کام بەشیان دروستکردوە. مەخاریجی سازکردنی ئەو بینایە بەهۆی خەڵکی بازاڕی و کچانی لیدیایی دابینکراوە. لە هەڵسەنگاندنی بەشەکاندا دەردەکەوێ کە گەورەترین بەشی ئەو بینایە بە یارمەتی و تێکۆشانی کچەکان سازکراوە. کچانی لیدیایی بەپانەوە، تا کاتی مێردکردنیان، مژوڵی لەشفرۆشی دەبن، بۆوەی پارەی جهێزیان دابین بکەن و مێردێک

---

١- کاهێنێکی مەزنی شاری ئارغۆس بووە.

٢- لەگەڵ چۆمی ناسراوی پاکتولیۆ کە لەو شاخەوە سەرچاوەی گرتبوو.

بدۆزنەوە. دەوری حەساری ئەو مەرقەدە شەش ستادیۆ و دوو پلێترا[1] و بەرینایییەکەشی سێزدە پلێترا دەبێ. لە نیزیک ئەو ئارامگەیە، گۆلێکی گەورە هەڵکەوتووە.[2] وەک لیدیەکان باسدەکەن هیچکات ئاوی لێنابڕێ و ویشک هەڵناگەڕێ. ئەو گۆلە ناسراوە بە ییغیس. ئەوەش نەختە زانیاریەکی من سەبارەت بەو ئارامگەیە بوو.

[٩٤] لیدیەکان خاوەن دابونەریتی هاوشێوەی یۆنانییەکانن. جیاوازیان تەنیا لەوەدایە کە کچەکانیان لەبەر لەشفرۆشی دەنێن. ئەوەندەی من بزانم، لیدیەکان یەکەم خەڵکانێک لە بڕین و دەکارکردنی پارەی زێڕ و زێو و بازرگانیدا خاوەن ئەزمون بوونە. ئەوان هەروەها دەڵێن کە کێبەرکێ و یاریەکانی یۆنانیەکان، سەرەتا هی ئەوان بووە و بۆ دۆزینەوەیان بیر و خەیاڵی خۆیان بەکارهێناوە و زۆربەیان لە سەردەمی کۆچکردنی بەشێک لە دانیشتووانی لیدیایی بۆ وڵاتی تیرانیا سازکراون. ئەوان لەو بارەوە دەڵێن: وەختێک ئاتیس، کوڕی مانی[3] پاشایەتی دەکرد، قاتی و برسێتی سەراسەری وڵاتی تەنییەوە. لیدیەکان سەرەتا لە هەمبەر برسێتیدا خۆیان ڕاگرت. دواتر، لەبەرئەوەی بارودۆخەکە بەردەوام و دژوارتر دەبوو، هەرکەسە لەبەر خۆیەوە خەریکی دۆزینەوەی ڕێگا چارەیەک بوو بۆوەی کۆتایی بەو نەهامەتییە بێنێ. ڕاست ئەو دەورانە بوو کە کایەی تاوڵە و جگێن و گشت یارییەکانی هاوشێوە، جیا لە شەترەنج دۆزرانەوە. لیدیەکان خۆیان لەو باوەڕەدا نین کە شەترەنج دەستکردی ئەوانە. ئەوان بەو شێوەیە ململانێیان لەگەڵ برسێتی دەکرد. ڕۆژی یەکەم لە بەیانییەوە تا ئێوارە کایەیان دەکرد، بۆوەی بیر لە خواردن نەکەنەوە. ڕۆژی دووهەم هەر هەمووی خەریکی خواردن دەبوون. هەژدە ساڵی ڕێک بەو چەشنە تێپەڕی. بەڵای برسێتی نەک هەر لە یەخەیان نەبۆوە، بەڵکوو ڕەوشەکە ئاڵۆزتریش بوو. پاشای لیدی،

---

١- هەر ١ پلێترا لە یۆنانی باستان، وەک پێوانەی مەودا بەرابەری یەک لە شەشی ستادیۆیەک بووە، دەکرێ بڵێین نیزیک بە ٣٠ میتر.

٢- ئەوە هەمان گۆلە کە لە کتێبی ئیلیادا باسی کراوە و ئەمڕۆ بەناوی دەریای مەرمەرە ناسراوە.

٣- یەکەم پاشای ئەفسانەیی وڵاتی لیدیا، کوڕی خواوەند دیا و ئیلاهە یێئا (خوای زەوین).

دانیشتووانی بەسەر دوو دەستەدا دابەشکرد. ناوبراو شێر و خەتی بۆ هەڵاویشتن و بەو چەشنە دیاریکرا کە کام دەستە دەبێ ڕێگای کۆچبەری بگرێتەبەر. پاشا لە وڵاتی لیدی مایەوە، بەڵام کوڕەکەی خۆی بەناوی تیرینۆ وەک پاشای کۆچبەران دیاریکرد. ئەوانەی دەبوایە کۆچ بکەن، بەرەو دورگەی سمیرنی[1] وەڕێکەوتن. گشتیان سواری کەشتی بوون و باربنەیان بە کۆڵیان تێکنا و بەدوای دۆزینەوەی شوێنێکدا گەڕان تا بتوانن بژیوی خۆیان دابینبکەن. پاش گەڕان و سوڕانی زۆر بە وڵاتاندا، گەیشتنە هەرێمی ئۆمبریکی، لەوێ دامەزران و تا ئەمڕۆ لەو دەڤەرە ماون. ئەوانە ناوی لیدی‌یان لەسەر نەما و وەک تیرینی دەناسرێن، دەگەڕێتەوە بۆسەر کوڕی پاشای لیدی‌یەکان بوو. لەو لایەشەوە، خوودی لیدی‌یەکان بوونە یەخسیری بەر دەستی پارسەکان.

### فەرمانڕەوایی میدییەکان

**[٩٥]** ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە باسی کوروش بکەم و بڵێم ئەو مرۆڤە کێ بووە کە کریسۆسی شکستدا و پارسەکان چۆن بوونە فەرمانڕەوای ئاسیا. هەرچەند سەبارەت بە کوروش سێ جۆر زانیاریم لەلایە، بەڵام من زانیاری چوارەم دەخەمە بەرباس و پشت بەو بۆچوونانە دەبەستم کە هێندێک زانای پارسی جێگای باوەڕ قسەیان لێکردوە، واتە ئەوانەی گەرەکیان بووە ڕاستییەکان بڵێن، نەک پێهەڵگوتنی کوروش بێ.

ئاسووری‌یەکان(ئاشووری) بۆ ماوەی پێنسەد ساڵ دەسەڵاتداری ئاسیای ژوروو بوون. میدییەکان یەکەم نەتەوە بوون کە دژی ئاسووریەکان ڕاپەڕین. ئەوان بۆ ڕزگاری و سەربەستی خۆیان شەڕی ئاسووری‌یەکانیان کرد و جوامێری و بوێرییان نواند و سەربەستییان وەدەستهێنا. دواتر گەلانی‌تریش چەشنی میدییەکان هەمان ڕێگایان گرتەبەر و خۆیان ڕزگارکرد.

---

١- شاری سمیرنی، ئەمڕۆ ناسراو بە ئەزمیر هەڵکەوتوو لە کەنارەکانی دەریای مەدیترانە.

[٩٦] دوای ئەو ئاڵوگۆڕانە، گشت گەلانی ئاسیای بچووک بوونە خاوەن سەربەخۆیی خۆیان، بەڵام دواتر دووبارە چەشنی کۆیلە و یەخسیر کەوتنە ژێردەستی تاکە کەسێک. ڕەوتی ڕووداوەکان بەو شێوەیە بوو: لەنێو میدییەکاندا مرۆڤێکی وشیار و زیرک بە ناوی دییۆکیس (دیاکۆ)، کوڕی فەرائۆرت هاتە مەیدان. ناوبراو ئەو کاتە قازی بوو. دیاکۆ ئاواتی دەخواست دەسەڵات بەدەستەوە بگرێ و بۆ ئەو مەبەستە بەو چەشنە هەڵسوکەوتی کرد. میدییەکان لە شارۆچکەکانیان دەژیان. دیاکۆ سەرەتا لە شارۆچەکەی خۆی و دواتر لە سەراسەری وڵاتدا بوو بە خاوەن ناو و ناوبانگ و ڕێز و حورمەت. ناوبراو بەرەبەرە و پتر لە پێشوو هەوڵی وەدەسخستنی دەسەڵاتیدا. تێکۆشانی ئەو ڕاست لەو سەردەمەدا بوو کە لە سەراسەری وڵاتی میدیادا بێسەرە و بەرەیی حاکم بوو و هیچکەس بایەخی بە یاساکانی حکوومی نەدەدا. دیاکۆ دەیزانی کە ناهەقی، دوژمنی سەرەکی هەق و ڕاستییە. دانیشتووانی میدی، هاوڵاتی ناوبراو کاتێک چاویان بە ئەخلاق و ڕەفتاری باشی ئەو کەوت، وەک قازی خۆیان هەڵیانبژارد. ئەویش لە خەیاڵی خۆیدا، بیری لە وەدەسخستنی حوکمڕانی وڵات دەکردەوە. بۆیە بە نەزاکەت و جوامێرییەوە، لەگەڵ خەڵک هەڵسوکەوتی کرد. هاوڵاتییانی دیاکۆ، کاتێک ئەو ڕەفتار و گوفتارە باشەی ئەویان بینی وەک دادوەری خۆیان هەڵیانبژارد . دادپەروەری دیاکۆ ناوبانگی لە ناوچەکانی دەوروبەریش دەرکرد و وەختێک خەڵک پێیانزانی کە یەکەم کەسە ئاوا بەرهەق دەجوڵێتەوە و خۆشیان گەلێک ناهەقییان لەدەست حاکمانیتری ئەو سەردەمە دیتبوو، خێرا و بەردەوام ڕوویان لە ناوبراو دەکرد و سکاڵاکانیان بۆلای ئەو دەبرد و ئەویش بە گرفتەکانیان ڕادەگەیی و ڕەوشەکە بە جێگایەک گەیی کە خەڵک جیا لەو، نەدەچوونە لای هیچ قازییەکیتر.

[٩٧] ئەو کەسانەی شکایەتیان دەبردە لای دیاکۆ، ژمارەیان ڕۆژبەڕۆژ پتر دەبوو، چونکە دەیانزانی هەردوو لایەن دادگایی بەرهەق دەکرێن. دیاکۆ کاتێ هەستی بەوە کرد کە بۆتە مرۆڤێکی پێویست بۆ کۆمەڵگاکەی، گەرەکی

نەبوو تەنیا لەو شوێنەی خۆی دانیشێ و خەریکی کاری قەزایی بێ، بۆیە رایگەیاند کە ناخوازێ لەوە زیادتر درێژە بەو کارە بدات. بیانووشی بۆ ئەو بڕیارە ئەوە بوو کە لەبەر دادگایی و وەڕێخستنی کاری خەڵکیتر، ناتوانێ بە ژیان و کاروباری رۆژانەی خۆی رابگا. تالان و راوورووت دوبارە سەریان هەڵداوە و خەراپەکاری و ناقانوونی پتر لە پێشوو دەستی پێکردەوە. میدییەکان کۆبوونەوە و بارودۆخەکەیان هەڵسەنگاند و باسی ئەو وەزعە خوڵقاوەیان کرد. بە باوەڕی من دۆستانی دیاکۆ لەو کۆبوونەوەیەدا پتر لە بەشدارانیتر قسەیانکرد: "ئەو رەوشە لەوە زیادتر قبوڵ ناکرێ. ئەگەر قەرار بێ بەو وەزعە ناخۆشە لەو وڵاتەدا بژین، پێویستە پاشایەک بۆ خۆمان دیاری بکەین. بەو شێوەیە هێمنایەتی دەگەڕێتەوە وڵات و ئێمەش دەتوانین خەریکی ژیان و گوزەرانی خۆمان بین و ئیتر لەمەو بەدوا چیتر نیگەرانی خەراپەکاری و بێ یاسایی لە وڵاتدا نەبین ". بەو قسانە خەڵک رازیکران کە پاشایەک حوکمڕانییان بکا.

[٩٨] دیارە خێرا ئەو پرسەش هاتەگۆڕێ کە کێ بۆ پاشایەتیکردن گونجاوە. خەڵک تێکڕا داوای پاشایەتی دیاکۆیان کرد، چونکە توانیبووی دەنگی تەواوی جەماوەر وەدەست بێنێ. کاتێک دیاکۆ لەلایەن گەورەپیاوانی میدیاییەوە هەڵبژێردرا، فەرمانیدەرکرد کە بارەگای پاشایەتی تایبەتی بۆ دروستبکەن و هێزی پاسەوانیی بۆ دابین. چی دیاکۆ داوای کرد، دانیشتووانی میدیایی جێبەجێیان کرد. بارەگای بە قەڵا و بورجەوە بنیاتنرا و ئیزنی پێدرا لەنێو لەشکری میدیدا، بە دڵی خۆی پاسەوانەکانی هەڵبژێرێ. کاتێک دیاکۆ لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت، میدییەکانی ناچارکرد تەنیا یەک شاری مەحکەم و خاوەن قەڵا دروست بکەن و بایەخ بە شارۆچکەکان نەدەن. میدییەکان بە قسەیان کرد و دیواری ئەستوور و بەرزیان لە دەوری شاری تازە دروستکراو سازکرد. ئەو شارە ناوی نرا ئێکباتان. دیوارەکانی شار بازنەیی و لەپشت سەری یەکتر و جیاوازی بەرزاییان تەنیا بە هۆی بورجەکانیانەوە دیاریدەکرا، بەواتایەک دیواری

دووهەم بەرادەی بەژنی بورجەکان لە دیواری یەکم بەرزتر و لە دیواری سێهەم نزمتر بوو. وەستاکارەکان بە ئەنقەست ئەو دیوارانەیان بە شێوەیە دامەزراند تا مەتەرێزەکانیان بەرزتر لە یەکتر بێ. ئەو شوێنەی دیوارەکانیان لێ دروست کراوە، بۆ ئەو مەبەستە دەستی دەدا و لەبار بوو، چونکە تەپۆڵکە و ژێربینای بەرد و رەقی هەبوو. دیارە بۆ جێبەجێکردنی ئەو کارە، پێویستی بە کۆمەڵێکی زۆر وەستاکار هەبوو تا بتوانن بەو چەشنە دایمەزرێنن. دیوارەکانی بازنەیی و لەپشت سەری یەکتر، ژمارەیان حەوت دانە بوو. ئەو گشتە دیوارە قەسرەکان و خەزێنەکانی پاشایەتی‌یان لە باوەش گرتبوو. مەودای دیواری دەرەوە تەقریبەن بە ئەندازەی درێژایی دیواری حەساری شاری ئاتێن دەبوو. مەتەرێزەکان و لێواری دیوارەکان رەنگ کرابوون، بەو شێوەیە کە دیواری یەکەم بە رەنگی سپی، دووهەم رەش، سێهەم سوور، چوارەم شینی ئاسمانی و پێنجەم زەرد نەخشێندرابوون. مەتەرێزەکانی دوو دیواری ئاخر، یەکیان خاوەن رووکێشی نوقرەیی و ئەوەی‌تریش رووکێشی ئاڵتوونی هەبوو.

**[٩٩]** دیاکۆ ئەو دیوارانەی لەبەر باری ئەمنی خۆی دروستکرد. بەو شێوەیە حەساری لە دەوری بارەگاکەی سازکرد و فەرمانی بە خەڵکدا لە دەرەوەی دیوارەکان نیشتەجێ بن. وەختێک کاری بیناسازی تەواو بوو، دیاکۆ سیستەمێکی دامەزراند کە کەس بۆی نەبوو لەمەر کاری شەخسی چاوی بە ناوبراو بکەوێ. هەرکەس کار و گرفتی هەبوایە، پێویست بوو بەشێوەی پەیام یا نووسراوە بدەنە دەست پەیامهێنەرکان. ئەو هەروەها رایگەیاند کە پێکەنین و تف و لەعنەت کردن لە حزوور پاشادا، کردەوەیەکی ناشایستە. ناوبراو بۆیە ئەو بڕیارەی‌دا تا پیاوانی هاوتەمەنی ئەو کە بەدەورییەوە بوون. خەریکی ئێرەیی‌بردن و داڕشتنی پیلان دژی ئەو نەبن. ئەوان گشتیان سەردەمێک پێکەوە ژیابوون و لەباری رەچەڵەک و جوامێرییەوە لە ناوبراو کەمتر نەبوون. بەپێی ئەو یاسا نوێیە، ئەو کۆمەڵە

خەڵکە کەمتر دەچوونەلای دیاکۆ و ناچاربوون بەچاوێکی جیاوازتر سەیری ئەو بکەن.

[١٠٠] کاتێک دیاکۆ ئەو رێوشوێنانەی گرتەبەر و دەسەڵاتی تەواوی بۆخۆی مسۆگەرکرد، هەوڵیدا دادپەروەری و یاسا جێبگرن. خەڵک بە نووسراوە خواست و گرفتی خۆیان دەناردە بارەگای پاشا. ئەویش بڕیاری نیهایی لەسەر دەدان و وەڵامی بۆ خاوەن سکاڵاکان دەناردەوە. دیاکۆ بەو شێوەیە دادگایی و مەحکەمەی جۆراوجۆری بە ئەنجام گەیاند. ناوبراو هێندێک یاسای‌تریشی لەبەرچاوگرت. ئەگەر دیتبای کەسێک ناهەقی کردوە، داوای تاوانبارەکەی دەکرد و پاش دادگایی، بەپێی چۆنییەتی تاوانەکە، حوکمی لەسەر دەدا و کابرای بە سزای خۆی دەگەیاند. دیاکۆ بۆ جێبەجێ‌کردنی ئەو کارە خەڵکی خۆی لە سەراسەری وڵات هەبوو و زانیاری پێویستیان پێدەگەیاند.

[١٠١] دیاکۆ، خەڵکی وڵاتی میدیای بەپانەوە رێکخست و کۆی‌کردنەوە سەر یەک و فەرمانڕەوایی بەسەردا کردن.[١] گەلی میدیا لەو هۆزانە پێکهاتبوو: بووسی، پارتاکنی، ستروخاتی، ئاریزاندی، بوودی و ماغ. ئەو هۆزانە پێکهێنەری نەتەوەی میدیا[٢] بوون.

[١٠٢] دیاکۆ کوڕێکی هەبوو بەناوی فەرائۆرت (فەروەرتیش). ئەو کوڕە دوای مەرگی باوکی کە پەنجاوسێ ساڵ فەرمانڕەوایی کرد، تەنیا بە پاشایەتی خەڵکی میدیا رازی نەبوو. بۆیە سەرەتا لەشکرکێشی کردە سەر پارسەکان، ئەوانی شکستدا و گشتیانی هێنا ژێر رکێفی دەسەڵاتی خۆی. ناوبراو دوای ئەوەی دوو نەتەوەی بەهێزی میدی و پارسی هێنانە ژێر دەسەڵاتی فەرمانڕەواییەکەی، ئەوسا رووی لە گەلانی ئاسیا کرد. فەرائۆرت هەرجارێ شەڕی دژی یەکێک لە گەلانی نیشتەجێی ئاسیا کرد. لە کۆتاییدا

١- ئەو یەککگرتنەی میدیاکان دەبێ بەر لە ٦٨١ی پێش زایین جێبەجێ‌کرابێ.

٢- لەوانە چواریان ئارییین. پاریتاکینی‌یەکان و بوودی‌یەکان لە رەگەزی ئاری نەبوونە کە لەگەڵ میدیاکان ژیاون.

بڕیاری لەشکرکێشی بۆسەر ئاسووڕییەکانی ئەو سەردەمەی شاری نەینەوادا، واتە ئەوانەی سەردەمێک فەرمانڕەوای گشت ئاسیا بوون. ئاسووڕییەکان سەرەڕای ئەوەی خاوەن هاوپەیمانییەک نەبوون و تەواو تەریک مابوونەوە و هاوپەیمانەکانی قەدیمی دژیان راپەڕیبوون، بەو حاڵەش سەرکەوتن و وەختێک فەرائۆرت پەلاماری‌دان، خۆی دوای بیست و دوو ساڵ پاشایەتی لەو شەڕەدا کوژرا و بەشی هەرە زۆری لەشکرەکەشی تێداچوو.

[١٠٣] دوای مەرگی فەرائۆرت، کوڕەکەی بەناوی کیاکساریس، نەوەی دیاکۆ فەرمانڕەوایی وڵاتی بەدەستەوە گرت و دەگێڕنەوە کە ئەو لە باب و باپیرانی بوێرتر و پتر عاشقی شەڕ بوو. کیاکسار یەکەم کەس بوو لەشکری ئاسیایی لە چەند دەستەی جیاوازدا رێکخست و فەرمانی‌دا کە سەربازانی لەشکرەکەی، بەپێی چەکەکانیان، لە گوردانەکانی کەماندار و نێزەدار و سوارەنیزامدا جێبگرن. تا ئەو سەردەمە سەربازانی لەشکری تێکەڵپێکەڵ بوون. لە سەردەمی دەسەڵاتداری کیاکساردا، راست لە کاتی شەڕ دژی لیدی‌یەکان، بەری خۆر گیرا و رۆژ تاریک بوو. هەر ئەویش بوو کە لە رووباری ئالی‌ئاسیا پەڕییەوە. کیاکسار پاش لەشکرکێشی و شکست‌دانی گەلانی نیشتەجێ لەوبەری ئەو چۆمە، ئەوسا پەلاماری شاری نەینەوای‌دا. ئەو گەرەکی بوو تۆڵەی کوژرانی باوکی بکاتەوە. کیاکسار دەستووری‌دا شارەکە لە بناخەڕا وێران بکەن. ناوبراو ئاسووڕی‌یەکانی شکست‌دا و شارەکەی گرت. هەڵبەت لەکاتی گەمارۆی شاری نەینەوادا، لەشکرێکی گەورەی سکیتی بە پاشایەتی و فەرماندەری مادی‌ئیس، کوڕی پرۆتوتی‌ئیس هێرشیان کردە سەر وڵاتی میدیا. سکیتی‌یەکان لەسەر رێگای خۆیاندا، کیمێریەکانیان لە ئورووپاوە بەرەو ئاسیا دەرپەڕاندبوو و بەدوایاندا هاتنە ئاسیا. ئەو سکیتی‌یانە بەمەبەستی تۆڵە سەندنەوە، بەردەوام راوی کیمێری‌یەکانیان کرد و گەیشتنە فەرمانڕەوایی میدیا. وەختێک کیمێری‌یەکانی

راوکراو هاتنەنێو خاکی وڵاتی میدیا، سکیتیەکانیش وێڕای ئەوان پەلاماری ئەو فەرمانڕەواییەیان‌دا.

[١٠٤] مەودای نێوان گۆلی مێئۆتیدا[1] تا رووباری فاسی[2] و ناوچەی کۆلخیدا،[3] بۆ کەسێکی پیادەی خۆش ئاژۆ، سێ رۆژ دەخایەنێ. بەڵام، لەوێڕا پیاو خێرا دەگاتە وڵاتی میدیا، چونکە تەنیا یەک هۆز لەو نێوەدا دەژی کە ئەوانیش پێیان دەگوترێ ساسپیری.

سکیتیەکان ئەو رێگایەیان نەگرتەبەر و بە شوێنێکی‌تردا هێرشیان کردە وڵاتی میدیا. ئەوان بەرەو باکوور وەرسوڕانەوە و بە رێگای سەرەوەتردا، مەودایەکی پتریان پێوا و لەلای راستی خۆیان چیای قەفقازیایان جێ‌هێشت.[4] لەهەرحاڵدا، لەشکرەکانی میدی و سکیتی کەوتنەبەریەک. لەو شەڕەدا میدییەکان تووشی شکست هاتن و فەرمانڕەوایی ئاسیایان لەدەستدا و تەواوی ئاسیا کەوتە ژێردەستی سکیتیەکان.

[١٠٥] سکیتیەکان لەوێوە بەرەو میسر پێشڕەوییان کرد. کاتێک گەیشتنە سوریەی وڵاتی فەلەستین، پسامیتیخۆس،[5] پاشای میسر بە دیاری و خەڵاتەوە بەرەو پیریان چوو و داوای لێکردن لەوە زیادتر پێشڕەوی نەکەن.

سکیتیەکان دوای ئەو دیدارە گەڕانەوە دواوە و کاتێک گەیشتنە شاری ئاسکالۆنای[6] سەر بە سوریا، بەشێکی زۆری لەشکرەکەیان بەو شارەدا

١- دەریای ئازۆفیکی

٢- چۆمێک کە لە ناوچەی کۆلخیدای قەدیم هەڵکەوتوو لە ئاسیای بچووک دەرژێتە دەریای رەش و ئەمڕۆ ناسراوە بە رینۆ.

٣- ناوچەی کۆلخیدا یەکێک لە هەرێمەکانی باستانە و لە بەشی رۆژئاوای ئاسیا لە رۆژهەڵاتی دەریای رەش و باشووری قەفقاز هەڵکەوتووە و بەهۆی چۆمی فاسی پاراو دەکرێت.

٤- رەنگە مەبەست لە دەریای ئازۆف، شوێنی دەسپێکی کۆچکردنی هۆزەکانی کیمێری بووبێ.

٥- پسامیتیخۆس یەکەم پاشای هەرێمەکانی سایی و مێمفیس و دامەزرێنەری شازدەهەمین زنجیرەی پاشایەتی میسری باستان لە ساڵی ٦٦٦ی پێش زایین بووە. لە زەمانی ئەو پاشایەدا میسر لەباری نیزامییەوە هێزی نوێی وەبەرهات.

٦- ئاسکالون یەکێک لە شارەکانی هۆزی فیلیستن بووە. ئەو ئیلاهەیەی کە هێرۆدۆت بەناوی ئەفرۆدیتی ئورانییا دەیناسێ، لە ناوچەی دێرکێتۆ پەرستش دەکرێت.

تێپەڕی، بێ ئەوەی تاڵانێک بکەن. بەڵام پاشماوەی لەشکر لە دواوە خۆیان پێڕانەگیرا و پەرستگەی (ئورانییائەفرۆدیت)یان[1] تاڵانکرد. بەپێی ئەو زانیارییانەی سەبارەت بەو پەرستگە کۆمکردۆتەوە، لەگشت پەرستگەکانی کۆنترە و بۆ ڕێزگرتن لە خواوەند ئەفرۆدیت بنیاتنراوە. ئەو پەرستگەش کە لە قبرس هەیە،[2] بە گووتەی دانیشتووانی ئەوێ، لەڕووی نەخشەی ئەو پەرستگەیە قەدیمییە سازکراوە. پەرستگەی ئەفرۆدیت لە کیتیرا[3] بەدەست ئەو فینیقییانە بنیاتنرا کە لە وڵاتی سوریاوە هاتبوون. ئەو کۆمەڵە سکیتییانە کە پەرستگەی ئەفرۆدیتیان لە ئاسکالۆن تاڵان کردبوو، خۆیان و نەوەکانیان تووشی نەخۆشییەک هاتن و نێرەموکی رووی تێکردن.

سکیتییەکان خۆیان نەخۆشییەکەیان بۆ ئەو هۆیە دەگەڕاندەوە. هەرکەسێکیش سەردانی ئەوانە بکا و چاوی پێیانبکەوێ، دەزانێ کە ئەوانە چۆن بەدەست ئەو گرفت و ئازارەوە دەناڵن. خەڵکانی سکیتی خۆیان بە ناساغی ئەو کۆمەڵە جەماوەرە دەڵێن نەخۆشی ناپیاوەتی.[4]

[١٠٦] سکیتییەکان وەک فەرمانڕەوای ئاسیا ماوەی بیست و هەشت ساڵ مانەوە و بە شێوەیەکی دڕندانە و بەوپەڕی بێموبالاتییەوە، هەموو شتێکیان وێرانکرد. جیا لە سەپاندنی باڵیات و وەرگرتنی باج و خەڕاجی ساڵانە بە سەر دانیشتووانی ئاسیادا، ئەوسا بەنێو وڵاتدا گەڕان و چی دەستیان کەوت، بەتاڵانیان برد. لەبەر ئەو بارودۆخە دژوارە، کیاکسار و میدییەکان جارێک ژمارەیەکی زۆر لە پیاوانی سکیتییان بۆ خۆش ڕابواردن و سەرمەست

---

١- ئەفرۆدیت ئورانیا یا ڤینوس، ئیلاهەی جوانی و سیمبولی عەشق و خۆشەویستی.

٢- بە گووتەی پافسانیاس لە دەڤەری پافۆس، پەرەستنی ئەو خوایە (ئیلاهە) بەرلە ئاسکالوناس بووە.

٣- ناوی یەکێک لە دورگەکانی کۆمەڵە دورگەی یۆنان و ئەمڕۆ ناسراوە بە سێریگو و لە رابردوودا مەعبەدێکی گەورەی لێبووە. ئەو دورگەیە پێتەختی شێعر و شاعیری و عەشق و ئەدەبیات بووە.

٤- ئەو نەخۆشییەی هێرۆدۆت باسی دەکا، ئیپۆکراتیس وەک نێرەمۆکی سەیری دەکا. ناوبراو لە کتێبی پێری‌ئائێرۆن ئەو نەخۆشییەی نەنێر نەمێ دەسنیشان کردوە. لە وڵاتی سکیتییەکان کەسانێک دەژیان کە بە ئێناری ناودێرکراوە و هەرکەسێک لێیان نیزیک کەوتباوە، دەیتوانی چاوی بە نەخۆشییەکەیان بکەوێ. سکیتییەکان خۆیان بەو نەخۆشییە دەڵێن ئێناری.

بوون بانگهێشتی زیافەتێک کرد و لەوێ بە کۆمەڵ کوشتیانن. میدیيەکان بەو شێوەیە دووبارە دەسەلاتیان وەدەست خستەوە و ئەو ولاتانەی پێشتر بەهۆی سکیتییەکانەوە داگیرکرابوون، گشتیان هێناوە ژێر حوکمی فەرمانڕەوایی خۆیان. میدیيەکان شاری نەینەواشیان گرت (دواتر باسی لێوەدەکەم کە چۆن داگیرکرا). میدیيەکان هەروەها توانیان ولاتی ئاسیریاش داگیربکەن، هەڵبەت جیا لەو بەشەی سەر بە ناوچەی بابێل بوو. دوای ئەو رووداوانە، کیاکسار پاش چل ساڵ فەرمانڕەوایی کۆچی دوایی کرد، دیارە ئەگەر سەردەمی ژێردەستەیی سکیتییەکانیش حیساب بکرێ.

### مێژووی پارسەکان

پاش مەرگی کیاکسار، کوڕەکەی بەناوی ئاستیاگ هاتە سەر تەختی پاشایەتی. ئاستیاگ کچێکی بوو بەناوی ماندانە. ئاستیاگ کاتی خۆی خەونێکی دیتبوو کە ماندانەی کچی ئەوەندەی گمێز کردبوو کە لافاو پێتەختی ولات و تەواوی ئاسیای وەبەر خۆیدابوو. کیاکسار ئەو خەونەی بۆ مۆغەکانی خەونوەرگێڕ گێڕایەوە و بە لێکدانەوەی ئەوان تووشی مەترسییەکی گەورە هات.

کاتێک ماندانە گەیشتە تەمەنی مێردکردن، ئاستیاگ لە ترسی خەونەکەی، ئیزنی بە کچەکەی نەدا مێرد بە کەسێکی نەجیبزادەی میدی بکات. بەپێچەوانەوە، ماندانەی دایە کابرایەکی پارس بەناوی کامبیز. کامبیز لە بنەماڵەیەکی رێزدار، مرۆڤێکی ئارام، بەلام لەباری چینایەتییەوە لە گشت میدیيەکانی چینی مام نێوەندی، پلە نزمتر بوو.

[١٠٨] لە ساڵی یەکەمی ژیانی هاوبەشی کامبیز و ماندانەدا، ئاستیاگ دووبارە خەونی بینی. لە خەونەکەیدا، دیتی کە لە نێو لینگی کچەکەیدا مێوێک رووەوە و چڵوپۆپی ئەو دارەمێوە سەراسەری خاکی ئاسیای داپۆشیوە. دیسان

بانگهێشتی زانایانی لێکدانەوەی خەونی کرد. دواتر بەدوای کچەکەیدا نارد کە وەختی زانی بوو. ئاستیاگ ماندانەی لە بارەگای خۆی راگرت، بەو مەبەستەی کە کاتێک منالّەکە لەدایک بوو، خێرا بیکوژێ. زانایانی خەونناس بە ئاستیاگیان گوتبوو کە منالّی ماندانە گەورە دەبێ و لەجیات باپیری پاشایەتی دەکا. ئاستیاگیش بەنۆرەی خۆی، بۆوەی پێش بە قەومانی ئەو رووداوە بگرێ، وەختێک کوروش لەدایک بوو، بەدوای ئارپاغۆس‌یدا نارد کە خزمی خۆی بوو. ئاستیاگ باوەڕی تەواوی بە ئارپاغۆس هەبوو، چونکە بە رەگەز میدی و کەسێکی بەتوانا بوو. ئاستیاگ زۆربەی کارەکانی دەرباری پاشایەتی بە ئارپاغۆس دەسپارد و لەڕاستی‌دا دمراستی ئەو بوو. پاشا بە ئارپاغۆسی گووت: "ئارپاغۆس! راسپاردەیەکم بۆ تۆ هەیە. نە لای کەس باسی دەکەی و نە خەیانەتیشم گەرەکە بۆوەی خزمەتت بە کەسێکی‌تر کردبێ، چونکە ئەو کاتە ئیتر سەرت تێدا دەچێ. منالّەکەی ماندانە هەلّگرە و بیبەوە مالّی خۆت و بیکوژە. پاشان بەو شێوەیەی خۆت بە مەسلّەحەتی دەزانی بینێژە ". ئارپاغۆس لە وەلامی ئاستیاگدا گوتی: "پاشاکەم، ئەو پیاوەی لە حزووردتدا راوەستاوە، هیچکات لە ژیانتدا دلّت لێی نەئێشاوە. بەلّێن بێ لە داهاتووشدا قەت نەهێلّم ناڕاحەت بی. ئێستا کە دەخوازی من ئەو کارە بکەم، ئەوە ئەرکی سەرشانی منە و ئەمرەکەت بەدروستی و رێکوپێکی بەجێ‌دەگەیێنم ".

[١٠٩] ئارپاغۆس دوای ئەو قسانە، خێرا منالّی کفنکراوی و بەگریانەوە بردییەوە مالّ و لەوێ رەوتی رووداوەکەی بۆ ژنەکەی باسکرد. ژنە لە ئارپاغۆسی پرسی: "دەخوازی چیبکەی؟ ئارپاغۆس گوتی: "هەرچەند ئاستیاگ خەریکە دلّی بتۆقێ ، ئەگەر لەوەش پتر شێت و ماخولیا بێ، دیسانیش من حازر نیم خواستی ئەو بەجێ بگەیێنم. زۆر دەلیلم لەمەر نەکوشتنی ئەو منالّە هەیە. بەر لە هەر شتێک، ئەوە منالّی خزمی منە و ئاستیاگ خۆی پیر بووە و ئەولادی نێرینەی نییە. ناوبراو ئەگەر بخوازێ لە پاش مردنی، تاج و تەختی پاشایەتی بە کچەکەی بسپێرێ، واتە بەو کچەی کە کوڕەکەی بە کوشتن دەچێ، من چۆن چاوەڕوانی مەترسییەکی گەورەتر لە داهاتوودا نەبم!

هەڵبەت ئەو کوڕە دەبێ بمرێ، بەڵام پێویستە ئەو قەتڵە بەدەست خزمێکی ئاستیاگەوە بەڕێوە بچێ، نەک بەدەست من ".

[١١٠] ئارپاغۆس پاش ئاخاوتنەکەی، خێرا یەکێک لە پیاوانی خۆی نارده لای شوانەکانی ئاستیاگ. ئارپاغۆس خەبەری بوو کە مێگەل و گاڕانی ئاستیاگ لە جێگایەکی پڕ شیناوەرد دەلەوەڕێن و بۆ جێبەجێ بوونی نەخشەکەی شوێنێکی گونجاوە و لەوێ ئەژمارێکی فرە ئاژەڵی دڕندە هەن.

میترالاتیس، شوان و کۆیلەی ئاستیاگ لەگەڵ ژنێکی کۆیلە بەناوی سپاکۆ ژیانی هاوبەشیان بوو. سپاکۆ لە زمانی میدیدا واتای دێڵەسەگ دەدا و هاوتای کینۆ لە زمانی یۆنانیدا. میدییەکان بە دێڵەسەگ دەڵێن سپاکۆ. میترالاتیس لە داوێنی چیاکانی هەڵکەوتوو لە باکووری ئێکباتان بەرەو دەریای رەش شوانێتی دەکرد. ئەو ناوچەیە سەر بە وڵاتی میدیایە و لە دەوری ساسپیرا هەڵکەوتووە و تەواو شاخاوی و دارستانە، بەپێچەوانەوە، باقی شوێنەکانیتر دەشتایین. وەختێک میترالاتیسی شوان لەسەر داوای ئارپاغۆس گەیشتەجێ، ئارپاغۆس پێیگوت: "ئاستیاگ فەرمانی بە تۆ داوە کە ئەو منداڵە هەڵگری و لە چۆلترین شوێنی چیاکان بەرەڵای بکەی، بۆوەی هەرچی خێراتر بمرێ. دەبێ ئەوەش بزانی کە ئەگەر ئەو منداڵە نەکوژرێ و بەپێچەوانەوە رایگری و زیندوو بمێنێ، ئاستیاگ تۆ بە دڕندەترین شێوە دەکوژێ. خۆیشم چاوەدێری بەرەڵابوونی ئەو منداڵە لە کوێستانەکان دەکەم ".

[١١١] کابرای شوان گوێی لەو حوکمە گرت و رۆبووە منداڵەکە و بە هەمان رێگادا گەڕایەوە ماڵ. راست لەو کاتەدا کە شوانە بە فەرمانی ئارپاغۆس بەرەو شار وەڕێکەوتبوو، ژنەکەی ئاوس و لەسەر زان بوو. ئەوەش خواستێکی خوایی لەپشت بوو. لەو نێوەدا ژنە نیگەرانی چارەنووسی مێردەکەی بوو و میترالاتیس، ئەویش خەمی خێزانەکەی خۆی بوو. میترالاتیس لەوە دەترسا کە ژنەکەی بێکەس و بێدەرەتان منالی ببێ و لەلایەکیتریشەوە خۆی تووشی رووداوێکی سەیر و سەمەرە هاتبوو. شوانە کاتێک گەڕاوە، ژنەکەی پێیوانەبوو کە مێردەکەی بە زیندوویی دێتەوە، بۆیە خێرا لێی پرسی کە ئارپاغۆس بۆچی ئاوا

بەپەلە بەدوایدا ناردبوو. شوانە وڵامی هاوژینەکەی خۆی بەو چەشنە داوە: "ژنەکە! ئەوەی من لەو سەفەرەم بۆ شار دیتم و بیستم، یاخوا قەت چ جاریتر تووشی نەبمەوە. نازانی چ بەسەر ئەربابەکانی من هاتووە. تەواوی ئەندامانی بنەماڵەی ئارپاغۆس دەگریان. منی سەر لێشێواو رووم لەلای ژوورەوە کرد. چاوم بە منالێک کەوت کە گڕوگاڵی دەکرد. بە زێڕ و ئاڵتوون رازاندبوویانەوە و لە پارچە قوماشێکی رەنگاورەنگیان وەرپێچابوو. ئارپاغۆس هەرکە چاوی بە من کەوت، دەستوریدا منالەکە هەڵگرم و بەرەو ماڵ بگەڕێمەوە و پاشان لە شوێنێکی پڕ لە ئاژەڵی دڕندە بەرەڵای بکەم. دیارە ئەوەشی پێگوتم کە ئەوە فەرمانی ئاستیاگە. هەڕەشەیەکی زۆر توندیشی لێکردم کە ئەگەر بێتوو حوکمەکە بەڕێوە نەبەم، تێدادەچم. سەرەتا پێموابوو منالی یەکێک لە خزمەتکارەکانی ئارپاغۆسە و لەبەر ئەوەی نەمدەزانی دایک و بابی ئەو منالە کێیە، خێرا هەڵمگرت کە بیهێنمەوە. ئیتر بیرم لەوە نەکردەوە کە من کۆیلەم و ئەو منالەش هی کەسێکیترە. ئەوەی بەلامەوە سەیر بوو، رازانەوەی منالەکە بە زێڕ و ئاڵتوون و جلوبەرگی رەنگین و گریان و شینگێڕانی بنەماڵەی ئارپاغۆس بوو. دواتر ئەو خزمەتکارەی کە منالەکەی هەڵگرتبوو تا لە دەرەوەی شار تەحویلم بدات، زانیاری تەواوی دامێ و پێیگووتم کە ئەوە منالی ماندانای کچی ئاستیاگە، واتە ئەوەی ژنی کامبیزە. کوڕەکەیان ناو لێناوە کوروش و ئاستیاگی باپیری فەرمانی کوشتنی داوە. فەرموو ئەوەش منالەکە! ".

**[۱۱۲]** کابرای شوان دوای ئەو قسانە، منالەکەی بە ژنە نیشاندا. ژنە کاتێک چاوی بەو منالە جوان و گەورەیە کەوت، دەستی بە گریان کرد. مێردەکەی لە باوەش گرت و خۆی لەبەر دەست و پێیانی هاویشت و لێی پاڕایەوە کە منالەکە بە کوشتن نەدا. شوانە لە وڵامی ژنەکەیدا گوتی کە ناتوانی ئەمریٚ ئاستیاگ بەجێ نەگەیێنێ، چوونکە پیاوەکانی ئارپاغۆس لە کارەکە دەکۆڵنەوە بۆوەی دڵنیابن کە جێبەجێم کردوە یان نا. ئەگەر ئەو راسپاردەیە بەجێ نەگات، بە دڕندەترین شێوە دەمکوژن. ژنەکە نەیتوانی مێردەکەی رازی بکا و ناچار دەستی بە قسە کردەوە: "وێدەچێ ناتوانم

قەناعەتت پێبێنم کە منالّەکە فڕێ نەدەی، بەلاّم دەتوانی کارێکی‌تر بکەی، ئەگەر هیچ ڕێگا چارەیەک نییە و پیاوانی ئارپاغۆس پێویستە دلّنیا بن و تەرمی منالّەکە بە فڕێدراوی ببینن، تۆ دەتوانی تەرمی منالّەکەی خۆمان کە بە مردوویی لەدایک بووە لەجیاتی نەوە زیندووەکەی ئاستیاگ دابنێی و ئەوەیان لەلای خۆمان گەورە بکەین. بەو شێوەیە هیچکەس نازانێ کە تۆ ئەمری ئەربابەکانت بەجێ نەگەیاندوە و ئێمەش تووشی گوناهێک سەبارەت بە منالّەکەمان نابین و وەک پاشازادەیەک بە خاکی دەسپێرین و ژیانی ئەوەی‌تریشمان نەجات داوە ".

[١١٣] شوانە قسەکانی خێزانی بەلاوە دروست بوو و بەگوێی کرد. ئەو منالّەی بۆ کوشتن هێنابووی رووتیکردەوە و جلوبەرگەکانی لەبەر منالّە مردوەکەی خۆیان کرد و لەنێو هەمان سەبەتی نا و بەرەو چۆلگەی نێو چیاکان ڕۆیشت و منالّەی لەوێ ڕەهاکرد. سێ ڕۆژ تێپەڕی و منالّێکی شوانکارەی بۆ پاسەوانی لە سەوەتەکە دانا و ئەوجار خۆی بەرەو شار وەڕێکەوت تا بە ئارپاغۆس بلّێ کە ئامادەیە تەرمی کوژراوی منالّەکەیان نیشان بدا. ئارپاغۆس باوەڕپێکراوترین پیاوانی لەشکری خۆی نارد. ئەو ڕاسپاردانە دانیان بەوەنا کە منالّکە مردوە و لەڕاستیدا تەرمی منالّە مردووی میتراداتیس‌یان ناشت. شوانە لەجیات ناوی کوروش، ناوێکی‌تری لەسەر کوڕەکە دانا.

[١١٤] کاتێک ئەو کوڕە گەیشتە تەمەنی دە سالّی، ڕووداوێکی سەیر قەوما و بووە هۆی ئاشکرابوونی ئەو. لەو گووندەی هۆلّ و تەویلەی مەڕ و مالاّتی لێبوو، کوروش لە کۆلاّنی دێدا لەگەلّ منالاّنی هاوتەمەنی خۆی کایەی دەکرد. منالّەکان کوڕی شوانەیان وەک پاشای خۆیان هەلّبژاردبوو. کوڕە منالّەکانی دابەشکرد و بۆ هەر دەستەیەکْ کارێکی دیاریکرد. (هێرۆدۆت لە هێندێک شوێن کابرای شوان وەک گاوانیش ناودەبا و لێکیان جیا ناکاتەوە)

کۆمەلّێک لە منالّەکان دەبوایە خانوو و قەسر دروستبکەن، یەکدوو منالّی‌تری کردە پاسەوان و یەک لە منالّەکانی وەک چاوی پاشا دیاریکرد،

یەکی‌تری کردە پۆستچی و لەکۆتاییدا هەرکام لە منداڵەکان ئەرکێکیان پێ‌ئەسپێردرا. یەکێک لەو منداڵانە کوڕی ئارتێمباریس بوو. ناوبراو خاوەن پلەیەکی بەرز لە بارەگای میدییەکاندا بوو. کوڕەکەی ئەو کابرایە بە دابەشکردنی ئەرکەکان لەلایەن کوروشەوە رازی نەبوو. کوروش دەستوری‌دا بیگرن و بیهێننە لای ئەو. منداڵانی‌تر بەگوێیان کرد و کوڕی ئارتێمباریس‌یان هێنا حزوور کوروش. ناوبراو قەمچی‌یەکی توندی سرەواندێ. هەرکە منداڵە بەرەڵا کرا، ناڕاحەت و زیز گەڕاوە شار، چونکە بێ‌حورمەتی بە گەورەیی و شان و شەوکەتی کرابوو. رووداوەکەی بۆ باوکی خۆی باس‌کرد و گووتی کە کوروش چۆن بە قەمچی لێیداوە و بێ‌ڕێزی پێکردوە. هەڵبەت ناوی کوروشی نەهێنا، لەبەر ئەوەی ئەو سەردەمە ناوی کوروش لەگۆڕێدا نەبوو. بەڵکوو گوتی کوڕی گاوانی ئاستیاگ ئەو بەڵایەی بەسەر هێناوە.

ئارتێمباریس بە توڕەییەوە چووە لای ئاستیاگ و باسی ئەو بێ حورمەتییەی لای پاشا کرد و شان و پیلی منداڵەکەی بە پاشا نیشان‌دا و گوتی: "پاشا! چاوت لێیە کە کۆیلەیەکی جەنابت چۆن بێ ئیحترامی دەکات، ئەوەش منداڵی گاوان! ".

**[١١٥]** کاتێک ئاستیاگ وەزعەکەی بینی و گوێی لەو قسانە بوو، بڕیاری سزادانی منداڵەکەی بۆخاتری بەجێ‌هێنانەوەی دڵی ئارتێمباریس‌دا و بەدوای کابرای شوان و کوڕەکەیدا نارد. ئەوان هەرکە گەیشتنێ، ئاستیاگ رووی لە کوروش کرد و پێیگوت: "تۆی کوڕە شوان و گاوان چۆن لەخۆت‌ڕادیت لەگەڵ کوڕی کەسێک بەبێ حورمەتی بجوڵێیەوە کە خاوەن یەکەم پلە و جێگا لە تەنیشت منە؟". کوروش وەجواب هات: "پاشا! ئەوەی من کردم کارێکی دروست بوو. منداڵەکانی دێ کە ئەو کوڕەشیان لەگەڵدا بوو، لەبەر ئەوەی پێیانوابوو من باشتر لە هەموویانم، وەک پاشا هەڵیانبژاردم تا پێکەوە کایە بکەین. ئەوانی‌تر چی ئەرکی پێم‌ئەسپاردن، بەجێیان‌گەیاند، بەڵام ئەو کوڕە

ئیتاعەتی ئەمرەکانی منی نەکرد و بۆیە سزامدا. ئەگەر ئێستا منیش لەمەر ئەو کارەی کردومە شایستەی سزادانم، لێرە لە خزمەت جەنابتدام ".

[١١٦] لەو کاتەدا کە منداڵەکە قسەی بۆ ئاستیاگ دەکرد، پاشا لە ژێرەوە تێیدەفکری و هەستی بە ناسینەوەی کوڕە کردبوو. تایبەتمەندییەکانی ئەو کوڕە هاوشێوەی پاشا بوو و نیشانی دەدا کە منداڵی کابرایەکی ئازادە، نەک کۆیلەیەک. هەروەها تەمەنی منداڵەکەش لەگەڵ مەودای زەمەنی رۆژی فرێدانی تا ئەو دەمە رێکدەهاتەوە. پاشا پەشۆکاو لەو رووداوە، ماوەیەک بێدەنگ بوو و پاشان وەقسەهات. داوای لە ئارتێمباریس کرد بچێتە دەرەوە، چونکە پاشا گەرەکی بوو خۆی بە تەنیا کابرای شوان دادگایی بکات، بۆیە گووتی: "ئارتێمباریس! چی پێویست بێ دەیکەم بۆوەی خۆت و کوڕەکەت گلەییتان نەمێنێ ". پاش ئەو قسەیە، ئارتێمباریس وەدەرکەوت.

ئاستیاگ ئەوجار فەرمانی بە خزمەتکارەکانیدا کە کوروش بەرنە هۆدەیەکی تایبەت لەنێو قەسردا. وەختێک خۆی و شوانە بەتەنیا مانەوە، ئاستیاگ لێیپرسی کە ئەو کوڕەی لەکوێ بووە و کێ پێیداوە. شوانە گوتی کە کوڕی خۆمە و دایکی منداڵەکەش ماوە و لە ماڵەوەیە. ئاستیاگ پێیگوت: "کارێکی باش ناکەی کە راستییەکە نادرکێنی، دڵنیابە تووشی ئەشکەنجەیەکی زۆر و توووند دێی ". هاوکات دەستوری‌دا کە پاسەوانەکان کابرای شوان بگرن. کاتێک شوانەیان بەرەو شوێنی ئەشکەنجە برد، شوانە هاواری لێ‌هەستا و گووتی راستی‌یەکان دەدرکێنێ و بۆیە تەواوی بەسەرهاتەکەی لە سەرەتاوە تا کۆتایی گێڕاوە و ئەوسا دەستی بە پاڕانەوە و داوای لێبووردن کرد.

[١١٧] وەختێک شوانە راستییەکەی ئاشکرا کرد، ئاستیاگ لەوە زیادتر خۆی بە کابراوە ماندوو نەکرد و بە دەست ئارپاغۆسەوە قەڵس بوو و دەستوری‌دا کە پاسەوانەکان ئەوی بێنن. کاتێک ئارپاغۆس هات، ئاستیاگ لێی‌پرسی: "ئارپاغۆس دەمەوێ بزانم ئەو کاتەی منداڵی کچەکەی خۆم تەحویل دای، چۆن کوشتت؟ ". ئارپاغۆس هەرکە چاوی بە کابرای شوان لە کۆشکی پاشایەتی کەوت، نەیوێرا درۆبکا، چونکە لێی ئاشکرا دەبوو و بۆیە گوتی:

"پاشا! وەختێک منداڵەکەم وەرگرت، بیرم لەوە کردەوە کە چۆن هەم خواستی جەنابت بەجێ بگەیێنم و هەمیش نەبمە بکوژی ئینسانێک. بەبێ ئەوەی لەلای ئێوە و کچەکەتان باس بکەم، بەدوای ئەو شوانەمدا نارد و منداڵەکەم دایە دەستی. پێمگوت کە پاشا فەرمانی داوە ئەو منداڵەی بۆ بکوژی. دیارە درۆشم پێنەگوتبوو، چونکە ئەوە دەستوری جەنابت بوو. منداڵەکەم تەحویلدا و رێنوێنی پێویستم کرد و پێمگوت لە شوێنێکی چۆڵەوار رەهایبکا و خۆی لەوێ بمێنێتەوە تا منداڵکە دەمرێ. هەروەها هەڕەشەم لێکرد ئەگەر ئەو کارە نەکا، خۆی سەری تێدا دەچێ. وەختێک دەستووراتی منی بەجێگەیاند و منداڵەکە مرد، باوەڕپێکراوترین پیاوانی خۆم نارد بۆوەی بە چاوی خۆیان لە مەرگی منداڵەکە دڵنیابن، ئاخۆ مردوە یاننا. هەر ئەو راسپاردانەش جەنازەی منداڵەکەیان ناشت. ئەوە رەوتی رووداوەکە بوو و منداڵەکەش بەو شێوەیە کوژرا ".

[١١٨] ئارپاغۆس راستی رووداوەکەی باسکرد. ئاستیاگ رکوکینی دەروونی خۆی شاردبۆوە و دوبارە رووی لە ئارپاغۆس کردوە و رەوتی قەومانەکەی چۆن لە زمانی شوانە بیستبوو، بۆ ناوبراوی گێڕایەوە. پاش دووپات کردنەوەی بەسەرهاتەکە، لە کۆتاییدا گوتی کە منداڵەکە دەژی و ئەوەش بەلامەوە گرینگترە. "گەلێک خەمی ئەو منداڵەم بوو "، ئاستیاگ گوتی، "بۆ ئەو قەومانە زۆر ناڕاحەت بووم و کچەکەم لەو بارەوە منی بە تاوانبار دەزانی". ئێستا کە چارەنووس ئاوای هێناوە، تکایە کوڕەکەی خۆت بنێرە لای منداڵەکەمان با کایەی لەگەڵدا بکات و دواییش وەرەوە ئێرە با شێوی شەو پێکەوە بخۆین. هەڵبەت بەر لە هەر کارێک گەرەکمە قوربانییەک پێشکەش بە خواکان بکەم کە ئەو کوڕەیان نەجات داوە ".

[١١٩] کاتێک ئارپاغۆس گوێی لەو قسانە بوو، کڕنۆشی بۆ پاشا برد و گەلێک خۆشحاڵ بوو، چونکە هەرچەند لەمەر جێبەجێکردنی فەرمانی پاشا بێمبالاتی کردبوو، بەو حاڵەش گرفتەکە وەخێرگەڕابوو و هەستی بە بەختەوەری خۆی کرد. ئارپاغۆس لەبەر ئەوەی بۆ زیافەتی شام بانگهێشت

کرابوو تا ئەو رووداوە خۆشە جێژن بگرن، ئیتر لەوە زیادتر ماتڵ نەمایەوە و بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە رۆیشتەوە ماڵ. هەرکە گەیشتەوە، بە کوڕە تاقانە و سێزدە ساڵەکەی گوت کە بچێتە قەسری پاشا و ئاستیاگ چی پێبگوت، بەقسەی بکا. ئارپاغۆس شاد و خۆشحاڵ رەوتی رووداوەکەی بۆ ژنەکەی خۆی گێڕایەوە. کاتێک کوڕەکەی ئارپاغۆس گەیشتە قەسری پاشایەتی، ئاستیاگ فەرمانی‌دا بیکوژن و قەڵتوبڕی بکەن. بەشێک لە جەستەی لەتوپەتکراوی مناڵەکەی بۆ کوڵاندن دانا و بەشەکەی‌تری برژاند و بڕیاردرا بۆ زیافەتی شام لەسەر مێزی خواردن داندرێن. وەختێک کاتی خواردن هات و تەواوی میوانەکان و ئارپاغۆس ئامادە بوون، لەسەر مێزی بەردەم ئاستیاگ و میوانەکانی‌تر گۆشتی بەرخ داندرا، بەڵام بۆ ئارپاغۆس گۆشتی لێندراو و برژاوی جەستەی کوڕەکەی داندرا. تەنیا سەر و لاق و دەستی مناڵەکە لەبەر چاوان نەبوون. ئەوانەشیان لەنێو سەبەتێکدا بە داپۆشراوی هەڵگرتبوو. کاتێک ئارپاغۆس لە خواردن بۆوە، ئاستیاگ لێی پرسی ئاخۆ تێری خواردوە یاننا. ئارپاغۆس نیهایەتی رەزایەتی دەربڕی. راست لەو کاتەدا خزمەتکارانی ئاستیاگ بەپێی دەستوری پێشوو، سەبەتی داپۆشراویان لەپێش دانا کە سەر و دەست و لاقەکانی کوڕەکەی تێدا بوو. خزمەتکارەکان بەپێوە لە حزووری ئارپاغۆس‌دا راوەستان و داوایان لێکرد سەری سەبەت هەڵداتەوە و حەزی لە هەرچییەک بێ، هەڵگرێ. ئارپاغۆس بە رەزامەندییەوە دەسماڵی سەر سەبەتی هەڵدایەوە و چاوی بە باقی ئەندامانی جەستەی کوڕەکەی کەوت. وەختێک ئەو دیمەنەی دیت، هەرگیز خۆی شڵوێ نەکرد و هێمنی خۆی پاراست. ئاستیاگ لێی‌پرسی کە ئەو گۆشتەی خواردی لە کام نێچیرەوە هاتووە! ئارپاغۆس وەڵامی داوە کە ئەو دەیزانی چ دەخوا و ئەمری پاشای بەلاوە گرینگ بووە. پاشان پاشماوەی جەستەی مناڵەکەی هەڵگرت و گەڕاوە ماڵ بۆوەی بەخاکیان بسپێرێ.

[۱۲۰] ئاستیاگ بەو چەشنە تۆڵەی خۆی لە ئارپاغۆس ئەستاندەوە. ئاستیاگ لە فکری ئەوەدا بوو کە لەمەودوا چ لە کوروش بکا و بۆیە بەدوای

ئەو کۆمەڵە مۆغەیدا نارد کە پێشتر خەونەکەیان لێکدابۆوە. ئەوانە دیسان هەمان لێکدانەوەیان لەمەر خەونەکە دووپاتکردەوە، واتە ئەگەر منداڵەکە ژیابا، بە دڵنیاییەوە دەبوو بە پاشا. ئاستیاگ پێی‌گوتن: "منداڵەکە نەمردوە و ئێستا زیندووە و هەیە. لە گوندێک ژیاوە و منداڵان کردوویانەتە پاشای خۆیان و ئەویش وەک پاشای راستەقینە هەڵسوکەوتی کردوە. پاسەوانی بۆخۆی دیاری‌کردوە و دەرکەوان و پۆستچی دامەزراندوە و هەرچی بۆ پاشایەک پێویست بووە ئامادە و جێبەجێی‌کردوە. ئێستا، بەباوەڕی ئێوە ئەو کردەوانە چ مانایەک دەدەن؟ زاناکان وڵامیان داوە: "ئەگەر ئەو منداڵە لە کوشتن و مردن رزگاری هاتووە و بۆتە پاشا بەبێ ئەوەی خۆی گەرەکی بووبێ، ئیتر بۆ خۆ پێوە ماندوو کردن نابێ. تۆ دەتوانی هێمنی خۆت بپارێزی و ئەو منداڵە لەبەر ئەوەی خۆی بەو چارەنووسە بزانێ، لە سەردەمی منداڵییەتی خۆیدا جارێک پاشایەتی کردوە و قەرارنییە جارێکی‌تر ببێتەوە بە پاشا و خەونەکە جێبەجێ بووە. ئەوەش بڵێین کە خەون و پێشگۆیی هەرتەنیا بۆ ڕووداوی گەورە نین و گەلێک جار تەعبیر و تەفسیری رووداوگەلی بچووکیش دەکەن". ئاستیاگ لە وڵامیاندا گوتی: "منیش هەر لەسەر ئەو باوەڕەم. پاش ئەوەی ئەو منداڵە پاشایەتی کردوە، ئیتر خەونەکە کۆتایی پێهاتووە و تەواو بووە و پێویست ناکا لەوە زیادتر نیگەران بم. بەڵام تکایەکم لێتان هەیە، باشتر بیر لەو گرفتە بکەنەوە و پتر رێنوێنیم بکەن. دەمەوێ بزانم کە بۆ بارەگای پاشایەتی و ئێوە، دەبێ چ بکەم و کام رێوشوێنی باشتر بگرمەبەر". سەبارەت بەو پرسیارە زانایانی لێکدانەوەی خەون وڵامیان داوە: "پاشا، مانەوەی بارەگای پاشایەتی ئێوە، لە بەرژەوەندی ئێمەش دایە. ئەگەر بێتوو دەسەڵات لەدەست بدەی، ئەو کوڕە دەبێتە خاوەن تاج و تەخت و لە رەگەزی پارس‌یشە. ئێمە رەگەزی میدین و دەبینە کۆیلەی پارسەکان و ئەوانیش هیچ نرخێک بۆ ئێمە دانانێن، چونکە خاوەن رەگەزی جیاوازن. ئەگەر تۆ کە هاوڕەگەزی خۆمانی لە دەسەڵاتدا بمێنییەوە ، ئێمەش لە سایەی سەری تۆوە ساحێبی جێگا و دەسەڵات و قەدر و حورمەتی

فرەین. بۆیە دەبێ بە هەموو توانامانەوە پارێزگاری لە تۆ و فەرمانڕەواییەکەت بکەین. ئەوەش بڵێین، ئەگەر هەستمان بە مەترسییەک سەبارەت بە فەرمانڕەوایی تۆ لە پێشبینییەکانماندا کردبا، بە دڵنیاییەوە پێمان دەگوتی. بەڵام، لەبەر ئەوەی خەونەکە بە ڕووداوێکی بێنرخ کۆتایی پێهاتووە، نیگەران نین و تەنیا ئەو پێشنیارەمان بۆ تۆ هەیە کە ئەو منداڵە لەبەر چاوان دوورخەوە و بینێرە بۆ لای دایک و باوکی ڕاستەقینەی خۆی لە ناوچەی پارس".

[١٢١] ئاستیاگ کاتێک گوێی لەو قسانە بوو تەواوێک گەشایەوە و بانگی کوروشی کرد و پێیگوت: "کوڕم، ناهەقیم لەگەڵ کردوی، چونکە خەونێکم بینی کە ئاکامێکی پوچ و بێمانا و ناخۆشی لێکەوتەوە. بەڵام، تۆ شانس و ئیقباڵ ڕووی تێکردی و نەجاتیت هات. ئێستا بەوپەڕی هێمنی و دڵنیاییەوە بڕۆوە بۆ وڵاتی خۆت، بۆ دەڤەری پارس. خۆم کاروانت لەگەڵ دەنێرم. وەختێک گەیشتییە ئەوێ دایک و باوکت دەدۆزییەوە، هەڵبەت ئەوان وەک میتراداتی شوان و ژنەکەی نین".

[١٢٢] ئاستیاگ پاش ئاخاوتنەکەی، کوروشی نارده لای دایک و باوکی. کوروش هەرکە گەیشتە بارەگای کامبیز، دایک و باوک خێرا کوڕەکەیان ناسییەوە و بە شادی و خۆشییەکی فرەوە وەریانگرت و بەر لە هەر کارێک گەرەکیان بوو کە بزانن چۆن ڕزگاری هاتووە. ئەوان پێیانوانەبوو ئەو کوڕە ماوە و لەو باوەڕەدا بوون کە هەرلە سەردەمی منداڵییەوە مردوە. کوروش لە وڵامیاندا گوتی کە تا ئەو سەفەرە ئاگای لە هیچ شتێک نەبووە و تازە زانیویەتی کە لە ژیانیدا چی قەوماوە. ئەو هەروەها گوتی کە ڕاستی ڕووداوەکەی سەبارەت بەو بەسەرهاتە لە زاری ئەو کەسانەوە بیستووە کە لەگەڵی هاتوون و بەر لە وەرگرتنی زانیاری لە هاوسەفەرانی، پێیوابوو کە کوڕی شوانی ئاستیاگە، بەڵام لە ڕێگای بەرەو وڵاتی پارسدا، جەماوەری کاروانچی، ڕەوتی ڕووداوەکەیان بۆ باسکردوە. واتە لەلایەن ژنی شوانکارەوە شیری پێدراوە. کوروش لەنێو قسەکانیدا هەمیشە ستایشی ئەو

ژنەی دەکرد و بەردەوام ناوی (کینۆ)ی لەسەر زاری بوو. دایک و باوکی کوروش بەکارهێنانی ئەو ناوەیان وەک فرسەتێک قۆستەوە بۆوەی نیشان بدەن دێڵە سەگێک کوروشی شیرداوە و پارسەکان باوەڕ بە موعجیزەی رزگاری کوڕەکەیان بکەن. ئەو حیکایەتە لەو رۆژەوە دەستی پێکردوە.

[۱۲۳] کاتێک کوروش روخساری پیاوانەی بەخۆوەگرت، جوامێرتر و خۆشەویستتر لە گەنجانی هاوتەمەنی خۆی بوو. ئارپاغۆس کە بە تەمای تۆڵە سەندنەوە لە ئاستیاگ بوو، بەردەوام دیاری و خەڵاتی بۆ کوروش دەنارد. ئەو هەستی بەوە کردبوو کە بەتەنیا دەرەقەتی تۆڵە ئەستاندنەوە لە ئاستیاگ نایە و مان و گەورە بوونی کوروش‌یشی بە چاوی خۆی بینی و حەولی‌دا کە هاوپەیمانی لەگەڵدا دامەزرێنێ. ئارپاغۆس وێچوونییەکی لەنێوان ئازارەکانی خۆی و کوروش‌دا بەدی‌دەکرد. هەڵبەت بەر لە کوروش‌یش دەستی بە ئامادەکاری کردبوو. ئاستیاگ ئەو سەردەمە فرە بێ بەزەییانە لەگەڵ خەڵکی میدیا دەجوڵایەوە. ئارپاغۆس بەردەوام لە سەرکردەکانی نیزامی نیزیک دەکەوتەوە و پێیدەگوتن کە دەبێ کوروش بێننە سەر تەختی پاشایەتی و ئاستیاگ وەلابنێن. وەختێک ئارپاغۆس هەموو ئامادەکارییەکی کرد، ئەوسا گەرەکی بوو نهێنی دڵی خۆی لەلای کوروش ئاشکرا بکا کە ئەو وەختە لە ویلایەتی پارس دەژیا.

ئارپاغۆس هیچ رێگا چارەیەکی بۆ پێوەندی گرتن شک نەبرد، چونکە هاتووچۆی رێگاکان لەژێر چاوەدێری توونددا بوون، بۆیە ئەو رێگایەی رەچاوکرد: کەروێشکێکی گرت، خاڵیگەی هەڵدڕی بەبێ ئەوەی خوری لەشی بشێوێنێ. پەیامێکی تێدا جێکردەوە و لەنێو نامەکەیدا باسی نەخشە و پیلانی خۆی نووسی. خاڵیگەی کەروێشکی دووبارە دوورییەوە و باوەڕپێکراوترین خزمەتکاری خۆی بانگ‌کرد. تۆڕ و کەرستەی راوی دایە دەست کابرا، بۆوەی تەواو وەک راوچی بچێ و ناردیە ویلایەتی پارس، بەو مەبەستەی کە کەروێشکەکە بداتە دەستی خودی کوروش و پێشی بڵێ کە بە دەستەکانی خۆی خاڵیگەی کەروێشکی دیاری هەڵدڕێت و نابێ هیچ کەسی‌تری لەلا بێ.

[١٢٤] ڕەوتی ڕووداوەکان بەو چەشنە چوونەپێش و کوروش کەروێشکی پێگەیی، خاڵیگەی دڕی، پەیامەکەی دەرهێنا و خوێندییەوە. تێیدا نووسرابوو: "کوڕی کامبیز، خواکان پارێزگاریت لێدەکەن، جیا لەو فرسەتە، قەت نابییە خاوەن شانسێکیتر. ئێستا کاتی ئەوە هاتووە تۆڵەی خۆت لە ئاستیاگ بستێنییەوە کە بکوژی تۆ بوو. خواستی ئاستیاگ ئەوە بوو کە تۆ نەمێنی و بمری و من و خواکان هۆی زیندوومانی تۆین. هیوادارم سەبارەت بە ماجەرای ژیانت، ڕاستییەکانت پێگوترابن . هەڵبەت منیش بەدەست ئەو کابرایە ئازارێکی زۆرم چێشتووە، چونکە تۆم نەکوشت و دامییە دەست کابرای شوان. تۆ ئەگەر ئێستا دەخوازی گوێم لێبگری، دەبییە پاشای وڵاتێک کە ئاستیاگ فەرمانڕەوایی دەکا. پێویستە پارسەکان ڕازی بکەی کە شۆڕش بکەن و دژی میدییەکان هانیان بدەی. ئەگەر ئاستیاگ منی کردە سەرلەشکر بۆ جەنگ دژی تۆ، جا چ من بم یا هەرکەسێکی ناسراویتری میدی، ئەوکاتە ڕەوتی ڕووداوەکان بە مەیلی تۆ دەچنە پێش. چونکە لەپێشدا میدییەکان پشتی ئاستیاگ بەردەدەن و ڕوو لەلای تۆ دەکەن، بۆوەی ئەو لەسەر تەختی پاشایەتی نەمێنێ. ئامادەکاری تەواو کراوە، ئەوەی بۆم نووسیوی بە ئەنجامی بگەیێنە و خێرا جێبەجێیان بکە ".

[١٢٥] وەختێک کوروش نامەکەی خوێندەوە، بیری لە شێوازێک دەکردەوە کە بە دڵنیایی فرەوە بتوانێ پارسەکان ڕازی بکات ڕاپەڕن. پاش فەترەیەک لێوردبوونەوە بەو ئاکامە گەیشت کە گونجاوترین ڕێوشوێن بەو چەشنە دەبێ کە لەخوارەوە باسی دەکەم: سەرەتا نامەیەکی نووسی و چی گەرەکی بوو تێیدا هێنایە بەرباس و پاشان پارسەکانی بانگهێشتی کۆبوونەوەیەک کرد و ئەوسا ئەو نامەیەی لە حزووری ئەواندا کردەوە و خوێندییەوە. کوروش ڕایگەیاند کە ئاستیاگ نامەی بۆ ناردوە و ئەوی وەک سەرکردەی پارسەکان دیاری کردوە: "ئێستا، لەبەر ئەوەی من وەک سەرکردە دیاریکراوم، دەستورتان پێدەدەم هەر هەمووتان لێرە کۆبنەوە و هەر کەسە داسێک لەگەڵ خۆی بێنێ ". کوروش ئەو فەرمانەی بە هۆزەکانی پارسدا – هۆزەکانیتری

پارسیش سەر بەوانەوە بوون – قەناعەتی بە گشتیان هێنا کە دژی میدییەکان راپەڕن. هۆزەکانی پارس بریتی بوون لە پاسارگادی، مەرافی، ماسپی. لەنێو ئەوانەدا پاسارگادی‌یەکان رەسەنترینن. لەراستیدا خێڵی ئاخامێنی (هیخامەنیشی) لکێک لە هۆزی پاسارگادی پێکدێنن. بنەماڵەی پاشایەتی پارسەکانیش لەو خێڵەوە سەرچاوەدەگرێ. هۆزەکانی‌تری پارس بریتین لە پانتیالی، دیروسی (دروزی) و بێرمانی (ژێرمەنی). ئەوانە پتر خەریکی پیشەی کشتوکاڵین، بەڵام داینی، ماردی، درۆپیکی و ساغارتی کوچەرن.

**[١٢٦]** وەختێک جەماوەری داس بەدەست کۆبوونەوە، کوروش فەرمانی‌دا ناوچەیەک بە پانتایی هەژدە تا بیست ستادیۆ لە دڕوداڵ پاک بکەنەوە. پارسەکان ئەو کارەیان جێبەجێ‌کرد. کوروش ئەوسا دەستوری‌دا رۆژی دوایی بە پاک و خاوێنی بێنەوە ئەو شوێنە. لەو نێوەدا، گشت مەڕ و ماڵاتی باوکی لەو گوڕەپانە ئامادەکراوەدا کۆکردەوە، سەری بڕین و بۆ میوانداری لەشکر ئامادەی کردن. ئەو هەروەها شەڕاب و خواردنی جۆراوجۆری‌تری بۆ خەڵکەکە دابین‌کرد. سبەینەکەی، وەختێک جەماوەری پارس هاتن، کوروش دەستوری‌دا کە گشتیان لە گوڕەپانەکە دانیشن و خۆش‌رابوێرن. دوای ئەوەی هەموو لایەک تێروتەسەل خواردیان و نۆشیان، ئەوسا کوروش لێی‌پرسین لەو دوو حاڵەتە کامیان بەلاوە گرینگترە، کارکردنی دوێنێ یا تێر خواردنی ئەمڕۆ؟ جەماوەر هەستیان بە جیاوازییەکی فرە کرد. رۆژی بەرێ زەحمەت و کوێرەوەری، بەڵام ئەمڕۆ تەواو خۆش‌رابواردن بوو. کوروش فرسەتی قۆستەوە و دەستی بە ئاخاوتن کرد: "ئەی پیاوانی پارس، ئەوە دیتتان جیاوازی دوو رۆژ چەندە زۆرە. ئەگەر گوێ لە من بگرن، ئێوە دەبنە خاوەن ئەو گشتە خۆشییە، بەبێ ئەوەی چەشنی کۆیلە بچەوسێنەوە. بەڵام ئەگەر نەخوازن بەقسەم بکەن، هەزاران قوڕبەسەری چەشنی دوێنێ چاوەڕوانتان دەبێ. کەوابوو حاڵی بن چیتان پێدەڵێم، بۆوەی بتوانن خۆتان رزگارکەن. من لەو باوەڕەدام کە خواکان منیان بۆیە هێنا سەر دنیا، تا ئەرکی رزگاری ئێوە وەستۆ بگرم. من پێموایە کە پلەی ئێوە لە میدییەکان نزمتر نییە، نە لە باری

نیزامی و نه له هیچ بوارێکی‌تردا. ئێستا که دەزانن بارودۆخەکە چۆنە، تکایە هەرچی زووتر دژی ئاستیاگ راپەڕن ".

[١٢٧] پارسەکان، ئیتر بوونە خاوەن سەرکردە و ئامادەکارییان بۆ جولانەوەی رزگاریخوازی دەسپێکرد. ئەوان لەمێژ ساڵ بوو بەدەست فەرمانڕەوایی میدی‌یەکانەوە دەیان‌ناڵاند و بۆیە خوازیاری ئازادی خۆیان بوون. وەختێک ئاستیاگ خەبەری هەڵسوکەوتەکانی کوروشی پێگەیی، راسپاردەی نارده لای ناوبراو و بانگهێشتی بارەگای پاشایەتی کرد. کوروش به تەتەری ئاستیاگی گوت که پێیبڵێ خێراتر له چاوەڕوانی ئەو دەگەمە لای، هەڵبەت نەک بۆ ئیتاعەت، بەڵکوو بۆ دوژمنایەتی. کاتێک ئاستیاگ گوێی لەو وڵامە بوو، خەڵکی میدی بەپانەوە چەکدار کرد. دەتگوت خواوەند کوێری کردوە، ئارپاغۆس‌یشی وەک سەرکردەی لەشکر هەڵبژارد و بیری لەوە نەکردەوە که چی بەسەر ئەو کابرایە هێناوە. وەختێک هێزەکانی میدی لەگەڵ پارسەکان کەوتنە مەیدانی شەڕ، ئەوانەی به نهێنییەکەیان نەدەزانی شەڕیان دەکرد. کۆمەڵێک خۆیان بەدەستەوەدا و بەشی هەر زۆریش بڵاوەیان کرد و گۆڕەپانی شەڕیان بەجێ‌هێشت.

[١٢٨] لەشکری میدی بەو شێوەیە تووشی شەرمەزاری و هەڵوەشانەوە هات و خودی ئاستیاگ‌یش که به خەبەری تێکشکانەکەی زانی، به هەڕەشەوە به کوروشی گوت: "کوروش، تۆ تەنانەت بەو سەرکەوتنەش ناتوانی دڵخۆش بی ". له درێژەدا و بەر له هەر کارێک، ئەو کۆمەڵە زانایانەی خەونەکەیان لێکدابۆوە گشتیانی له شیش‌دا، چونکە ئەوان پێشنیاری ئازادکردنی کوروش‌یان دابوو. پاشان تەواوی دانیشتووانی پیر و لاوی میدی چەکدار کرد که لەنێو شاردا مابوونەوە. ئاستیاگ ئەوسا لەگەڵ ئەو جەماوەرە له شار وەدەرکەوت و بەرەو مەیدانی شەڕی دژی پارسەکان چوو. لەو شەڕەدا تووشی شکست هاتن و ئاستیاگ خۆی بەدیل گیرا و گشت خەڵکی میدی هاوڕێی کوژران.

[١٢٩] ئارپاغۆس شاد و خۆشحاڵ بوو که ئاستیاگی بەیەخسیری دیت و کۆڵێک قسەی ناحەزی پێگوت و جنێوی پێدا و زیافەتی شامی ئەو شەوەی

وەبیر هێناوە کە چۆن جەستەی لەت و پەتکراوی کوڕەکەی دەرخوارد دابوو. لە ئاستیاگی پرسی کە ئێستاچۆن هەستێکی هەیە، کە ئاوا بۆتە کۆیلە و یەخسیر و دەسەڵاتی پاشایەتی لەدەستداوە. ئاستیاگ وەرسوڕایەوە و چاوێکی لێکرد و لێیپرسی داخوا ئەو هێرشەی کوروش پیلان و نەخشەی ئەو بووە. ئارپاغۆس لە وڵامدا گوتی بەڵێ، ئەو خۆی نامەی بۆ کوروش نووسیوە و ئێستاش ئەو سەرکەوتنە بەهی خۆی دەزانێ. ئاستیاگ لەو ساتەدا دووبارە پێیگوت کە تۆ ئارپاغۆس، نەفامترین و ناعادڵترین مرۆڤی ئەو جیهانەی، بێ عەقڵییەکەت لەبەر ئەوەیە کە خۆت دەتتوانی ببیە پاشا، ئەگەر ئەو لەشکرکێشییە کاری تۆ بێ، لە حاڵێکدا دەسەڵاتت داوەتە دەستی یەکێکیتر. ناهەقیش، چونکە بۆخاتری زیافەتێکی شام تەواوی خەڵکی میدیت کردە کۆیلە ". ئاستیاگ لەدرێژەدا گوتی، ئەگەر ئێستاش قەرارە بێ جیا لە ئارپاغۆس یەکێکیتر دەسەڵات بەدەستەوە بگرێت، باشترە کەسێکی میدی ئەو ئەرکە وەستۆ بگرێ نەک کابرایەکی پارس. ئەمڕۆ میدییەکان بەبێ ئەوەی هیچ تاوانێکیان هەبێ، لە نەتەوەیەکی دەسەڵاتدارەوە بوونەتە کۆیلە و یەخسیر و پارسەکانی کۆیلەش بوونەتە فەرمانڕەوا وحوکمڕانی بەسەر میدییەکاندا دەکەن.

[١٣٠] ئاستیاگ دوای سیوپێنج ساڵ پاشایەتی کردن، دەسەڵاتی لەدەستدا و میدییەکان کەوتنە ژێر حوکمی پارسەکان.[١] ئەو شکستە دەگەڕێتەوە بۆ توندوتیژی ناوبراو دەرهەق بە خەڵکانی ژێر دەسەڵاتی ئەو، ئەگینا میدییەکان سەد و بیست و هەشت ساڵی ڕێک فەرمانڕەوای وڵاتانی ئاسیای بچووک لەوبەر چۆمی ئالیس بوون. هەڵبەت ئەو ساڵانەی کە ژێر دەستەی سکیتییەکان بوون، حیساب نەکراون. میدییەکان دواتر لەمەر لەدەستچوونی سەروەرییەکەیان پەژیوان بوونەوە و دژی داریوش پاشا ڕاپەڕین. سەرهەڵدانەکەیان تووشی شکست هات و دووبارە بوونەوە بە کۆیلەی پارسەکان.

---

١- شکستی ئاستیاگ لە کوروش، ساڵی ٥٥٠ی پێش زایین بووە.

له سەردەمی فەرمانڕەوایی ئاستیاگدا، کوروش و پارسەکان دژی میدییەکان شۆڕشیان کرد و بەو شێوەیە تەواوی خاکی ئاسیاش کەوتە ژێر دەسەڵاتی ئەوان. کوروش هیچ ئازارێکی بە ئاستیاگ نەگەیاند، بەڵام تا کاتی مردن، ناوبراوی لەلای خۆی دەسبەسەر راگرت. کوروش بەوجۆرەی لە سەرێ باسم لێوەکرد، لەدایک بوو، پەروەردە کرا و گەورە بوو و پاشایەتی وەدەست هێنا. کریسۆس، ئەویش بەهۆی هەڵەیەکی کردی و بەدەست کوروشەوە شکستی خوارد و یەخسیرکرا. کوروش دوای تێکشکاندنی دەسەڵاتی کریسۆس، فەرمانڕەوایی سەراسەر خاکی ئاسیای بەدەستەوە گرت.

**داب و نەریتی پارسەکان**

[۱۳۱] سەبارەت بە داب و نەریتی پارسەکان ئەو زانیارییانەی خوارەوەم هەیە: ئەوان عادەتیان نییە پەیکەرە، قوربانگە و دێر و ئارامگە دروست بکەن. ئەو خەڵکانەش کە  بە دروست کردنی بینای لەو چەشنەوە خەریک بن ، پارسەکان بە چاوی سووک سەیریان دەکەن. هەڵبەت ئەوەندەی من بزانم، پارسەکان بەقەدەر یۆنانییەکان حەز لە پەرستن ناکەن و خواکانیان بە تایبەتمەندیيە مرۆییەکانەوە قبوڵ نییە. عادەتیانە قوربانی پێشکەش بە خواوەند دیا[۱] بکەن. ئەوان لەسەر دوندی بەرزترین کێو قوربانی دەکەن و ناوی خواوەند دیا دێنن و گومبەزی شینی ئاسمان بەلایانەوە ئەو خواوەندەیە. پارسەکان قوربانی پێشکەش بە خۆر، مانگ، زەوی، ئاگر، ئاو و با دەکەن. سەرەتا تەنیا قوربانییان بۆ ئەو خوایانە دەکرد، بەڵام دواتر لەژێر کارتێکەری عەرەبەکان، فێربوون کە قوربانی پێشکەش بە (ئورانییا ئەفرۆدیت)یش بکەن. ئاسیرییەکان بەو خوایە دەڵێن میلیتا و عەربەکان ناوی (ئالیلات)یان لەسەر داناوە و پارسەکانیش پێیدەڵێن میترا.

---

١- هێرۆدۆت لێرەدا گەورەترین خوای پارسەکان واتە ئاهورا مەزدای هاوشانی خواوەند دیا سەیرکردوە، هەڵبەت خاوەن هەمان ناو نەبووە.

[١٣٢] پارسەکان قوربانییەکانیان بەو شێوەیە پێشکەش بە خواکان دەکەن: نە قوربانگە دروست دەکەن و نە ئاگر دەکەنەوە. کاتی قوربانیکردن، نە شەرابی موقەدەس دەپرژێنن و نە فلووت لێدەدەن و نە دەسرەی پیرۆز لەنێو چاوانی ئاژەڵ دەبەستن و نە جۆی متفەرکی دەرخوارد دەدەن. هەرپارسێک بخوازێ قوربانی بکا، ئاژەڵەکەی دەباتە شوێنێکی خاوێن و تاجێکی ئاڵقەیی دروستکراو لە گوڵی کەرکوژە، لەسەر خۆی دەنێ و لەبەر خواوەند دەپاڕێتەوە و دوعا دەکا. ئەو کەسەی قوربانی پێشکەش دەکا، بۆی نییە تەنیا بۆ بەختەوەری خۆی دوعا بکا، بەڵکوو لەسەریەتی بۆ خەڵکی پارس و پاشاکانیش بپاڕێتەوە. ئەوەش بڵێم کە پاشا خۆیشی وەک تاکێکی پارس حیسابی بۆدەکرێ. خاوەن قوربانی پاش ئەوەی ئاژەڵەکەی سەربڕی و لەتوپەتی کرد و گۆشتەکەی کوڵاند، ئەوجار گژوگیای نەرم و بەپڕانی سێوەرەی سێپەلکە دەدروێ و رایدەخا و تەواوی گۆشتەکەی لەسەر رۆدەکا. پاشان ئەو مۆغ یا پیاوە ئایینییەی لەگەڵیەتی، دوعایەک بەسەر گۆشتەکەدا دەخوێنێ و ناوی ئەژدادی خواکان دێت. پارسەکان بەو دوعایە دەڵێن: تێئۆغۆنی (سەبارەت بە ئەژدادی خواکانە).

ئەگەر لە کاتی قوربانی کردندا هیچ مۆغ یا پیاوێکی ئایینی لەوێ ئامادە نەبووبێ، خاوەن قوربانی ناچارە دەستراگرێ. پاش خوێندنەوەی سرودی ئایینی لە قوربانگە، کابرا گۆشتەکە هەڵدەگرێ و بەرەو ماڵ دەگەڕێتەوە و بۆخۆی سەرپشکە کە چی لێبکا.

[١٣٣] رۆژی لەدایکبوون بەلای پارسەکانەوە گرینگترین رۆژی ساڵە. هەر تاکێکی پارس لەسەریەتی تا ئەو رۆژە بەشێوەیەکی تایبەت جێژن بگرێ. لەو رۆژەدا وەک ئەرک پێویستە سفرەکەی دەوڵەمەند و رازاوە بێ. دەوڵەمەندەکان گا، ئەسپ، وشترْ یا کەرێک لەنێو تەندووردا دەبرژێنن و لەپێش میوانی دادەنێن. بەپێچەوانەوە، خەڵکی هەژار و نەدار، بە ئاژەڵی بچووکتر قەناعەت دەکەن. پارسەکان خواردەمەنی قورس کەمتر دەخۆن و حەزیان لە چێشتی سووکە. ئەوان قەیاسێکی زۆر شیرینی لەسەر سفرە دادەنێن و یەکبەدوای

یەکدا دەیخۆن. هەربۆیە، پارسەکان دەڵێن کە یۆنانییەکان هەرکات لەسەر سفرە دادەنیشن، خێرا لە چێشت خواردن ماندوو دەبن و ناچارن درێژە بە خواردنەوە بدەن، چوونکە دوای زیافەت هیچ شتێکی بەنرخ و خۆشیان نییە لەپێش میوانی دانێن. ئەگەر یۆنانییەکان خواردەمەنییەکی خۆش و بەتامیان هەبوایە، خواردنیش درێژەی دەبوو. پارسەکان گەلێک حەزیان لە نۆشینی مەی و شەڕابە. بۆیان نییە لە حزوور خەڵکی‌تردا بڕشێنەوە یا گمێز بکەن. لە کۆنەوە ئەو دابونەریتە پارێزراوە. وەختێک مەست دەبن، عادەتیانە گرینگترین بابەتەکانی ژیانیان باس‌بکەن و بڕیار بدەن. ڕۆژی دوایی، وەختێک گشتیان بەتەواوی هاتنەوە سەرخۆ، کابرای خانەخوێ واتە ئەو کەسەی باسە گرینگەکان لە ماڵی ئەودا کراون، وەبیر میوانەکان دێنێتەوە کە لەکاتی مەستیدا چییان گوتووە و چ بڕیارێکیان داوە. ئەگەر هەمان بڕیار لەکاتی ئەغیاریشدا ئاقڵانە و دروست وەبەرچاو هات، ئەوە بەجێی‌دەگەیێنن، دەنا لێی پاشگەز دەبنەوە. پێچەوانەی ئەوەش دەقەومێ، واتە ئەگەر بە هەڵکەوت لەکاتی ئەغیاریدا قسە و بڕیارێکی نابەجێ بێتەبەرباس، لەکاتی مەینۆشیدا دوبارە دەیهێننە گۆڕێ و لەسەری دەدوێن.

[١٣٤] وەختێک دوو کەسی پارسی لە ڕێگا و کۆڵاندا تووشی هەڤدوو دەبن، پیاو بەڕاحەتی لێی حاڵی دەبێ کە خاوەن چ پلە و پێگەیەکی کۆمەڵایەتیین. ئەویش بەو چەشنەیە: لەجیات ئەوەی لەگەڵ یەکتر قسە بکەن، لێوی هەڤدوو ماچ دەکەن. ئەگەر یەکێکیان لەوەی‌تر تۆزێک هەژارتر بێ، ئەوسا گۆنای یەکتر ماچ‌دەکەن. ئەگەر هاتوو کابرای دووهەم زۆر هەژار بێ، خێرا دەکەوێتە بەر دەست و پێی ساماندارەکە و یەک لە ئەژنۆکانی لەسەر عەرز دادەنێ و سوژدە بۆ ساماندارەکە دەبا. ئەوە لەنێوان خۆیاندا، بەڵام سەبارەت بە خەڵکانی‌تر، دەبێ بڵێم کە حورمەتێکی زۆر بۆ هۆزەکانی نیزیک لە خۆیان دادەنێن. پاش ئەوانە، ئەوسا ڕوو دەکەنە ئەو خەڵکانەی وەک میوان لەگەڵیان هاتبن. ئەوانە بە پێی مەودای دووری وڵاتەکان، ڕێز و حورمەت بۆ خەڵکانی بێگانە دادەنێن. ئەو گەلانەی زۆر دوورن، بەلای پارسەکانەوە خاوەن

ئیحتیرامی کەمترن، چونکە خۆیان لەو باوەڕەدان کە لە هەموو باریکەوە لە خەڵکانی‌تر زاناتر و خاوەن رەفتاری پەسندترن و خەڵکانی دراوسێ هەتا دوورتر هەڵکەوتبن، ماقوڵییان کەمتر دەبێتەوە چونکە تێکەیشتوویی بێگانەکان بە بەراورد لەگەڵ زانایی و یاسا و ریسای خۆیان هەڵدەسەنگێنن.

پارسەکان بەچاوی سووک سەیری گەلانی دوور لە خۆیان دەکەن. پێوەندی نێوان نەتەوەکانی ژێردەستی ئیمپراتۆری میدییەکان زنجیرەیی و پلەبەپلە بوو. میدییەکان فەرمانڕەوایی گشتییان بەدەستەوە، حوکمڕانیان بەسەر نەتەوەکانی دراوسێی هاوسنووردا دەکرد. ئەو کۆمەڵە دراوسێیە هاوسنوورە، پاشایەتیان بەسەر جیرانەکانی خۆیاندا دەکرد و بەو شێوەیە هێزی دراوسێ بەسەر دراوسێی دوورتردا زاڵبوو. بنەمای ئەو شێوە فەرمانڕەوایییەی میدییەکان لەسەردەمی هاتنەسەرکاری پارسەکانیشدا رێزی لێگیرا و گرینگی پێدرا و بۆیە هەر نەتەوەیەک لە رووی خاکەوە نیزیکتر لە دەزگای حکوومی پارسەکان بوایە، هێزی پتری بۆ حوکمڕانی پێدەدرا.

[۱۳۵] پارسەکان راحەتتر و هاسانتر لە گەلانی‌تر، عادات و رەفتاری بێگانەکان وەردەگرن. شێوەی پۆشینی جلوبەرگی میدییەکانیان لە هی خۆیان پێ‌باشترە و رەچاویان کردوە. لە شەڕەکاندا زرێی میسری دەپۆشن. وەختێک شێوەکانی جۆراوجۆری خۆشگوزەرانیی گەلانی‌تر دەبینن، خێرا رووی تێدەکەن. پارسەکان منداڵبازی و نێربازی لە یۆنانییەکانەوە فێربوون و خاوەن سیستەمی فرە ژنی و مەعشوقەی زۆرن (جیا لە ژنەکانی خۆیان، کۆمەڵێک سیغەشیان هەیە).

[۱۳٦] بەوەج‌ترین هونەری پیاو دوای جوامێری لە شەڕدا، ئەوەیە کە خاوەن منداڵی زۆر بێ. پاشا هەموو ساڵێک ئەو کەسە خەڵات دەکا کە زۆرترین ژمارەی منداڵی هەبێ. ژمارەی زۆری منداڵ و نفوس، بە لای پارسەکانەوە مانای توانایی و هێزی پتر دەدا. منداڵەکانیان لە تەمەنی پێنج ساڵییەوە تا بیست ساڵی فێری سوارکاری، تیرهاوێژی و راستگۆیی و سەداقەت دەکەن. منداڵ تا نەبێتە پێنج ساڵ، بە باوکی نیشان نادرێت و تەنیا لەلای ژنەکان دەژی. بۆیەش ئەو

کارەدەکەن کە ئەگەر ڕۆژێک منالّی شیرەخۆرە مرد و نەژیا، باوک بۆی بە پەرۆش نەبێ.

**[١٣٧]** من ستایشی ئەو داب‌ونەریتانە و ئەوانەی خوارەوەش دەکەم: نە پاشا و نە هیچ تاکێکی پارس بۆیان نییە سزای مەرگ لەمەر تاکە تاوانێک بۆ تاوانبار دیاری‌بکەن. هیچ پارسێکیش ئەو مافەی پێنەدراوە، ئەندامانی بنەماڵە یا کۆیلەی ژێر دەستی خۆی بەجۆرێک سزا بدا کە دواتر قەرەبوو نەکرێتەوە. کابرای پارس پێویستە بە وردبینییەوە لە تاوانەکە بکۆڵێتەوە و یاساکە بەو جۆرەیە، ئەگەر هەڵە و خەراپەکاری تاوانبار و کۆیلەکە پتر لە خزمەتەکانی بێت، ئەوسا پارسەکە دەتوانێ بەمەیلی خۆی تاوانبار سزا بدات. دەگێڕنەوە کە هیچکات پارسێک باوک یا دایکی خۆی نەکوشتووە. ئەگەر سەردەمێکیش لەو چەشنە جینایەتانە قەومابن، لە توێژینەوە و لێکۆڵینەوەکانەوە دەرکەوتووە کە بەهۆی منالّانی حەرامزادە یا نایاسایی و زڕ بە ئەنجام گەیشتوون. ئەوان لەو باوەڕەدان کە دیاردەیەکی سروشتی نییە ئەگەر باوک یا دایکی خاوەن بنەچکەی رەسەن لەلایەن منالّی خۆیەوە بکوژرێ.

**[١٣٨]** پارسەکان بۆیان نییە سەبارەت بەو بابەتانەی لێیان یاساغ کراوە، لەبارەیەوە بدوێن. گەورەترین بێ نەزاکەتی بەلایانەوە درۆ و قەرزکردنە. ئەوان پێیانوایە ئەگەر پیاو قەرزداربێ، سروشتییە لەبەر دەسکورتی لای زۆر کەس درۆبکا. هەر کەسێک تووشی نەخۆشی دوزامی و دوزامی سپی(نەخۆشی ئالّبۆمین) بێ، نە ئیزنی پێدەدرێت و نە بۆی هەیە بێتە نێو خەڵک و نابێ هاتووچۆی پارسەکان بکەن. پارسەکان لەو باوەڕەدان کە ئەوانەی تووشی ئەو نەخۆشی‌یانە دێن، بێ‌حورمەتییان بە خۆر کردوە. ئەگەر کەسێکی بێگانە تووشی نەخۆشی لەو جۆرە بێت، پارسەکان خێرا لە وڵاتی خۆیان دەریدەکەن. ئەوان کۆترێ سپی دەکوژن و پێیانوایە ئەو باڵندەیە خاوەن نەخۆشی دوزامییە. تف و بەڵغەم و گمێز لەنێو ئاوی چۆم ناکەن و تەنانەت دەستیشیان بە ئاوی ڕووبار ناشۆن و ڕێگە بە کەسانی‌تریش نادەن

ئەو کارە بکەن. ئەوان بەپێچەوانەی ئێمە حورمەتێکی فرەیان بۆ چۆم و ڕووبار هەیە.

[١٣٩] تایبەتمەندییەکی‌تری پارسەکان کە خۆیان هەستیان پێنەکردوە، بەڵام سرنجی ئێمەی بۆلای خۆی ڕاکێشاوە، ناوەکانیانە. ناوەکانیان، ئەوانەی مانای تایبەتمەندییەکانی جیسمی و گەورەیی و پلە و پایە دەدەن، هەمیشە بە یەک پیت کۆتاییان پێدێت. دووری‌یەکان بەو پیتە دەڵێن "سان "و یوونی‌یەکان پێیدەڵێن س (سیغما). ئەگەر پیاو بە وردی لێی‌بکۆڵێتەوە، ئەوسا بۆی دەردەکەوێ کە گشت ناوەکانی پارسی، بەبێ هیچ هەڵاواردنێک بەپیتی س (سیغما) کۆتاییان پێدێ.

[١٤٠] ئەو کۆمەڵە بابەتەی تا ئێستا لەمەر پارسەکان هێناومەتە بەرباس، بەلامەوە تەواو دروستن، چونکە زانیاری زۆرم لەبارەیانەوە هەیە. بەڵام لەمەوبەدوا، ئەوەی دەیڵێم پتر بابەتی نهێنی و شاراوەن و لێیان دڵنیا نیم. من سەبارەت بە دابونەریتی مردوەکانیان زانیاری فرەم لەبەردەستدا نییە، لەبەر ئەوەی خەڵکی پارس نهێنی پارێزن. ئەوان هیچ مردوویەک نانێژن، سەرەتا پێویستە جەستەی مردوو بە دەم سەگ یا دەنووکی باڵندەکان لەتوپەت بکرێ، ئەوجار دەینێژن. سەبارەت بە ناشتنی مۆغەکانیان، دڵنیام کە بەو شێوەیەی باسم‌کرد بەخاکیان دەسپێرن، چونکە ئەو نەریتە بە ئاشکرا بەڕێوەدەچێ. پارسەکان سەرەتا مۆمی تواوە لە لەشی مردوو هەڵدەسوون، پاشان دەینێژن. مۆغەکان جیاوازی زۆریان لەگەڵ خەڵکانی ئاسایی و بەتایبەت میسرییەکان هەیە.

کاهێنانی میسری هیچ ئاژەڵێک ناکوژن، مەگەر ئەوانەی بۆ قوربانی دیاری‌کرابن. بەپێچەوانەوە، مۆغەکان جیا لە سەگ و مرۆڤ، گشت حەیوان و باڵندەیەک بەدەستی خۆیان دەکوژن. بەلای مۆغەکانەوە گەلێک شوورەییە گەورەیە ئەگەر مێرووله و مار و حەیواناتی خزۆک و باڵدار نەکوژن و حەزیان لەو کارەیە و زۆرجار کێبەرکێیانە. ئەوە کۆمەڵێک زانیاری سەبارەت بە دابونەریتی پارسەکان بوو و ئێستا دەگەڕێمەوە سەر باسەکانی پێشووم.

[١٤١] کاتێک لیدی‌یەکان بەدەست پارسەکانەوە تووشی شکست هاتن، یوونی‌یەکان[1] و ئێئۆلی‌یەکان[2] وەفدێکیان ناردە لای کوروش لە شاری سارد کە ئیتاعەتی خۆیان رابگەیێنن، هەڵبەت بەو شەرتەی کە ئەو مافانەی پێشتر کریسۆس پێی‌دابوون، بپارێزرێن. کوروش وەختێک گوێی لە قسە و خواستەکانیان گرت، بە کورتە چیرۆکێک وڵامی دانەوە و گوتی: "رۆژێکیان کابرایەکی بلوێرژەن کاتی ژەنینی بلوێرەکەی لە قەراخ ئاو، چاوی بە رەوەیەکی ماسی کەوت. درێژەی بە ژەنین‌دا و پێیوابوو ماسییەکان لە ئاو دێنەدەر و دەچنە سەر ویشکایی. پاش فەترەیەک ژەنینی بلوێر، کابرا ناهومێد بوو و خێرا چوو تۆرێکی ماسیگری هێنا و لە ئاوی هاویشت. ماسییەکی زۆر پێوە بوون و گشتیانی لەسەر عەرز رۆکرد. ماسییەکان ئەوجار خەریکی هەڵبەزدابەز بوون. کابرا پێی‌گوتن: دەست لەو هەڵپەڕینە هەڵگرن! ئەو کاتەی من بلوێرم بۆ لێدەدان، نەودەویست لە ئاو بێنەدەر، باشە ئێستا ئەو سەما کردنەتان لە چییە؟". کوروش بەو شێوەیە وڵامی یوونی و ئێئۆلی‌یەکانی داوە. ئەو کاتەی خۆی وڵامی بۆ ناردبوون کە پشتی کریسۆس بەردەن، ئەوان بە قسەیان نەکردبوو، بەڵام ئێستا لە رووی ناچاری ئامادەی ئیتاعەت کردن لە ناوبراو بوون. کوروش ئەو قسانەی بە قەڵسی پێگوتن. وڵامی کوروش خێرا بە گوێی

---

١- یوونی، هەرێمێک لە ئاسیای بچووکی سەردەمی باستان، لەنێوان کەنداوی ئەزمیری ئەمڕۆ و کەنداوی مێندێلیا هەڵکەوتبوو و لە سەراسەری خاکەکەیدا کۆچبەرانی یۆنانی نیشتەجێ بوونە. شارەکانی گەورەی ئەو هەرێمە بریتی بوونە لە میلیتوس، ئێفێسۆس، کۆلۆفۆن، فۆسێ و خییۆ.

٢- ئێئۆلی، ناوی یەکێک لە هەرێمە کۆنەکانی ئاسیای بچووکە و لە دراوسێیەتی هەرێمی یوونی بووە. دانیشتووانی ئێرە بە هەمان ناو واتە ئێئۆلی دەناسران. سەرەتا لە وڵاتی یۆنان ژیاون، بەڵام دواتر بەهۆی هێرشی دووری‌یەکان، بەرەو ئاسیای بچووک کۆچیان کردوە و لەو شوێنە نیشتەجێ بوونە کە ناوی نراوە ئێئۆلی.

خەڵکی شارەکانیتر گەیشت و بۆیە بەپەلە دەستیان بە دروستکردنی دیواری حەساری دەوری ئاواییەکان کرد و دانیشتووانی ئەو ناوچانە جیا لە میلیتۆسییەکان (دانیشتووانی بازێڕ و ناوچەکانی میلیتۆس)، گشتیان لە پانیۆنیۆ[1] کۆبوونەوە. میلیتۆسییەکان پێشتر پەیمانی دۆستایەتییان لەگەڵ کوروش بەستبوو و لەسەر ئەو خاڵە رێککەوتبوون کە مافەکانی خۆیان وەک سەردەمی دەسەڵاتداری کریسۆس بپارێزن. یوونییەکان، وەفدێکیشیان ناردە شاری سپارت و داوای هێزی پشتیوانیان کرد.

[١٤٢] پانیۆنیۆ ملکی یوونییەکان بوو. ئەوان عادەتیان بوو کە کۆمەڵگاکانی خۆیان لەو شوێنانە دروستبکەن کە جوانترین ئاسمان و خۆشترین ئاو و هەوای هەبێ. تەنانەت شارەکانی باکوورتر، یا ئەوانەی لە باشوور و رۆژهەڵات و رۆژئاوای یوونیۆ سازکراون، لەگەڵ شوێنی نیشتەجێیی یوونییەکان نایەنە هەڵسەنگاندن و بەراوردکردن. دانیشتووانی شارەکانی باکوور بەدەست نمی هەوا و سەرما دەناڵێنن و باشووریەکانیش لە گەرما و ویشکارۆیی بێزارن. یوونییەکان بە یەک زاراوە قسە ناکەن و خاوەن چوار زاراوەی جیاوازن.

سەرەکیترین شاری یوونییەکان لە باشوور پێیدەگووترێ میلیتۆس و میلیتیەکانی لێدەژین. پاشان نۆرەی شاری میئۆسی و بازێڕی پرێئینی[2] دێت. ئەو دوو کۆمەڵگایەی دوایی لە ناوچەی کاریا[3] هەڵکەوتوون خەڵکەکە خاوەن زاراوەی یوونیین. ئەو شارانەش کە ناویان دێ، گشتیان لە وڵاتی لیدی هەڵکەوتوون: ئێفێسۆس[4]، کۆلۆفی[1]، لێفێدۆس[2]، تێئۆس[3]، کالزۆمینی[4] و

---

١- نێوەندی کۆبوونەوەی نوێنەرانی شارەکانی هاوپەیمانی یوونی بووە.

٢- یەکێک لە شارە ناسراوەکانی یوونی لەسەردەمی باستاندا. ئەمڕۆ بەناوی سامسۆن دەناسرێ. ناسراوییەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوە کە وڵاتی فەیلەسوف فیاس بووە.

٣- کاریا، ناوچەیەکی سەردەمی باستان لە ئاسیای بچووک، هەڵکەوتوو لە قەراخ ئاوەکانی دەریای ئێژە. شارەکانی ناسراوی ئەو دەڤەرە، میلیتۆس و ئالیکارناسۆس پتر ناسراون.

٤- ئێفێسۆس، شارێکی باستانی یوونی، خاوەن مەعبەدێکی گەورە و پڕشکۆ کە وەک یەکێک لە حەوت شاکارەکانی سەرسوڕهێنەری جیهان سەیردەکرا.

فۆکیس[٥]. دانیشتووانی ئەو کۆمەڵگایانە، زمانی هاوبەشیان هەیە و هیچ هاوشێوەیی و نیزیکایەتییەکیان لەگەڵ زمانی سێ کۆمەڵگاکەی‌تر نییە کە لە سەرەوە باسمان کرد. سێ کۆمەڵگای‌تریش هەن کە ئەوانیش لە رەگەزی یوونی‌یەکانن. دوو لەو هۆزانە لە دورگەکانی سامۆس و خییۆس[٦] نیشتەجێن و ئەوەی‌تریش واتە ئێریتری‌یەکان لە دەشتایی دامەزراون. دانیشتووانی دورگەی خییۆس و ئێریتری‌یەکانی دەشتایی خاوەن یەک زمانی هاوبەشن، بەڵام خەڵکی دورگەی سامۆس زمانی تایبەت بەخۆیان هەیە. لە ئەنجامدا دەبێ بڵێم کە چوار زاراوە لەو وڵاتەدا قسەیان پێدەکرێ.

**[١٤٣]** لەنێو هۆزەکانی یوونی‌دا، میلیتۆسی‌یەکان (دانیشتووانی شاری میلیتۆس) لە هیچ پێشهاتێک نەدەترسان، چونکە پێشتر پەیمانی ئاشتییان مۆر کردبوو. دانیشتووانی دورگەکانیش هەستیان بە مەترسییەکی ئەوتۆ نەدەکرد، لەبەرئەوەی پارسەکان لە شەڕی دەریاییدا زۆر شارەزا نەبوون و لەلایەکی‌تریشەوە، فینیقی‌یەکان هێشتا نەکەوتبوونە ژێردەسەڵاتی پارسەکان. دیارە ئەوەش بگوترێ، کە ئەو سەردەمە پارسەکان خاوەن کەشتیگەلیەکی دەریایی بەهێز نەبوون. ئەوەی ئەو دوازدە شارە یوونی‌یەی پێشتر ناوم‌هێنان و لە خەڵکانی‌تری یوونی جیادەکردنەوە، ئەوە بوو کە ئەو سەردەمە سەرتاسەری وڵاتی یۆنان تووشی بێ‌هێزی و بێدەسەڵاتی هاتبوو و لەو نێوەدا خەڵکی ئەو کۆمەڵگایانە پتر لە خەڵکانی‌تر تووشی هەژاری هاتبوون و هیچکەس بایەخی پێنەدەدان و حیساباتیان بۆ نەدەکرا. ئەو کاتە تەنیا شارێکی بەوەج لەنێو وڵاتی

---

١- شاری باستانی یوونی و مەوتەنی فەرزی و گرێمانەیی هۆمێر لە ئاسیای بچووک.

٢- یەکێک لە کۆمەڵی دوازدە شارەی یوونی لە سەردەمی باستاندا و دراوسێی ئێفێسۆس و تێئۆس.

٣- شاری باستانی لە ئاسیای بچووم لە روبەڕووی نیمچەدورگەی کلازۆمێن و مەوتەنی ئەناکرێئۆنی شاعیر لە ٥٧٢ی پێش زاییندا.

٤- شاری باستانی یوونی و مەوتنی ئاناکساغۆراسی فەیلەسوفی یۆنانی.

٥- فۆکیس یا فۆکیدا، شارێکی یوونی لە ئاسیای بچووک کە بەدەست کوچبەرانی یۆنانی بنیاتنراوە.

٦- دورگەیەک لە کۆمەڵەدورگەکانی یۆنانی باستان و مەوتنی گریمانەیی هۆمێر.

یوونی‌یەکاندا ئاتێن بوو و هەر ئەویش گرینگی پێدەدرا. یوونی‌یەکانی جیا لەو دوازدە شارە و ئاتێنی‌یەکان ناوی یوونی‌یان بەلاوە پەسند نەبوو و حەزیان نەدەکرد بەو ناوەیان بانگبکەن و تەنانەت ئێستاش پێیەوە قەڵسن و هەست بە خەجاڵەتی دەکەن. بەپێچەوانەوە، دوازدە کۆمەڵگاکەی‌تر شانازیان بەو ناوە دەکرد و بەو بۆنەوە پەرستگەیەکیان سازکرد و ناوی (پانیۆنیۆ)یان لەسەردانا و بڕیارییاندا هیچ یوونی‌یەک جیا لە خۆیان ڕێگەنەدەن بچێتە ژوورەوەی ئەو پەرستگەیەو ڕەگەڵ ئەو هاوپەیمانییە بکەوێ. هەڵبەت ئەوەشمان لەبیر بێ کە کۆمەڵگەکانی جیا لەوانە قەت داوای تێکەڵبوونیان نەکرد و تەنیا سمیرنی‌یەکان جارێک ئەو خواستەیان هێناگۆڕێ.

[١٤٤] دووری‌یەکان[١]، ئەوانیش هەربەو چەشنە هەڵسوکەوتیان کرد. ئەو هۆزانەی لەو وڵاتە دەژین، قەدیم خاوەن پێنج شاری هاوپەیمان بوون و کۆمەڵگاکەیان پێکدەهێنا کە پێیدەگووترا پێنداپۆلی. ئەمڕۆ لە شەش شار پێکهاتوون و ناسراون بە ئێکساپۆلی. ئەوانە هۆزەکانی دراوسێ ڕێگەنادەن بچنە ژووری پەرستگەی تریۆپیکۆ[٢] و تەنانەت خەڵکانی خۆشیان کە تووشی کردەوەی دژە یاسا بووبن، بۆیان نییە لەو پەرستگەیە وەژوورکەون. زەمانی زوو لە کێبەرکێکانی وەرزیشی تریۆپیۆ کە بۆ ڕێزگرتن لە خواوەند ئاپۆلۆن پێکدەهاتن، خەڵات بە هەریەک لە براوەکانی پاڵەوانییەتی دەبەخشرا و پەیکەرەیەکی سێ پایەی مسی بوو. براوەی خەڵات بۆی نەبوو خەڵاتەکە لە پەرستگە بەرێتەدەر و دەبوایە لەوێ بمێنێتەوە و وەک دیارییەک بۆ خواوەند چاوی لێدەکرا.

---

١- ناوچەیەک لە یۆنانی باستان هەڵکەوتوو لە باشووری هەرێمی تێسالی. دووری‌یەکان یەکێک لە هۆزەکانی ڕەسن و سەرەتایی یۆنانی باستان کە نیمچە دورگەی پێلۆپۆنیسۆس‌یان داگیرکرد و دەوڵەتی سپارتیان دامەزراند.

٢- ئەو مەعبەدە لەسەر بەرزاییەکی نیمچەدورگەی کنیدۆس هەڵکەوتوو لە هەرێمی کاریا لە کەنار ئاوەکانی دەریای ئێژە. ئەو مەعبەدە بەناوی دامەزرێنەری ئەفسانەیی خۆی واتە تریۆپۆس کوڕی خواوەند پۆسیدۆن ناودێرکراوە.

ئاغاسیکلیس خەڵکی ئالیکارناسۆ کاتێک پاڵەوانێتی وەدەست هێنا و یەکەم هاتەوە، ئەو قانوونەی پێشێلکرد و پەیکەرەکەی وەریگرتبوو، بردییەوە ماڵ و پاراستی. سەبارەت بەو کارەی ئاغاسیکلیس، خەڵکی پێنج کۆمەڵگاکەی لیندوس، یالیسۆس، کامیرۆس، کۆس و کیندۆس[1]، کۆمەڵگای شەشەم واتە (ئالیکارناسۆ)یان لە هاوپەیمانێتی خۆیان وەدەرنا و بەو چەشنە سزایاندا.

[١٤٥] دۆدێکا پۆلی، کۆمەڵگایەکی‌تری پێکهاتوو لە دوازدە شار لەلایەن یوونی‌یەکانەوە. ئەو کۆمەڵگایە ئامادەی وەرگرتنی ئەندامییەتی هیچ شارێکی‌تر نەبوو. هۆیەکەشی ئەوە بوو کە وەختێک ئەو یوونی‌یانە لە هەرێمی پێلۆپۆنیسۆس دەژیان، تەنیا دوازدە شاریان بەو ناوانە هەبوو: شاری پێلینی لەسەر رێگا و لە نیزیک سیکی‌ئۆنا، شارەکانی ئایرا و ئاییێس، رووباری کراتیس بەوەی دواییدا دەرباز دەبێ و بەردەوام پڕئاوە. هەڵبەت چۆمی (کراتیس)ی ئیتالیاش ئەو ناوەی هەر لەوێوە وەرگرتووە. شارەکانی ڤورا و ئێلیکی، وەختێک یوونی‌یەکان بەدەست ئاخاییەکان شکستیان خوارد پەنایان بۆ ئەو دوو ناوچەیە برد. ئێیی‌ئۆ، ریپێس، پاترا، فارێس، ئۆلێنۆس کە چۆمی گەورەی پیرۆسی پێدا دەڕوا، دیمی و تریتی‌ئا، ئەوەی دوایی تەنیا کۆمەڵگای هەڵکەوتوو لە هەرێمی مەدیترانەیە.

[١٤٦] ئەوانە ناوی ئەو دوازدە شارە بوون کە وەختی خۆی مڵکی یوونی‌یەکان بوون و دواتر ئاخاییەکان داگیریانکردن و تێیاندا نیشتەجێ بوون. یوونی‌یەکان لەبەر ئەوەی دامەزرێنەری سەرەکی ئەو دوازدە کۆمەڵگایە بوون، پتر لە یوونی‌یەکانی‌تر خۆیان بە خاوەنی ڕەگەزی یوونی یا نژادی رەسەنتر دەزانن و ئەوەش بۆچوونێکی دروست نییە. چونکە حەشیمەتێکی زۆری ئاڤاندی[2] سەر بە ناوچەی ئێڤڤیا[3] لەنێو ئەوانەدا دەژین و هیچ پێوەندییەکیان بە رەگەزی یوونییەوە نییە و تەنانەت ناوەکانیشیان

---

١- شارێکی کۆنی دەڤەری کاریا، هەڵکەوتوو لە کەنارئاوەکانی دەریای ئێژە و ئاسیای بچووک.

٢- ئەوانە لە دەڤەری فۆکیداوە هاتبوون و لە ئێڤڤیا نیشتەجێ بوون و وێدەچێ بەڕەگەز تراکی بووبن.

٣- هەڵکەوتوو لە رۆژهەلاتی یۆنان.

لەیەک ناچن. جیا لە هۆزی ئاڤاندی، مینیيەکانی دانیشتووی هەرێمی ئۆرخۆمینۆ[1]، کادمیی[2]، دریپی، فوکی، مۆلۆسی، پێلاسغیيەکانی[3] دەڤەری ئارکادیا[4]، دووریيەکانی ئێپیداڤرۆس[5] و زۆرانیتریش دەتوانین ناوبەرین.

ئەو جەماوەرە یوونیيەی لە پریتانی[6] شاری ئاتینەوە ڕێگای کۆچبەریيان گرتەبەر و پێیانوابوو کە ڕەگەزی ئەسڵی یوونین، ژنەکانیان لەگەڵ خۆیان نەبرد، بەڵکوو میرد و گشت کەسوکاری ژنانی ناوچەی (کاریا)یان کوشت و لەگەڵ ژنەکاندا ژیانی هاوسەرییان پێکهێنا. هەر بە هۆی ئەو جینایەتەوە، ژنەکان لەنێو خۆیاندا سوێندیان خوارد و وەسیەتیشیان بۆ کچەکانیان کرد کە هیچکات لە ژیانیاندا لەگەڵ مێردەکانیان دانەنیشن و خواردن نەخۆن و قەت مێردە نوێیەکانیان بەناوی ئەسڵییانەوە بانگنەکەن، چونکە گشت کەسوکاری ئەو ژنانە بەدەست ئە مێردە تازانەوە کوژرابوون و خۆشیان ناچارکرابوون لەگەڵیان بژین. ئەو ڕووداوە لە شاری میلیتۆس قەوما.

---

١- شارێک لە هەرێمی ڤیوتییای وڵاتی یۆنان و لەسەردەمی عەتیقدا پێتەختی هۆزەکانی مینی بووە.

٢- یەکێک لە قەڵاکانی ناسراوی یۆنانی لە هەرێمی ڤیۆتییا.

٣- پێلاسغی ناوی هۆزێکی گەلێک کۆنی سەردەمی پێش مێژوویە. ئەوانە لە وڵاتی یۆنان، ئاسیای بچووک، دورگەکانی ئیتالیا و خاکی ئیتالیادا ژیاون و خاوەن شارستانییەتی گەڕۆکی بوونە و هیچکات وەک نەتەوەیەکی یەکدەست یەکتریان نەگرتووە و یۆنانییەکان لە خاکی یۆنان دەریانکردون و بەشێکیان یەخسیرکراون. ئەو هۆزانەی لەوانەوە وەپاشکەوتوون بریتین لە تراکی، فریژی، لیدی، کاری، ئەتروسکی، ئاڵبانی و ئیتالیاییەکانی دانیشتووی دورگەکان.

٤- ناوچەیەکی نێوەندی وڵاتی یۆنانی باستان، هەڵکەوتوو لە نیمچە دورگەی پێلۆپۆنیسۆس. شارە ناسراوەکانی ئەو ناوچەیە، تێیێئا، ئۆرخۆمێن کە ئەمرۆ بە تریپۆلی ناسراوە.

٥- ئێپیداڤرۆس شارێکی یۆنانی باستان هەڵکەوتوو لە ئارغۆس لە کەنار ئاوەکانی دەریای ئێژە. مەعبەدی گەورەی ئەو شارە زیارەتگەی گشت خەڵکانی نەخۆش بوو کە لە سەراسەری یۆنانەوە بەرەو ئەوێ دەهاتن.

٦- نێوەندی ئیداری و دەسەڵاتدارییەتی شاری ئاتین، کۆچبەرانی یۆنانی کاتی ڕۆیشتن بەرەو دەڤەری نوێ، لەوێوە مەشخەڵی ئاگریان هەڵدەگرت و لەگەڵ خۆیان دەیانبرد.

[١٤٧] هێندێک له هۆزەکانی یوونی نیشتەجێی ئاسیا پاشای خۆیان له خانەدانێکی خاوەن رەگەزی لیکی و له نەوەکانی غلافکۆسی[١] کوڕی ئیپۆلۆخۆس هەڵبژارد. ژمارەیەکیشیان پاشای خۆیان له هۆزی کافکۆنی نیشتەجێی دەڤەری پیلۆس و له نەوە و نەتیجەکانی کودرۆسی کوڕی مێلانتۆس دیاریکرد. له هێندێک شوێنیش یوونییەکان پاشایان له هەردووی ئەو خانەدانانه هەڵدەبژارد. لەنێو گشت هۆزەکانی یوونیدا، تەنیا ئەوانەی دوایی بایخی زۆریان به ناو و رەگەزی یوونی داوه و پێیانوابووه که نەژادی راستەقینه ئەوانن. یوونییەکانی ناسراو، لەڕاستیدا ئەو کەسانەن که له ئاتێنییەکان وەپاشکەوتوون و جێژنی سێ رۆژەی ئاپاتۆریا[٢] له وەرزی پاییزدا پیرۆزدەکەن. هەڵبەت گشت یوونییەکان، جیا له دانیشتووانی ئێفێسیۆس و کۆلۆفۆنیۆس، ئەو سێ رۆژه جێژن دەگرن. دانیشتووانی ئەو دوو شارە، لەبەر قەومانی جینایەتێک له سەردەمی خۆیدا، ئامادە نین جێژنی ئاپاتۆریا بەڕێوەبەرن.

[١٤٨] پانیۆنیۆ شوێنێکی پیرۆز له کوێستانەکانی ناوچەی میکالی[٣]، بەرەو باکوور ڕاکشاوە و یوونییەکان بەگشتی ئەو مەکانەیان پێشکێش به ئێلیکۆنیۆس پۆسیدۆنا کرد. دەڤەری میکالی نیمچه دورگەیه و لەلای رۆژئاوا، لەڕووبەڕووی دورگەی سامۆس هەڵکەوتووه. یوونییەکان عادەتیان بوو لەو جێگەیه کۆبنەوە و مەراسیمی جێژنی پانیۆنیۆ بەڕێوەبەرن. هەڵبەت ئەوەش بڵێم که تەنیا جێژنەکانی یوونی نین که بەو پیته کۆتایی دێن، بەڵکوو هەموو جێژنەکانی وڵاتی یۆنان وەک ناوەکانی پارسی له ئاخردا به یەک پیتی دیاریکراو کۆتاییان پێدێت.

---

١- راوچی ماسی ناسراوی دەڤەری ڤیۆتیا که دواتر وەک خوای مەلەوانانی دەریا ناوبانگی دەرکرد.

٢- ئەو جێژنه له وەرزی پاییزدا بووه و سێ رۆژی خایاندوه. ئاتێنییەکان له رۆژی سێهەمدا گشت ئەو منداڵانەی لەو ساڵەدا لەدایکبوونە، ناوەکانیان له دەفتەری بنەماڵەدا که چەشنێک لیستی شارۆمەندی بووه، تۆمارکردوه.

٣- هەڵکەوتوو له هەرێمی پریئێنی.

[١٤٩] ئەوانەی ناوم هێنان شارەکانی یوونی بوون. ئەوانەی خوارەوەش هی ئیئۆلی‌یەکانن: کیمی ناسراو بە فریکۆنیس، لیریسێس، نیئۆتیخۆس، تیمنۆس، کیللا، نۆتیۆ، ئێیروسا، پیتانی، ئێییئا، میرینا، غرینیا. ئەو ناوانەی باسم لێوەکردن، بە یازدە شاری قەدیمی ئیئۆلی‌یەکان ناسراون. یەکێک لە شارەکانیان بەناوی سمیرنی، بەدەست یوونی‌یەکانەوە داگیرکرا، ئەگینا ئیئۆلی‌یەکان لە سەرەتادا دوازدە شاریان هەبوو. ئەو هەرێمەی ئیئۆلی‌یەکان بەمەبەستی نیشتەجێ بوون هەڵیانبژاردبوو گەلێک لە هەرێمی یوونی‌یەکان خۆشتر و سازگارتر و خاوەن ئاو و هەوای جیاوازتر بوو.

[١٥٠] ئیئۆلی‌یەکان بەو هۆیەی باسی دەکەم. شاری سمیرنی‌یان لەدەستدا. کۆمەڵێک خەڵکی کۆلۆفۆنی سەرهەڵدانیان سازکرد. تووشی شکست هاتن و دوور خرانەوە و ناچار بوون پەنا بۆ ناوچەی سمیرنی بەرن. کۆلۆفۆنی‌یەکان راست لەو ڕۆژەیدا کە دانیشتووانی شاری سمیرنی بۆ جێژنگرتن و رێز لێنان لە خواوەند دیۆنیسۆس[١] چوبوونە دەرەوەی شار و لە پشت حەسار و دەروازەکانی شار بوون، لەپڕێکا درگایان لەسەر داخرا و لەدەرێ مانەوە و شارەکەیان داگیرکرا. خەڵکی ئیئۆلی بەپانەوە هاتن بۆوەی یارمەتی سمیرنی‌یەکانی لێقەوماو بدەن. لەکۆتایی‌دا بەو رێککەوتنە گەیشتن کە یوونی‌یەکان تەواوی سامانی گوێزراوە (مەنقول) بدەنەوە بە ئیئۆلی‌یەکان، بەڵام حوکمڕانی شارەکە بەدەستەوە بگرن. ئەوە چارەنووسی سمیرنی‌یەکان بوو و لەڕووی ناچاری بەسەر شارەکانی‌تردا دابەش‌بوون.

[١٥١] پێنج شاری ئیئۆلی‌یەکان کە لە ویشکایی هەڵکەوتوون و باسمان لێوەکردن، جیا لەوانەن کە لە هەرێمی ئیدی[٢] جێیانگرتووە و لەئەژمار نەهاتوون.

بەڵام شارەکانی جێگیر لە دورگەکان، لەوانە پێنجیان لە دورگەی لێسڤۆس (شەشەمین شاری ئەو دورگەیە ناسراوە بە ئارسیڤا. خەڵکی ئەو شارە

---

١- دیۆنیسۆس یا ڤاکخۆس، خواوەندی شەڕاب لە یۆنانی باستاندا.

٢- مەبەست دەڤەرێکی شاخاوییە کە لە نیزیک شاری تریا (ترۆوا) هەڵکەوتووە.

هەرچەند لەگەڵ دانیشتووانی شارەکانیتری دورگە خاوەن یەک رەگەزی هاوبەشن، بەڵام بەدەست خەڵکی میتیمنی کە خزمی خۆشیان بوون، شکستیان خوارد و بوونە کۆیلە). لە دورگەی تێنێدۆس تەنیا یەک شار هەڵکەوتووە و شارێکیتریش لە کۆمەڵێک دورگەی بچوک ناسراو بە ئێکاتۆنیسیا (سەددورگە)[1] دروستکراوە. ئێئۆلییەکان، ئەوانیش چەشنی دورگە نشینانی یوونی و لێسڤۆسی و تێنێدۆییەکان لەباری ئەمنییەوە هەستیان بە مەترسی نەدەکرد. چەند شارێکیتریش هەبوون کە پێشوەخت ساغ ببوونەوە و ملکەچی بڕیارات و دەستووراتی یوونییەکان بوون.

[١٥٢] وەختێک راسپاردەکانی یوونی و ئێئۆلی گەیشتنە شاری سپارت (لەبەر ئەوەی پەلەیان بوو)، پیتێرمۆس خەڵکی شاری فۆکێیایان دیاریکرد بە نوێنەرایەتی گشتیان قسە بکات. پیتێرمۆس جلوبەرگی رەنگ سوور و رازاوەی لەبەرخۆی کرد. گەرەکی بوو سپارتییەکان پتر رێزی لێبگرن و جەماوەری زیادتر بۆ گوێگرتن لەو کۆبێتەوە. وەختێک خەڵک کۆبۆوە، ناوبراو خۆی ناساند و وتارێکی دوورودرێژی پێشکەشکرد.[2] ئەو بە سپارتییەکانی گوت کە پێویستە یارمەتی ئێئۆلییەکان بدەن. ئەو ئاخاوتنەی ناوبراو جێگای ڕەزامەندی لاکێدیمۆنییەکان(سپارتییەکان) نەبوو و خۆیان لە کۆمەگ کردن بە ئێئۆلی و یوونییەکان پاراست. ڕاسپاردەکانی یوونی و ئێئۆلی ڕۆیشتن. سپارتییەکان پاش رەدکردنەوەی داوای ئەو وەفدە، چەند راسپاردەیەکی خۆیان بەسواری گەمییەکی پێنیداکۆپۆ[3] وەدوای ئەوانە خست تا زانیاری تەواو سەبارەت بە ڕەوشی یوونییەکان کۆکەنەوە. باوەڕی من گەرەکیان بوو بزانن پێوەندی ئەوانە لەگەڵ کوروش چۆنە. وەختێک پیاوەکانی سپارتی گەیشتنە ناوچەی فۆکێئا، بەتواناترین کەسیان لەنێو خۆیاندا نارده نێو شاری

---

١- ئەو کۆمەڵە دورگەیەی لەنێوان دورگەی لێسڤۆس و ئاسیای بچووک هەن.

٢- سپارتییەکان حەزیان لە وتاری دورودرێژ نەبوو و خۆیشیان درێژەدادرییان نەدەکرد و قسەکانیان کورت و پوخت بوو و تا ئەو جێگەیەی کە وێژەی لاکونیک کە لەراستیدا ناوی رەگەزیی سپارتییە و مانای خەڵکی لاکونی دەدا، لە زمانەکانیتردا وەک کورت وێژی دەکاردەکرێ.

٣- گەمییەکی سووکی بازرگانی کە خاوەن پەنجا بێڵژەن لە ریزێکدا.

سارد. ئەو کەسە ناوی لاکرینییس بوو و دەبوایە پەیامی لاکێدیمۆنی‌یەکان بگەیێنێتە دەست کوروش. لە پەیامەکەدا گوترابوو: "وڵاتی یۆنان وێران مەکە، چوونکە ئەو کردەوەیەت بە هیچ جۆرێک قبوڵ ناکرێ".

[۱٥۳] دەگێڕنەوە کە کاتێک کابرای راسپاردە ئەو قسەیەی بە کوروش گوت، ناوبراو رووی لە یۆنانی‌یەکانی بەکرێگیراوی خۆی کرد و پرسی، لاکێدیمۆنی‌یەکان چەند کەسن و چ جۆرە خەڵکێکن کە وێراویانە پەیامێکی ئەوتۆ بۆ من بنێرن. کاتێک وڵامی خۆی وەرگرتەوە، ئەوسا بە راسپاردەی سپارتی گوت: "من لەو جۆرە خەڵکە ناترسم، وەختێک لەنێوەڕاستی شارەکەیاندا (لە نێو بازاڕ) کۆدەبنەوە و بەدەم سوێندخواردنەوە یەکتری هەڵدەفریوێنن. ئەگەر خواکان یارمەتیم بدەن، ئەو جۆرە خەڵکە ئیتر مەجالی زماندرێژی سەبارەت بە چارەڕەشی یوونی‌یەکانیان نامێنێ، بەڵکوو پێویستە لەمەو بەدوا باسی لێقەوماوی خۆیان بکەن". کوروش بەو قسانەی تەواوی یۆنانی‌یەکانی بەتاوانبار زانی،چونکە لەسەرتاسەری خاکی یۆناندا، ژمارەیەکی زۆر بۆ کڕین و فرۆشتن دروست کرابوون. بەپێچەوانەوە، پارسەکان ئەسڵەن عادەتیان بە دامەزراندنی بازاڕ نەبووە و لە وڵاتەکەشیان هیچ شوێنێک بۆ مامەڵەکردنی رۆژانە تەرخان نەکراوە. دوای ئەو ئاخاوتنە، کوروش حوکمڕانی شاری ساردی دایە دەست کابرایەکی پارس بەناوی تاڤالۆس و دەستووری بە پاکتی‌ئیسی لیدیایی دا تەواوی خەزێنەی زێڕ و جەواهیراتی کریسۆس و لیدی‌یەکانی‌تر باربکات. بەو گشتە غەنیمەتەوە بەرەو شاری ئێکباتان وەڕێکەوت و کریسۆس‌یشی لەگەڵ خۆی برد. سەرەتا خۆی لە یوونی‌یەکان نەگەیاند، ئەوەش بۆیە بوو کە بابێلی و باکتری[1] و ساکی و میسری‌یەکان کێشە و گرفتیان بۆ خوڵقاندبوو و راپەڕیبوون. ئەو گەرەکی بوو لەپێشدا خۆی شەڕی ئەو بەرهەڵستکارانە بکات و پاش تێکشکاندنیان، ئەوسا لەشکرێک بنێرێتە سەر یوونی‌یەکان.

---

۱- باکتری یا باختری، ئەو هۆزە بوونە لە وڵاتی تورکستانی ئەمڕۆ کە پێشتر شوێنی نیشتەجێیی ئارياييەكان بووە، ژیاون. پێتەختی ئەوانە باکتریا و دواتر ناسراو بووە بە بەلخ.

[١٥٤] كوروش وەختێک لە شاری سارد رۆیی، پاكتیئیس دانیشتووانی وڵاتی لیدی هاندا دژی تاڤالۆس و كوروش راپەڕن. ناوبراو خەزێنەی زێڕ و جەواهیراتی خەڵكی شاری ساردی بەدەستەوە بوو و بەرەو ناوچەكانی كەنار دەریا داگەڕاخوار. خێرا مواجبی لەشكری بەكرێگیراوی دایەدەستیان و حەشیمەتی ناوچەكانی دوور لە دەریاكانیشی رازیكرد، بۆوەی پشتیوانی لێبكەن. پاكتیئیس دواتر بەرەو شاری سارد گەڕایەوە و هێزەكانی تاڤالۆسی گەمارۆدا كە لەنێو قەڵای شاردا خۆیان حەشار دابوو.

[١٥٥] كوروش راست لەو كاتەدا كە بەرەو شاری ئێكباتان دەچوو هەواڵی ئەو قەومانەی پێگەیی. لەجێوە لە كریسۆسی پرسی: "كریسۆس! ئەو گرفتانەی بۆ من سازدەبن، تۆ بڵێی رۆژێک كۆتاییان پێبێت؟ لەو باوەڕەدا نیم كە لیدییەكان دەست لە خولقاندنی كێشە بۆ من و بۆ خۆشیان هەڵگرن. بیر لەوە دەكەمەوە كە باشترە گشتیان وەک كۆیلە بفرۆشم. لەڕاستیدا من وەک ئەو كەسە دەچم كە باوكێكی كوشتبێ، بەڵام بەزەیی بە منداڵەكاندا هاتبێ. تۆم لەو خەڵكە ئەستاند كە لە باوكێک باشتر بووی و زۆرت لێ ڕازی بوون، هەرچەند شارەكەم داوە بە خۆیان، بەڵام بەو حاڵەش دانامركێن و سەرهەڵدان دژی من سازدەكەن ".

كوروش بەڕاشكاوی قسەی خۆی كرد و كریسۆس لەترسی ئەوەی مەبادا پاشا شاری سارد وێران بكا، بەو شێوەیە وەڵامی داوە: "پاشاكەم! قسەكانت تەواو راستن. من داوایەكم لە جەنابت هەیە كە تەسلیمی ڕقوكین مەبە و شارێكی دێرین وێران مەكە، تەنیا بۆخاتری كۆمەڵە رووداوێک كە هیچ نەخشێكیان لە كێشە و رووداوەكانی ئێستا و پێشوودا نەبووە. سەبارەت بە گرفتەكانی پێشوو من تاوانبار بووم و ئەوە بە سزای خۆم گەیشتووم. لەمەر كێشەكانی ئێستاش، دەبێ بڵێم كە پاكتیئیس گوناهبارە، واتە ئەو كەسەی خۆت شارەكەت تەحویلدا و پێویستە ئەو سزا بدرێ. دانیشتووانی لیدیایی

ببووره و ئەو حوکمانەیان دەسەر بکە، بۆوەی جارێکیتر شۆڕش نەکەن و مەترسی نەخوڵقێنن: مافی چەکداربوونیان لێوەرگرەوە. دەستووریان پێبدە کە شۆرە و عەبا لەژێر جلەکانیترەوە لەبەر خۆیان بکەن و پێڵاوی پاشنەبەرز لەپێکەن. هەروەها داوایان لێبکە کە مناڵەکانیان فێری ئامێری مۆسیقا و گۆرانی و بازرگانی بکەن.

پاشاکەم! دڵنیام زۆر زوو دەبینی کە ئەو خەڵکە لە پیاوەتی دەکەون و خووی ژنان هەڵدەگرن و بەو شێوەیە هیچ چەشنە مەترسییەک بۆ سەر ئاسایيشی جەنابت ناخوڵقێنن و روو لە شۆڕش ناکەن ".

[١٥٦] کریسۆس بۆیە ئەو کۆمەڵە پێشنیارەی بەیانکرد، چوونکە لەو باوەڕەدا بوو کە خەڵکی لیدی باشتر وایە بەو چەشنە بژیت، نەک وەک کۆیلە لە کوچە و کۆڵانی وڵاتانیتر بفرۆشێن. ناوبراو ئەوەشی دەزانی کە دەبێ چەند ڕێنوێنییەک بداتە دەست کوروش تا بتوانێ قەناعەتی پێبێنێ. کریسۆس لەوە دەترسا مەبادا لیدییەکان کە ئەمڕۆ لە مەترسییەکی گەورە رزگاریان هاتووە، لە داهاتوودا دوبارە دژی پارسەکان راپەڕن و تووشی تێداچوون بێن. کوروش ئەو پەند و ئامۆژگارییانەی کریسۆسی بەکەیفێ بوو، تۆزێک رقی نیشتەوە و پەسندی کردن. بانگی مەزاریسی میدیای کرد و دەستووری پێدا کە ئەو بۆچوونانەی کریسۆس سەبارەت بە لیدییەکان خێرا جێبەجێبکا و تەواوی ئەو کەسانەی لەگەڵ لیدییەکان پەلاماری شاری ساردیان داوە، وەک کۆیلە بفرۆشێن و پێویستە پاکتیئیس، ئەویش بە زیندووی دەسگیر بکرێت و بیهێنێتە بەردەم ئەو.

[١٥٧] کوروش لە کاتێکدا بەرەو وڵاتی پارس دەڕۆیی، ئەو دەستوورانەیدا. وەختێک پاکتیئیس ئاگادار بۆوە کە لەشکری دژبەر بەڕێوەیە، ترسی ڕێنیشت و پەنای بۆ هەرێمی کیمی برد. مەزاریس بەو هێزە لەشکریە کە کوروش لە ئیختیاری نابوو، بەرەو شاری سارد پێشڕەوی کرد. نابراو کاتێک لە هەرێمی سارد، پاکتیئیس و هاوڕێیانی ئەوی نەدۆزییەوە، لیدییەکانی ناچارکرد دەستوورات و خواستەکانی کوروش بەجێبگەیێنن.

بەو دەستوورانەی کوروش، شێوەی ژیانی لیدیەکان ئاڵوگۆڕی قووڵی بەسەردا هات. دواتر مەزاریس راسپاردەی نارده ناوچەی کیمی و داوای لە حوکمڕانی ئەوێ کرد کە پاکتیئیس تەحویل بداتەوە. دانیشتووانی کیمی داوای ئامۆژگاریان لە خواکانی ڤرانخیدی[1] کرد. ئەو شوێنە نێوەندی پێشگۆیی لە سەردەمی دێرین (باستان)ەوە تا ئێستا بووە و بەپێی عادەت، یوونیەکان و ئێئۆلیەکان بەمەبەستی راوێژ روویان تێکردوە. بەپێی هەڵکەوتەی جۆغرافیایی، ئەو نێوەندە دەکەوێتە هەرێمی میلیتۆس و لە سەرووی بەندەری پانۆرمۆس جێیگرتووە.

[١٥٨] کیمیەکان راسپاردەیان نارده نێوەندی پێشگۆیی و داوای رێنوێنی و ئامۆژگاری جێگای رەزامەندی خواکانیان لەمەر گرفتی پاکتیئیس کرد. پێیانگوترا کە پاکتیئیس تەحویلی پارسەکان بدەنەوە. کاتێک کیمیەکان گوێیان لەو ئامۆژگارییە بوو، بڕیاریاندا ناوبراو تەحویل بدەنەوە، هەرچەند زۆربەی خەڵکەکە لەگەڵ ئەو کارە بوون، بەڵام ئاریستۆدیکۆس، کوڕی ئیراکلیدیس پیاوێکی بە ویقار و گەورە، باوەڕی بەو ئامۆژگارییە نەهێنا و شکی لە راستگۆیی راسپاردەکان بوو و پێیوابوو درۆدەکەن. ناوبراو گوتی کە کیمیەکان نابێ پاکتیئیس تەحویل بدەنەوە، بەرلەوەی کۆمەڵێک راسپاردەیتر دوبارە بچنەوە نێوەندی پێشگۆیی و لەنێو ئەوانیشدا خۆی لەگەڵیان بچێ.

[١٥٩] کاتێک وەفدەکە گەیشتە لای خواکانی ڤرانخیدی، ئاریستۆدیکۆس لەسەر ناوی گشت نوێنەرانەوە لە کاهێنی مەزنی پرسی: "گەورەم! پاکتیئیسی لیدی بە گریانەوە هاتووە و پەنای بۆ ئێمە هێناوە بۆوەی بەدەست پارسەکانەوە ناجوامێرانە نەکوژرێ. پارسەکان داوای تەحویلدانەوەی ناوبراو لە ئێمە دەکەن و دەستووریان پێداوین رادەستی بکەینەوە. ئەوەش بڵێم کە ئێمە هەرچەند لە هێزی پارسەکان دەترسێین،

---

١- شارێکی یوونی باستان لە نیزیک میلیتۆس و شوێنی یەکێک لە کاهێنانی ناسراوی ئەو سەردەمە. بیریەکان وەرەسەی ڤرانخۆسی کوڕی خواوەند ئاپۆلۆنای تاڵەبین بوونە.

بەوحاڵەش تا ئێستا نەمانویستووە ئەو کابرایە بدەینەوە دەست ئەوان، پێش ئەوەی راوبۆچوونی ئێوە لەو بارەوە بە روونی و ئاشکرا بزانین کە دەبێ چ بکەین ".

ئاریستۆدیکۆس پرسیاری خۆی بەو شێوەیە گووتم، خستە بەرباس. کاهێنی مەزن دوبارە هەمان وڵامی پێشووی داوە و ئامۆژگاری کردن کە پاکتیئیس تەحویلی پارسەکان بدەنەوە. لەوکاتەدا، ئاریستۆدیکۆس بە ئانقەست کارێکی سەیری کرد. گشت چوێلەکە و باڵندەکانی دەوروبەری پەرستگەی هەڵفڕاند. دەگێڕنەوە کە دەنگێک لە قوڵایی پەرستگەوە هات و بە ئاریستۆدیکۆسی گوت: "ئەی بێ عەقڵ! ئەوە خەریکی چی؟ بۆچی باڵندەکانی من لە مەعبەد دەردەکەی؟ ". ئاریستۆدیکۆس بەبێ پەشۆکان، وڵامی داوە: "گەورەم! تۆ بەو چەشنە یارمەتی باڵندەکانی خۆت دەدەی و هاوکاتیش دەستوور بە کیمیەکان دەدەی کە باڵندەکەیان (پەنابەرەکەیان) تەحویلبدەنەوە ". خواوەند دوبارە وەقسە هاتەوە: "بەڵێ، بۆیە فەرمانێکی ئەوتۆ بە ئێوە دەدەم بۆوەی هەرچی خێراتر لەمەر بێ ئاقڵیتان تووشی تێداچوون بێن و لەوە پتر روو لەلای من نەکەنەوە، ئەویش تەنیا بۆ پرسیارێکی نەفامانە کە داخوا پێویستە پەنابەرێک رادەست بکەینەوە یاننا! ".

[١٦٠] وەختێک کیمیەکان گوێیان لەو دەنگە بوو، چوون خوازیاری تەحویل دانەوەی پاکتیئیس نەبوون، هەروەها نەشیان دەویست بکەونە بەر پەلامار و هێرشی پارسەکان، ئەو کابرایەیان ناردە دورگەی میتیلینی[١]. وەختێک فەرمان و خواستی مەزاریس (فەرماندەی پارس) بە میتیلینیەکان گەیشت، ئەوان ئامادەبوون لە بەرامبەر پوڵ و پارەدا پاکتیئیس تەحویلبدەنەوە. ئەوەی راستی بێ ئەمن نازانم پارەکە چەندە بووە، لەبەر ئەوەی کە ئەو پوڵە قەت نەدرا. لەو لاشەوە کیمیەکان خەبەری ئەو کارەی میتیلینیەکانیان پێگەیی. خێرا گەمیەکیان ناردە شاری لێسبۆس و پاکتیئیسیان رفاند و بردیانە دورگەی خییۆس. لەوێ، دانیشتووانی خییۆس

---

١- میتیلین ناوی قەدیمی دورگەی لێسبۆس و لە باشووری یۆنان هەڵکەوتووە.

پاکتیئیس‌یان بەزۆر لە پەرستگەی ئاتێنای پارێزەر[1] رفاند و رادەستی پارسەکانیان کردەوە. دواتر ئەو کابرایە لەبەرامبەر خاکی دەڤەری (ئاتارنیئا)دا[2] مامەڵە و گۆڕینەوەی پێکرا. ئاتارنیئا سەر بە ناوچەی میسیا[3] و دەکەوێتە روبەرووی دورگەی لێسڤۆس.[4] پارسەکان پاکتیئیس‌یان تەحویل وەرگرت و بە پاسەوانییەکی چڕوپڕەوە بردیانە لای کوروش. بۆ ماوەیەکی زۆر هیچ کەس لە دانیشتووانی دورگەی خییۆس لەخۆی رانەدیت دانەوێڵە و جۆی بەرهەمی خاکی ئاتارنیئا بکاتە خێر و خێرات و بەسەر ئاژەڵی قوربانیدا بیپرژێنن. تەنانەت کولێرەی متفەرکیش لە حاسڵاتی ئەو دەڤەرە دروست نەکرا کە بۆ خێرات بێ. خەڵکی خییۆس خۆیان لە کڕینی بەرهەمی ئەو ناوچەیە بۆ رێورەسمەکانی ئایینیش پاراست.

[١٦١] دانیشتووانی دورگەی خییۆس، پاکتیئیس‌یان رادەست کردەوە. مەزاریس دوای جێبەجێ کردنی ئەو کارە، هێرشی کردە سەر خەڵکانێک کە یارمەتی پاکتیئیس‌یان دابوو و تاڤالۆس‌یان لە گەمارۆ خستبوو. مەزاریس خەڵکی پریئینی بەخڕی وەک کۆیلە فرۆشت و ئەوجار بەرەو دەشتی میئاندرۆس[5] پێشڕەوی کرد و ئەو دەڤەرەشی بەپانەوە تاڵان‌کرد. ناوچەی

---

١- ئاتینا، ئیلاهەی یۆنانی باستان و خوای فکر و ئەندێشە و پارێزەری شاری ئاتێن.

٢- یەکێک لە ناوچەکانی هەرێمی میسیا لە باکووری رۆژئاوای ئاسیای بچووک.

٣- میسیا هەرێمێک لە باکووری رۆژئاوای ئاسیای بچووک و شارە ناسراوەکانی بریتین لە: تریا (ترۆوا) و لامپساکوس. شارونی قایقوانی ناسراو لە میتولۆژی یۆنانیدا خەڵکی لامپساکوس بووە و ناوبراو بە قایقێکی بچووک جەنازەی مردوانی لە چۆمی ستۆخۆس پەڕاندۆتەوە و بردونییەتە شاری حادێس.

٤- بەپێی زانیارییەکانی هێرۆدۆت ئێرە ناوچەیەکی پڕحاسڵات و نێوەندی بەرهەمهێنانی گەنم بووە.

٥- تورکەکان ئەمڕۆ بە مندرێس ناوی دێنن، ناوچەیەک لە ئاسیای بچووک، بەهۆی چۆمێک پاراودەکرا کە هەر بەو ناوە ناسراوە.

ماغنیسی‌یا[1]، ئەویشی هەر بە هەمان شێوە تالان و وێرانکرد. مەزاریس دوای ئەو کردارەی تووشی نەخۆشی هات و پێی‌مرد.

[١٦٢] دوای مەرگی مەزاریس، ئارپاغۆس لە نێوەندی ئاسیا بوو و فەرماندەریی لەشکرەکەی مەزاریسی وەستۆگرت. ئارپاغۆس، ئەویش وەک مەزاریس خاوەن رەگەزی میدیایی بوو، واتە ئەو کەسەی کە پاشای میدی‌یەکان بانگهێشتی میواندارییە قیزەوەنەکەی کردبوو و ئەویش بۆ تۆڵەسەندنەوە یارمەتی کوروشی دابوو کە دەسەلات بەدەستەوە بگرێ. ئارپاغۆس بە فەرمانی کوروش وەک سەرکردەی لەشکر دیاری‌کرا و کاتێک گەیشتە هەرێمی یوونی، شارەکانی یەکبەدوای‌یەکدا داگیرکرد. ئەو بەدروستکردنی تەپۆڵکەی گڵ و خەندەک شارەکانی گەمارۆ دەدا و دانیشتووانی دەڤەرەکەی ناچاردەکرد لەنێو حەساری ئاواییەکانیان‌دا حەپس‌بن و دواتریش بە خاکی ئەو تەپۆڵکانە وەسەر دیواری شارەکان دەکەوت و پەلاماری نێوەوەی شاری دەدا. ئارپاغۆس یەکەم شوێنی داگیری کرد، شاری فۆکێئا لە هەرێمی یوونی‌یا بوو.

[١٦٣] فۆکیس‌یەکان (دانیشتووانی ناوچەی فۆکێئا) یەکەم وەجبەی یۆنانی‌یەکان بوون کە سەفەری گەورەیان بۆ دەریاکانی دوردەست بە ئەنجام گەیاند. ئەوانە بوون کە سەرەتا کەنداوی ئادریاتیک و پاشان ناوچەکانی تیرینی، ئیڤیری[2] و تارتیسۆس‌یان[3] دۆزییەوە. ئەوانە خەڵکانێک بوون کە بە گەمییەکانی بازرگانی خڕ[4] هاتووچۆیان نەدەکرد، بەڵکوو کەڵکیان لەو پاپۆڕانە وەردەگرت کە درێژ و خاوەن پەنجا کوپەی دانیشتن بوون.

---

١- یەکێک لە شارەکانی ئاسیای بچووک لە سەردەمی باستاندا. شەڕی ماغنیسییا ساڵی ١٩٠ی پێش زایین لەنێوان سیپیۆنی ئاسیایی و ئانتیخۆسی سێهەم لێرە قەوماوە.

٢- ناوی ناوچەیەکی کۆنی ئاسیا لە باشووری قەفقاز.

٣- نیزیک لە دەڤەری کۆڵەکەکانی ئیراکلیس یا جەبەل ئەل تاریقی ئەمڕۆ، لە هەرێمی کادیکس هەڵکەوتووە.

٤- هێرۆدۆت بەوانە دەڵێ " دورگەی خڕ یا بازنەیی "، بۆ کاری بازرگانی کەڵکیان لێوەردەگیرا، قورس و شل‌ئاژۆ بوون. بۆ دەریاکانی دوور لە گەمی درێژ کەڵکوەردەگیرا.

ئەوان لە هەرێمی تارتیسۆس توانیان دڵی ئارغانتۆنیۆس، پاشای ئەو وڵاتە وەدەست بێنن. ئەو پاشایە هەشتا ساڵ حوکمڕانی کرد و سەرجەم سەدوچل ساڵ ژیا. فۆکیس‌یەکان ئەوەند لە ئارغانتۆنیۆس نیزیک کەوتنەوە کە ناوبراو پێشنیاری کرد ئیتر نەچنەوە هەرێمی یوونی و لە وڵاتی ژێر دەسەڵاتی ئەودا و لە هەرجێگایەک خۆیان بخوازن نیشتەجێ بن. پاشا لەمەر هاتنیان بۆلای ئەو نەیتوانی رازی‌یان بکات، لەولاشەوە خەبەری پێگەیی کە فەرمانڕەوایی میدیا خەریکە پەرەدەستێنێ، بۆیە یارمەتی زۆری ماڵی بە دانیشتووانی فۆکیسی کرد لە دەوری شارەکەیان حەسار دروستبکەن. دیوار و حەسار دروست کردن لەو سەردەمەدا هاسان و خێرا نەبوو، بەڵکوو پێویستی بە قەیاسێکی زۆر بەردی گەورەی داتاشراو هەبوو.

[١٦٤] فۆکیس‌یەکان بەو چەشنەی باسمکرد، توانیان دیوارەکانیان دروست بکەن. ئارپاغۆس، ئەویش بە لەشکرەکەیەوە گەیشتە ناوچەی فۆکێئا و گەمارۆی‌دان، هەڵبەت بە دانیشتووانی فۆکیسی راگەیاند ئەگەر تەنیا بورجێک بڕوخێنن و دیوارێک لابەرن و بینایەک تەحویل بدەن، ئەوە نیشانەی ئیتاعەت کردنە و ئەو لێیان خۆش دەبێ و دەست لە گەمارۆ هەڵدەگرێ. فۆکیس‌یەکان گەرەکیان نەبوو کۆیلەتی قبوڵ بکەن، گوتیان پێویستە رۆژێکیان مۆڵەت بدرێتێ بۆوەی بیر لەو پێشنیارە بکەنەوە و دواتر وڵام بدەنەوە. ئەوان هەروەها داوایان کرد، لەو ماوەیەدا کە کۆبوونەوەی راوێژ بەڕێوە دەچێ، پێویستە هێزەکانی لەشکری ئارپاغۆس لە دیوارەکانی شار دوور کەونەوە. ئارپاغۆس تێیگەیاندن کە زۆر چاک لە مەبەستیان حاڵی بووە و دەزانێ کە خەریکی چین، بەڵام بەو حاڵەش رێگای پێدان کە کۆبوونەوەکەیان بە ئەنجام بگەیێنن و هێزەکانی لەشکریی لە دیوارەکان دورخستەوە. فۆکیس‌یەکان فرسەتیان قۆستەوە و خێرا گەمییەکانیان هاویشتە سەر بەحر. ژن و مناڵ و هەرچی کەلوپەلی هەیانبوو و بۆ هەڵگیران دەبوو، لەگەڵ پەیکەرە و کەرستەی خاوەن پیرۆزایەتی و شتوومەکی نێو پەرستگە و باقی دارایی و سامانەکەیان رەپێچەکیان‌دا و بایەوانی

گەمییەکانیان کردەوە و بەرەو دورگەی خییۆس رایاندا. دیارە کەلوپەلی مس و بەردی نەخشێندراوی نێو پەرستگەکانیان لەگەڵ خۆیان نەبرد. پارسەکان وەختێک دەستیان بەسەر شاری فۆکیس داگرت، تەنیا چۆلەوارێکیان بۆ بەجێ مابوو.

[١٦٥] فۆکیس‌یەکان پێشنیاریان بە دانیشتووانی دورگەی خییۆس کرد کە گەرەکیانە دورگەکانی ئینووسی لەوان بکڕن. خییۆسی‌یەکان خۆیان لەو مامەڵەیە نەدا و لەوە دەترسان مەبادا فۆکیس‌یەکان ئەو شوێنانە بکەنە نێوەندی بازرگانی و دورگەکانی خۆیان لەو کێبەرکێیەدا زیانیان پێبگات.

فۆکیس‌یەکان بەناچار بەرەو ناوچەی کیرنۆس[1] کۆچیان کرد، چونکە بیست ساڵ پێشتر پەند و ئامۆژگارییەکیان لەگوێ گرتبوو و لەوێ شارێکیان بنیات‌نابوو کە پێی‌دەگوترا ئالالییا.[2]

لەو سەردەمەدا کە ئەو کۆمەڵە رووداوە دەقەومان، ئارغانتۆنیۆس[3] فەوتی کردبوو. لە رێگای بەرەو کیرنۆس، سەرەتا بە دەڤەری فۆکیئادا تێپەڕین و تەواوی پاسەوانەکانی پارسییان لەو شوێنە کوشت. ئەو دەڤەرە بەهۆی لەشکری ئارپاغۆس داگیرکرابوو و پاشان تەحویلی کۆمەڵێکی‌تر لە پارسەکان درابوو و پادگانێکی نیزامی لێ‌دامەزرابوو. فۆکیس‌یەکان دوای بەئەنجام گەیاندنی ئەو رەشەکوژییە، بە ئاشکرا و بە دەنگی بڵێندەوە تووک و دوعایان لەو کەسانە کرد کە لە گەمی‌یەکانیان دادەبەزین و لەگەڵیان نەدەچوون. ئەوان بەوەش نەوێستان و پارچە ئاسنێکی سوورکراوەیان هاویشتە نێو دەریای ئازاد و سوێندیان‌خوارد، تا ئەوکاتەی ئەو پارچە ئاسنە وەسەر ئاو نەگەڕێ، نەگەڕێنەوە وڵاتی فۆکیئا. وەختێک بە گەمی‌یەکانیان بەرەو کیرنۆس دەڕۆیشتن، هەستی غەریبایەتی و پەرۆشی لەمەر تاڵانکرانی وڵاتەکەیان، زیادتر لە نیوەی خەڵکەکەی[4] داگرت و هەربۆیە سوێندەکانیان وەژێر پێ خست و گەڕانەوە

---

١- سەر بە ناوچەی کورسی، هەمان کێرسی ئەمڕۆ.

٢- شاری ئالالییا دواتر بە ئالێریا ناسرا و لە کەنارئاوییەکانی رۆژئاوای کیرنۆس یا کورس هەڵکەوتووە.

٣- ئارغانتۆنیۆس پاشای تارتیسۆس بووە.

هەرێمی فۆکێئا. ئەوانەی مابوونەوە، سوێندەکانیان پاراست و لە ناوچەکانی ئینووسیڕا بەرەو نێوەندی دەریاکان ڕۆیشتن.

[١٦٦] ئەو کۆمەڵە خەڵکەی دوایی کاتێک گەیشتنە کیرنۆس، لەگەڵ یەکەم وەجبەی دانیشتووانی ئەوێ ماوەی پێنج ساڵان ژیان و چەند پەرستگەیەکیان دروستکرد. لەبەر ئەوەی بەردەوام خەڵکانی دراوسێی خۆیان تاڵان دەکرد، دوای پێکهاتنی هاوپەیمانییەک لەنێوان هۆزەکانی تیرینی[١] و کارخیدۆنی[٢]، بە شێست گەمی جەنگییەوە هێرشیان کردە سەر فۆکیسیەکان. فۆکیسیەکان، ئەوانیش شێست گەمییان پڕچەک کرد و لە بەرامبەر هێزەکانی هاوپەیمان لە ناوچەی ساردینیا لەسەر دەریای ئازاد دامەزران. شەڕی گەمییەکان گەیشتە قۆناخی کادمییا،[٣] هەردوو لایەن تووشی خەسارێکی گەورە هاتن و لە ئاکامدا فۆکیسیەکان شکستیان خوارد. فۆکیسیەکان چل گەمییان لەدەستدا و تەنیا بیست دانەیان بۆ مایەوە کە ئەوانیش تەقریبەن لە کەڵک کەوتبوون، چونکە کاریتەکانیان خوار ببوون. بەهەرحاڵ گەڕانەوە دەڤەری ئالالییا. لەوێ ژن و منداڵیان هەڵگرت و چی کەرستەی لەنێو گەمییەکاندا جێیبۆوە، باریانکرد و لە ناوچەی کیرنۆس ڕۆیشتن و چوونە هەرێمی ریغیۆن.[٤]

[١٦٧] کارخیدۆنی و تیرینییەکان تەواوی خەدەمە و شەڕکەرانی گەمییەکانی قومبووی نێو ئاوەکانیان کۆکردەوە و لەنێوان خۆیان و ئاییلییەکاندا[٥] بەشیان کردن و گشت یەخسیرەکانیان بەردەبارانکرد و کوشتیانن. هەڵبەت ئاییلییەکان دوای ئەو کارەیان تووشی بەسەرهاتێکی ناخۆش هاتن. لەو شوێنەی کە دیلەکانی

---

١- مەبەست لە هۆزەکانی ئەترووسکییە.

٢- کارخیدۆنی (کارتاژی) لەو سەردەمەدا کۆمەڵێک نێوەندی بازرگانییان لە کورسی و ساردینیا هەبوو.

٣- کادمییا لێرەدا بەو مانایەیە کە هاوپەیمانان سەرەڕای ئەوەی کە فۆکیسیەکانیان شکستدا ، بەلام وەزعیان لەوان باشتر نەبوو. وەک شەڕی نێوان دوو برا لە خانەدانی کادمۆس، ئێتێئۆکلیس و پۆلینیکیس کەوتنە گیانی هەڤدوو و کوژران و دەرنەکەوت کامیان براوەی شەڕەکەن.

٤- ناوچەیەک کە ئەمڕۆ پێیدەگووترێ ڕێگگیۆ و لە ئەیالەتی کالابرای ئیتالیا هەڵکەوتووە.

٥- دانیشتووانی شاری ئاییلا، ئەو بازێڕەی دواتر ناوی گۆڕا و بوو بە کائیرا و یەکێک لە پێتەختەکانی هۆزی ئەترووسکییە.

فۆکیسی‌یان بەردەباران کردبوو، هەرکەس لە هۆزی ئایلی یا مەڕ و ماڵاتیان بەوێدا ڕابردبا، یا وندەبوو یا تووشی کەم ئەندامی و دواکەوتوویی دەهات. لەکۆتاییدا ئایلی‌یەکان ناچار بوون کە راسپاردە بنێرنە نێوەندی ئایینی دێلفوس بۆوەی لەدەست ئەو سزا قورسە رزگاریان بێ. کاهێنی مەزن واتە پیتیا داوای لێکردن کە چۆن تا ئێستا هەڵسوکەوتیان کردوە، بە هەمان شێوە بەردەوام بن. لەو کاتەوە ئیتر ئایلی‌یەکان درێژەیان بە جێژن و مەراسیمی ڕێزلێنان بۆ مردوەکانی فۆکیسی دا و خەلات و قوربانیان پێشکەش‌کرد و کێبەرکێی وەرزیشی و سوارکارییان لەسەر ناوی ئەو کوژراوانە پێکهێنا.

دەکرێ بڵێم کە ئەوە چارەنووسی فۆکیسی‌یەکان بوو. ئەوانی‌تر چوونە دەڤەری ریغیۆن و لەوێوە بەرەو ناوچەی ئینۆتریا[1] رۆیشتن بۆوەی لەو شوێنە شارێک بنیات‌بنێن. ناوی ئەو شارە نوێیە ییلی[2] بوو. فۆکیس‌یەکان دوای دروستکردنی ئەو شارە، لەلایەن کابرایەکی خەڵکی پۆسی‌دۆنیا[3] ئاگادارکرانەوە کە دروست کردنی پەرستگە لە دورگەی کیرنۆس[4]، خواستی خواوەند پیتیا نەبووە، بەڵکوو ئەو ویستوویەتی خەڵک پەرستگەیەک پێشکەش بە کیرنۆسی قارەمان بکەن و هەروەها شارێکی کۆچبەرنشین لەو دورگەیە بنیات‌بنێن.

بەهەرحاڵ زانیارییەکانی بەردەست سەبارەت بە فۆکیس‌یەکانی وڵاتی یوونی ئەوانە بوون کە باسم لێوەکردن.

[١٦٨] تییۆسی‌یەکان، ئەوانیش کەم‌وزۆر هەر بەو چەشنە جوڵانەوە. دوای ئەوەی ئارپاغۆس بە یارمەتی تەپۆڵکە گڵییەکان توانی وەسەر دیواری قاییمەی شارەکەیان بکەوێ، خەڵکەکە تێکرا لەنێو گەمی‌یەکاندا دانیشتن و

---

١- ئینۆتریا، لە بەشی باشووری ئیتالیا و دوو شاری گرینگ وەک بروتیۆم و لوکانی ئەمڕۆ لەخۆوە دەگرێ.

٢- ییلی، شارێک کە ئەمڕۆ بەناوی وێلیا لە دەڤەری لوکانی ئیتالیا هەڵکەوتووە.

٣- ئەمڕۆ ناسراوە بە پێستۆم لە دەڤەری لوکانی ئیتالیا.

٤- کیرنۆس، نێوی دورگەی کورسی ئەمڕۆ بووە. یەکێک لە نیوەخواکانی باستان، کوڕی ئیراکلیس ئەویش بەو ناوە ناسرابوو.

بەرەو رۆخەکانی ناوچەی تراکی رۆیشتن و لەوێ شارێکیان داگیرکرد کە پێیدەگووترا ئاڤدیرا[1]. ئەو شارە بەدەست کلازۆمێنیۆس[2] تیمیسیۆس دروست کرابوو. ناوبراو خۆی نەیتوانی لەوێ بمێنێتەوە، لەبەر ئەوەی تراکی‌یەکان دەریان کرد. دانیشتووانی تییۆسی نیشتەجێ لە شاری ئاڤدیرا، ڕێز و حورمەتی زۆریان بۆ کلازۆمێنیۆس هەیە و وەک قارەمان و نیوەخوایەکی خۆیان سەیری دەکەن.

[١٦٩] تییۆس‌یەکان تەنیا ڕەگەزی یوونی بوون کە تووشی ئاوارەیی هاتن، لەبەر ئەوەی رازی نەبوون وەک کۆیلە بژین. یوونی‌یەکانی‌تر بەڵام، جیا لە میلیتۆسی‌یەکان، وەک ئەوانەی لە وڵاتی خۆیان رۆیشتبوون لەبەرامبەر ئارپاغۆس‌دا راوەستان و شەڕیان‌کرد و پیاوەتی و جوامێریان نواند و بەهەر وەسیلەیەک بۆیان گونجا بەرگریان لە نیشتمانەکەیان کرد. دیارە لە ئەنجامدا شکستیان خوارد و شارەکانیان بەدەست پارسەکانەوە داگیرکرا و ناچاربوون گوێڕایەڵی و ئیتاعەتی خۆیان رابگەیێنن.

هەروەک لەسەرەوە باسم‌کرد، میلیتۆسی‌یەکان لەگەڵ خواستەکانی کوروش ڕێک کەوتن و هێمنی و ئاسایشی خۆیان پاراست. هەڵبەت وڵاتی یوونی بۆ جاری دووهەم تووشی کۆیلەداری بۆوە. وەختێک ئارپاغۆس هێرشی کردە سەر یوونی‌یەکانی جێگیر لە ناوچەکانی قەراخ ئاوی ئاسیا، یوونی‌یەکانی نیشتەجێ لە دورگەکان مەترسیان ڕێنیشت و خۆیان تەسلیمی کوروش کرد.

[١٧٠] سەرەڕای ژیانێکی هێمنانە، یوونی‌یەکان بەردەوام هاتووچۆی (پانیۆنیۆ)یان[3] کردوە و لەوێ کۆبوونەتەوە. بەپێی ئەو زانیارییانەی دەستم

---

١- یەکێک لە بەندەرەکانی ناوچەی تراس لە کەنارئاوەکانی دەریای ئێژە و لە قەراخ روباری نێستوس.

٢- شارێکی باستانی ئاسیای بچووک لە هەرێمی یوونی بووە و ئەمڕۆ ناسراوە بە ڤورلا.

٣- نێوی پارلەمانی یەکگرتووی دوازدە شاری هەرێمی یوونی لە سەردەمی باستاندا و هەڵکەوتوو لە داوێنی چیای میکالی لە بەرامبەر دورگەی سامۆس.

کەوتوون، ڤییاس[1] (ڤییاندا) خەڵکی پریئینی[2] سەردەمی خۆی ئامۆژگارییەکی زۆر بەجێی یوونییەکانی کردبوو کە ئەگەر خەڵکەکە بەقسەیان کردبا، سەربەستترین جەماوەری یۆنانی دەبوون. ناوبراو پێیگوتبوون کە هەرهەموویان پێکەوە ناوگانێکی دەریایی پێکبێنن و بەسواری پاپۆڕەکانیان بەرەو ناوچەی ساردۆ بڕۆن و لەوێ شارێکی گەورە واتە یەک پانیۆنێۆ بۆ گشت یوونییەکان بنیات بنێن. بەو شێوەیە ئەوان دەیانتوانی لەدەست کۆیلەبوون رزگارییان بێت و بەختەوەرانە بژین. ئەوان بەو شێوەیە دەیانتوانی گەورەترین دورگە بۆ نیشتەجێ بوونی خۆیان تەرخان بکەن و گشت دورگەکانی بچووکی دەوروبەر بێننە ژێر دەسەڵاتی خۆیان و حوکمڕانیان بەسەردا بکەن. ڤییاس هەروەها پێیگوتبوون ئەگەر لە وڵاتی یوونیا بمێننەوە، وێناچی لە داهاتوودا خاوەنی ژیانێکی ئازادتر بن.

ئەوە فکر و بۆچوونی ڤییاندا پریئینی دوای وێرانی وڵاتی یوونی بوو. هەڵبەت بەر لەوەی کە یوونییەکان تووشی ژیانی کۆیلەتی بێن، تالیس[3] میلیتۆسی کە بە رەگەز فینیقییایی بووە، ئەویش پێیگوتبوون کە مەجلیس و شۆرای هاوبەش و یەکگرتوو پێکبێنن و نێوەندی ئەو دەسەڵاتە لە شاری تیئۆ دامەزرێنن (ناوچەی تیئۆس لە نێوەڕاستی وڵاتی یوونی جێیگرتووە) و

---

١- ڤییاس یەکێک لە حەوت زاناکانی ئەفسانەیی یۆنانی باستان کە لە ساڵی ٥٧٠ی پێش زایین لە شاری پریئینی لەدایک ببوو و دواتر بوو بە گەورەترین وەکیل لە یۆنان. ئەوجۆرەی باسدەکرێ، ناوبراو ئامۆژگاری یوونییەکانی کردوە کە وڵاتی خۆیان جێبهێڵن بەڵام کۆیلەتی پارسەکان قبوڵ نەکەن.

٢- پریئینی یەک لە دوازدە شارەکانی هاوپەیمانی یوونی، هەڵکەوتوو لە کەنارئاوەکانی ئاسیای بچووک و لە نیزیک چیای میکالی و لە باکووری رۆژئاوای روباری میئاندرۆس.

٣- تالیس خەڵکی میلیتۆس و فەیلەسوفی یۆنانی بووە و لە سەدەی شەشەمی پێشزاییندا ژیاوە و وەک دامەزرێنەری مەکتەبی ناسراوی یوونی ناویدەرکردوە. ناوبراو یەکێک لە گەورەترین ئەستێرەناسان و ماتماتیک زانانی سەردەمی باستان بووە و دۆزینەوەی گەلێک بابەتی ئەستێرەناسی و ماتماتیکی دەگەڕێتەوە بۆ هەوڵ و تێکۆشانی ئەو. پلوتارخیس لە کتێبی " نییەت خەراپی هێرۆدۆت"دا دەڵی کە هێرۆدۆت خەریک بووە وڵاتی یۆنان لە فەیلەسوفێکی خۆی بێبەش بکا.

شارەکانیتر لەژێر بڕیاری ئەودا بن و بەو شێوەیە پێشگیری لە پەرش و بڵاوی یوونییەکان بکەن و شارەکانیتر دەیانتوانی وەک پارێزگا و ئوستان بمێننەوە.

[١٧١] ئەوانەی باسم لێوەکردن، نەخشە و پلانی پێشنیاریی ڤیاس و تالیس بوون. ئارپاغۆس پاش ئەوەی وڵاتی یوونی داگیرکرد، ئەوجار پەلاماری دانیشتووانی کاری[1] و کانیۆسی و لیکیدا[2] و بۆ ئەو کارەش یارمەتی لە یوونییەکان و ئیئۆلییەکان وەرگرت.

لەو گەلانەی ناویان هات، کارییەکان لە دورگەکانەوە هاتنە دەشتاییەکانی ئاسیا. ئەوانە لە سەردەمی دێرین (باستان)دا، لەژێر دەسەڵاتی پاشایەتی مینۆسدا بوون و پێیاندەگوترا لێغی. دانیشتووی دورگەکان بوون و منیش هێندێک زانیاریم لەسەر دابونەریتی کۆنی ئەوانە دەست کەوتووە. لێغییەکان هیچماڵیاتێکیان نەداوە، بەڵام هەرکاتێک مینۆس[3] پاشا پێویستی بە دابینکردنی هێزی مرۆیی بۆ کەشتیگەلی جەنگی بوایە، خێرا ئامادەیی خۆیان ڕاگەیاندوە. مینۆس بەو چەشنە توانیویەتی خاکێکی زۆر داگیربکات و لە شەڕەکاندا بەردەوام سەرکەوێ. کارییەکانیش بەوپێیە توانیان بۆ ساڵانێکی زۆر لەنێو گەلانیتردا ناوبانگ دەرکەن.

سێ بابەت دۆزراوەی کارییەکانە و بەلای یۆنانییەکانەوە گرینگ بوونە و کەڵکیان لێوەرگرتووە. کارییەکان یەکەم هۆز بوون کە کڵاوی جەنگی بە گوڵینگی پەڕیان لەسەر خۆیان نا و خەڵکیتریان فێرکرد. ئەوان هەروەها نەخش و نیگاری خۆیان لەسەر قەڵغانەکانیان کێشاوەتەوە و دەسکەی چەرمیان بۆ ڕاگرتنی مەتاڵ لە دیوی نێوەوە بەستووە. خەڵکانیتر عادەتیان

---

١- هەرێمی کاری لە بەشی باشووری رۆژئاوای ئاسیای بچووک، لە باکوور هاوسنوورە لەگەڵ وڵاتی لیدی. لە رۆژئاوا دراوسێی فریژی و لیکی و لە باشوور و رۆژئاوا دەگاتە دەریای ئێژە.

٢- لیکی نێوی یەکێک لە هەرێمەکانی ئاسیای بچووکە و لە بەشی باشووری رۆژئاوای ئەو وڵاتە لە کەنارەکانی دەریای مەدیترانە و دەریای ئێژە و لە دراوسێیەتی هەرێمی کاری هەڵکەوتوو. روباری کسانتۆس ئەو وڵاتە پاراو دەکا.

٣- پاشای ئەفسانەیی هۆزەکانی کاری و کوڕی خواوەند دیا و ئیلاهە ئێفرۆپیئا، ساڵی ١٣٠٠ ی بەر لە زایین فەرمانڕەوایی کارییەکانی کردوە.

بوو کە مەتاڵەکانیان بەبێ دەسگرە هەڵگرن. تەنیا قایشێکی چەرمیان لێدەبەست و بە ملیانەوە هەڵیانداوەسی و دەکەوتە سەر شانی چەپ. ساڵانێکی زۆر دواتر، دووری‌یەکان و یوونی‌یەکان پێکەوە شەڕیان دژی کاری‌یەکان کرد و لە دورگەکانیان دەرکردن. لەو کاتەوە، کاری‌یەکان ناچاربوون لە دەشتاییەکانی ئاسیا و دوور لە ئاوەکان بژین. کریتی‌یەکان بەو شێوەیە باسی بەسەرهات و مێژووی کاری‌یەکان دەکەن.

کاری‌یەکان خۆیان لەگەڵ بۆچوونی کریتی‌یەکان ڕێکنین و لەسەر ئەو باوەڕەن کە هەر لە سەرەتاوە سادە و خۆجێیی(بوومی) بوونە و لە دەشتاییەکانی ئاسیا ژیاون و ناوەکەشیان تا ئێستا پاراستووە. لە ناوچەی میلاسا[1] شوێنەواری دێرێکی کۆنی خوای کاری‌یەکان بەناوی دییۆس دۆزراوەتەوە. کاتی خۆی میسی‌یەکان[2] و لیدی‌یەکان وەک گەلانی خزمی کاری‌یەکان هاتوچۆی ئەو نێوەندە ئایینی‌یەیان کردوە. ڕەوایەتەکان باس لەوە دەکەن کە لیدۆس و میسۆس، برایانی کارۆس بوونە، بۆیەش ڕێگا بە لیدی‌یەکان و میسی‌یەکان دەدرێ بچنە نێو ئەو پەرستگەیە. هەڵبەت بە پێچەوانەوە، ئەو گەلانەی هاورەگەزی کاری‌یەکان نین، بۆیان نییە رووی تێبکەن، هەرچەند خاوەن زمانی هابەشیش بن.

**[١٧٢]** سەبارەت بە کاڤنی‌یەکان، من لەو باوەڕەدام کە لە بنەرەتدا خەڵکێکی خۆجێیین (بوومی)، هەرچەند خۆیان دەڵێن بەڕەگەز کریتی‌ین. لەمەر زمانەکەیان، ئەوانە زمانی کاری‌یەکانیان وەرگرتووە، یا رەنگە بەپێچەوانەوە کاری‌یەکان زمانی ئەوانیان وەرگرتبێ. لەهەرحاڵدا من بەدڵنیاییەوە ناتوانم هیچ بۆچوونێک لەوبارەوە دەرببڕم.

---

١- میلاسا، شارێک لە ناوچەی کاری لە سەردەمی باستاندا، ١٦ کیلۆمیتر لە قەراخ ئاوەکانی دەریای مەدیترانە دوورە و ئەمڕۆ ناسراوە بە مێلاسۆ.

٢- میسیا، وڵاتی میسی‌یەکان لە ئاسیای بچووک و لە رۆژهەڵاتی تەنگەبەراییەک کە چیای ناسراوی ئۆلیمپیک پێکی‌دێنی، هەڵکەوتووە. لە شارە ناسراوەکانی ئەو هەرێمە، لامپساکۆ و ترۆئا و پێرغامۆس دەکرێ نێو بێنین و ئەو شارانە لە شەڕی ناسراوی ترۆئادا نەخشی بەرچاویان بووە.

کاڤنی‌یەکان خاوەن هێندێک دابونەریتی جیاواز لە خەڵکانی‌تر و بەتایبەت کاری‌یەکانن. ژن و پیاو و منالّیان بەدەوری یەکترەوە کۆدەبنەوە و قسە دەکەن و شەڕاب دەخۆنەوە و بەلایانەوە دیاردەیەکی جوان و ئاساییە. سەردەمێک، هەر پەرستگەیەکیان دروست کردبا، خێرا پێشکەش بە خواکانی بێگانەیان دەکرد، بەڵام دواتر نەزەریان گۆڕا و بڕیاریان‌دا تەنیا خواکانی خۆیان بپەرستن. ئەو راست بەدوای گۆڕینی ئەو باوەڕەیان بوو کە پیاوەکانیان تێکرا چەکیان هەڵگرت و گۆپاڵیان هەڵسوڕاند و تا سنوورەکانی وڵاتی کالیندا[1] چوون، بەو حیسابەی کە خواکانی بێگانە لە هەرێمی خۆیان دەردەکەن.

[۱۷۳] ئەوە باسێک سەبارەت بە دابونەریتی کاڤنی‌یەکان بوو. لیکی‌یەکان، ئەوانە لەڕاستی‌دا کریتی‌ین (سەردەمی دێرین (باستان)، تەواوی دانیشتووانی دورگەی کریت بەربەربوون). کاتێک سارپیدۆن[2] و مینوس، کوڕانی ئەورووپی (ئێڤرۆپی)[3] لەسەر کورسی دەسەلات بەشەڕهاتن و مینوس سەرکەوت، سارپیدۆن و لاینگرانی لە دورگەی کریت دەرکرد. ئەو دەرکراوانە بەرەو ئاسیا چوون و گەیشتنە ناوچەی میلی‌ئادا[4]، واتە ئەو هەرێمەی ئەمڕۆ لیکی‌یەکان لێی دەژین. زەمانی زوو بەو ناوچەیە دەگوترا میلی‌ئاس و خەڵکی میلی‌ئا بەناوی سۆلیمی ناسراوبوون. سەرەڕای ئەوەی کە سارپیدۆن پاشایەتی دەکردن، بەوحاڵەش ناوی دێرین (باستان)ی خۆیان پاراستبوو. هەڵبەت گەلانی دراوسێ هەرکات باسی لیکی‌یەکان بکەن، هەر بە ناوە دێرینەکەیانەوە دەیانناسن و پێیان دەڵێن: تێرمیلی. بەڵام کاتێک لیکۆس کوڕی

---

۱- یەکێک لە شارەکانی هەرێمی کاری و سنوورەکانی دەگاتە هەرێمی لیکی.

۲- سارپیدۆن کوڕی زۆپیتێر و ئێڤرۆپێ لەسەر فەرمانڕەوایی وڵاتی لیدی، لەگەڵ برای خۆیان مینۆس شەڕیان کرد و شکستیان خوارد.

۳- ئێڤرۆپی کچی ئاینێنۆر بە روخساری گامێش وەدیارکەوت و خواوەند زۆپیتێر (دیا) رفاندی و بردییە وڵاتێک کە دواتر نێوی نرا ئەورووپا. ئێڤرۆپی وەک دایکی مینۆس دەناسرا.

٤- میلی‌ئاد (میلیاد) یەکێک لە هەرێمەکانی باستانیی ئاسیای بچووک هەڵکەوتوو لەنێوان ناوچەکانی لیکی و پامفیلی و فریژی.

پاندیۆنۆس[1] بەدەست براکەی بەناوی لیغیئاس لە شاری ئاتێن دەرکرا، پەنای بۆ تێرمیلییەکان برد و هاتە لای سارپیدۆن و ئیتر وردەوردە ناوی لیکۆس بەسەر هۆزەکەدا بڕا و بوون بە لیکی. لە هێندێک نەریتدا شێوەی کریتییەکانن و لە کۆمەڵێکیشدا وەک کارییەکان دەچن. یەکێک لە نەریتە جیاوازەکەیان ئەوەیە کە ناوەکانیان لە دایکەوە وەردەگرن نەک لە باوکیانەوە، واتە بە بەرەی دایکەوە ناسراون. ئەگەر ڕێبوارێک سۆراغی یەکێک لەوانە بگرێ، خێرا ناوی تایفەی دایکی ئەو کەسە دێتەگۆڕێ. ئەگەر ژنێکی ئازاد و بێمێرد پیاوێکی کۆیلە هەڵبژێرێ، منداڵەکانی ئەو جووتە وەک مرۆڤی ئازاد سەیردەکرێن، نەک کۆیلە. ئەگەر پیاوێکی ڕەبەن، تەنانەت ئاغاوەت و سەرۆک هۆزیش بێ، ژنێکی بێگانە یا مەعشوقەیەک هەڵبژێرێ، منداڵەکانی ئەو کابرایە خاوەن هیچ چەشنە ماف و حورمەتێک نیین.

[١٧٤] کارییەکان پەلاماری لەشکری ئارپاغۆسیاندا، بەبێ ئەوەی دەستکەوتێکی ئەوتۆیان هەبێ. نە کارییەکان و نە یۆنانییەکان کە لەو ناوچەیە دەژین، خاوەن کار و بەرهەمێکی ئەوتۆ سرنجڕاکێش نین. کۆمەڵێک هۆزیتریش لەو دەڤەرە دەژین، بۆوینە کیندییەکانی ژێردەسەڵاتی لاکیدێمۆنییەکان. وڵاتی کیندییەکان پێیدەگوترێ تریۆپیۆ، ڕاکشاوەتە نێو بەحر و لە نیمچە دورگەی ڤیڤاسۆس[2]ڕا دەستپێدەکا. سەرتاسەری هەرێمی کیندۆس[3] جیا لە بەشێکی کەم نەبێ بەهۆی دەریاوە گەمارۆدراوە. لە باکوور کەنداوی کێرامیکۆ[4]، لە باشوور

---

١- پاندیۆنۆس، پاشای باستانیی شاری ئاتێن لە سەدەی سێزدەی پێش زایین بەهۆی کەسێکی سەر بە هۆزەکەی لەو بازێرە دەرکرا و دوای ماوەیەک سەرگەردانی دووبارە فەرمانڕەوایی وەرگرتەوە.

٢- ڤیڤاسۆس، شارێکی هەرێمی کارییەکان لەبەر هەڵکەوتەی جۆغرافی تایبەت چەشنی نیمچە دورگەی لێهاتبوو. وڵاتی کیندی لەلای ڕۆژئاوای ئەو نیمچە دورگەیەیە.

٣- کنیدۆس، شارێکی دەڤەری کاری لە ئاسیای بچووک و لە لوتکەی ئاخری نیمچە دورگە و لە داوێنی بەرزایی تریۆپیۆم هەڵکەوتووە. کتێسیاسی مێژووناسی یۆنانی باستان لەو شارە لەدایکبووە و مەعبەدی ئیلاهە ڤێنوس لەوێیە.

٤- کەنداوی کێرامیکۆ ئەمڕۆ ناسراوە بە ستانکۆ و لە قەراخ ئاوەکانی وڵاتی کاری و دەریای ئێژە هەڵکەوتووە.

ئاوەکانی دورگەی سیمی[1] و رۆدۆس دەوریان داوە. لەو کاتەدا کە هێرشی ئارپاغۆس بەمەبەستی داگیرکردن و کۆیلەکردنی هۆزەکانی یوونی دەستیپێکرد، خەڵکی کیندوس خەندەکێکیان بە مەودای پێنج ستادیۆ[2] لەو بەشە بچووکە ویشکاییە هەڵکەند. ئەوان بۆیە ئەو کارەیان کرد کە خاکی وڵاتەکەیان وەک دورگەی لێبێ. پانتایی هەرێمی کیندۆس راست لەو شوێنە کۆتایی پێدەهات کە کاناڵیان لێهەڵکەند و لەوێوە بە دەشتایی بەسترابۆوە. هێزێکی زۆری کرێکارییان تەرخانکرد. لەبەر ئەوەی کرێکارەکان بەهۆی بەردی رەوەزەکان بریندار دەبوون و بەتایبەتی چاوەکانیان لەدەست دەدا، هاتنە سەر ئەو باوەڕە کە خواستی خواوەند لەپشت ئەو ئازارانەیە. خێرا راسپاردەیان ناردە نێوەندەکانی ئایینی دێلفوس بۆوەی بزانن بەربەستی سەر رێگای کارەکەیان چییە. وەک کیندۆسی‌یەکان خۆیان دەگێڕنەوە، خواوەند پیتیا بە شیعرێکی سێ بەیتی وڵامی داونەوە.

*"هەڵمەکەنن، کاناڵ مەکەنە مەتەرێز*
*ئەگەر خواوەند دیا گەرەکی بوایە، ئێوەش دەبوونە دورگە نشین."*

دوای ئەو ئامۆژگارییەی پیتیا، کیندۆسی‌یەکان دەستیان لەو کارە هەڵگرت. وەختێک ئارپاغۆس گەیشتە ناوچەکە، کیندۆسی‌یەکان بەبێ بەرگری کردن خۆیان تەسلیمی لەشکری ئارپاغۆس کرد.

**[١٧٥]** هۆزەکانی پیداسی لە سەرووی ناوچەکانی مەدیترانەیی ئالیکارناسۆس و لە نێوەندی وڵاتدا دەژین. ئەوانە خۆیان یا دراوسێکانیان هەرکات تووشی رووداوێکی ناخۆش هاتوون، کۆڵێک موو لەسەر روومەتی ژنە کاهێنی مەزنی پەرستگەی ئاتینا شینبووە. ئەو رووداوە سێ جار قەوماوە. پیداسی‌یەکان تەنیا خەڵکانێکی دانیشتووی ناوچەی کاریاس بوون

---

١- دورگەی سیمی لە چەند کیلۆمیتری دورگەی رۆدۆس سەر بە ئاسیای بچووک بەراورد کراوە.
٢- پێوانەی مەودا، بەرابەری ١٧٧ میتر و ٦ سانتی‌میتر بووە.

که له بەرامبەر هێرشی لەشکری ئارپاغۆس‌دا راوەستان و کۆمەڵێک گرفتیان بۆ خولقاند. پیداسی‌یەکان له چیایەک بەنێوی لیدی سەنگەریان گرتبوو.

[١٧٦] ئارپاغۆس له کۆتاییدا توانی ئەوانەش شکست بدا. کاتێک لەشکری ناوبراو له دەشتی کسانتۆس[١] پێشرەوی کرد، لیکی‌یەکان به مەبەستی شەڕ بەرەو روویان چوون. لەشکری لیکی‌یەکان به ژمارە کەم، خاوەن جوامێرییەکی بەوەج لەبەرامبەر هێزێکی گەورەدا راوەستان، هەرچەند لەکۆتاییدا تووشی شکان هاتن. لەبەر ئەو شکستە، خێرا خۆیان لەنێو شار ئاخنی. ژن و منداڵ و کۆیله و خەزێنەی زێڕ و جەواهیراتیان گواستەوە نێو قەڵا و هەرهەموویان ئاگر تێبەردان. پیاوە شەڕکەرەکانی کسانتی ئەوجار سوێندیان خوارد و بەڵێنیان به یەکتردا له حەسار وەدەرکەون. شەڕیان دەست پێکرد و بەپانەوە کوژران. ئەو خەڵکانەی ئێستا دەڵێن کسانتین، تەنیا هەشتا بنەماڵە نەبێ ئەوەی دیکە کۆچبەر و بیانین. ئەو هەشتا بنەماڵەیەش به هەڵکەوت لەو سەردەمی‌دا دوور له وڵاتی خۆیان بوونه و بۆیه رزگارییان هاتووە. ئارپاغۆس ناوچەی کسانتی داگیرکرد و هەر بەو چەشنەش دەستی بەسەر دەڤەری کاڤنۆس[٢]دا گرت. کاڤنی‌یەکان وەک لیکی‌یەکان له هەمبەر پەلاماری ئارپاغۆس‌دا بەرگریان لەخۆیان نیشان‌دا و تووشی هەمان چارەنووس هاتن.

[١٧٧] کاتێک ئارپاغۆس خەریکی وێرانکردنی ئاسیای خواروو بوو، کورووش، ئەویش ئاسیای سەرووی داگیرکرد و گشت نەتەوەکانی ئەو بەشەی کردە کۆیله و کەسی هەڵناوارد. من ناوی ئەو کۆمەڵە وڵات و گەلانە ناهێنم و تەنیا باسی ئەوانە دەکەم که گرفت و بەربەستی زۆریان بۆ کورووش پێکهێنا و بایەخی مێژوویيان هەیه و بۆیه دەبێ که پیاو خۆیان پێوە خەریک بکا.

---

١- کسانتۆس، هەم ناوی گەورەترین شاری وڵاتی لیکیا و هەم ناوی روبارێک بووە.

٢- ناوچەیەکی ئاسیای بچووک له روبەڕووی دورگەی رۆدۆس.

## مێژووی بابل

[١٧٨] کوروش کاتێک خاکی گشت وڵاتانی دوور لە دەریاکان، واتە ئاسیای بچووکی داگیرکرد، ئەوجار پەلاماری ئاسیریەکانی (ئاسوری یا ئاشوری)دا. بێشک گەلێک شاری گەورە لە وڵاتی ئاسیریا هەن، بەڵام شاری بابل لە هەموویان بەناوبانگتر و مەحکەمترە و بەدوای وێرانبوونی نەینەوا،[1] بووەتە پێتەختی پاشایەتی و منیش باسی ئەوێ دەکەم. شاری بابل لە دەشتێکی پان و بەرین هەڵکەوتووە و خاوەن قەوارەیەکی چوارگۆشەیە و مەودای هەر پەلێکی ئەو چوارخانەیە دەگاتە سەد و بیست ستادیۆ.[2] سەرجەمی درێژایی پەلەکانی دەوری شار چوارسەد و هەشتا ستادیۆیە. شارێکی گەورە و خاوەن پانتایی فرە، هەڵبەت سەبارەت بە شێوازی بیناسازی شارەکە دەبێ بڵێم کە جوانترین شوێنە کە تا ئێستا من دیتوومە. بەرلە هەر دیاردەیەک، خەندەکێکی بەرین و قووڵ شارەکەی دەورداوە و پڕ لە ئاوە. دوای ئەو خەندەکە پڕ ئاوە، دیوارێک[3] بە ئەستوورایی پەنجا و بەرزی دوو سەد پێخیسی[4] شاهی دروستکراوە. پێخیسی شاهی سێ قامک زیادتر لە پێخیسی گشتییە.

[١٧٩] بەپێویستی دەزانم باسی ئەوەش بکەم کە ئەو برە گڵەی خەندەکی دەوری شار لە کوێ کەڵکی لێوەرگیراوە و دیوارەکەشیان چۆن سازکردوە. وەختێک گڵەکەیان هەڵدەکەند، لەجێوە دەیانکردە خشت. پاش ئەژمارێکی فرەی خشت، ئەوسا گشتیان لە کورەدا دەبرژاند. لەجیاتی قوڕ، بە قیری تواوە دوای هەر سێ چین خشت، یەک ڕیز حەسیری قامیش دادەندرا.

---

١- بەر لە ڕووخانی شاری نەینەوا، بەماوەیەکی کەم، لە ساڵی ٦١٢ی پێش زایینیدا شاری بابیل لەدەست ئاشوورییەکان ڕزگاری هاتبوو. پاشای ئەو سەردەمەی بابیل هاوپەیمانی کیاکسار بوو.

٢- پێوانەی مەودا، بەرابەری ١٧٧ میتر و ٦ سانتیمیتر بووە.

٣- ئەوە دیوارە دەبێ هەمان دیواری نابوخودۆنۆسۆرا (بەختونەسر) بێ. دوو دیواری هاوسوو بوونە. دیواری یەکەم خۆی دوو توێ بووە و لەنێوان ئەو دیوارە و دیواری ژوورەوە حەسارێک هەبووی. بەرینایی حەسار و دیوارەکان سەرجەم گەیشتووەتە سی میتر.

٤- پێوانەی یۆنانی مەودا لە سەردەمی باستاندا، بەرابەری ٤٤٤ میلیمیتر.

سەرەتا دیواری خەندەک دروستکرا و پاشان خەریکی سازکردنی دیواری شاربوون. سەر ئەو دیوارە ڕێگا بوو و لە قەراخەکانی ئەو ڕێگایە، کۆمەڵێک هۆدەی بچووکی یەک بانەکی لە روبەرووی یەکتر دروستکرابوون و داڵانێکی تەنگ لە نێوانیاندا وەبەرچاو گیرابوو کە فایتوونێکی چوار ئەسپە بتوانێ پێیدا دەربازبێ. ئەو دیوارە خاوەن سەد دەروازەیە و گشتیان لە میس سازکراون و بە نەخش و نیگار و سەردەرانەی جوان رازاونەوە.

شارێکیتریش هەیە کە هەشت ڕۆژە ڕێگا لە بابل دوورە و پێیدەگوترێ ئیس[1]. چۆمێک بەو شارەدا دەرباز دەبێ و بە ناوی شاری ئیس کراوە. ئەو چۆمە دەڕژێتە رووباری فورات. ئاوی چۆم پڕە لە قیر و کاتی دروست کردنی دیواری بابل، لەو چۆمە کۆدەکرایەوە و بۆ ئەوێ دەبردرا.

[١٨٠] دیواری بابل دوو بەشە، چونکە بەهۆی رووباری فورات لەت دەبێ. ئەو رووبارە گەورە و قوڵ و ڕژدە و لە وڵاتی ئەرمەنستانەوە سەرچاوە دەگرێت و دەڕژێتە دەریای ئێریترە.[2] هەر سەرێکی دیواری شاری بابل لەگەڵ قەراخی چۆم گۆشەیەک پێکدێنێ. لەوێوە دوو دیواریتر هاوسوو و بەدرێژایی چۆمی نێو شار، بە خشتی کاڵ لە هەردوو بەری فورات دروستکراون. بینا و خانوەکانی شار سێچوار نهۆمین. شەقام و کۆڵانەکان هاوقەوارە و ڕاست و ئەستوونی (عەمودی) دەگەنەوە سەر چۆمی فورات. لەهەر شوێنێک کە کۆڵان و شەقامەکان گەیشتوونەتە سەر دیواری چۆم، دەروازەی بچووک داندراون و چوارچێوەیان بە ئەندازەی بەرینایی کۆڵانەکانە. ئەو دەروازانە لە مس دروست کراون و بەلای رووباردا دەکرێنەوە.

[١٨١] جیا لە دیواری ئەمنی شار کە باسم کرد، دیوارێکیتریش لە دیوی ژوورێدا دروستکراوە و بەرزییەکەی بەقەرا ئەوەی دەرەوەیە و وەک ئەو

---

١- یەکێک لە شارەکانی بابلی قەدیم کە لەسەر چۆمی فورات بنیات نرابوو و لەکۆنەوە نێوەندی دەرهێنانی قیر بووە.

٢- خەڵک لە سەردەمی باستاندا، ئەقیانووسی هیند و دەریاکانی سەر بەو ئەقیانووسەیان وەک دەریای ئێریترە ناوبردوە.

مەحکەمە، تەنیا تۆزێک بەرتەسکترە.[1] هەردوو بەشەکانی شار خاوەن دیواری خۆیانن و لەنێو یەکێکیاندا قەسری پاشایەتی بە دیواری مەحکەم و بەرز بنیاتنراوە و لە بەشەکەی‌تریش نێوەندی ئایینی دیۆس ڤیلۆس[2] جێی‌گرتووە و دەروازەکانی ئەو بارەگایە لە مس دروستکراون و ئەو شوێنە تا ئێستاش پارێزراوە. ئەو نێوەندە چوارگۆشەیە و هەر پەلێکی خاوەن دوو ستادیۆ[3] مەودایە. لە نێوەڕاستی نێوەندی ئایینی، بورجی موقەدەس هەڵکەوتووە. [4] بەرینایی و درێژایی بورجی گورین یەک ستادیۆ دەبێ. لەڕاستیدا هەشت بورج لەسەریەک دروستکراون و بۆوەی پیاو بتوانی بچێتەسەر، پلیکانی بازنەیی بەدەوری بیناکەدا سازکراوە. لەنێوەڕاستی ئەو گشتە پلیکانانەدا، پلەیەکی پانوپۆڕ هەیە و بۆ حەسانەوە تەرخانکراوە و کورسیلەی لێن و ڕێبواران لەوێ پشوویەک دەدەن. پەرستگەی گەورە لە بەرزترین بورجدا جێی‌گرتووە و قەرەوێڵەیەکی زلی ڕازاوەی تێدایە و لە تەنیشتییەوە مێزێکی زێڕ داندراوە. لەو هۆدەیەدا هیچ پەیکەرەیەکی خواکان وەبەرچاو ناکەوێ و کەسیش بۆی نییە لێی وەژوور کەوێ یا شەو لەوێ بخەوێ. تەنیا ژنێکی خەڵکی ئەو ناوچەیە هاتووچۆی ئەو وەتاغە دەکا، هەڵبەت پیاوانی ئایینی خالدی دەڵێن کە خواوەند لەنێو گشت ژنانی هەرێمدا ئەوەیانی هەڵبژاردوە و بۆی هەیە بچێتە ژوورەوە.

[١٨٢] ئەوە بۆچوونی خالدی‌یەکانە و من لەو باوەڕەدا نیم کە خواوەند بچێتە نێو هۆدەکە و لەسەر قەرەوێڵە ڕاکشێ و بحەسێتەوە. وەک

---

١- حەساری دووهەم، حەساری ئەسڵی شاری بابێل، چوارگۆشەیەکی ڕێک کە دوو لای ٢٥٥٠ میتر و دوو لایەکەی‌تر ١٥٠٠ میتر مەودایان بووە. چۆمی فورات بەلای باکووری ڕۆژئاوا و باشووریدا تێپەڕیوە. دیوارەکانی ئەو حەسارەش لە دوو دیوار و دالانێکی نێوانیان پێکهاتووە و سەرجەم ١٧ میتر و نیو بەرین بوونە.

٢- هەمان مەعبەدی بەعل مەردوکە و ناسراو بە ئیساژیل و یەکێک لە مەعبەدەکانی کۆنی بابێل بووە.

٣- ستادیۆ، پێوانەی مەودا، بەرابەری ١٧٧ میتر و ٦ سانتی‌میتر.

٤- هەمان بورجی ناسراوی بابێل بووە و بەناوی‌تریش وەک ئێتێمێناکی ناودێرکراوە.

میسریی‌یەکان باس‌دەکەن لە شاری تیڤای[1] وڵاتی میسریش ئەو دیاردەیە باوە. بۆچوونی میسریی‌یەکان و خالدیی‌یەکان لەو بارەوە وەک یەک دەچێ، چونکە لە میسریش ژنێک لە ژووری پەرستگەی تیڤاییکۆ دیۆس‌دا دەخەوێ. دیارە ئەو ژنانە، واتە هەم ئەوەی نێوەندی ئایینی دیۆس ڤیلۆس و هەم ئەوەی‌تر لە پەرستگەی دیۆس تیڤاییکۆس هیچ پێوەندییەکیان لەگەڵ پیاوان نییە. بابەتی لەو چەشنە، لە پەرستگەی پێشگۆیی ناوچەی پاتارای[2] هەرێمی لیکیا بەرچاودەکەوێ. ئەو پەرستگەیە خاوەن کاهێنی مەزنی هەمیشەیی نییە و تەنیا بە رۆژ خەریکی کاروباری پێشگۆیی و ئامۆژگاری دەبێ. خەڵکەکە شەوانە ئەو ژنە لەگەڵ خواوەند لەنێو پەرستگەکەدا زیندانی دەکەن.[3]

[١٨٣] لە خوارووی نێوەندی ئایینی شاری بابل، پەرستگەیەکی‌تر هەیە. لەو جێگایەی پەیکەرەی زێڕینی دیۆس[4] دامەزراوە، لە تەنیشت ئەو پەیکەرەیە، مێزێکی زێڕین داندراوە. هەڵبەت جیا لەو مێزە، پایەی پەیکەرەکە و کورسیلەی تەنیشت مێزەکەش هەر لە زێڕ دروست کراون.

خالدیی‌یەکان دەڵێن بەهای ئەو زێڕانە هەشت سەد تالاند[5] دەبێ. لە دەرەوەی پەرستگە سەکۆیەکی‌تر (قوربانگە) هەیە کە ئەویش لە زێڕ دروست کراوە. دیارە یەک سکۆی گەورەی‌تریش بەرچاودەکەوێ کە بۆ قوربانی کردنی ئاژەڵ و ماڵاتی گەورەیە. ئەوەش لەبەر ئەوەیە کە کەس بۆی نییە لەسەر سەکۆ زێڕینەکە قوربانی‌تر بکا و تەنیا بۆ ئاژەڵی شیرەخۆرە وەبەرچاو گیراوە.

---

١- تیڤا، ناوی یەکێک لە پێتەختەکانی وڵاتی میسری باستان وپەرستگەی ناسراوی ئامۆن لەوێ بووە.

٢- یەکێک لە شارەکانی هەرێمی لیکیا لە ئاسیای بچووک و لە باشووری چۆمی کسانتۆس و شوێنی نیشتەجێیی کاهێنێکی مەزن بووە. ئەو شارە ئەمڕۆ بەناوی پاترا ناسراوە و لە یۆنانە.

٣- بە باوەڕی یۆنانییەکانی سەردەمی باستان، خواوەند ئاپۆلۆن بەشێک لە ساڵدا لە نێوەندی ئایینی پاترا دەژی و بەشی‌تریش لە دێلفووس.

٤ – مەبەست پەیکەرەی خوای بابێلی‌یەکان واتە مەردوکە.

٥- تالاندی یۆنانی ٢٦ کیلۆگرەم، میسری ٢٧ کیلۆگرەم، بابێلی ٣٠.٣ کیلۆگرەم و رۆمی ٣٢.٣٠ کیلۆگرەم بووە.

خالدی‌یەکان گشت ساڵێک، راست لەو رۆژەدا کە بۆ رێزگرتن لە خواوەند جێژن دەگرن، لەسەر سەکۆ گەورەکە بەهای هەزار تالاند عود دەسوتێنن. ئەو سەردەمە پەیکەرەیەکی پتەوی دروستکراو لە زێڕی خالیس و بە بەرزی دوازدە پیخیس[1] لەنێو پەرەستگەکەدا هەبوو. من خۆم ئەو پەیکەرەیەم نەدیتوە، بەڵکوو لە خالدی‌یەکانم بیست. داریوش کوڕە گەورەی گشتاسپ گەرەکی بووە ئەو پەیکەرە پتەوە زێڕینە لەگەڵ خۆی بەرێ، بەڵام نەیوێراوە.
کسێرکیس (خەشایار) کوڕی داریوش بەپێچەوانەی باوکی، پەیکەرەکەی برد. کسێرکیس ژنەی کاهێنی پەرستگەکە دەکوژێ چونکە نەیهێشتبوو ناوبراو دەست لە پەیکەرەکە بدا. بەهەرحاڵ ئەو کەرستانە بوون کە پەرستگەکەیان رازاندبۆوە. هەڵبەت کۆمەڵێک دیاری پێشکەشکراوی‌تریش بەرچاو دەکەون کە خەڵک بەو ئارامگەیەی بەخشیوە.
[١٨٤] شاری بابل گەلێک پاشای بەخۆوە بینی، سەبارەت بەوان لە بەشی مێژووی ئاسووری‌یەکاندا دەدوێم.[2] ئەو پاشایانە دیواری حەساری شار و پەرستگەکانیان بە کەرستەی جۆراوجۆر رازاندەوە. لەنێو ئەو پاشایانەدا دوو خاتوون هەڵکەوتن و سرنجڕاکیشن. یەکەمیان پێنج وەچە[3] پێشتر لەوەی دووهەمی فەرمانڕەوایی کرد و پێیدەگوترا سەمیرامیس.[4] ئەو خاتووشایە کۆمەڵێک بەنداوی (سەد) لە دەشتی بابل دروست کرد کە بەڕاستی بۆ دیتن دەبن. بەر لە سازکردنی ئەو بەنداوانە، لافاوی چۆم تەواوی دەشتی بابلی دادەگرت.
[١٨٥] خاتوو شای دووهەم ناوی نیتۆکریس بوو و لەوەی بەر لە خۆی پتر خزمەتی وڵاتی کرد. ئەو دەیدیت کە دەسەڵاتی میدییەکان بەرەو زۆر

---

١- پیخیس، پێوانەی درێژایی و بەرابەری ٤٤٤ میلی‌میتر.
٢- بەرهەمێکی نەناسراو کە نەگەیشتە سەردەمی ئێمە یا رەنگە هێرۆدۆت لەبیری چووبێ باسی لێوەبکا.
٣- هێرۆدۆت لە کتێبی ئێفتێرپی‌دا، هەر سەدەیەک بۆ سێ وەچە دادەنێ، کەوابوو هەر نەسڵێک دەبێ ٣٣ساڵ ژیابێ.
٤- سەمیرامیس، دەبێ هەمان سامووراماتی شازادەی بابێلی و دایکی پاشای ئاشوور واتە ئەدادنیراری سێهەم لە نێوان ساڵەکانی ٧٦٢ تا ٨١٠ی پێش‌زایین.

بوون دەچێ و بەردەوام هێرش دەکەن و کۆمەڵە شارێکی فرەیان داگیرکردوە و شاری نەینەواش لەو نێوەدا کەوتۆتە دەست ئەوان، بۆیە هەوڵیدا هێمنی و ئاسایش بۆ شاری بابل دابینبکات. نیتۆکریس سەرەتا بواری ئاوی چۆمی فوراتی گۆڕی کە پێشتر بەنێو شاردا تێدەپەڕی. چەند کاناڵێکی دروست کرد و ئاوی چۆمی ناچارکرد شێوەی خوارەپێچە و لوول بەخۆوە بگرێ بۆوەی سێ جار بە گوندێکدا دەربازبێ. ئەو گووندە پێیدەگوترێ ئاردێریکا. ئەگەر کەسێک لە دەریای لای ئێمەڕا بیهەوێ[1] بچێتە شاری بابل و ناچاربێ بە گەمی و بەسەر ئاوی رووباری فوراتدا بڕوا، لە ماوەی سێ رۆژدا سێ جار بەو گووندەدا تێدەپەڕێ. ئەوە کاری نیتۆکریس بوو.

نیتۆکریس هەروەها کۆمەڵێک تەپۆلکەی سرنجڕاکێشی لە هەردوو قەراخەکانی چۆمی فورات دروست کرد. ئەو گردانە ئێجگار بەرز و گەورە بوون. دواتر، تەواوێک دوور لە شاری بابل، گۆلاوێکی دەسکردی سازکرد کە لە تەنیشت چۆم هەڵکەوتبوو. ئەو گۆلە ئەوەندە قوڵ هەڵکەندرا کە تەختی بنی گەیشتە ئاوەکانی ژێرعەرد. مەودای بازنەیی دەوری ئەو گۆلە چوارسەد و بیست ستادیۆ دەبێ. ئەو گڵەی هەڵیانکەند، دواتر بۆ دروست کردنی تەپۆلکەکانی قەراخ چۆم کەڵکی لێوەرگیرا. کاتێک کاری هەڵکەندنی گۆلاو کۆتایی پێهات، نیتۆکریس دەستووریدا دیواری دەوری گۆلەکە بە بەرد دامەزرێنن و بناغەی دیواری گۆل تەواو مەحکەم سازبکرێ.

مەبەستی خاتووشا لەو گشتە گۆڕانکارییە، وەک لوولکردنی چۆم و بەنداو و دروستکردنی گۆلی دەسکرد لە قۆپییەکانی قەراخ رووبار، هەموویان بۆیەبوون چونکە هەست بە مەترسی هاتنی کومەڵێک نەیار دەکرا. بەتایبەت خوارەپێچ کردنی چۆم و دابەشکرانی لەبەر ئەوە بوو کە کەس نەتوانێ بەسواری گەمی خێرا بێتە نێو شاری بابل. ئەگەر یەکێک ویستبای لە رێگای چۆمەوە داخڵ بێ، دەبوایە دەورێکی تەواوی گۆلەکە بدا، دیارە ئەویش بەنۆرەی خۆی ئێجگار گەورە بوو.

---

١- هێرۆدۆت دەریای مەدیترانەی بە ناوەکانی دەریای ئێمە، دەریای دایک یا ناویتر نووسیوە.

تەواوی ئەو هەوڵانە لەو ناوچەیەی وڵات بۆ ئەوە بوون کە پێش بە هێرشی میدییەکان بگرن، چونکە بۆ پەلاماردان نیزیکترین شوێن بوو. دەکرێ بڵێم چارەیەکی بەجێ بوو تا ڕێگا بە دانیشتووانی میدی نەدرێ بەدزییەوە بێنە نێو شار و بزانن باس و خەبەر چییە.

[١٨٦] نیتۆکریس سەرەتا بەو کارانەی گەرەکی بوو هێڵێکی دیفاعی دروستبکا، بەڵام دواتر دەکەوت کۆمەڵێک قازانجیتریان لێکەوتەوە. شاری بابل بە دوو جێ دابەش ببوو و چۆمی فورات بە نێوەڕاستی کۆمەڵگاکەدا تێدەپەڕی. لە زەمانی پاشاکانی قەدیمەوە تا سەردەمی ئەو، خەڵک ناچاربوو بە قایق بپەڕنەوە و ئەوەش زۆر ڕاحەت نەبوو. نیتۆکریس ئەو گرفتەشی چارەسەر کرد. وەختێک ناوبراو گۆلی دەستکردی جێبەجێ کرد، فرسەتی دەستکەوت کە شاکارێکیتریش بخوڵقێنێ. فەرمانیدا بەردی درێژ و باریک داتاشن. کاتێک ئەو بەردانە ئامادە کران و کاری هەڵکەندن و دروست کردنی دیواری گۆلیش تەواو بوو، ئەوجار بواری ئاوی چۆمیان گۆڕی و بەو چەشنە تەختی چۆم ویشک هەڵگەڕا و گۆل خەریک بوو پڕئاو دەبوو. خێرا دیوارەکانی قەراخ چۆم لەو شوێنانەی شاری دابەشکردبوو سازکران. هەڵبەت لەو شوێنانەش کە کۆڵانەکان دەگەیشتنە سەر لێواری چۆم دیوار دروست کرا. دوای ئەوانە، ئەوجار بناغە و کۆڵەکەی پردێکی گەورە لە هەردوو بەری چۆم و لە نێوەڕاستی شار بە بەردی تاشراو و خشت و ئاسن بنیاتنران. دوای ئەوە گشت ڕۆژێک کاریتەی ساف و چوارگۆشەیان لەسەر کۆڵەکەکانی پرد ڕەیاڵ دەکرد بۆوەی خەڵک بتوانێ بپەڕنەوە، شەوانەش هەڵیان دەگرتنەوە تا ڕێگای هاتووچۆ بۆ ئەو کەسانی دەسپیس نەمێنێ کە بچنە نێو شار و دزی بکەن. بەهەرحاڵ کاتێک گۆلی دەستکرد پڕئاو بوو و کاری پردی نێو شاریش کۆتایی پێهات، ئەوسا ئاوی چۆمی فورات لە گۆلەوە دووبارە بەردرایەوە نێو بواری پێشوو. بەو چەشنە کارێکی گرینگ جێبەجێ بوو و خەڵکی بابل بوونە خاوەن پرد و گۆلی دەسکرد.

[١٨٧] خاتوو نیتۆکریس بیری لە زیرەکییەکی دیکەش کردەوە و لەڕاستیدا حیلەیەک بوو. دەستووری دا لەسەر پڕهاموشۆترین دەروازەی شار ئارامگە (مەقبەرە)ی بۆ دروست بکەن. شوێنێکی بەرز و لە هەموو جێگایەکی شارەوە دەدیترا. کۆڵەکەکانی ئەو مەقبەرەیە (هەجەر) لەسەر ستوونەکانی دەروازە دامەزرابوون. لەسەر بەردی سەر سینگی گۆڕەکە نووسرابوو: "هەر پاشایەکی دوای من دەسەڵاتی شاری بابیل بەدەستەوە بگرێ و بێ پارە بمێنێتەوە، بۆی هەیە بەردی سەر قەبرەکەم هەڵگرێ و پارەی نێو گۆڕ دەربێنێ. بەڵام، ئەگەر پاشایەکی ساماندار بێ و پێویستی بە پارە نەبێ، باشترە دەست لە گۆڕەکەم نەدات، چونکە هیچ قازانج و مەسڵەحەتێکی بۆ ئەو پاشایە لێناکەوێتەوە ". ئەو گۆڕە بەساڵان وەک خۆی مایەوە، تا ئەو کاتەی داریوش پاشا شاری بابلی داگیرکرد. ناوبراو زۆری پێ حەیف بوو خۆی لە پارەی نێو قەبرەکە بەساحێب نەکا، هەربۆیە پێشنیاری هەڵدانەوەی گۆڕەکەی پەسندکرد. داریوش بە ژێر ئەو درگایەدا هاتووچۆی نەدەکرد چونکە گەرەکی نەبوو بەژێر تابووتی مردوویەکدا ڕابرێ. فەرمانیدا سەر قەبرەکە لابەرن. داریوش هیچ پارەیەکی نەدۆزییەوە، تەنیا ئێسقانی مردوو و پەیامێکی دۆزییەوە کە تێیدا نووسرابوو: "ئەگەر تۆ تینووی پارە نەبوای و تەماحی بێشەرمانە هانینەدابای و لەشت پیس و بێنوێژ و دڵت ناپاک نەبوایە، قەت گۆڕی مردوانت هەڵنەدەدایەوە ". ئەوجۆرەی باسی خاتوو نیتۆکریس دەکەن، مرۆڤێکی ئەوتۆ زیرەک بووە.

[١٨٨] کوروش لەگەڵ کوڕی نیتۆکریس کەوتە شەڕ. ئەو کوڕە ناوی باوکی لەسەر بوو و پێیدەگوترا لاڤینیتۆس[١] و پاشای ئاسوورییەکان[٢] بوو. کوروش هەرکات لەشکرکێشی کردبا، ئازوقە و وڵاغ و ماڵاتێکی زۆری

---

١- لاڤینیتۆس، دوایین پاشای بابیل.

٢- ئەو لەشکرکێشییەی هێرۆدۆت باسی دەکا و دەڵێ دژی ئاشوورییەکان بوو، لەڕاستیدا دژی بابیلییەکان و لە ساڵی ٥٣٨ی پێش زایین بووە.

ڕەگەڵ خۆی دەدا. تەنانەت ئاویشی لە چۆمی خۆئاسپ[1] هەڵدەگرت کە بە تەنیشت شاری شوشدا تێدەپەڕی. کوروش جیا لە ئاوی ئەو چۆمە، ئاوی هیچ ڕووبارێکیتری نەدەخواردەوە. ئەوان سەرەتا ئەو ئاوەیان دەکوڵاند و پاشان لە گۆزەی زێویان دەکرد و کۆمەڵێک فایتوونی چوار ئەسپ ئەو گۆزانەیان لێ باردەکرا. ئەو فایتوونانە بە ئەسپ و هێستر ڕادەکێشران و پاشا بۆ هەر شوێنێک چووبا، وەدوای دەکەوتن.

[١٨٩] کوروش وەختێک بە مەبەستی هێرش بۆ سەر شاری بابل وەڕێکەوت، گەیشتە سەر چۆمی گیندیس[2]. سەرچاوەکانی ئاویی ئەو چۆمە لە چیاکانی ماتیئینا[3] هەڵکەوتوون و بە وڵاتی داردانییەکاندا[4] تێدەپەڕێ و دەڕژێتە ڕووبارێکیتر بە ناوی دیجلە. ڕووباری دیجلە بە شاری ئۆپیسدا دەربازدەبێ و پاشان دەڕژێتە بەحری ئێریترە. وەختێک کوروش دەیویست لە چۆمی گیندیس بپەڕێتەوە، کە دەبوایە کەڵک لە قایەق وەرگرێ، ڕاست لەو کاتەدا یەکێک لە ئەسپە سپییەکانی موقەدەسی[5] پاشا سڵەمییەوە و کەوتە نێو ئاو. ئەو ئەسپە زۆری حەوڵدا خۆی بگەیێنێتە قەراخ چۆم، بەڵام ئاوەکە ئەوەندە خوڕێن بوو کە لەگەڵ خۆی بردی. کوروش زۆری ڕق لەو چۆمە هەستا، چونکە لەو بڕوایەدا بوو کە تەوهین و بێڕێزی بە پاشایەتییەکەی کراوە، بۆیە لەجێوە بڕیاری دا چۆمی گۆڕین ئەوەندە بێهێز بکا کە ڕۆژێک ژنانیش بتوانن بەبێ قایق لێیبپەڕنەوە و ئاوەکە ئەژنۆشیان تەڕ نەکات.

---

١- دەبێ هەمان چۆمی کارون بێ کە یەکێک لە لکەکانی بەناوی چۆمی قەرەسوو بەتەنیشت شاری شووشدا تێدەپەڕێ.

٢- چۆمی گیندیس، ڕوباری دیالەی ئەمڕۆ.

٣- ماتیئینا، وڵاتی نێوان ئەرمەنستان و خوزستان و بەشی هەرزۆری لەژێر دەسەڵاتی ئاشوورییەکاندا بووە.

٤- دیارنییە کام وڵات یا هەرێمە و ڕوون نەکراوەتەوە.

٥- هەشت ئەسپی سپی فایتوونێکی بەتاڵیان لەو لەشکرکێشییەدا ڕاکێشاوە ئەوە فایتوونی خواوەند دیا (زۆس) یا خواوەند ئیلیو (خۆر) بووە.

کورِوش دوای ئەو رووداوە هێرشی دژی شاری بابلی راگرت و لەشکرەکەی کردە دوو دەستە. فەرمانیدا لە هەردوو قەراخ چۆمی گیندیس کۆمەڵێک نیشانە دابندرێن و لەهەر لایەی رووبار سەد و هەشتا جۆگە[1] هەڵکەندرێن و ئاوەکە بەسەر ئەو جۆگانەدا بەش‌بکرێ. ئەو جۆگانە بەرەو گشت لایەک دەچوون. بەهەرحاڵ خێرا و لەجێوە دەستووری هەڵکەندنی جۆگەکانیدا. بەبوونی ئەو هەموو هێزە کارکەرە، پلانی ناوبراو جێبەجێ کرا و وەرزی هاوین بەو شێوەیە کۆتایی پێهات.

[١٩٠] کوروش دوای ئەوەی چۆمی گیندیسی سزادا و بەسەر سێسەد و شێست جۆگەدا بەشی کرد، فەسڵی بەهار بەرەو شاری بابێل وەڕێکەوت. بابلی‌یەکان خۆیان رێکخست و لە شار دەرکەوتن و چاوەڕوانی پەلاماری کوروش بوون. کاتێک لەشکری کوروش لە شاری بابل نیزیک کەوتەوە، بابلییەکان پەلاماریان دەست پێکرد و تووشی شکست هاتن و ناچار بە پاشەکشە بوون و خۆیان لەنێو دیوارەکانی شاردا ئاخنییەوە. بابلی‌یەکان لەوە دڵنیا بوون کە کوروش دەست هەڵناگرێ و دەخوازێ تەواوی گەلانی ناوچە بێنێتە ژێر رکێفی دەسەڵاتی خۆی. بۆیە هەرچی ئازوقە و پێداویستی هەیان‌بوو، گشتیان کۆکردەوە تا ساڵانێکی زۆر تووشی گرفت نەیەن. ئیتر گەمارۆی شارەکەیان جێگای نیگەرانی نەبوو. دروست بەپێچەوانەوە، ئەوە کوروش بوو کە تووشی رەوشێکی نالەبار هاتبوو. بەهەرحاڵ ماوەیەکی زۆر تێپەڕی و کوروش رێگای لێگیرابوو.

[١٩١] ئایا کوروش خۆی بەو قەناعەتە گەیشت، یا خەڵکانی‌تر رێنوێنی‌یان کرد، ئەو بڕیارێکی بەو شێوەیەیدا: کۆمەڵێک لە شەرکەرەکانی لە شوێنی هاتنە ژوور و چوونەدەری ئاوی چۆمی شار دانا و دەستووری پێدان کە هەرکات ئاوەکە لە تەنکەی دا، ئەوان پەلاماری شار بدەن. دوای ئەو دەستوورە و دامەزراندنی پیاوەکانی، خۆی و پاسەوانانی رۆیشتن. کوروش

---

١- لە هەرلایەی روباری دیالە ١٨٠ جۆگە هەڵکەندرێن، واتە ٣٦٠ جۆگە، ژمارەکانیان لەگەڵ رۆژەکانی ساڵ یەکدەگرنەوە.

گەیشتە سەر گۆل و راست ئەو کارەی کرد کە خاتوو پاشای بابیلی لەگەڵ چۆم و گۆل کردی. کوروش ئاوی چۆمی بۆ گۆل بەرێکرد کە ئەو کاتە بەتاڵ بوو و بەو چەشنە ئاوی رووباری نێو شار لە کەمیدا. دوای ئەو کارە پارسەکانی دامەزراو لە نیزیک شار و لە شوێنی چوونە ژوور و هاتنە دەرەوەی چۆم کاتێک دیتیان ئاوی رووبار تەنکەی کردوە و دەگاتە نێو قەدیان، پەلاماری نێو شاریاندا. ئەگەر بابیلییەکان ئاگاداری ئەوە ببان کە کوروش چی کردوە، لە پارسەکان دەگەڕان بێنە نێو شار و تەڵەیەکی گەورەیان بۆ دادەنانەوە. ئەوان دەیانتوانی تەواوی ئەو دەروازانەی بەرەو چۆم بوون داخەن و خۆشیان لەسەر دیوارەکانی لێواری چۆم دامەزرێن و پارسەکان لە بۆسە هاوێن. بەڵام پەلاماری پارسەکان ئەوانی تووشی سەرسوڕمان کرد. شاری بابل تەواوێک گەورەیە، وەک دانیشتووان باسی دەکەن، وەختێک بەشەکانی دەرەوە داگیرکران، نێوەندی شار ئاگایان لەوە نەبوو کە چ قەوماوە. دیارە ئەو رۆژە لەنێو شار جێژن گیراوە و خەڵک خەریکی هەڵپەڕکێ و خۆش گوزەرانی بوونە و تا دوایین سات بەهیچیان نەزانیوە. بەهەرحاڵ شاری بابل بەو شێوەیە و بۆ یەکەمجار داگیرکرا.

[١٩٢] بۆوەی باسی هێزەکانی لەشکریی بابلی بکەم، پێویستە لەسەر زۆر بابەتیتر بدوێم. پاشای پارسەکان خاکی ژێر دەسەڵاتی خۆی بەچەشنێک دابەشکردبوو کە جیا لەماڵیاتی حکوومی، پێویست بوو خۆیشی و لەشکرەکەی لەباری ماڵییەوە دابینبکرێن. هەرساڵ دوازدە مانگە و لەو یەکساڵەدا خەرجی چوار مانگ بەتەنیا لەسەر بابیلییەکان و هەشت مانگی دواییش بۆ گشت وڵاتانی ئاسیایی تەرخان کرابوو. ئیدارەی ناوچەکە وەک پارسەکان ناویان ناوە ساتراپیا، گەلێک بە قازانجیانە. تریتادێخمیس کوڕی ئارتاڤازۆس کە پاشا ساتراپییەکی داوەتێ، تەنیا لە یەک رۆژدا، یەک ئارتافی

لە بەعەمەل هێنانی زێو قازانج کردوە. ئارتاڤی[1] پێوانەیەکی پارسییە و بەرابەری یەک مێدیمنۆی[2] ئەتیکی (ناوچەی ئاتێن) و سێ خینیکس[3] دەبێ.

جیا لە سوارە نیزام، تریتادێخمیس خاوەن هەشت سەد ئەسپی سواری و شازدە هەزار مایین بووە. واتە بۆ هەر ئەسپێک بیست مایین تەرخان کراوە. ناوبراو ئەوەندە زۆر سەگی هیندی راگرتووە کە چوار گوندی ژێر دەسەڵاتی پاشا باج و خەراجیان نەداوە، تەنیا لەسەریان فەرز کراوە کە ئەو سەگانە بەخێو بکەن.

**[١٩٣]** لە وڵاتی ئاسیریا (ئاشوور) باران کەم دەبارێ و تەنیا بەشی پاراوکردنی سەرەتایی حاسڵاتی گەنم دەکات. هەڵبەت بە ئاوی چۆم ئەو گەنمە باڵا دەگرێ و دەگاتێ. دیارە ئەوەش بڵێم کە ئێرە وەک وڵاتی میسر نییە. لەوێ وەختێک چۆمی نیل هەڵدەستێ، کێڵگەکان پاراو دەکا، لێرە خەڵک ناچارە بەدەست و بە یارمەتی چەرخ ئاو لە بیر و چۆم هەڵکێشی و ئاودێری پێبکات. خاکی بابێل وەک میسر پڕە لە جۆگە و جۆیبار. گەورەترین جۆیباری خورێن بەرەو ئەو نوختەیە دەچێ کە لە وەرزی زستاندا، خۆر لەوێ هەڵدێ[4]. ئەو جۆیبارە[5] لە چۆمی فوراتەوە دەست پێدەکا و پاشان دەرژێتەوە نێو چۆمی دیجلە لە یەکتریان گرێدەداتەوە. شاری نەینەوا لە قەراخ چۆمی دیجلە هەڵکەوتووە.

ئەو وڵاتانەی من زانیاریم لەسەریان هەیە، ئاسیریا پتر لە گشتیان خاوەن بەروبوومی دەغڵ و دانە، چونکە دار و دەوەنی وەک هەنجیر، مێو، زەیتوون لەگۆڕێدا نییە و نایچێنن و تەنانەت بەتاقیشی ناکەنەوە، بزانن ئایا خاکەکەیان دەیهێنێ یاننا. هەروەک گوتم لەمەر دەغڵ و دان ئەوەندە خاکێکی دەوڵەمەندە

---

١- یەک ئارتاڤی یا ئارتابای پارسی بەرابەری ٥٥ لیتر بووە.

٢- مێدیمنۆ، پێوانە بۆ کەرستەی ئاوەکی لە شاری ئاتێن و بەرابەری ٥٢ لیتر بووە.

٣- خینیکس، یەک چل و هەشتمی مێدیمنۆ.

٤- لە وەرزی زستاندا خۆر لەلای باشووری رۆژهەڵات هەڵدێ.

٥- جۆگەی شا یا جۆیباری شا، لە زەمانی بەختونەسر بەمەبەستی لێکگرێدانی دوو چۆمی فورات و دیجلە هەڵکەندرابوو و لە باشووری رۆژهەڵات هەڵکەوتووە.

که هەر دەنکە گەنمێک دووسەد دەنک بەرهەم دێنێ و ئەگەر تۆوی چاکیان دەستکەوێ، ئەوسا دەگاتە یەک بە سێسەد. گەڵای گەنم و جۆی ئێرە بە هاسانی چوار پەنجە پان دەبێ. هەرزن و کونجی زۆرجار بەقەرا بەژنی دارێک هەڵدەستن. دیارە بەپێویستی نازانم کە باسی قەیاسی بەرزییەکەیان لەوە پتر بکەم. ئەوەش بڵێم کە ئەو کەسانەی هاتووچۆی هەرێمی بابلیان نەکردبێ، بۆیان سەختە باوەڕ بەو زانیارییانەی من سەبارەت بە دەغڵودانی ئێرە بکەن. بابلی‌یەکان رۆن لە زەیتوون ناگرن بەڵکوو رۆنی گەنمە شامی بەکاردێنن. ئەوان رووەک و داری چێندراوی چەشنی خورما لە دەشتەکانیان زۆرە و بەپڕانی بەردارن. میوەی ئەودارانە بۆ خواردن رادەگرن و شەڕاب و هەنگوین‌یش بەرهەم دێنن. داری خورما وەک داری هەنجیر پەروەردە دەکرێ. بابلی‌یەکان دەنکی خورما دەچێنن و وەک یۆنانی‌یەکان بەو دەنکە دەڵێن نێرینە. وەختێک ئەو دەنکە شین بوو و بالای گرت و گوڵی‌دا، چڵەکانی لێدەکەنەوە و لە لکەکانی دارخورمای مێیینەی دەبەستن بۆوەی حەشەرەی چڵە (مەبەستی هێرۆدۆت دەبێ گەردەی گوڵ بێ) نێرینەکە بچێتە سەر گوڵی مێیینە و دارەکە بەربگرێ. تۆوی نێرینە لە دار هەنجیریشدا راست بۆ ئەو مەبەستەیە.

**[١٩٤]** ئێستا باسی بابەتی سرنج‌ڕاکیش‌تری ئەو کۆمەڵگایە دەکەم. قایق و گەمی بابلی‌یەکان بەگشتی خڕن. هەر هەموویان لە چەرمی دەباغکراو لە وڵاتی ئەرمەنستان دروست دەکرێن. بەو قایق و گەمی‌یانە لە شوێنی دیکەوە بەرەو شاری بابل دێن. لە لکی دارەبی چوارچێوە و قەوارەی قایق سازدەکەن و بە مەحکەمی چەرمی تێوەردەپێچن. ئەو قایقانە پاش و پێشیان نییە و بازنەیی دروستکراون و وەک قەڵغان دەچن. قامیش و حەسیریان لەنێودا ڕادەخەن و دەیانهاوێنە سەر ئاو. بەو قایقانە کەرستەی جۆراوجۆری بازرگانی یا نێرە و خومرەی داری پڕ لە شەڕابیان لەسەر باردەکەن. دوو کەسی شەقڵە بەدەست بەپێوە لەسەر قایق دەوێستن. ئەو جووتە بەنۆرە شەقڵە لە ئاو دەکووتن و قایقەکە لێدەخوڕن. هەڵبەت گەمی گەورە و

بچووکیش دروست دەکرێن. ئەوانەی گەورە جێگای پێنج هەزار تالاند[1] دەبێتەوە. ئەوەش بڵێم کە لەنێو هەر گەمییەکی سەر ئاودا، کەرێکیش هەیە، دیارە لە گەمی گەورەتردا ژمارەی کەرەکان پتر دەبێ. کاتێک ئەو گەمی‌یانە دەگەنە شاری بابێل بارەکانیان کە شەراب[2] و حەسیر بێ لەجێوە حەراج دەکەن. پاشان چەرمی قایقەکانیان لێدەکەنەوە، چوارچێوەکەی دەفرۆشن. چەرمەکان لە کەرەکانیان باردەکەن و بەرێگای ویشکاییدا دەگەڕێنەوە وڵاتی ئەرمەنستان.

ئاوی رووبار زۆر خوڕێنە و کاتی گەڕانەوە کەس ناتوانێ بەپێچەوانەی رەوتی ئەو، قایق سەرەوژوور لێخوڕێ. هەر بۆیە قایق و گەمی‌یەکان لەجیاتی دار، لە چەرم دروست دەکەن و پاشان هەڵیدەوەشێننەوە. ئەو کاروانچیانەی بە سواری کەرێ دەگەڕێنەوە وڵاتی ئەرمەنستان، دووبارە قایقی چەرمی بە هەمان شێوەی باسمان کرد، دروست دەکەنەوە.

[١٩٥] تا ئێستا باسەکەمان سەبارەت بە قایقەکانی بابلی بوو، بەڵام ئەوجار باسی جلوبەرگیان دەکەم. ئەوانە شۆرەی درێژی کەتانی لەبنەوە دەپۆشن و دەگاتە سەر قاچەکانیان. لەسەر ئەو شۆرەیە، عەبای خوری و لەسەر ئەویش، رەدای تەنک و سووک بەخۆدادەدەن. پێڵاوەکانیان لە هەرێمی خۆیان دروست دەکەن و وەک کەوشی ڤیۆتی[3] دەچن. بابێلی‌یەکان قژ درێژن و عەمامە لەسەر دەنێن و بۆنی خۆش لە هەموو لەشیان دەدەن. هەرکەسە خاوەن بەردەمۆری تایبەت بەخۆی بۆ ئیمزاکردنە و عەسا و وەکازی بەدەستەوە کە دەسگرەکەی نەخشێندراوە. لەسەر دەسگرەی هەر وەکازێک، نەخشی سێو، خۆخ، هڵوو، گوڵی سوێسن یا بابەتی‌تری لەسەر هەڵکەندراوە.

---

١- تالاندی یۆنانی ٢٦ کیلۆگرەم، میسری ٢٧ کیلۆگرەم، بابێلی ٣٠.٣ کیلۆگرەم و رۆمی ٣٢.٣٠ کیلۆگرەم بووە.

٢- ئەو شەرابە لە ترێ دروست دەکرا و لە وڵاتی فینیقی‌یەوە دەهات.

٣- ڤیۆتیا، ناوچەیەکی باستانی و لە بەشی نێوەندیی یۆنان هەڵکەوتووە و خاوەن شارێکی ناسراوە بەناوی تیڤا.

دیاره بەپێی نەریتی ناوچەکەیان کەس بۆی نییە عەسای بێ نەخش و نیگار دەست داتێ و ئەوە عادەتیانە.

### دابونەریتی بابلییەکان

[١٩٦] دابونەریتی بابیلییەکان بەو چەشنەیە: بەباوەڕی من خەڵکی ئێنێتی[1] لە ناوچەی ئیلیریاس[2] باشترین دابونەریتیان هەبووە. ئەوجۆرەی من بزانم، لە هەر گووندێک و یەکجار لە ساڵدا، مەراسیمێک بەو چەشنەی باسی دەکەم، بەڕێوە چووە.

تەواوی کچانی خاوەن تەمەنی شووکردن، لە یەک شوێن کۆکراونەوە و پیاوان دەوریان گرتوون. دەلاڵێک دەستی بە فرۆشتنی ئەو کیژانە کردوە. ئەو دەلاڵە هەرجارێ رووبەڕوی کچێک وێستاوە، هەڵبەت بازاڕی بە جوانترین کیژە وەگەڕخستوە. وەختێک کچە مشتەری دەست کەوتووە و بە پارەیەکی زۆر فرۆشراوە، کابرای دەلاڵ ئەوجار چووەتە سەر کیژی جوانی دووهەم. ئەو کچانە بەو شەرتە فرۆشاون کە پیاوەکان لەگەڵیان زەماوەند بکەن و ژیانی هاوبەشیان لەگەڵدا پێکبێنن. بابیلییەکانی لە تەمەنی ژن هێناندا بوونە و پارەیان هەبووە، حەولیان داوە جوانترین کچ بکڕن. کوڕە هەژارەکانی بێپارە کە جوانی کچیان بەلاوە گرینگ نەبووە، ناحەزەکانیان هەڵبژاردوە و تەنانەت پارەشیان لەسەر وەرگرتوە. ئەوەش لەبەر ئەوە بووە کە کابرای دەلاڵ کاتێک کاری فرۆشتنی جوانترین کچانی کۆتایی پێهێناوە، ناحەزترینیانی لەجێوە هەستاندووەتە سەر پێیان و داویە بەو کەسەی کە کەمترین قەیاسی پارەی گەرەک بووە. ئەو پارەیەش لە فرۆشتنی کچە

---

١- ئێنێتی، کۆمەڵێک لەو هۆزانە لە هەرێمی دەریای ئادریاتیک لە رۆژهەلاتی ئادیژ نیشتەجێ بوون و بەشێکیشیان لە ئاسیای بچووک گیرسانەوە.

٢- ئیلیریاس، ناوی ناوچەیەکی باکووری رۆژئاوای یۆنانی باستان و بەسەر باکوور و باشووردا بەشکرابوو.

جوانەکان دەست دەکەوت. لەڕاستیدا جوانەکان یارمەتییان بە مێرد وەگیرکەوتنی ناحەزەکان و سەقەتەکان کردوە.

هیچکەس بۆی نەبووە لەگەڵ کچی خۆی ژیانی هاوبەش پێکبێنێ، هەرچەند گەرەکیشی بوایە. هەروەها ئیزنی بردنەوەی کچەی بۆ ماڵەوەش پێنەدراوە، ئەگەر کەسێکی وەک زەمانەتکار دیاری نەکردبا. ئەو لەسەری بوو زەمانەتی ئەوەش بدا کە کچەکە لە ماڵەوە دانانیشێ و حەتمەن بە مێردی دەدا. ئەگەر ژیانی هاوبەش سەری نەگرتبا، پێویست بوو پارەکە بدرێتەوە بە خاوەنەکەی و ئەوەش بەپێی یاسا بەڕێوە دەچوو.

ڕێگا بە لاوانیتر دەدرا بێنە ئەو بازاڕە کە خەڵکی دێهاتیتر بوون و لە هەراجدا بەشداربن. ئەوە باشترین یاسای ئەو خەڵکە بوو، بەڵام ئێستا ئیتر بەڕێوە ناچێ، چونکە ڕێگایەکیتریان گرتۆتەبەر و حەزناکەن کچەکانیان تووشی چارەنووسی نادیار و ژیانی غەریبایەتی بن. بابلییەکان لەو کاتەوە کە بوونەتە کۆیلە و وێرانی و چارەڕەشی رووی تێکردون، هەر پیاوێکی هەژار و دەستەنگ کە دەبینی، بۆوەی بتوانێ ژیانی رۆژانەی خۆی و بنەماڵەکەی دابین بکا، ناچارە کچەکانی لەبەر لەشفرۆشی بنێ.

[۱۹۷] دووهەمین عادەتی عاقڵانەی بابێلییەکان ئەوە بوو کە نەخۆشەکانیان دەبردنە نێو بازاڕ. ئەو کاتە دوکتورێک لەگۆڕێدا نەبوو. خەڵک لە نەخۆشەکان وەنیزیک دەکەوتنەوە و زانیاری خۆیان سەبارەت بە کەسێک کە پێشتر تووشی هەمان ئازار هاتبێ و دواتر چاک بووبێتەوە، بە ناساغی تازە دەگوت و داوایان لێدەکرد عەینی ڕێوشوێن بگرێتەبەر. هیچکەس بۆی نەبوو بە تەنیشت نەخۆشێکدا رابرێ و لە حاڵ و نەساغییەکەی نەپرسێ.

[۱۹۸] بابلییەکان مردوەکانیان لە هەنگوین دەگرن و تەرمەکانیان وەک هی میسرییەکان دەپێچن. ئەگەر پیاوێکی بابێلی لەگەڵ ژنەکەی خۆی تێکەڵاوی بکات، کابرا کەرستەی بۆنخۆشی وەک داری کوندۆر دەسووتێنێ و بەجووتە لەبەری دادەنیشن و بۆنی پێوەدەکەن بۆوەی جەستەیان لەباری دەروونییەوە پاک بکەنەوە. کاتێک رۆژ بۆوە هەردوکیان خۆیان دەشۆن. ئەو

جووته بۆیان نییه بەر لەوەی خۆیان شوشتبێ، دەست لە هیچ دەفر و زەرفێک بدەن. عەرەبەکانیش خاوەن نەریتی لەو چەشنەن.

[١٩٩] نەریتێکی زۆر سەیرتری بابێلییەکان ئەوەیە: هەر ژنێک لەسەری فەرزکراوە یەکجار لە ژیانیدا بچێتە پەرستگەی ئەفرۆدیت[١] و لەگەڵ پیاوێکی بیانی و نەناسراو تێکەڵاو بێ. گەلێک ژنی دەوڵەمەند حەزناکەن لەگەڵ ژنانی هەژار بچنە نێو پەرستگە. ئەوانە سواری فایتوونی داپۆشراو دەبن و کۆمەڵێک خزمەتکار لەگەڵ خۆیان دەبەن و ماوەیەکیش لە دەوروبەری پەرستگە دەمێننەوە. هەڵبەت زۆربەی ئەو ژنانە بەو چەشنەی باسی دەکەم، هەڵسوکەوتیان دەکرد: ژمارەیەکی زۆر ژن لە پەرستگەی ئەفرۆدیت دادەنیشتن و کەژی چندراو لە بەن و قەیتانیان لە دەوری سەریان دەبەست. بۆیە ژمارەیان زۆرە، چونکە هەر چینێک دەڕوا و چینێکیتر دێتە ئەو شوێنە. لەو پەرستگەیەدا گوریس و تەناف رەیاڵکراون و داڵانیان دروست کردون. پیاوەکان بەو داڵانانەدا دێنە لای ژنەکان و هەڵیان دەبژێرن. ئەگەر ژنێک لەوێ دانیشتبێ، تازە ناتوانێ بچێتەوە ماڵی خۆی، دەبێ حەتمەن پیاوێکی غەریبە پارەی لە کۆشی هاویشتبێ و لەنێو پەرستگەدا تێکەڵاوی لەگەڵدا کردبێ. کاتێک پیاوەکە پارە لە کۆشی ژنە داوێ، پێویستە بڵێ: "بەناوی خواوەند میلیتا میوانی منی". میلیتا ناوی خواوەند ئەفرۆدیتی ئاسوورییەکانە. قەیاسی پارەکە هەرچەندێک بێ گرینگ نییە و ژنە نابێ خۆی لە وەرگرتنی بپارێزێ، چونکە ئیزنی ئەو کارەی پێنەدراوە و متفەڕک و پیرۆزە. ژنە وەدوای ئەو پیاوە دەکەوێ کە بەر لە هەرکەسێکیتر پارەی لە کۆشی هاویشتووە و هەقی نییە خۆی لە تێکەڵاوی بپارێزێ. وەختێک لەگەڵ کابرا چوو و ئەرکی پیرۆزی پەرستگەی بۆ خاتری خواوەند ئەفرۆدیت بەجێگەیاند، ئەوساکە دەگەڕێتەوە ماڵ و ئەوکاتە هەرکەسێکی دیکە بێت و هەر قەیاسێکیش پارەی بداتێ، ژنە مافی ئەوەی هەیە قبوڵی نەکا. ئەوانەی لەباری لەش و روخسارەوە جوانن خێرا دەگەڕێنەوە ماڵ، بەڵام ژنانی ناحەز

---

١- ئەفرۆدیت، یا ڤێنوس، ئیلاهەی جوانی لە یۆنانی باستاندا.

ماوەیەکی زۆر لە پەرستگە دەمێننەوە چونکە ناتوانن قەرزەکانیان بەپێی نەریت بدەنەوە (کەس تخوونیان ناکەوێ). هێندێک لەو ژنانە سێ تا چوار ساڵ لە پەرستگە دەمێننەوە تا پیاویان دەسکەوێ. نەریتی لەو چەشنە، لە زۆر شوێنی قیبرس‌یش بەرچاو دەکەوێ.[1]

**[٢٠٠]** ئەوانەی باسم لێکردن، دابونەریتی بابلی‌یەکان بوون. لەنێو ئەوانەدا سێ هۆز هەن کە هیچ شتێکی‌تر جیا لە ماسی ناخۆن. ئەو خەڵکانە هەرکە ماسی‌یان راوکرد، لەبەر خۆرەتاو ویشکی دەکەنەوە، پاشان لەنێو کوندە دارێکدا دەیکوتن و دەیکەنە ئارد و بە پارچە قوماشێک لە هێڵەگی دەدەن. هەرکەس گەرەکی بێ دەتوانێ وەک شۆرباو یا بە برژاوی بیخوا.

## لەشکرکێشی دژی ماساغێتی‌یەکان

**[٢٠١]** کاتێک کوروش بەسەر بابلی‌یەکاندا زاڵبوو، بڕیاری‌دا دژی ماساغێتی‌یەکان لەشکرکێشی بکا. ماساغێتی‌یەکان خەڵکانێکی گەلێک بەغیرەت و جوامێر بوون. ئەوانە لە ناوچەکانی رۆژهەڵاتی دوور لە چۆمی ئاراکس (ئاراس) دەژیان و رووبەرووی ئیسی‌دۆنی‌یەکان[2] بوون. شارەزایان دەڵێن کە ماساغێتی‌یەکان لەڕاستیدا خاوەن رەگەزی سکیتی‌ین.

**[٢٠٢]** چۆمی ئاراکس[3] بە باوەڕی کۆمەڵێک زانای ناسراو لە رووباری ئیستڕۆ[4] بچووکترە و چەند شارەزایەکیش پێیانوایە گەورەترە. هەڵبەت ئەو زانایانە دەڵێن کە ئاراکس ژمارەیەک دورگەی گەورە و بچووکی هەیە و لەباری پانتاییەوە لەگەڵ دورگەی لێسڤۆس بەرابەرە. لەو دورگانە خەڵکانێک دەژین کە لە وەرزی هاویندا ریشەی گژ و گیا لەژێر دەردێنن و لەگەڵ دانەوێڵەی‌تر دەیانخۆن. لە وەرزی پێگەیشتنی میوە و دەغڵ و دان، گشتی کۆدەکەنەوە و بە

---

١- لە پافۆس و ئاماتووندا لە قیبریس هەبوونە.

٢- ئەوانە لە رۆژهەڵاتی ئورال ژیاون و یەکێک لە هۆزەکانی سکیتی بوونە.

٣- چۆمی ئەرەس.

٤- هەمان روباری دانوبی ئەمڕۆیە.

ویشکهەڵگیراوی چەشنی ئازوقە و بژیوی زستان هەڵیدەگرن. لەو هەرێمە باغاتی ئەوتۆ هەیە کە میوەکانیان خاوەن ئەو تایبەتمەندییانەن: جەماوەرێکی زۆر لە دەوری ئاگر کۆزیلە دەبەستن و ئەو میوەیە لەنێو ئاگر داوێن. کاتێک دەسووتێ، بۆنی پێوەدەکەن و پێی مەست دەبن، راست چەشنی شەرابی یۆنانییەکان کە وەختێک دەیخۆنەوە، پێی سەرخۆش دەبن. هەرچی پتر لەو بەرهەمە برژێننە نێو ئاگر، بەهەمان ئەندازە زیاتر مەست و سەرخۆشیان دەکا، تا ئەو رادەیەی کە هەڵدەستنە سەرپێ و گۆرانی دەڵێن و هەڵدەپەڕن.

چۆمی ئاراکس لە وڵاتی ماتیئینۆسڕا[1] سەرچاوە دەگرێ. چۆمی گیندیس،[2] ئەویش لێرەوە سەرچاوەدەگرێ و کوروش کاتی خۆی بەسەر چوارسەد و شێست جۆگە و کاناڵدا بەشیکرد. ئەو چۆمەش چل جۆگەی لێبووەتەوە. لەوانە جیا لە یەکیان، تەواوی ئەوانیتر بەرەو ناوچەکانی زەل و ئاوەدان دەڕۆن، واتە بۆ ئەو خەڵکانەی وەک پێشتر باسم کرد، ماسی بەکاڵی دەخۆن و پێستی سەگاو دەکەنە جلوبەرگ و لەبەری دەکەن. یەکێک لە لکەکانی چۆمی ئاراکس دەڕژێتە دەریای کاسپیا کە دەوری گیراوە و پێوەندی بە هیچ دەریایەکی ئازادەوە نییە. مەبەستی من ئەو بەحرانەی یۆنانییەکان بە پاپۆر و گەمی بەسەریاندا دەگەڕێن[3] یا ئەو دەریایەی دوور لە کۆڵەکەکانی ئیراکلیس[4] هەڵکەوتووە، یا دەریای ئاتلانتیک و دەریای ئێریترەی[5] ناسراو، هەرسێکیان بەحرێکی گەورە پێکدێنن و ئازادە. بەهەرحاڵ کاسپیاش وەک دەریایەکی جیا لە بەحرەکانیتر، سەربەخۆیە.

---

١- هۆزەکانی ماتیئینی لە دروستییەتی ساسپیرییەکان، لە ئاسیای بچووک ژیاون. چۆمی ئەرەس لە وڵاتی ئەوانەوە سەرچاوەی گرتووە. ٠

٢- روباری دیالە کە دەڕژێتە چۆمی کارون.

٣- مەبەست دەریای مەدیترانە، ئادریاتیک و دەریا رەش.

٤- مەبەست ئەقیانووسی ئەتلەسە، خەڵکی ئەمڕۆ کۆڵەکەکانی ئیراکلیس بەنێوی جەبەلولتاریق دەناسن.

٥- مەبەست لە ئەقیانووسی هیندە، پێوەندی ئەو ئەقیانووسە و ئەقیانوسی ئەتڵەس بۆ یەکەمجار بەهۆی فینیقییەکانەوە دوزرایەوە و لەو کاتەدا بوو کە بەدەوری ئەفریقادا دەگەڕان.

[۲۰۳] دەریای کاسپیا دەوری گیراوە. بۆوەی کەسێک بتوانێ مەودای درێژایی ئەو بەحرە بپێوێ و بە گەمی خاوەن پاڕوو و بێڵ سەفەر بکا، پازدە رۆژی تەواو وەختی پێویستە، بەڵام بۆ پێوانی بەرینایی لە بەرتەسکترین شوێن، تەنیا حەوت رۆژی گەرەکە. لە رۆژئاوای ئەو بەحرە، هەرێمی کاڤکاسۆس (قەفقاز) هەڵکەوتووە.

بەرزترین و گەورەترین چیای ئەو ناوچەیە پێیدەگوترێ کێوی قەفقاز. لە ناوچەی قەفقاز کۆمەڵێک هۆز نیشتەجێن. بەشی هەرەزۆری ئەو هۆزانە بە میوەی کێوی دارستان دەژین. دەڵێن کە جۆرە داری ئەوتۆ لەو دارستانانەدا هەیە کە گەڵاکانیان ویشک دەکرێنەوە و دوای وردکران و تێکەڵ بە ئاوکردن، مەرەکەب و جەوهەری لێدروست دەکرێ کە خەڵکی ناوچەکە بۆ کێشانەوەی نەخش و نیگاری ئاژەڵان لەسەر جلوبەرگەکانیان کەڵکیان لێوەردەگرن. ئەو نەخش و نیگارانە بە شوشتن پاک نابنەوە و لەسەر پارچەکە دەنیشن، وەک ئەوەی هەر لەسەرەتاوە بەو چەشنە چندرابن. ئەو هۆزانە چەشنی ئاژەڵەکان، بە ئاشکرا تێکەڵاوی جینسی دەکەن و خۆیان لەبەر چاوی خەڵک ناشارنەوە.

[۲۰٤] سنوورەکانی رۆژئاوای بەحری کاسپیا دەبێتە هەرێمی قەفقاز. لەلای رۆژهەڵاتی ئەو دەریاوە، دەشتێکی پان و بەرین هەیە کە چاو بڕی نادا. بەشێکی زۆری ئەو دەشتە بەدەست ماساغێتی‌یەکان بەساحێب دەکرێ و کوروش گەرەکی بوو دژی ئەوانە لەشکرکێشی بکا. فرە هۆ کوروش‌یان بە قەناعەت گەیاند تا بڕیارێکی ئەوتۆ بدا. هەڵبەت بەر لە گشت هۆیەک، ئەو کابرایە لە باری نژاد و رەگەزەوە، بەشێوەیک بیری دەکردەوە کە لە خەڵکانی‌تر بێتر و باڵاترە. هۆی دووهەم، شانسی کوروش لە سەرجەم شەڕەکاندا بوو. ناوبراو هەر شوێنێکی ویستبا داگیری بکا، خەڵکی ناوچەکە بەبێ هیچ بەرگرێ لەخۆ کردنێک، سەری کڕنۆشیان بۆ دادەنواند.

[۲۰٥] شای ماساغێتی‌یەکان ئەو سەردەمە ژنێک بوو کە دوای مەرگی پاشا هاتبووە سەر تەخت. ئەو خاتوو شایە ناوی تۆمیریس بوو. کوروش سەرەتا خوازبێنی لێکرد، بەڵام تۆمیریس دەیزانی کە مەبەستی ناوبراو تەنیا

داگیرکردنی وڵاتەکەیەتی نەک پێکهێنانی ژیانی هاوبەش، هەربۆیە رازی نەبوو و داوای ناوبراوی قبوڵ نەکرد. دوای ئەوەی کوروش بە فێڵ نەیتوانی بە ئامانجەکەی بگا، بەرەو چۆمی ئاراکس پێشڕەوی کرد و لەشکری بۆ پەلامار وەرێخست. ناوبراو خێرا چەند پردێکی دەستکردی بۆ پەڕینەوە لە چۆم ئامادەکرد و بورجی دیدەوانی لەسەر ئەو پردانە دامەزراند تا چاوەدێری کاروانی لەشکر لە کاتی دەربازبووندا بکەن.

[٢٠٦] وەختێک ئەو ئامادەکارییانە بەڕێوەچوون، تۆمیریس ڕاسپاردەی ناردە لای کوروش و پێیڕاگەیاند: "پاشای میدیاکان، دەست لەو ئامادەکارییە هەڵگرە، تۆ نازانی لە کۆتاییدا چەندە بە زەرەر و زیانت تەواو دەبن. خۆت لە هەڵتوهەڵتۆز بپارێزە، لە وڵاتی ژێر دەسەڵاتتدا فەرمانڕەواییەکەت بەڕێوە بەرە و لە ئێمەش گەڕێ کە لە چیاکانی خۆماندا حوکمڕانی بکەین. ئەگەر ناخوازی ئەو داواکاری و ئامۆژگارییانەم قبوڵ بکەی و جیا لە هێمنی و ئاسایش، دەست بۆ کردەوەی تر دەبەی و تامەزرۆی شەڕ دژی ماساغێتی‌یەکانی، ئیتر پێویست ناکا خۆت ئەوەندە بە پەڕینەوە لە چۆم ماندوو بکەی. ئێمە مەودای سێ رۆژ رێگا پاشەکشە دەکەین و تۆ وەرە خاکەکەمان داگیر بکە. ئەگەر هەر دەست هەڵناگری، دەبێ چاوەڕوانی هاتنی ئێمە لەنێو وڵاتی خۆتدا بکەی. ئیستا چیت لە دەست دێ، بیکە ". وەختێک کوروش گوێی لەو قسانە بوو، پیاوەکانی سەرکردەی پارسی کۆکردەوە و باسی رەوشەکەی کرد و خوازیاری پێشنیار و بۆچوونی ئەوان بوو. کوروش نەیدەزانی کام یەک لەو دوو ڕێگایە هەڵبژێرێ. هەموو لایەک لەو باوەڕەدا بوون کە باشترە کوروش لەنێو خاکی خۆیدا چاوەڕوانی لەشکری خاتوو تۆمیریس بکا.

[٢٠٧] کریسۆسی لیدیایی ئەوکاتە لەلای کوروش دەستبەسەر بوو. کریسۆس دژی ئەو هەڵوێستە راوەستا و بە پێچەوانەی بۆچوونی ئەوان گوتی: "پاشاکەم، پێشتریش عەرزم کردی کە خواوەند دیا منی تەسلیمی جەنابت کرد. کاتێک مەترسییەک هەڕەشە لەماڵی ئێوە بکا، بە ئەرکی سەر شانی خۆمی دەزانم، ئەوەندەی لە توانام دابێ پێشی پێبگرم. بەسەرهات و رووداوی ناخۆش کۆمەڵێک ئەزموونیان خەڵات کردوم. جەنابت ئەگەر

پێتانوایە مرۆڤێکی ئەبەدی و نەمر و خاوەن لەشکرێکی هەتاهەتایی، ئەوساکە من هەرچی بیڵێم مانای نییە. بەڵام بەپێچەوانەوە، ئەگەر لەسەر ئەو باوەڕەی کە ئێوەش وەک خەڵکانیتر مرۆڤی ئاساییین و لەشکرێکی مرۆییتان لەژێر فەرمان دایە و بەواتایەک هیچ کامتان ئەبەدی نین، ئەو کاتە بزانن کە ژیانی مرۆڤ چەشنی چەرخی گەردون وایە و بەردەوام خول دەخوا و لێناگەڕێ پیاو بەردەوام وەک پێشوو بەختەوەر بژی. سەبارەت بەو بابەتە دیارەی باسی لێوە دەکەن، بەپێچەوانەی ئەو راوێژکارانە کە لێرە دانیشتوون، من پێموایە ئەگەر ئێمە چاوەڕوانی روبەڕو بوونەوە لەگەڵ هێزەکانی دوژمن لەنێو خاکی خۆمان‌دابین، تووشی ئەو مەترسییە دێین کە ئەگەر شکست بخۆین، جەنابت تەواوی پاشایەتیەکەت لەدەست دەدەی، چونکە ئاشکراو روونە کە ماساغێتی‌یەکان دوای سەرکەوتن قەرار نییە بگەڕێنەوە وڵاتی خۆیان، بەڵکوو خوازیاری داگیرکردنی سەراسەری وڵاتەکەت دەبن. ئەگەر جەنابت ئەوان شکست بدەی، لەگەڵ ئەو حاڵەتەی کە ئێوە لەنێو خاکی ئەواندا براوەی شەڕ بی و لەوێ وەدەریان بنێی، لەباری هەڵسەنگاندنەوە جیاوازییەکی زۆر بەدی دەکرێ و سەرکەوتنەکەتان ئەوەندە بەرچاو نابێ. لەمەر چوونە نێو خاکی ئەوان، دەبێ بڵێم کاتێک ئێوە سەرکەوتن، دەبنە خاوەن وڵاتی خاتوو تۆمیریس. دیارە جیا لەو باسانە، بەڕاستی سەرشۆڕییە و قبوڵ ناکرێ کە کوروشی کوڕی کامبیز لە بەرامبەر ژنێکدا پاشەکشە بکا. ئەوەی من بە مەسڵەحەتی دەزانم و پێویستە هەر ئێستا بیکەین، ئەوەیە کە لە چۆم بپەڕینەوە و بەو ئەندازەیەش پێشڕەوی بکەین کە ئەوان پاشەکشەیان کردوە. دوای ئەو بەشە لە پێشڕەوی هێزەکان، دەبێ کارێکیتر بکەین کە ئێستا لەسەری دەدوێم و دەبێتە هۆی سەرکەوتنتان.

ئەوەندەی من بزانم ماساغێتی‌یەکان سەبارەت بە ژیانی پڕ لە خۆشی و دەوڵەمەندیی پارسەکان هیچ نازانن. ئێوە ئێزن بفەرموون با ماڵاتێکی زۆر سەرببڕین و دوای ئەوەی زیافەتێکی باش لە ئۆردوگای لەشکریماندا سازکرا و سفرەیەکی رەنگین رازایەوە و کوڵێک خمرەی پڕ لە شەڕاب و شەربەت داندرا،

ئەوساکە هێزێکی کەمی جەنگاوەران لەوێ بەجێدەهێڵین و باقی لەشکر دەبەینە سەر چۆم. ئەگەر بەهەڵە نەچووبم، ماساغێتی‌یەکان وەختێک چاویان بەو گشتە خواردن و خواردنەوەیە بکەوێ، بەپانەوە پەلاماری دەدەنێ، ئەوکاتە فرسەتێکی باش بۆ ئێمە هەڵدەکەوێ کە هەڵە گەورەکان ڕاست بکەینەوە".

[٢٠٨] کوروش رای راوێژکارانی وەلانا و پێشنیاری کریسۆسی پەسند کرد. ناوبراو بە تۆمیریسی راگەیاند کە پاشەکشە بکا، چونکە گەرەکییەتی لەچۆم بپەڕێتەوە. خاتوو تۆمیریس وەک چۆن بەڵێنی دابوو، پاشەکشەی کرد. کوروش، کریسۆسی دیل و دەستبەسەری بە کوڕەکەی خۆی واتە کامبیز ئەسپارد کە وەک جێگر دیاریکرابوو[1]. ئەو هەروەها بە کامبیزی گوت: کوڕم ئەگەر هاتوو لە شەڕی دژی ماساغێتی‌یەکان‌دا تووشی شکست هاتم، تۆ دەبێ زۆر بەباشی ئاگات لە کریسۆس بێ و ڕێزی لێبگری و نەهێڵی لە هیچی کەم بێ. کوروش، کریسۆس و کامبیزی بەرەو ئێران رەوانە کرد و خۆیشی لەگەڵ لەشکر بە رووباری ئاراکس‌دا پەڕییەوە.

[٢٠٩] وەختێک لە چۆمی ئاراکس پەڕینەوە و شەو داهات، کوروش لە خاکی وڵاتی ماساغێتی‌یەکان‌دا نووست و خەونێکی بینی. ئەو لە خەونەکەیدا بینی کە لەسەر شانەکانی کوڕە گەورەی گشتاسپ[2] دوو باڵ هاتوونەدەر. یەک لە باڵەکان سایەی خستۆتە سەر ئاسیا و ئەوەی‌تریش ئوروپای داگرتووە. گشتاسپ کوڕی ئەرسام لە وەچە و نیژادی هیخامەنیشی بوو. کوڕی گەورەی ناوبراو ناوی داریوش و نیزیک بە بیست ساڵان بوو.[3] ئەو کوڕە لە وڵاتی پێرسیا (پارس) مابۆوە، چونکە نەگەیشتبووە تەمەنی لەشکرکێشی. کاتێک کوروش لە خەو هەستا، هەوڵی‌دا لە لێکدانەوەی خەونەکەی حاڵی بێ. ناوبراو خەونەکەی بەلاوە زۆر گرینگ بوو. بانگی گشتاسپی کرد کە بەتەنیا بێتە لای و پێی‌گوت: "گشتاسپ! کوڕەکەت چاوی لە مەرگی من و تاج و تەختەکەمە و بۆت باس دەکەم کە بۆچی

١- بەپێی نەریت، پاشا بەر لە دەسپێکی لەشکرکێشی، جێنشینی بۆخۆی دیاری دەکرد.

٢- گشتاسپ، باوکی داریوشی یەکەم.

٣- گزنفۆن لە کتێبی " پەروەردەی کوروش، پاراگرافەکانی ١،٢،١٣"دا دەڵێ پارسەکان تا نەگەنە تەمەنی ٢٥ ساڵی، ناچنە نێو ریزەکانی دپای نیزامی.

لەو بارەوە دڵنیام. خواکان لەمەر قەومانی هەر رووداوێکدا کە قەرارە بقەومێ، پارێزگاریمان لێدەکەن و ئاگادارمان دەکەنەوە. دوێنێ شەو خەونم بینی کە کوڕی گەورەی تۆ، دوو باڵی لەسەر شانەکانی رواون. یەکیان سایەی خستبۆ سەر ئاسیا و ئەوەیتریش بەسەر ئوروپادا سەیتەرەی هەبوو. هیچکەس ناتوانێ ئەو خەونە بەشێوەیەکی جیاواز و دوور لە راستی لێکداتەوە، واتە کوڕی تۆ چاوی تەماعی لە تاج و تەختی من نەبێ. ئێستا بڕۆ و بگەڕێوە بۆ وڵاتی پارس و هەرچی خێراتر ئاگات لە وەزعەکە بێ، منیش هەرکە لەو لەشکرکێشییە نەجاتیم هات، بە پەلە دەگەڕێمەوە ئەوێ. دەبێ کوڕەکەت بێنییە لای من، بۆوەی هەڵیسەنگێنم ".

[۲۱۰] کوروش ئەو قسانەی کرد، چونکە لەو باوەڕەدا بوو کە داریوش قەست و نییەتی خەراپی لە مێشک دایە. لەحاڵێکدا خواوەند چارەنووسی ئەوی وەها دیاریکردبوو کە لەو جێگایەدا بکوژرێ کە ئێستا گرتوویەتی و پاشایەتییەکەی بکەوێتە دەست داریوش. گشتاسپ لە وڵامی کوروشدا گوتی: "پاشاکەم! هیوادارم هیچ تاکێکی پارس لە گۆڕێدا نەبێ کە مەترسی بۆ سەر دەسەڵاتی جەنابت بخوڵقێنێ، ئەگەریش کەسێکی ئەوتۆ هەبێ، هیوادارم هەرچی زووتر لەنێو بچێ. تۆ پارسەکانت لە کۆیلەتی نەجاتدا. ئێستا لەجیات ئەوەی خەڵکانیتر حوکمڕانیان بەسەردا بکەن، ئەوان خۆیان بوونەتە فەرمانڕەوای گەلانیتر. ئەگەر خەونەکە بەو مانایەیە کە کوڕەکەی من دژی جەنابت خەریکی شۆڕش و سەرهەڵدانە، من خۆم ئەو کوڕە دێنم و دەیدەمە دەست جەنابت و چی حەزدەکەی، لێیبکە ". گشتاسپ ئەو قسانەی کرد و لە چۆمی ئاراکس پەڕییەوە، بەو قەرارەی کە هەرکات بگاتەوە وڵاتی پارس، خێرا هەڵسوکەوتی داریوشی کوڕی خۆی بخاتە ژێر چاوەدێری.

[۲۱۱] کوروش، ئەویش رێگای رۆژێک دوور لە چۆمەوە پێشڕەوی کرد. ناوبراو بەو شێوەیە جولایەوە کە کریسۆس پێشنیاری پێکردبوو. دواتر، بەوەجترین قیسمی لەشکری هەڵگرت و بەرەو چۆم گەڕایەوە و ژمارەیەکی کەمیش لە هێزەکانی لە ئۆردوگادا بەجێهێشت. ئەوساکە ماساغێتییەکان بە

یەک لە سێی هێزەکانی خۆیان پەلاماری ئۆردوگایاندا و شەڕکەرانی کوروش کە خەریکی بەرگری لە خۆیان بوون، بەخڕی کوشتیانن. کاتێک ماساغێتی‌یەکان بەسەر دوژمندا زاڵبوون و چاویان بەو ئامادەکارییە کەوت، بەپانەوە روویان لە خواردن کرد و شەڕابیان نۆشی و خەویان لێکەوت. لەپڕێکا لەشکری پارس بەسەریان وەربوون و ژمارەیەکی زۆریان لەو هێزە خەوتووە کوشت و بەدیل گرت. لەو نێوەدا فەرماندەی ماساغێتی‌یەکان بەناوی سپارغاپیس کە کوڕی خاتوو تۆمیریس بوو، بە دیل گیرا.

**[٢١٢]** تۆمیریس وەختێک خەبەری پێگەیی کە چ بەسەر لەشکر و کوڕەکەی هاتووە، راسپاردەی ناردە لای کوروش و پێیگوت: "کوروشی خوێنخۆر! سەبارەت بەو رووداوە، شانازی بە سەرکەوتن مەکە، چونکە شەڕابت بەکارهێنا، ئەوەی تەنگەکانت پێ ئەستوور کردوە. ئێوە بە خواردنەوەی شەڕاب هزر و فام لە لەشتاندا دادەبەزێ و چی ناحەزە بەسەر زارتان دادێ. بە حیللە و بە یارمەتی ئەو دەرمانە کوڕی منتان لەداو خست، نەک بە شەڕێکی بەرامبەر و جوامێرانە لە مەیداندا. ئێستاش باشتر وایە کە گوێ لە ئامۆژگارییەکانی بەنرخی من بگری. هەرچەند یەک لە سێی لەشکرەکەمت لەنێو بردوە، داوادەکەم کوڕەکەم بنێرەوە لام و لە وڵاتەکەم دەرکەوە، بەبێ ئەوەی تووشی رووداوی ناخۆش بێی. ئەگەر بەقسەم نەکەی، سوێند بە خۆر، خوای ماساغێتی‌یەکان دەخۆم و بەڵێن بە گەورەی ئایینی میللەتەکم دەدەم کە خوێنت دەرخوارد بدەم، هەرچەند دەزانم تینوێتیت قەت ناشکێ".

**[٢١٣]** کوروش پەیامەکەی بەهێند وەرنەگرت. سپارغاپیس، کوڕی خاتوو تۆمیریس، ئەویش وەهۆش هاتەوە و لێی حاڵی بوو کە تووشی چ چارەنووسێک هاتووە. داوای لە کوروش کرد کە دەستبەندەکانی بکەنەوە. وەختێک دەستەکانی ئازاد بوون، لەجێوە خۆی کوشت.

[٢١٤] سپارغاپیس بەو چەشنە مرد. خاتوو تۆمیریس لەبەر ئەوەی کوروش داواکانی بەجێ نەگەیاند، تەواوی لەشکرەکەی بۆ شەڕ کۆکردەوە و بەرەو گۆڕەپانی شەڕچوو.

من لەو باوەڕەدام کە لەنێو گشت ئەو شەڕانەی لەنێوان بەربەرەکاندا قەوماون، ئەوەیان لە هەموویان توندتر بووە. دەگێڕنەوە کە لە سەرەتای شەڕدا دوو لایەن روبەڕوی یەکتر وێستان و دەستیان بە تیرهاوێژی کرد، پاشان لەبەر ئەوەی کە تیرەکانیان تەواو بوو، ئامبازی یەکتر بوون و شەڕی تاکەکەسی قەوما. شەڕی ئەو جارەیان بە نێزە و شمشێر بوو. ئەو جەنگە ماوەیەکی زۆری خایاند و هیچکەس حازر بە پاشەکشە نەبوو. لەکۆتاییدا ماساغێتییەکان سەرکەوتن. بەشی هەرەزۆری لەشکری پارس لەو مەیدانەدا تێداچوو و کوروش خۆیشی پاش بیست و نۆ ساڵ پاشایەتی کوژرا[١]. تۆمیریس داوای مەشکێکی پڕ لە خوێنی مرۆڤی کرد و خێرا بۆیان هێنا و ئەوجار داوای کرد تەرمی کوروشی بۆ بدۆزنەوە. کاتێک جەنازەی کوروش دیترایەوە، تۆمیریس سەری مەشکی خوێنی بە زاری ناوبراوەوە کرد و کەلاکەکەی ئازاردا و پاشان گوتی: "تۆ منت وێران کرد، هەرچەند زیندووم و براوەی شەڕ. تۆ کوڕەکەی منت بە حیلله کوشت، ئێستاش لەبەر ئەوەی هەڕەشەم لێکردبووی، ئیتر دەبێ تێروپڕ خوێنت دەرخوارد بدەم ".

سەبارەت بە مەرگی کوروش گەلیک رەوایەت هەیە،[٢] بەڵام من لەو باوەڕەدام کە ئەو بەسەرهاتە پتر لە راستی دەچێ.

---

١- کوروش ساڵی ٥٢٩ی پێش زایین لە وەرزی هاویندا کوژراوە. ئەگەر ناوبراو ٢٩ ساڵ پاشایەتی کردبێ، دەبێ لەکاتی رووخانی فەرمانڕەوایی ئاستیاگدا کە ساڵی ٥٥٠ی پێش زایین قەوماوە، ئەو پاشا بووبێ. ئەوەش دژایەتی هەیە لەگەڵ ئەو ئەفسانەیەی کە هێرۆدۆت باسی دەکا.

٢- مێژوونووس گزنفۆن، لە کتێبی پەروەردەی کوروشدا باسی مەرگی کوروش بەو شێوەیە دەکا. ئەو دەڵێ کە کوروش پاش ئەوەی کامبیزی کوڕی وەک جێنشینی خۆی دیاریکرد، ئەوجار کۆمەڵێک ئامۆژگاری دایە کوڕە و پێیگووت کە چۆن یاسا و رێساکانی فەرمانڕەوایی رەچاوبکا. پاشان باسی نەمری روحی ئینسان و چۆنییەتی ناشتنی تەرمی خۆی و شێوەی گۆڕەکەی بۆ کوڕە کردوە.

[٢١٥] ماساغێتی‌یەکان جلوبەرگی چەشنی سکیتی‌یەکان دەپۆشن و شێوەی ژیانیان وەک یەک دەچێ. ئەوانە سوارە و پیادە دەجەنگن و لەهەردوو شێوەی شارەزان. خاوەن تیروکەوان و نێزەن و عادەتیانە تەورێک بەدەستەوە بگرن و پێیدەگوترێ سەغاریس[1]. ئەو خەڵکە لە کاری مس و زێڕدا زۆر شارەزان. لە مس، سەرنێزە و تیر و تەور دروست دەکەن. خشروخاڵ، کۆچکەی سەر، کەمبەرە و بەرگەردنیان لە زێڕ سازکراوە. لەمەر ئەسپەکانیان، بەروانکەی (زرێی) ئەسپ بۆ پارێزگاری لە سینگ مس بووە و باقی کەرستەکانی‌تر وەک هەوسار و رێشمە و رەخت و بەرچاوکە بەزێڕ رازاونەوە.[2] ماساغێتی‌یەکان ئاسن و زێو بەکار ناهێنن، چونکە لە وڵاتەکەیان دەست ناکەوێ، بەڵام زێڕ و مس ئیجگار زۆرە.

[٢١٦] دابونەریتی ئەو خەڵکە بەو چەشنەیە: پیاو بۆی هەیە تەنیا یەک ژن بێنێ. بەڵام ژنەکانیان بەپانەوە بۆ کەلکی گشتییە. یۆنانییەکان لەو بارەوە دەڵێن، ئەوە نەریتی سکیتی‌یەکانە. دیارە سکیتی‌یەکان خۆیان ئەو دابە بەکار ناهێنن و تەنیا ماساغێتی‌یەکانن کە پاراستوویانە.

ئەگەر پیاوێکی ماساغێتی حەزی لە ژنێک بێ، هەگبەی چەرمی تیرەکانی بە لووتی فایتوونی ژنە هەڵداوەسێ[3] و ئەوسا بەبێ گرفت، تێکەڵاوی لەگەڵ ژنە دەکا. سنووری تەمەن لەگۆڕێدا نییە، بەڵام هەرکەسێک زۆر پیر ببێ، خزمەکانی ئەو کەسە کۆدەبنەوە و ناوبراو لەگەڵ ئاژەڵی دیکە دەکەنە قوربانی. گۆشتی قوربانی تێکەڵدەکەن و دەیبرژێنن و دوعا دەکەن. ئەو رێورەسمە خۆشترین کات لە ژیانی ئەو خەڵکە دایە. ئەگەر کەسێک بەهۆی نەخۆشی بمرێ، گۆشتەکەی ناخۆن، تەنیا بەخاکی دەسپێرن و گەلێک بۆی

---

١- تەوری دوو سەر.

٢- زرێی ماساغێتی، چەشنێک کەمەرەی پان بووە و تەواوی بەشی سەرووی لەشی تا ژێرهەنگڵ داپۆشیوە.

٣- ماساغێتی‌یەکان چەشنی سکیتی‌یەکان، خاوەن ماڵ و خانوو نەبوون و پتر لەنێو داشقە و فایتووندا دەژیان.

بەداخن و پێیانوایە مرۆڤێکی بێبەخت بووە چونکە نەگەیشتۆتە تەمەنی قوربانی.

ماساغێتی‌یەکان هەگیز کشتوکاڵ ناکەن، بەڵکوو تەنیا خەریکی ئاژەڵداری و خواردنی گۆشتی ماڵات و ماسیین. ماسی لە چۆمی ئاراکس راودەکەن و بەفراوانی دەست دەکەوێ. لەنێو خواکاندا، تەنیا خۆر دەپەرستن و ئەسپی بۆ دەکەنە قوربانی. ئەوان لەو باوەڕەدان کە بۆ خێراترین خوا، تووند ئاژۆترین ئاژەڵ دەکەنە قوربانی.

# کتێبی دووهەم

## ئێڤتێرپی، خواوەندی مۆسیقا

### وڵاتی میسر

**[١]** وەختێک کوروش مرد،[١] کامبیز لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت. کامبیز کوڕی کوروش و کساندان بوو. کساندان[٢] کچی فارناسپ[٣]، بەر لە کوروش مردبوو و ناوبراو زۆری بۆ بەپەرۆش بوو و لە سەراسەری وڵاتدا پرسەی راگەیاند. کامبیز کە کوڕی کوروش و لەو ژنە بوو، خەڵکانی یوونی[٤] و ئیئۆلی[٥] وەک کۆیلە و غوڵامی میراتی باوکی سەیردەکرد. ناوبراو بڕیاریدا لەشکرکێشی بکاتە سەر وڵاتی میسر و بۆ ئەو کارە جیا لە هێزەکانی خۆماڵی، سەربازانی یۆنانی ژێردەستی خۆیشی ئامادەی شەڕکرد.

---

١- کوروشی هیخامەنیشی هاوینی ٥٢٩ی پێش‌زایین مردوە.

٢- کساندان، ژنی کوروش و دایکی کەمبوجییە.

٣- یەک لە گەورەپیاوانی خانەدانی هیخامەنیشی.

٤- وڵاتی نێوان کەنداوی ئەزمیری ئەمڕۆ و مەندەلییە لە ئاسیای بچووکی سەردەمی باستان و شوێنی نیشتەجێیی یۆنانیانی کۆچبەر، کە بە وڵاتی یوونی ناسراوبوو.

٥- هەرێمێک لە ئاسیای بچووک کە هۆزی ئیئۆلی دوای راکردن لە یۆنان، چوونە ئەوێ و لێ نیشتەجێ بوون.

[٢] بەرلەوەی پسامیتیخۆس[١] حوکمڕانی وڵاتی میسر بکا، میسرییەکان لەو باوەڕەدا بوون کە کۆنترین خەڵکانی ئەو جیهانەن. کاتێک پسامیتیخۆس بوو بە پاشا، گەرەکی بوو بزانێ کە چ میللەتێک بەر لە خەڵکانیتر چاویان بە دنیا پشکوتووە. ئیتر لەو کاتەوە میسرییەکان هاتوونەتە سەر ئەو باوەڕە کە فریژییەکان[٢] پێش خەڵکانیتر بوونیان هەبووە و دوابەدوای ئەوان میسرییەکان هاتوونەتە گۆڕێ.

پسامیتیخۆس هەوڵێکی زۆریدا و گوێی لە گەلێک زانیاری گرت، بەڵام نەیتوانی بسەلمێنێ کام کۆمەڵە مرۆڤ سەرەتاییترە، ناچاربوو بەو شێوەیە گرفتەکە چارەسەر بکا. ناوبراو لەگۆترە دوو منالی تازە لە دایکبووی بێناو و نیشانی هەڵبژارد و دایە دەست کابرایەکی شوان، بۆوەی لەگەڵ مەڕەکانی بەخێویان بکات. پسامیتیخۆس زەختی لە شوانە کرد کە هیچکەس بۆی نییە لەلای منالەکان، تەنانەت یەک وشە قسە بکا. شوانەکە دەبوایە ئەو منالانە لەنێو هۆڵێکدا رابگرێ و نێوەنێوە چەند بزنێکیان دەباڵ بکا، بۆوەی شیری خواردنەوەیان هەبێ و برسی نەمێننەوە و بەردەوام پێیانڕابگا.

پسامیتیخۆس بۆیە ئەو بڕیارانەی دا، چونکە گەرەکی بوو بزانێ کە کاتێک منالەکان دەست لە بەکارهێنانی ئیما و ئیشارە و قیژاندن هەڵدەگرن و پێکەوە قسە دەکەن،گوێیان لێبگرێ. دوای ئەوەی دوو ساڵ گوزەرا و شوانە ئەرکی خۆی بەباشی جێبەجێکرد، رۆژێک درگای هۆڵەکەی کردەوە. منالەکان هەریەکە لە شوێنێک دەستیان لەبەر چۆک وەرهێنابوو، هەرکە چاویان بە شوانە کەوت خێرا بۆلای چوون و خۆیان لەبەرپێی هاویشت و هاواریان کرد: "ڤێکۆس". کابرای شوان وەختێک بۆ یەکەمجار گوێی لەو وشەیە بوو، بایخی پێنەدان. ئەو گشت رۆژێک سەردانی منالەکانی دەکرد، بۆوەی ئاگای لە بارودۆخی ژیانیان بێ. منالەکان بەردەوام وشەی "ڤێکۆس"یان دووپات دەکردەوە. شوانە چوو بۆ لای

---

١- پسامیتیخۆس، پاشای سای یا سائیس و مێمفیس، دامەزرێنەری شازدەهەمین زنجیرەی پاشایەتی میسری باستان لە ساڵی ٦٦٦ی پێش زایینداو رێکخەری هێزی نیزامی ئەو وڵاتە لە سەدەی حەوتی پێش زایین.

٢- وڵاتی فریژی لە نێوەندی ئاسیا بچووک و خاوەن شاری ناسراو و باستانی ترۆئا.

پاشا و حاڵ و وەزعی بۆ گێڕایەوە. پسامیتیخۆس دەستووری‌دا کە مناڵەکان بەرنە لای ئەو. کاتێک خۆی گوێی لەو وشەیە بوو، حوکمی کرد کە توێژەران سەرچاوەی ئەو وشەیە لە زمانەکاندا بدۆزنەوە. پاش توێژینەوە دەرکەوت کە فریژی‌یەکان بە نان دەڵێن: "ڤێکۆس".

دوای ئەو رونبوونەوەیە، میسرییەکان لە ئیدیعای خۆیان کە کۆنترین گەلن، پاشگەز بوونەوە. من رەوتی ئەو لێکۆڵینەوە و بەسەرهاتەم لە زمانی پیاوانی ئایینی پەرستگەی ئێفێستۆس[1] لە ناوچەی مێمفیس[2] بیست. هەڵبەت یۆنانییەکان باسی زۆر بۆچوونی نەگونجاو دەکەن، وەک ئەوەی کە پسامیتیخۆس زمانی کۆمەڵێک ژنی بڕیوە و مناڵانی ساوای لەبەر مەمکیان ناوە تا بێ‌شیر نەبن و گەورەیان بکەن.

[٢] وەختێک لەگەڵ کاهێنانی پەرستگەی ئێفێستۆس سەبارەت بە بەخێوکردنی ئەو کۆمەڵە مناڵە ساوایە قسەم کرد، زۆر زانیاری‌ترم دەسکەوت. لە ناوچەکانی ئیلیۆپۆلی[3] و تیڤا[4]، بە هەمان شێوە باسی ئەو رووداوە دەکەن. من بە ئەنقەست سەفەری ئەو دوو شارەم کرد، بۆوەی دڵنیا بم کە ئەو زانیارییانەی لە دەڤەری مێمفیس بیستوومە، لێرەش پشتراستیان دەکەنەوە یان نا، چونکە دەڵێن کاهێنانی ئیلیۆپۆلی، ناسراوترین و زاناترین کەسایەتی ئایینی میسرین. بەپێویستی نازانم باسی ئەوە بکەم کە سەبارەت بە خواکانیان چیم بیستووە و تەنیا ناوەکانیان دێنم و لەو باوەڕەدام کە گشت مرۆڤەکان باوەڕی وەک یەکیان هەیە. ئەوەندەش کە ناوی خواکان دێنم، تەنیا لەبەر ئەوەیە کە نووسینەکەم ناچارم دەکا.

[٤] سەبارەت بە بابەتە مرۆییەکان ، ئەوەندەی لە زمانی پیاوانی ئایینی بیستوومە، دەڵێن کە میسرییەکان یەکەم کەس بوونە ساڵی هەتاوی‌یان

---

١- خەڵکی هەر شارێک لەو سەردەمەدا خوای تایبەت بەخۆی هەبوو، بەچەشنێک کە خوای هەر شارێک جیا لە شارەکانی‌تر بوو. ئێفێستۆس خوای شاری مێمفیس بوو و ناوی میسری ئەو خوایە فتا بوو. یۆنانییەکان بە خوای ڤولکانی دەناسن، واتە خوای ئاگر و ئاسن.

٢- مێمفیس شاری خواوەند ئیفێستیۆس یا فتا.

٣- ئیلیۆپۆلی شاری خواوەند ئیلیۆ واتە خۆر.

٤- تیڤا شاری خواوەند ئامۆن.

دۆزیوەتەوە و وەرزەکانیان بەسەر دوازدە مانگدا بەشکردوە. ئەو زانایانە بۆیان باس کردم کە دوای روانین لە ئەستێرەکان، بەو ئاکامە گەیشتوون. من خۆم پێموایە کە رۆژژمێری میسرییەکان لە هی یۆنانییەکان دروستترە، چونکە یۆنانییەکان هەر بە دوو ساڵ جارێک، یەک مانگی لەلاوەڕا پێوە زیاددەکەن بۆوەی وەرزەکان لەگەڵ رەوتەکە سازگاربن. میسرییەکان بەپێچەوانەوە خاوەن دوازدە مانگی سی رۆژەن و لە کۆتایی هەر ساڵێکدا، پێنج رۆژی پێوە زیاد دەکەن و بەو شێوەیە بازنەی وەرزەکان بەردەوام وەک یەکە.[1] ئەو کۆمەڵە زانایە پێیان گووتم کە میسرییەکان بوون یەکەمجار دوازدە ناویان بۆ خواکان دیاری کرد و یۆنانییەکان لاسایی ئەوانیان کردوەتەوە[2] و هەوەها میسرییەکان بوون کە قوربانگە و پەیکەرە و پەرستگەیان پێشکەش بە خواکان کردوە و بۆ یەکەمجار شەمایلی ئاژەڵیان لەسەر بەرد هەڵکەندوە. سەبارەت بە زۆربەی ئەو زانیارییانە، کاهینەکان بە بەڵگەوە بۆچوونەکانی خۆیان وەڕاست دەگێرا.

زانایانی ئایینی هەروەها پێیانگووتم کە یەکەم پاشای میسر کەسێک بووە بەناوی مین[3]. لە سەردەمی ئەودا، جیا لە پارێزگای تیڤا[4]، سەرتاسەری وڵاتی میسر زەل و قۆپی بووە و لەو خاکەی کە ئێستا کەوتووەتە باکووری گۆلی

---

١- لەڕاستیدا ساڵی میسری بە قەیاسی نیوەرۆژێک کەمی هەبوو، میسرییەکان بەو گرفتەیان دەزانی، بەڵام خۆیان پێوە ماندوو نەدەکرد.

٢- سووکە جیاوازییەک لەنێوان خواکانی میسری و یۆنانیدا هەیە، بۆ وێنە خواوەند پۆسیدۆن کە یەکێک لە دوازدە خواکانی یۆنانی بووە، لەلای میسرییەکان نەناسراوە.

٣ - میسرییەکان لە باوەڕەدان کە خواکانی سەرەتایی، پاشاکانی میسری بوونە و مین وەک یەکەم خوا و پاشای میسری فەرمانڕەوایی ئەو وڵاتەی کردوە. پێش ئەو پاشایە میسر دووبەش بووە، واتە میسری خواروو و میسری سەروو، بەڵام لە سەردەمی میندا، ٥٠٠٠ ساڵ بەر لە زایین، ئەو وڵاتە یەکی گرتوە و ناوبراو پاشایەتی خۆی دامەزراندوە.

٤- شارێکی بەناوبانگی میسری باستانە. ئەمڕۆ وێرانەکانی ئەو شارە بەناوی کارناک و لۆکسۆر لە شوێنی خۆیان ماون.

میریس[١]، ئەو سەردمی لەوێرا بە مەودای حەوت ڕۆژ ڕێگای سەفەر بە دەریا و ڕووباردا، پیاو هیچ ویشکایی یا شتێکیتری لەسەر ئاو بەدینەدەکرد.[٢]

## سروشتی وڵاتی میسر

[٥] بە باوەڕی من، بۆچوونی زانایانی میسری سەبارەت بە وڵاتەکەیان تەواو دروستە. چونکە هەر کەسێکی خاوەن ڕوانین، بەبێ ئەوەی زانیارییەکی ئەوتۆی لەمەڕ میسر هەبێ، تەنیا بە دیتنی وڵاتەکە بۆی دەردەکەوێ کە ئەو بەشەی یۆنانییەکان بەگەمی سەفەری بۆ دەکەن، پارچە خاکێکە و خەڵاتی ڕووبارە و دواتر بە وڵاتەکە لکاوە. ئەو بەشەش کە لە سەررووی گۆلی میریس هەڵکەوتووە، پیاو بە ماوەی سێ ڕۆژی سەفەری دەتوانێ لە گۆلەوە بگاتە ڕووبار. کاهینەکان هیچ زانیارییان لەبارەی ئەو پانتاییەوە نەبوو. خاکی ئەو شوێنەش بەهەمان شێوەی باسم کرد، بەهۆی ئاوی ڕووبارەوە دروست بووە.

ئێستا تۆزێک سەبارەت بە چۆنییەتی خاکی میسر دەدوێم: سەرەتا دەبێ بڵێم کە ئەگەر کەسێک لە ڕێگای بەحرەوە مەودای ڕۆژ و دانێک لە ڕۆخەکانی دەریاوە دوورکەوێتەوە و شیشێکی ئاسن لە ئاو ڕۆبکا و هەڵیکێشێتەوە، قوڕی پێوەدێ و قوڵایی ئاو دەگاتە یازدە ئۆرغیس[٣]. ئەوە یەکەم بەڵگەیە کە پێماندەڵێ تەختی بن ئاو تا ئەو مەودایە خاکی قوڕە و لەڕاستیدا کەنارێکی ڕاکشاوە.

[٦] بەڵگەی دووهەم، مەودای سنوورەکانی ئاوی ئەو وڵاتەیە، واتە ئەو شوێنەی ئێمە پێمانوایە میسرە. درێژایی ئەو سنوورە لە کەنداوی

---

١- گۆلی میریس یا موریس، بەشێکی ئەو گۆلە باستانییە تا ئەمڕۆ ماوە و پێیدەگووترێ برکە ئەلکرون.

٢- مەبەست ئەو هەرێمەیە کە کەوتووەتە نێوان دەریای مەدیترانە و گۆلی میریس یا موریس.

٣- ئۆرغیس، پێوانەی درێژایی لە سەردەمی یۆنانی باستاندا، بەرابەری ٦ پێ یا ١ میتر و ٧٧٦ میلیمیتر بووە.

پلینتینیتی‌یەوە تا دەگاتە گۆلی سێرڤۆنیدا کە چیاکانی کاسیۆ[١] لەوێوە دەستپێدەکەن، سەرجەم دەبێتە دەبێتە شێست سخینۆس[٢]. بەشێک لە خەڵکی خاوەن زەوی، پێوانەی ئۆرغیس دەکاردەکەن، ئەوانەی نەختێک پتر خاکیان هەبێ لە ستادیۆ[٣] کەڵکوەردەگرن و کەسانێکیش خاوەن مڵکی زۆر بن بە فەرسەخی[٤] حیساب دەکەن و هەر فەرسەخێک بەرابەری سێ ستادیۆ دەبێ. هەر سێ سخینۆس دەبێتە شێست ستادیۆ و بەو چەشنە مەودای سەرجەمی سنوورەکانی وڵاتی میسر دەگاتە سێ هەزار و شەش سەد ستادیۆ.

[٧] کاتێک لە دەریاوە بەرەو ناوچەی ئیلیۆپۆلی[٥] دەچین و بەرەو نێوەندی خاکی میسر پێشڕەوی دەکەین، وڵاتی میسر پان و پۆڕتر دەبێ و خاکەکەی گۆڕ و قوڕ و زەلە. ئەگەر لە کەنارەوە بەرەو ئیلیۆپۆلی بڕۆین، ناچاردەبین مەودایەک بپێوین کە بەرابەری ڕێگای نێوان چیاکانی دوازدە خواوەند لە شاری ئاتێن تا پەرستگەی خواوەند دیا لە چیاکانی سەر بە هەرێمی پیسایە[٦]. بەبەراوردێکی خێرا، بۆمان دەردەکەوێ کە جیاوازی ئەو دوو مەودایە زۆر کەمە و لە پازدە ستادیۆ تێناپەڕێ. مەودای نێوان ئاتێن تا پیسا تەنیا پازدە ستادیۆ کەمتر لە هەزار و پێنج سەد ستادیۆیە. مەودای نێوان بەحر و شاری ئیلیۆپۆلی‌یش ڕاست هەزار و پێنج سەد ستادیۆ دەبێ.

[٨] لە شاری ئیلیۆپۆلی‌یەوە بەرەو نێوەندی وڵاتی میسر دەشتێکی ویشک و باریکە. لەلایەک زنجیرە چیای عەرەبستان لە باکوورەوە بەرەو باشوور

---

١- چیای کاسیۆ لە نیزیک شاری قەدیمی پلوز هەڵکەوتووە. هەڵبەت کێوێکیش هەر بەو ناوە لە سووریە هەیە بە ڕیزەچیای لوبنان لکاوە.

٢- سخینۆس، هەر یەک سخینۆس بەرابەری ٦٠ ستادیۆ و بە بەراوردی ئەمڕۆ دەبێتە ١٠ کیلۆمیتر و ٦٥٦ میتر.

٣- ستادیۆ بەرابەر بە ١٧٧ میتر و ٦ سانتی‌میتر.

٤- فەرسەخ، بەرابەری ٣٠ ستادیۆ یا ٥ کیلۆمیتر و ٣٢٨ میتر.

٥- شارێکی میسری باستان، پاشماوەی ئەو شارە، ئەمڕۆ لە نیزیک شاری قاهیرە بەرچاو دەکەون.

٦- شارێکی کۆنی یۆنانی باستان لە هەرێمی پیلۆپۆنیسۆس. خاوەن پەرستگەیەک و لە نیزیک چیای ئۆلیمپۆس بووە.

راکشاوە و بێ پسانەوە بەرەو بەحری ئێریترە[1] دەچێ. لەو ریزە چیایە کۆمەڵێک کانزای بەرد هەن کە خەڵک دوای دەرهێنان و پەرداخکردنیان بۆ دروست کردنی پیرامیدەکانی هەڵکەوتوو لە بیابانی مێمفیس کەڵکیان لێوەردەگرن. لەو شوێنە کە کانزاکانی لێیە، زنجیرەچیای عەرەبستان بوار دەگۆڕێ و ئەوجار بەرەو دەریای ئێریترە دەچێ.

وەک بزانم ئەو ریزە چیایە لە رۆژهەڵاتەوە بەرەو خۆرئاوا، خاوەن درێژترین مەودایە و رێگای دوو مانگی سەفەرییە و لەلای رۆژهەڵات بە دارستانی کوندۆر داپۆشراوە. ئەوە شێوەی هەڵکەوتەیی ئەو چیایە بوو. بەلای وڵاتی لیبیدا، ریزە چیایەکیتر دەستپێدەکا کە تەواو بەردەڵانە، پیرامیدەکان لەو نیزیکانە دامەزراون. ئەو ریزە چیایە بە خیز و لم داپۆشراوە و بوارەکەی چەشنی بواری ئەو بەشە لە چیای عەرەبستانە کە لە باشوور هەڵکەوتووە.

لە ئیلیۆپۆلییەوە بەرەو نێوەندی وڵات، لە هەڵسەنگاندن لەگەڵ باقی ناوچەکانیتری وڵاتی میسر، هەرێمێکی بەرفراوان بەرچاوناکەوێ. دوای چواردە رۆژ سەفەر بەسەر ئاوی رووباردا و بەپێچەوانەی رەوتی ئاو رۆیشتن، ئەوجار قەوارەی وڵاتی میسر بەرتەسک دەبێتەوە. ئەو دەشتە لەنێوان دوو ریزە چیا هەڵکەوتووە، بەپێی حیساباتی من لە تەسکترین نوختەی بەرینایییەکەیدا، واتە لە چیاکانی عەرەبستانەوە تا ریزە چیاکانی لیبی، نیزیک بە دوو سەد ستادیۆ دەبێ. لێرە بەو لاوە ئیتر، ئەو وڵاتە دووبارە بەربەرین دەبێتەوە.

**[٩]** ئەو وڵاتە بەو جۆرەیە: لە ناوچەی ئیلیۆپۆلییەوە تا دەڤەری تیڤا، گەمی ئاژۆتن بەپێچەوانەی رەوتی ئاو نۆ رۆژ دەخایێنێ و مەوداکەشی چوار هەزار و هەشت سەد و شێست ستادیۆ دەبێ، کە ئەوەش بەرابەری هەشتا و یەک سخینۆس. هەروەک پێشتریش باسم کرد، مەودای سنوورەکانی وڵاتی میسر بەرابەری سێ هەزار و شەش سەد ستادیۆ دەبێ. لە دەریاوە تا

[1]- هێرۆدۆت سەراسەری دەریای سوور و ئەقیانووسی هیند بەناوی دەریای ئێریترە دەناسێ.

ناوچەی تیڤا شەش هەزار و سەد و بیست ستادیۆ، دەمێنێتەوە هەزار و هەشت سەد ستادیۆ بۆ ئەو مەودایەی کە لەنێوان دەڤەری تیڤا و شاری ئێلیێفاندینی[1] هەڵکەوتووە.

[١٠] وەک زانایانی ئایینی بۆیان باسکردم و بۆ منیش روون بۆتەوە، گەورەترین بەشی ئەو وڵاتە، خاکێکە دوای پاشەکشە و رۆچوونی ئاوی لافاوەکانی رووباری نیل سازبووە. ئەو هەرێمەی کەوتووەتە سەرووی شاری مێمفیس و لەنێوان دوو ریزە کێودا جێیگرتووە، لەڕاستیدا کەنداو بووە و شێوەی ناوچەکانی دەوروبەری ئیلیۆ[2]، تێڤترانیا، ئێفێسۆس[3] و هەروەها دەشتی مێئاندرۆ[4] دەدا. هەڵبەت دروست نییە کە ناوچەکانی گەورە و بچووک پێکەوە هەڵسەنگێنم، چونکە ئەو چۆمانەی پێکهێنەری ئەو دەشت و دەڤەرانە بوونە، ناتوانن لەگەڵ هیچکام لەو پێنج لکەی رووباری نیل بەراورد بکرێن.

کۆمەڵێک چۆمیتریش هەن کە لەباری قەوارەوە بە گەورەیی رووباری نیل نین، هەرچەند ئاڵوگۆڕی بنەڕەتییان خوڵقاندوە. وەک چۆمی ئاخیلیئۆس[5] کە پاش پاراوکردنی ناوچەکانی ئاکارنانییا[6] دەڕژێتە نێو بەحر. ئەو چۆمە بووە هۆی لێکگرێدانی دورگەکانی ئێخینا[7] لەگەڵ باقی خاکی وڵات و دروست بوونی دەشتایی لەو هەرێمە.

---

١- ئاخر نوختەی سنووری میسر و سودان، ئەمڕۆ بە دورگەی ئەسوان ناسراوە.

٢- ناوی کۆنی شاری باستانی ترۆئا لە ئاسیای بچووک.

٣- بەندەری باستانی لە کەنارئاوەکانی ئاسیای بچووک.

٤- مێئاندرو هەروەها ناوی روبارێکە لە وڵاتی فریژیەوە سەرچاوەی گرتووە و وڵاتی لیدی لە هەرێمی کاری جیا کردوەتەوە و لە باکووری شاری ناسراوی میلیتوس رژاوەتە دەریای ئێژە. ئەمڕۆ ناسراوە بە میندێر.

٥- روبارێک کە لە ناوچەی ئاکارنانی، لە نێوەندی یۆنان، دەڕژێتە بەحری یوونی.

٦- ناوچەیەک لە نێوەندی یۆنان و لە کەنارئاوەکانی دەریای یوونییە. شاری ناسراوی ئارغۆس لەوێ بنیاتنراوە.

٧- کۆمەڵە دورگەی یۆنانی لە زارکی کەنداوی کورینتۆ.

[١١] له عەرەبستان، نەک زۆر دوور له وڵاتی میسر، کەنداوێکی بەحری[1] هەیه، ئەویش له بەحری ئێریترەی[2] ناسراوەوه سەرچاوه دەگرێ و دێته نێو ویشکایی خاکەوه. ئەو کەنداوه درێژ و باریکه و ئێستا باسی لەسەر دەکەم. ئەگەر کەسێک به باری درێژایی کەنداودا گەمی پاڕوودار لێخوڕێ، بۆوەی بگاته بەحری ئازاد، چل ڕۆژی پێدەچێت. پەڕینەوه بەباری بەرینابیدا و له شوێنی هەره پانی ئەو کەنداوه، تەنیا یەک ڕۆژی سەفەری گەرەکه. لەو کەنداوه گشت ڕۆژێک هەڵکشان و داکشانی ئاو بەرچاو دەکەوێ. به باوەڕی من وڵاتی میسر پێشتر کەنداوێکی لەو چەشنه بووه. ئەو کەنداوه له دەریای باکوورەوه[3] بەرەو نێوەندی خاکی ئەتیۆپیا پێشوەچووه، لەولاشەوه کەنداوی عەرەبستان له بەحری باشوورەوه ڕوو له وڵاتی سووریا هاتووەته خوارەوه و هەردوو کەنداو به مەودایەکی زۆر کەم، له تەنیشت هەڤدوو جێیان‌گرتوه و تەنیا باریکاییەکی خاک لەیەکتری جیا کردونەوه. ئەگەر ئاوای دابنێین که ڕۆژێک ڕووباری نیل بەهەڵکەوت بوار بگۆڕێ و بڕژێته کەنداوی عەرەبستان، چ شتێک پێشی پێدەگرێ که له ماوەی بیست هەزار ساڵدا، ئەو کەنداوه پڕ ئاو نەکا! من لەسەر ئەو باوەڕم که ڕەنگه تەنیا ده هەزار ساڵی گەرەک بێ بۆوەی پڕی ئاوی بکا. کەوابوو چۆن مومکین دەبێ که هەزاران ساڵ بەر له دایکبوونی من، کەنداوێک که مەزنتر له کەنداوی عەرەبستانه، بەهۆی چۆمێکی گەورەی وەک نیل پڕ نەبووبێتەوه!

[١٢] من خۆم لەو باوەڕەدام زانیاری پیاوانی ئایینی سەبارەت به وڵاتی میسر تەواو دروستن. بۆم دەرکەوت که خاکی وڵاتی میسر به بەراوردکردن لەگەڵ دراوسێکانی قەراخ بەحر، بەرزتره. من به چاوی خۆم سەدەفی بەحریم لەسەر بەرزاییەکان بینیوه و خاکەکەشی سوێره، به چەشنێک که زیانی به پیرامیدەکانیش گەیاندوه، من ئەوەشم دیت که تەنیا چیای میسر،

---

١- مەبەست دەریای ئەحمەره.

٢- دەریای ئێریتره له سەردەمی کۆندا، به ئاوەکانی دەریای ئەحمەر و ئەقیانووسی هیند دەگووترا.

٣- دەریای باکوور لێره، هەمان دەریای مەدیترانەیه.

واتە ئەو کێوەی کە لە سەرووی شاری مێمفیس هەڵکەوتووە، لە خیز و لم دروست بووە. هەڵبەت خاکی ئەو شوێنە تەنانەت وەک خاکی عەرەبستان و لیبی و سووریاش ناچێ کە جیرانی ئەو وڵاتەن. (مەبەستم ناوچەکانی دوور دەستی عەرەبستانە کە خەڵکی سووری لێنیشتەجێن). چونکە خاکەکەی رەشە و بۆ سواغ دەبێ و چەشنی قوڕە و چۆمی نیل لە وڵاتی ئەتیۆپیاوە هێناویەتی. ئەوەشمان لێڕوونە کە خاکی لیبی، خیزەڵان و قوڕە سوورە، لە حاڵێکدا خاکی سووریا پتر بەردەڵان و گڵی سوورە.

[١٣] کاهێنەکان بە مەبەستی تەواو و کامڵکردنی زانیارییەکان، باسی ئەوەشیان بۆ کردم کە وڵاتی میسر چۆن دروست بووە. لە سەردەمی پاشایەتی میریسدا[١]، میسری ژوورو لە ناوچەی مێمفیس بەولاوە ئاودێری دەکرا و ئاوی رووبار لانیکەم هەشت پیخیس[٢] هەڵدەستا. کاتێک کاهێنەکان ئەو زانیارییەیان بۆ من باسکرد نۆسەد ساڵ بەسەر مەرگی میریسدا تێنەپەڕیبوو. ئێستا بەڵام، پلەی ئاوی چۆم تا ئەو رادەیە دابەزیوە کە ئەگەر پازدە شازدە پیخیس هەڵنەستێ، ئاودێری کێڵگەکان ناکرێ. ئەگەر رووبەری خاک بەردەوام بەرزبێتەوە و پلەی ئاو داکشی و کێڵگەکان لە چۆم دوور بکەونەوە، ئەوە بەو مانایە دەبێ کە رووباری نیل ئیتر لافاو دروست ناکات. ئەو میسرییانەی لە خوارووی گۆلی میریس دەژین یا خەڵکی شوێنەکانیتری نیشتەجێ لە دێلتا، وەک خۆیان دەڵێن، چاوەڕوانی چارەنووسی چەشنی یۆنانییەکان دەکەن و بەدائیم گرفتی بێ ئاوییان دەبێ. ئەوان وەختێک زانیان کە سەرتاسەری خاکی وڵاتی یۆنان لە جیاتِ ئاوی چۆم، بەهۆی باران پاراو دەبێ، گووتیان کە رۆژێک دادێ یۆنانییەکان گەلێک ناهومێد بن و ئەگەر باران نەباری لەبەر تینوێتی تووشی ئازار کێشان دەبن. ئەو گووتەیە بەو مانایە بوو کە ئەگەر رۆژێک خواوەند گەرەکی نەبێ بارانیان بۆ ببارێنێ و

---

١- میریس یا گووتەی ئەمڕۆ موریس، کۆنترین پاشای میسری لەنێوان ساڵەکانی ١٧٣٦ تا ١٧٢٦ی پێشزایین لەو وڵاتە پاشایەتی کردوە و کۆمەڵێک بەرهەمی لەدوای خۆی جێهێشتووە. گرینگترینی ئەوانە گۆلی موریسە کە بەناوی ئەوەوە دەناسرێ.

٢- هەر یەک پیخیس یا ئانیشک، ٤٤.٤ سانتیمیتر یا ٤٤٤ میلیمیتر.

ویشکه ساڵی دابێت، ئەو وەختە یۆنانییەکان لەبەر بێ ئاوی دەخنکێن و جیا لەو بارانەی خواوەند دیا بۆیان دەنێرێ سەرچاوەیەکیتریان نییە.

[١٤] بۆچوونی میسرییەکان سەبارەت بە یۆنانییەکان دروستە. دیارە ئێستا نۆرەی منە کە باسی رەوشی میسرییەکان بکەم. ئەگەر، وەک پێشتریش قسەم لەسەر کردوە، میسری خواروو لە ناوچەی مێمفیسڕا تا دەگاتە دەریا (چونکە ئەو بەشەی وڵات بەرەو زیادبوون دەچێ) بەردەوام و لە درێژماوەدا بەرز بێتەوە، ئایا دانیشتووانی ئەوێ لە داهاتوودا تووشی برسێتی نایەن، لەبەر ئەوەی قەت بارانی لێ نابارێ و رووباریش ناتوانێ کێڵگەکانیان پاراو بکات؟ دانیشتووانی ناوچەی دێلتا راحەتتر لە خەڵکانیتر تەنانەت لە میسرییەکانیش کێڵگەکانیان دادەچێنن. ئەوانە خۆیان ماندوو ناکەن و پێویستییان بە جووت و گا و دێراو و کەردوو نییە و تەنانەت روخساری زەویش داناروشکێنن بۆوەی دەغڵ و دان بچێنن. وەختێک چۆم سەربەخۆ مەزراکانیان پاراو دەکات و پاشەکشە دەکات، هەر کەس لەبەر خۆیەوە تۆوی گەنم دەپرژێنێ و پاشان رەوەی بەرازەکانیان بەنێو کێڵگەدا دەگێڕن، بۆوەی پێ لە تۆوەکان بنێن و وەژێر قوڕیان بدەن. دوای ئەو کارە چاوەڕوانی شین بوونی زراعەت دەکەن و کاتێک گەنم پێگەیی، بە یارمەتی ئەو بەرازانە خەرمان گێرەدەکەن.

[١٥] ئەگەر ئێمە بۆچوونی یوونییەکان سەبارەت بە میسر قبوڵبکەین، دەتوانین بڵێین کە ئەو نەتەوەیە خاوەن هیچ وڵاتێک لە رابردوودا نەبووە. یوونییەکان دەڵێن قەوارەی وڵاتی میسر تەنیا سێ گۆشەیەکە و بەس (دێلتا). سنوورەکانی ئاویی میسر بەباوەڕی یوونییەکان لە شوێنێکەوە بەناوی سکۆپیا سەربە ناوچەی پێرسێئا دەستپێدەکا و دەگاتە کانزای خوێی پیلووسییەکان[١] و مەودای چل سخینۆسە[٢]. ئەوان هەروەها دەڵێن خاکی میسر لە دەریاوە بەرەو

---

١- ناوچەیەک لەسەر سنووری نێوان میسر و ئاسیا و گەورەترین نێوەندی نیزامی وڵاتی میسری لێبووە.

٢- پێوانەی مەودا لە یۆنانی باستان و بەرابەری ٦٠ ستادیۆ یا ١٠ کیلۆمیتر و ٦٥٧ میتر بووە.

قوڵایی وڵات دەگاتە شاری کیرکاسۆرۆ، واتە ئەو شوێنەی رووباری نیل دووبەش دەبێ. لەکێکی ئەو چۆمە بەرەو پیلووسیۆس دەچێ و ئەوەیتریش بەرەو کانوڤۆ[1]. ئەوان ئەوەشی پێوە زیاددەکەن کە باقی خاکی میسر یا ملکی ئەفریقایە، یا بەشێکە لە عەرەبستان. دیارە میسرییەکان خۆیان لەو باوەڕەدان و بەلای منیشەوە دروستە کە ناوچەی سێ گۆشەی دێلتا وەک پاشماوەی خاکیی دوای سێلاوە و لەمێژ نییە دروست بووە. دەکرێ بلێم ئەو دەڤەرە دەسکردی ئاوەکانە. میسرییەکان سەردەمێک، هیچ شوێنێکیان بۆ نیشتەجێ بوون نەبووە، کەوابوو بۆچی شانازی بەو بۆچوونە بکەن کە یەکەم دانیشتووانی سەر بیچمی زەوی بوونە. بە باوەڕی من نەدەبوایە تاقیکاری لەو چەشنەش لەسەر منالەکان کرابا، ئەویش تەنیا بۆوەی بزانن کام زمان یەکەمجار قسەی پێکراوە. یوونییەکان دەلێن کە میسرییەکان راست لە کاتی دروستبوونی هەرێمی سێ گۆشەی دێلتا وەدیارکەوتوون، بەلام من خۆم پێموانییە کە راست لەو سەردەمەوە بووبێ. بە باوەڕی من لەو کاتەوە کە نەسل و نیژادی مرۆڤەکان دروست بووە، ئەوانەش هەبوونە. کاتێک وڵاتەکەیان گەشەی سەندوە و گەورە بووە، بەشی زۆری خەلک لەوێ ماونەوە و ژمارەیەکیش بەقەراخ چۆمدا بەرەو دەریا داگەڕاون. لە سەردەمی دێرین (باستان)دا تەنیا بە هەرێمی تیڤا گوتراوە وڵاتی میسر و مەودای سنوورەکانیشی شەش هەزار و سێسەد و بیست ستادیۆ[2] بووە.

[١٦] ئەگەر لێکدانەوەکانم بەجێبن، ئەو کاتە ئەوەی یوونییەکان لەمەر وڵاتی میسر گوتوویانە دروست نییە. ئەگەریش یوونییەکان خاوەن بۆچوونی راست بن، ئەو وەختە من دەتوانم بیسەلمێنم کە یوونییەکان و یۆنانییەکان لەمەر دابەشکردنی بیچمی زەوی بەسەر سێ بەشدا واتە ئورووپا و ئاسیا و لیبی(ئەفریقا) هەلەیە. چونکە پێویستە بەشی چوارەمیش، واتە

١- کانوڤۆ، کانوپ، یەکێک لە شارەکانی میسری باستان و لە رۆژئاوای رێژاوگەی روباری نیلە، ئەمرۆ ناسراوە بە ئەبووخەیر. لکێکی چۆمی نیل لەنیزیک ئەو شارە دەرژێتە دەریای مەدیترانە و قەدیم بەناوی شارەکە و لکی کانوڤۆ ناسراو بوو.

٢- پێوانەی مەودا لە سەردەمی یۆنانی باستاندا، بەرابەری ١٧٧ میتر و ٦ سانتیمیتر.

دێلتای میسر بەو سێ بەشەوە زیادبکرێت، هەڵبەت ئەگەر ئەو قیسمە سەر بە لیبی یا ئاسیا نەبێ. بەپێی ئەو بەراوردانە، رووباری نیل نابێتە سنووری نێوان ئاسیا و لیبی(ئەفریقا)، چونکە ئەو رووبارە لە گۆشەی ژووری دێلتادا بەسەر کۆمەڵێک لکی‌تردا بەش دەبێ و سێ گۆشەکە لە باوەش دەگرێ و بەو چەشنە دێلتا دەکەوێتە نێوان ئاسیا و ئەفریقا.

**[١٧]** ئەوانە کۆمەڵێک زانیاری بوون کە یوونی‌یەکان و میسرییەکان باسیان لەسەرکردوە. ئێمە خۆمان لەو باوەڕەداین میسر ئەو وڵاتەیە کە خودی میسرییەکان لە سەرتاسەری خاکەکەیدا نیشتەجێن. وەک وڵاتی کیلیکیا کە تەنیا خەڵکی کیلیکی لێدەژین یا ئاسیریا (ئاشوور) کە خاوەن جەماوەری ئاشووری‌یە.

ئێمە هەروەها بەو قەناعەتە گەیشتین کە لەنێوان ئاسیا و لیبی‌دا، سنوورێک نییە، جیا لە سنووری وڵاتی میسر. ئەگەر بۆچوونی یۆنانییەکان پەسند بکەین، ئەو کاتە دەبێ بڵێین تەواوی خاکی میسر کە لە تاڤگەکانی هەرێمی ئێلێفاندینی‌یەوە[١] دەستپێدەکات و بەسەر دوو هەرێمدا بەش دەبێ. بەشێکیان کەوتووەتە لیبی و ئەوەی‌تریش لە ئاسیا جێی‌گرتووە و هەردوو بەش خاوەن ناوی جیاوازن. چۆمی نیل وڵاتی میسر لە ناوچەی تاڤگەکان دوو لەت دەکا و بەرەو دەریا دەچێ. رووباری نیل تا شاری کێرکاسۆرۆ خاوەن یەک بەستەر یا مەرخە، لێرە بەولاوە بەسەر سێ لکدا بەش دەبێ. یەکەمیان بەرەو خۆرهەڵات و پێیدەگووترێ پیلۆسیۆس، ئەوەیتر بەرەو خۆرئاوا دەچێ و ناسراوە بە کانۆڤیکۆ. لکی سێهەم بەو چەشنە دەستپێدەکا. ئەوەیان لکی ئەسڵی و گەورەی رووباری نیلە و بە میسری ژوورودا دەربازدەبێ و دەگاتە گۆشەی سەرووی دێلتا و ئەو گۆشەیە دوولەت دەکا و پاشان دەرژێتە نێو بەحر. ئەو لکەیان لەبابەت ئاو و ناسراوی کەمتر لە

---

١- ئێلێفاندین، ئاخر نوختەی سنووری میسر و سودان، ئەمڕۆ بە دورگەی ئەسوان ناسراوە و خاوەن کۆمەڵێک تاڤگەیە.

دووانەکەی‌تر نییە و پێیدەگووترێ سێوێن‌نیتۆ[1]. دوو لکی‌تریش لە سێوێن‌نیتۆ جیادەبنەوە و پاشان دەڕژێنە نێو بەحر. یەکەمیان پێیدەگووترێ سایتیکۆ[2] و ئەوەیتریش مێندیسیۆ[3]. لکەکانی‌تر وەک ڤۆلڤی‌تینۆ[4] و ڤوکۆلیکۆ بەشێوەی سروشتی پێکنەهاتوون و دەستکردن.

[١٨] بەڵگەیەک کە دەتوانم بۆ راستی زانیارییەکانم لەمەر گەورەیی و پانوپۆڕی وڵاتی میسر بیخەمە روو و دواتر دەستم کەوت، قسە و بۆچوونی کاهێنانی نێوەندی ئایینی ئامۆنۆسە[5]. دانیشتووانی شارەکانی ماریێئا و ئاپیس کە لە خاکی میسر و دراوسێیەتی ئەفریقا دەژین، خۆیان پتر بە ئەفریقایی دەزانن تا میسری. ئەوانە لەبەر ئەوەی حەزیان‌نەدەکرد خواردنی گۆشتی کەڵ و گایان لێ یاساغ بکرێ و نەریتی قوربانی‌کردن بەلایانەوە دژواربوو، بۆیە کۆمەڵێک راسپاردەیان نارده مەعبەدی ئامۆنۆس. ئەو راسپاردانە بە کاهێنانی مەعبەدی ئامۆنۆس‌یان راگەیاند کە دانیشتووانی ماریێئا و ئاپیس[6] خاوەن هیچ چەشنە نەریتێکی هاوبەش لەگەڵ میسرییەکان نین. ئەوان هەروەها گووتیان کە خەڵکەکەیان لە دەرەوەی دێلتا دەژی و ژمانی ئەوان جیا لە زمانی میسرییەکانە و بۆیە داوادەکەن خواوەند ئیزنیان پێبدا گۆشتی کەڵ و گا بخۆن. خواوەندی نێوەندی ئامۆنۆس ئیزنی پێ نەدان چۆنی گەرەکیانە هەڵسوکەوت بکەن. خواوەند ئامۆژگاری کردن کە وڵاتی میسر تەواوی ئەو خاکە دەگرێتەوە کە بەهۆی ئاوی رووباری نیل پاراو

---

١- سێوێن‌نیتۆ، ناوی شارێکی باستانی میسریشە کە لە کەنار ڕێژاوگەی ئەو چۆمە دروستکراوە.

٢- شارێکی باستانی میسر و لە سەردەمی کۆندا پێتەختی یەکێک لە زنجیرە پاشاییەکانی میسریش بە هەمان ناو بووە.

٣- ناوی شارێکی باستانی میسریشە و لە ناوچەی ڕێژاوگەی چۆمی نیل لە رۆژئاوا هەڵکەوتووە، واتە لەو جێگایەی رووبار تێکەڵ بە دەریا دەبێتەوە.

٤- هەروەها شارێک لەسەر ئەو چۆمە و بە هەمان ناو، ئەمڕۆ ناسراوە بە رۆزێت.

٥- ئیلاهە ئامۆنۆس یا ئامۆن، مەزهەر و سیمبۆلی خۆر، خاوەن روخساری کەڵ و دوو شاخی گەورە بووە و لە شاری تیڤا و شارەکانی‌تری میسری کۆندا کەڵکی لێوەرگیراوە.

٦- شارێکی ناسراوی میسری کۆن و شوێنی پەرستنی ئوسیریس و ئاپیس و خاوەن زیارەتگەیەکی مەزن بووە.

دەبێ. وڵاتی میسر بەو شوێنانە دەگووترێ کە لە شاری ئێلێفاندینی‌یەوە بەرەو خوارەوە دەست پێدەکات و خەڵکەکە ئاوی رووباری نیل دەخۆنەوە. ئەوە وڵامی نێوەندی ئامۆنۆس بە راسپاردەکان بوو.

[١٩] وەختێک رووباری نیل هەڵدەستێ، تەنیا خاکی هەرێمی دێلتا وەبەر لافاو نادات بەڵکوو ئەو دەڤەرانەش دەگرێتەوە کە سەر بە لیبی(ئەفریقا) و عەرەبستانن و مەودای پتر یا کەمتر لە دوو رۆژ رێگای سەفەری وەبەرخۆی دەدا. سەبارەت بە دیاردەی لافاو و هەستانی ئاوی رووباری نیل زانیارییەکی فرەم دەست نەکەوت. نە لەلای پیاوانی ئایینی و نە لە زاری خەڵکەوە شتێکی ئەوتۆم نەبیست. من گەرەکم بوو بزانم کە بۆچی چۆمی نیل لە یەکەم رۆژی هاوینەوە هەڵدەستێ و ناوچەکانی دەوروبەر دادەگرێ و سەد رۆژی رێک بەردەوام دەبێ و کاتێک بەرەو کۆتاییەکانی ئەو وەرزە دەچێ، لەبەر خۆیەوە دەنیشێتەوە و تەنیا بوار و بەستەری ئەسڵی خۆی دەگرێتەوەبەر و هەروەها لە سەرتاسەری زستاندا کەم ئاوە و چاوەڕوانی هاتنی وەزی باران لە سەرەتای هاویندا دەکا. سەبارەت بەو دیاردەیە زانیارییەکی ئەوتۆم لەلای هیچ سەرچاوەیەکی میسری دەست نەکەوت. هەرچەند پرسیارم لێکردن کە هۆی چییە رووباری نیل بەپێچەوانەی گشت چۆمەکانی‌تر دەجوڵێتەوە. من گەرەکم بوو هۆیەکەی بزانم و بۆیە بەردەوام دەمپرسی. دیارە رووباری نیل تەنیا چۆمێکە جیا لە رووبارەکانی‌تر شنەبا و نەسیم دروست دەکا.

[٢٠] هێندێک لە یۆنانییەکان گەرەکیان بوو زیرەک و وشیار وەبەرچاو بێن و سەبارەت بە لافاوەکانی رووباری نیل سێ روونکردنەوەیان دایە دەست. دوو روونکردنەوەیان بۆ توێژینەوە نابن و من تەنیا دەیانخەمەڕوو. روونکردنەوەی یەکەم دەڵێ کە بایەکانی هاوینی[١] پێش بە چۆم دەگرن و ناهێڵن ئاوەکەی بەتەواوی بڕژێتە نێو دەریا، بۆیە لافاو دروست دەبێ. سەرەتا پێویستە ئەوە بڵێم کە گەلێک جار بایەکانی مەدیترانەیی بەردەوام نایەن، بەو حاڵەش رووباری نیل کاری خۆی هەر دەکا. یا ئەگەر بایەکانی

---

١- مەبەست لە بای شەماڵ لە هاوینی گەرمی میسرە.

مەدیترانەیی هۆی سەرەکین، ئەوکاتە دەبوایە چۆمەکانی‌تریش، واتە ئەوانەی بەپێچەوانەی رەوتی ئەو بایانەن، چەشنی رووباری نیل تووشی هەستان‌بن و بگرە زیادتریش، بەتایبەت کە ئاوی ئەو چۆمانە زۆر نییە و خوڕێنیش نین. کۆمەڵێک چۆم لە لیبی و سوریا هەن و هیچیان چەشنی رووباری نیل رووداوی ئەوتۆ ناخولقێنن.

[۲۱] روونکردنەوەی دووهەم لەوەی پێشوو کەم بایختر و سەیرترە و تەواو خەیاڵییە. دەڵێ هۆی لافاوەکانی نیل راستەوەخۆ دەگەڕێتەوە بۆ ئۆقیانووس کە زۆربەی رووبەری خاکی زەوینی داپۆشیوە و ئەو رووبارەش لەوێوە سەرچاوە دەگرێ.

[۲۲] سێهەم بۆچوون لە دووانەکەی پێشوو وێچووترە، هەرچەند لەگەڵ عەقڵ و لۆژیک ناتەبایە، چونکە زۆر هاسانە پیاو بڵێ ئاوی رووباری نیل بەرهەمی توانەوەی بەفری چیاکانە. ئێمە دەزانین کە رووباری نیل لە وڵاتی لیبی‌یەوە سەرچاوە دەگرێ و بە خاکی ئەتیۆپی‌دا دەرباز دەبێ . چۆن دەکرێ بەفر سەرچاوەی بنەڕەتی رووبارێک بێ کە لە گەرمترین شوێن دەست پێبکا و بێتە وڵاتێکی سارد. هەرکەس تۆزێک بیر لەو بۆچوونە بکاتەوە، بەو قەناعەتە دەگا کە بەفر سەرچاوەی ئاویی رووباری نیل نییە. یەکەم و بەوەجترین بەڵگەش بۆ دروستی ئەو بۆچوونە ئەوەیە کە بایەکانی لەو وڵاتەوە دێن، تەواو گەرمن. دووهەم بەڵگە ئەوەیە کە وڵاتی میسر خاوەن بەفر و باران نییە. لەهەر شوێنێک بەفر بکەوێ، پێویستە پێنج رۆژ پێشتر لەوێ باران باریبێ. بەو حیسابە ئەگەر قەرارە بەفر هەبێ، دەبێ بارانیش لە میسر باریبێ.

سێهەم بەڵگە ئەوەیە کە دانیشتووانی ئەو وڵاتانە لەبەر تەوژمی گەرما بەگشتی رەش، هەڵگەڕاون. پەلەوەری وەک سیسارک و پەڕەسلێرکە سەرتاسەری ساڵ لە میسر دەمێننەوە. مراوی‌یەکانی کۆچکردوو لەبەر سەرمای هەرێمی سکیتی‌یا دێن و لەو وڵاتە گەرمانە دەگیرسێنەوە. ئەگەر بەفر تەنانەت برێکی کەمیش لە میسر یا لەو وڵاتانە باریبا و رووباری

نیلیش لەو بەفرانەوە سەرچاوەی گرتبا، هیچکام لەو ڕووداوانەی باسم لێکردن، نەدەقەومان.

**[٢٣]** ئەو بۆچوونەی سەبارەت بە ئۆقیانووس هاتەگۆڕێ، پشت بە ڕەوایەتێکی نەناسراو دەبەستێ و هیچکەس ناتوانێ توێژینەوەی لەسەر بکا. من لانیکەم نەمتوانی دڵنیا بم و لە هیچ کەسێکیشم نەبیست کە ڕووباری ئۆقیانووسی هەیە. پێموایە ئۆمیرۆس یا کەسێک لە شاعیرانی قەدیمی ناوێکی لەو چەشنەی دۆزیبێتەوە و بۆ هۆنینەوەی هەڵبەستەکانی کەڵکی لێوەرگرتبێ.

**[٢٤]** لەبەر ئەوەی ئەو چەند بۆچوونەی سەرەوە بەلامەوە ڕاست نەبوون، ئێستا دەبێ ڕای خۆم سەبارەت بە گرفتێکی ئەوتۆ قوڵ دەرببڕم.

پێویستە بڵێم کە خۆر لە وەرزی زستاندا، لەبەر کەشوهەوای نالەبار و تۆفان بواری لێدەشێوێ و تەلاسا دەبێ و بەرەو نێوەندی لیبی (ئەفریقا) ڕادەکشێ. بەکورتی، ئەوە هۆی ڕاستەقینەی ئەو گرفتەیە. دیاردەیەکی گەلێک سروشتییە کە ئەو وڵاتەی نیزیکتر لەو خوایە بێ، پتر تینوو بێ و چۆمەکانیشی ویشک هەڵگەڕێن.

**[٢٥]** بۆوەی مەبەستەکەم باشتر ڕوون بێتەوە، ڕەوتی ڕووداوەکان بەو چەشنە بەیان دەکەم: خۆر وەختێک بە هەرێمی سەرووی لیبیدا (نێوەندی ئەفریقا) تێدەپەڕێ، ئەو کۆمەڵە ڕووداوە دەخوڵقێنێ: لەبەر ئەوەی هەوای ئەو هەرێمانە سەرتاسەری ساڵ گەرمە و ئاسمان ساف و بێگەردە و بای فێنک نایە، خۆر کاتێ تێپەڕین بە ئاسماندا هەمان کاریگەری دەبێ کە لە وەرزی هاویندا هەیەتی، واتە ئەو کاتەی لە تەشقی ئاسمان جێیگرتووە. بەو مانایە کە قەیاسێکی فرە لە ئاوی سەر زەوی چەشنی هەڵم بەرەو ئاسمان هەڵدەکشێ. کاتێک با و زریانەکان هەڵدەکەن، جێگۆڕکێ بەو تنۆکە ئاوانە دەکرێ و دڵۆپەکانی ئاو دروست دەبن. دیاردەیەکی سروشتییە کە ئەو بایانەی وەک بای شەماڵ و بای لیبی (باشووری ڕۆژئاوا) لە گشت بایەکانیتر پڕبارانتر بن. دیارە من خۆم لەو باوەڕەدا نیم ئەو قەیاسە ئاوەی کە خۆر لە چۆمی نیل وەریدەگرێ، بیکاتەوە باران و دووبارە بباریتەوە. من

پێموایە بەشێکی لای خۆی رادەگرێ. کاتێک وەرزی زستان بەرەو کۆتایی چوو، خۆر دەگەڕێتەوە تەشقی ئاسمان، ئەوەش راست ئەو کاتەیە کە ئاوی گشت رووبارەکانی بۆلای خۆی راکێشاوە و وەختێک بەو هەرێمانەدا تێدەپەڕێ، بارانەکان دەست پێدەکەن و چۆمەکان لافاو دەخولقێنن. بەپێچەوانەوە هەرکە هاوین داهات، باران لە کەمی دەدا و ئاوی چۆمەکان بەرەو خۆر هەڵدەکشێنەوە و هێزی لافاو و رووبار کەم دەبێتەوە. لەو نێوەدا رووباری نیل لەبەر ئەوەی کە بارانێک نییە و تێرئاو نابێ و تەنیا چۆمێکە لە وەرزی زستاندا ئاوەکەی بەهۆی کێشی خۆر رادەکێشرێ، بۆیەش دەبینین و زۆریش سروشتییە کە لە وەرزی زستاندا پتر لە هاوین تووشی کەم ئاوی بێت. بە واتایەک، وەختێک خۆر ئاوی گشت چۆمەکانی راکێشاوە، تەنیا رووباری نیلە کە خاوەن ئاوە. دەبێ بڵێم کە خۆر هۆی سەرەکی گشت ئەو کۆمەڵە ئاڵوگۆڕانەیە.

[٢٦] من هەروەها لەو باوەڕەش‌دام کە ویشکبوونی هەوای ئەو هەرێمانە پێوەندی بە خۆرەوە هەیە، چونکە تیشکەکانی بە هەناوی هەر شتێکدا تێپەڕێ، گەرمی دادێنێ. ئەوەش خۆی هۆیەکە کە لە نێوەندی لیبی بەردەوام وەرزی هاوینە. ئەگەر جێگای وەرزەکان و تایبەتمەندییەکانیان لە ئاسمان بگۆڕێن، واتە لەو شوێنەی ئێستا باکوورە و هەوا تووشە، باشوور و هاوین جێبگرێ، هەروەها لەو هەرێمانەش کە ئێستا باشوورە، باکوور نیشتەجێ بێ و رەوتی ئاڵوگۆڕەکان بەو چەشنە بەردەوام بن، خۆر ئەوکاتە بەهۆی باکوور و هاوین بواری لێدەشێوێ و بەسەر ئوروپادا دەرباز دەبێ، وەک ئێستا کە بەسەر هەرێمی سەرووی لیبی‌دا تێدەپەڕێ، دڵنیام چۆن لەگەڵ رووباری نیل جوڵاوەتەوە، بە هەمان شێوەش لەگەڵ چۆمی ئیسترۆ[1] هەڵسوکەوتی دەکرد.

[٢٧] بەڵام سەبارەت بەوە کە رووباری نیل بۆچی شنەبا ناخولقێنێ، بە باوەڕی من دیاردەیەکی سروشتییە کە لە وڵاتانی گەرمەسێروە هیچ پشوو و

---

١- ئەمرۆ چۆمی دانوب.

بایەک نەیە، چونکە نەسیم و شنەبا بەپێی عادەت لە شوێنی فێنکەوە سەرچاوەدەگرن.

[٢٨] ئەوە کۆمەڵێک لەمەر دیاردە و هۆیەکانیان بوون. سەبارەت بە سەرچاوەی ئاویی رووباری نیل، هیچکەس، تەنانەت خودی میسرییەکان، لیبییەکان و یۆنانییەکانیش کە من قسەم لەگەڵ کردن، زانیارییەکی ئەوتۆ جێگای باسیان پێنەبوو. تەنیا یەک کەس نەبێ، ئەویش حیسابداری پەرستگەی ئاتینا[١] کە خەزنەداری نێوەندی ئایینی شاری سای[٢] لە میسر بوو، هێندێک زانیاری پێدام. سەرەتا پێموابوو کە ئەو کابرایە گاڵتەم پێدەکا و من باوەڕم پێینەبوو، هەرچەند ناوبراو گووتی کە زانیاری بەنرخی لەلایە.

ئەو گووتی کە دوو چیا هەن و خاوەن دووندی تیژن و لەنێوان شاری سیئینی[٣] سەر بە ناوچەی تیڤا[٤] و شاری ئێلیفاندینی هەڵکەوتوون. ناوی چیاکان بریتییە لە کرۆفی و مۆفی. ئەو کابرایە پێیگووتم کە سەرچاوەی رووباری نیل کەوتوەتە دۆڵێکی قووڵ و هەڵدێر و لەنێوان ئەو دوو کێوەدا هەڵکەوتووە و نیوەی ئاوەکەی بەرەو میسر و باکوور دەچێ و ئەوەیتریش بەرەو ئەتیۆپیا و باشوور دەڕوا.

سەبارەت بەوە کە ئەو سەرچاوانە قووڵ و بێ بوارن، بەپێی زانیارییەکانی کابرای گۆرین، لەلایەن پاشای میسر، واتە پسامیتیخۆس هێندێک تاقیکاری بە ئەنجام گەیشتن. ئەو پاشایە دەستووریدا گوریسێک بهۆننەوە کە چەند هەزار ئۆرغیس[٥] درێژ بێ. پاشا خۆی ئەو گوریسەی لە ئاوەکەدا شۆڕ کردەوە و ئاخرەکەشی نەگەیشتە تەختی ژێر ئاو. ئەگەر قسەی ئەو کابرایە

---

١- خوای هونەرە جوانەکان لە سەردەمی باستاندا.

٢- شارێکی باستانی میسر و هەڵکەوتوو لەسەر رێژاوگەی رووباری نیل و پێتەختی پاشاکانی خانەدانی سائیس.

٣- شارێکی کۆنی میسری باستان، هەڵکەوتوو لە سەر سنووری نێوان سودان و میسر، ئەمڕۆ بەناوی ئەسوان ناسراوە.

٤- شارێک لە میسری ژوروو و بە ساڵان پێتەختی ئەو وڵاتە بووە.

٥- میترێک و ٧٧٦ میلیمیتر.

راست بێ، ئەوەندەی من بزانم، گێژاوی گەورە و رژدی و خوڕێنی ئاو نەیانهێشتوە تۆپەڵە ئاسنی سەری گوریس بگاتە تەختی عەرزی سەرچاوەکە.

[٢٩] زانیاری زیاتر لەوە کە لە سەرەوە باسم کرد، دەست نەکەوت. ڕێگای دوو رۆژانم پێوا، بۆوەی ئەو توێژینەوەیە بکەم و ئاخرەکەی گەیشتمە شاری ئێلیفاندینی. لەو شارەوە بەرەو ئەولاتر، وڵات پتر هەورازە و خەڵک ناچارە قایقەکان بە گوریس ببەستنەوە. ئەگەر گوریسەکان بپسێن، قایق دەکەوێتە بەر خوڕێنی بەهێزی ئاو. مەودای ڕێگا بۆ ئەو ناوچەیە، چوار رۆژی سەفەرییە. رەوتی رووباری نیل لەو دەڤەرە خواروپێچە و وەک چۆمی مێئاندرۆ دەچێ. ئەو مەودایەی کە پیاو ناچارە بەو شێوەیەی باسم کرد، بپێوێ، نیزیک بە دوازدە سخینۆس[1] دەبێ. پاشان دەگاتە دەشتێک کە لەوێ رووباری نیل دەوری دورگەیەک دەدا و پێیدەگووترێ ئاخۆمپسۆ. لە شاری ئێلیفاندینییەوە بەرەو سەرێ، خەڵکی ئەتیۆپیایی لێدەژین. ئەوانە خاوەن نیوەی دورگەکەن و لە بەشەکەیتریش میسریەکان نیشتەجێن. دوورتر لەو دورگەیە، گۆلێکی گەلێک مەزن وەبەرچاو دەکەوێ. لە قەراخەکانی ئەو گۆلە کۆمەڵێک هۆزی ئەتیۆپیایی بیاباننشین هەن. وەختێک پیاو لە گۆلەکە دەرباز دەبێ، دووبارە چاوی بە رووباری نیل دەکەوێتەوە کە دەڕژێتە نێو ئەو گۆلاوە. لێرە بەولاوە پیاو ناچارە لە گەمی دابەزێ و روو لە دەشتایی بکا و ماوەی چل رۆژ بە پێیان بڕوا. چونکە زۆر رەوەزی خاوەن دوند و بەردی تەپۆڵکەیی لەنێو رووبار هەن و لەوێدا چەقیون. ئەوجار، پاش ئەوەی پیاو بەو ناوچەیەدا تێپەڕی و چل رۆژی بەسەر چوو، دووبارە سواری گەمییەکی دیکە دەبێتەوە و دوای دوازدە رۆژ سەفەر دەگاتە شارێکی گەورە کە پێیدەگووترێ مێرۆئی[2]. دەگێڕنەوە کە ئەو شارە پێتەختی

---

١- سخینۆس بەرابەری ١٠ کیلۆمیتر و ٦٥٦ میتر.

٢- بەشێک لە وڵاتی ئەتیۆپیا، هەڵکەوتوو لە نێوان رووباری نیل و لکێکی ئەو رووبارە بەناوی ئاسترابۆرا.

گشت ئەتیۆپی‌یەکانە. خەڵکی ئەو شارە لە نێوان گشت خواکاندا، تەنیا دیا[1] و دیۆنیسۆس[2] دەپەرستن و ڕێزی تایبەتیان بۆ ئەوانە هەیە و پەرستگەیان بۆ خواوەند دیا دروست کردوە. ئەوانە کاتێک شەڕ دەکەن کە ئامۆژگاری و پێشگۆیی خواوەند دیایان بیستبێ، بەتایبەت ئەگەر گەرەکیان بێ دژی ئەو وڵاتەی کە قەرارە خۆی تێکێشن و پەلاماری بدەنێ.

[٣٠] ئەگەر کەسێک لەو شارەوە بە گەمی سەفەر بکا و مەودایەکی بەرابەری مەودای نێوان شارەکانی ئێلێفاندینی و پێتەختی ئەتیۆپی‌یەکان بپێوێ، ئەوسا دەگاتە وڵاتی ئافتۆمۆلی‌یەکان. ئافتۆمۆلی‌یەکان (ڕاکردو) لەڕاستیدا بەناوی ئاسخام ناسراون و لە زمانی یۆنانیدا بەو کەسانە دەگووترێ کە لە قۆڵی چەپی پاشا ڕادەوەستن و سیخوڕی بۆ ئەو دەکەن. ئەوانە لەشکرێکی دووسەد و چل هەزار کەسی میسری و ئەتیۆپیایی بوون و بۆ ئەو مەبەستەی خوارەوە پێکهاتبوون. لە سەردەمی پاشایەتی پسامیتیخۆس‌دا کۆمەڵێک پادگانی نیزامی بۆ نیگابانی و پاسەوانی لە سنوورەکان سازکرابوون. پادگانێکی ئەو لەشکرە نیزامییە بە ئامانجی بەرگری لەهەمبەر هێرشی ئەتیۆپی‌یەکان لە شاری ئێلێفاندینی دامەزرا. نێوەندێکی‌تر لەبەرامبەر عەرەب و ئاشووری‌یەکان، لە شاری دافنی[3] سەربە هەرێمی پێلوسیۆس جێی‌گرت و بنکەیەکی‌تریش لە ماریێا لەسەر سنوورەکانی ئەفریقا سازکرا. وەختێک من چوومە میسر، پارسەکان ڕاست وەک سەردەمی پاشایەتی پسامیتیخۆس لە شارەکانی ئێلێفاندینی و دافنی پادگانیان دامەزراندبوو. بەهەرحاڵ، ئەو میسرییانەی لە پادگانی ئێلێفاندینی‌دا بوون، سێ ساڵ خزمەتیان کرد و هیچ کەس مەرەخەسی نەکردن. میسرییەکان کۆبوونەوە و یەکدەنگ بڕیاریان‌دا خۆیان لەدەست پسامیتیخۆس ڕزگار بکەن و پەنا بۆ ئەتیۆپی‌یەکان بەرن. کاتێک پسامیتیخۆس بەو

---

١- خواوەند دیا لێرەدا هاوشانی خواوەند ئامۆنی میسرییەکانە.

٢- خواوەند دیۆنیسۆس، هاوشانی خواوەند ئۆسیریسی میسرییە.

٣- ئەمڕۆ ناسراوە بە بەرزایی دافنە.

رووداوەی زانی، وەدوایانکەوت و داوای لێکردن خواوەندەکانی رەسەن و ژن و منداڵیان بەجێنەهێڵن. دەگێڕنەوە کە یەکێک لە نیزامییەکان دەستی بۆ گوونی برد و گووتی گوونەکانی بۆ هەرکوێ بەرێ، لەوێ ژن و منداڵیش دەست دەکەوێ. وەختێک ئەو جەماورە نیزامییە گەیشتنە وڵاتی ئەتیۆپیا، خزمەتەکانی خۆیان پێشکەش بە پاشای ئەو وڵاتە کرد. پاشا، ئەویش بەنۆرە و شێوەی خۆی وڵامی خزمەتەکانی ئەوانەی داوە. فەرمانی دەرکرد کە ئەو کۆمەڵە خەڵکە ئەتیۆپییەی دوژمنایەتی مانەوەی ئەوانە دەکا، لە وڵات دەربکرێن و ئیزنی بە نیزامییەکاندا لە شوێنی ژیانی دەرکراوەکاندا نیشتەجێ بن.[1] میسرییەکان لەنێو کۆمەڵگای ئەتیۆپییەکاندا دامەزران و خاوەن شارستانییەتێکی بەهێز بوون. ئەتیۆپییەکان گەلێک دابونەریتی ئەو میسرییانەیان رەچاوکرد.

[٣١] کەوابوو ئاژۆتنی بگاری رووباری نیل بە پیادە یا بە گەمی چوار مانگی رێک دەخایەنێ، هەڵبەت بەشێکی ئەو چۆمە هەرچەند لەنێو خاکی میسردا هەڵکەوتووە، بەو حاڵەش حیسابی بۆ نەکراوە. ئەگەر رۆژەکانی مژوڵبوون بەو سەفەرە کۆکەینەوە، سەرجەمی ماوەکە بەرابەری ئەوەندە کاتەیە کە بۆ پێوانی مەودای نێوان شاری ئێلێفاندینی و ناوچەی ئاڤتۆمۆلۆسی پێویستە.[2] رووباری نیل لە رۆژئاواوە بەرەو رۆژهەڵات دەچێ.[3] لەو نوختەیەوە بەو لاوە، هیچکەس ناتوانێ زانیاری دڵنیاکەرەوە بداتەدەست، چونکە دەڤەرەکە لەبەر گەرمای فرە بووەتە سەحرا و بیابان.

[٣٢] من هێندێک زانیاریم لەلای کۆمەڵێک خەڵکی کیرینێئی[4] دەسکەوت. ئەوان پێیانگووتم کە چوونەتە نێوەندی ئاییني ئامونۆس[1] و لەگەڵ پاشای

---

١- دەشتی پرحاسڵاتی سێنائار.

٢- دوازدە رۆژ رێگایە.

٣- شوێنی تێکەڵبوونەوەی رووباری نیل و چۆمی ئەلغزالە. ئەو چۆمەی دوایی لەلای رۆژئاواوە تێکەڵ بە نیل دەبێتەوە.

٤- پێتەختی ئەوانە، واتە شاری کیرنائیک، ١٥ کیلۆمیتر لە کەنارئاوەکانی دەریای مەدیترانە دوورە و لە سەردەمی باستاندا یەکێک لە شارە گەورە و ناسراوەکانی ئەو هەرێمە بووە.

ئامونۆسی‌یەکان بەناوی ئیتی‌ئارخۆس سەبارەت بە سەرچاوەی ئاویی رووباری نیل قسەیان کردوە، چونکە هیچکەسی‌تر زانیارییەکی ئەوتۆی لەو بارەوە نەبووە. ئیتی‌ئارخۆس بەو خەڵکەی گوتووە کە کاتی خۆی چەند کەسێکی ناسامۆنی[2] هاتوونە لای ئەو. ئەو هۆزە ئەفریقییە لە ناوچەی سیرتی[3] و تۆزێک بەلای رۆژهەڵاتدا نیشتەجێن. کاتێک ئەو چەند کەسە گەیشتنە لای پاشا و ناوبراو پرسیاری لێکردن ئاخۆ هیچ زانیارییەکی پتریان سەبارەت بە ناوچە بیابانیەکانی وڵاتی لیبی هەیە، ئەوان وڵامیان داوە کە کۆمەڵێک گەنجی جوامێر، گشتیان سەر بە بنەماڵەی ناسراو، وەختێک گەورە و باڵغ بوون، جیا لەوەی چەند کاری دژواریان جێبەجێ‌کردبوو، ئەوجاریش بڕیاریان‌دا بەمەبەستی سیاحەت و گەڕان بچنە دوورترین شوێنە بیابانیەکانی ئەفریقا کە تا ئەو سەردەمە هیچکەس سەردانی نەکردبوون. ئەوانە لەنێو خۆیاندا کێبەرکێ‌یان سازدا، بۆ ئەو پێنج کەسەی کە قەرار بوو لێکۆڵینەوە لەسەر ناوچە بیابانیەکانی لیبی بکەن. پەیمانیان بەست زانیاریی ئەوەندە بەوەج وەدەست بێنن کە تا ئەو سەردەمە کەس پێی‌نەگەیشتبێ. رۆخەکانی لیبی لە باکووری دەریا، لە میسر تا گەرووی سۆلۆئیس[4] واتە ئەو شوێنەی سنووری کۆتایی وڵاتی لیبی‌یە، خەڵکی لیبی‌یایی و کۆمەڵێک هۆزی‌تری ئەفریقایی لێ نیشتەجێن، هەڵبەت جیا لەو ناوچانەی یۆنانی و فینیقی لێدەژین. بەدوای ئەو ناوچە کەنارییانە و هۆزەکانی نیشتەجێ لە قەراخ ئاوەکان، سەرتاسەری ئەفریقا پڕە لە ئاژەڵی دڕندە و کێوی

---

١- ئیلاهە ئامۆنۆس یا ئامۆن، مەزهەر و سیمبۆلی خۆر، خاوەن روخساری کەڵ و دوو شاخی گەورە بووە و لە شاری تیڤا و شارەکانی‌تری میسری کۆندا کەڵکی لێوەرگیراوە.

٢- ناسامۆن، هۆزێکی خێڵەکی سەحرانشینی ئەفریقایی کە لەنێوان هەرێمی کیرینی و کارتاژدا هاتووچۆیان دەکرد و خەریکی مامەڵە لەگەڵ میسرییەکان بوون و بەرەگەز کارتاژی بوونە.

٣- سیرت، ناوی کۆنی دوو کەنداوی سەر بە دەریای مەدیترانە، هەڵکەوتوو لە کەنارئاوەکانی باکووری ئەفریقایە. یەک لەوانە کەوتووەتە رۆژئاوای ساحلی تریپۆلی و ئەمڕۆ ناسراوە بە سەدر، ئەوەی‌تریش لەلای رۆژهەڵاتی ئاوەکانی تونس و ناسراوە بە کابس.

٤- ئەمڕۆ پێیدەگووترێ گەرووی کانتن.

و ئەگەر لەوێش تێپەڕین، ئەوجار دەگەینە سروشتێکی دەستلێنەدراو و ویشک و خیزەڵان و تەواو بیابانە.

بەڵێ دوای ئەوەی ئەو ناسامۆنییەکان ماڵئاواییان لە گەنجەکان کرد، ئەوانە خواردەمەنی و ئاویان بە رادەی پێویست هەڵگرت و سەرەتا بە لیبی ئاوەداندا تێپەڕین و پاشان بە ناوچەی ئاژەڵە درندەکان دا دەربازبوون و لەوێشەوە بەرەو رۆژئاوا روویان لە بیابان کرد. دوای ئەوەی بە کۆمەڵێک ناوچەی خیزەڵاندا تێپەڕین، ئەوجار چاویان بە دەشت و دارستانی چێندراو کەوت. وەختێک لەو باغاتە نیزیک کەوتنەوە، دەستیان بە بڕینی دار و کۆکردنەوەی میوەجات کرد. لە پڕێکا جەماوەرێکی کورتەباڵایان لێوەدەرکەوتن. کورتەباڵاکان خێرا ناسامۆنییەکانیان رەپێچەکدا. چونکە لە زمانی هەڤدوو نەدەگەیشتن. ئەو کورتەباڵایانە ناسامۆنییەکانیان لەگەڵ خۆیان برد و بەنێو دەشتێکی زەلی بەربەریندا تێپەڕین و کاتێک لە ئاوەکان پەڕینەوە، گەیشتنە ئاوایییەک و لەوێ تەواوی خەڵکەکە رەشپێستی کورتەباڵا بوون. چۆمێکی گەورە لە رۆژئاواوە بەرەو رۆژهەڵات و بەنێو ئاوایییەکەدا تێدەپەڕی و پڕ لە تیمساح بوو.[1]

[٣٣] تا ئێرە باسی ئەوەیان بۆ من کرد کە ئیتیئارخۆسی پاشای ئامۆنیۆس گوتبووی، جیا لەوەش، وەک کیرینیئییەکان[2] بۆیان باس کردم، پێنج کەسە ناسامۆنییەکە گەڕانەوە وڵاتی خۆیان. ئەو پێنج کەسە گشتیان تاڵەبین بوون. ئیتیئارخۆس لەو باوەڕەدا بوو کە ئەو رووبارەی بەتەنیشت ئاوایییەکەیاندا دەربازدەبێ، لەڕاستیدا هەمان چۆمی نیلە. هەڵبەت بۆچوونێکی وێچوویە. رووباری نیل بە نێوەڕاستی ئەفریقادا تێدەپەڕێ و دوو لەتی دەکات. ئەگەر قەراربێ بابەتی نەناسراو لەگەڵ بابەتی ناسراو هەڵسەنگێنم، دەبێ بڵێم کە رووباری نیل خاوەن هەمان مەودایە کە چۆمی ئیسترۆ[3]

---

١- دەبێ هەمان چۆمی نیجیریە بێ.

٢- پێتەختی ئەوانە، واتە شاری کیرنائیک، ١٥ کیلۆمیتر لە کەنارئاوەکانی دەریای مەدیترانە دوورە و لە سەردەمی باستاندا یەکێک لە شارە گەورە و ناسراوەکانی ئەو هەرێمە بووە.

٣- ئیسترۆ ئەمڕۆ ناسراوە بە چۆمی دانوب.

هەیەتی، چونکە ئیسترۆ لە وڵاتی کێلتی‌یەکانەوە، لە نیزیک شاری پری‌ئینی سەرچاوەدەگریَ و ئوروپا دوو بەش دەکا. کێلتی‌یەکان[1] دوور لە کۆڵەکەکانی ئیراکلیس[2] دەژین و دراوسێی کینیسی‌یەکانن[3]. کینیسی‌یەکان دانیشتووی رۆژئاوای ئوروپان. چۆمی ئیسترۆ لە نیزیک شاری ئیستریا[4]، شوێنی نیشتەجێیی موهاجیرانی میلیسی دەڕژێتە بەحری رەش.

**[٣٤]** چۆمی ئیسترۆ ناسراوە، چونکە ناوچەکانی ئاوەدان دابەش دەکا. بەپێچەوانەی ئەو چۆمە، زانیارییەکی ئەوتۆ سەبارەت بە سەرچاوەی ئاویی رووباری نیل لەگۆڕێدا نییە، لەبەر ئەوەی بە ئەفریقادا دەرباز دەبیَ و تەواو سەحرایە. ئەوەندە زانیارییەی سەبارەت بە مەودای نیل دەستم کەوت، پێشتر باسم لێوەکردوە. لەهەرحاڵدا، ئەو چۆمە دێتە نێو وڵاتی میسر کە تەقریبەن لە بەرامبەر وڵاتی شاخاوی کیلیکیا جێی‌گرتووە و لێرەوە تا سینۆپی[5] هەڵکەوتوو لە کەنار دەریای رەش، بە رێگای راستدا پێنج رۆژی سەفەری بۆ کەسێکی خۆش ئاژۆ دەخایەنیَ. سینۆپی لە روبەڕووی شوێنی تێکەڵبوونی چۆمی ئیسترۆ لەگەڵ دەریای رەش هەڵکەوتووە. هەر بۆیە من بەو بڕوایە گەیشتووم، رووباری نیل کە ئەفریقا دابەش‌دەکا، لەگەڵ چۆمی ئیسترۆ، خاوەن هەمان مەودای درێژاییە. لێرەدا باسەکەم سەبارەت بە رووباری نیل تەواودەکەم.

---

١- دەگووتریَ کە ئەوانە هۆزێکی گەورەی ئاریایی بوونە و دوو هەزار ساڵ پێش زایین لە رۆژهەڵاتی ئوروپاوە بەرەو رۆژئاوای ئەو قارەیە کۆچیان کردوە و لە ماوەی دە سەدە دا سەراسەری ئەو قارەیەیان داگیرکردوە و نێرک و بنەچەی سەرەتایی دانیشتووانی وڵاتانی رۆژئاوایی بوونە.

٢- کۆڵەکەکانی ئیراکلیس، ئەمڕۆ ناسراوە بە جەبەلولتاریق.

٣- ئەو هۆزە دەبیَ لە باشووری رۆژئاوای نیمچە دورگەی ئیفێری ژیابن.

٤- ئیستریا، ئەمڕۆ بەناوی ئیستر دەناسریَ و لە هەرێمی دوبروجەی وڵاتی رۆمانی هەڵکەوتووە.

٥- سینۆپی ناوی شارێکی کۆنی ئاسیای بچووک، هەڵکەوتوو لە کەنارئاوەکانی دەریای رەش و مەوتەنی دیۆیێنیس، (دیۆژێن یا دیۆجانێس) فەیلەسوفی یۆنانییە.

## دابونەریتی میسرییەکان

[٣٥] لەو بەشەدا پتر باسی وڵاتی میسر دەکەم، چونکە زیاتر لە هەر شوێنێکی‌تر خاوەن کەلتووری سرنج‌ڕاکێشە و پێویستە توێژینەوەی لەسەر بکرێ. هەڵبەت نەک لەبەر ئەوەی کە ئاسمانی ئەو وڵاتە شینترە یا رووباری نیل بەشێوەیەکی جیاواز لە چۆمەکانی‌تری جیهان هەڵسوکەوت دەکا، بەڵکوو میسرییەکان خۆیان بە پێچەوانەی دابونەریتی گەلانی‌تر دەجوڵێنەوە.

لە وڵاتی میسر ژنان دەچنە بازاڕ و خەریکی بازرگانین، لەحاڵێکدا پیاوان لە ماڵەوە دەمێننەوە و کاری رستن و چنین دەکەن. ئەوان پارچە و قوماش لە سەرەوە بۆ خوارەوە دەچنن و بەپێچەوانەی خەڵکانی‌تر کە لە خوارەوە بۆ سەرەوە دەچن. پیاوەکان وەختێک بار هەڵدەگرن، لەسەر سەریان دادەنێن، بەڵام ژنەکان بار بە شان هەڵدەگرن. ژنان بەپێوە گمێز دەکەن، پیاوان بە دانیشتنەوە. بۆ دەست بە ئاو گەیاندن دەچنە ژووری ماڵەکانیان، بۆ خواردن روو لە دەرێ و لە کۆڵان دەکەن. دیارە ئەوان لەو باوەڕەدان کە کاری ناحەز، بەڵام پێویست، دەبێ بەنهێنی و لە ماڵەوە جێبەجێ بکرێت و کردەوەی بەجێ باشترە لە حزووری خەڵکدا و بەئاشکرا بێ.

هیچ ژنێک بۆی نییە ببێتە کاهێن و نێرینەکان دەتوانن کاهێنایەتی ژنان و پیاوان بکەن. کوڕ لە ماڵدا ناچار نەکراوە و لەسەری نییە ئاگای لە دایک و باوک بێ، ئەگەر خۆی رازی نەبێ ئەو کارە بکا، بەڵام کچ ئەرکی سەر شانییەتی ئەگەر خۆیشی گەرەکی نەبێ.

[٣٦] لە وڵاتانی‌تر پیاوانی ئایینی قژیان درێژە، لەحاڵێکدا کاهێنانی میسری سەریان دەتاشن. خەڵکانی‌تر عادەتیانە لە کاتی پرسە و سەرەخۆشی‌دا قژیان کورت بکەنەوە، میسرییەکان بە پێچەوانەوە، هەرکەسێکیان لێ بمرێ، ردێن ناتاشن و قژی سەریشیان کورت ناکەنەوە. گشت مرۆڤێک جیا لە ئاژەڵان دەژی، میسرییەکان لەگەڵ ئەوان دەژین. خەڵک گەنم و جۆ دەخۆن، میسرییەکان خواردنی گەنم و جۆیان بەلاوە شوورەییە و هەر بۆیە

نانەکانیان لە ئاردی چاودار دروست دەکەن. ئەوان هەویر بە قاچەکانیان دەشێلن، بەڵام قوڕ و ڕیخ و پشکەڵ گرتنەوە بە دەستە.

گەلانی‌تر، هەڵبەت جیا لەوانەی لە میسرییەکان فێربووبن، ئەندامانی شەرمینەی لەشیان دەست لێنادەن و بەشێوەی سروشتی دەمێننەوە، بەڵام میسرییەکان سوونەت و خەتەنە دەکەن. پیاوەکان دوو دەست جلوبەرگ لەبەر خۆیان دەکەن، لە حاڵێکدا ژنەکان تەنیا یەک دەست. خەڵکانی‌تر ئاڵقە و تەنافی خێمە بە دیوی دەرێی دیواری گەمیدا هەڵداوەسن، بەڵام میسرییەکان بە دیوی ژوورێدا. یۆنانییەکان ژمارە و وشەکان لە کاتی حیسابات، لەلای چەپەوە بۆ ڕاست دەنووسن، میسرییەکان بەپێچەوانەوە لە ڕاستەوە بۆ چەپ دەنووسن و لەو باوەڕەش‌دان کە شێوازی ئەوان دروستە و هی یۆنانییەکانیان بەلاوە سەیرە. میسرییەکان خاوەن دوو شێوە پیتن، پیتی موقەدەس و پیرۆز لەگەڵ پیتی گشتی.[1]

[۳۷] میسرییەکان لە هەڵسەنگاندن لەگەڵ خەڵکانی‌تر، لەڕادەبەدەر ئایینیترن و خاوەن دابونەریتی خۆیانن: بە پەرداخی گڵێنە شتگەلی ئاوەکی دەخۆنەوە و گشت ڕۆژێک خاوێنی دەکەنەوە و ئەوەش تەنیا کاری یەک کەس نییە، بەڵکوو هەموو لایەک ئەو عادەتەیان هەیە. بەردەوام جلوبەرگی چندراو لە کەتانی تازە دەپۆشن و هەمیشە خاوێن و شۆردراوە. ئەوان بە مەبەستی پاراستنی پاک و خاوێنی خۆیان کوڕ سوننەت و کچ خەتەنە دەکەن. پاک و خاوێنییان لە جوانییان بەلاوە گرینگترە. پیاوانی ئایینی ئەوانە سەرتاسەری لەشیان، هەر سێ ڕۆژ جارێک دەتاشن. ئەوکاتە هیچ ڕشک و ئەسپێیەک ناتوانێ تخوونیان بکەوێ، بەتایبەت ئەو وەختەی خەریکی عیبادەتی خواکانیانن. پیاوانی ئایینی تەنیا جلوبەرگی کەتان دەپۆشن و پێڵاوەکانیان لە گەڵای پاپیرۆ دروست دەکەن. ئەوانە بۆیان نییە کەڵک لە جلوبەرگ و پێڵاوی جیاواز وەرگرن.

١- ئەو دوو پیتانە بریتین لە شێوازی پیرۆغلیف (هێرۆغلیف) و شێوازی دیمۆتیک.

دوو جار له رۆژ و دوو کەڕەت لە شەودا حەمام بە ئاوی سارد دەکەن و وەک دەگووترێ بە هەزاران نەریتی ئایینیتری لەو جۆرەیان هەیە. هەڵبەت خاوەن گەلێک نەریت و رێوشوێنیتر هەن، چونکە کاهێنەکانیان نە مژوڵی ژیانی رۆژانەن و نە خەریکی پارە خەرجکردنن. خواردەمەنی پیرۆز دەخۆن و هەرکەس لەبەر خۆیەوە کۆڵێک گۆشتی گا و پەلەوەری وەک قاز و مراوی هەیە و خەڵک بۆیان دێنێ. شەڕاب و ترێی رەزیشیان پێدەدرێ. پیاوانی ئایینی میسری بۆیان نییە گۆشتی ماسی بخۆن. باقلە و لۆبیا لە وڵاتی میسر ناچێندرێ، ئەگەر بە هەڵکەوتیش شین بووبێ، نە بەکاڵی و نە بەبرژاوی نایخۆن و تەنانەت پیاوانی ئایینی رازی نین چاویان پێیبکەوێ، چونکە لەو باوەڕەدان دەغلێکی ناپاکە. هەر پەرستگەیەک خاوەن چەندین کاهێنە و پەرستگەکانیان خاوەن پلەی ئایینین و گەورەترینیان پەرستگەی جامیعە. کاتێک کاهێنەکی میسری دەمرێ، کوڕەکەی جێیدەگرێتەوە.

[۳۸] میسرییەکان لەو باوەڕەدان کە ئاژەڵی گا، ملکی خواوەندێکە بەناوی ئێپافۆ[1] و بۆیە بەو چەشنە تاقی دەکەنەوە. کاهێنێک بە وردی لەشی ئەو ئاژەڵە دەپشکنێ و ئەگەر تەنیا یەک مووی رەش بدۆزێتەوە، ئیتر وەک ئاژەڵی ناپاک چاویلێدەکرێ. سەرەتا پیاوێکی ئایینی ئاژەڵەکە بەپێوە و دواتر بە راکشاوی لەسەر عەرز دەپشکنێ. ئەو پیاوە ئایینییە تەواو لەو کارەدا شارەزایە. چەند پێوانەیەکی ئایینی هەن کە دواتر باسیاندەکەم. کاهێنەکە زمانی گای قوربانی دەردێنێ و چاوی لێدەکا ئاخۆ خاوێنە یاننا. پاشان مووگەلی کلکی گایەکە دەنۆڕێ، بۆوەی دڵنیا بێ کە بەشێوەی سروشتی رواون. ئەگەر دوای ئەو گشتە نۆڕین و پشکنینە، ئاژەڵەکە خاوێن دەرچێ، ئەوجار پیاوە ئایینییەکە گەڵای پاپیرۆ لە شاخەکانی گا وەردەپێچێ و مۆریان دەکا. نەخشی هەڵکەندراو لەسەر مۆری گڵی سوور، هەمان ئەو نەخشەیە کە لەسەر ئەنگوستیلەی پیاوە ئایینییەکەیە. دوای گشت ئەو پشکنین و مۆر لێدانە، ئاژەڵەکە بۆ قوربانیکران پەسند دەکرێ. سزای ئەو

---

۱- ئێپافۆ یا ئێپافۆس، کوڕی خواوەند ژوپیتێر و ئیلاهە یوو و دامەزرێنەری شاری مێمفیس.

کەسەی کە گای نێر بێ مۆرکران بکاتە قوربانی، مەرگ و کوشتنە. ئەوە شێوەی تاقیکاری جوانەگای قوربانی بوو. شێوازی قوربانیکردنیش بەو چەشنەیە:

[۳۹] ئاژەڵی مۆرکراو دێننە سەر سەکۆی قوربانی و ئامادەی سەربڕینی دەکەن و ئاگر هەڵدەکرێ. سەرەتا بە شەڕابی پاک جوانەگایەکە غوسڵدەدەن، پاشان بەدەم دوعا و پاڕانەوە، دەیکوژنەوە. لە کۆتاییدا جوانەگا کەوڵدەکەن و دوای ئەوەی پڕ جنێو و لەعنەتباران کرا، ئەگەر هاتوو بە هەڵکەوت بازرگانێکی یۆنانییان بەڕێبوار دۆزییەوە، لەجێوە پێیدەفرۆشن. ئەگەریش کەسیان دەست نەکەوت، ئیتر رایناگرن و فڕیی دەدەنە نێو چۆم. بۆیە لەعنەت و نفرینی کەوڵ و سەری گایەکە دەکەن، تا بەڵا و موسیبەتی ئیحتیمالی بۆ ئەو کەسانەی قوربانیان کردوە، لەسەریان دوورکەوێتەوە (بەواتایەک سەر چاککردنەوەیە). میسرییەکان بەگشتی، لەمەر غوسڵی شەراب و سەربڕینی ئاژەڵی قوربانی، خاوەن یەک نەریتی هاوبەشن و لە پەرستگە بەڕێوەدەچێ. لەو بۆنەیەدا هیچ میسریەک ئامادە نییە گوشتی سەری ئاژەڵەکە بخوا.

[٤۰] بەڵام، بەتاڵکردنی ریخ و پیسایی، سەربڕین و برژاندنی ئاژەڵی قوربانی، شێواز و نەریتی خۆی هەیە و دەگەڕێتەوە سەر ئەو خوایەی قەرارە قوربانی بۆ بکرێ. من باسی رێورەسمی قوربانی بۆ ئەو خوایە دەکەم کە بەلای خەڵکەوە گرینگتر لەوانیترە و بەو بۆنەشەوە جێژنی گەورەتری بۆ رێکدەخەن.[١]

پاش ئەوەی جوانەگا کەوڵکرا، نوێژی لەسەر دەکەن و دوعا دەخوێندرێ، ئەوجار ریخۆڵەکانی پڕ لە ریخ جیادەکرێنەوە، بەڵام دڵ و جەرگ و سیپەلاک و بەزەکەی دەست لێنادەن و دەیهێڵنەوە. دوای ئەو کارە قاچەکانی دەبڕن و پاشان گۆشتی مازەی پشت و شان و پشت ملی جیادەکەنەوە و هەناوی کەلاکی

١- مەبەست جێژن گرتن بۆ ئیلاهە ئیسیس یا ئیسیدا، هاوسەری خواوەند ئۆسیریس. ئیسیدا ئیلاهەی ناسراوی میسرییە.

جوانەگا پڕ لە نان و هەنگوین و مێوژ و هەنجیر و ئەدوییەی بۆنخۆش و ورتکە داری کۆندۆر (مەرمەک) و گەلێک بابەتی عەترداری‌تر دەکەن و ڕۆنی تێهەڵدەسوون و وەسەر ئاوری دەنێن هەتا دەبرژێ. خەڵک بەر لە قوربانی بە ڕۆژوو دەبن و لە کاتی برژانی کەلاکدا، لە سینگی خۆیان دەدەن. پاشان دادەنیشن و دەست بە خواردنی گۆشتی برژاوی ئاژەڵەکە دەکەن.

[٤١] میسرییەکان گا و جوانەگای خاوێن دەکەنە قوربانی. ئەوان بۆیان نییە مانگا و نێنگوون(بەرکەڵ) سەرببڕن، چونکە ئەوانە پێشکەش بە خواوەند ئیسی کراون. پەیکەرەی ئەو خوایە ژنانە دروست کراوە و خاوەن شاخی مانگایە، وەک چۆن یۆنانییەکان خواوەند یۆ[1] نیشان دەدەن. میسرییەکان پتر لە تەواوی مالات و پەلەوەری خۆماڵی، حورمەت بۆ مانگا دادەنێن. هیچ ژن و پیاوێکی میسری کەسێکی یۆنانی لە زارەوە ماچ ناکا، یا چەقۆ و شیش و مەنجەڵی ئەوان بەکارناهێنێ. میسرییەکان تەنانەت گۆشتی لەتوپەتکراو بە چەقۆی یۆنانییەکانیش ناخۆن. کاتێک گا یا مانگایان بمرێ، بەو شێوەیە بە خاکی دەسپێرن: کەلاکی مانگا فڕێ دەدەنە نێو ئاوی چۆم، بەلام کەڵ و گا لە دەرەوەی شار ژێر خاک دەکەن، بەچەشنێک کە یەک یا دوو شاخی مالاتەکە بەدەرەوە دەبێ. کاتێک کەلاکی گا بوو بە خاک و وەختی هات، کۆمەڵێک گەمی لە دورگەی پرۆسۆپیتیسی[2] سەربە هەرێمی دێلتا وەڕێدەکەون و بەمەبەستی کۆکردنەوەی ئێسک و پروسکی گایە نێژراوەکان بە ئاواییەکاندا دەگەڕێن. ئەو دورگەیە پێنج سخینۆس[3] لە شار دوورە. دیارە جیا لەو ئاواییە کە گەمییەکای لێ وەڕێدەکەون تا ئێسقانی مانگا پیرۆزەکان باربکەن، لە

---

١- ئیلاهە یووی یۆنانی کچی ئینافۆس و حەزی خواوەند ژوپیتێر یا هەمان دیا، ژوپیتێر بۆوەی ئەو ئیلاهەیە لەدەست دوژمنان ڕزگار بکا، ڕوخساری مانگای پێبەخشی. ئەو ئیلاهەیە لەنێوان ئەرز و ئاسماندا سەرگەردان خولاوەتەوە و پاشان گەیشتووەتە ولاتی میسر و لەوێ بەناوی ئیسی یا ئیسدا بووەتە هێمای پەرەستن.

٢- ئەو دورگەیە لە ڕێژاوگەی ڕوباری نیل، کەوتووەتە نێوان چۆمەکانی کانوپی (کانوفۆ) و سیڤێنیتی.

٣- سخینۆس، بەرابەری ١٠ کیلۆمیتر و ٦٥٦ میترە.

دەوری ئەو دوورگەیە کۆمەڵێک شار و ئاوایی‌تریش هەن. یەکێک لەو ئاواییانە بەناوی ئاتارڤیخیس خاوەن پەرستگەی ئافرۆدیتە[1]. لە شاری ئاتارڤیخیسەوە جەماوەرێکی زۆر دەچنە ئاواییەکانی‌تر و پاش دەرهێنانی ئێسقانی ماڵاتە نێژراوەکان، گشتی کۆدەکەنەوە و لەگەڵ خۆیان دەیهێننەوە و لە یەک شوێن دەیان‌نێژن ئەوە باسی ناشتنی کەلاکی گا و ماڵاتی‌تر بوو، چوونکە بەپێی یاسا، میسرییەکان هیچکام لەو ئاژەڵانە ناکوژن

**[٤٢]** ئەو میسرییانەی لە ئاواییەکەیان خاوەن مەعبەدی پێشکەش‌کراو بە خواوەند دیای ناوچەی تیڤا بن یا دانیشتووانی تیڤایی خۆیان، هیچکات کاوڕ و بەران ناکەنە قوربانی و تەنیا بزن سەر دەبڕن. چونکە جیا لە خواوەند ئیسی و خواوەند ئۆسیری کە دەڵێن هەمان دیۆنیسۆسە، میسرییەکان تەواوی خواکانی‌تر وەک یەک ناپەرستن. ئەوان بەپانەوە ئەو دوو خوایە دەپەرستن. میسرییەکانی کە لە دەڤەرەکەیان مەعبەدیان بۆ خواوەند مێندیس[2] دروست کردوە یا خۆیان لە ناوچەی مێندی‌سیۆ بژین، لەجیاتی بزن تەنیا کاوڕ و بەران دەکەنە قوربانی.

دانیشتووانی ناوچەی تیڤا و گشت ئەوانەی کاوڕ و بەران ناکەنە قوربانی، مێژووی دابونەریتی خۆیان بەو چەشنە دەگێڕنەوە: خواوەند ئیراکلیس[3] پێداگر بوو کە چاوی بە خواوەند دیا بکەوێ، بەڵام دیا گەرەکی نەبوو خۆی نیشان بدات. پاش ئەوەی ئیراکلیس زۆر لەبەر دیا پاڕایەوە و پێداگری کرد، خواوەند دیا تووشی سەر لێ‌شێوان هات و بەرانێکی سەر بڕی و کەوڵی کرد. کەوڵەکەی پۆشی و ئەوجار خۆی نیشانی ئیراکلیس‌دا. میسرییەکان لەو کاتەوە پەیکەرەی خواوەند دیا بە روخساری بەران دروست دەکەن. ئامۆنی‌یەکان، ئەوانیش ئەو دابەیان لە میسرییەکان وەرگرتووە. ئامۆنی‌یەکان لەڕاستیدا موهاجیری میسری و ئەتیۆپین و بە زمانێک قسە دەکەن کە

---

١- ئەفرۆدیت، خوای جوانی لە یۆنانی کۆندا.

٢- مێندیس، ناوی دەڤەرێکە لە باکووری رۆژهەڵاتی رێژاوگەی نیل و هەروەها ناوی یەک لە خواکانی میسرییە کە خاوەن روخساری بزن بووە و هێماوە بارەوەری و زاوزێ بووە.

٣- ئیراکلیس، پاڵەوانی ئەفسانەیی لە یۆنانی سەردەمی کۆندا.

هاوشێوەی زمانی هەردووکیانە. من خۆم دڵنیام کە ناوی ئامۆن لەوەڕا هاتووە کە ئەوانە خواوەند دیا بەناوی ئامۆن[1] بانگ دەکەن.

دانیشتووانی هەرێمی تیڤا، واتە تیڤییەکانی رەسەن عادەتیان نییە بەران قوربانی بکەن و بەلایانەوە ئاژەڵێکی موقەددەس و پیرۆزە. بەڵام تەنیا یەک رۆژ لە ساڵدا، ئەویش رۆژی جێژنی خواوەند دیا، بەرانێک سەر دەبڕن و کەوڵی دەکەن و پێستەکەی لەبەر پەیکەرەی خواوەند دیا دەکەن. پاشان پەیکەرەی خواوەند ئیراکلیس دێنن و لە بەرامبەر دیادا دایدەنێن. خەڵکی بەشدار لەو رێورەسمە سەرەتا بۆ بەرانی قوربانیکراو لە سینگی خۆیان دەدەن و دواتر کەلاکەکە لەنێو تابووتی پیرۆز دەنێن.

[٤٣] سەبارەت بە ئیراکلیس بیستوومە کە یەکێک لە دوازدە خواکان بووە. لەمەر ئیراکلیسێکیتر، ئەوەی کە یۆنانییەکان باوەڕیان پێیەتی، لە هیچ شوێنێکی وڵاتی میسر زانیاریم دەست نەکەوت. ئەوەندەم بۆ روون بۆتەوە کە میسرییەکان ناوی ئەو خوایەیان لە یۆنانییەکان وەرنەگرتووە، بەڵکوو بە پێچەوانەوە، یۆنانییەکان ئەو ناوەیان لە میسرییەکان وەرگرتووە، واتە ئەو کۆمەڵە یۆنانییەی کە ناوی ئیراکلیس‌یان لەسەر کوڕی ئامفیتریئۆنۆس[2] داناوە. یەک لە بەڵگەکانم کە باسی دەکەم: دایک و باوکی ئیراکلیس واتە ئامفیتریئۆنۆس و ئالکمینی[3]، خاوەن رەگەزی میسری بوونە[4]. هەڵبەت بۆچوونێکیتریش هەیە، میسرییەکان دەڵێن نە ناوی پۆسیدۆن[5] و نە ناوی دیۆسکۆرۆس‌یان[6] نەبیستووە و لە ریزی خواکانیان دانانێن. ئەگەر ناوی

---

١- ئیلاهە ئامۆنۆس یا ئامۆن، مەزهەر و سیمبۆلی خۆر، خاوەن روخساری کەڵ و دوو شاخی گەورە بووە و لە شاری تیڤا و شارەکانیتری میسری کۆندا کەڵکی لێوەرگیراوە.

٢- ئامفیتریئۆنۆس کوڕی ئالکایۆن، پاشای تیرینتی.

٣- ئالکمێنی، کچی ئیلێکتریۆنی پاشای مایسن، ژنی ئامفیتریئۆنۆس کە بەهەڵە لەگەڵ خواوەند دیا دەستی تێکەڵکرد و ئیراکلیسی ناسراو لەدایکبوو.

٤- ئالکایۆن باوکی ئامفیتریئۆنۆس و ئیلێکتریۆن باوکی ئالکمینی، هەردووکیان کوڕانی خواوەند پێرسیئا بوونە.

٥- پۆسیدۆن یا نێپتۆن، خواوەندی دەریاکان لە یۆنانی باستان.

٦- دیۆسکۆرۆ، خوای کایە و کێبەرکێکانی وەرزیشی لە یۆنانی باستان.

خوایەکیان لە یۆنانییەکان وەرگرتبا، دەبوایە لەبیریان مابا، چونکە ئەوان لە زەمانی قەدیمەوە بە کاری دەریاوانییەوە مژوڵبوونە. هەڵبەت دەبێ ئەوەش بڵێم کە یۆنانییەکانیش هەر بەو کارەوە خەریک بوونە، کەوابوو میسرییەکان دەبوایە ئەو دوو خوایەی دواییان ناسیبا. دیارە یەکێک لە خواکانی دێرینی میسرییەکان بەو ناوە بانگدەکرێت و وەک خۆیان دەڵێن ئیراکلیس لەو دوازدە خوایەیە کە حەڤدە هەزار ساڵ لەوە پێش و لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئاماسیسدا[1] کە هەشت خواوەند بوونەتە دوازدە، ئەویش یەک لەوان بووە.

**[٤٤]** من گەرەکم بوو بەپێی توانا زانیاری پتر وەدەست بێنم و بۆ ئەو مەبەستە چوومە شاری تیرۆس[2] لە فینیقیا. لەوێ پێیانگووتم کە پەرستگەیەکی خواوەند ئیراکلیس هەیە و خەڵک ڕێز و حورمەتێکی زۆری بۆ دادەنێن. من چاوم بەو پەرستگەیە کەوت و بینیم بە دیاری و خەڵات ڕازاوەتەوە. دوو کۆڵەکەم باش لەبیرن، یەکیان لە زێڕی خالس و ئەوەی تر لە زمرڕوتی سەوز دروستکراوە کە شەوانە دەدرەوشێتەوە. لەگەڵ پیاوانی ئایینی ئەو پەرستگەیە قسەم کرد، لێمپرسین ئەو مەعبەدە کەی بنیات نراوە، تێگەییم کە زانیاری یۆنانییەکان پەسند ناکەن. ئەوان وڵامیان دامەوە کە ئەو پەرستگەیە لە سەردەمی بنیاتنانی شاری تیرۆسدا سازکراوە و لەو کاتەوە تا ئێستا دوو هەزار و سێسەد ساڵ تێپەڕیوە. لە شاری تیرۆس چاوم بە پەرستگەیەکیتریش کەوت کە پێشکەش بە خواوەند ئیراکلیسی دەڤەری تاسۆس[3] کراوە. دواتر چوومە شاری تاسۆس و لەوێ ئەو پەرستگەیەم بینی. ئەوەیان لەلایەن خەڵکی فینیقییەوە دروست کراوە. ئەو فینیقیانە بەدوای

---

١- ئاماسیس، پاشای میسر لە ساڵی ٥٧٠وە تا ساڵی ٥٢٦ی پێشزایین و هاوسەردەمی کورۆش و کەمبوجییە.

٢- تیرۆس، گەورەترین بەندەری دنیای باستان لە کەنارئاوەکانی ڕۆژهەڵاتی مەدیترانە و لە شوێنی بەندەری بەیروتی ئەمڕۆ.

٣- دورگەیەک لە نێو دەریای ئێژەدا.

خاتوو ئێڤرۆپیدا[1] گەڕابوون و لە ناوچەی تاسۆس ئاواییەکیان سازکرد. بەهەرحاڵ پێنج وەچە بەر لەوەی خواوەند ئیراکلیسی کوڕی ئامفیتری‌ئۆنۆس لە یۆنان وەدیارکەوێ، ئەو گشت ڕووداوانە لە میسر قەوماون.

ئەو لێکۆڵینەوەیە بە ئاشکرا دەردەخا کە ئیراکلیس خوایەکی دێرین (باستان)ییە. بە باوەڕی من یۆنانییەکان کارێکی باشیان کردوە کە دوو جۆر پەرستگەیان بنیات ناوە، یەکەمیان پێشکەش بە ئیراکلیسی نەمر کراوە کە ناسناوی ئۆلیمبوسی[2] هەیە و دەیپەرستن و دووهەمیان بەو ئیراکلیسە کە چەشنی قارەمان چاوی لێدەکرێ و قوربانی بۆ دەکەن.

**[٤٥]** یۆنانییەکان وردبین نین و زۆر شتگەلی‌تر دەڵێن، بۆ وێنە ئەو ڕەوایەتەی خوارەوە کە زۆر ناماقوڵە و باسی ئیراکلیس دەکات. دەڵێ، کاتێک ئیراکلیس گەیشتۆتە وڵاتی میسر، مسری‌یەکان تاجی گوڵیان لەسەر ناو و بەدەم پێشوازییەوە بۆ قوربانی‌کردن بردویانەتە خزمەت خواوەند دیا. دەگێڕنەوە کە ئیراکلیس سەرەتا زۆر هێمن و ئارام بووە، بەڵام کاتێک گەیشتووەتە بەردەم سەکۆی قوربانی، کەڵکی لە هێزی خۆی وەرگرتوە و گشت خەڵکی دەوروبەری خۆی کوشتوە.

کاتێک یۆنانییەکان شتگەلی لەو بابەتە دێننە بەرباس، بەباوەڕی من ئەوان سروشت و یاسا و نەریتەکانی میسری وەبەر چاو ناگرن. دەبوایە ئەوەیان زانیبا کە میسرییەکان جیا لە کاوڕ و کەڵیجە و جوانەگا و قاز، تازە ئەوانەش پێویستە خاوێن و بێگەرد بن، بۆیان نییە هیچ ئاژەڵێکی‌تر بکەنە قوربانی، جا چ بگا بە ئینسان. جیا لەوەش، ئیراکلیس لەو کاتەدا مرۆڤێکی تەنیا بووە و هەرچەند بەهێزیش بووبێ، چۆن توانیویەتی دە هەزار کەس بکوژێ! پێموایە ئەوەی باسم کرد، کیفایەت دەکا و داوادەکەم خواکان و قارەمانەکان بمبوورن.

---

١- ئێڤرۆپی کچی ئاپێنۆر بە ڕوخساری گامێش وەدیارکەوت و خواوەند ژوپیتێر (دیا) رفاندی و بردییە وڵاتێک کە دواتر نێوی نرا ئەوروپا. ئێڤرۆپی وەک دایکی مینۆس دەناسرا.

٢- ئۆلیمبوس، چیای ناسرا لە یۆنانی باستان کە بەپێی چیرۆکە ئەفسانەییەکان شوێنی کۆبوونەوەی خواکان بووە.

[٤٦] میسرییەکان، وەک پێشتر گووتم، بزن و گیسک قوربانی ناکەن. ئەوە بەو هۆیانەی خوارەوەیە: مێندیسی‌یەکان[١] پانا[٢] وەک یەکێک لە هەشت خواکان بە ئەژمار دێنن و دەڵێن کە ئەو هەشت خوایە بەر لە دوازدە خواوەندەکە هەبوونە. نیگارکێش و پەیکەرە سازەکان لە میسر چەشنی یۆنانییەکان خواوەند پانا بە شێوەی پەیکەرەی مرۆڤی سەر و سمی گیسک نیشان دەدەن. دیارە ئەوە بەو مانایە نییە کە ئەو خوایە خاوەن شەمایلی لەو چەشنە بووە، بەڵکوو پێیانوایە شێوەی خواکانی‌تری داوە. ئەوە کە بۆچی بەو چەشنەی نیشان دەدەن، حەزناکەم باسی لەسەر بکەم. لەهەرحاڵدا مێندیسی‌یەکان ڕێز و حورمەتی پتر بۆ گیسک دادەنێن تا بزن. شوانەکانیش ڕێزی تایبەت لە گیسک دەگرن. کاتێک گیسکێک مردار دەبێ، خەڵکی دانیشتووی ناوچەی مێندیسی کۆڕی پرسە و سەرەخۆشی بۆ سازدەکەن. لە زمانی میسریدا بە گیسک و خواوەند پان، دەگووترێ مێندیس. لەو ناوچەیە و لە سەردەمی مندا شتێکی سرنجڕاکیش ڕوویدا. گیسکێک بە ئاشکرا و لە حزووری خەڵکدا، تێکەڵاوی جینسی لەگەڵ ژنێکدا دەکرد.

[٤٧] بەراز بەلای میسرییەکانەوە ئاژەڵێکی ناپاکە و ئەگەر لەکاتی دەربازبووندا خۆی لە کەسێک بخشێنێ، ئەو کەسە لەسەریەتی کە بە جلوبەرگەوە خۆی لەنێو ئاوی چۆمدا بشوا. شوانی بەرازان ئەگەر میسرییش بێ بۆی نییە بچێتە ژووری پەرستگە و کەس حەز ناکا لێی نیزیک بکەوێتەوە، کچی بداتێ، کچی لێ‌بخوازێ و بۆیە تەنیا لەنێو خۆیاندا زەماوەند دەکەن. میسرییەکان بەراز بۆ هیچکام لە خواکان جیا لەو دوو خوایە بە

---

١- مێندیس، ناوی دەڤەرێکە لە باکووری ڕۆژهەلاتی ڕێژاوگەی نیل و هەروەها ناوی یەک لە خواکانی خواکانی میسرییە کە خاوەن ڕوخساری بزن بووە و هێماوە بارەوەری و زاوزێ بووە.

٢- پانا یا پان، ناوی خوایەکی بەهێز و منالی خواوەند ئێرمیس و دریۆپی بووە. چیرۆکە ئەفسانەییەکان باس لەوە دەکەن کە ئەو خوایەی سەردەمی کۆن بەسەر چیا و دەشتەکاندا فڕیوە و سەمای فریشتەکانی ڕێبەری کردوە و بەردەوام بلوێرێکی دەسکردی خۆی بە دەمییەوە بووە و هاوڕێیەتی فریشتەکانی کردوە. ئەو خوایە خاوەن سەر و قاچی گیسک بووە.

ناوەکانی سیلینیس[1] و دیۆنیسۆس[2]، ناکەنە قوربانی. ئەوان تەنیا ئەو کاتە بۆ ئەو خوایانە بەراز قوربانی دەکەن و گۆشتەکەی دەخۆن کە مانگ کامڵ بووبێ (پانسیلینۆ).[3] ئەوە کە بۆچی میسرییەکان خۆیان لە قوربانی کردنی بەراز لە جێژنەکانیتردا دەپارێزن، دەگەڕێتەوە بۆ سەر دابێکی تەواو بنەڕەتی کۆنیان. من لەو بارەوە زانیاریم هەیە، بەڵام لە بەرژەوەندی نازانم لێرەدا باسی بکەم. میسرییەکان بەو شێوەیە بەراز بۆ خواوەند سیلینیس دەکەنە قوربانی: کاتێک سەری دەبڕن، کلک و گوون و ریخۆڵەی، گشتی بە یەکەوە لەلایەک دادەنێن و بە قەڵەوایی کەلاکەکە دایاندەپۆشن و دوایە هەرهەموویان لەنێو ئاگردا دەسووتێنن. باقی گۆشتەکە، کاتێک مانگ کامڵدەبێ، دەیبرژێنن و ئەو شەوە دەیخۆن و رۆژی دوایی بۆیان نییە گۆشتی بەراز بخۆن. خەڵکانی هەژار کە تواناییماڵیان نییە، پەیکەرەی بەراز بە هەویر دروست دەکەن و قوربانی پێدەکەن و دەیبرژێنن.

[٤٨] رۆژێک بەرلە جێژنی خواوەند دیۆنیسۆس[4]، هەر میسرییەک لەبەر خۆیەوە بەرازێک لەبەر درگای ماڵەوە دەکاتە قوربانی و پاشان کەلاکەکەی دەداتەوە ئەو شوانەی بەرازەکەی لێکڕیوە. بۆ باقی شتگەلیتر لەمەر جێژنی دیۆنیسۆس، هاوشێوەی یۆنانییەکان هەڵسوکەوت دەکەن، تەنیا ئەوە نەبێ کە میسرییەکان گۆرانی و سرود چڕینی بەکۆمەڵیان نییە. لەجیات پەیکەرەی

---

١- خەڵکانێک لەو باوەڕەدان کە خواوەند سیلینیس هەمان ئیلاهەیە کە پێیدەگووترێ نێخێب. کەسانیتریش پێیانوایە ئەوە هەمان ئیلاهە ئیسیس یا ئیسیدای ناسراوی میسری باستانە. لەبەر ئەوەی هێرۆدۆت ناوی دیۆنیسۆس دێنێ کە هەمان ئۆسیریسە، کەوابوو سیلینیس دەبێ ئیسیدا بێ.

٢- هێرۆدۆت لە ناوی ئەو خوایەی یۆنانی باستان بۆ ئۆسیریسی خوای میسرییەکان کەڵک وەردەگرێ.

٣- میسرییەکان دوای بەجێگەیاندنی هێندێک نەریت و دابی جێژن کە بە پامیلیس ناسراوە، ئەو کارە دەکەن.

٤- دیۆنیسۆس خوای یۆنانی، لە وڵاتی لاتینییەکان وەک ڤاکخۆس دەناسرا و بەلای میسرییەکانەوە هەمان ئۆسیریس بووە. ڤاکخۆس خوای شەراب، کوڕی دیا (ژوپیتێر) و لە زۆربەی وڵاتانی سەردەمی کۆن، جێژنی گەورە و بەشکۆی بۆ گیراوە.

خواوەند فالۆس[1]، خوای کێر و گوونی پیاو، پەیکەرەی یەکپارچەی پیاو بە بەرزی یەک پیخیس[2] دروست دەکەن. ژنانی لادێ بەو پەیکەرەیە رادەگەن و خزمەتی دەکەن و کاتێک بە کۆڵانی ئاواییەکاندا دەیگێڕن، کێری پەیکەرەکە دەجولێتەوە و تەقریبەن بە قەرا تەواوی لەشی پەیکەرەکە دەبێ. کەسێک وەپێش کاروانی ژنەکان دەکەوێ و فلووت لێدەدا و ئەوانیش بە گۆرانی و سرود ستایشی خواوەند دیۆنیسۆس دەکەن. میسرییەکان ئەندامانی نێرینەی ئەو پەیکەرەیە بەمەبەستی پەرستن، گەورەتر دروستدەکەن و تەنیا شوێنێکی لەشە دەجولێتەوە.

[٤٩] بە باوەڕی من مێلامپۆس[3]، کوڕی ئامیتیئۆنۆس ئەو رێورەسمەی رەت نەکردۆتەوە، بەڵکوو زانیاری زۆری لە بارەیانەوە هەبووە، چونکە ئەو بوو کە ناوی دیۆنیسۆس و شێوەی قوربانیکردن و رێپێوانی کێری فێری یۆنانییەکان کرد (رێپێوانی بە کۆمەڵی فالۆس). دیارە ئەوەش بگووترێ کە ناوبراو ئاوا خێرا یۆنانییەکانی فێری ئەو دابونەریتە نەکرد، کەسانیتر دوای ئەو دەرسەکانیان باشتر گووتەوە. مێلامپۆس ئەو کەسە بوو کە یەکەمجار رێپێوانی کێری هێنا بۆ خاکی یۆنان و یۆنانییەکان لەو فێربوون ئەو شتگەلە لە ریورەسمی ئایینی و پەرەستنی خواوەند دیۆنیسۆس بەکاربێنن. من ئەوەشی پێوە زیاددەکەم کە مێلامپۆس مرۆڤێکی وریا بۆ فێربوونی زانستی تاڵەبینی بوو، پێشگۆیی و غەیبگۆیی باش دەزانی و گەلێک زانیاریتری لەلا بوو. ناوبراو پاش ئەوەی شێوەی پەرستنی خواکان فێربوو و بەتایبەت سەبارەت بە دیۆنیسۆس، ئەوسا بە تۆزێک دەسکارییەوە هێنایە نێو کۆمەڵگای یۆنانی. من باوەڕم بەوە نییە کە وێکچوویی رێورەسمەکانی ئایینی

---

١- پەیکەری پیاو بە کێرێکی زل و درێژ، بە کوچە و کۆلاناندا دەگێردرا و خەڵک هەڵپەڕکێ و سەمایان بۆ دەکرد.

٢- پیخیسی سەردەمی باستان بەرابەری ٤٦ سانتیمیتر بووە.

٣- مێلامپۆس چارەبینێکی ناسراو بوو و بە زانستەکەی شێتایەتی کچانی پرۆئیتۆس، پاشای ئارغۆسی چارەسەرکرد و وەک پاداش داوای نیوەی خاکی وڵاتی لە پاشاکرد. ئەوە هەمان کەسە کە پەرستنی دیۆنیسۆس یا ڤاکخۆس، واتە خوای شەرابی هێنایە یۆنان.

میسری و یۆنانی لەمەر ڕێزدانان بۆ خواکان، دیاردەیەکی بە هەڵکەوت بێ. چونکە ئەگەر ئاوا بوایە، ئەو مەراسیمەی دواییش وەک باقی جێژنەکانی‌تری یۆنانی بەڕێوە دەچوو نەک لەو دواییانەدا وەدیارکەوتبێ. من هەروەها ئەوەش پەسند ناکەم کە میسرییەکان ئەو کەلتوورەیان لە یۆنانییەکان یا خەڵکانیتر وەرگرتبێ. بە باوەڕی من زۆر وێناچی کە مێلامپۆس ئەو چەشنە پەرستن و نەریتەی خواوەند دیۆنیسۆسی لە کادمۆس[1]، خەڵکی تیریۆس یا لە یارانی ئەو فێربووبێ. ئەو خەڵکە باسمکرد فینیقی بوون و هاتبوونە هەرێمی ڤیۆتی‌یا[2].

[٥٠] ناوی گشت خواکان لە میسرەوە هاتوونەتە وڵاتی یۆنان. چونکە بە توێژینەوەکەم تێگەییم کە ئەو ناوانە بەهۆی بەربەرەکانەوە گەیشتوونەتە لای ئێمە و بەتایبەتی لە میسرەوە هاتوون. ئەگەر پۆسیدۆن[3] و دیۆسکوروس[4] کە پێشتر باسم کردن و هەروەها خواوەندەکانی وەک ئیرا،[5] ئێستییا[6]، تێمیس[7]، خاریتی[8]، نیریدی[9] هەڵاوێرم، باقی خواکانی‌تری میسری لە قەدیمەوە لەو وڵاتە ناسراوبوونە. ناوی خواکان، ئەو کۆمەڵە خوایەی کە میسرییەکان دان بە نەناسینیان دا دەنێن، بە باوەڕی من بەهۆی پێلاسغی‌یەکان[10] ناسێندراون،

---

١- کادمۆس نەوەی مێلامپۆس بووە.

٢- ڤیۆتیا، ناوچەیەکی باستانی و لە بەشی نێوەندیی یۆنان هەڵکەوتووە و خاوەن شارێکی ناسراوە بەناوی تیڤا.

٣- پۆسیدۆن یا نێپتون، خوای دەریاکان، کوڕی ساتورنوس (زوحێل یا کەیوان) و برای دیا (زیئۆس یا ژوپیتێر).

٤- دیوسکوروس، ئەو ناوە بە کۆ دێ و دەگەڕێتەوە بۆ دوو کەس لە منداڵانی خواوەند دیا، دوو ئەستێرە بە ناوەکانی کاستور و پۆلوکس.

٥- ئیرا، هێرا یا ژونون، ژنی خواوەند دیا و ئیلاهەی زەماوەند لە یۆنانی باستان.

٦- ئێستییا، هێستیا یا وێستا، ئیلاهەی ئاگر و مەکۆی خاوخێزان.

٧- تێمیس، ئیلاهەی عەدل و دادپەروەری و بەردەوام تەرازوویەکی بەدەستەوەیە.

٨- خاریتی یا گراس، ئیلاهەکانی سیمبول و وێنای جوانی و سرنجڕاکێشینە. ئەو کۆمەڵە ئیلاهەیە سێ کەس و بریتی لە ئاغلائی‌ئا، تالیا و ئەفرۆسین بوونە.

٩- کچەکانی نێرێ و دریس، ئیلاهەکانی دەریای مەدیترانە.

١٠- پێلاسغی، هۆزێکی کۆن کە لە سەردەمی پێش مێژوو لەسەر خاکی یۆنانی ئەمڕۆ و کۆمەڵە دورگەکان و نیمچە دورگەکانی ئاسیا بچووک و ئیتالیا ژیاون. یۆنانییەکان ئەوانەیان ڕاونا و

تەنیا خواوەند پۆسیدۆن نەبێ، هەڵبەت ناوی ئەویش لە خەڵکی لیبیایی فێربوونە. لە سەرەتاوە، لە هیچ شوێنێک ناوی پۆسیدۆن نەهاتووەتە ناسکردن، لە لیبی نەبێ و تەنیا ئەوان ئەو ناوەیان پاراستووە. ئایینی میسرییەکان پەرەستنی هیچ پێرۆس[1]،واتە قارەمانێک وەک خوا لەخۆناگرێ.

[٥١] ئەوانەی باسم کردن و زۆر بابەتگەلی‌تر کە لە درێژەدا دەیانهێنمە گۆڕێ، ئەو شتانەن کە یۆنانییەکان لە میسرییەکانیان وەرگرتووە. یۆنانییەکان راستەوخۆ لە میسرییەکان فێرنەبوون، بەڵکوو ئەو راگواستنە بەهۆی پێلاسغی‌یەکانەوە بە ئەنجام گەیشتووە _ سەرەتا یۆنانییەکان ئەو دابونەریتانەیان وەرگرت و پاشان خەڵکانی‌تر _ و بەتایبەتی لەمەر دروستکردنی پەیکەرەی خواوەند ئێرمیسی[2] خاوەن کێری رەپ. ئەوکاتە ئاتێنی‌یەکان بەشێک لە کۆمەڵگای یۆنانی بوون، وەختێک پێلاسغی‌یەکان هاتن و لە ناوچەکانی ئاتێنی نیشتەجێ بوون و وەک یۆنانی حیسابکران، هەر ئەوان بوون کە ئەو نەریتانەیان بڵاوکردەوە. هەرکەس بەشداری رێورەسمی ئایینی کافیریەکان[3] بووبێ کە لەلایەن سامۆتراکی‌یەکانەوە[4] پێکدێ، بۆی دەردەکەوێ کە لە پێلاسغی‌یەکانەوە سەرچاوەی گرتووە.

پێلاسغی‌یەکان سەرەتا لە سامۆتراکی نیشتەجێ بوون، بەر لەوەی بچنە هەرێمی ئاتێنی‌یەکان. سامۆتراکی‌یەکان دابونەریتی ئایینی کافیری لە

---

کۆمەڵێکیان لێ بەدیل گرتن. دانیشتووانی تراس و فریژی و کاری و ئەتروسکی و ئاڵبانی و ئیتالیاییەکانی نیشتەجێ لە دورگەکان ئەو هۆزەن.

١- پێرۆس یا هێرۆس لە سەردەمی باستاندا بەو کەسانە دەگووترا کە بەرهەمی زەماوەندی یەکێک لە خواکان لەگەڵ مرۆڤ بووە. ئەوانە دوای ئەوەی ماوەیەک لەسەر عەرز ژیاون، بوونەتە خاوەن تایبەتمەندی ئیلاهی و وەک نیوە خوایەک سەیریان کراوە.

٢- ئێرمیس یا مێرکوری کوڕی خواوەند دیا (ژوپیتێر)، خوای رەوانبێژی و قسەپاراوی و توجارەت و مامەڵە بووە.

٣- کافیری‌یەکان، ناوی ئەو کۆمەڵە خوایانە بووە کە لە شارەکانی ساموتراکی و دورگەی لیمنۆس پەرستش کراون و دەگووترێ کە منالانی خواوەند ئیفێستیۆس واتە خواکانی ئاگر و گڕکان بوونە.

٤- سامۆتراکی، یەکێک لە دورگەکانی یۆنانی هەڵکەوتوو لە بەرامبەر کەنارئاوەکانی تراکی یا تراس و شوێنێکی ناسراو بەبۆنەی بەڕێوەچوونی رێورەسمی ئایینی کافیری بووە.

پێلاسغی‌یەکان فێربوون. بەر لە گشت یۆنانییەکان، ئاتێنی‌یەکان شێوازی دروستکردنی پەیکەرەی خواوەند ئێرمیس‌یان بە کێری هەستاو لە پێلاسغی‌یەکان رەچاوکرد. پێلاسغی‌یەکان لەو باوەڕەدان کە هۆی موقەددەس و پیرۆز لەپشت نهێنی‌یەکانی ئایینیی سامۆتراکی بەرچاو دەکەوێ.

[٥٢] وەک لە نێوەندی ئایینی دۆدۆنیس[١] پێیان‌گووتم، لە سەردەمی دێرین (باستان)دا پێلاسغی‌یەکان لە کاتی قوربانی‌کردن بۆ خواکان تەنیا ناویان دەهێنان و تایبەتمەندییەکی تایبەتی خواکەیان وەبەرچاو نەدەگرت. ئەوەش بۆیە بوو کە هیچکات ناوی خواکانیان نەبیستبوو و نەیاندەناسین. ئەوان تەنیا وشەی خوایان بەکار دەهێنا. خواکان دەسەڵاتیان دابەش کردبوو و نەزم و نیزامیان بۆ گشت لایە دامەزراندبوو. دواتر پاش تێپەڕبوونی زەمەنێکی زۆر، فێری ناوی خواکانیش بوون کە لە میسرەوە هاتن. دیارە ئەوەش بڵێم کە ئەوان زۆر درەنگ فێری ناوی خواوەند دیۆنیسۆس بوون. پێلاسغی‌یەکان پاش فەترەیەک سەبارەت بە ناوی ئەو خوایانە راوێژیان لەگەڵ کاهێنی مەزنی پەرستگەی دۆدۆنیس کرد. ئەو نێوەندە ئایینی‌یە کۆنترین و یەکەم شوێنی پێشگۆیی و ئەستێرە ناسی ئەو سەردەمەی یۆنانییەکان بوو. هەرکات پێلاسغی‌یەکان داوای فەتوایان لە نێوەندی ئایینی دۆدۆنیس بکردایە کە ئایا بۆیان هەیە کەڵک لە ناوی ئەو کۆمەڵە خوایانە وەرگرن کە بەهۆی خەڵکانی بەربەرەوە پێیان گەیشتووە، پەرستگە وڵامی ئەرێنی دەدانەوە. هەر لەو کاتەوە پێلاسغی‌یەکان لە مەراسیمەکانی ئایینی خۆیاندا بەناو لەبەر ئەو خوایانە دەپاڕێنەوە. یۆنانییەکان دواتر ئەو نەریتە ئایینی‌یەیان لە پێلاسغی‌یەکان وەرگرت.

[٥٣] بەو پێیە دەبێ بڵێم، یۆنانییەکان تا دوێنێ نەیاندەزانی ناوی ئەو خوایانە لەکوێوە سەرچاوەی گرتووە، ئەگەر بوونیان هەبووە یا هەرکام

---

١- ناوی یەکێک لە شارەکانی هەرێمی ئیپیرۆس یا ئێپیرێ لە یۆنانی باستاندا. ئەو ناوچەیە بەهۆی مەعبەدێک کە لە تەنیشت دارستان بنیات‌نرابوو، دەناسرا. ئەو مەعبەدە تایبەتی خواوەند دیا بوو و دەنگی کاهێنە مەزنەکەی تێکەڵ بە خشەی گەڵای دارەکان دەبوو و دەبیسرا.

لەوانە چ خوایەک بووە. چونکە ئیسیۆدۆس[1] و ئۆمیرۆس[2] قەدیمیتر لە منن و هەڵبەت نەک پتر لە چوارسەد ساڵ. ئەوانە بوون کە لە شێعرەکانیاندا مێژووی خواکانیان تۆمارکرد و تایبەتمەندی و سنووری شانازی و دەسەڵات و روخسار و قەوارەی یەکیەکی ئەوانەیان دیاریکرد. سەبارەت بەو کۆمەڵە شاعیرە کە بەر لەو دوو کەسە ژیابن، من لەو باوەڕەدام کە بەپێچەوانەوە، دەبێ دواتر بووبن. لەوانەی سەرەوە، کۆمەڵەی یەکەمی شاعیران بەهۆی پیاوانی ئاییی نێوەندی ئەستێرەناسی دۆدۆنیس باسیان کراوە. سەبارەت بە ئەوانیتر، ئیسیۆدۆس و ئۆمیرۆس، من خۆم باسیان دەکەم.

[٥٤] میسرییەکان سەبارەت بە کاهێنانی یۆنانی و لیبیایی بەو چەشنە دەدوێن. کاهێنانی پەرستگەی دیا لە شاری تیڤا پێیانگووتم کە دوو کەس لەو ژنانەی خزمەتی خواکانیان دەکرد، بەهۆی فینیقییەکانەوە رفێندران. کاهێنەکان خەبەریان پێگەیی کە یەکێک لەو ژنانەیان بردووەتە ئەفریقا و لەوێ فرۆشتوویانە و ئەوەیتریشیان بردووەتە یۆنان. ئەو جۆرەی باسدەکرێ، گۆیا ئەو ژنانە یەکەم کەسانێک بوونە پەرستگەیان دروستکردوە. من لە کاهێنەکانم پرسی کە ئەو زانیارییە وردەیان لەکوێوە دەسکەوتووە. ئەوان وڵامیان دامەوە کە زۆر لەمێژە وەدوای پێوشوێنی ئەو ژنانە کەوتوون و هیچ ئاسەوارێکیان نەدۆزیوەتەوە و زانیاری ئێستاشیان دواتر دەسکەوتووە.

---

١- ئیسیۆدۆس، شاعیری یۆنانی لە سەدەی هەشتی بەرلە زایین، خەڵکی ڤیۆتیا و هۆنەری کۆمەڵێک شێعری پاکرەوشتە.ناسراوترین بەرهەمی ئەو شاعیرە بەناوی تیئۆیێنیا (تیئۆغۆنیا) واتە رەگەزنامەی خانەدانی خواکان بووە و دەگووترێ کە مریدانی ئەو شاعیرە کۆیان کردوەتەوە.

٢- ئۆمیرۆس یا هۆمێر، شاعیری یۆنانی سەدەی نۆی پێش زایین، خاوەن دوو بەرهەمی ئەدەبی ناسراو بە ناوەکانی ئیلیاد و ئۆدیسە. سەبارەت بە شوێنی لەدایکبوونی ناوبراو بۆچوونی جیاواز هەیە و حەوت شار بە مەوتەنی ئەو شاعیرە دادەندرێت. دەگێڕنەوە کە هۆمێر پیرێکی کوێر بووە و شار بە شار گەڕاوە و شێعری گوتووە.

[٥٥] من ئەو قسانەم لە پیاوانی ئایینی شاری تیڤا بیست. ئێستا باسی ئەوە دەکەم کە ژنانی کاهێنی پەرستگەی دۆدۆنیس[١] پێیانگوتووم: دوو کۆتری رەش لە دەڤەری تیڤای میسر هەڵفڕین. یەکیان گەیشتە لیبی و ئەوەیتریش چوو بۆ ناوچەی دۆدۆنیس. ئەوەی دووهەمیان لەسەر دار بەڕوو نیشت و بە دەنگی مرۆڤێکەوە گووتی کە پێویستە لەو شوێنە پەرستگەیەک بۆ خواوەند دیا دروست بکرێ. ئەوانەی کە گوێیان لەو دەنگە بوو، وەک ئەمری خواوەندیان وەرگرت و لەجێوە پەسندیان کرد. ئەو کۆترەش کە گەیشتە وڵاتی لیبی، داوای لە لیبییەکان کرد نێوەندی ئایینی ئامۆنۆس[٢] بنیاتبنێن. ئەو نێوەندەش پێشکەش بە خواوەند دیا کراوە. کاهێنانی ژنی مەعبەدی دۆدۆنیس کە ئەو زانیارییانەیان بە من داوە، ئەو کەسانەن: پرۆمێنیا، لە گشتیان پیرتر و قەدیمیتر و خاوەن پلەی بەرزتر، تیمارێتی ساحێبی پێگەی ئایینی مام نێوەندی، نیکاندرا لە هەموویان گەنجتر. خەڵکانیتریش کە لە پەرستگەی دۆدۆنیس کاردەکەن، لەگەڵ بۆچوونی ژنانی ئایینی مژوڵ بە کاروباری موقەددەسەوە هاورابوون.

[٥٦] بۆچوونی من سەبارەت بەو زانیارییانەی سەرەوە بەو شێوەیە: ئەگەر ئەو قسەیە راست بێ کە فینیقییەکان دوو ژنە پیرۆزەکەیان رفاندبی و پاشان بە لیبییایی و یۆنانییەکانیان فرۆشتبێ، ئەوکاتە ئەوەی بەرەو ئەو شوێنە چووە کە ئیمڕۆ پێیدەگووترێ یۆنان، ئەو سەردەمە ناسراوبووە بە وڵاتی پێلاسغییەکان[٣] و ئەو ژنە لە دەڤەری تێسپرۆتیا[٤] فرۆشراوە و دواتر وەک کۆیلە لەوێ کاری کردوە و پەرستگەیەکی لە ژێر داری بەڕوو بۆ

---

١- یەک لە شارەکانی نێوەندی یۆنان کە کاهێنە مەزنەکەی دوای مەعبەدی دێلفوس، ناسراوترین کاهێنی سەردەمی باستان بووە.

٢- ئامۆنۆس یا ئامۆن، خوای میسرییانی باستان و پارێزەری شاری تیڤا و خاوەن مەعبەدی کارناک.

٣- ناوی سەرەتایی نیمچە دورگەی پێلۆپۆنیسۆس و چەند هەرێمێکیتر کە شوێنی نیشتەجێیی پێلاسغییەکان بووە.

٤- تێسپرۆتیا، هۆزێک کە لە بەشی رۆژئاوای ئیپیرۆ ژیاوە و لە رەگەزی پێلاسغی بووە. وڵاتێک کە ئەوانە لێی ژیاون، ناسراو بە تێسپرۆتی بووە.

خواوەند دیا سازکردوە. ئەوەش دیاردەیەکی سروشتییە، چونکە ئەو وەک ژنێکی ئایینی پێشتر لە پەرستگەی دیا لە هەرێمی تیڤای وڵاتی میسر خزمەتی کردوە و یادی ئەو خوایەی لەدڵدا بووە و بیری لە دروستکردنی پەرستگە کردبێتەوە. ئەو ژنە کاتێک زمانی یۆنانی فێربووە، پەرستگەیەکی بنیاتناوە. ئەو هەر لەو شوێنە نوێیە بۆ یەکەمجار ئاشکرای کردوە کە فینیقی‌یەکان خوشکی ئەویان بە لیبی‌یەکان فرۆشتووە.

[٥٧] بە باوەڕی من خەڵکی ناوچەی دۆدۆنیس بۆیە بەو دوو ژنە ئایینی‌یەیان گوتووە کۆتر، چونکە لە وڵاتی بێگانەوە هاتبوون و دەنگ و چریکەیان وەک باڵندە دەچوو. دەگێڕنەوە کە کۆترەکە دوای ماوەیەک بە زمانی مرۆڤەکان قسەی کردوە، واتە ژنە بە زمانی یۆنانی ئاخاوتووە. ئەوەندەی بە زمانی بێگانەوە قسەی کردوە، شێوەی دەنگی کۆتری داوە، چونکە لە عەقڵ بەدوورە کۆتر بە زمانی مرۆڤ قسە بکات. کاتێک دەڵێن کۆترێکی رەش بووە، دەخوازن بڵێن ئەو ژنە خەڵکی وڵاتی میسر بووە. شێوازی تاڵەبینی و پێشگۆیی لەلای میسرییەکانی دەڤەری تیڤا و ناوچەی دۆدۆنیسی یۆنان تەقریبەن وەک یەک دەچن. ئەوەش بڵێم کە ئەو تاڵەبینی‌یەی بەدەم قوربانی کردنەوە بەڕێوە دەچێ، سەرچاوەی میسری هەیە.

[٥٨] کۆبوونەوە و رێورەسم و جێژن و رێپێوانە ئایینی‌یەکان، سەرەتا گشتیان بەهۆی میسرییەکانەوە سازبوون و لەوانەوە گەیشتوونەتە دەست یۆنانییەکان. بەڵگەش بۆ ئەو قسەیەم ئەوەیە کە لە وڵاتی میسر لەمێژ ساڵە ئەو مەراسیمانە بەڕێوە دەچن، لە حاڵێکدا لەو ساڵانەی دواییدا لە یۆنان دەستیان پێکردوە.

[٥٩] میسرییەکان لە ساڵدا کۆمەڵێک بۆنەیان هەیە و تەنیا بە جێژنێک قەناعەت ناهێنن. سەرەتا، گەورەترین و گرینگترین جێژنیان لە شاری

ڤوڤاستی بۆ ڕێزگرتن لە خواوەند ئارتیمیس[1] بەڕێوەبردوە. پاشان، بۆ خواوەند ئیسی[2] لە شاری ڤوسیری[3] مەراسیمێکیان سازکردوە. لەو شارە گەورەترین پەرستگە بۆ ڕێزلێنان لە خواوەند ئیسیدۆس بیناکراوە. شارەکە لەنێوەڕاستی دێلتا هەڵکەوتووە. خواوەند ئیسیدۆس لە زمانی یۆنانیدا پێیدەگوترێ دیمیترا[4]. سێهەم جێژن لە شاری سای[5]، بۆ ڕێزگرتن لە خواوەند ئاتینا[6] تەرخان کراوە. چوارەم جێژنی میسرییەکان لە ناوچەی ئیلیۆپۆلی[7] بۆ بۆ خۆر (ئیلیۆس)[8] و ڕووناکی داندراوە. پێنجەم، خواوەندی مێینە لیتۆن[9] لە شاری ڤوتوو و شەشم خواوەند ئاری[10] لە شاری پاپریمی[11] ڕێورەسمیان بۆ بەڕێوەدەچێ.

[٦٠] میسرییەکان وەختێک لە شاری ڤوڤاسی کۆدەبنەوە، بەو شێوەیە هەڵسوکەوت دەکەن: جەماوەرێکی زۆر ژن و پیاو بە قایق و گەمی دێنە ئەو

---

١- ئارتیمیس، یەک لە خواکانی یۆنانی کۆن، خاوەن ناوی دووهەم واتە دیانا و کچی دیا (ژوپیتێر) خوای ڕاو و شکار و دارستانەکان بووە.

٢- ئیسیس، ئیلاهەی میسری باستان، خوشک و ژنی خواوەند ئوسیریس، ئیلاهەی تەبابەت و زەماوەند و مەزرای گەنم و نیشانەی شارستانییەتی سەرەتایی وڵاتی میسر بووە.

٣- ڤوسیری، شارێکی کۆنی میسر، ئەمڕۆ ناسراو بە تەلبەستە و لە نیزیک زاگازیگ هەڵکەوتووە.

٤- دیمیترا، یا سێریس، کچی خواوەند ساتورنۆس (کەیوان یا زوحەیل)، ئیلاهەی خەرمان و زەوی و زار و کشتوکاڵ.

٥- سای یا سائیس، یەکێک لە شارەکانی میسری باستان و پێتەختی خانەدانی پاشایەتی سائیت و ئەمڕۆ ناسراوە بە کەنارئاوەکانی حەجەر.

٦- ئاتینا، ئیلاهەی یۆنانی کۆن، لە زمانی رۆمیدا پێیدەگووترێ مینێروا، کچی خواوەند دیا و خوای هزر و هونەرە جوانەکان.

٧- ئیلیۆپۆلی، یەک لە شارەکانی میسری کۆن، کەلاوەکانی لە نیزیک قاهیرە ماوەن و ناسراوە بە تەلولحەسەن.

٨- ئیلیۆس، ئیلاهەی خۆر، نیشانە و سیمبۆلی نور و روناکی.

٩- لیتۆن، دایکی ئاپۆلۆن و ئاتینا، دژبەری ژونون واتە ئیلاهەی یۆنانی باستان.

١٠- ئاری، ئاریس یا مارس، کوڕی خواوەند ژوپیتێر و ژونون، خوای شەڕ لە یۆنان و رۆمی باستان.

١١- پاپریمی، وێدەچی هەمان شاری پێلوسە بێ کە یەکێک لە دەروازەکانی مەحکەمی میسری کۆن بووە.

شارە. هێندیک لە ژنەکان ئامێری مۆسیقا ژەنینی چەشنی شەقشەقەیان پێیە (کرۆتاڵ)[1] و بەردەوام لێیدەدەن. هەربابایە شتێک بۆ ئەو سەفەرە لەگەڵ خۆی دێنێ. لەو نێوەدا کۆمەڵێک لە پیاوەکان ئامێری فلووت دەژەنن. باقی ژنان و پیاوانیتر گۆرانی دەڵێن و چەپڵە لێدەدەن. هەرکات لە شارێک نیزیک دەکەونەوە، بەو چەشنە دەجوڵێنەوە: کۆمەڵێک لە ژنەکان وەک باسم کرد خەریکی چەقەنەلێدان و شەقشەقە ژەنین دەبن و بەشێکیش جەفەنگ لەگەڵ ژنان و کچانی ئاوایی لێدەدەن و لەڕاستیدا پێیان ڕادەبوێرن و ئەوانیتریش سەما دەکەن و جاروبار داوێنەکانیان هەڵدەدەنەوە. بە گشت شارەکانی قەراخ دەریادا دەربازدەبن و بە هەمان شێوە دەجوڵێنەوە. وەختێک دەگەنە ڤوڤاستی جێژن دەست پێدەکەن. بە دەم پێشکەش کردنی قوربانی گەورە، ئەو ڕۆژە پتر لە هەر کاتێکیتر شەڕاب دەنۆشن. ژنان و پیاوانی ئەو ناوچەیەش لەوێ کۆدەبنەوە، جیا لە مناڵەکانیان ژمارەیان دەگاتە حەوت سەد هەزار کەس.

[٦١] دیتمان جێژنەکان لە شاری ڤوڤاستی چۆن بەڕێوە چوون. سەبارەت بە چۆنییەتی جێژن گرتن لە پەرستگەی (ئیسی)یش پێشتر قسەم کرد. گووتم کە بە دەیان هەزار کەس ژن و پیاو دوای بەڕێوەچوونی قوربانی چۆن لە سینگی خۆیان دەدەن. بۆچی ئەو کارە دەکەن، من بە شایستەی نازانم لێرەدا لەسەری بڕۆم. ئەو کۆمەڵە خەڵکەی لە ناوچەی کاری وڵاتی میسر دەژین، شتگەلی سەیرتر دەکەن. ئەوانە نێوچاوانیان بە چەقۆ لێدان بریندار دەکەن و بەو چەشنە گەرەکیانە نیشانبدەن کە بێگانەن و میسری نین.

[٦٢] میسرییەکان وەختێک لە شاری سای بۆ ئەو مەبەستە کۆدەبنەوە، گشتیان قەندیلیان بە دەستەوەیە و لە دەرێن و بە کۆڵاناندا دەخولێنەوە. ئەو قەندیلانە لەڕاستیدا پیاڵەیەکی پڕ لە ڕۆن و خوێیە و فتیلەی تێچەقاوە و سەرتاسەری شەو دایسێن. ئەو جێژنە پێیدەگووترێ چراخان. ئەو کۆمەڵە خەلکە میسرییەی ناچنە ئەو مەراسیمە ئایینییە، شەونخوونی دەکەن و گشت

---

١- کرۆتاڵ، چەشنێک ئامێری کۆنی مۆسیقا کە لە دوو پارچە تەختە پێکهاتووە. شەقشەقەی کوردی کوردی بۆ دەرکردنی باڵندە لە باغاتی گێلاس و ئاڵوباڵوو.

قەندیلەکانیان دادەگیرسێنن. بەو شێوەیە تەنیا قەندیلەکانی شاری سای نین کە دایسێن، بەڵکوو لە سەراسەری خاکی میسردا رۆشەنن. هەڵبەت هۆی ئایینی لەگۆڕێدا و شەوێکی موقەددەسە و پێشکەش بە رووناکی کراوە.

[٦٣] لە شاری ئیلیۆپۆلی و ڤوتۆس، خەڵک تەنیا بە مەبەستی قوربانی کردن دەچنە ئەو جێژنە. لە شاری پاپریمی جیا لە ڕێورەسمی قوربانی، وەک شوێنەکانیتر جێژنیش دەگیرێ. لەوێ وەختێک ڕۆژ ئاوا دەبێ، چەند کەسێک لە کاهێنانی پەرستگە بە دەوری پەیکەرەی خواکەیاندا هەڵدەسوڕێن و پێیرادەگەن. زۆربەی خەڵک گۆپاڵی داریان بەدەستەوەیە و لەبەر درگای پەرستگە رادەوەستن. لە رووبەرووی ئەوانیشدا نیزیک بە هەزار کەسێکیتری گۆپاڵدار لەوانەی نەزریان کردوە، جێگا دەگرن. پەیکەرەی خواوەند لەنێو پەرستگەیەکی گەڕۆکی بچووکی چەشنی کەژاوەدا داندراوە. ئەو پەرستگە بچووکە بە زێڕ و ئاڵتون رازاوەتەوە. پیاوانی ئایینی کە مژوڵی ئەو پەرستگە و پەیکەرەکەن، بە ئەسپایی پەرستگەکە هەڵدەگرن و لەسەر عارەبانەی چوار چەرخی دادەنێن. مەبەست ئەوەیە کە ئەو پەیکەرەیە بچێتە نێو ژووری پەرستگەی گەورە. گوتمان کە کۆمەڵێکی زۆریش لە کاهێنانیتر لەبەر درگای پەرستگەی ئەسڵی راوەستاون و ڕێگە بە چوونە ژوورەوەی پەیکەرەکە نادەن. ئەو کاهێنانەی نەزریان کردوە و یارمەتی پەیکەرەی خواوەند دەدەن کە بچێتە ژوورەوە، لەڕووی ناچاری وەردەگەڕێنە بەرهەڵستکاران و بڵاوەیان پێدەکەن. شەڕێکی قورس دەست پێدەکا. بە گۆپاڵ سەر و گوێلاکی یەکتر دەشکێنن. من خۆم لەو باوەڕەدام کە زۆربەی ئەو کاهێنانە لەبەر کاریبوونی برینەکانیان دەمرن. دیارە میسرییەکان باوەڕیان بەوە نییە کە کەس بمرێ. خەڵکی ناوچەکەش باوەڕ بە مردنی کەس ناکەن. خەڵکەکە پێیانوایە ئەو جێژن و ڕێورەسمە بۆیە بەڕێوە دەچێ، چونکە دایکی خواوەند ئاریس[1] لەنێو پەرستگەدا دەژی.

---

١- ئاری یا مارس، خوای شەڕ و پێکدادان.

خواوەند ئاریس لە شوێنێکی‌تر و دوور لە دایکی پەروەردە بووە و کاتێک باڵغ بووە، چووەتە ژووری پەرستگەی پاپریمی و ویستوویەتی لەگەڵ دایکی خۆی تێکەڵاوی جینسی بکات. نیگابانانی دایکی ئاریس کە هیچکات ئەو کوڕەیان نەدیوە، ڕێگەی پێنادەن بچیتە نێو پەرستگە. ئاریس خەڵکی لە شارەکانی‌ترەوە لەگەڵ خۆی هێناوە و شەڕی لەگەڵ پاسەوانەکان کردوە. ئاریس بە زۆری خۆی لە ژووریٚ ئاخنیوە و چووەتە لای دایکی. ئەو بەشە لە شەڕ و پێکدادانی مەراسیمەکە دەگەڕێتەوە سەر ئەو ڕەوایەتە.

[٦٤] میسرییەکان یەکەم خەڵکانێک بوون کە یاساکانی ئایینی‌یان دامەزراند. ئەوەش بۆوەی بوو کە پیاوان هەقیان نەبیٚ تخوونی ژنانی نێو پەرستگە بکەون و هەروەها ئەگەر تێکەڵاویان لە دەرەوەش هەبوویٚ، بەر لەوەی غوسڵ دەرکەن، نەچنە نێو پەرستگە. تەقریبەن گشت خەڵکانی‌تر جیا لە میسری و یۆنانییەکان تێکەڵاوی جینسی لەنێو پەرستگەدا دەکەن، یا لە دەرەوە ئەو کارە دەکەن و بەبیٚ ئاو بەخۆ داکردن دەچنە نێو پەرستگە.

ئەو خەڵکانە پێیانوایە کە مرۆڤەکانیش چەشنی ئاژەڵەکانن. ئەوەش دەگەڕێتەوە سەر ئەو دیاردەیە کە ئەوان بە چاوی خۆیان دەبینن کە ئاژەڵ و پەلەوەر تێکەڵاوی جینسی لەنێو پەرستگەی خواکان و لە حەساری موقەددەسدا دەکەن. ئەوان دەڵێن، ئەگەر ئەو کارە بە دڵی خواکان نەبوایە، ڕێگایان بە ئاژەڵانیش نەدەدا. ئەوە بۆچوونی خەڵکە، بەڵام بە باوەڕی من کارێکی لێوەشاوە نییە.

[٦٥] میسرییەکان بە حورمەتێکی فرەوە ئەرکەکانی ئایینی و بەتایبەتی ئەوانەی خوارەوە دەپارێزن: وڵاتی میسر ئەگەرچی لەگەڵ لیبی (ئەفریقا) هاوسنوورە، خاوەن ئاژەڵێکی زۆر نییە. ئەوەندەش کە هەن، هەرهەموویان بەلایانەوە موقەددەس و پیرۆزن، تەنانەت ئەوانە و گەلێکی‌تر کە خۆماڵین و لەگەڵ مرۆڤەکان دەژین. ئەگەر بڵێم بۆچی، ئەو کاتە ناچار دەبم باسی بابەتگەلی ئایینی بکەم. دیارە دەبیٚ بڵێم کە ئەوەندەی بۆم بکریٚ خۆی لێدەبوێرم. ئەگەریش تا ئێستا چەند کورتەیەکم لەو بارەوە گوتووە، ناچار

بوومە. بەهەرحاڵ ئەو کۆمەڵە یاسایە سەبارەت بە ئاژەڵەکان بەڕێوە دەچن: پاسەوان بۆ هەر ڕەگەزە ئاژەڵێک دیاریکراوە، ژن یا پیاو بێ گرینگ نییە، ئەو پاسەوانانە لەسەریانە کە پارێزگاری لە ئاژەڵان بکەن و خواردنیان بدەنێ. ئەو بەرپرسیارەتییە وەک میرات لە باوەکەوە بۆ منداڵەکان دەمێنێتەوە. ئەوانەی لە کۆمەڵگا و ئاواییەکانی جۆراوجۆردا نەزر و خێر بکەن، بەو چەشنە دەجوڵێنەوە: بەدەم نوێژ و پاڕانەوە لەبەر خوا، واتە ئەو خوایەی ئاژەڵەکەی بۆ دیاریکراوە، سەری منداڵەکانیان بەتەواوی یا نیوەی یا یەک لە سێی قژەکانی دەتاشن و پاشان قورسایی قژەکە بە تەرازوو حیساب دەکەن. بەو قەیاسە زێو دەبەخشنە شوان و پارێزگاری ئاژەڵەکە. شوانەکە بەو پارانەی وەریدەگرێ پەڵخوڕی ماسی کە خۆراکی سەرەکی ئاژەڵانە، دابین دەکا. ئەگەر کەسێک بەئەنقەست ئاژەڵێکی موقەددەس بکوژێ، بەرەوڕووی سزای مەرگ دەبێتەوە. بەڵام ئەگەر بە ئەنقەست نەبێ، ئەو کاتە لەسەریەتی زیانەکە قەرەبوو بکاتەوە. قەرەبووی زەرەر و زیان گەیاندن بە ئاژەڵان، بەهۆی کاهێنانەوە دیاری دەکرێ. لەو نێوەدا، ئەگەر کەسێک بە ئەنقەست یا بە هەڵە حاجی لەقلەق یا سەقر و باز بکوژێ، تووشی سزای مەرگ دەبێتەوە.

[٦٦] ئاژەڵ و پەلەوەری خۆماڵی گەلێک زۆرن. ئەگەر پشیلەکان بەو چەشنەی باسی دەکەم نەجوڵابانەوە، ڕەنگ بوو ژمارەیان پتریش بێ. کاتێک پشیلە دەزێ و تووتکەی هەن، حەز ناکا نێرینەی باوک تخوونی بێچوەکانی بکەوێ. نێرینە حەزی لە جووت بوونی دووبارەیە و مێیینە ئامادە نییە. لەکاتی ئەوتۆدا، نێرینە بە ئاشکرا ڕۆدەبێتە جووجکە پشیلە یا بە دزی دایکیانەوە دەیان رفێنێ. بەبێ ئەوەی بیانخوا، دەیانکوژێ. پشیلەی مێ لەبەر خەمی لەدەستدانی بێچووەکانی، دووبارە حەزی لە ئاوسبوون دەبێتەوە. پشیلە حەیوانێکی گەلێک بە ڕەحمە و بۆیە خێرا لەگەڵ نێرەکە جووت دەبێ.

کاتێک ماڵ یا بینایەک ئاوردەگرێ، پشیلەکان زۆر زوو تووشی نیگەرانی و سەرسامی دێن. میسرییەکان لە کاتی ئەوتۆدا حەپەساو رادەوەستن و پتر

خەمی پشیلەکانیانە تا کوژاندنەوەی ئاگرەکە. پشیلەکان بێروبەوێدا غاردەدەن و بەسەر یەکتردا دەکەون و زۆرجار خۆیان لە ئاگر داوێن. میسرییەکان بە بینینی رووداوی لەو چەشنە تەواوێک خەمبار دەبن. لە هەر ماڵێکدا پشیلە بە مردنی خۆی بمرێ، گشت ئەندامانی بنەماڵە برۆکانی خۆیان دەتاشن. ئەگەر سەگی ماڵێک بتۆپێ، ئەوجار سەرتاپای لەشیان دەتاشن.

[٦٧] میسرییەکان کەلاکی پشیلەی مردوو دەبەنە شاری ڤوڤاستی و لەوێ دوای مۆمیاییکردن لە قەبرستانی پشیلانی دەنێژن. سەگ و مشکەخورما بەجیا لەنێو تابووت دەنێن. مشکەکانی سەحرایی و بازەکان دەبەنە ناوچەی ڤوتۆس، بەڵام حاجیلەقلەق دەبردرێتە ئێرموپۆلیس[1]. ورچ کە ژمارەیان زۆر کەمە، لەگەڵ گورگ کە تۆزێک لە رێوی گەورەترە، لەو شوێنەی کە مردون، دەنێژرێن.

[٦٨] تیمساح، ئەو ئاژەڵە لە ویشکایی و نێو ئاودا دەژی و هەرچەند خاوەن چوار دەست و پێیە، چوار مانگی زستان هیچ خۆراکێک ناخوا. هێلکە دەکات و لە ویشکایی قەراخ رووباردا لەسەریان کورک دەبێ. زۆربەی سەعاتەکانی رۆژ لە ویشکاییدا و تەواوی شەو لەنێو ئاوی رووباردا جێگیردەبێ. ئاوی رووبار لە شەودا، لە هەوای دەرێ و بەتایبەتی لە شنەی بەرەبەیان گەرمترە. تیمساح لەنێو ئاژەڵاندا، ئەو حەیوانەیە کە وەختێک لە هێلکە دێتەدەر زۆر بچووکە و پاشان ئیجگار زۆر گەورە دەبێ. ئەو هێلکانەی هەڵیان دێنێ، فرە گەورەتر لە هی قاز نین و قەوارەی جوجکەکەش دەگەڕێتەوە سەر ئەندازەی هێلکەکە. جوجکە تیمساح کاتێک گەورە بوو، درێژاییەکەی دەگاتە نیزیک بە حەڤدە پیخیس[2] و بگرە زیاتریش. چاوەکانی تیمساح وەک هی بەراز دەچن. ددانەکانی تەواو گەورەن و تەنیا ئاژەڵێکە زمانی نییە، هەربۆیە چناگەی خواروی ناجوڵێتەوە و لەجیات ئەو چناگەی سەرووی دێنێتەخوار. نینۆکەکانی بەهێز و پێستی پولەکەدارە و هیچ کەرستەیەکی تێڕۆناچێ. تیمساح لەنێو ئاودا ئەبەدا نابینێ، بەڵام لە ویشکاییدا

---

١- ئێرموپۆلیس، یەک لە شارەکانی میسری باستان کە شوێنی پەرستنی خواوەند ئێرمیس بووە.

٢- پیخیس یا ئانیشک، ٤٤.٤ سانتیمیتر یا ٤٤٤ میلیمیتر.

بینابییەکی فرە بەهێزی هەیە. لەبەر ئەوەی ماوەیەکی زۆر لەنێو ئاودا دەمێنێتەوە، زاری پڕ لە زێروو دەبێ. هیچ ئاژەڵ و باڵندەیەک ناوێرێ تخوونی بکەوێ. تەنیا نێوانی لەگەڵ باڵندەی کۆلیبری[1] خۆشە. وەختێک تیمساح لە ئاو دێتەدەر بەپێی عادەت بەرەو رۆژئاوا وەردەسوڕێ، ئەو کاتە کۆلیبری دەچێتە نێو زاری و زێروەکان دەخوا. تیمساح هەست بە حەسانەوە دەکات و پێیخۆشە و بۆیە ئازار بەو باڵندەیە ناگەیێنێ.

[٦٩] بەلای هێندیک لە میسرییەکانەوە تیمساح ئاژەڵێکی پیرۆزە و کۆمەڵێکیش پێیانوایە ئازار دەگەیێنێ. ئەوانەی لەو باوەڕەدان کە تیمساح موقەددەسە، پتر لە ناوچەکانی دەوروبەری شاری تیڤا و گۆلی میریس[2] دەژین. دانیشتووانی ئەو دەڤەرانە شەونخوونی دەکێشن و تیمساحێک لە ئاو رادەکێشنەدەر خۆراکی دەدەنێ و گوێیەکانی بە شتگەلی بریقەدار و زێڕ دەڕازێننەوە. پاوانەش لە دەستەکانی پێشەوەی دەکەن، و بە خۆراک تێری‌دەکەن و بەتایبەتی ئەو گۆشتەی دەدەنێ کە لە قوربانی‌کردنی ئاژەڵانی‌ترەوە دەستیان کەوتووە. خەڵک تەواوێک بەو تیمساحە رادەگەن بۆوەی هیچ کەموکوڕییەکی نەبێ. کاتێک تیمساحێک بمرێ، مۆمیایی دەکەن و لە تابووتی پیرۆزی دەنێن. میسرییەکانی دانیشتووی ناوچەی ئێلێ‌فاندینی[3]، تیمساحەکانیان نەک هەر بەلاوە موقەددەس نییە، بەڵکوو گۆشتەکەشیان ناخۆن. لەوێ پێیان ناگووترێ تیمساح، بەناوی خامپسی[4] دەناسرێن. ناوی

---

١- باڵندی کۆلیبری، باڵندەیەکی بچووکی سەر رەشە و بەناوی باڵندەی تیمساح ناسراوە.

٢- گۆلی میریس یا موریس، یەکێک لە گەورەترین داموودەزگای سەردەمی میسری باستان کە بۆ رێکوپێک‌کردن و دابەشکردنی ئاوی روباری نیل دروستکرا و بەناوی پاشایەک بە هەمان ناو ناودێرکرا.

٣- ئێلێفاندینی، ناوچەی سنووری نێوان میسر و ئەتیۆپیا و شوێنی تاڤگەکانی روباری نیل، ئەمڕۆ بەناوی ئەسوان ناسراوە.

٤- میسرییانی باستان، جیا لەوە بە تیمساعیان گوتووە خامپسی، بەناوی‌تریش وەک ئیماش ناسراو بووە.

کرۆکۆدیل لەلایەن یۆنانییەکانەوە هاتۆتە سەر زمان. ئەوان پێیانوابوو هەمان سوسمار (مارمێلکەی)[1] قەراخ ئاوەکانی خۆیانە.

[٧٠] میسرییەکان راوی تیمساح بە شێوەی جۆراوجۆر دەکەن. لێرەدا من باسی ئەو چەشنەیان دەکەم کە لە ئەوانیتر سرنج راکێشترە. لەتە گۆشتێکی درێژی بەراز بە قولاپ وەدەکەن و پارچە گۆشتەکە تا نیوە لەنێو ئاوی چۆم رۆدەکەن و لە قەراخ رووبار دەوێستن و هاوکاتیش بەداردەستێک لە کودەڵە بەراز دەدەن. تیمساحەکە گوێی لە قیژەی کودەڵە بەراز دەبێ و بەرەو ئەو دێ، پارچە گۆشتەکە دەبینێ و قەپاڵی لێدەگرێ. کاتێک قولاپ رادەکێشنە دەر، کابرای راوچی یەکەم کاری دەیکا، خێرا هێندێک گڵی سوور بە چاوەکانی تیمساح دادەکات، چونکە بەو شێوەیە ئاسانتر دەتوانێ بەسەریدا زاڵبێ، ئەگینا راوکردن فرە دژوار دەبێ.

[٧١] ئەسپی ئاوی تەنیا بەلای دانیشتوانی ناوچەی پاپریمیتی پیرۆزە. لە شوێنەکانیتری وڵاتی میسر ئەو ئاژەڵە پیرۆزایەتی نییە. ئەسپی ئاوی چوار پێی دوو سمە و شێوەی کەڵ دەدا و سەروگوێلاک قوپاوی و چەشنی ئەسپ خاوەن یاڵە و ددانەکانی وەک عاج دەرپەڕیون. کلکی وەک هی ئەسپە و شێوەی ئەو دەحیلێنێ و قەوارەشی بەقەدەر کەڵێک دەبێ. پێستەکەی ئەوەندە ئەستوورە کە ئەگەر پیاو خاوێن بیتاشێ و ویشک هەڵگەڕێ، بۆیە دەبێ سەرنێزەی لێدروست بکرێ.

[٧٢] لەنێو ئاوی رووباری نیلدا ماری ئاوی هەیە و بەلای میسرییەکانەوە پیرۆزە. سەبارەت بە ماسییەکان، تەنیا ماسی کەپور و مارماسی پیرۆزن. خەڵک ئەو ئاژەڵە ئاوییانە وەک حەیواناتی پیرۆزی رووباری نیل سەیردەکەن. لەمەر پەلەوەر و باڵندەکان، ئەوانەی پیرۆزن دەکرێ ناوی ئەو قازە بێنین کە شێوەی رێوی دەدا.

---

١- ئەو ئاژەڵە لە زمانی بیانیدا بە لێزارد، بە کوردی هەمان مارمێلکەیە و پتر لە قەڵشتە دیوارەکانی خشت و بەرددا دەژی.

[٧٣] هەڵبەت باڵندەی پیرۆزی‌تریش هەن و بۆوێنە (قەقنووس) سیمرغ. من خۆم ئەو باڵندەیەم بە زیندوویی نەدیوە و تەنیا چاوم بە وێنەی نەققاشی کراوی کەوتووە، چونکە زۆر بە دەگمەن پەیدا دەبێ. میسرییەکان، دانیشتووانی ئیلیۆپۆلی[1] دەڵێن ئەو باڵندەیە هەر پێنسەد ساڵ جارێک دێتە وڵاتی میسر، ئەوەش لە کاتێک دایە کە باوکی دەمرێ. ئەگەر وێنەکەی لە نەققاشیدا دروست کێشرابێتەوە، بەو شیوەیەیە: هێندێک لە پەڕی باڵەکانی زێڕین و بەشێکیشیان سوورن. لەمەر شکڵ و قەوارە وەک هەڵۆ دەچێ. دەگێڕنەوە کە بەو چەشنە هەڵسوکەوت دەکات، هەرچەند خۆم باوەڕم بەو قسانە نییە: دەڵێن کە لە عەرەبستانەوە دێ و تەرمی باوکی لە جیوەی داری مەرمەک دەگرێ بۆوەی لە پەرستگەی ئیلیۆس‌دا بینێژێ. تەرمەکەش بەو چەشنە لەگەڵ خۆی دێنێ: سەرەتا هێلکەیەک لە جیوەی بۆنخۆش دروست دەکا، ئەو هێلکەیە دەبێ قورساییەکەی بەو رادەیە بێ کە قەقنوس بتوانێ بەرزی بکاتەوە و بۆیە پێشتر چەند جارێک بەتاقی دەکاتەوە. دوای ئەوەی لە بەرزکردنەوەی دڵنیا بوو، ئەوجار هەناوی ئەو هێلکەیە هەڵدەکۆڵێ و هەڵۆلی دەکات و جەنازەکەی تێدەخا. پاشان بە جیوەی (بنێشتی) داری مەرمەک زارکی هێلکەکە دەبەستێ. هێلکەکە لەڕاستیدا دەبێتەوە خاوەن هەمان قورسایی پێشووی خۆی و بۆ هەڵگرتن دەبێ. سیمرغ کاتێک تابووتەکەی ئامادەکرد، دەیهێنێتە وڵاتی میسر و دەیباتە نێو پەرستگەی ئیلیۆس(خۆر). ئەوە کۆمەڵێک زانیاری سەبارەت بەو باڵندەیە بوو کە میسرییەکان باسی دەکەن.

[٧٤] لە ناوچەی تیڤا ماری پیرۆز هەن کە هیچ ئازارێک بە مرۆڤەکان ناگەیێنن. قوڵە و باریک و خاوەن دوو شاخی بچووک لە لاجاینگەکانیان هاتوونەدەر. کاتێک ئەو مارانە دەمرن لە پەرستگەی خواوەند دیا دەیاننێژن، چونکە بەلای میسرییەکانەوە پیرۆزن و هی ئەو خوایەن.

---

١- ئیلیۆپۆلی، شارێکی باستانی لە میسری کۆندا، هەڵکەوتوو لە کەنار ئاوەکانی روباری نیل و لە یازدە کیلۆمیتری قاهیرەی ئەمڕۆ.

[٧٥] له عەرەبستان شوێنێک هەیە کە تەقریبەن لە روبەڕووی شاری ڤوتۆس هەڵکەوتووە. سەفەری ئەوێم کرد بۆوەی هێندێک زانیاری سەبارەت بە مارە باڵدارەکان کۆکەمەوە. کاتێک گەیشتمە ئەوێ، کۆڵێکم ئێسقان و مازە پشتی ئەو مارانە دی، بەڕادەیەک کە پیاو ناتوانێ رێژەکەی مەزەندە بکا. ئێسقانی مازە پشتی ئەو مارانە، ورد و درشت و بە کۆمەڵ چەشنی جێخوون لەسەر یەک هەڵدرابوونەوە. هەڵبەت کۆمەڵی بچووک پتر وەبەر چاو دەهاتن. شوێنی ئەو ئێسقانانە زۆرتر لەنێو بەرد و رەوەزی نێو شاخەکانە و بەرەو دەشتێکی پانوپۆڕ دەچێ و لەگەڵ دەشتی میسر هاوسنوورە. دەگێڕنەوە کە لە وەرزی بەهاردا مارە باڵدارەکان لە عەرەبستانەوە دەفڕن و دێنە میسر. لە هەمان کاتدا لەقلەقی گەرمەسێر دەچنە نێو ئەو رەوەزانە و ناهێڵن مارەکان بەوێدا دەربازبن و لەجێوە دەیانکوژن. عەرەبەکان خۆیان دەڵێن، میسرییەکان رێز و حورمەتی زۆریان بۆ ئەو لەقلەقانە هەیە و خوودی میسرییەکانیش ئەو بۆچوونەیان بەلاوە دروستە.

[٧٦] لەقلەقی گەرمەسێر خاوەن ئەو روخسار و تایبەتمەندییانەیە. لەشی تەواو رەشە. قاچەکانی وەک باڵندەی ماسیگرەی گەورە دەچن. دەنووکی خوار و هەڵۆیی و قەوارەی لەشی بەقەرا مریشکە قۆپییە. ئەوەیان لەقلەقی رەش بوو. لەقلەقیتر (دوو شێوە لەقلەقی گەرمەسێری هەن) کە پتر لە شوێنی ئاوەدان بەرچاو دەکەون و سەر و گەردنیان رووتەنە. باڵەکانیان گەورە و سپین. جیا لە سەر و گەردن، سەری پەڕەکانی باڵ و کلکی، رەشی پڕرەنگن. سەر و قاچەکانی وەک لەقلەقی رەش دەچن. ئەوەش بڵێم کە مارە باڵدارەکان شێوەی ماری ئاوی دەدەن. باڵەکانیان پەڕدار نین، بەڵکوو چەشنی شەمشەمە کوێرەن.

[٧٧] ئێستا سەبارەت بەو میسرییانەی لە هەرێمە خاوەن کێڵگەکان دەژین، باسێک دەکەم. ئەوانە چونکە لەبەرامبەر هەر رووداوێکدا خۆڕاگر و سێبوورن، لەنێو گشت ئەو خەڵکە کە ناسیمن، بەلامەوە ئاقڵتر و بەمشوورتر لە میسرییەکانی دیکە وەبەرچاو کەوتن. شێوازی ژیانی رۆژانەیان بەو

جۆرەیە: ئەوانە سێ جار لە مانگدا دەرمان دەخۆن و خۆیان دەرشێننەوە و هەناویان پاکدەکەنەوە بۆوەی سلامەتتر بژین. ئەوان هەروەها لەو باوەڕەدان کە گشت نەخۆشی و ناساغییەکانی مرۆڤ دەگەڕێنەوە سەر کەلتووری خواردن. هەڵبەت جیا لەوەش، میسرییەکان دوای لیبیاییەکان(ئەفریقایی)، سلامەتترین مرۆڤن. من هەروەها لەو باوەڕەدام ئەو سلامەتییەیان دەگەڕێتەوە سەر کۆمەڵە هۆیەکیتریش، وەک ئەوە کە ئاڵوگۆڕی وەرزەکانی ساڵ بوونی نییە و کەشوهەوای وڵات ناگۆڕێ، چونکە نەخۆشییەکان پتر بەو هۆیە تووشی مرۆڤ دەبن. ئەو کۆمەڵە میسرییە نان لە ئاردی چاودار دروست دەکەن و پێیدەڵێن کیلاستی. ئەوانە شەرابی جۆ[1] دەخۆنەوە لەبەر ئەوەی رەزی ترێ لە وڵاتەکەیان نییە. ماسی بە خاوی دەخۆن، یا لەبەر خۆر ویشکی دەکەنەوە و لەخوێی دەگرن و هەڵیدەگرن. گۆشتی هەوێردە و مراوی و چەند پەلەوەرێکیتر، بەخاوی یا خوێکراو دەخۆن. جیا لەوانەی پیرۆز و موقەددەسن، گشت ماسی و باڵندەکانیتر بە کوڵاوی و برژاوی دەخۆن.

[٧٨] لە کۆڕی میسرییە دەوڵەمەندەکاندا، ئەگەر زیافەتی شەو تەواو بوو، خزمەتکارێک پەیکەرەی مردوویەک لەنێو تابووتێکی نەخشێندراودا دێنێتە ژوور. جەنازەی نێو تابووت لە دار دروست کراوە. تابووتەکەش بە نەخش و نیگاری رەنگاورەنگ هەڵکەندراو، وەک تابووتی راستەقینە دەچێ. درێژایی ئەو تابووتە دەگاتە یەکدوو پیخیس[2]. خزمەتکارەکە تابووت بەبەردەم میوانانددا دەگێڕێ و بەردەوام ئەو رستەیە دەڵێتەوە: "چاو لەو مردوویە بکە! بخۆ و بخۆوە و شاد بە! چونکە کاتێک مردی وەک ئەو مردوویەت بەسەر دێ ". ئەو نەریتەیان لە وەختی زیافەتی دەوڵەمەنداندا هەیە.

[٧٩] میسرییەکان کەلتووری کۆنیان دەپارێزن و نایگۆڕن. دیارە خاوەن دابونەریتی بەنرخن و بەتایبەتی گۆرانییەکی بەناوبانگیان هەیە. خەڵکانی

---

١- هەمان ئابجۆی ئەمڕۆ بووە.

٢- پیخیس یا ئانیشک، ٤٤.٤ سانتیمیتر یا ٤٤٤ میلیمیتر.

فینیقی و قیبریس‌یش ئەو گۆرانییە دەچرن. یۆنانییەکان پێیدەڵێن لینۆ[1]. من سەبارەت بەو شێوە گۆرانییە فرە شتگەلی‌ترم لە میسرییەکان پرسی، بەتایبەت ئەوەکە ناوی ئەو گۆرانییە لەکوێرا هاتووە. میسرییەکان خۆیان بەو گۆرانییە دەڵێن مانێرۆ. لە میسر بۆیان گێڕامەوە کە یەکەم پاشای وڵاتی میسر تاقە کوڕێکی هەبوە کە بە مناڵی مردوە. هەربۆیە میسرییەکان بە شێوەی شینگێری دەیچڕن و تا ئێستاش وەک گۆرانی بۆیان ماوەتەوە.

[٨٠] میسرییەکان تەنیا لە بوارێکدا هاوشێوەی هۆزی لاکێدیمۆنی[2] یۆنانی بیردەکەنەوە. کاتێک گەنجەکان تووشی کەسانی لە خۆیان بەتەمەنتر دەبن، لادەدەن و ڕێگا چۆڵدەکەن و وەختێکیش دانیشتبن خێرا لەبەریان هەڵدەستن. بەڵام لە بواری‌تردا هیچ وەک یۆنانییەکان هەڵسوکەوت ناکەن. میسرییەکان لەجیات ئەوەی لە ڕێگاوباندا سڵاو لەیەکتر بکەن، دادێنەوە و دەستەکانیان تا سەر ئەژنۆکانیان شۆڕدەکەنەوە کڕنۆش دەبەن.

[٨١] میسرییەکان بەگشتی عەبای کەتانی لەبەردەکەن و لەسەر گوێزینگی پێیان ریشۆڵەدارە و پێیدەگووترێ کلاسیر. لەسەر ئەو عەبایە(خیتۆن)، کەوای خوری سپی دەپۆشن. بە جلوبەرگی خوری ناچنە ژووری پەرستگەکانیان و قەتیش بەو بەرگەوە نانێژرێن و ئایینەکەیان ڕێگەیان پێنادا. لەو دابە ئایینی‌یەدا شێوەی خەڵکی پیتاغۆری، ئۆرفێیی[3] و ڤاکخۆسی[4] دەدەن.

ئەو هۆزەی دوایی میسری نین و دەستوراتی ئایینی پیتاغۆری (فیساغۆرۆس) بەڕێوەدەبەن.

---

١- لینۆ یا لینۆس، شاعیرێکی ئەفسانەیی و خەیاڵی هاوسەردەمی ئۆرفێئا لە میسری باستان بووە.

٢- لاکێدیمۆن، ناوی دوهەم شاری ناسراوی سپارت و پێتەختی لاکونی‌یەکان بووە.

٣- ئۆرفێئا، کوڕی پاشای تراکی و یەکێک لە نیوە خواکانی سەردەمی باستان (کالیۆپ) بووە و وەک ناسراوترین مۆسیقازانانی ئەوکاتە ناوبانگی دەرکردوە و کۆمەڵێک شێعر و باوەڕ بەناوی ئەوەوە بڵاوبووەتەوە کە دواتر روخساری ئایینی‌یان بەخۆوە گرتوە.

٤- ڤاکخۆس، خوای شەڕاب، کوڕی ژوپیتێر، یۆنانییەکان بە دیۆنیسۆس دەیناسن.

ئەو کەسانەی پسپۆڕ لە ڕەمز و ڕازن، دەڵێن دروست نییە کە مردوو نابێ بە جلوبەرگی خورییەوە بنێژرێ. بۆ گشت ئەو بۆچوونانە ڕۆشنگەری ئایینی و موقەددەس هەیە.

[٨٢] بابەتێکی‌تر کە میسرییەکان لێیان‌کۆڵیوەتەوە و بە ئەنجامێک گەیشتوون، ئەوەیە کە چۆن مانگ و ڕۆژەکانی ئەو مانگەیان بە خوایەکەوە بەستۆتەوە. هەڵبەت بە لەبەر چاوگرتنی ڕۆژی لەدایکبوونی خوایەکە و چۆن مرۆڤێک بووە و چ شانسگەلێکی هەبووە و چۆن مردووە. شاعیرانی یۆنانیش ئەو دۆزینەوەیەی میسرییەکانیان لە شێعرەکانیاندا بەکار هێناوە. میسرییەکان پتر لە گشت خەڵکانی‌تری ئەو جیهانە موعجیزەیان دۆزیوەتەوە. کاتێک ڕوداوێکی سەیروسەمەرە دەخولقێ، کۆڵێکی لەبارەوە دەنووسن، کە چ قەوماوە و چیان کردوە، ئەوەش بۆوەیە کە ئەگەر هاتوو جارێکی‌تر قەومانی لەو چەشنە دووپات بۆوە، دیسان بە هەمان شێوەی نووسراو هەڵسوکەوت لەگەڵ بارودۆخەکە بکەن.

[٨٣] سەبارەت بە تاڵەبینی و پێشگۆیی میسرییەکان، زانیارییەکان بەو چەشنەن: باوەڕیان بەوە نییە کە ئەو زانستە لەلای مرۆڤەکان دەست بکەوێ، بەڵکوو بە پێچەوانەوە تەنیا چەند خوایەک بە خاوەنی ئەو زانستە دەزانن. لە وڵاتی میسر نێوەندی ئەستێرە ناسی ئیراکلیس[١] و ئاپۆلۆنا[٢] و ئاتینا[٣] و ئارتێمیدۆس[٤] و ئاریس[٥] و دیا[٦] هەیە. هەڵبەت پتر لە گشتیان حورمەت بۆ پەرستگەی لیتۆس[٧] لە شاری ڤوتۆس دادەنێن. ئەوانە شێوەی تاڵەبینی‌یان

١- ئیراکلیس، پاڵەوانی ئەفسانەیی لە یۆنانی سەردەمی کۆندا و خوای هێز و دەسەلات.

٢- ئاپۆلۆنا یا ئاپۆلۆن، کوڕی خواوەند دیا (ژوپیتێر) و ژونون، خوای شێعر و موسیقی و نیشانەی جوانی.

٣- ئیلاهەی یۆنانی باستان و خوای فکر و ئەندێشە و پارێزەری شاری ئاتێن.

٤- ئارتێمیدۆس، ئارتێمیس یەک لە خواکانی یۆنانی لە سەردەمی کۆندا، کچی ژوپیتێر و ژنون و ئیلاهەی ڕاو و شکار و دارستان.

٥- ئاری، ئاریس کوڕی ژوپیتێر و ژنون (یێرا یا هێرا)، خوای شەڕ و تێکهەڵچوون.

٦- دیا (ژوپیتێر)، خوای خواکان یا باوکی خواکان.

٧- لیتۆ، دایکی ئاپۆلۆن و ئاتینا و هەوێی یێرا (ژنون).

وەک یەک ناچێ و جیاوازی نێوانیان لە نێوەندەوە بۆ نێوەندێکیتر بە ئاشکرا دەردەکەوێ.

[٨٤] زانستی پزیشکی بەو شێوەیە دابەشکراوە: هەر پزیشکێک تەنیا دەتوانێ خاوەنی پسپۆری لە یەک نەخۆشیدا بێ، نەک زیاتر. بۆیە پزیشک لەو وڵاتە زۆرە. ئەوانە پسپۆری چاو، سەر، ددان، گورچیلە و نەخۆشییەکانی گشتین.

[٨٥] لەمەر سەرەخۆشی و شێوازی بە خاک سپاردن، ئەو کۆمەڵە زانیاریانە بەرچاون: لە ماڵی خاوەن مردوودا کە هێندێک خاوەن کەسایەتی بێ، تەواوی ژنانی بنەماڵە بە پانەوە سەر و گوێلاکی خۆیان لە قوڕ دەنێن. مردوو لە ماڵەوە بەجێدەهێڵن و دەچنە دەرێ و بە کۆڵاناندا دەگەڕێن و بەرسینگی خۆیان رووت دەکەن، بەجۆرێک کە مەمکیان دەردەکەوێ و شین دەگێڕن. تەواوی ئەندامانی بنەماڵە و خزمەکان لەگەڵ ئەو ژنانە دێنەدەر. پیاوەکانیش هەر بەو چەشنە بەجلی شۆڕەوە وێڕای ژنان و بە هەمان شێوە سینگیان رووتدەکەن و لەسێنگیان دەدەن و شیندەگێڕن. پاش ئەو کارەوە، جەنازەی مردوو بۆ مۆمیایی کردن دەبەن.

[٨٦] کەسانێک هەن کە کار و پیشەیان بەخاک سپاردنی مردوەکانە. وەختێک مردوو بێتە لایان، ئەوانە پەیکەرەی رەنگین و نەخشاوی مردوێکیتر و شێوازی مۆمیایی کردن بە کەسوکاری ئەو مردوە نوێیە نیشان دەدەن. گرینگترین شێواز، بۆ ئەو کەسە کراوە کە ناخوازم باسی بکەم. دووهەم شێوە کەمێک باشە و سادەترە، سێهەم شیواز تەواو بەجێیە. کەسوکاری مردوو پاش وەرگرتنی زانیاری لەمەر بەخاک سپاردن و مۆمیایی کردن، بڕیاری کۆتایی دەدەن و دەچنەوە ماڵ. دوای ئەو بڕیارە و حورمەت دانانە بۆ جەنازەی مردوو، مۆمیاکاران خێرا وەخۆدەکەون و لە ژووری کارگە دەست بە کار دەبن.

باشترین شێوە بەلای منەوە ئەوەیە کە ئێستا باسیدەکەم: بەر لە هەر شتێک بە ئامرازەکانیان بەشی هەرە زۆر یا تەواوی مێشکی مردووەکە بە

کوونی لووتیدا دەردێنن و بۆ پاشماوەکەیتریش دەرمانی تێدەکەن. دوایە بە ئامرازێکی بەردینەی رەش خاڵیگەکانی مردووەکە دەبڕن و بەوێدا گشت ریخۆڵە و پیسایی نێو سکی دێننەدەر. هەناوی مردوو بە شەرابی خورما دەشۆنەوە و پاشان گیای وێشک و وردکراوی بۆنخۆشی پێدادەپرژێنن.[1] ئەوسا نێو کەلاکەکە بە وردەی داری مەرمەکی خاوێن، دارچین و چەند کەرستەی‌تری بۆنخۆش جیا لە داری کۆندور دەئاخنن و دەیدوورنەوە. جەنازەکە بە خوێی نیترۆ (سوود) دادەپۆشن و حەفتا رۆژ دەستی لێنادەن. نابێ لەوە زۆرتر بمێنێتەوە. دوای تێپەڕ بوونی ئەو ماوەیە، ئەوجار مردوو خاوێن دەشۆن و بە کۆمەڵێک تیتۆڵی سپی تەنک دەیپێچن. ئەو تیتۆڵانە نەواری باریک و درێژن و لە جیوەی‌دار هەڵکێشراون. جیوە لەجیات چەسپ کەڵکی لێوەردەگیرێ. دواتریش میسرییەکان کۆڵێک جیوە لە تەرمەکە هەڵدەسوون و لەڕاستیدا کونبڕی دەکەن. خزمانی مردوو جەنازەکە بەو شێوەیە تەحویل وەردەگرنەوە. سەرەتا تابووتێک بە شکڵ و قەوارەی مردووەکە بە دروست کردن دەدەن و ئەوسا جەنازەکەی لەنیو دەنێن. تابووت مۆر دەکرێ و بەدیواری ماڵەوە و لە ژوورێکی تایبەتدا هەڵدەپەسێردرێ.

[۸۷] ئەوەی باسم کرد گرانترین شێوازی مۆمیایی کردن بوو. هەڵبەت شێوازی‌تریش هەن، بۆ ئەو کەسانەی ناخوازن وردەکاری زۆری تێدابکرێ و پرخەرج بێ. ئەو شێوازە بەو چەشنەیە: مۆمیاکاران قەیاسێکی فرە رۆنی داری سەدر(کۆنار) بە کونەکانی لەشی مردوودا بەڕێ‌دەکەنە نێو سک و هەناوی و پێویست ناکا زگی بدڕن و ورگ و ریخۆڵەی دەربێنن. کونەکانی کەلاک دەئاخنن و ماوەی حەفتا رۆژ لە خوێی دەگرن. دوایین رۆژ رۆنی سەدر بەتاڵ دەکەن. زەختی ئەو رۆنە بەڕادەیەکە کە تەواوی پیسایی و

---

١- کەرستە بۆنخۆشەکان لە چوار دەفری بەردینەدا بوون، سەری هەرکام لە دەفرەکان، روخساری یەک لە کوڕانی خواوەند هۆرۆسی لەسەر هەڵکەندراوە. هۆروس یەکێک لە خواکانی میسری بووە کە خاوەن روخساری هەڵۆ بووە.

نێوەرۆکی نێو هەناوی مردوو کە تەواو تواوەتەوە، لەگەڵ خۆی دێنێتەدەر. گۆشتی جەندەکەکەش لە خوێی جۆشدا تواوەتەوە و تەنیا پێست و ئێسقان ماون. ئەوجار مۆمیاکاران بەبێ ئەوەی کاری پتر لەسەر جەنازەکە بکەن، رادەستی خاوەن مردووی دەکەنەوە.

[٨٨] سێهەم شێواز بۆ خەڵکی فەقیر و هەژارە. بە ئاوی جۆ نێو ورگ و ریخۆڵەی مردوو دەشۆنەوە، حەفتا رۆژ لەنێو خوێی نیترات سدیۆمی دەنێن و پاشان دەیدەنەوە دەست کەسوکاری مردوو.

[٨٩] کاتێک ژنی کابرایەکی بەناوبانگ بمرێ، خێرا نایبەنە کارگەی مۆمیایی کردن. ئەو نەریتە دەرهەق بە ژنانی جوان و ناسراویش لەجێی خۆیدا. دوای دوو سێ رۆژ ئەوجار دەیبەن. هۆی ئەو خۆپاراستنە ئەوەیە کە مەبادا وەستاکاران تێکەڵاوی جینسی لەگەڵ ژنە مردووەکە بکەن. دەگێڕنەوە کە یەکێک لەوانە تخوونی ژنێکی تازە مردوو کەوتوە و هاوکارێکی لێی لەهەڵا داوە.

[٩٠] ئەگەر میسرییەک یا بیانییەک بکەوێتە بەر پەلاماری تیمساح یا لە چۆمدا بخنکێ، ئەو کاتە دانیشتووانی شار جەنازەکە دەدۆزنەوە. خەڵک لەسەریەتی کە بەر لە ناشتن، تەرمی ئەو مردوە مۆمیایی بکەن و لەنێو تابووتی پیرۆزی بنێن و چەندەی دەست بدا، تابووتەکە بنەخشێنن و بیرازێننەوە. هیچکەس بۆی نییە دەست لە جەنازەکە بدا، تەنانەت خزم و دۆستانی کابراش. تەنیا کاهێنانی رووباری نیل ئیزنیان پێدراوە بەدەستی خۆیان تەرمەکە بنێژن. وێدەچێ ئەو جەنازەیە لە تەرمی مردوویەکی دیکە پیرۆزترە.

[٩١] میسرییەکان لە بەکار هێنانی دابونەریتی یۆنانی خۆیان دەپارێزن. ئەوان بەگشتی کەلتووری هیچ کۆمەڵە خەڵکێکی بیانی پەسند ناکەن و تەواو ئەو باوەڕەیان پاراستووە. هەڵبەت لە شاری خێمیس، سەر بە هەرێمی تیڤا[١] و دراوسێتی نێئاپۆلیس، مەعبەدێکی چوارگۆشە بۆ پێرسێئا[٢]، واتە کوڕی

---

١- ناوی یەکێک لە پێتەختەکانی وڵاتی میسری باستان و مەعبەدی ناسراوی ئامۆن لەوێ بووە.

٢- نیوەخوای سەردەمی باستان لە یۆنان، کوڕی ژوپیتێر و دانائی و دامەزرێنەری پاشایەتی وڵاتی میکینی.

دانائی[1] سازکراوه. دەوری ئەو پەرستگەیە بە دارستانی خورما گیراوه. دالآنەکانی لە بەرد دروستکراون و گەلێکیش گەورە و بەرزن. لەسەر سەکۆی نێو دالآنەکاندا دوو پەیکەری بەردینە داندراون ویەکجار زلن. لەسەر سەکۆی ژووری پەرستن پەیکەرەی پیرۆزی پێرسیئا بەرچاو دەکەوێ.

خەڵکی ناوچەی خێمیس دەڵێن کە پێرسیئا زۆر جار لە دەرێ یا لەنێو پەرستگە خۆی بە جەماوەر نیشاندەدا. دانیشتووانی ناوچەکە هەروەها دەڵێن کە جاروبار یەکێک لە پێلاوە کۆنەکانی ئەو خوایە وەدیاردەکەوێ. پێڵاوەکە دوو پیخیس[2] گەورەیە و کاتێ وەدیارکەوت، خێر و بەرەکەت بە وڵاتی میسر دەبەخشێ. ئەوە باوەڕی میسرییەکانە. دیارە لاسایی یۆنانییەکانیش دەکەنەوە و بۆ ڕێزگرتن لە پێرسیئا ئەو کارانەش دەکەن. میسرییەکان کێبەرکێی وەرزیشی لە گشت بوارێکدا سازدەکەن، ئاژەڵ و جلوبەرگ و کەوڵ بە براوەی یەکەم دەبەخشێ. من پرسیارم لێکردن کە خواوەند پێرسیئا بۆچی تەنیا خۆی بە خەڵکی ئەو ناوچەیە نیشان دەدا و هۆی چییە ئەوانیش کێبەرکێی وەرزیشی بۆ سازدەدەن. لە وڵامی مندا گووتیان کە خواوەند پێرسیئا خۆی خەڵکی ئەو ناوچەیەیە، بەڵام خواکانیتر وەک دانائۆس[3] و لینگیئا[4]، هەرچەند خێمیسی بوون، دواتر بەسواری گەمی چوونەتە یۆنان. مەراسیمەکان بەوانەوە دەستی پێکردوە و پاشان بۆ خواوەند پێرسیئا ماوەتەوە. دانیشتووانی خێمیس دەڵێن: وەختێک خواوەند پێرسیئا گەیشتوەتە وڵاتی میسر بۆ بردنی کاسە سەری غۆرغۆسی[5] لیبیایی، چاوی بە خەڵکی خێمیسی کەوتووە و خزمەکانی خۆی ناسیوەتەوە. خواوەند پێرسیئا کاتێک گەیشتۆتە جێ ناوی خێمیسی زانیوە و لە

---

١- دانائی، کچی پاشای ئارغۆس و دایکی پێرسیئا و ژنی ژوپیتێر.

٢- پیخیس یا ئانیشک، ٤٤.٤ سانتیمیتر یا ٤٤٤ میلیمیتر.

٣- کەسایەتی ئەفسانەیی و پاشای میسر و ئارغۆس.

٤- لینگیئا، کەسێکی خەڵکی وڵاتی ئارغۆس بووە و دەگێڕنەوە کە نووری چاوەکانی ناوبرا لە دیوار گوزەراوە.

٥- غۆرغۆسەکان، سێ دێوی ئەفسانەیی بوونە و سەیری هەرکەسێکیان بکردایە، لەجێوە دەبووە بە بەرد. ناسراوترین غۆرغۆس ناوی مێدوسە بووە و بەدەست پێرسیئا کوژراوە.

زمانی دایکییەوە بیستوویەتی. هەر لەو کاتەوە ئەمری کردوە بە بەڕێوە چوونی کێبەرکێی وەرزیشی، ڕێزی لێبگرن.

**[٩٢]** ئەو کۆمەڵە باسە سەبارەت بە دابونەریتی ئەو میسرییانە بوو کە دوور لە زەل و قۆپی‌یەکان نیشتەجێن. ئەوانەی لەنێو قۆپی‌یەکاندا[١] دەژین کەم و زۆر وێڕای خەڵکانی‌تر خاوەن هەمان کەلتوورن، بەڵام لەبەر هەژاری و دەستەنگی خاوەن چەند تایبەتمەندییەکن. کاتێک چۆم هەڵدەستێ و لافاو کێڵگەکان دادەپۆشی، لەنێو ئاودا گوڵی سوێسن شین دەبێ. میسرییەکان بەو گوڵە دەڵێن شلێرە چۆم (لۆتۆس). خەڵک دوای کۆکردنەوەی ئەو گوڵە، لەبەر خۆرەتاو هەڵیدەخەن و ویشکی دەکەنەوە. نێرکی شلێرە چۆم وەک هی خاشخاش دەچێ و دەیکەنە ئارد و هەویری نانی لێ‌دروست دەکەن و دەیبرژێنن. ڕەگ و ریشەی ئەو شلێرە بۆ خواردن دەبێ، خڕە و گەورەیە و بەقەدەر سێو دەبێ و شیرینە. گەلێک سوێسنی‌تر هەن و شێوەی گوڵەباخ دەدەن. ئەوانیش لە قەراخ چۆم شین دەبن. میوەی ئەو سوێسنانە لە چڵی‌تر دەردەکەون کە لەسەر ریشەی ئەسڵی دەڕوێن و گەلێک شێوەی شانەی ژەنگەسوورە دەدەن. لەنێو میوەی ئەو شلێرەدا کۆمەڵێک تۆو هەیە، گەورە بەقەرا دەنکی زەیتوون. ئەوانە بە خاوی و ویشککراوی دەخورێن. خەڵکی ئەو دەڤەرە گشت ساڵێک کە پاپیرۆس شین‌دەبێ، شتڵەکانیان لەنێو قۆپی‌یەکاندا دەچێنن و لەنێوقەدەوە بۆ سەرێ هەڵیان‌دەپەرتێون و بۆ زۆر بابەت کەڵکیان لێوەردەگرن. بەشی خوارووی خاشخاشەکان تەقریبەن یەک پیخیس[٢] درێژن و بۆ خواردن دەبن و دەفرۆشرێن. خەڵکی ئەو ناوچانە بۆوەی چێژی زۆر لە کولاندنی گیای پاپیرۆ وەرگرن، ئەو گیایە لەنێو مەنجەڵ و لەسەر ئاگرێکی بەتینیدا دەکوڵێنن. هێندێک لەو خەڵکانە تەنیا بە خۆراکی ماسی دەژین. وەختێک ماسی ڕاو دەکەن، ورگ و ریخۆڵەکانی فڕێ‌دەدەن و لەبەر خۆرەتاو هەڵیدەخەن و پاشان بە ویشککراوی دەیخۆن.

---

١- واتە لە ناوچەی ڕێژاوگەی نێوان لکەکانی روباری نیل.

٢- پیخیس یا ئانیشک، ٤٤.٤ سانتی‌میتر یا ٤٤٤ میلیمیتر.

[۹۳] ئەو ماسی‌یانەی بە ڕەوە دەژین، کەس ناتوانێ بەردەوام لەنێو چۆمەکاندا بیانبینێ. پتر لەنێو گۆلاودا دەبن و وەختی بەرەوەی تێکرا دەردەکەون و ڕوو لە بەحر دەکەن. بەر لەوانە ماسی‌یە نێرەکان جوڵەیان کردوە و تۆوەکانیان ڕشتۆتە نێو ئاو. مێ‌یەکان بەدوایاندا، تۆوەکان قووت دەدەن و سکپڕ دەبن. کاتێک ئەو مێ‌یانە لەنێو ئاوی دەریادا ئاوس بوون، ئەوسا بەرەو گۆلاوەکان دەگەڕێنەوە. دیارە ئەوجار بەپێچەوانەوە، ماسی‌یە نێرەکان وەپێش ناکەون و نۆرەی مێ‌یەکانە. ئەو مێ‌یانە نێوەنێوە هێلکەکانیان دەڕژێننە نێو ئاو و نێرەکان دەیانخۆن. ئەو هێلکانە لەڕاستی‌دا ماسی بچکۆلەن. ئەوەندەی بەدەست خواردن و قووت‌دان ڕزگاریان هات، دەبنە ماسی گەورە. کاتی ڕاوکردنی ئەو کۆمەڵە ماسی‌یەی بەرەو دەریا ڕۆیشتوون، برینێک لەلای چەپی سەریان بەدی‌دەکرێ. ئەو کۆڕەوەش کە بەرەو گۆلاوەکان دێنەوە، هەمان نیشانەیان لەلای ڕاستیان بەرچاودەکەوێ. ئەو دیاردەیەش دەگەڕێتەوە سەر ئەوە کە وەختی کۆچ بەرەو دەریا، بە نیزیک قەراخی چەپی ڕووباردا تێدەپەڕن و کاتێکیش دەگەڕێنەوە هەمان ڕۆخ دەگرن. بەردەوام کەناری ڕووبار دەگرنە بەر و ناخوازن ڕێگای گەڕانەوەیان لێ‌ونبێ، چونکە دەکەونە بەر شەپۆلان. کاتێک ڕووباری نیل هەڵدەستێ سەرەتا قوڵکە و قۆپی‌یەکانی نیزیک چۆم بە ئاوی مەرخی ڕووبار پڕدەبن. هەرکە ئەو ڕووداوە قەوما، ماسی‌یەکان گشتیان ڕوو لە قوڵکە و قۆپی‌یەکان دەکەن. من خۆم پێموایە لێی حاڵی بوومە کە چۆن ئەو بەرەوەری دەکەن. ساڵی پار، وەختێک پلەی ئاوی ڕووباری نیل دابەزی، ماسی‌یەکانیش هێلکەکانیان لەنێو قوڕ و زەلکاودا جێهێشت، خۆیان بەیارمەتی پاشەکشەی دوایین وەجبەی ئاوی چۆم بەرەو ناخی ڕووبار چوون. وەختێک زەمان کامڵ بوو و ئاو ٠گەڕایەوە، لەو هێلکانەی نێو قوڕ و زەلکاودا، ماسیان لێ دەرکەوت. ئەوە هێندێک زانیاری سەبارەت بە ماسی‌یەکان بوو.

[۹٤] ئەو میسرییانەی لە ناوچە زەلییەکان نیشتەجێن، ڕۆنێک بەکار دێنن کە لە میوەی دار گەرچەکی هیندی دەگیرێ. میسرییەکان خۆیان بەو ڕۆنە

دەڵێن کیکی. خەڵکی ئەو دەڤەرە گەرچەکی هیندی لە قەراخ چۆم و گۆلاوەکان دەچێنن، لەحاڵێکدا ئەو رووەکە لە وڵاتی یۆنان رمەکییە و خۆی شین دەبێ. ئەوانەی لە میسر دەچێندرێن، بەرێکی زۆریان هەیە و بۆنیان ناخۆشە. پاش کۆکرانەوە، ورد دەکرێن و دەکوڵێندرێن و رۆنیان لێدەگیرێ. رۆنی ئەو گەرچەکە چەورترە و چی لە رۆن زەیتوون کەمتر نییە. وەختێک لە قەندیلدا بۆ رۆشنایی کەڵکی لێوەردەگرن، بۆنی زۆر قورس و گرانە.

[٩٥] لەمەر تەپۆ و مێشوولە، دەبێ بڵێم بە میلیۆنان هەن. میسرییەکان بەو چەشنە بەربەرەکانیان لەگەڵ دەکەن. ئەو خەڵکانەی دوور لە قۆپی و زەلەکان دەژین،[1] لەسەر بورج و کەپردا دەخەون، چونکە مێشوولەکان لەبەر شنەی با ناتوانن بەرز بفڕن. جەماوەری قەراخ ئاو و قۆپی، لەجیات بورج و کەپر، رێگا چارەی‌تریان دۆزیوەتەوە. هەر بابایە خاوەن تۆڕێکە. رۆژانە بەو تۆڕە ماسی دەگرێ و شەوانە لەسەر جێگای خەو چەشنی چادر هەڵی‌دەدا و لەژێرەوەڕا تێیدەخزێ و دەخەوێ. ئەگەر مرۆڤ بە جلوبەرگ و مەلافەوە بخەوێ، مێشوولەکان لەسەر جلەکانەوە پێوەدەدەن، بەڵام ناتوانن لە تۆڕەکە دەربازبن.

[٩٦] میسرییەکان قایقە چەرخدارەکان لە داری ئاقاقیا (عەناوە، بیسمیللا) دروست دەکەن و ئەو دارە شێوەی دارکوناری ناوچەی کیرینیئا[2] دەدا. شیرەی ئەو دارە وەک چەسپ وایە. داری ئاقاقیا بەقەرا یەک ئەستوور و بە درێژایی دوو پیخیس[3] پارچەپارچە دەکەن، ئەوسا چەشنی خشتەکانی دیوار لەتەنیشت هەڤدوو دیواریان پێ دروست دەکرێ و سەری ئەو دارانە لە کاریتەی ژێرەوە بزمارکووت دەکەن. جووتێک کاریتە بەشێوەی خاچ لەنێو گەمی‌یەکەدا دادەمەزرێنن، و پارچە براوەکان لەو کاریتانە بزمارکووت دەکرێن. وەختێک تەختی بنی گەمی ئامادەبوو داری کەمانەدار لە قەراخەکانی قایق وەک چەپەر دەبەستن و ئەو شێوە دیوارە پێویستی بە ساف و لووس

---

١- مەبەست میسری ژوررووپە.

٢- کیرینیئا، ناوی موهاجیرنشینێک کە یۆنانییەکان لە رۆژئاوای میسر و لە خاکی ئەفریقیادا دروستیان‌کرد و پێتەختی وڵاتی کیرینی‌یەکان بووە.

٣- پیخیس یا ئانیشک، ٤٤.٤ سانتی‌میتر یا ٤٤٤ میلیمیتر.

کردن نییە و تەنیا بە گەڵای پاپیرۆ و بەدیوی ژووریدا دایدەپۆشن و کەلێنەکان کوونبڕ دەکەن. ئەو قایقانە تەنیا یەک پاڕوویان هەیە کە لەلای پشتەوە بەنێو کاریتەی مازەی ژێرەوەی قایقدا دەچێتە نێو ئاو. دەکەل، واتە کۆڵەکەی بایەوان، ئەویش لە داری ئاقاقیا دروست دەکرێ و بایەوانیش لە گەڵاکانی پاپیرۆسە. ئەو قایقانە ناتوانن بەپێچەوانەی ڕەوتی ئاوی چۆم پێشڕەوی بکەن، مەگەر بای توند یارمەتییان بدا، بۆیە دەبێ لە قەراخ دەریاوە بە گوریس ڕاکێشرێن. ئەگەر هاوسوو لەگەڵ ڕەوتی چۆم جووڵە بکەن، پێویستە بەو چەشنە بێ: کۆمەڵێک قوڵەداری تەمر بە جەگەن لەیەکتر دەبەستن و قەوارەیەکی چوارگۆشەی شێوەی درگا دروست دەکەن. بەردێکی کونکراو بە قورسایی دوو تالاند[1] بە گوریس لە پاشەوەی قایقیش دەبەستن. درگاکە بە گوریس لە پێشەوەی قایق دەبەستن. درگا فڕێ دەدرێتە نێو ئاوی چۆم و خوڕێنی ڕووبار ڕایدەکێشێ. ئاو درگا دەبا و ئەویش بەنۆرەی خۆی قایق ڕادەکێشێ (بەو چەشنە قایقانە دەگووترێ بار یا قورسایی). بەردەکە لەنێو قوڵایی ئاودا بەهۆی قایق ڕادەکێشرێ و بۆ ڕاگرتنی پارسەنگی قایقە. لەو چەشنە قایقانە بە فراوانی لە میسر بەرچاو دەکەون و هێندێکیان جێگای چەند هەزار تالاند باری قورسیان هەیە.

[۹۷] کاتێک ئاوی ڕووباری نیل هەڵدەستێ و لافاو دەخوڵقێنێ، تەنیا شارەکان بەدەرەوەن و شێوەی دوورگەکانی ناوچەی ئیێئۆ (ئێژە) دەدەن. سەراسەری خاکی میسر وەک دەریای لێدێ و ئاواییەکان لەنێو ئاودا قووت دەبنەوە. هەرکات ئەو دیاردەیە سازدەبێ، خەڵک سەفەر بەسەر ڕووباری نیلدا ناکەن، بەڵکوو ڕێگای ویشکایی دەگرنەبەر. بۆوێنە هەرکەس بخوازێ بەرەو شاری ناڤکراتیس[2] لە ناوچەی مێمفیس بچێ، بە نیزیک پیرامیدەکاندا تێدەپەڕێ. ئەگەر ئەو ڕێگایە نەبوایە، پیاو ناچار دەبوو بە نووکی سێ

---

١- تالاندی یۆنانی ٢٦ کیلۆگرەم، میسری ٢٧ کیلۆگرەم، بابیلی ٣٠.٣ کیلۆگرەم و ڕۆمی ٣٢.٣٠ کیلۆگرەم بووە.

٢- ناڤکراتیس، شارێک لە ڕۆژئاوای لکێکی ڕوباری نیل کە بە شاری کانوپدا دەرباز دەبوو و لەنیزیک تەلنەبیرە هەڵکەوتووە.

گۆشەی دێلتا و بە هەرێمی کێرکاسۆرۆدا دەربازبێ. گەر کەسێک بیهەوێ بەڕێگای دەریادا لە کانوپۆسەوە[1] بچیتە ناڤکراتیس، دەگاتە دەڤەری ئانتیلا[2] و شاری ناسراوی ئارخاندرۆس[3].

[۹۸] شاری ئانتیلا کۆمەڵگایەکی تەواو ناسراوە، لەبەر ئەوەی کە دانیشتووانی شار و ناوچەکە خەرجی دابینکردنی پێڵاوەکانی شاژنی میسریان پێئەسپێردراوە و دەڤەرەکە ملکی شاژنە. ئەو ئەرکە لەو کاتەوە بەڕێوە دەچێ کە میسر بۆتە ژێر دەستەی فارسەکان. شارێکیتریش بە باوەڕی من ناوەکەی لە زاوای دانائۆس[4] واتە ئارخاندرۆسی کوڕی فتیۆس و نەوەی ئاخایۆس وەرگرتووە و شارەکە پێیدەگووترێ ئارخاندرۆس. رەنگە کەسێکیتریش بەو ناوە هەبووبێ. بەهەرحاڵ ناوەکەی میسری نییە.

### مێژووی میسر

[۹۹] تا ئێرە باسی ئەو بابەتگەلەم کرد کە بە چاوی خۆم بینیم و ئەو زانیارییانەی دەستم کەوتن. ئێستا لەسەر ئەو بابەتە دەڕۆم کە میسرییەکان پێیانگوتووم و لە زمان خۆیانەوە دەیانگێڕمەوە. هەروەها ئەوانەش کە بەدیم کردوون. کاهێنانی میسری گووتیان کە یەکەم پاشای میسر بەناوی مین[5]، دیوارێکی کەوانەیی بەمەبەستی بەربەست کردن و دابەشین و بەلاڕێدا بردنی ئاوی چۆم دروست کرد و بەو کارەی گەرەکی بوو شاری مێمفیس لەدەست سێڵاوی رووبار رزگار بکات. رووبار بە تەنیشت ریزە چیای خیزەڵان و

---

١- کانوپ یا کانوپۆس، یەک لە شارەکانی میسری خواروو لە کەنار روباری نیل و نیزیک لە قەراخ ئاوەکانی دەریای مەدیترانە و یەکێک لە لکەکانی ئەو روبارە بە کانوپۆس ناسراوە.

٢- شوێنی ئەو شارە باستانییەی میسر نەدۆزراوەتەوە.

٣- شوێنی ئەو شارە باستانییەی میسر نەدۆزراوەتەوە.

٤- کەسایەتی ئەفسانەیی و پاشای میسر و ئارغۆس.

٥- مین یا مێنێس، یەکەم پاشای ئەفسانەیی میسری کۆن. وێدەچێ ئەو گۆڕەی لە نقدە، هەڵکەوتوو لە سی کیلۆمیتری شاری تیڤا دۆزراوەتەوە هی ئەو پاشایە بێ.

بەلای لیبی‌دا (ئەفریقا) تێدەپەڕی و مین پاشا ئەو سەددە کەوانەییەی لەسەر پێچی گەورەی رووبار دامەزراند. ئەو شوێنە لەلای باشووری شار و نیزیک بە سەد ستادیۆ[1] لە میمفیس دوور بوو. بەو دیوارە کەوانییە، رووبار ناچار بوو رەوتی کۆنی خۆی بگۆڕێ و بە دۆڵێکی‌تردا دەرباز بێ. ئەو جێگایەی کە پێشتر مەرخ (بەستەری ئاو) بوو و رووباری نیلی پێدادەهات، تا ئیمرۆکە لەلایەن فارسەکانەوە پارێزگاری لێدەکرێ و دیوارەکانی ساڵێ جارێک پێویستیان بە نۆژەن کردن هەیە. چونکە ئەگەر درزی تێکەوێ، مەترسی سێلاو بۆ سەر شاری مێمفیس لەگۆڕێدا.

کاهێنان دەڵێن مین وەک یەکەم پاشای میسر بە گۆڕینی بواری ئاوی نیل، پانتاییەکی فرەی ویشکهەڵگێڕا و شاری مێمفیسی لێ‌دروست کرد. ئەو هەروەها لە دەرەوەی شار، بەرەو باکوور و رۆژئاوا گۆلێکی هەڵکەند کە بەهۆی رووبار پڕدەبێ. رۆژهەڵاتی شار بەهۆی چۆمی نیل دەپارێزێ. مەعبەدی ئێفێستۆ[2] لە نێوەندی مێمفیس بنیات‌نرا و ئێجگار گەورەیە و گشت لایەک رێزی دەگرن.

[۱۰۰] دوای مین پاشا، پیاوانی ئایینی لە رووی کتێبێکەوە ناوی سێسەد و سی پاشای میسرییان بۆ من خوێندەوە. لەنێو ئەوانەدا، هەژدەیان ئەتیۆپیایی، یەک ژنی میسری و گشت ئەوانی‌تر پیاوی میسری بوونە. ژمارەی ئەو سێسەد و سی پاشایە لەگەڵ رادەی جیلەکانی دەرباز بوو بە مێژووەکەیاندا، بەرابەر دەهاتنەوە.

ئەو ژنە پاشایە ناوی نیتۆکریس[3] بووە. وەک ژنە پاشای بابیلۆن، ئەویش ناوی نیتۆکریس بووە. بۆیان گێڕامەوە کە ئەو خاتوونە ویستوویەتی تۆڵەی کوژرانی برا کوژراوەکەی خۆی بستێنێتەوە. براکەی بەر لەو پاشای میسر بوو. ئەوانەی ئەو کابرایەیان کوشتبوو، خێرا ئەو خاتوونەیان لەجێی براکەی کردە پاشا. نیتۆکریس بۆ تۆڵە ئەستاندنەوە، جەماوەرێکی زۆری لەو

---

١- ستادیۆ، پێوانەی مەودا لە یۆنانی باستاندا و بەرابەری ١٧٧ میتر و ٦ سانتیمیتر بووە.

٢- خوای ئاگر و ئاسن لە یۆنانی سەردەمی کۆندا.

٣- نیتۆکریس یا نیتاکاریت، شاژنی میسر لە شەشەمین خانەدانی پاشایەتی ئەو وڵاتە. مێژووی فەرمانڕەواییەکەی روون نەکراوەتەوە. سەبارەت بە شاژن نیتۆکریسی بابێلی، هێرۆدۆت لە کتێبی یەکم، بەندەکانی ١٨٥ و ١٨٧ باسی دەکا.

میسرییانە کۆکردەوە و بە زەبری ئازار و ئەشکەنجە لەنیوی بردن. ناوبراو ژێرزەوینێکی گەورە و درێژی سازکرد. بە بیانووی ڤەکردن و ئیفتیتاحی ژێرزەوین، جەماوەری بۆ زیافەت بانگهێشت کرد. لە مێشکی خۆیدا خەریکی تۆڵەسەندنەوە بوو. تەواوی ئەو میسرییانەی کە ئەو خاتوونە پێیوابوو دەستیان لە کوشتنی براکەیدا هەیە، لەوێ بوون. لە کاتی خواردندا گورینگی نهێنی ئاوی رووباری کردەوە و گشتیانی لەنێو ئاودا خنکاند. کەس بەو گورینگەی نەدەزانی. کاهێنان ئەو کۆمەڵە زانیارییەیان سەبارەت بەو خاتوونە دایە من. ئەو ژنە دوای تۆڵە سەندنەوە، بۆوەی نەکەوێتە بەر پلاماری شمشێری خەڵک، خێرا لەنێو هۆدەیەکی پڕ لە خۆڵەمێشدا خۆی شاردەوە.

[١٠١] سەبارەت بە پاشاکانیتر، هیچکامیان لەمەر کارەکانیان بایەخی ئەوەیان نەبوو کە باسیان بکەم، تەنیا یەکیان نەبێ کە ئەویش دوایین کەسە و پێیدەگووترێ میریس[١]. باسی میریس بۆیە دەکەم، چونکە بینای بەرهەیوانی بەشی باکووری پەرستگەی ئێفێستۆی دروست کرد و گۆلێکی گەورەشی هەڵکەند. دەوری ئەو گۆلە چەند ستادیۆ[٢] دەبێ و دواتر لەسەری دەدوێم. ئەو پاشایە (فیرعەونە) لەنێو گۆلدا پیرامیدێکی بیناکرد. زانیاری سەبارەت بە درێژایی و بەرینایی پەرستگە، لە کاتی توێژینەوەی قەوارەی گۆلدا دێنمە گۆڕێ. خەڵک ئێستاش باسی ئەو کارانە دەکا. فیرعەونەکانیتر کارێکیتری ئەوتۆیان نەکردوە.

---

١- بۆچوونێکیتر دەڵێ کە گۆلی دەسکردی میریس یا موریس بەهۆی ئامێن ئێم هاتی سێهەم لە سێزدەهەمین خانەدانی پاشایەتی میسر کە نیزیک بە ٢٩٩٠ ساڵ پێش میلاد ژیاوە، دروستکراوە. وێدەچێ هێرۆدۆت هێرۆدۆت ٢٠٠ ساڵ ئەو پاشایەی لە ئێمە نیزیک کردبێتەوە. موریس ناوی یەکێک لە پاشاکانی میسرە کە لە نێوان ساڵەکانی ١٧٣٦ تا ١٧٢٣ی بەرلە زایین لە میسر فەرمانڕەوایی کردوە و لەنێوان ناوی ئەو پاشایە و گۆلی موریس یا میریس وێکچوونێک بەدیدەکرێت، بۆیە ئەو بە بنیاتنەری ئەو گۆلە دادەنێن.

٢- ستادیۆ، پێوانەی مەودا لە یۆنانی باستاندا و بەرابەری ١٧٧ میتر و ٦ سانتیمیتر بووە.

[۱۰۲] لەو فیرعەونە دەگەڕێم و تەنیا باسی ئەوەیان دەکەم کە جێنشینی ئەو و ناسراو بە سێسۆستریس[1] بووە. کاهینەکان دەیانگووت کە ناوبراو یەکەم کەس بووە بە گەمییە جەنگییەکان لە دوورگەی عەرەبستانەوە پێشرەوی کردوە و گەلانی نیشتەجێی رۆخەکانی دەریای ئێریترەی[2] هێناوەتە ژێر نیری دەسەلاتی خۆی. ناوبراو ئەوەندە بەسەر ئاوەکاندا رۆیی تا گەیشتە بەحرێک کە لەبەر رژدی و نزمی پلەی ئاو، ئیتر بۆ قایقرانی دەستی نەدا. ناچار بوو گەڕایەوە ولاتی میسر. بەپێی گووتەی کاهینان، ئەو فیرعەونە لەشکرێکی ئێجگار گەورەی سازدا و بەڕێگای ویشکاییدا پێشڕەوی کرد و پەلاماری ئەو گەلانەی سەر رێگای‌دا کە دژی راوەستابوون. فیرعەونی گۆرین هەرکات تووشی خەڵکی جوامێر و شەڕکەر هاتبا کە بۆ رزگاری و پاراستنی خۆیان دەستیان کردبێتەوە، کۆڵەکەی بیرەوەری دەچەقاند و ناوی خۆی و ولاتەکەی لەسەر دەنووسین و لە کۆتاییدا ئەوەشی لێ زیاد دەکرد کە بە هێز و توانایی خۆی شکستی بەو بەرهەڵستکارانە هێناوە. ئەگەر ناوچەیەکی بەبێ شەڕ گرتبا، ئەوسا لەسەر ئەستوندەکی ناسراو هەمان بابەتی دەنووسی کە بۆ جوامێرەکانی نووسیبوو، بەو جیاوازییە کە ئەوجار لە کۆتاییدا نەخش و وێنەی ئەندامی مێیینەی ژنانی دەکێشایەوە، بۆوەی نیشان بدا کە دانیشتووانی ئەو دەڤەرە خاوەن غیرەتی ژنانە بوونە.

[۱۰۳] ئەو پاشایە بەو چەشنە پێشڕەوی کرد و بە ئاسیادا دەرباز بوو تا گەیشتە ئوروپا و سکیتی[3] و تراکییەکانیشی شکستدا. بە باوەڕی من ئەوە دوورترین شوێن بوو کە لەشکری میسر دەستی پێڕاگەیشت. لەو ناوچانەی

---

۱- سێسۆستریس، وێدەچێ هەمان رامسیسی دووهەم واتە فیرعەونی میسر بێ کە یەکێک لە گەورەترین و ناسراوترین پاشاکانی میسر بووە و نیزیک بە چواردە سەدە بەرلە زایین ژیاوە.

۲- ئێریترە، ناوێکە کە یۆنانییەکانی سەردەمی باستان بۆ ئەقیانووسی هیندیان داناوە. ئەوان دواتر لەجیات ئەو ئەقیانووسە ئەوجار بە دەریای ئەحمەریان گوتووە دەریای ئێریترە.

۳- سکیتی، کۆمەڵێک هۆزی بەربەری سەردەمی باستان کە بادیەنشین بوونە و بەردەوام لە باکووری رۆژهەلاتی ئەورووپا و باکووری رۆژئاوای ئاسیا ماونەوە. شوێنی نیشتەجێیی ئەوانە پتر لە باکووری دەریای رەش بووە.

لەشکر پێیاندا دەرباز ببوو، پیاو چاوی بەو ئەستووندەکانە دەکەوێ، بەڵام کە دوور دەکەوییەوە، ئیتر کۆتاییان پێدێ. ئەو پاشایە تا ئێرە هات و پاشان گەڕایەوە. کاتی گەڕانەوەی گەیشتە چۆمی فاسی[1]، لێرەدا ناتوانم بڵێم ئاخۆ هەمان فیرعەون واتە سێسۆستریس بووە یاننا، یا بەشێک لە لەشکرەکەی بەمەبەستی نیشتەجێبوون و دروست کردنی موهاجیرنشین جێهێشتبێ. هەڵبەت بۆچوونێکیتریش هەیە کە دەڵێ بەشێک لە لەشکر ڕێگای هەتڵە کرد و بڕیاریاندا لە ڕۆخەکانی چۆمی فاسی بمێننەوە و چەند ئاواییەک دروست بکەن.

[١٠٤] کۆلخیەکان[2] وێدەچێ میسری بن. من خۆم بەو قەناعەتە گەیشتووم بەر لەوەی خەڵکانیتر زانیاریم بدەنێ، لەبەر ئەوەی گرفتەکە بەلامەوە گرینگ بوو، پرسیارم لە کۆلخیەکان خۆیان و لە میسرییەکان کرد. کۆلخیەکان پتر میسرییەکانیان لەبیربوو تا ئەوە کە میسرییەکان کۆلخیەکانیان لەبیر مابێ. میسرییەکان بەڵام، پێیان گووتم کە لەو باوەڕەدان کۆلخیەکان لەڕاستیدا میسرین و پاشماوەی لەشکری سێسۆستریس پاشان. من خۆێشم شکم بۆ ئەوە دەچوو، چونکە کۆلخیەکان قژیان ڕەش و لوولە و ڕەنگی پێستیان گەنمییە. هەرچەند ئەو وێچوونە مانایەکی ئەوتۆی نییە، چونکە گەلانیتریش هەن کە خاوەنی تایبەتمەندی لەو چەشنەن، بەڵام ئەوە گرینگە کە لەنێو خەڵکانی جیهاندا تەنیا کۆلخیەکان و میسرییەکان و ئەتیۆپیەکان نەریتی سوننەت و خەتەنەیان پاراستوە. فینیقیەکان و سوورییەکانی وڵاتی فەلەستین دەڵێن ئەو نەریتە لە میسرییەکان فێربوونە. لە حاڵێکدا دووریەکان کە لە ناوچەکانی قەراخ ڕووبارەکانی تێرمۆدۆند[3] و پارتینیۆ دەژین، لەگەڵ دراوسێکانیان واتە ماکرۆنیەکان دەڵێن دابی سوننەت و خەتەنە لەو دواییانە و لە کۆلخیەکانەوە بەوان گەیشتووە، کۆلخیەکان تەنیا خەڵکانێکن کە سوننەت

---

١- فاسی، چۆمێک لە هەرێمی کۆلخید کە تێکەڵ بە بەحری ڕەش دەبۆوە. ئەمڕۆ ناسراوە بە ریۆن.

٢- هەرێمی کۆلخیەکان لە ئاسیا کوندا، لە ڕۆژهەڵاتی دەریای ڕەش و باشووری قەفقاز بەهۆی چۆمی فاسی پاراو دەکرا.

٣- ئەو چۆمە دەڕژێتە دەریای ڕەش.

و خەتنەکردنیان پاراستووە و وەک نەریتێک لە میسرییەکانەوە بۆیان ماوەتەوە. ئەوەش کە میسرییەکان لە ئەتیۆپی یەکان فێربوون یا بە پێچەوانەوە ئەتیۆپی یەکان لە میسرییەکان، ناتوانم بە دڵنیاییەوە بیسەلمێنم. لەبەر ئەوەی ئەو نەریتە ئێجگار کۆن و دێرین (باستان)ییە. بەڵام ئەوەی کە خەڵکانی‌تر لە میسرییەکانەوە وەریانگرتووە، دەگەڕێتەوە سەر پێوەندی نێوانیان و هاتووچۆیان. تەواو ئاشکرا و روونە، ئەویش بە پشتبەستن بەو زانیارییانەی خوارەوە: ئەو بەشە لە فینیقی یەکان کە پێوەندی و هاموشۆیان لەگەڵ یۆنانییەکان هەیە، ئەو نەریتەی میسرییەکانیان وەرنەگرتووە و مناڵەکانیان سوننەت و خەتەنە ناکەن.

[١٠٥] بابەتێکی‌تر کە کۆلخی یەکان لە میسرییەکان نیزیک دەکاتەوە و دەکرێ قسەی لەسەر بکەین، ئەوەیە کە هەردووکیان شێوەی هەڤدوو کارلەسەر کەتان دەکەن. هەڵبەت ژیان و زمانیشیان وەک یەک دەچن. ئەو کەتانەی لە وڵاتی کۆلخی یەکان بەرهەم دێت، یۆنانییەکان پێیدەڵێن ساردۆن و ئەوەش کە لە میسرەوە بێ پێیدەڵێن میسری.

[١٠٦] زۆربەی بەردەنووسەکانی سێسۆستریسی پاشای میسری چەقاندنی. ئیمڕۆکە هیچیان نەماون، بەڵام لە سوریا و فەلەستین من چاوم بە ژمارەیەک لەوانە کەوت. مۆری فیرعەونی ناوبراو لەگەڵ نەخشی ئەندامی مێیینەی ژنانی لەسەر بوو. هەڵبەت لە ناوچەی یوونیا[1] دوو شێوەیان وەبەرچاو کەوت. یەکێک لەوانە لەسەر رێگای بەرەو ئێفێسۆ[2] لە ناوچەی فۆکێئا[3] چەقێندراوە و ئەوەی‌تریش لەسەر رێگای شاری سارد لە دەڤەری

---

١- یوونی، هەرێمێک لە ئاسیای بچووکی سەردەمی باستان، لەنێوان کەنداوی ئەزمیری ئەمڕۆ و کەنداوی مێندێلیا هەڵکەوتبوو و لە سەراسەری خاکەکەیدا کۆچبەرانی یۆنانی نیشتەجێ بوونە. شارەکانی گەورەی ئەو هەرێمە بریتی بوونە لە میلیتوس، ئێفێسۆس، کۆلۆفۆن، فۆسێ و خیێۆ.

٢- ئێفێسۆ، یەک لە شارە کۆنەکانی هەرێمی یوونی هەڵکەوتوو لە کەنار ئاوەکانی دەریای ئێژە و ئەمڕۆ تەنیا کەلاوەیەکە.

٣- فۆکێئا یا فۆسە، شارێکی کۆنی ئاسیای بچووک لە هەرێمی یوونی، ئەمڕۆ ناسراوە بە فوچە.

سمیرنی‌یە[1]. لەسەر هەردووکیان، نەخشی پیاو هەڵکەندراوە و پیخیس[2] پتر بەرزە. لەنێو دەستی راستدا نێزەی هەیە و بەدەستی چەپ کەوانی راگرتووە. رەختی چەکەکانیان هەم میسرییە و هەم ئەتیۆپیایی. لەسەر سینگیان نووسراوێک بەرچاو دەکەوێ و لە شانێکەوە بۆ شانی‌تر دەچێ و بە خەتی پیرۆزی میسری هەڵکەندراوە و دەڵێ: "من ئەو وڵاتەم بە زەبری مەچەکی خۆم داگیرکردوە ". نووسراوەکە باسی ئەوە ناکا خاوەنی گووتەکە کێیە و خەڵکی کام شوێنە. هەڵبەت ئەوەمان بە زانیاری تەواوەوە لێ‌روونە، بەڵام گشت ئەو کەسانەی چاویان بەو بەردەنووسانە کەوتووە، دەڵێن ئەوە کاری مێمنۆیە[3]. بەباوەڕی من لەو بارەوە بە هەڵە چوونە.

[١٠٧] کاهێنە میسریەکان ئەوەشیان پێگووتم کە سێسۆستریس وەختێک گەڕایەوە وڵاتی خۆی، جەماوەرێکی ئێجگار زۆری دیل لەگەڵ خۆی هێنابوو. ئەو کۆمەڵە دیلە لە نەتەوەی جۆراوجۆر بوون و فیرعەونی ناوبراو وڵاتەکەیانی داگیرکردبوو. سێسۆستریس لە نێوەندی ئایینی دافنی[4] سەر بە ناوچەی پیلوسیۆس[5] چاوی بە براکەی کەوت، واتە ئەو کەسەی دەسەڵاتی میسری

---

١- سمیرنی، شارێکی کۆنی ئاسیای بچووک، هەڵکەوتوو لە کەنارئاوەکانی دەریای مەدیترانە، ئەمڕۆ ناسراوە بە ئەزمیر.

٢- پیخیس یا ئانیشک، ٤٤.٤ سانتی‌میتر یا ٤٤٤ میلیمیتر.

٣- مێمنۆن، کەسایەتییەکی ناسراوی ئەفسانەیی لە سەردەمی ئەنتیکدا، کوڕی تیتۆن و خۆری سپێدە بوو. کاتێک شاری ترۆئا کەوتە گەمارۆی یۆنانییەکان، باوکی مێمنۆن پاشای میسر بووە. ئەو پاشایە مێمنۆنی بەمەبەستی یارمەتیدانی خەڵکی ترۆئا ناردوەتە ئەو شارە. مێمنۆن لەو شارە بەدەستی ئاخیلێئا یا ئاشیل کوژراوە. ناوبانگی مێمنۆن دەگەڕێتەوە بۆ پەیکەرەیەکی زەبەلاح و گەورە کە لە نیزیک شاری تیڤا لەپاش ئەو بەجێ ماوە. ئەوجۆرەی باس‌دەکرێ گشت بەیانییەک کە خۆر گزینگ دەدا، دەنگێک لە هەناوی ئەو پەیکەرەیە بەهۆی تیشکەکانی خۆری سپێدە دەبیسرێ و خەڵک لەو باوەڕەدان کە مێمنۆن خۆیەتی و سڵاو و درود بۆ دایکی خۆی واتە خۆر دەنێرێ.

٤- دافنە، خۆی شارێکی بچووکی ناوچەی ئەندیۆخیا یا ئانتیۆش لە نیزیک وڵاتی میسرە و لە سەردەمی باستاندا نێوەندی بەڕێوەچوونی رێورەسمە ئایینی‌یەکان بۆ رێزگرتن لە خواوەند ئاپۆلۆن بووە.

٥- پیلۆسی، یەک لە شارەکانی کۆنی میسر، لە نیزیک پۆرت‌سەعیدی ئێستا، بۆ ساڵانێکی زۆر دەروازەی سەرەکی وڵاتی میسر بەرەو ئاسیا بووە.

پێئەسپاردبوو. براکەی سێسۆستریس، پاشا و منداڵەکانی بانگهێشتی ماڵی خۆی کرد. حەسارێکی لە داری ویشک بە دەوری ماڵدا سازکرد و ئاگری تێبەردا. سێسۆستریس هەرکە هەستی بەو گەمارۆ ئاگراوییە کەوت، خێرا لەگەڵ ژنەکەی خۆی کەوتە راوێژ. ئەو ژنە بەردەوام لەگەڵی بوو. ژنە بە پاشای گووت: "شەش منداڵمان هەیە، دوو کەسیان راکشێن و ببنە پرد و گشتمان بەسەر پشتیاندا برۆین و خۆمان دەرباز بکەین. سێسۆستریس بە قسەی کرد و دوو لە منداڵەکانی سووتان و ئەوانی‌تر لەگەڵ باوکیان نەجاتیان هات.

[١٠٨] سێسۆستریس گەڕایەوە میسر و براکەی خۆیشی بە سزا گەیاند. ئەو کۆمەڵە دیل و یەخسیرەش کە لە وڵاتانی داگیرکراوەوە هێنابووی، بەو شێوەیە هەڵسوکەوتی لەگەڵ کردن: ئەوانە بوون کە تەواوی بەردە درێژ و زلەکانیان لە سەردەمی دەسەڵاتداری ناوبراودا بۆ دروست کردنی پەرستگەی ئێفێستۆس[1] هێنا. هەر ئەوانەش بوون کە گشت کاناڵەکانی وڵاتی میسرییان هەڵکەند. دیارە دواتر ئەو زانیارییەشم دەست کەوت: وڵاتی میسر لە ئەسپ و داشقە پاک بۆوە کە پێشتر ئەو کۆمەڵگا گەورەیەی داگرتبوو. لەو سەردەمەوە لە وڵاتی میسر کە سەراسەر دەشت بوو، نە ئەسپ ماوە و نە داشقە، چونکە کاناڵێکی زۆر لێدران و بۆ گشت لایەک دەچوون. سێسۆستریس لەبەر ئەو هۆیانە کاناڵەکانی دروست کرد: ئەو میسریانەی لە چۆمەکان دوور بوون و لە بەرزاییەکان دەژیان، هەرکات ئاوی رووبار لەکەمی دەدا و پاشەکشەی دەکرد، ناچار دەبوون لەبەر کەمی ئاو کەڵک لە چاڵاو وەرگرن و ئاوی سوێر بخۆنەوە.

[١٠٩] کاهێنانی میسری بۆیان باسکردم کە ئەو پاشایە تەواوی کێڵگەکانی وڵاتی میسری بە یەک پانتایی بەسەر وەرزێڕاندا بەشکرد. کێڵگەکان گشتیان چوارگۆشە بوون. بۆ هەرکەس دیاریکرا کە بەشی خۆی ماڵیاتی ساڵانە بدا. پاشا بەو شێوەیە مەخاریجی پاشایەتییەکەی دابینکرد. ئەگەر کێڵگەی وەرزێرێک ژێر ئاو کەوتبا، کابرا یەکسەر دەچووە لای پاشا و

---

١- ئێفێستوس، خوای ئاگر و ئاسنی یۆنانییەکان.

باسی ڕووداوەکەی دەکرد. پاشا یەکێکی ڕادەسپارد، بۆوەی بزانێ کێڵگەکە چەندەی وەژێر ئاو کەوتووە، ئیتر لەو کاتەوە و بەو ڕێژەیە ماڵیاتی ئەو ساڵە لەسەر کابرای وەرزێڕ کەم دەبۆوە. بەباوەڕی من هەر بەو چەشنە بوو کە زانستی تۆپۆگرافی (نەخشەبەرداری) دۆزرایەوە و دواتر گەیشتە یۆنان. یۆنانییەکان کاتژمێری هەتاوی(پۆلۆس)[1]، غنۆمۆن[2]، دابەشکردنی شەو و ڕۆژ بەسەر دوازدە بەش لە بابلییەکان فێربوون.

[۱۱۰] سێسۆستریس تەنیا پاشایەکی میسری بوو کە حوکمڕانی وڵاتی ئەتیۆپیاشی دەکرد. ناوبراو پەیکەرەی خۆی لەبەردەم پەرستگەی ئێفێستۆس دامەزراند. دوو پەیکەری خۆی و ژنەکەی و دواتریش چواری پەیکەری منالەکانی لەو شوێنە دانا. پەیکەرەی خۆی و ژنەکەی بەردینە، بەبەژنی سێ پیخیس[3] و هی منالەکانیشی بەرزاییان بیست پیخیس بوون. ساڵانێک دواتر، کاهێنی پەرستگەی ئێفێستۆس ڕێگای بە داریوشی فارس نەدا پەیکەرەی خۆی لە هەمان شوێن دابنێ. ئەو بە داریوشی گوتبوو کە فتووحات و داگیرکەریی کەمتر لە سێسۆستریسی هەبووە و ژمارەیەکی کەمتری لە گەلانی ناوچە هێناوەتە ژێر دەسەڵاتی خۆی و بەتایبەتی دەرەقەتی سکیتییەکان نەهاتووە. هەربۆیە دروست نییە کە کەسێک بە سەرکەوتنی پترەوە پەیکەرەی خۆی دامەزرێنێ و پاشان یەکیتر بە فتووحاتی کەمترەوە هەمان مافی هەبێ. داریوش خۆیشی ئەو وەڵامەی قبوڵکرد.

[۱۱۱] هەر ئەو کاهێنانە گووتیان کە سێسۆستریس مرد و کوڕەکەی بەناوی فێرۆس[4] لە جێگای دانیشت. ئەو کوڕە خۆی لە شەڕ و لەشکرکێشی نەدا و دواتر لەبەر هێندیک هۆ کوێر بوو: جارێکیان چۆم بە ڕێژەیەکی بەرچاو هەستا، پلەی

---

١- پۆلۆس، چەشنێک کاتژمێری هەتاوی، لەڕاستیدا قوڵکەیەک بوو کە لە قەراخ بازنەی ئەو قوڵکەیە کاریتە دارێک دەچەقێندرا. بەپێی جوڵەی نیسێی ئەو دارە لەسەر جغزی بازنەکە، کات و ساتی ڕۆژ دیاری دەکرا.

٢- غنۆمۆن، ئەو دارەی بۆ کاتژمێری هەتاوی کەڵکی لێوەرگیراوە.

٣- پیخیس یا ئانیشک، ٤٤.٤ سانتیمیتر یا ٤٤٤ میلیمیتر.

٤- فێرۆس یا فێرۆن، ناوی فیرعەون لەوەوە سەرچاوەی گرتووە.

بەرزی ئاو گەیشتە هەژدە پیخیس. پاش ئەوەی ئاو تەواوی زەوی‌وزاری داپۆشی، بایەکی توندیش هەڵیکردێ و تۆفانی سازکرد. دەڵێن پاشا خۆی پێڕانەگیرا و نێزەی دەست دایە و هاویشتییە نێو گرداوی رووبار و راست لەو کاتەدا چاوەکانی تووشی بەڵایەک هاتن و کوێر بوو. دە ساڵی ڕێک بە کوێری مایەوە و لە ساڵی یازدەهەمدا پێشگۆییەکی لە شاری ڤوتۆسەوە بۆ هات کە دەیگووت سزای تەواو دراوە و ئێستا پێویستە رووناکی بگەڕێتەوە چاوەکانی، ئەگەر بە گمێزی ژنێک بشۆرێن کە تەنیا مێردی خۆی خۆش‌ویستبێ و لەگەڵ هیچ پیاوێکی‌تر نەخەوتبێ. فێرۆس پاشا سەرەتا چاوەکانی بە گمێزی ژنەکەی خۆی شوشت و چاک نەبۆوە. دواتر کۆمەڵێکی ژن کۆکردەوە و گمێزی گشتیانی بەتاقی کردەوە و چاک بۆوە. جیا لەو ژنەی کە بە گمێزەکەی تیمار ببوو، هەرهەموو ژنانی‌تری کۆکردەوە و بردنیە شارێک بەناوی ئێریتری ڤۆلۆس. ئاگری لە ژنەکان و خەڵکی ئەو شارە بەردا. ئەو ژنەی ببوە هۆی چاک بوونەوەی، خێرا لەخۆی مارەکرد. دوای گەڕانەوەی بینایی چاوانی، خەڵاتێکی فراوانی پێشکەشی نێوەندەکانی ئایینی ناسراو کرد. لەنێو خەڵاتەکاندا، دوویان گەلێک بەرچاو بوون. دوو دانە ستوونی بەردینەی یادوەری، کە هەردووکیان لە پەرستگەی ئێلیۆ(خۆر) دامەزران. ئەوانە بەردی یەکپارچەن و بەژنی هەرکامیان سەد پیخیس[1] بەرزە و هەشت پیخیس پانن.

## مێژووی میسر و ئۆمیرۆس

**[١١٢]** کاهینانی میسری باسیان کرد کە دوای فێرۆس کەسێکی خەڵکی مێمفیس هاتەسەر تەخت و یۆنانییەکان بەناوی پرۆتێ‌ئاس[2] دەیناسن. لە کارەکانی پرۆتێ‌ئاس تەنیا حەوشەی پیرۆزی پەرستگەیەک ماوە و زۆر جوان و

---

١- پیخیس یا ئانیشک، ٤٤.٤ سانتی‌میتر یا ٤٤٤ میلیمیتر.

٢- پرۆتێ‌ئاس یا پرۆتێ، ناوی پیرێکی بەساڵاچووی دەریاوانی باستانییە. بەپێی چیرۆکەکانی یۆنانی، ئەو کابرایە ساڵانێکی زۆر لە کەنارئاوەکانی میسر خەریکی دەریاوانی بووە و هەمان کەسە کە لە کتێبی ئۆدیسەدا لەگەڵ مێنێلائۆس راوێژدەکەن. رووننەکراوەتەوە کە چ پێوەندییەک لەنێوان دوو ناودا، واتە ناوی پاشایەک و ئەو کابرایە لەگۆڕێدا.

رازاوەیە و لەلای باشووری پەرستگەی ئێفێستێو هەڵکەوتووە. لە دەوری ئەو پەرستگایە، حەشیمەتی فینیقی سەر بە ناوچەی تیرۆس دەژین و شارەکەیان پێیدەگووترێ تیرۆ[1]. لەنێو حەساری پەرستگەی پرۆتێئا دێری کسێنیئەفرۆدیت[2] (کسێنی واتای بیانی دەدا) جێیگرتووە و لەلایەن خەڵکەوە بەو ناوە ناسراوە. من خۆم بەو قەناعەتە گەیشتووم ئەو پەرستگەیە هی ئێلێنی[3] کچی (تینزارێئۆ)[4]یە. بۆیەش ئەوە دەڵێم، چونکە گوێم لە بەسەرهاتێکی حیماسی بووە کە دەڵێ، ئێلێنی بە ساڵان لەلای پرۆتێئا ماوەتەوە، بۆیە تەنیا بۆ ئافرۆدیت کسێنی ئەو ناسناوە بەکاردێنن و لە هیچ شوێنێکیتر مەعبەدی ئافرۆدیت بە ناوی کسێنی واتە بیانی و بێگانە کەڵکیلێوەرنەگیراوە.

[١١٣] کاتێک سەبارەت بە ئێلێنی پرسیارم لە کاهینەکان کرد، وڵامیان دامەوە کە رەوتی رووداوەکان بەو چەشنە بووە: وەختێک ئەسکەندەر[5] (مەبەست ئەسکەندەری مەزن نییە) ئێلێنی لە شاری سپارت رفاند و بەرەو وڵاتی خۆی گەڕایەوە. گەیشتە بەحری ئێیێئۆ(ئێژە)، کاتێک رۆژ بۆوە، بایەکی توند هەڵیکردێ و هەردووکیانی راماڵی و بردنی بۆ بەحری میسر. گەرمای ئەوێ سڵینەکردنەوە و خێرا چوونە میسر، واتە بۆ ناوچەی

---

١- تیرۆ، سوور یا تیر، شارێکی کۆنی فینیقییەکان بووە کە بەهۆی دانیشتووانی سیدۆنی بنیاتنراوە و لە رابردوودا نێوەندی بازرگانی و شوێنی سنعاتی پارچە و قوماش بووە و ئێستا تەنیا بەشێکی بچووکی ئەو شارە لە وڵاتی لوبنان ماوە.

٢- ئەفرۆدیت، ڤێنۆس، ئێلاهەی یۆنانی، خوای جوانی. دەبێ هەمان ئاستارتێی فینیقی بووبێ.

٣- ئێلێنی یا هێلێن، شازادەی یۆنانی، کچی لیدا و خوشکی کاستۆر و ژنی مێنێلائۆس، لەبەر جوانی بێوێنەی بەهۆی پاریس رفێندرا و یۆنانییەکان بە مەبەستی ئەستاندنەوەی پەلاماری شاری ترۆئایاندا و شەڕی ئەفسانەیی ترۆئای لێکەوتەوە و بە شەڕی ترۆئاهێلێنیش ناسراوە.

٤- تینزارێئۆس، پاشای ئەفسانەیی سپارت و مێردی لیدا و باوکی هێلێنی ناسراو کە شەڕی ترۆئای لەسەر سازبوو.

٥- ئەلێکساندرۆس یا ئەسکەندەر، مەبەست ئەسکەندەری مەزن نییە، لە کتێبە مێژووییەکاندا بە پاریس ناسراوە. کوڕی دووهەمی پریام و ئیراکلیس بووە و هێلێنی جوان و ژنی مێنێلائۆسی رفاندوە و بووەتە هۆی شەڕی ترۆئا.

تاریخیا[1]، ئەو شوێنەی گەرووی رووباری نیلی لێهەڵکەوتووە. ئیمڕۆ ناسراوە بە کانوپ[2]. لەوێ، لە کەنار ئاو، پەرستگەی ئیراکلیس جێی گرتووە و تا ئێستا ماوە. هەرکات کۆیلەیەک یا هەر کەسێکیتر پەنا بۆ ئەو مەعبەدە بەرێ و نیشانەکانی پیرۆز لەسەر لەشی خۆی هەڵکەنێ، ئەو کاتە پێشکەش بە خواوەند دەبێ و هیچکەس بۆی نییە لەمەو بەدوا ئازاری پێبگەیێنێ.[3] ئەو قانوونە تەواو دێرین (باستان)ییە و تا ئێستاش هیچ ئاڵوگۆڕێکی بەسەردا نەهاتووە. کۆمەڵێک لە دیلەکانی ئەسکەندەر وەختێک بە یاسای ئەو پەرستگەیان زانی، راپەڕین و خێرا پەنایان بۆ ئەوێ برد و سەری کڕنۆشیان دانەواند و بە مەبەستی زیانگەیاندن بە ئەسکەندەر، ناوبراویان تاوانبار کرد و باسی بەسەرهاتی ئەویان هێنایە گۆڕێ. ئەوان گووتیان کە ئەسکەندەر خاتوو ئێلێنی هەڵگرتووە و تۆڵەی لە مانێلائۆس[4] ئەستاندۆتەوە. هەڵبەت ئەسکەندەر تەنیا لەلای ئەوان بە تاوانبار نەزانرا، بەڵکوو لەلای تۆنیس، سەرۆکی پاسەوانانی گەرووی رووباری نیلیش بە خەتابار ناسرا.

[١١٤] وەختێک تۆنیس گوێی لە گشت لایەک راگرت، پەیامێکی خێرا و گرینگی بۆ پرۆتێئاس نارد کە ئەو کاتە لە دەڤەری مێمفیس بوو و تێیدا گوتبووی: "کابرایەکی بیانی هاتووە، سەر بە خانەدانی تێفکرۆس، لە یۆنان بێ حورمەتی بە پیرۆزایەتیەکان کردوە، ژنی ئەو کەسەی هەڵفریواندوە کە لەلای میوان بووە و هەڵیگرتووە و کۆمەڵێک ئەشیای قیمەتی رفاندوە. ئێستا بەهۆی تۆفان و تەوژمی بایەکان گەیشتۆتە ئێرە. چی لێبکەین؟ لێیگەڕێین

---

١- تاریخیا، تاریشە، دەبێ ناوی شوێنێک بێ کە کانزای خوێی لێ هەڵکەوتبێ. ستراڤۆن لە جۆغرافیاکەیدا دەڵێ لە کەنارئاوەکانی لیبی (ئەفریقیا) چەند دورگەیەک هەن و بەو ناوە ناسراون. (کتێبی ١٧، بەندەکانی ٣ و ١٦).

٢- کانوپ یا کانوپۆس، یەک لە شارەکانی میسری باستان لە نیزیک دەریای مەدیترانە و هەڵکەوتوو لە قەراخ لکێکی روباری نیل. ئەو شارە بەبۆنەی رێزگرتن لە کەشتیوانی مێنێلائۆس دروست کرا چونکە لەو شوێنە مرد. (ستراڤۆن، کتێبی ١٧ بەندەکان ١ و ١٧).

٣- کۆیلەکان لە میسری باستاندا بەهۆی خاڵکوبی تایبەتەوە نیشانەدەکران.

٤- مانێلائۆس یا مێنێلائۆس، پاشای ناسراوی سپارتی و برای ئاغامێمنۆن کە ژنەکەی بەهۆی ئەسکەندەر یا پاریس رفێندرا و شەڕی بەناوبانگی ترۆئای لێکەوتەوە.

بڕوا، بەبێ ئەوەی سزابدرێت یا ئەوەی پێیەتی لێی بستێنینەوە؟ ". پرۆتێئاس بەو چەشنە وڵامی تۆنیسی داوە: "ئەو کابرایە هەرکەسێک بێ، لەبەر ئەوەی کارێکی ئەوتۆ ناحەزی دەرهەق بە خانەخوێی خۆی کردوە، هەرچی زووتر بیگرن و بۆ لای منی بنێرن. بابزانم جوابی من چ دەداتەوە ".

[١١٥] تۆنیس هەرکە ئەو فەرمانەی پێگەیی، ئەسکەندەری گرت و لەنێو گەمییەکی نا. خاتوو ئێلێنی و کۆیلەکان و گشت ئەشیا قیمەتی‌یەکانی لەگەڵ ئەسکەندەر بەڕێ کردە لای پرۆتێئاس. وەختێک ئەوانە گەیشتنە لای ناوبراو، پرۆتێئاس دەستی بە لێکۆڵینەوە لە ئەسکەندەر کرد. سەرەتا لێی پرسی خەڵکی کوێیە و چکارەیە. ئەسکەندەر ناوی خۆی و وڵاتەکەی بە پرۆتێئاس گووت و هەروەها باسی ئەو رێگا دوور و درێژەی کرد کە پێوابووی. پرۆتێئاس ئەوجار پرسی کە خاتوو ئێلێنی لە کام وڵات هەڵگرتووە. ئەسکەندەر وڵامەکەی ناڕوون بوو و گەرەکی نەبوو راستیی کردەوەکەی بە ناوبراو بڵێ. کۆیلەکان بەڵام، لەجیاوە ئەسکەندەریان وەدرۆ خستەوە. کۆیلەکان ئەو کەسانە بوون پەنایان بۆ مەعبەدی ئیراکلیس بردبوو. ئەوانە باسی رەوتی رووداوەکەیان کرد و بە ئاشکرا دوان و راستیەکەیان بۆ پرۆتێئاس گێڕاوە. لە کۆتاییدا پرۆتێئاس بڕیاری خۆیدا: "ئەگەر لە سەرەتادا هەولم نەدا کەسێکی بیانی بکوژم کە با و تۆفان هێنابیان بۆ وڵاتی من، ئێستا بۆ خاتری خاتوو ئێلێنی سزات دەدەم هەی چەپەڵی خەراپکار. تۆ کە ئەو هەموو بێئاقڵییەت دەرهەق بە خانەخوێیەکەت کردوە کە میوانداری لێکردووی، ژنت لێفریو داوە و بەوەش نەوێستاوی هەڵتگرتووە. دزی و تالانیش لە ماڵی خانەخوێ، ئەویشی با بێتە سەر. ئێستا لەبەر ئەوەی ناخوازم کەسێکی بێگانە بکوژم، ئیزنی ئەوەت پێنادەم ئەو خاتوونە لەگەڵ کەل و پەلە پڕبەهاکان ببەی، ئەوانە بۆ خاتوو ئێلێنی بیانی دەپارێزم، تا ئەو کاتەی مێردەکەی خۆی بێ و وەریان‌گریتەوە. تۆ خۆت و هاوکارانت لە ماوەی سێ رۆژدا دەبێ لە وڵاتی من برۆن، ئەگینا وەک دوژمن سەیرتان دەکەم ".

[١١٦] کاهێنان ڕەوتی ڕووداوەکان و چۆنییەتی هاتنی خاتوو ئێلێنی بۆ وڵاتی فەرمانڕەوایی پرۆتیئاس‌یان بەو چەشنە بۆگێڕامەوە. من لەو باوەڕەدام کە ئۆمیرۆس[١] بەو بەسەرهاتەی زانیوە. ئەو پێیوابووە کە بەسەرهاتی گۆڕین بۆ هۆنینەوەی شێعری حیماسی فرە شاز نەبووە و ئەوەی دەستکاری کراو باشتر جێیدەگرێ. دیارە ئەوەشی روون کردووەتەوە کە چۆن چیرۆکەکەی بیستووە. چونکە لەنێو کۆمەڵە شێعری (ئیلیاد)[٢]دا کاتێک باسی سەرگەردانی ئەسکەندەر دوای هەڵگرتنی خاتوو ئێلێنی دەکات، (لە هیچ شوێنێکی‌تر بەپێچەوانەی ئەو قسەیەی شتێکیتر ناڵێ) بە زۆر وڵاتاندا خولاوەتەوە و ئاخرەکەی گەیشتۆتە سیدۆنا[٣] لە وڵاتی فینیقیا. ئۆمیرۆس لە بەشێکی‌تردا کە باسی شەڕکردن و پاڵەوانییەتی دیۆمیدۆس[٤] ئاریستیا دەکا، ئەو چەند هەڵبەستەی هۆنیوەتەوە:

*ڕازاوەترین جلی بووکێنی دەستکردی ژنانی سیدۆنا، ئەسکەندەری[٥] خاوەن روخساری خودایی لەوێوە لەگەڵ خۆی هێنابووی. ئەو کاتەی خاتوو ئێلێنی خاوەن شکۆی بەرەو وڵاتەکەی هێنا و بەسەر ئەقیانووساندا دەرباز بوو.*

---

١- ئۆمیرۆس یا هۆمێر، شاعیری ناسراوی یۆنانی کە ٩ سەدە پێش میلاد ژیاوە و دەگووترێ کە کتێبەکانی ئۆدیسە و ئیلیاد نووسراوی ئەون.

٢- ئیلیادا یا ئیلیاد، دیوانە شێعری ئۆمیرۆس لە بیست و چوار پارچەدا و گەورەترین و ناسراوترین شاکاری یۆنانیی سەردەمی باستانە. ئەو کۆمەڵە شێعرە حیماسییە باسی شەڕی ترۆئا و رفاندنی شازادە ئێلێن دەکا.

٣- سیدۆنا یا سیدۆن، شارێکی باستانی فینیقی‌یەکان لە قەراخ ئاوەکانی دەریای مەدیترانەیە. ئەمڕۆ ناسراوە بە سەعیدە.

٤- دیۆمیدۆس، یەک لە پاشاکانی ئەفسانەیی، سەرەڕۆ و زاڵمی وڵاتی تراکی بووە. لە چیرۆکێکی خەیاڵیدا دەگووترێ کە ئەسپانی کێوی رەوەک و گۆشتخۆری پاڵەوانی مێژوویی واتە ئیراکلیس یا هێرکولیس، ئەو پاشایەیان خواردوە.

٥- ئەلێکساندرۆس یا ئەسکەندەر، مەبەست ئەسکەندەری مەزن نییە، لە کتێبە مێژووییەکاندا بە پاریس ناسراوە. کوڕی دووهەمی پریام و ئیراکلیس بووە و هێلێنی جوان و ژنی مێنێلائۆسی رفاندوە و بووەتە هۆی شەڕی ترۆئا.

ئۆمیرۆس لە شاکاری ئۆدیسەدا[1] هەمان رووداو بە چەند شێعرێک دووبارە بەیان دەکاتەوە:

*دەوا کارسازەکان لای کچی خواوەند دیا[2] دەستدەکەوتن. پۆلیدامنا ژنی تۆنی[3] دەواکانی پێدابوو. ئەو ژنە خەڵکی وڵاتی میسر بوو. میسرێکی خاوەن کێڵگەی پڕحاسڵات کە جیا لە گەنم، کۆمەڵێک گژوگیای‌تری لێ دەستدەکەوت. ئەو گژوگیایانە مرۆڤیان دەکوشت یا چاکیان دەکردەوە.*

لە شوێنێکی‌تر مێنێلائۆس[4] بە تیلێماخۆس[5] دەڵێ:

*خواکان لە وڵاتی میسر، لە کاتی گەڕانەوەمدا پێشیان‌پێگرتم، چونکە قوربانیم پێشکەش نەکردبوون.*

بەو شێعرەی دوایی بەئاشکرا دەردەکەوێ کە ئۆمیرۆس (هۆمێر) زانیاری زۆری سەبارەت بە سەرگەردانی ئەسکەندەر لە وڵاتی میسر هەبووە. وڵاتی

---

١- کۆمەڵێک شێعری حیماسی لە ٢٤ پارچەدا و چەشنی کتێبی ئیلیادا داڕێژراوە. لەو دیوانە شێعرەدا باسی سەفەرەکانی ئولیس، دوای داگیرکردنی شاری ترۆئا دەکرێ و لە زۆربەی شێعرەکاندا روداوەکان و باری ئەخلاقییان زەق کراونەوە.

٢- دیا (ژوپیتێر یا زێئۆس)، باوکی خواکان و فەرمانڕەوای گشتیان لە ئەفسانەکانی یۆنانی باستاندا.

٣- تۆنی یا تونیس، پاسەوانی روباری نیل کە زۆربەی روداوەکان لە هەرێمی ژێر دەسەڵاتی ئەودا قەومابوون و لە بەندی ١١٣دا باسی لێوەدەکرێ.

٤- مانێلائۆس یا مێنێلائۆس، پاشای ناسراوی سپارتی و برای ئاغامێمنۆن کە ژنەکەی بەهۆی ئەسکەندەر یا پاریس رفێندرا و شەڕی بەناوبانگی ترۆئای لێکەوتەوە.

٥- تیلێماخۆس، کوڕی ئولیس و خاتوو پینێلۆپی بووە. تیلێماخۆس مناڵ بووە و باوکی بۆ شەڕی ترۆئا چووە. ئەو کوڕە دواتر بەدوای باوکیدا، دەوری دنیا گەڕاوە. فنلۆن نووسەری ناسراوی فەرانسەوی لە سەدەی حەڤدەدا، سەفەرەکانی ئەو کوڕەی وەک چیرۆکی ئەفسانەیی لە کتێبێکدا بەناوی بەسەرهاتەکانی تێلماک نووسیوە.

سوریا سنووری هاوبەشی لەگەڵ میسر و فینیقیا هەیە و خەڵکی سیدۆنی کە سەر بەوانن، لەو وڵاتە واتە لە سوریا نیشتەجێن.

[١١٧] ئەو شێعرانە، بەتایبەتی ئەوەی دوایی، دەردەخەن کە کۆمەڵە بەرهەمی کیپریا ئێپی(هۆنراوەکانی قیبریسی) ملکی ئۆمیرۆس نییە و هی کەسێکی‌ترە. چونکە لە (کیپریا ئێپی)دا کە دەڵێ ئەسکەندەر سێ ڕۆژ دوای ڕۆیشتن لە شاری سپارت، لەگەڵ ئێلێنی گەیشتنە شاری تریا[1]. ئەو کاتە شنە بای دەهات و دەریا ئارام بوو. لەحاڵێکدا لە دیوانە شێعری (ئیلیادا)دا باسی ئەوە دەکرێ کە ئەسکەندەر و خاتوو ئێلێنی چۆن تووشی سەرگەردانی و ئاوارەیی هاتوون. بەهەرحاڵ ئێستا بەپێویستی نازانم لەوە زیاتر باسی ئۆمیرۆس و هۆنراوەکانی قیبریسی بکەم.

[١١٨] کاتێک لە کاهینەکانم پرسی ئاخۆ ئەو شتانەی یۆنانییەکان سەبارەت بە ڕووداوەکانی تریا[2] دەیڵێن، هیچ بنەمایەکیان هەیە یان نا؟ وڵامیان دامەوە و دڵنیایانکردم کە ئەوان خۆیان لە زمانی مێنێلائۆسەوە ڕەوتی ڕووداوەکان دەگێڕنەوە. دوای ڕفانی خاتوو ئێلێنی، هێزێکی گەورە لە لەشکری یۆنانی ڕووی لە شاری تریا (ئیلیۆن – ترۆئا) کردوە، بۆوەی یارمەتی مێنێلائۆس بدەن. کاتێک ئەوانە گەیشتوونەتە نێو شار، داوای خاتوو ئێلێنی و ئەشیا بەنرخەکانیان کردوە کە کاتی خۆی ئەسکەندەر دزیبوونی. هەروەها داوای قەرەبووی گشت ئەو زیانانەشیان کردوە کە لە ڕێگادا پێیان‌گەیشتبوو. ترۆئاییەکان سوێندیان خوارد و چەند جاریش دووپاتیان کردەوە کە نە خاتوو ئێلێنی و نە ئەشیا قیمەتی‌یەکان لەلای ئەوان نین و گشتیان لە وڵاتی میسرن. لێرەدا ناهەقی بوو ئەگەر ئەوان بە تاوانبار بناسرێن، ئەویش بۆ شتگەلێکی کە پرۆتێئاس، پاشای میسر لەلای خۆی ڕایگرتبوون. یۆنانییەکان لەو باوەڕەدا بوون کە ترۆئاییەکان ئەوان دەسخەڕۆ

---

١- تریا، ترۆئا، بەناوی ئیلیۆنیش ناسراو بووە.

٢- تریا، ترۆئا، ئیلیۆن یا پێرغامۆس، یەکێک لە شارەکانی کۆنی ئاسیای بچووک بووە. یۆنانییەکان لە شەری ناسراوی ترۆئادا، بۆ ماوەی دە ساڵ ئەو شارەیان گەمارۆدا. پاشماوەی ئەو شارە لە شوێنێک بەناوی حەسارلک دۆزراوەتەوە.

دەکەن و راستی‌یان پێنالێن و بۆیە گەمارۆی شاریان‌دا و داگیریان کرد. کاتێک شار گیرا، گشت شوێنێکیان پشکنی. خاتوو ئێلینی‌یان نەدۆزییەوە و بەردەوام هەمان وڵامیان لە زمانی خەڵکەوە بیست. دوای ماوەیەک، یۆنانییەکان باوەڕیان هێنا و بۆیە لەجێوە خودی مێنێلائۆس‌یان ناردە لای پاشای میسر، واتە پرۆتیئاس.

[١١٩] مێنێلائۆس گەیشتە میسر. ئەو بە سواری گەمی و بەسەر رووباری نیل‌دا چووە شاری مێمفیس. لەویٚ بەسەرهاتەکەی بە تێروتەسەلی بۆ پرۆتیئاس گێڕاوە. لەدرێژەدا میوانداریەکی شایانی لێکرا و پاشان خاتوو ئێلێنی بە ساغ و سلامەتی وەرگرتەوە و گشت کەلوپەلە پڕبەهاکانیشی لەگەڵ. لەحالێکدا ئەو کابرایە بەو شێوەیە رێزی لێگیرا، مێنێلائۆس جینایەتێکی دژی میسرییەکان بە ئەنجام گەیاند. ئەو وەختەی ناوبراو ئامادەی گەڕانەوە بوو، تۆفانێک هەڵیکردیٚ. لەبەر ئەوەی تۆفانێکی مەودا درێژ بوو، کارێکی تەواو ناشایست و نامرۆڤانەی کرد. ناوبراو دوو منالی میسری گرت و سەری برین. لە کاتی بە ئەنجام گەیاندنی ئەو جینایەتەدا، کەوتە بەر رق و کینی میسرییەکان و بۆیە وەک تاوانبارێک بە کاروانەوە هەڵات بۆ لیبی (قەراخ ئاوەکانی ئەفریقا). میسرییەکان نەیانزانی ئەو کابرایە بۆ کویٚ چووە، هەر بۆیە کاهینەکانیش هیچیان لەو بارەوە نەدەزانی تا بە منی بڵێن. لەنێو گشت کاهینەکاندا، ئەو جۆرەی بۆیان گێڕامەوە، تەنیا چەند کەسێک ئەو زانیارییەیان لەلا دەستدەکەوت. هەڵبەت توێژینەوە سەبارەت بەو رووداوانەی لە وڵاتەکەیان قەومابوو و بە وردەکارییەوە دەیانزانی.

[١٢٠] بەهەرحاڵ ئەوە رەوتی رووداوەکان بوون کە کاهینانی میسری بۆیان باس‌کردم و بەباوەڕی من دەبیٚ هەرواش بوویٚ. خۆیشم هێندێک زانیاری دەخەمە سەر. ئەگەر خاتوو ئێلێنی لە شاری تریا بوایە، بە دڵنیاییەوە خەڵکەکە ئەو خاتوونەیان تەحویلی یۆنانییەکان دەداوە، جا ئەسکەندەر رازی بوایە یان نا.

چونکە نە پریامۆس[1] و نە خزمەکانی ئەوەندە شێت نەبوون کە ژیانی ماڵ و منداڵ و شارەکەیان تەنیا بۆ خاتری رزگاری ئەسکەندەر و خاتوو ئێلێنی لە مەترسی هاوێن. ئەو هەڵوێستە کە خەڵک بەکوژ نەچێ، لە ساڵانی سەرەتای گەمارۆی شاردا بەڕێوەنەچوو، چونکە دواتر شەڕی نێوان خەڵکی ترۆیی و یۆنانی دەستی پێکردوە و حەشیمەتێکی فرەی ترۆیی کوژراون. بەپێی شێعرە حیماسییەکانی ئۆمیرۆس، پریامۆس خۆی دووسێ کوڕی لەدەست داوە. بەباوەڕی من ئەگەر هەڵوێستی نا بۆ شەڕ ئەو سەردەمە لەگۆڕێدا بوایە، خاتوو ئێلێنی هەرچەند ژنی پریامۆس‌یش بوایە، هەر بۆوەی ئەو شەڕە ساز نەبێ، رادەستی ئاخاییەکانیان[2] دەکردنەوە. جیا لەوەش، خۆ ئەسکەندەر جێگری پریامۆس نەبوو، هەتا ناوبراو بتوانێ بڕیاری لەسەر بدا. ئەو سەردەمە پریامۆس تەواوێک پیر ببوو و قەرار بوو کوڕە گەورەکەی بەناوی ئێکتۆر[3] لەجێی دانیشێ و تەواوێکیش لە ئەسکەندەر جوامێرتر بوو. ئێکتۆر، ئەویش ئەو کەسە نەبوو کە بەبێ قانوونی بجوڵێتەوە و شەڕ بۆ خۆی و خەڵکی ترۆیی هەڵایسێنێ.

خاتوو ئێلێنی لەلای ئەوان نەبوو و یۆنانییەکانیش باوەڕیان پێنەکردن. دیارە یۆنانییەکان بۆیە دڵنیا نەبوون، چونکە رەزای خوای لەسەر بوو. دەبوایە وێرانییەک بخوڵقێ، جائەوجار مرۆڤەکان بەچاوی خۆیان ببینن کە خواکان لەمەر نەنگی و ریسوایی لەو چەشنە، سزای گەورەیان بۆ مرۆڤەکان دیاری کردوە، هەڵبەت ئەوە بۆچوونی منە.

---

١- پریامۆس، دوایین پاشای ترۆئا کوڕی لائۆمێدۆن و باوکی ئێکتۆر یا هێکتۆر و پاریس یا ئەسکەندەری رفێنەری خاتوو ئێلێن.

٢- ئاخایی، ناوچەیەک لە کەنارئاوەکانی باکووری نیمچەدورگەی پێلۆپۆنیسۆس. ئەوانە لە نەوەکانی ئاخێئۆس و پێشتر لە دەڤەری تێسالی ژیاون. دواتر سەراسەری خاکی پێلۆپۆنیسۆس‌یان داگیرکردوە، بەڵام هۆزەکانی دووری یا دەری ئەوانەیان راوناوە بۆیە ناچاربوونە لەو نیمچە دورگەیە و لە شوێنێک بەناوی ئاخایی نیشتەجێ بن.

٣- ئێکتۆر یا هێکتۆر، کوڕی گەورە و جوامێری پریامۆسی پاشای ترۆئا، لە شەڕی ئەو شارەدا کۆمەڵێک جوامێری نواند و لە کۆتاییدا بەدەستی ئاخیلی‌ئاس یا ئاشیل کوژرا.

[١٢١] کاهێنان بۆیان باس کردم کە دوای پرۆتیئاس، رامپسینیتۆس[١] حوکمی بەدەستەوە گرت. ئەو پاشایە وەک دەستکردی مێژوویی، هەیوانی رۆژئاوای پەرستگەی (ئیفێستۆس)ی[٢] دروستکرد. ناوبراو دوو پەیکەرەی لە پێشەوەی ئەو هەیوانە دانا کە بەژنی هەرکامیان پێنج پیخیس[٣] دەبێ. ئەوەی رووی لە باکوورە، میسرییەکان ناویان ناوە هاوین و ئەوەیتریش بە زستان ناسراوە. هاوین پتر رێزی لێدەگیرێ و بەپێچەوانەوە ئەوەندە حورمەت بۆ زستان دانادرێ. رامپسینیتۆس سامانێکی زۆری وەک پارەی زێو هەبووە، بەرادەیەک کە هیچکام لە پاشاکانی دوای ئەو نەیانتوانی بەو قەیاسە دەوڵەمەند بن.

رامپسینیتۆس بۆوەی ئەو گەنجە بپارێزێ، بینایەکی بەردینەی سازکرد کە یەکێک لە دیوارەکانی بەماڵەکەی خۆی وەنووسابوو. ئەو وەستاکارەی بیناکەی دروست کرد، تەماحی گەنجەکەی رێنیشت و بە سەرسورمانەوە تێیفکری.

کابرای وەستاکار یەکێک لە بەردەکانی دیواری خەزێنەی پاشای بە چەشنێک دانا کە یەکدوو کەس بتوانن بەراحەتی هەڵگێرو وەرگێری بکەن. هەر کە خەزێنە سازکرا، پاشا گەنجەکەی خستە ناوی. چەند ساڵێک تێپەری و کابرای وەستاکار کەوتە سەرەمەرگ. ناوبراو دوو کوری هەبووە. کورەکانی بانگکرد و پێیگووتن کە داهاتووی ئەوانی لەبەرچاو گرتووە و بۆیە لە کاتی دروست کردنی خەزێنەی پاشادا بیری لە ئاییندەی مناڵەکانی کردۆتەوە. ئەو بە وردی بۆ کورەکانی باسکرد کە چۆن دەتوانن بەردەکە لابەرن و چ قەوارەیەکی هەیە. ئەگەر بتوانن نهێنییەکە بەباشی بپارێزن، دەبنە خاوەنی خەزێنەی فیرعەون.

باوکی کورەکان مرد و ئەوان وەخۆکەوتن. شەو چوونە سەر خەزێنە و بەردەی گۆرینیان دۆزییەوە. بە ئەسپایی لایان برد و قەیاسێک سکەیان هەڵگرت.

---

١- رامپسینیتوس دەبێ هەمان رامسیسی سێهم و پاشای ناسراوی بیستەمین زنجیرە پاشایەتی فیرعەونەکانی میسر بێ. لە بیستەمین زنجیرە پاشایەتی فیرعەونەکانی میسردا زیادتر لە ١٠ پاشا ناویان رامسیس بووە.

٢- ئیفێستۆس، خوای ئاگر و ئاسن.

٣- پیخیس یا ئانیشک، ٤٤.٤ سانتیمیتر یا ٤٤٤ میلیمیتر.

واهەڵکەوت کە رۆژی دوایی فیرعەون بچێتە ژووری خەزێنە و لەنەکاو هەستی بە قەومانی رووداوێک کرد. چەند کووپەیەک بەتاڵ کرابوون. پاشا شکی بۆ هیچ دزێک نەچوو، چونکە مۆری درگاکان دەستیان لێنەدرابوو و بەتەواوی داخراو بوون. یەکدوو جاری تریش سەری لە خەزێنە دا و هەرجارێ بەسەر چەند کووپەی بەتاڵیتردا کەوت (چوونکە دزەکان خوویان بەو کارە گرتبوو). پاشا دەستووری‌دا چەند تەڵەیەک دروست بکەن و لەنیزیک کووپەکانی پڕ لە سکەکان داندرێن. دزەکان (کوڕەکان) دووبارە بەپێی عادەت چوونەوە سەر خەزێنە. یەکیان چووە ژوورێ و ئەوەی‌تر چاوەڕوان لەدەرێ مایەوە. ئەوەی ژوورێ هەرکە لە کووپەکان نیزیک کەوتەوە، بەتەڵەی وەبوو و خێرا تێگەیی تووشی چ چارەنووس و رۆژگارێک هاتووە. بانگی براکەی کرد و پێیگووت کە چی بەسەر هاتووە. داوای لێکرد کە یەکڕاست بێتە ژوورێ و سەری ببڕێ. چونکە ئەگەر پیاوانی پاشا ئەویان بە تەڵەوە گرتبا و دەرکەوتبا کێیە، ئەو کاتە هەردووکیان سەریان تێدا دەچوو. براکەی‌تر لێی‌حاڵی بوو کە بۆچوونی برا گیراوەکە راستە و بەقسەی کرد. سەری برای خۆی بڕی و بەردەکەی لە جێگای خۆی داناوە و چۆوە ماڵ. وەختێک رۆژ بۆوە پاشا سەردانی خەزێنەی کرد و واقی وڕما کاتێک چاوی بە جەنازەی بێسەر کەوت کە بە تەڵەی وەببوو. پاشا بەو قەناعەتە گەیشت کە خەزێنە دەستی لێنەدراوە و پێوشوێنی هاتنە ژووریش بەرچاو ناکەوێ و دیار نییە کە هیچ کەسێک هاتووچۆی ئەو هۆدەیەی کردبێ. پاشا شڵەژا و بڕیاری‌دا جەنازەی سەربڕاوی دزەکە لە دەرێ هەڵواسن و پاسەوانان سرنج بدەنە ئەو کەسانەی بۆ کوژراوەکە دەگرین یا بۆی بەپەرۆشن. وەختێک جەنازەی کوڕە هەڵواسرا، دایکی کوڕەکان تەواوێک تێکچوو و لەبەر کوڕەکەی‌تر پاڕایەوە بەر شێوەیەک، جەنازەکە دابەزێنێ و بۆ ئەو بیهێنێتەوە ماڵ. لەو نێوەدا هەڕەشەی لەو کوڕەی کرد کە بێتوو بە قسەی نەکات، یەکسەر دەچێتە لای پاشا و پێی دەڵێ کە پارەی دزراو لەلای کێیە.

کوڕە هەولی‌دا دایکی بە قەناعەت بگەیێنێ، بەڵام ئەو پتر پێداگر بوو. کوڕە بە ناچار چەند کەرێکی ئامادەکرد. کۆمەڵێک گۆزە و زەرفی پڕ لە شەڕابی لە

کەرەکان بارکرد و وەڕێکەوت. وەختێک گەیشتە ئەو شوێنەی کە پاسەوانەکان چاوەدێری جەنازەی هەڵواسراوی براکەیان بەئەستۆوە بوو، یەکدوو گۆزەی شەڕابی لارکردەوە بۆوەی بڕژێنە سەر عەرز. شەڕاب هێندێک رژا و کوڕە بە چەپۆکان وەرگەڕا سەروگوێلاکی خۆی و هاوارهاواری لێبڵیند بوو. وای نواند کە نازانێ بە کام گۆزە رابگا و نەهێڵێ شەڕابەکەی بڕژێتە سەر عەرز. پاسەوان و خەڵک وەختێک چاویان بە باری شەڕاب کەوت کە ئاوا بەخۆڕایی دەچێ، دەفر و زەرفی بەتاڵیان هێنا و پڕیانکردن. ئەوان گەلێک خۆشحاڵ و رازی لەوە کە شەڕابی مفتێیان دەستکەوتووە. کابرای خاوەن شەڕاب بە درۆ جنێوی بە عەرز و ئاسمان دەدا و نیشانیدا کە بۆ لەدەست چوونی شەڕابەکەی تەواوێک خەمبارە. پاسەوانەکان بەردەوام دڵخۆشیان دەدایەوە و کابراش مرچ و مۆن و دەست لە ئەژنۆ چاوەڕوانی فرسەت بوو. لە کۆتاییدا ئارام بۆوە و کەرەکانی راکێشا قەراخ رێگا و بەستنیەوە. لەگەڵ پاسەوانان کەوتە باس و جەفەنگ و یەک لەوانی خستە بەر گاڵتە. هەر هەموویان پێدەکەنین. کابرا گۆزەیەک شەڕابی هێنا و لەگەڵ پاسەوانان مەجلیسیان دامەزراند و دەستیان بە خواردنەوە کرد. پاسەوانەکان لەجیات پارێزگاری کردن، لەسەر عەرز دانیشتن و ملیان لە شەڕاب خواردنەوە نا. کابرا لەگەڵیان بووە دۆست و بڕێکی زۆری شەڕاب بۆ هێنان. هەر هەموویان مەست و سەرخۆش بوون و بە قورسی خەویان لێکەوت. شەو درەنگ ببوو و کوڕە بە ئەسپایی جەنازەی براکەی خۆی دابەزاند. بۆوەی نیشان بدا کە گاڵتەی بە پاسەوانەکان کردوە، لای راستی ردێنی گشتیانی تاشی. جەنازەی لە کەرێک بارکرد و چۆوە ماڵ. پاشا وەختێک لە دزینی تەرمەکە ئاگادار بۆوە، بۆوەی ئەو دزە بدۆزێتەوە، کارێکی زیرەکانەی کرد (هەرچەند من خۆم باوەڕ بەو قسەیە ناکەم) کچەکەی بەتەنیا لە ماڵێک دانا و ئیزنی پێدا خەڵک بچنە لای. کچەش قەراریدا کە هەرکەس بخوازێ تخوونی بکەوێ، بەر لە هەر شتێک پێویستە باسی زیرەکانەترین هەڵسوکەوتی ژیانی خۆی بۆ ئەو بگێڕێتەوە. پاشا ئاوای حیساب کردبوو کە بەو شێوەیە دەتوانێ دزەکە بدۆزێتەوە و پیاوەکانی بیگرن. لەو فەترەیەدا کە کچە خواستی باوکی بەجێدەگەیاند، کابرای

دز (کوڕە) بە خەبەری دیدارەکانی کچی پاشای زانی و بڕیاریدا لێرەش وڵامی زیرەکییەکانی پاشا بداتەوە. کوڕە قۆڵی مردوویەکی لەبنەوەڕا لێکردەوە و لەژێر جلوبەرگی خۆیدا شاردییەوە. چوو بۆ لای کچی پاشا، باسی ئەوەی کرد کە ناخۆشترین کردەوە لە ژیانیدا ئەو کاتە بوو کە سەری برای خۆی بڕی، ئەویش ڕاست لەو کاتەدا کە کەوتبۆ بەر تەڵەی نێو خەزێنەی پاشا. زیرەکانەترین کردەوەشی، سەرخۆش کردنی پاسەوانانی نیگابانی جەنازەی هەڵواسراوی براکەی بوو. کچە هەرکە گوێی لەو قسانە بوو، قەستی گرتنی کابرای کرد. ئەویش لە تاریکایی شەو کەڵکی وەرگرت و قۆڵی مردووی بۆ کچە ڕاداشت و خۆی بە درگادا بۆی دەرچوو. کچە قۆڵی براوی گرتبوو و پێیوابوو دەستی دزەکەیە. پاشا کاتێک بەو ڕووداوەی زانی، تەواوێک دزەی کەوتە بەر دڵ و حوکمی کرد کە لە سەراسەری وڵاتدا جاڕبدرێ، ئەگەر بێتوو دزە خۆی بەو بناسێنێ، نەک هەر سزای نادات، بەڵکوو کۆڵێک دیاری و خەڵاتی پێدەبخشێ. دزە باوەڕی بە پاشا کرد و خێرا چوو بۆ لای ڕامپسینیتۆس و کڕنۆشی بۆبرد. پاشا کچی خۆی لێ مارەکرد و باوەڕی بە دزە هێنا کە وشیارترین مرۆڤی جیهانی ئەو سەردەمەیە. هەروەها پێیگووت، میسرییەکان وریاترین مرۆڤەکانی ئەو دنیایەن، بەڵام تۆ لە گشت میسرییەکانیش وشیارتر و زیرەکتری.

**[١٢٢]** بەپێی گووتەی کاهێنان، ڕامپسینیتۆس بەزیندوویی چوو بۆ ژێرعەرد، ئەو شوێنەی یۆنانییەکان پێیانوایە خواوەند ئادیس[١] لەوێ دەژی. ڕامپسینیتۆس لەگەڵ دیمیترا کایەی تاسی(تاوڵە) کردوە. جاروبار بە دیمیترای[٢] دۆڕاندوە و هێندێک کەڕەتیش لێیبردوەتەوە. لە کۆتاییدا دەسماڵێکی لە زێڕی چندراوی لە دیمیترا بردەوە. پاشا لە شوێنی کایەکەڕا وەسەر عەرز کەوتەوە و مەندیلی زێڕی دیاری دیمیترای لە سەری هاڵاندبوو. بۆ یادکردنەوەی ڕۆژی دابەزین و گەڕانەوەی ڕامپسینیتۆس، میسرییەکان جێژنیان گرتووە. ئەمڕۆش کە من لێرەم

---

١- ئادیس، خوای جەهەنەم و دۆزەخ لە ئەفسانەکانی یۆنانیدا.

٢- دیمیترا خوای عەرز لە یۆنانی سەردەمی باستاندا. میسرییەکان ئەو ئیلاهەیە بەناوی ئۆسیریس دەناسن.

جێژنێکی لەو شێوەیەیان گرتووە، بەڵام من دڵنیا نیم ئاخۆ بەبۆنەی ئەو رووداوەیە یا شتێکیتر. کاهێنان خۆیان بەرگێک دەچنن کە تەنیا یەک رۆژی تێدەچێ. دواتر بە تیتۆڵێک پەڕۆ بەرچاوی کاهێنێک دەبەستن و ئەو دەستە بەرگە نوێ چندراوەی وێدەدەن. کۆمەڵێک کاهێنیتر کابرای چاوبەستراو بەرەو پەرستگەی دیمیترا رێنوێنی دەکەن و پاشان خۆیان دەگەڕێنەوە. دەڵێن ئەو کاهێنە بە چاوی بەستراو لە پەرستگەی دیمیترا وەژوور دەکەوێ کە بیست ستادیۆ[1] لە شار دوورە. لە تەواوی رێگادا دوو گورگ وەپێش ئەو دەکەون و دەیگەیەننە پەرستگە و دوایە دەیهێننەوە ئەو شوێنەی جەماوەر بەجێیان هێشتبوو.

**[١٢٣]** لەمەر روونکردنەوەی میسرییەکان، ئەوە مافی هەر تاکێکە کە چۆنی لێکبداتەوە و چەندەی بەلاوە پەسند بێ. سەبارەت بە بۆچوونی خۆم لەو بارەوە، دەبێ بڵێم کە لە تەواوی نووسینەکانمدا ئەو یاسایە دەپارێزم، خەڵک چیم بۆ باس بکا، من وەک خۆی و لە شوێنی جۆراوجۆردا بەیانی دەکەم. میسرییەکان دەڵێن دیمیترا و دیۆنیسۆس[2] لەژێر عەرزدا (جەهەننەم) فەرمانڕەوایی دەکەن و میسرییەکان یەکەم خەڵکانێک بوونە کە گوتوویانە رووحی مرۆڤ نەمرە. ئەوان پێیانوایە وەختێک لەش دەمرێ، رووحی ئەو ئینسانە دەچێتە قالبی کەسێکی تازە لەدایک بوو. رووح پاش ئەوەی گشت بوونەوەرە و عەرز و ئاسمان و دەریای دەربازکرد، ئەوسا دەگەڕێتەوە نێو لەشی مرۆڤ. ئەو دەور لێدانە، بە باوەڕی میسرییەکان، سێ هەزار ساڵ دەخایەنێ.

کۆمەڵێک لە یۆنانییەکان کەڵکیان لەو بۆچوونە وەرگرتووە، هێندێک بەر لەوان و چەندێکێش دوای ئەوان، خۆیان لەو باوەڕە بەخاوەن کرد. من خۆم ناوی ئەوانە گشتیان دەزانم، بەڵام پێویست بە نووسینیان ناکا.

---

١- ستادیۆ، پێوانەی مەودا و بەرابەری ١٧٧ میتر و ٦ سانتیمیتر لە یۆنانی باستاندا.

٢- دیۆنیسۆس یا ڤاکخۆس خوای شەڕاب لە یۆنانی باستان و دیمیترا خوای عەرز بووە. دیۆنیسۆسی یۆنانی لەگەڵ خواوەند ئیسیسی میسری و دیمیترا لەگەڵ ئۆسیریس یەکن.

[١٢٤] بە گووتەی کاهێنانی میسری، ئەوەندەی رامپسینیتۆس پاشایەتی کرد، دادپەروەری و ژیانی پڕ لە بەختەوەری لە سەرتاسەری میسردا حاکم بووە. دوای ئەو فیرعەونە، خێئۆپۆس[١] هاتە سەر تەخت. ناوبراو کەسێک بوو کە چارەڕەشییەکی فرەی بەدیاری هێنا. خێئۆپۆس سەرەتا تەواوی پەرستگەکانی داخست. میسرییەکان بۆیان نەبوو قوربانی بکەن و دواتر گشتیان ناچارکران بۆ ئەو فیرعەونە کار بکەن. هێندێک لەو خەڵکە دەسەریان کرا بەردی گەورە لە کانزاکانی ریزە چیای عەرەبستان دەردەهێنا و تا سەر لێواری چۆمی نیل رایاندەگواست. دواتر ئەو بەردە گەورانە لە گەمی‌یەکان بار دەکران. خەڵکانی‌تر بەردەکانیان تەحویل وەردەگرت و بەرەو ریزە چیاکانی لیبی‌یان(ئەفریقا) دەیانبردن. سەد هەزار کەس شەو و رۆژ خەریکی ئەو بێگارییە بوون. هەر کۆمەڵێک لەو جەماوەرە دەبوایە سێ مانگی رەبەق کاربکا و پاشان کۆمەڵێکی‌تر جێگای‌دەگرتنەوە. تەنیا بۆ دروست کردنی ئەو رێگایەی کە دەبوایە بەردەکانیان پێدا راگوێزن، دە ساڵی رێکی گرت. بە باوەڕی من ئەو کوێرەوەری و ماوەیە کەمتر لە زەحمەتی بنیات نانی هەرەمەکان نەبوو. مەودای رێگاکە پێنج ستادیۆ[٢] و بەرینایی دە ئۆرغیس[٣] و هەروەها بەرزایی لە بڵیندترین شوێن دەگەیشتە هەشت ئۆرغیس. گشتی لە بەردی تاشراو و رازاوە بە نەخشی ئاژەڵان بوو. دە ساڵی خایاند تا بیناکانی ژێر زەوی دروست بکرێن کە لەسەر تەپۆڵکە هەڵکەوتبوون و پیرامیدەکانیان لەسەر سازدەکرا. خێئۆپۆس ئەو شوێنەی بۆ گۆڕی خۆی دیاری‌کردبوو و کردیە دورگە و دوو کاناڵی ئاویی لە چۆمی نیلەوە بۆ راکێشا. دروست‌کردنی ئەو پیرامیدە بیست ساڵی خایاند. بناخەکەی چوارگۆشەیە و هەر لایەکی

---

١- خێئۆپۆس پاشای میسری لە زنجیرەی چوارەمی فیرعەونەکان، بەناوی خۆفۆن‌یش ناودێرکراوە. ئەو پاشایە ٢٨٠٠ ساڵ پێش لەدایکبوونی عیسا فەرمانڕەوایی کردوە و بنیاتنەری گەورەترین ئەهرامی میسر بووە.

٢- ستادیۆ، پێوانەی مەودا و بەرابەری ١٧٧ میتر و ٦ سانتی‌میتر لە یۆنانی باستاندا.

٣- پێوانەی مەودا لە یۆنان، بەرابەری میترێک و ٧٧٦ میلیمیتر بووە.

هەشت پلێترا[1] و بەرزی گشت لایەک بەقەرا یەکە و لە بەردی تەواو تاشراو دروستکراوە. ئەو بەردانە بە ڕێکوپێکی لەسەر یەک داندراون و درێژایی هیچکامیان لە سی پێ[2] کەمتر نییە.

[١٢٥] ئەو پیرامیدە بە شێوازی هێرەمی دروستکراوە. خەڵکانێک پێیدەڵێن کاریتەیی و کەسانێکیش پێیانوایە پلەکانییە. کاتێک بناغەی ئەو بینایە دەمەزرا، بۆ بەرزکردنەوە و وەسەر خستنی گابەردەکان کەڵکیان لە چەشنە مەکینەیەک وەرگرت کە بە کۆمەڵێک قوڵەکاریتەی دار قوڵە دروست کرابوو. بەو مەکینەیە بەردەکانیان لەسەر عەرز بەرز دەکردەوە، بۆوەی چینی دووهەم دامەزرێنن. مەکینەکانی سەر چینی دووهەم بەردیان بۆ چینی سێهەم دەگواستەوە. بۆ تەواوی قاتەکانی پیرامید لەو مەکینانە کەڵک وەرگیرا. گەلێک جار مەکینەکان رادەگوێزران بۆ قاتەکانی ژوورتر و زۆر بە هاسانی بەردەکانیان چینچین دەبردە سەرەوەتر. دیارە باسی دوو شێوەکاریان بۆ من کرد و منیش وەک خۆیان دەیانگێڕمەوە. سەرەتا لە نووکی پیرامیدەوە دەسپێکراوە و پاشان بەرەو خوار داگەڕاون و لە کۆتاییدا خەریکی بناغەکەی بوونە. نووسراوێک بە خەتی میسری لەسەر بەردەکانی پیرامید هەڵکەندراوە و باسی ئەوە دەکا کە چەندە پارە خەرجی کرێکاران و سیر و پیواز و توور کراوە. من زۆر باش لەبیرمە کە چاوساغەکانم بۆیان باس کردم و ئەو نووسراوەیان خوێندەوە. هەزار و شەش سەد تالاندی[3] زێو خەرج کراوە. ئەگەر ئەوە راست بێ، دەبێ بڵێم ئەوەندەش سەرفی ئەو کۆڵە ئاسنە کراوە کە دەکاریان کردوە و بەشێکیش بۆ ئازوقە و جلوبەرگی کرێکارەکانی کە لەو ماوەیەدا خەریکی کار بوونە. وەک بۆچوونی خۆم پێموایە، بۆ بڕین و تاشینی گابەردەکان و راگواستنیان و هەروەها ژێرعەردی پیرامید، ئەو هەموو وەختەی بەخۆوە گرتووە، کەم نییە.

---

١- پلێترا، پێوانەی مەودا لە یۆنان، بەرابەری ٢٩ میتر و ٦ میلیمیتر بووە.

٢- پێ، پێوانەی مەودا و بەرابەری ٢٦٩ میلیمیتر.

٣- تالاندی یۆنانی ٢٦ کیلۆگرەم، میسری ٢٧ کیلۆگرەم، بابێلی ٣٠.٣ کیلۆگرەم و رۆمی ٣٢.٣٠ کیلۆگرەم بووە.

[١٢٦] خیئۆپۆس لەبەر بێ پارەیی، تارادەیەک تووشی رەزاڵەت هات کە ناچار بوو کچەکەی بە مەبەستی لەشفرۆشی لە ماڵێکی تەنیا دابنێ و داوای کۆڵە پارەیەکی دیاریکراو بکات، هەڵبەت کاهینەکان نەیانگووت قەیاسی پارەکە چەند بووە. کچە ئەو برە پارەیەی وەردەگرت کە باوکی گوتبووی. دیارە ئەو خۆیشی گەرەکی بوو کە بینایەکی یادوەری دروست بکا. بۆ ئەو کارە، هەرکەسێک تخوونی کەوتبا، دەبوایە بەردێکیش خەڵاتی کچە بکات. کچە بەردەکانی کۆدەکردەوە و وەک دەگێڕنەوە پیرامیدی نێوەڕاستی دروستکرد. ئەو پیرامیدە لە روبەڕووی پیرامیدی گەورەدا هەڵکەوتووە. مەودای پێواژەی (ضلع) پێشەوەی ئەو پیرامیدە یەک و نیو پلێترا[١] دەبێ.

[١٢٧] میسرییەکان دەڵێن خیئۆپۆس پەنجا ساڵ حوکمڕانی کرد و کاتێک مرد، براکەی بەناوی خێفرین[٢] (حێفرین) لە جێگای دانیشت. ئەوەشیان چەشنی براکەی فەرمانڕەوایی کرد و ئەویش پیرامیدی بیناکرد. پیرامیدی ئەو هێندە گەورە نەبوو، خۆم بەراوردم کرد، نە ژێر عەردی هەبوو و نە وەک ئەوانیتر گەیشتبووە ئەو کاناڵەی لە رووباری نیلەوە دەهات. ئاوی ئەو پیرامیدە لە جۆگەیەکەوە دەهات و دەوری بیناکەی دەدا و روخساری دورگەی پێدابوو. جەنازەی خیئۆپۆس لەوێ نێژراوە. خێفرین یەکەم پیرامیدی پلیکانی لە بەردی رەنگاورەنگی ئەتیۆپیایی دروستکرد کە چل پێ بچووکتر لەوەی گەورەکە بوو. هەردوو پیرامیدەکان لەسەر هەمان تەپۆڵکە هەڵکەوتوون کە سەد پێ[٣] بەرزە. بە منیان گووت خێفرین پەنجا و شەش ساڵ فەرمانڕەوایی کرد.

[١٢٨] میسرییەکان سەرجەم سەد و شەش ساڵ تووشی نەهامەتی هاتن و درگای پەرستگەکانیان لێداخرا. رق و کینی میسرییەکان لەو دوو فیرعەونە

---

١- پلێترا، پێوانەی مەودا لە یۆنان، بەرابەری ٢٩ میتر و ٦ میلیمیتر بووە.

٢- خێفرین یا خافرا پاشای میسر لە زنجیرە پاشایەتی چوارەم، برای خیئۆپۆس و بنیاتنەری دوهەمین هێرەمی گەورە.

٣- پێ، پێوانەی مەودا و بەرابەری ٢٦٩ میلیمیتر.

بەڕادەیەکە کە ئامادە نین ناویشیان بێنن و ناوی فیلیتیۆسی[1] شوانیان لەسەر پیرامیدەکان داناوە. ئەو کابرایە لەو دەڤەرە شوان و لەبەر مەڕی بووە.

[١٢٩] دوای خێفرین، وەک بە منیان گووت، میکێرینۆس[2] پاشایەتی کردوە. ناوبراو کوڕی خێئۆپۆس[3] بوو. کارەکانی خێئۆپۆس بە دڵی کوڕەکەی واتە میکێرینۆس نەبوون. ئەو درگای مەعبەدەکانی کردەوە و خەڵکی وەزاڵە هاتووی ئازادکرد، بۆوەی قوربانی پێشکەش بە خواکانیان بکەن و مژوڵی کار بن. میکێرینۆس لە گشت پاشاکانیتر دادپەروەرتر بوو. خەڵک لەنێو پاشاکانی میسریدا پتر ڕێز لەوەیان دەگرێ. ئەو کابرایە جیا لەوەی دادپەروەری بەلاوە گرینگ بوو، ئەگەر کەسێک لە بڕیارەکانی ناڕازی بوایە، زەرەدەکەی بۆ قەرەبوو دەکردەوە و لە کیسەی خۆی دەیبەخشی، بۆوەی دڵی کابرا بەجێبێنێتەوە. ئەوە شێوەی حوکمڕانی میکێرینۆس بوو، ئەو بەڕادەیەک دادپەروەرانە فەرمانڕەوایی میسرییەکانی کرد کە کاتێک خۆی تووشی خەمی لەدەستدانی کچە تاقانەکەی هات، گەلێک خەمبار بوو، هەربۆیە داوای کرد جەنازەی کیژۆڵە خۆشەویستەکەی بە قەدر و حورمەتی پتر لە هەرکەسێکیتر بنێژرێ. میکێرینۆس تابووتێکی بە شەمایلی مانگا لەدار دروست کرد کە هەناوی بەتاڵ بوو. جەنازەی کچەکەی لەزێڕ گرت و لەنێو هەناوی مانگا دارینەکەدا ناشتی.

---

١- لە سەردەمی فەرمانڕەوایی رامسیسەکان، بەشی باکووری میسر لەلایەن هۆزەکانی باکووری و وێدەچێ بەدەست فیلیتیۆسی‌یەکان داگیرکرا. هێندێک توێژەریتر لەو باوەڕەدان کە ئەو ناوە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی پاشایەتی شاهانی هێکسۆسی یا کیکسۆسی کە بە شوان ناسراو بوون.

٢- میکێرینۆس یا مانکائورا پاشای میسر کە وێدەچێ دە وەچە بەرلە شەڕی ترۆئا ژیاوە و سێهەمین ئەهرامی دروست کردوە و دواتر گۆڕەکەی دۆزرایەوە.

٣- خێئۆپۆس پاشای میسری لە زنجیرەی چوارەمی فیرعەونەکان، بەناوی خۆفۆن‌یش ناودێرکراوە. ئەو پاشایە ٢٨٠٠ ساڵ پێش لەدایکبوونی عیسا فەرمانڕەوایی کردوە و بنیاتنەری گەورەترین ئەهرامی میسر بووە. خێئۆپۆس لە تەنیشت هێرەمی خۆی، هێرەمێکیشی بۆ خوشکەکەی بەناوی هۆنتسێن یا خۆنتسێن بیناکرد.

[١٣٠] ئەو مانگایە نەنێژراوە و من لە شاری سای[1] چاوم پێکەوت. لە قەسری پاشا و لە هۆڵێکی رازاوەدا داندراوە. کۆمەڵێک کەرستەی داری بۆنخۆش لە دەوری ئەو تابووتە دەسوتێندرێن و شەوانە قەندیلێک تا بەری بەیانی لە ژوور سەری دایسێ. لە نیزیک ئەو مانگا دارینەیە و لە هۆڵێکی‌تر چەند پەیکەرەیەک هەن و گشتیان هێمای مەعشوقەکانی میکێرینۆس نیشان‌دەدەن. ئەوجۆرەی کاهێنانی شاری سای بۆیان باس‌کردم، بیست پەیکەرەی دار هەن، قەوارەیان لە حاڵەتی سروشتی‌یان گەورەترە و هەموویان هێمای ژنی رووتن. ئەو ژنانە کێن، من نازانم و ناخوازم جیا لەوەی بیستوومە، لەخۆمەوە شتی‌تر ناڵێم.

[١٣١] لەبەر بوونی مانگا و پەیکەرەکانی‌تر، هێندێک کەس لەو باوەڕەدان میکێرینۆس عاشقی کچە تاقانەکەی بوو و بەبێ ئەوەی کچە مەیلی لێبێ، لەگەڵی خەوتووە. دوای ئەو قەومانە کچە ناهومێد بووە و خۆی هەڵواسیوە و میکێرینۆس بۆیە جەنازەکەی لەنێو هەناوی مانگا دارینەکەدا شاردۆتەوە. لەو لاشەوە دەڵێن کە دایکی کچە دەستی گشت ئەو قەرەواش و خزمەتکارانەی بڕی کە کچەیان رادەستی میکێرینۆس کردبوو. کۆمەڵێک پەیکەرە لە ژنانی دەسبڕاو دروست‌کراون. بەباوەڕی من ئەو حیکایەتە، بەتایبەت سەبارەت بە دەستی پەیکەرەکان. ئەو دەستانە وەک خۆیشم دیتم، بەتێپەڕینی رۆژگار رزیون و شکاون و لەوێ داندراون و گشتیان لەبەر لاقی پەیکەرەکان کەوتوون و پێوەندییان بە ئەفسانەکەوە نییە.

[١٣٢] پەیکەرەی مانگاکە بە تارایەکی رەنگ ئەرخەوانی داپۆشراوە، جیا لە گەردن و سەری کە بە زێڕ روکێش‌کراوە، لەنێوان شاخەکانی‌دا هێمای خۆر هەیە و ئەویش لە ئاڵتوون دروست‌کراوە. مانگاکە بەپێوە نییە و چۆکی داداوە و قەوارەیەکی بسروشتی هەیە. گشت ساڵێک لەو هۆڵە دەیهێننەدەر و خاوێنی دەکەنەوە و پێی‌رادەگەن. ئەوەش لە کاتێک‌دا کە میسرییەکان جێژن دەگرن و

---

١- سای یا سائیس، یەکێک لە شارەکانی میسری باستان و پێتەختی خانەدانی پاشایەتی سائیت و ئەمڕۆ ناسراوە بە کەنارئاوەکانی حەجەر.

بەدەست لە سینگی خۆیان دەدەن، بۆ ئەو خوایەی ناتوانم ناوی بێنم. دەڵێن کاتێک کچە لە سەرەمەرگ دابووە، داوای لە میکێرینۆسی باوکی خۆی کردوە کە ساڵێ جارێک خۆری پێنیشان بدەن.

[١٣٣] دوای مەرگی کچە تاقانەکە، بەڵایەکیتر تووشی میکێرینۆس هات. لە کۆمەڵگای ڤوتۆسرا پێشگۆییەک هات کە دەیگووت پاشا شەش ساڵیتر دەژی و ساڵی حەوتەم دەمرێ. میکێرینۆس لە قوڵایی دڵەوە بەو پێشگۆییە تێکچوو. هەربۆیە خێرا وڵامێکی پڕ لە جنێوی بۆ پیری نێوەندەکە ناردەوە و بەوە تاوانباری کرد کە لە سەردەمی باوک و مامیدا ئەوەی گشت مەعبەدەکان داخرابوون و بێحورمەتی بە خواکان دەکرا و خەڵک تووشی کوێرەوەری و مەینەت هاتبوون، بەو حاڵەش، ئەوان ئەو هەموو ساڵە ژیان، بەڵام ئەو خۆی کە حورمەتی خەڵکی لەبەر بوو، دەبێ خێرا بمرێ. لە نێوەندی ئابینییەوە وڵامیان بۆ ناردەوە کە راست لەبەر ئەو پیاوچاکییە دەبێ ئاوا زوو بمرێ، چونکە ئەوەی دەبوایە بیکا، نەیکردوە. لە لاپەڕی چارەنووسدا نووسرابوو کە خەڵکی میسر پێویستە سەد و پەنجا ساڵ ئازار بچێژێ، شتێک کە دوو کەس لە پاشاکانی بەر لەو پێیانزانی، بەڵام ئەو هەستی پێنەکرد. میکێرینۆس کاتێک گوێی لەو قسانە بوو و بە قەناعەت گەیشت کە مەحکوومە، فەرمانیدا کۆمەڵێکی زۆر قەندیل دروست بکەن. شەوانە لەبەر رووناکی ئەو قەندیلانە دادەنیشت، شەو و رۆژ شەڕابی دەخواردەوە و خۆشی رادەبوارد و چرکەیەکی بەفیڕۆ نەدەدا. بەسەر گۆلاواندا دەگەڕا و بۆ شوێنی بەسەفا دەچوو و خۆشی رادەبوارد. ئەو بە هەڵکردنی قەندیلەکان و رووناککردنی شەو چەشنی رۆژ گەرەکی بوو شەش ساڵی تەمەنی بکاتە دوازدە ساڵ و خواوەندیش وەدرۆ بخاتەوە.

[١٣٤] ئەو فیرعەونەش پیرامیدێکی لە دوای خۆی بەجێهێشت. هەڵبەت بچووکتر لە هی باوکی بوو. درێژایی هەر پێواژەیەکی ئەو چوارگۆشەیە دەگەیشتە بیست پێ[١] کەمتر لە سێ پلێترا[١]. چوارگۆشەیە و تا نێو قەدی لە

---

١- پێ، پێوانەی مەودا و بەرابەری ٢٦٩ میلیمیتر.

بەردی ئەتیۆپیایی دروست کراوە. هێندیک لە زانایانی یۆنانی لەوەدا بەهەڵە چوونە کە پێیانوایە پیرامیدی ڕۆدۆپیس هی یەکێک لە ژنانی بارەگایە. هیچکات قەرار نەبووە پیرامیدێک بەناو ئەو خاتوونە بکرێت کە دنیایەکی خەرج هەڵگرتووە. جیا لەوەش، شکۆفایی خاتوو ڕۆدۆپیس لە سەردەمی ئاماسیس‌دا[٢] دەرکەوتووە، نەک لە دەورانی میکێرینۆس، بەواتایەک ساڵانێکی زۆر دوای ئەو سەردەمەی کە فیرعەونەکان پیرامیدەکانیان بنیات‌نا. ئەو خاتوونە خەڵکی تراکی[٣] بووە و کۆیلەی یادمۆناس. یادمۆناس دانیشتووی دورگەی سامۆس[٤] و کوڕی ئیفێستیۆپۆلیۆسە و کۆمەڵێک بەڵگە لەو بارەوە لەبەر دەستدا هەن. خاتوو ڕۆدۆپیس کۆیلەی هاوتەرازی ئیسۆپۆسیش[٥] بووە. دانیشتوانی دێلفوس بە فەرمانی خواوەند، زۆر جار جاڕیان‌دابوو، پێویستە ئەو کەسە دەرکەوێ کە مافی وەرگرتنی خوێنبایی سەبارەت بە کوژرانی ئێسۆپۆس هەیە. هیچکەس دەرنەکەوت، تەنیا یەک کەس خۆی ناساند، ئەویش نەوەی یادمۆناس و وەک باپیری ناوی یادمۆناس بوو. ئەو کەسە پارەی بەرخوێنی وەرگرت و بەو شێوەیە دەرکەوت کە ئێسۆپۆس لە ڕەگەزدا دەگەڕێتەوە سەر یادمۆناس.

[١٣٥] ڕۆدۆپیس بە یارمەتی کسەنتۆسی خەڵکی دورگەی سامۆس گەیشتە وڵاتی میسر. کاتێک ڕۆدۆپیس هاتە میسر بۆوەی پیشەی خۆفرۆشی ڕەچاوبکا، بەهۆی کەسێکی خەڵکی دورگەی میتیلین، بەناوی خاراکسۆس، کوڕی سکاماندرۆنیمۆس و برای خاتوونی شاعیرساپفۆس ڕزگاری‌هات.

---

١- پلێترا، پێوانەی مەودا لە یۆنان، بەرابەری ٢٩ میتر و ٦ میلیمیتر بووە.

٢- ئاماسیس پاشای میسر لە شازدەهەمین خانەدانی فیرعەونەکانی میسر.

٣- تراکی، هەرێمی باکووری یۆنانی باستان، ئەمڕۆ بەشێکی وەبەر وڵاتی بولغارستان کەوتووە.

٤- سامۆس، دورگەی یۆنانی و مەوتەنی فیساغۆراس.

٥- نووسەری چیرۆکە ئەفسانەییەکانی یۆنانی لە سەردەمی باستاندا کە ماوەیەک وەک کۆیلە ژیا و لە دوایین ساڵەکانی تەمەنیدا ئازادکرا. پیاوێکی نیوە ئەفسانەیی و خاوەن ڕوخسارێکی ناشرین و لەشێکی ناحەز و لە سەدەی شەش و حەوتی پێش زایین ژیاوە. کۆمەڵێک چیرۆکی ئەفسانەیی لەدوای خۆی جێهێشتووە.

خاراكسۆس پارەیەکی زۆری بۆ ئازادکردنی رۆدۆپیسی کەنیز دا. خاتوو رۆدۆپیس بەو شێوەیە توانی لە میسر، بەسەربەستی بژی. لەبەر ئەوەی ژنێکی جوان و لەبەردڵان بوو، پارەیەکی زۆری دەسکەوت. هەڵبەت ئەو پارەیە تەنیا بەشی دابینکردنی ژیانی رۆدۆپیسی دەکرد، نەک بۆ بنیاتنانی پیرامیدێک. ئێستاش پیاو دەتوانێ یەک لە دەی ئەو سامانە ببینێ و دڵنیا بێ کە رێژەیەکی ئەوەندە زۆر نییە. خاتوو رۆدۆپیس گەرەکی بوو بابەتێکی یادگاری لە یۆنان جێبهێڵێ، بەرهەمێک کە تا ئەو کاتە کەس بیری لێنەکردبێتەوە و لە پەرستگە دایبنێ. دەیەویست پێشکەش بە نێوەندی ئایینی دێلفوسی بکا و ناوەکەی ماندگار بێ. بە دە لە سەدی سامانەکەی کۆمەڵێک شیشی ئاسنی کڕی (ئەوکاتە لەجیات پارەی سکە کەڵکیان لیوەردەگیرا) واتە ئەوەندە کە بە پارەکەی قەوەتی پێشکا. ناوبراو گشتیانی ناردە پەرستگەی دێلفوس. لەوێ لە پشت سەکۆی قوربانی داندران. ئەو سەکۆیە لەلایەن خەڵکی دورگەی خییۆس[1] پێشکەش بە پەرستگە کرا و لە بەردەم بیناکە داندراوە. مەعشووقەکانی شاری ناڤکراتیس لە جوانیدا ناسراو بوون. خاتوو رۆدۆپیس، ئەویش ئەوەندە جوان بوو کە ناوبانگی دەرکردبوو و تەواوی یۆنانییەکان دەیانناسی. دواتر جوانی مەعشووقەیەکیتر بەناوی ئارخیدیکی لە سەرتاسەری وڵاتی یۆناندا دەنگی دایەوە، هەرچەند بەقەدەر خاتوو رۆدۆپیس بەدناو و سووک نەبوو. کاتێک خاراکسۆس خاتوو رۆدۆپیسی لە کەنیزی رزگارکرد و گەڕایەوە دورگەی میتیلینی، خاتوونی شاعیر، سپافۆس لە سترانێکدا کۆڵێکی وەبەر تەشەراندا. باسی خاتوو رۆدۆپیس لێرەوە تەواو دەکەم.

[١٣٦] پیاوانی ئایینی پێیانگوتم کە لە جێگای میکێرینۆس، کەسێکیتر بە ناوی ئاسیخیس بوو بە پاشای میسر. ئاسیخیس هەیوانی لای رۆژهەڵاتی پەرستگەی ئیفێستیۆسی[2] دروستکرد کە گەورەتر و جوانترە. هەڵبەت

---

١- دورگەی یۆنانی، مەوتەنی ئۆمیرۆس یا هۆمێر.

٢- ئیفێستیۆس، خوای ئاگر و ئاسن لە یۆنانی باستان.

تەواوی هەیوانەکانی ئەو پەرستگەیە خاوەن نەخش و نیگارن، بەڵام ئەوەیان پتر لە گشتیان رازاوەتر و سرنجڕاکێشترە. لە سەردەمی حوکمڕانی ئاسیخیس پارە ئیجگار کەم بوو و بازرگانی لەوپەڕی شەپڕێویدا. ئەو کاتە یاسایەکی پەسند کرد کە خەڵک بۆی هەبوو جەنازەی باوکی بە گرێو و زەمانەت دابنێ و قەرز وەرگرێ. بەندێک بەو یاسایە زیادکرا کە دەڵێ: ئەو کەسەی قەرز وەردەگرێ، قەبری بابی لەگرێو ناوە و ئەگەر ئەو کەسە دەینەکەی نەداتەوە، بۆی نییە، نە لە تەنیشت گۆڕی باوکی و نە لە تەنیشت کەسێکیتر و تەنانەت هەقی نییە هیچکەس لە خزمانیشی لەو شوێنانە بنێژێ. ئاسیخیس گەرەکی بوو وەپێش گشت فیرعەونەکانیتر بکەوێتەوە کە بەر لەو فەرمانڕەواییان کردبوو. ناوبراو پیرامیدێکی لە خشت دروست کرد و بەردەنووسێکی جێهێشت کە لەسەری نووسراوە: "ناهەقی مەکە و من لەگەڵ پیرامیدەکانی بەردینە هەڵمەسەنگێنە، چونکە چەندەی خواوەند دیا لەگەڵ خواکانیتر جیاوازە، منیش ئەوەندە لە پیرامیدەکانیتر جیاوازم. کاتێک منیان دروست دەکرد، شەقڵەداریان لە قولایی قوڕی گۆل رۆدەکرد، ئەو قوڕەی بە شەقڵەکان وەدەنووسا، کۆدەکراوە و بەو قوڕە خشتەکانی من دروست کراون ". ئەوەش باسێک بوو سەبارەت بە کردەوەکانی ئەو پاشایە.

[١٣٧] دوای ئاسیخیس کەسێکی کوێر لە ناوچەی ئانیسیۆپۆس فەرمانڕەوایی دەستپێکرد. ئەوەیان پێیدەگووترا ئانیسیس. لە سەردەمی حوکمڕانی ناوبراودا، ئەتیۆپیەکان هێرشیان کردە سەر میسر. پاشای ئەتیۆپیەکان بەناوی ساڤاکۆس[١] خاوەن لەشکرێکی بەهێز بوو. فیرعەونە کوێرە هەڵات و لە ناوچەی زەلاوەکان خۆی شاردەوە و پاشای ئەتیۆپیەکان لەسەر تەختی پاشایەتی میسر پەنجا ساڵ مایەوە و بەو شێوەیە هەڵسوکەوتێ کرد: تووشی تاوانێک هاتبا، لەبەر ئەوەی ئەو پاشایە باوەڕی

---

١- ساڤاکۆس یا شاباکا ساڵی ٨١٥ی پێش زایین هێرشی کردوەتە میسر و ٢٥مین خانەدانی فیرعەونەکانی میسری دامەزراند. ئەو پاشایە دواتر بەدەست سارگۆنی مەزنی ئاشووری شکستی خوارد و کۆتایی بە فەرمانڕەواییەکەی هات.

به کوشتنی مرۆڤ نەبوو، بەپێی قورسی و گرانی تاوانەکە، سزای بۆ تاوانبار دیاری دەکرد و پتر بێگاری پێدەکرد. تاوانبار دەبوایە گڵ بگوێزێتەوە نێو ئەو شارەی لێی لەدایک ببوو. بەو چەشنە شارەکان بڵیندی زۆرتریان بەخۆوە بینی. وەختێک جۆگە و کاناڵەکان لە سەردەمی پاشایەتی سێسۆستریس هەڵکەندران، هێندێک بوو بەهۆی بەرزتر بوونی رووپەلی خاک. دواتر ئەو شارانە بە گڵی تاوانباران بەرزتر بوونەوە، کاتێک پاشای ئەتیۆپیایی حوکمڕانی دەستپێکرد. زۆرێک لە شارەکانی میسر کەوتنە سەر بەرزایی. بە باوەڕی من بڵیندتر لە گشتیان شاری ڤوڤاستی[1] بوو. ئەو شارە خاوەن پەرستگەی ڤوڤاستیۆس[2]، شوێنێکی بە وەج و جێگایەکی سرنجڕاکێشە و پێویستە باسی بکرێ. دیارە کۆمەڵێک پەرستگەی‌تریش هەن کە خەرجی پتریان تێچووە، بەڵام ئەوەیان پتر بۆ دیتن دەبێ. یۆنانییەکان بە پەرستگەی ڤوڤاستی دەڵێن ئارتیمیس.

[١٣٨] جیا لە درگای سەرەکی، باقی شوێنەکانی‌تری مەعبەدی ڤوڤاستی بە ئاو گەمارۆ دراوە و ئەو پەرستگە شێوەی دورگە دەدا. دوو چۆم لە رووباری نیل جیاکراونەوە و هەرکامەیان لەلایەکەوە دەوری پەرستگەی تەنیوە و بەرینایيان دەگاتە سەد پێ[3] و کەوتوونە ژێر سایەی دار و دەوەن. چۆمەکان لەبەر درگای مەعبەد تێکەڵ بە هەڤدوو دەبنەوە. بەرزی هەیوانەکان دەگاتە شەش ئۆرغیس[4] و لە بڵیندایی شەش پیخیس[5]ڕا بۆسەرێ، نەخش و نیگاریان لەسەر هەڵکەندراوە و خاوەن تابلۆی پەیکەرەیی جوانن. ئەو پەرستگەیە لە نێوەڕاستی شار جێی‌گرتووە، دەوری  بە گڵ بەرزتر کراوە، بەڵام عەرزەکەی دەستی لێنەدراوە و نەویترە و وەک سەردەمی بنیاتنانی

---

١- شاری ڤوڤاستی یەکێک لە باژێرە مەزنەکانی میسر لە سەردەمی کۆندا. ئەو شارە بەبۆنەی بەڕێوەچوونی جێژنەکانی گەورەی ئایینی ناسراو بووە.

٢- ڤوڤاستی، ئیلاهەی میسرێ باستان لەگەڵ ئارتیمیسی یۆنانی و دیانای رۆمی یەک بوونە.

٣- پێ، پێوانەی مەودا و بەرابەری ٢٦٩ میلیمیتر.

٤- ئۆرغیس، ١ میتر و ٧٧٦ میلیمیتر.

٥- پیخیس یا ئانیشک، ٤٤.٤ سانتی‌میتر یا ٤٤٤ میلیمیتر.

ماوەتەوە. پیاو دەتوانێ لە بەرزاییەکانەوە بەجوانی ببینێ. دیوارێکی نەوی دەوری داوە و بە ژمارەیەکی فرە نەخشی هەڵکەنراو رازاوەتەوە. لەنێو حەساردا کۆمەڵێک داری بەرز و گەورە هەن و پەرستگەکەیان لە باوەش گرتووە، بەتایبەت لەو جێگایەی پەیکەرەی خواوەندی لێ داندراوە. درێژایی و بەرینایی دەوری ئەو نێوەندە ئایینییە دەگاتە یەک ستادیۆ[1]. رێبوار بە رێگایەکی بەردرێژدا دەچێتە ژوورەوە. مەودای رێگا سێ ستادیۆ و بەرینایی چوار پلێترا[2] و بە نێوەراستی بازاری شاردا دەرباز دەبێ و بەرەو رۆژهەڵات دەچێ. لە هەردوو لای ئەو رێگایەدا داری سەوزی بەرز هەن و لە پەرستگەی ئارتێمیدۆسەوە بەرەو مەعبەدی ئێرمیس[3] دەچێ.

[۱۳۹] بە گووتەی کاهێنان، کۆتایی فەرمانڕەوایی پاشای ئەتیۆپیایی دەگەڕێتەوە سەر خەونێک کە بینیویەتی و دوای ئەو خەونە رایکردوە. ناوبراو خەونی بینی کە یەکێک لە تەنیشتی راوەستاوە و داوای لێدەکا کە گشت کاهێنانی پەرستگەکانی وڵاتی میسر کۆکاتەوە و بە زەبری شمشێر لە نێوقەدەوە دوو لەتیان بکات. وەختێک ئەو خەونە ترسناکەی بینی، بەو قەناعەتە گەیشت کە کابرای تەنیشتی لەلایەن خواکانەوە بە ئەنقەست راسپێردراوە، بۆوەی کارێکی ریسوا و ناپەسەندی پێبکەن و حورمەتی بشکێنن. ئەویش بەهۆی ئەنجام دانی کردەوەیەکی ئاوا ناشایست، جا چ بەرامبەر بە خەڵک یا دەرهەق بە کەسایەتییەکانی ئایینی. پاشا گەرەکی نەبوو خەونەکە وەڕاست بگێڕێ. لەلایەکیتریشەوە ماوەی حوکمڕانییەکەی لە وڵاتی میسر بەرەو کۆتایی دەڕۆیی و لەو بارەوە پێشتر پێشگۆیی پێگەیشتبوو، هەربۆیە خێرا بۆی دەرچوو و هەڵات. ئەو سەردەمەی لە وڵاتی ئەتیۆپیا دەژیا، بەپێی پێشگۆیی تاڵەبینەکانی ئەتیۆپیایی، دەبوایە تەنیا پەنجا ساڵ فەرمانڕەوایی میسر بکات. لەبەر ئەوەی پەنجا ساڵی حوکمڕانی تەواو ببوو،

---

١- ستادیۆ، پێوانەی مەودا و بەرابەری ١٧٧ میتر و ٦ سانتیمیتر لە یۆنانی باستاندا.

٢- پلێترا، پێوانەی مەودا لە یۆنان، بەرابەری ٢٩ میتر و ٦ میلیمیتر بووە.

٣- ئێرمیس، ناوی یۆنانی بۆ خوای میسری کە پێیدەگووترێ تووت.

خەونەکە هێندەی دیکە تۆقاندبووی. بەهەر حاڵ ساڤاکۆس بەو شێوەیە دەستی لە دەسەڵاتدارییەتی وڵاتی میسر هەڵگرت.

[١٤٠] وەختێک ئەو پاشا ئەتیۆپیاییە وڵاتی میسری جێهێشت و رایکرد، فیرعەونە کوێرە دووبارە هاتەوە سەر تەخت. هەڵبەت بە یارمەتی دانیشتووانی هەرێمی زەلاوەکان. ئەو شوێنە، دورگەیەک بوو و فیرعەونە کوێرە پەنجا ساڵ تێیدا ژیا. دورگەکە بە خاک و خۆڵەمێش دروست کرابوو. ناوبراو ئەو ماوەیەی لەوێ ژیا، رێنمایی میسرییەکانی کردبوو کە چۆن خواردەمەنی و بژیو بە نهێنی لە وڵاتی ئەتیۆپیاوە بۆ ئەو بێنن. ئەو داوای کردبوو کە گشت جارێ لەگەڵ ئەرزاق و بژیو، کۆڵێکیش خۆڵەمێش بێنن. کەس نەیتوانی ئەو دورگەیە لەو سەردەمی‌دا بیدۆزێتەوە. تەنیا یەک کەس توانی ئەو کارە بکات کە ناوی ئەمیرتێئۆس[1] بوو. بۆ ماوەی حەوت سەد ساڵ، گشت پاشاکانی بەر لە ئەمیرتێئۆس حوکمڕانیان کردبوو، نەیانزانیبوو ئەو شوێنە لە کوێ هەڵکەوتووە. دوورگەکە پێیدەگووترێ ئێلڤوو و مەودای هەرلایەکی دەگاتە دە ستادیۆ.

[١٤١] دوای ئەمیرتێئۆس کاهێنێکی سەر بە پەرستگەی ئیفێستیۆس دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت. ئەوەیان ناوی سێتۆس بوو. ئەو حوکمڕانە بە چاوی سووک دەیڕوانییە لەشکری میسری و بەردەوام سەرکۆنەی دەکردن، زۆری لێدەگووت و پێیوانەبوو کە رۆژێک لە رۆژان پێویستی بەو لەشکرە دەبێ. بە شێوازی جۆراوجۆر هەر هەموویانی لەسەر کار لابرد و بەتایبەتی ئەو مڵک وماڵەی پاشاکانی پێشوو بە نیزامییەکانیان بەخشیبوو یا بە رێگای نایاسایی وەدەستیان خستبوو، گشتی لێ ئەستاندنەوە. هەرکام لەوانە خاوەن دوازدە سترێما[2] زەوی بوون. پاش ماوەیەک، ساناخاریڤۆس[3] بە لەشکرێکی

---

١- ئەمیرتێئۆس، هەمان ئەو کەسەیە کە لەگەڵ ئینارۆس بوونە هاوپەیمان و ساڵی ٤٦٠ی پێش میلاد دژی پارسەکان راپەڕین و تا ساڵی ٤٤٩ی پێش زایین درێژەیان بەو بەرگرییەدا.

٢- سترێما، پێوانە بۆ پانتایی زەوی لە یۆنان و بەرابەری ١٠٠٠ میتری چوارگۆشە.

٣- ساناخاریڤۆس یا سەناخریب، پاشای ئاشووری لەنێوان ساڵەکانی ٧٠٥ تا ٦٨١ی پێش میلاد. ناوبراو کوڕ و جێنشینی سارگۆنی دووهەم بووە و لەشکری کێشایە سەر کلدانی‌یەکان و وڵاتانی

زۆری عەرەب و ئاسووری پەلاماری میسری‌دا. لەشکری میسری، هیچکەسیان ئامادەی بەرگری نەبوو. کاهێنی ئایینی کەوتە تەنگانە و نەیدەزانی چیبکات. چووە ژووری مەعبەد و لەبەر پەیکەرەی خواوەند چۆکی دادا و دەستی بە پاڕانەوە کرد و باسی بارودۆخە دژوارەکەی کرد. ناوبراو بەدەم هاوارکردنەوە، دەگریا و دەیقیژاند. پاش ماوەیەک خەوی لێکەوت و خەونی بینی. لە خەودا دیتی کە خواوەند لە تەنیشتی راوەستاوە و ورەی پێدەبەخشێ، پێیدەڵێ کە هیچی بەسەر نایە، بەو مەرجەی لەهەمبەر عەرەبەکاندا خۆڕاگری لە خۆی نیشان بدا. خواوەند هەروەها بەڵێنی پێدا کە هێزی یارمەتیدەری بۆ بنێرێ. کابرای کاهێن واتە سێتۆس بەو قسانەی خواوەند لە خەو راچەنی و هێور بۆوە. لە پەرستگە وەدەرکەوت و گشت ئەو خەڵکە میسرییەی بەڵێنیان پێدابوو شەڕی بۆ بکەن کۆکردەوە و لەگەڵ خۆی بردنی بۆ ناوچەی پیلۆسیۆ[1] و لەوێ ئۆردوی لێدا (لەو شوێنەڕا پیاو دەتوانێ بچێتە نێو خاکی میسر). شەڕکەرانی میسری هیچیان لەگەڵی نەچوون، تەنیا بازرگان و سنعاتکار و خەڵکی بازاڕی رەگەڵی کەوتن. پاشا و لەشکرە کەمەکەی لە ئۆردوگا دامەزران. شەو بە هەزاران مشک رژانە نێو ئۆردوگای دوژمن و دەستیان بە خواردنی کالانی تیری (تیردان) سەربازەکان کرد. مشکەکان هەروەها زێی کەوانەکانیان خوارد و چەرمی دەستگرەی مەتاڵەکانیان قرتاند. رۆژی دوایی، دوژمن ناچار بوو لەبەر بێ چەکی رێگای راکردن بگرێتەبەر و ژمارەیەکی زۆریشیان لێکوژرا. پەیکەرەی بەردینەی ئەو پاشا کاهێنە پاشایە لەنێو پەرستگەی ئێفێستۆس تا ئەمڕۆکەش پارێزراوە. لە دەستێکی‌دا مشکێکی دەشتایی راگرتووە. نووسراوێک لەسەر

---

وەک فەلەستین، ئەرمەنستان، میدیا، عەرەبستان و میسر. لەکۆتاییدا بەدەست کوڕی خۆی کوژرا. یەک لە پاشاکانی زاڵم و سەرەڕۆی ئاشووری بووە.

١- پیلۆسیۆ، شارێکی باستانی میسر لە نیزیک پۆرتسەعیدی ئەمڕۆ، خاوەن دیوار و قەڵا و بورجی مەحکەم کە لەلایەن فیرعەونەکانی میسرییەوە دروست کرابوو، بۆوەی پێش بە پەلاماری هۆزەکانی ئاسیایی بگرن و وەک پادگان و دەروازەی میسر لەبەرچاو گیرابوو.

پەیکەرەکە هەڵکەندراوە کە دەڵێ: "سەیری من بکە و فێری دینداری و پیاوخاسی ببە ".

[١٤٢] تا ئێرە میسرییەکان و کاهێنانی مەعبەدەکان باسی مێژووی وڵاتی خۆیان لە یەکەم فیرعەونەوە تا کەسایەتی ئایینی مەعبەدی ئیفێستیۆس بۆ من کرد کە دوایین فەرمانڕەوا بوو. ئەوان گووتیان سێسەد و چل و یەک وەچە دەرباز بوونە[١] و لە سەردەمی هەرکامیاندا یەک پاشا و یەک کاهێنی مەزن دەسەڵاتدار بووە. سێسەد وەچەی مرۆڤ دەبێتە دە هەزار ساڵ، چونکە هەر سێ وەچە دەبێتە سەد ساڵ. ئەو چل و یەک وەچەی دوایی کە پێویستە بەو سێسەدەوە زیادبکرێ، سەرجەم دەبێتە هەزار و سێسەد و چل ساڵ. لەو یازدە هەزار و سێسەد و چل ساڵە، هیچکام لە خواکان روخساری مرۆڤیان بەخۆوە نەگرتووە، نە لە ساڵانی زوودا و نە لە سەردەمی نوێیدا کە پاشاکانی میسری فەرمانڕەواییان کردبێ. بەڵام گووتیان کە لەو ماوە دوور و درێژەدا خۆر چوار جار رەوتی سوڕانی خۆی گۆڕیوە. دوو جار لە رۆژئاوا دەرکەوتووە و دوو جاریش لە رۆژهەڵات ئاوابووە. ئەو رووداوە هیچ ئاڵوگۆڕێکی لە وڵاتی میسردا بەدینەهێناوە، تەنانەت کاریگەری لەسەر کشتوکاڵ، زیندەوەری نێو روبارەکان، نەخۆشییەکان یا مردن و ژینیشدا نەبووە.

[١٤٣] لە شاری تیڤا[٢]، وەختێک مێژوونووسێک بەناوی ئێکاتیئۆس[٣] گەرەکی بووە ژیاننامەی خۆی بنووسێ، لە بنەچەکەی خۆی کۆڵیوەتەوە و

---

١- یەکەم پاشای میسری مین بووە و پاش ئەو فیرحەونە ٣٣٠ پاشایتر هاتوون و دوایین پاشا میریس یا موریس بوو، ئەوجار ١٠ پاشایتر بە گووتەی هێرۆدۆت دەسەڵاتیان بەدەستەوە گرتووە و ناوی گشتیان دێنی بە ئانیسیسی ئەتیۆپییەوە دەبنە ٣٤١ کەس.

٢- تیڤا، شارێکی میسری باستان، بەهۆی کادمۆس بنیاتنرا، گەورەترین شاری ئەو سەردەمە و بە سەد دەروازە ناوی دەرکردبوو. ئەمرۆ گوندەکانی کارناک و لۆکسور لەسەر وێرانەکانی ئەو شارە دروست کراون.

٣- ئێکاتیئۆس، مێژووناس و جۆغرافیزانی ناسراوی یۆنانی لە سەردەمی باستاندا و خەڵکی میلیتۆس بووە و لە سەدەی شەشی پێش میلا، واتە سەدەیەک بەر لە هێرۆدۆت ژیاوە.

بەو قەناعەتە گەیشتووە کە شازدەهەمین ئەژدادی ئەو خوا بووە. کاهێنانی مەعبەدی دیا[1] چۆن لەگەڵ من جولانەوە، بەو چەشنەش هەڵسوکەوتیان لەگەڵ ناوبراو کردوە، هەچەند من نەچوبووم لە تۆرەمەی خۆم بکۆڵمەوە. منیان بردە نێو پەرستگە کە تەواوێک گەورە بوو و ژوورەوەیان پیَنیشاندام. پانتایی ژوورەکەم پێوا. کۆمەڵێک پەیکەری دارینەی ئیجگار گەورەی لێبوو. پێشتر باسی قەوارەی ئەو پەیکەرانەم کردوە. لەویَ هەر کاهێنێکی مەزن، تەنانەت ئەگەر لە ژیانیشدا بیَ، پەیکەرەی روخسار و هێمای خۆی دادەنیَ. ئەوان بۆیان روون کردمەوە کە هەرکام لەو کاهێنانە کوڕی ئەوەی بەر لە خۆی بووە.کاهێنەکان لە دوایین کەسەوە دەستیانپێکرد کە لەمێژ نەبوو مردبوو و گشت ئەوانیتریان نیشانی مندا. کاتێک ئێکاتیئۆس خەریکی دۆزینەوەی تایفە و ئەژدادی خۆی بووە و گەیشتۆتە سەر شازدەهەمین خواوەند، کاهێنان پێیانگوتووە کە باوەڕیان بە توێژینەوەی ناوبراو نییە، چونکە مرۆڤ ناتوانیَ لەدایکبووی خواوەند بیَ. کاهێنان حیساباتی خۆیان کرد و گووتیان هەرکام لەو پەیکەرە زەبەلاحانە نیشانەی یەک پیاوی گەورە و خاس دەردەخا کە لە یەکیتر وەپاش کەوتوون و بۆ ئێکاتیئۆسیان روونکردەوە کە پاشەبەرەی سێسەد و چل و پێنج پەیکەرەی قەبەی ئەو پیاوانەیە کە بەدوای یەکتردا لەدایک بوونە و هیچکامیشیان نەچوونەتەوە سەر خوا یا قارەمانێک. ئەو پیاوانە پێیان گووتراوە پیرومیس، لە زمانی یۆنانیدا مانای پیاو چاک یا مرۆڤی پاک دەدا.

[١٤٤] هەروەک گووتم کاهێنەکان ئەو کۆمەڵە پەیکەرە فیلەتەنانەیان بە ئێکاتیئۆس نیشاندا کە هیچکامیان پێوەندییەکیان بە خواکانەوە نەبوو. دیارە بەر لە مرۆڤەکان، خواکان فەرمانڕەوایی وڵاتی میسریان کردوە. ئەو خوایانە لەنێو خەڵکدا ژیاون، بەو جیاوازییەی لە حەشیمەتی ئاسایی بەهێزتر بوونە.

---

١- دیا یا ژوپیتێر، باوکی خواکان.

دوایین کەس کە بوو بە فەرمانڕەوا، ناوی ئۆرۆس[1] و کوڕی ئۆسیریۆس[2] بووە، یۆنانییەکان بەناوی ئاپۆلۆنۆس[3] دەیناسن. ئۆرۆس ئەو کەسەیە کە بەسەر تیفۆناس‌دا[4] سەرکەوت و دوایین خواوەند بوو کە هاتە سەر تەختی دەسەڵاتداری لە وڵاتی میسر. ئۆرۆس لە باوەڕی یۆنانییەکاندا، هەمان دیۆنیسۆسە.

**[١٤٥]** لە وڵاتی یۆنان، لەنێو خواکانی نوێدا، ئیراکلیس[5]، دیۆنیسۆس[6] و پانۆس[7] بەرچاون. لە میسر، خواوەند پانۆس کۆنتر لە هەشت خوای سەرەتاییە. ئیراکلیس، لەنێو کۆمەڵی دووهەمی دوازدە خواکاندا یەکەم خوا نییە. دیۆنیسۆس، ئەویش لە سێهەم دەستەی دوازدە خواکان کە لەدایکبووی کۆمەڵی دووهەم بن، وەک یەکەم خوا ناوی نابردرێ. من پێشتر بە پشت بەستن بە زانیاریی میسرییەکان، باسی ئەوەم کرد کە لە کاتی دەرکەوتنی ئیراکلیسەوە تا پاشایەتی ئاماسیس چەند ساڵ تێپەڕیوە. لە خواوەند پانۆس‌ڕا تا ئەو پاشایە پتری خایاندوە، بەڵام بۆ دیۆنیسۆس ماوەکە کەمتر بووە. هەڵبەت ئەوەش بڵێم کە بەراوردی پازدە هەزار ساڵ لە دیۆنیسۆسەوە تا پاشایەتی ئاماسیس کراوە. میسرییەکان لەو باوەڕەدان کە زانیاری ورد و گردیان لەبەردەست دایە، چونکە ئەگەر ئاوا نەبوایە، هیچکات نەیاندەتوانی بەو گشت وردەکارییەوە، حیساباتی ماوەکە بکەن. ئێستا لە ڕۆژی لەدایکبوونی دیۆنیسۆس‌ڕا کە کوڕی خاتوو

---

١- ئۆرۆس، کوڕی ئیلاهە ئۆسیریۆس، خوای میسری باستان.

٢- ئۆسیریۆس، ئیلاهەی میسری و ژنی ئیسیس و پارێزەری مردوەکان.

٣- ئاپۆلۆنۆس، خوای روناکی و هۆنەرە جوانەکان لە یۆنانی باستان. ناوی‌تری ئەو خوایە فیبوسە و کوڕی خواوەند دیا و برای دیانا بووە.

٤- تیفۆناس، خوای تاریکی و ناشرینییەکان.

٥- ئیراکلیس یا هێرکۆلیس، نیوە خوای یۆنانی باستان و پاڵەوانی ئەفسانەیی و کوڕی خواوەند ژوپیتێر و وێنای هێز و قودرەت.

٦- دیۆنیسۆس یا ڤاکخۆس، خوای شەراب و عەشق لە یۆنانی باستاندا.

٧- پان، پانا یا پانۆس کوڕی ئێرمیس و پینێلۆپی. خوای مێگەل و گاران و پەیکەرەکەی مرۆڤێکە بە قاچی سمدار و لەسەریشی دوو شاخ رواون، واتە سەری و سمی گیسک. بەندی ٤٦ی ئەو کتێبە. هێندێک بۆچوونیش دەڵێن کوڕی ئێرمیس و پەرییەک بەناوی دریۆپی بووە.

سێمێلیسی کچی کادمۆس بووە، هەزار و شەش سەد ساڵ دەرباز بووە. لەو کاتەوە کە ئیراکلیسی کوڕی ئالکمێنیس[1] لەدایک بووە، تا ئێستا نۆسەد ساڵ تێپەڕیوە و لە ڕۆژی هاتنە سەر دنیای پانۆس‌ڕا کە ئەویش کوڕی پینێلۆپی[2] بووە (یۆنانییەکان دەڵێن پانۆس لەو خاتوونە و لە ئێرمیس وەپاش کەوتووە)، هەشت سەد ساڵ گوزەراوە. بەواتایەک مەودایەکی کەمتر لەو وەختە کە شەڕەکانی تروایی قەومان.

[١٤٦] پیاو بۆی هەیە لەنێوان ئەو نەریت و باوەڕانەدا، ئەوەی بەلایەوە دروستە پەسندی بکا. سەبارەت بە بۆچوونی خۆم پێشتر قسەم لێوەکردوە. ئەگەر ئەو خوایانە، واتە ئیراکلیس کوڕی ئامفیتریۆنا[3]، دیۆنیسۆس کوڕی سێمێلیس[4] و و پانۆس کوڕی پینێلۆپیس، لە یۆنان وەدیارکەوتوون و لەوێ ژیاون و پیر بوونە، دەکرێ پیاو بڵێ گشتیان ئینسان بوونە و ناوی خواکانیان لەسەر بووە و لەسەردەمی کۆندا ژیاون. هەڵبەت یۆنانییەکانی ئێستا دەڵێن کە وەختێک دیۆنیسۆس لە دایکبووە، خواوەند دیا ئەوی لە ڕانی خۆی دووریوە و بردوویەتە شاری نیسا، شوێنێکی دوور لە وڵاتی میسر و لە ئەتیۆپیا هەڵکەوتووە. سەبارەت بە پانۆس، ئەویش دوای لەدایکبوونی بۆکوێ چووە، هیچ زانیارییەک لەگۆڕێدا نییە. بۆ من ئاشکرایە کە یۆنانییەکان ئەو کۆمەڵە خوایەیان بەهۆی ناوی‌ترەوە ناسیوە و فێری ناوەکانیان بوونە. یۆنانییەکان لەڕاستیدا مێژووی ڕەچەڵەکناسی ئەو خوایانەیان لەو سەردەمییەوە تا ئێستا بەتەواوی زانیوە.

---

١- ئالکمێنیس ژنی ئامفیتریۆنا یا ئامفیتریۆن فریوی خواوەند ژۆپیتێری خوارد و لێی بوو بە خاوەن ئیراکلیس. یۆنانییەکان ئیراکلیس هەم بە منداڵی ئامفیتریۆن و هەم بە منداڵی ژۆپیتێر دەزانن.

٢- پینێلۆپی ژنی ئولیس و دایکی تیلیماخۆس یا تێلێماک، وەک هێرۆدۆت باسی دەکا ئەو ژنە دایکی پانۆس خوای مێگەل و کاڕانیش بووە.

٣- ئامفیتریۆنا، مێردی ئالکمێنیس بووە و وێدەچێ باوکی ئیراکلیس بووبێ.

٤- سێمێلیس دایکی دیۆنیسۆس و کچی کادمۆسی پاشای شاری تیڤا.

[١٤٧] ئەو بابەتانەی تا ئێستا باسم کردن، گشتیان زانیاری میسرییەکان بوون. لەوە بەدواوە، پتر لەمەر ئەو ڕووداوانە دەدوێم کە میسرییەکان و گەلانیتر پەسندیان کردوە و لەو وڵاتە قەوماون. من خۆم چەند بابەتێکیتریش دەخەمە سەریان کە بە چاوی خۆم بینیومن.

میسرییەکان بەدەست فەرمانڕەوایی کاهێنی پەرستگەی ئێفێستیۆس ڕزگاریان هات. لەبەر ئەوەی نەیاندەتوانی بەبێ پاشا وڵات ئیدارە بکەن، ناچاربوون دوازدە پاشایتریان هەڵبژارد و وڵاتیان بەسەر دوازدە پارێزگادا دابەشکرد. پاشاکان لەنێوان خۆیاندا ژن خواستنیان کردە نەریت و بە ڕەچاوکردنی چەند یاسایەک درێژەیان بە حوکمڕانیدا. بەڵێنیان بە یەکتردا کە دۆستایەتی نێوانیان بپارێزن، هەوڵ نەدەن یەکیان ئەوەیتر لەسەر حوکم لابەرێ، کەس بۆی نەبوو دەسەڵاتی خۆی بە کزکردنی ئەوەیتر زێدەبکا. ئەو قانوونانە بەڕێوە چوون و ڕێزیان لێگیرا، تا ئەو کاتەی لە سەرەتای حوکمڕانی کردندا، ئامۆژگارییەک هات کە دەیگووت ئەگەر یەکێک لە پاشاکان مەی بە جامی مسی لە حەساریپەرستگەی ئێفێستیۆس بخواتەوە، دەبێتە پاشای مەزن و فەرمانڕەوایی سەراسەری وڵاتی میسر دەکا. ئەوانە بەپێی عادەت لە نێوەندەکانی ئایینی کۆدەبوونەوە، بەڵام ئەوجار لەبەر ئەو پێشگۆییە، گشتیان بەمەبەستی دیاریکردنی فەرمانڕەوا و پاشای سەراسەریی وڵاتی میسر کۆبوونەوە.

[١٤٨] گشتیان بڕیاریاندا بینایەکی یادوەری هاوبەش دروست بکەن و بۆ ئەو کارەش لەسەر بنیاتنانی لاڤیرینت ساغ بوونەوە. ئەو لاڤیرینتە لە باشوور و نیزیکی گۆلی مێریس و لە قەراخ شاری تیمساحەکان[١] جێیگرتووە. من خۆم چاوم بەو لاڤیرینتە کەوت. گەلێک زەحمەتە بە قسە باسی ئەو شوێنە بکرێ. ئەگەر کاری دروستکردنی تەواوی دیوار و

---

١- ئەو شارە لە باشووری بازێڕی ناسراوی تیڤا هەڵکەوتبوو و ستراڤۆن باسی لێوە کردوە.

بیناکانی هەموو یۆنان بەسەر یەکەوە حیساب بکەین، هێشتا کەمتر لەو هەموو زەحمەتەیە کە بۆ بنیاتنانی ئەو لاڤیرینتە کێشراوە. هەرچەند پەرستگەکانی ئێفێسۆس[1] و سامۆس بەوەجن، پیرامیدەکانیش بە گووتە ناکرێ باسیان بکەین و هەرکامیان بەتەنیا هاوسەنگی لەگەڵ بەرهەمەکانی یۆنانی دەکەن، بەڵام بەو حاڵەش، لاڤیرینت لە گشتیان سەرترە. بینای لاڤیرینت خاوەن دوازدە حەساری داپۆشراوە و گشتیان لە رووبەڕووی هەڤدوو هەڵکەوتوون. شەش حەسار روو لە باکوور و شەشی‌تریش روو لە باشوور و گشتیان بەدوای یەکتری‌دا هەڵکەوتوون و لە دەرەوەش دیوارێک دەوری داون. سەرجەم بینایەکی دوو نهۆمییە، یەکیان ژێرعەردە و ئەوەی‌تریش لەسەر عەرزە. خاوەن سێ هەزار تالار و هۆدەیە، هەزار و پێنسەدی لە خوارێ و هەزار و پێنسەدیش لەسەرێ چێکراون. من خۆم چاوم بەو هۆدانە کەوت و باسێکیان لەبارەوە دەکەم. سەبارەت بە هۆدەکانی ژێر عەرد، تەنیا ئەوە دەگێڕمەوە کە لە زمانی میسرییەکانم بیستووە. پاسەوانانی میسری پارێزگاریان لەو شوێنە دەکرد و بەهیچ جۆرێک ئامادە نەبوون قاتی خوارەوە بە من نیشان بدەن. پێیان‌گووتم کە جەنازەی پاشاکانی میسری لەوێ نێژراون و بۆیەش بە شێوەی لاڤیرینت دروستکراوە. دیارە کەلاکی تیمساحە موقەدەسەکانیش لەوێ دەنێژران.

هەروەک گووتم لەمەر هۆدەکانی خوارەوە تەنیا ئەوەندە دەڵێم کە بۆیان گێڕامەوە. سەبارەت بە هۆدەکانی سەروو کە خۆم چاوم پێیان کەوت، دەبێ بڵێم زەحمەتە پیاو باوەڕ بکات، ئەو بەرهەمە بەدەستی ئینسان خوڵقابێ. داڵانی نێوان تالارەکان، گوزەری بەینی حەسارەکان، هەرهەموویان بەچەشنێک تێکەڵوپێکەڵ و سەیر بوون کە بەردەوام تووشی سەرسوڕمان دەهاتم. هەرکات لە حەسارەوە دەچوومە هۆدەیەک و لەوێڕا بۆ ژوورێکی‌تر، ئەویش بە تێپەڕینی پاساژ بۆ پاساژ و ئەوجار لە وەتاغەکان‌ڕا بۆ

---

[1]- ئێفێسۆس، یەکێک لە شارەکانی یۆنانی باستان و هەڵکەوتوو لە کەنارئاوەکانی ئاسیای بچووک و نێوەندی گرینگی تەشەنەی شارستانییەتی یۆنانی بۆنێو ئاسیا.

حەساری‌تر، بەلامەوە گەلێک سرنجڕاکێش بوو. بانی گشت هۆدەکان، چەشنی دیوارەکان لە بەرد دروست کراون و کۆڵێک نەخش و نیگاریان لەسەر هەڵکەندراوە و تەواوێک رازاونەتەوە. کۆمەڵێک کۆڵەکەی بەردی سپی لەدەوری حەسارەکان بوون و بە وردەکارییەوە و زۆر رێکوپێک داندراون. لەو شوێنەی کە لاڤیرینتۆس تەواو دەبێ، واتە لە گۆشەیەک، پیرامیدێک بە بەژنی چل ئۆرغیس[1] بەرزایی هەڵکەوتووە و لەسەر بەردەکان وێنەی ئاژەڵی گەورە بەرچاو دەکەوێ. رێگای چوونە هۆدەکانی ژێر عەرز، لێرەوەیە.

[١٤٩] ئەگەر لاڤیرینت ئەوەندە شاکارە، لەو سەیرتر گۆلی میریسیە.[2] لە نیزیک ئەو گۆلە بینای لاڤیرینتۆس دروست کراوە. مەودای دەوری گۆل دەگاتە سێ هەزار و شەش سەد ستادیۆ[3] کە ئەویش دەبێتە شێست سخینۆس[4] و بەرابەری مەودای قەراخ بەحرەکانی وڵاتی میسرە. گۆلەکە درێژ و باریکە و لە باکوورەوە بەرەو باشوور دەڕوا. قوڵترین شوێنی دەگاتە پەنجا ئۆرغیس. گۆلێکی دەستکردە و مرۆڤ هەڵیکەندوە و ئەو دیاردەیەشی پێوە دیار و ئاشکرایە، چونکە لە نێوەندەکەی دوو پیرامید قووت بوونەتەوە و هەرکامەیان لە رووی ئاوەوە، پەنجا ئۆرغیس بەرزن. ئەو بەشەش کە لە ژێر ئاودایە خاوەن هەمان بەرزییە. لەسەر هەرکام لەو پیرامیدانە، پەیکەرەیەکی قەبە و زەبەلاحی بەردینە بەرچاو دەکەوێ و وێدەچێ لەسەر تەخت داندراون. سەرجەمی بەرزایی پیرامیدەکان دەگاتە سەد ئۆرغیس و بەرابەری مەودای دەوری ستادیۆمێکی شەش گۆشە دەبێ. ئەو ئاوەی دەڕژێتە نێو گۆل لە سەرچاوەیەکی سروشتی‌یەوە نایە، چونکە ناوچەیەکی تەواو ویشکارۆیە. ئاوەکە بەهۆی جۆگە و کاناڵ لە رووباری نیلەوە راکێشراوە و دووبارە دەڕژێتەوە هەمان چۆم. ماوەی شەش مانگ ئاوی چۆم بەردەدرێتە نێو گۆل و شەش مانگیش ئاوی لەبەر دەڕوا. پاشا ماڵیاتی بۆ راوچییانی

١- ئۆرغیس، پێوانەی مەودا لە یۆنانی باستان و بەرابەری ٧٧٦ میلیمیتر.

٢- ئەو گۆلە ١٧٢٠ ساڵ پێش میلاد دروستکرا و ئەمڕۆ بەناوی گۆلی ئەلعروق ناسراوە.

٣- ستادیۆ بەرابەری ١٧٧ میتر و ٦ سانتیمیترە.

٤- سخینۆس بەرابەری ١٠ کیلۆمیتر و ٦٥٥ میتر بووە.

ماسیگر داناوە. راوچییەکان لە شەش مانگی دووهەمدا کە ئاو لەبەر گۆل دەروا، رۆژێ یەک تالاندی[1] زێو مالیات دەدەن و بۆ شەش مانگی یەکەمیش بیست منا[2] دیاریکراوە.

[١٥٠] خەلکی دەڤەرەکە پێیانگووتم کە ئاوی گۆل بەهۆی گورینگی ژێرعەردەوە بەرەو رۆژئاوا دەچێ و بەتەنیشت ئەو بەرزاییانەدا تێدەپەرێ کە لە سەرووی ناوچەی مێمفیس هەلکەوتوون و پاشان دەرژێتە نێو چۆمی سیرتی[3] لە لیبی (ئەفریقا). لەبەر ئەوەی لە هیچ شوێنێک گلی کۆکراوەم نەبینی کە پاشماوەی هەلکەندنی گۆل بووبێ، بۆم پرسیار بوو کە ئەو گلە چی بەسەر هاتووە. لەو بارەوە لە دانیشتووانی نیزیک گۆلم پرسی: ئەو کاتەی گۆلتان هەلکەند، گلەکەتان بۆکوێ برد؟ وەختێک ولامەکەم وەرگرتەوە، بە قەناعەت گەیشتم و پرسیاریترم بۆ نەما و خێرا باوەرم پێکردن. چونکە دەمزانی شتێکی ئەوتۆ لە شاری نەینەوای ولاتی ئاسووریەکان رووی داوە. پاشای نەینەوا بەناوی سارداناپالۆس[4] پارەیەکی ئێجگار زۆری هەبوو. گشتی لە خەزێنەی ژێرعەردا شاردبۆوە. هێندێک دز تەمایان رێنیشت کە بیدزن. دزەکان لە مالی خۆیانەوە دەستیان بە خەندەک هەلکەندن کرد، تا گەیشتنە قەسری پاشا. ئەو گلەی لە خەندەک دەهاتە دەر، هەرکە شەو دادەهات، بە ئاوی چۆمی دیجلەیان دادەکرد کە بە تەنیشت شاردا تێدەپەری. لەمەر ئەو گۆلەی میسریش، هەلبەت بە شەو نا، بەلکوو بە رۆژی رووناک، خەلک

---

١- تالاندی یۆنانی ٢٦ کیلۆگرەم، میسری ٢٧ کیلۆگرەم، بابیلی ٣٠.٣ کیلۆگرەم و رۆمی ٣٢.٣٠ کیلۆگرەم بووە.

٢- پێوانەی بەها،و پارە لە یۆنانی باستان و بەرابەری ٦٨ تا ٩٢ فرانک زێر بووە.

٣- ناوی کۆنی هەرێمێک لە باکووری ئەفریقایە و لە رۆژئاوای میسر کەوتووەتە نێوان دوو کەنداو و لەلای رۆژهەلات دەگاتە میسر و لە رۆژئاوا پەیوەست بە ولاتی تونێس دەبێ. لە کلکی ئەو هەرێمە کەنداوێکیتر هەیە کە ئەمرۆ ناسراوە بە کابێس.

٤- ساردانapال، مانای " ئاشوور منالێکی دەبێ" نێوی چەندین پاشای ناسراوی ئاشوورییە کە تا ٦٢٥ی پێش میلاد فەرمانرەواییان کردوە و ناسراوترینیان ساردانapالی سێهەم و چوارەم و پێنجەمە.

هەڵیان دەکەند و گڵەکەیان بە چۆمی نیلدا دەکرد و ئاو دەیبرد و بڵاوەی پێدەکرد. دەگووترێ کە ئەو گۆلە بەو چەشنە هەڵکەندرا.

**[١٥١]** هەر دوازدە پاشا ڕێز و حورمەتیان بۆ پەیماننامەکەی نێوانیان دانا تا کاتی قوربانی پێشکەشکردن بۆ خوای پەرستگەی ئیفێستیۆس هات. دوایین ڕۆژی مەراسیمەکە جێژن گیرا و قەرار بوو مەی بخورێتەوە. کاهێنی مەزن وەک نەریت دەبوایە دوازدە دەفری زێڕیان بۆ بێنێ. ناوبراو بەهەڵە یازدە دەفری هێنا، لە حاڵێکدا دوازدە پاشا بوون. پاشاکان بەڕیز وێستابوون. ئەوەی لە ئاخری ریزدابوو پێیدەگووترا پسامیتیخۆس[١]، جامی زێڕی بەرنەکەوت. بەناچاری تاجی سەر سەری بەدەستەوە گرت کە مس بوو و بەشداری مەراسیمی مەینۆشی بوو. پاشاکان گشتیان تاجیان لەسەر بوو، پسامیتیخۆس کەڵکی لە تاجەکەی وەرگرت بەبێ ئەوەی بیری لێبکاتەوە یا بە ئەنقەست ئەو کارەی کردبێ. ئەوانیتر ئەوکارەی ناوبراویان بەجۆرێکیتر لێکدایەوە و لەمەر پێشگۆییەکەی پێیان گەیشتبوو، لە فکرەوە ڕۆچوون. پێشگۆییەکە دەیگووت هەر پاشایەک بە دەفری مس شەڕاب بخواتەوە، بەتەنیا فەرمانڕەوایی سەرتاسەری وڵاتی میسر دەکا. هەرچەند ئەو پێشگۆییەیان وەبیر هاتەوە، بەڵام بڕیاری کوشتنی پسامیتیخۆسیان نەدا، چونکە کاتێک لێیانکۆڵییەوە، دەرکەوت کە بەئەنقەست ئەو کارەی نەکردوە. لەجیات کوشتنی ناوبراو بەو قەناعەتە گەیشتن کە دووری بخەنەوە و بۆ دەڤەری ئێلیی بنێرن و زۆرترین بەشی دەسەڵاتی لێبستێننەوە، تا بۆی نەبێ کە پێوەندی بە باقی دانیشتووانی وڵاتی میسرەوە بگرێ.

---

١- پسامیتیخۆس دامەزرێنەری ٢٨مین خانەدانی پاشایەتی میسری باستان بووە کە سەرەتا لەلایەن پاشاکانی ئاشوورییەوە فەرمانڕەوایی بەشێک لە وڵاتی میسری کردوە (لە ساڵی ٦٧٢ی پێش میلاد و لە سەردەمی ئاسارادۆن، میسر بەدەست ئاشوورییەکان داگیرکرا و تا سەردەمی پاشایەتی پسامیتیخۆس بەردەوام بوو). پسامیتیخۆس لەو کاتەدا سەرهەڵدانی سازکرد و بە یارمەتی غیغیسی پاشای لیدی سەرکەوت و لە شەڕێکدا کە لە هەرێمی مێمفیس قەوما، توانی پاشایەتی سەراسەری خاکی میسر بەدەستەوە بگرێ و لە ساڵی ٦٦٠ی پێش زایین ٢٦مین خانەدانی پاشایەتی میسری دامەزراند.

[١٥٢] پسامیتیخۆس، سەردەمێک بووەی لەدەست پاشای ئەتیۆپی واتە ساڤاکۆس[١] رزگاری بێ، (چونکە پسامیتیخۆس باوکی ئەو پاشایەی بەناوی نێکۆن[٢] کوشتبوو) بۆ سوریا رایکردبوو و لەو نێوەشدا ساڤاکۆس خەونی دیتبوو و پاشەکشەی کردبوو، میسرییەکان پسامیتیخۆس‌یان دووبارە هێنابۆوە وڵاتی خۆیان و لە شاری سایی[٣] دایاننابوو. ئێستاش کە قەرار بوو لەگەڵ یازدە پاشای دیکە حوکمڕانی بکا، ناچار بە دورخراوەیی کرا، چونکە لەکاتی قوربانیکردندا کێشەی تاجهێنانەخواری بۆ هاتە پیش. پسامیتیخۆس پێیوابوو ناهەقی لێکراوە و بۆیە کەوتە فکری تۆڵە ئەستاندنەوە. چەند راسپاردەیەکی ناردە نێوەندی ئایینی لیتۆس لە هەرێمی ڤۆتۆس[٤]. پێشگۆییەکانی ئەو نێوەندە هەمیشە راست دەرچوبوون. پیشگۆیی ئەوجارە دەیگووت کە تۆڵەسەندنەوە لەلای دەریاوە دێ و راست لەو شوێنەی مرۆڤە مسییەکان وەدیاردەکەون. پسامیتیخۆس باوەڕی بەو پێشگۆییە نەکرد، واتە چۆن دەکرێ مرۆڤی مسی بێن و لەکاتی تەنگانەدا یارمەتی ئەو بدەن. زۆری نەکێشا، وەختێک دزەکانی دەریایی وڵاتی یوونیا و کاریا ناچاربوون لە خاکی میسر دابەزن. ئەوانە جلوبەرگی جەنگی لە مس دروستکراویان لەبەردا بوو. کاتێ گەیشتنە قەراخ دەریا و خەریکی داکەندنی جلەکانیان بوون، رێبوارێکی میسری چاوی پێیان‌کەوت. ئەو کابرایە لە ژیانیدا خەڵکی بەو بەرگەوە نەدیتبوو. خێرا رایکردە شاری ئێلیس، بۆ ئەو شوێنەی پسامیتیخۆس لێیدەژیا و خەبەری هاتنی مس‌پۆشەکانی بەناوبراو گەیاند و گووتی کە ئەو کۆمەڵە

١- ساڤاکۆس پاشای ئەتیۆپی لە سەدەی هەشتی پێش زایینداا میسری داگیرکرد و ٢٥مین زنجیرە پاشایەتی میسری دامەزراند. لەوانە تەنیا سێ پاشا فەرمانڕەواییان کرد و دواتر پسامیتیخۆس ٢٦مین پاشایەتی دامەزراند و کۆتایی بە دەسەڵاتی ئەوان هێنا.

٢- نێکۆن، یەکەم پاشای میسری لە کۆتاییەکانی سەدەی هەشتی پێش زایین. ئەو پاشایە بەدەست ساڤاکۆسی پاشای ئەتیۆپی کوژرا.

٣- سای یا سائیس، یەکێک لە شارەکانی میسری باستان و پێتەختی خانەدانی پاشایەتی سائیت و ئەمڕۆ ناسراوە بە کەنارئاوەکانی حەجەر.

٤- ڤۆتۆس یا ڤوتوس، ئیلاهەی میسری، وێنای حەیات و ژیان لە زۆربەی شارەکانی میسری پەرستش دەکرا و بەتایبەتی شارێکی گەورە بەو ناوە لە میسری خواروو بنیاتنرابوو.

خەڵکە هاتوون و دەڤەرەکەیان تاڵان کردوە. پسامیتیخۆس هەستی بەوە کرد کە پێشگۆییەکە وەڕاست گەڕاوە و هەر بۆیە زۆر دۆستانە لەگەڵ یوونی و کاری‌یەکان هەڵسوکەوتی کرد. کۆڵێک قەول و بەڵێنی پێدان و داوای لێکردن کە لە خزمەت ئەودا بمێننەوە. لەدرێژەدا، بە یارمەتی ئەوان و پیاوانی ژێردەستی خۆی، پاشاکانی‌تری لەسەر تەخت و سەدارەت لابرد.

[١٥٣] کاتێک پسامیتیخۆس حوکمڕانی سەراسەری وڵاتی میسری بەدەستەوەگرت، بەرهەیوانەکانی پەرستگەی ئێفێستۆسی لە شاری مێمفیس دروست کرد، واتە ئەو بەشانەی دەکەونە لای باشوور و هەروەها حەساری خواوەند ئێپیس[١]، ئەو شوێنەی لەکاتی بەڕێوەچوونی بۆنەکاندا دادەپۆشری. ئەو حەسارە روبەڕووی بەرهەیوانی مەعبەدە و دەوران دەوری چەشنی پاساژ دروستکراوە و کۆمەڵێک پەیکەرەی لێ داندراوە. لە پاساژەکان‌دا لەجیات کۆڵەکە کەڵک لە پەیکەرەی گەورە و فیلەتەن وەرگیراوە کە بەرزی بەژنیان دەگاتە دوازدە پیخیس[٢]. یۆنانییەکان خواوەند ئێپیس بەناوی ئێپافۆس دەناسن.

[١٥٤] پسامیتیخۆس لە وڵامی یارمەتی یوونی‌یەکان و کاری‌یەکاندا، ئەو ناوچانەی پێبەخشین کە لە روبەڕووی هەڤدوو هەڵکەوتوون و رووباری نیل بە نێوانیاندا دەربازدەبێ و ناوی لێنابوو ستراتۆپێد (مۆڵگەی سەربازی). ناوبراو ئەو ناوچانەی وەک خەڵات پێبەخشین و گشت بەڵێنەکانیشی بەجێ‌گەیاند. پسامیتیخۆس باوەڕی تەواوی بە یوونی و کاری‌یەکان هەبوو، بۆیە کۆمەڵێک منداڵی میسری نارده لایان تا فێری زمانی یۆنانی بن. هێندێک لەوانە ئێستاکە ماون و خەریکی کاری وەرگێڕین. یوونی و کاری‌یەکان

---

١- ئێپیس، ئاپیس، ئیلاهەی میسری، وێنای زیندوی خواوەند ئوسیریس بە روخساری گایەکی رەش کە خاوەن لەکە یا خاڵێکی چوارگۆشەی سپی لە نێوچاوان و لەکەیەکی سپی‌تری هیلالی لەلای راستی سەری بووە. ئەو گایە لە شاری مێمفیس پارێزگاری لێکراوە و کاهینەکان خزمەتیان کردوە و پاش ٢٥ ساڵ لە چۆمی نیل‌یان هاویشتووە و پرسە و سەرەخۆشی بەشکۆیان رێکخستووە. هەرکات گایەکی بە هەمان شێوە و روخسار لەدایکبووە، لەجێگای ئاپیس‌یان داناوە.

٢- پیخیس یا ئانیشک، ٤٤.٤ سانتی‌میتر یا ٤٤٤ میلیمیتر.

ساڵانێکی زۆر لەو دەڤەرە ژیان، شوێنی نیشتەجێ بوونیان لە نیزیک دەریاوە بوو کە تۆزێک لە خوارووی شاری ڤوڤاستی و لە سەرووی پیلۆسیۆس[1] کە سەرچاوەی ئاوی رووباری نیلە هەڵکەوتبوو. ماوەیەک دواتر، ئاماسیس[2] پاشا، ئەو خەڵکەی لەوێ راگواست و بردنی بۆ هەرێمی مێمفیس، بۆوەی پارێزگاری لەو بکەن بۆوەی نەکەوێتە بەر پەلاماری میسرییەکان. بەهەرحاڵ یۆنانییەکان بەو شێوەیە لە وڵاتی میسر دامەزران و لەگەڵ خەڵکی هەرێمەکە تێکەڵاو بوون. زانیاری ئێمەش سەبارەت بە میسرییەکان بەهۆی ئەوانەوەیە، بەتایبەتی دوای فەرمانڕەوایی پسامیتیخۆس و جێگرەکانی. حەمباری گەمییەکان و کەلاوەیماڵەکانیان لەو شوێنانەی وەدەرنراون، ئێستاش هەر ماون و پیاو دەتوانێ بیانبینێ. ئەوە باسێک بوو کە چۆن پسامیتیخۆس توانی فەرمانڕەوایی تەواوی وڵاتی میسر بۆخۆی مسۆگەر بکا.

[١٥٥] سەبارەت بە نێوەندی پێشگۆیی لە میسر زۆرم باس کردوە، بەڵام بە پێویستی دەزانم زیادتر لەوە لەسەری بدوێم. ئەو نێوەندە لە پەرستگەی لیتۆس هەڵکەوتووە، لە زارکی گەرووی چۆمی نیل و ئەو شوێنەی پێیدەگووتری ناوچەی سێڤێنیتیکۆ و شارێکی گەورەیە. پیاو لەو نێوەندەڕا چۆمی نیل بەجوانی دەبینێ. شارێک کە پێشتریش ناوم هێناوە و ناسراوە بە ڤوتۆس. مەعبەدەکانی ئاپۆلۆناس[3] و ئارتێمیدۆس[4]، ئەوانەش هەر لەو شارەن. مەعبەدی لیتۆس، لەو شوێنەی نێوەندی تاڵەبینییەکی لێهەڵکەوتووە، زۆر گەورەیە و خاوەن کۆمەڵێک بەرهەیوانە کە بەرزاییەکەیان دەگاتە دوازدە

١- پیلۆسیۆس یا پیلۆسی، یەک لە شارەکانی کۆنی میسر، لە نیزیک پۆرتسەعیدی ئێستا، بۆ ساڵانێکی زۆر دەروازەی سەرەکی وڵاتی میسر بەرەو ئاسیا بووە.

٢- ئاماسیس پاشای میسر لە شازدەهەمین خانەدانی فیرعەونەکانی میسر. لەنێوان ساڵەکانی ٥٧٠ تا ٥٢٦ی پێش میلاد، ماوەی ٤٠ ساڵ فەرمانڕەوایی کرد و نەیهێشت کوروش ئەو وڵاتە داگیر بکا و لەگەڵ کەمبوجییە شەڕی کرد و لەسەرەتای ئەو شەڕەی دواییدا مرد.

٣- ئاپۆلۆناس یا ئاپۆلۆن، خواوەندی رۆشنایی و نوور لە یۆنانی باستان و سەکەوتوو و ناسراو لە پێشگۆیی و ئامۆژگاریدا.

٤- ئارتێمیدۆس یا ئارتێمیس، یەک لە خواکانی یۆنانی کۆن، خاوەن ناوی دووهەم واتە دیانا و کچی دیا (ژوپیتێر) خوای راو و شکار و دارستانەکان بووە.

ئۆرغیس[1]. دیاره باسی شاکاریی ئەو شوێنە دەکەم. ئەگەر پیاو بخوازێ چاوی پێبکەوێ. لە حەساری پیرۆزی پەرستگەی لیتۆس، پەرستگەیەکی دیکە دروستکراو لە یەک جۆر بەرد و چوارگۆشەیە و گشت لایەکی بەقەرا یەکن و هەرلایەکی چل پیخیس[2] بەرینن. بانی ئەو پەرستگەیە تەواو لەبەردە و سوانەکانی چوار پیخیس بەدەرەوەن.

[١٥٦] لەو نێوەندە، پەرستگەکە لە گشت بیناکانیتر پتر سرنجی راکێشام. دوای مەعبەد، دورگەی خێمیس، گەلێک جوان و دڵپەسەند، لەنێو گۆلێکی قوڵ و بەرین و لە نیزیک پەرستگەی لیتۆس هەڵکەوتووە. میسرییەکان دەڵێن ئەو دورگەیە سەرئاو و شناوەرە. من خۆم نەمدی سەرئاو بێ، هیچ جوڵەیەکیشم پێوە نەدی و بۆیە کۆڵێک پرسیارم بە مێشکدا هات، واتە دیاردەیەکی ئەوتۆ چۆن بەرهەم دێ. لە نێوەندی دورگە، مەعبەدی ئاپۆلۆناس و سێ سەکۆی قوربانی جیا لە یەکتر دروست کراون و داری بەری و بەتایبەت دار خورمای چەقێندراو، شوێنەکەیان رازاندۆتەوە.

میسرییەکان لەمەر سەرئاو بوونی ئەو دورگەیە بەو شێوەیە وڵامیان دامەوە: خاتوونی خواوەند لیتۆ یەکێک لە هەشت خواکانی سەرەکی کە سەردەمی خۆی لە شاری ڤوتۆس ژیاوە، لەوێ خاوەن نێوەندی تاڵەبینی بووە. ئەو خاتوونە خواوەندە ئاپۆلۆناسی خەڵکی ئیسی هێناوەتە لای خۆی و رزگاری کردوە و لەو دورگەیە حەشاری داوە. واتە بۆ ئەو دورگەیەی کە ئیمڕۆ دەڵێن سەرئاوە، دیارە سەرەتا بەو چەشنە نەبووە و زەمانێک ئاوای لێهاتووە کە خواوەند تیفۆناس سەراسەری جیهان گەڕاوە بۆوەی کوڕەکەی بەناوی ئۆسیری بدۆزێتەوە.

بەپێی گووتەی میسرییەکان، ئاپۆلۆن و ئارتێمیس مناڵانی دیۆنیسۆس و خاتوو ئیسیدۆس بوون. خاتوو لیتۆ تەنیا دایانی ئەو مناڵانە بووە و رزگاری کردوون. لە زمانی میسریدا ئاپۆلۆن بەناوی ئۆرۆس، خاتوو دیمیترا بەناوی

---

١- ئۆرغیس، ١ میتر و ٧٧٦ میلیمیتر.

٢- پیخیس یا ئانیشک، ٤٤.٤ سانتیمیتر یا ٤٤٤ میلیمیتر.

ئیسیس و خاتوو ئارتێمیس بەناوی ڤوڤاستی ناسراون بەپێی ئەو دابونەریتە و نەک لە هیچ شوێنێکی‌تر، ئێس‌خیلۆس[1]، کوڕی ئێڤ‌فۆریۆنۆس، بەر لە شاعیرانی‌تر ئەو بابەتەی کە من باسی دەکەم هێناوەتە گۆڕێ و دەڵێ: ئارتێمیس تاقانە کچی دیمیترا بووە. بەهەرحاڵ ئەوە بۆچوونی میسرییەکان لەمەر سەرئاو بوونی دورگە بووە.

[۱۵۷] پسامیتیخۆس پەنجا و چوار ساڵی ڕێک فەرمانڕەوای وڵاتی میسر بوو. لەو ماوەیەدا بیست و نۆ ساڵ گەمارۆی شاری ئازۆتوس[2] لە هەرێمی سوریای‌دا و لە کۆتاییدا داگیری کرد. ئەو شارە واتە ئازۆتۆ، ئەوەندەی من بزانم ماوەیەکی پتر خۆڕاگری لەخۆی نیشان‌داوە.

[۱۵۸] نێکۆس[3] کوڕی پسامیتیخۆس بوو. ئەو کوڕە پاشایەتی وڵاتی میسری کرد و یەکەم کەس بوو کاناڵی ئاویی بەرەو دەریای ئێریترە[4] ڕاکێشا و دواتر بەهۆی داریوشی فارس تەواو کرا. مەودای کاناڵەکە چوار ڕۆژی سەفەری دەریایی و بەرینایییەکەشی هەرئەوەندە دەبێ. دوو گەمی جەنگی هاوکات دەتوانن پێیدا دەربازبن. ئاوەکەی لە ڕووباری نیلەوە دابین‌دەکرێ. ئەو کاناڵە لە شوێنێکی سەرووی شاری ڤوڤاستی‌یەوە دەست‌پێدەکات و لە قەراخ شاری پاتومۆس[5] کە یەکێک لە شارەکانی عەرەبستانە دەرباز دەبێ و دەگاتە دەریای ئێریترە. ئەو کاناڵە سەرەتا لە بەشی دەشتایی میسر کە بەلای عەرەبستاندا کەوتووە، هەڵکەندراوە. ئەوە هەمان دەشتە کە کەوتوەتە

---

١- کۆنترین شاعیری یۆنانی کە لە سەدەی پێنجی پێش زایین‌دا ژیاوە و لە شەڕەکانی ناسراوی ماراتۆن و سالامینا بەشداری کردوە و بەرهەمەکانی لەباری مێژووییەوە گرینگن.

٢- ئازۆتۆس، پێتەختی یەکێک لە پێنج ئوستانی فەلەستینی کۆن، هەڵکەوتوو لە ڕۆژئاوای بەیتول‌موقەدەس کە دوای ٢٩ ساڵ گەمارۆ بەهۆی پسامیتیخۆس داگیر و وێرانکرا.

٣- نێکۆس یا نێخائۆی دووهەم، کوڕی پسامیتیخۆسی ناسراو، لەنێوان ساڵەکانی ٦١٧ تا ٦٠٠ی پێش میلاد پاشایەتی وڵاتی میسری کردوە و لە کۆتاییدا بەدەست بوختولنەسری دووهەم کوژرا.

٤- ئێریترە، ناوێکە کە یۆنانییەکانی سەردەمی باستان بۆ ئەقیانووسی هیندیان داناوە. ئەوان دواتر لەجیات ئەو ئەقیانووسە ئەوجار بە دەریای ئەحمەریان گوتووە دەریای ئێریترە.

٥- پاتومۆس، ئەمڕۆ ناسراوە بە تەلول‌مەسکوت و لە ١٧ کیلۆمیتری ڕۆژئاوای ئیسماعیلیە هەڵکەوتووە.

تەنیشت چیایەک لە روبەرووی مێمفیس. کاناڵە ئاوییەکە لە داوێنی چیاکە هەڵکەندراوە و لە رۆژئاواوە بەرەو رۆژهەڵات دەچێ. بە شیو و دۆڵەکاندا دەربازدەبێ و چیاکان تێپەڕدەکا و بەرەو باشوور شۆڕدەبێتەوە و دەڕژێتە نێو کەنداوی عەرەبستان. رێگای نێوان دەریای باکوور تا دەریای باشوور، واتە ئێریترە، نیزیکترین رێگایە. لە چیای کاسیۆ لەسەر سنووری نێوان میسر و سوریەوە دەستپێدەکا و لەو نوختەتەیە تا کەنداوی عەرەبستان هەزار ستادیۆ[1] دەبێ. ئەوە نیزیکترین رێگای سەفەرە، لە حاڵێکدا کاناڵی ئاوی دوور و درێژترە، چونکە کەوانەی کردوە.

لە سەردەمی فەرمانڕەوایی نێکۆس‌دا، پێشگۆییەک بە دژی ئەو کارە گەیشتە دەستی ناوبراو کە دەیگووت: هەڵکەندنی کاناڵی گۆڕین لە خزمەتی بەربەرەکاندا. میسرییەکان تەواوی ئەو کەسانەی بە زمانی ئەوان قسەنەکەن، وەک بەربەر پێناسەیان دەکەن.

**[١٥٩]** کاتێک نێکۆس دەستی لە هەڵکەندنی کاناڵ هەڵگرت، رووی لە ئامادەکاری بۆ شەڕ کرد. ناوگانێکی دەریایی لە دەریای باکوور و یەکی‌تریشی لە کەنداوی عەرەبی و دەریای ئێریترە وەرێخست. ئیمڕۆش پیاو دەتوانێ لەو شوێنانە کارگە و مەکینەکانی ئەو سەردەمە ببینێ. ناوبراو لەو جێگایانەی پێویست بووە، کەڵکی لە ناوگانی دەریایی خۆی وەرگرتووە. نێکۆس بەسەر دانیشتووانی سوریایی‌دا زاڵبوو و لە دەشتایی و لە ناوچەی ماغدۆلۆ شکستی پێدان. دوای ئەو شەڕە دەڤەری کادیتی[2] گرت کە شارێکی گەورەی سوریا بوو. نێکۆس گشت جلوبەرگی خۆی کە لەو شەڕانەدا پۆشیبووی، بۆ ئاپۆلۆن لە شاری ڤرانخید[3] سەر بە هەرێمی میلیتۆس نارد.

---

١- ستادیۆ، پێوانەی مەودا و بەرابەری ١٧٧٫٦ میتر و ٦ سانتی‌میتر لە یۆنانی باستاندا.

٢- کەسانێک لەو باوەڕەدان کە شاری بەیتولموقەدەس لە سوریای باستاندا بووە و خەڵکانێکیش پێیانوایە غەزەیە.

٣- ناوی بنەماڵەیەکی کۆنی شاری میلیتۆس کە خزمەتی مەعبەدی ئاپۆلۆن‌یان کردوە. ئەوانە دواتر بەهۆی خەشاریاشا راگوێزرانە هەرێمی سوغدی‌یەکان. ئەوانە بنیاتنەری شارێک بەناوی ڤرانخید بوون کە دواتر بەدەست ئەسکەندەری مەزن وێرانکرا.

ئەو شێست ساڵی ڕەبەق حوکمڕانی کرد. دوای خۆی تاج و تەختی بۆ کوڕەکەی بەناوی پسامیس جێهێشت.

[١٦٠] لە سەردەمی دەسەڵاتدارییەتی پسامیس[1] لە میسر، ڕاسپاردەکانی ئێلیۆ[2] گەیشتنە لای ئەو و بە فڕوفیشاڵەوە ڕایانگەیاند کە ئەوان دەتوانن کێبەرکێکانی ئۆلیمپیا ڕێکوپێکتر و کەم خەرجتر لە هەرکەسێکی‌تر ڕێکبخەن و گووتیان کە تەنانەت بەتواناترین میسرییەکانیش ناتوانن چەشنی ئەوان لەو کارەدا سەرکەوتوو بن.

ئێلی‌یەکان هەر کە گەیشتنە وڵاتی میسر و مەبەستی سەفەرەکەیان بۆ پسامیس ئاشکراکرد، ناوبراو زاناترین ڕاوێژکارانی خۆی بانگهێشت کرد. شارەزایانی میسری کۆبوونەوە و گوێیان لە داوای ئێلی‌یەکان گرت، کە چۆن ڕێورەسمی کێبەرکێکانی ئۆلیمپیا ڕێکدەخەن. ئێلی‌یەکان ئەو پرسیارەشیان هێنا بەرباس کە ئاخۆ کەسی میسری ئەوەندە بەتوانا هەیە بە خەرجی کەمترەوە کێبەرکێکان چەشنی ئەوان بەڕێوەبەرێ.

میسرییەکان دوای هێندێک ڕاوێژ و بیرکردنەوە، لەو کۆمەڵە ڕاسپاردەیەیان پرسی کە هاوڵاتییانی ئەوان بەشداری کێبەرکێکان دەبن. ئێلی‌یەکان وڵامیان داوە کە هەم هاوڵاتی ئەوان و هەم یۆنانییەکان ئەگەر بخوازن، بۆیان هەیە بەشدار بن. ئا لەو کاتەدا میسرییەکان وڵامیان داوە کە بەپێی یاسای ئۆلیمپیکی میسری، ئەوە ناهەقییە، چونکە وەختێک کەسێکی خۆوڵاتی بەشداری کێبەرکێکان بێ کە لە وڵاتی ئەودا بەڕێوە دەچێ، هیچ ئیمکانی نییە کە لە گشت بارەوە یارمەتی پێدەکرێ و ئەوەش بە زیانی پاڵەوانەکانی بیانی تەواو دەبێ و کەوابوو ناهەقییە. لە کۆتاییدا پێیان‌گووترا ئەگەر قەرارە بەڕێوەچوونی ئەو کێبەرکێیانە ئاوا بە خەرجی کەمتر ڕێکبخەن،

---

١- پسامیس، دووهەم کوڕ و جێنشینی نێخائۆس، لەنێوان ساڵەکانی ٦١٠ تا ٥٩٤ی پێش میلاد پاشایەتی میسری کردوە. لە سەردەمی ئەودا شەڕی میسر و ئەتیۆپیا قەوما.

٢- شارێکی کۆنی ئاسیا لە هەرێمی ئێئۆلی.

پێویستە هیچکام لە دانیشتووانی ئێلی بەشداری پاڵەوانەتییەکان نەکەن و وەرزشەکان تەنیا بۆ خەڵکی بیانی ڕێکبخرێن.

**[١٦١]** پسامیس کە تەنیا شەش ساڵ حوکمڕانی وڵاتی میسری کرد، دوای ئەوەی لەشکرکێشی کردە سەر ئەتیۆپیا، خێرا مرد. لەجێگای ئەو کوڕەکەی بەناوی ئاپریس[1] دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت. لەنێو نەوەکانی پسامیتیخۆس‌دا، ئەوەیان واتە ئاپریس بەختەوەرتر لە گشت فەرمانڕەواکان بووە. ئاپریس بیست و پێنج ساڵ پاشایەتی کرد. لەو ماوەیەدا لەشکری ناردە سەر شاری سیدۆنا[2] و شەڕی دەریایی لەگەڵ دانیشتووانی دورگەی تیرۆس[3] دەست پێکرد. لە کۆتایی شەڕەکەدا تووشی نەهامەتی هات. هەڵبەت دواتر باسی ئەوە دەکەم کە چی لێقەوما، بەتایبەت لەو شوێنەدا کە دێمە سەر باسی لیبی(ئەفریقا)، بەڵام لێرەدا تەنیا ئیشارەیەکی پێدەکەم. ئاپریس لەشکری نیزامی ناردە شەڕی دژی (کیرینی)یەکان[4] و تەواوی هێزەکانی تێداچوون. میسرییەکان تاوانی ئەو قەومانەیان خستە ئەستۆی ئاپریس و پێیانوابوو کە ناوبراو بە ئەنقەست ئەو لەشکرەی ناردۆتە شەڕێک کە تێداچوونی حەتمی بووە، تا بەو شێوەیە هەست بە ئەمنییەتی خۆی بکات و باشتر بەسەر میسرییەکاندا حاکم بێ. ئەوانەی توانیان دوای شەڕ بە سڵامەتی بگەڕێنەوە، لەگەڵ کەسوکاری کوژراوەکان بەچەشنێک رقیان هەستابوو کە لەجێوە سەرهەڵدانێکیان سازکرد.

---

١- ئاپریس کوڕی پسامیتیخۆسی دووهەم و پاشای میسر لەنێوان ساڵەکانی ٥٩٣ تا ٥٦٩ی پێش میلاد. ئەو پاشایە لە ساڵی ٥٦٩دا بەدەست ئاماسیس لەسەر دەسەڵات لاچوو.

٢- سیدۆنا بەندەری باکووریی فینیقیای کۆن و هەڵکەوتوو لە باکووری تیرۆس یا سوور کە یەکێک لە بەندەرە گرینگەکانی ئەو سەردەمە لە کەنارئاوەکانی رۆژهەڵاتی دەریای مەدیترانە بووە. ئەمڕۆ وێرانەیە و پێیدەگووترێ سەعیدە.

٣- تیرۆس، گەورەترین بەندەری دنیای باستان لە کەنارئاوەکانی رۆژهەڵاتی مەدیترانە و لە شوێنی بەندەری بەیروتی ئەمڕۆ.

٤- کیرینیئا، ناوی موهاجیرنشینێک کە یۆنانییەکان لە رۆژئاوای میسر و لە خاکی ئەفریقیادا دروستیانکرد و پێتەختی وڵاتی کیرینی‌یەکان بووە.

[١٦٢] وەختێک خەبەر بە ئاپریس گەیشت، خێرا ئاماسیسی نارده لایان بۆوەی قسەیان بۆبکات و هێوریان بکاتەوە. ئاماسیس گەیشتە شوێنی راپەریوان، لەکاتی ئاخاوتندا، نیزامییەک کە لە پشت سەری ناوبراو راوەستابوو، تاجێکی لەسەر سەری ئاماسیس نا و پێیگووت کە تۆ پاشای ئێمەی. هەڵبەت شتێکی ئەوتۆ ئیمکانی نەبووە، مەگەر خواست و رەزامەندی خودی ئاماسیسی لەگەڵ بووبێ. دیارە دواتر ئەو بۆچوونە وەڕاست گەڕا چونکە کاتێک راپەڕیوان ئەویان وەک پاشای میسرییەکان راگەیاند، ناوبراو خێرا خۆی ئامادە کرد و وەپێش لەشکری دژی ئاپریس کەوت. ئاپریس هەرکە خەبەری پێگەیی، یەک لە پیاوانی شەڕکەری خۆی بە هێزێکەوە نارده بەرەی دژی ئاماسیس. فەرماندەی ئەو هێزە پێی دەگووترا پاتارفیمیس. ناوبراو دەستووری پێدرابوو کە ئاماسیس بە زیندوویی بێنێتەوە لای ئاپریس. کاتێک پاتارفیمیس گەیشتەجێ و داوای چاوپێکەوتنی لە ئاماسیس کرد، ئەو راست لەو وەختەدا لەسەر زینی ئەسپ دانیشتبوو، هەستایەوە سەر رکێف و تڕێکی کەند و بانگی لە پاتارفیمیس کرد کە ئەو تڕە وەک وڵام بداتەوە بە ئاپریس. پاتارفیمیس پێداگر بوو کە ئاماسیس دەبێ پەیڕەوی لە پاشا بکا. ئاماسیس وڵامی دایەوە کە ئەویش زۆر لەوە پێشتر راست لەو باوەڕەدا بووە، بۆیە پاشا پێویست نەبووە کە لێی دڕدۆنگ بێ. بەڵێنیشی داوە کە کۆمەڵێک خەڵک بەرێتە لای پاشا. پاتارفیمیس لە قسەکانی ئاماسیس حاڵی بوو و چاوی بە ئامادەکارییەکانی ناوبراو کەوت و ناچار گەڕایەوە بۆوەی پاشا لە بارودۆخەکە بگەیێنێ. هەرکە گەیشتەوە بەردەم ئاپریس، بەبێ ئەوەی ئاماسیس لەگەڵ خۆی بێنێتەوە. پاشا قەڵس بوو و بەبێ ئەوەی ئیزنی ئاخاوتن بە ناوبراو بدات، بڕیاریدا هەردوو گوێ و کەپۆی ئاماسیس خشت ببڕن. وەختێک میسرییەکان، ئەوانەی هێشتا لاینگری ئاپریس بوون، چاویان بەو کارە ناحەزەی دەرهەق بە پیاوێکی میسری ئەوتۆ ناسراو کەوت، خێرا ئەویان بەجێهێشت و چوونە بەرەی ئاماسیس.

[١٦٣] ئاپریس کاتێک خەبەری لەدەست چوونی ئەو خەڵکەشی پێگەی، بەکرێگیراوانی خۆی چەکدارکرد و دژی میسرییەکان کەوتە شەڕ. ناوبراو سی هەزار شەڕکەری لە هۆزەکانی کاری و یوونی لە قەسر و بارەگاکانی لە شاری سایی[1] هەبوو. زۆری نەکێشا هێزەکانی بەکرێگیراوی ئاپریس کەوتنەڕێ. لەلایەکی‌تریشەوە هێزەکانی لایەنگری ئاماسیس دژی بێگانەکان خۆیان ڕێکخست. دوو هێزی دژبەر لە شاری مۆمیمفیس گەیشتنە بەر هەڤدوو.

[١٦٤] کۆمەڵگای میسری بەسەر حەوت چیندا دابەش‌دەکرێ: کاهێنان، نیزامییان، گاوداران، بەرازداران، بازرگانان، مەلەوانان و دیلمانجەکان. کۆمەڵگای میسری لەوانە پێکدەهات و ناوەکانیان دەگەڕایەوە سەر پیشە و کاریان. نیزامییەکان بە ناوەکانی کەلاسیری[2] و ئێرمۆتیڤی[3] ناسراو بوون و ئەوەش بەپێی ئەو ناوچانە دیاری‌دەکران. سەراسەری خاکی میسر، بەسەر ناوچە و پارێزگاکاندا دابەش‌کرابوون.[4]

[١٦٥] ئێرمۆتیڤی‌یەکان خەڵکی ناوچەکانی ڤوسیریتی، سایتی، خێمیتی، پرمیتی، دورگەی پرۆسۆپیتیس و دورگەی ناتۆ بوون. لەو ناوچانە، خەڵکی ئێرمۆتیڤی دەژیان. ئەگەر ئەوانە لەشکرکێشی بکەن، یەکجێ سەد و شێست هەزار کەسیان کۆدەبێتەوە. هیچکام لەوانە بە ئیش‌وکار یا پیشەیەکەوە مژوڵ نابن و تەنیا بۆ شەڕکردن پەروەردە کراون.

[١٦٦] کەلاسیری‌یەکان خەڵکی ئەو ناوچانەن: تیڤێئۆ، ڤوڤاستی، ئاڤتیتی، تانیتی، مێندیسیۆ، سیڤێن‌نیتی، ئاتریبیتی، فارڤێتیتی، تموویتی، ئۆنووفیتی،

---

١- سای یا سائیس، یەکێک لە شارەکانی میسری باستان و پێتەختی خانەدانی پاشایەتی سائیت و ئەمڕۆ ناسراوە بە کەنارئاوەکانی حەجەر.

٢- کەلاسیری، ئەو وێژەیە سەرەتا بۆ هێزی پیادەنیزامی بەکرێگیراوی ئەتیۆپی کەڵکی لێوەرگیراوە.

٣- ئێرمۆتیڤی، بە داشقەچی و عارەبانەچی سپا گوتراون.

٤- هەرکام لە یەکە ئیداری و کشوەرییەکانی میسری باستان پێی‌گووتراوە نۆم. ژمارەی نۆمەکان لە هەرێمەکانی تیڤا و دێلتا سەرجەم گەیشتوونەتە ٤٠ دانە. جیا لەوانە ٥ نۆمی‌تر لە عەرەبستان و میسر و ٦ نۆم لە ڕۆژهەڵاتی چۆم و ٧ دانەش لە ڕۆژئاوای ڕوبار هەبوونە. ئەو دابەشبوونە ئیدارییە تا ٤ سەدە دوای میلادیش بەکارهاتووە. هەر نۆمێک خاوەن حوکمڕانێکی نیوە سەربەخۆ بووە و ناسناوی پاشای دووهەمی پێدراوە.

ئانیسیۆ، میئیکفۆریتی _ ئەو پاریزگایە دورگەیە و لە روبەرووی کۆمەڵگای ڤۆڤاستی هەڵکەوتووە. ئەو کۆمەڵە پاریزگایانە شوێنی دانیشتنی کەلاسیری‌یەکان بوون کە هەرکات بۆ شەڕکردن ئامادە دەبن، ژمارەیان دەگاتە دووسەد و پەنجا هەزار کەس. ئەوانە بۆیان نییە بە کاری دیکەوە سەرقاڵ بن، تەنیا خەریکی فێربوونی زانستی جەنگین و ئەو نەریتە لە باوکەوە بۆ کوڕ بە میرات ماوەتەوە و شەڕکردن پیشەیانە.

[١٦٧] ئەوەی کە یۆنانییەکان نەریتی شەڕ و نیزامیگەری لە میسرییەکان فێربوون، ناتوانم بە دڵنیاییەوە ڕوونی بکەمەوە، چونکە دەبینم کە گەلانی وەک تراکی، سکیتی، پارس و لیدی و تەواوی خەڵکانی بەربەر، ئەو کەسانەیان پێ پەستە، وەختێک وەدوای پیشە یا هونەرێکیتر دەکەون و بەرهەمێک بۆ وەچەی داهاتوویان بەجێدەهێڵن. ئەو گەلانەی ناوم‌هێنان، ڕێز لەو کەسانە دەگرن کە خۆیان لە کاری پێشەوەری و بەرهەم خولقاندن نادەن و خەریکی پیشەگەری نابن. ئەوانە پتر حورمەتی خەڵکانێک دەگرن کە بە پێشەی جەنگییەوە مژوڵ دەبن. یۆنانییەکان، بەتایبەتی لاکێدیمۆنی‌یەکان ئەو یاسایە بەڕێوە دەبەن. کۆرینتی‌یەکان، ئەوانیش کەمتر ڕێز لە پیشەگەران دەگرن.

[١٦٨] جیا لە کاهێنەکان، نیزامییەکان خاوەن هێندێک یارمەتی ماڵی بوونە. هەرکام لەوانە دوازدە ئارورا[١] خاکی بەبێ ماڵیاتی پێدراوە. هەر ئارورایەکی میسری بەرابەری سەد پیخیسی چوارگۆشەی میسرییە و پیخیسی میسری و پیخیسی سامۆسی[٢] بەقەرا یەکن. ئەو ئیمتیاز و پشکدانە بۆ گشتیان بووە، هەڵبەت لە یەک کاتدا هەموویان نەیانتوانیوە ببنە خاوەن زەوی و پێویست بووە کە لەسەر نۆرە ڕاوەستن و هیچکاتیش ئەو مافە دووجار بە یەک کەس نەدراوە. هەر ساڵێ هەزار کەسی کەلاسیری و هەزاری ئێرمۆتیڤی وەک پاسەوانانی پاشا خزمەتیان کردوە. بۆ ئەو پاسەوانانە جیا لە کێڵگە، ڕۆژێ

---

١- هەر یەک ئارورا بەرابەری ٢٧٥٦،٢٥میتری چوارگۆشە.

٢- بەرابەری ٤٤٤ میلیمیتر.

پێنج منێس[1] گەنم بە هەرکامیان دراوە. دوو مەنیس گۆشتی گا و چوار ئاریستێر[2] (یەکەی پێوانی شتی ئاوەکی) شەڕاب. ئەو کەرستانەی باسم لێوەکرد، جیرەی دائیمی پاسەوانەکانی پاشا بوون.

[١٦٩] بەهەرحاڵ کاتێک ئاپریس لەگەڵ شەڕکەرانی بەکرێگیراوی خۆی و ئاماسیس لەگەڵ خەڵکی راپەڕیوی میسری لە ناوچەی مۆمێمفی کەوتنەبەر یەک و شەڕیان دەستپێکرد، لەشکری بیانییەکان جوامێرانە شەڕیان کرد، بەڵام شکستی خوارد، چونکە ژمارەیان لە دژبەران کەمتر بوو. دەگێڕنەوە کە ئاپریس لەو باوەڕەدا بوو کە خواش ناتوانێ تاج و تەختی لێبستێنێ، چونکە متمانەی تەواوی بەخۆی هەبوو. بەهەرحاڵ شەڕی کرد و شکستی خوارد، گیرا و بەدەست بەستراوی ناردیانە شاری سای کە پێشتر شوێنی دانیشتنی بوو و ئێستاش بووەتە بارەگای ئاماسیس.

ئاپریس لەو شارە و لە قەسری پاشایەتیدا ژیا، چونکە ئاماسیس زۆر جوامێرانە هەڵسوکەوتی لەگەڵ کرد. دواتر بەڵام، لەبەر ئەوەی ئاماسیس‌یان بەوە تاوانبارکرد کە ئەو کارەی دەیکا، زۆر ناهەقییە و لەڕاستیدا دوژمنی خۆی و خەڵکەکەی بەخێو دەکا، خێرا ئاپریس‌یان خنکاند و لە گۆڕی بنەماڵەییدا ناشتیان. جەنازەی ئاپریس لە نێوەندی ئایینی ئاتینا و لە نیزیک پەرستگە و لەڕاستی درگای سەرەکی و لە دەستی چەپ نێژراوە. دانیشتووانی شاری سایی جەنازەی تەواوی پاشاکانیان لەوێ ناشتووە، هەڵبەت ئەوانەی خەڵکی پارێزگای خۆیان بوونە. گۆڕی ئاماسیس، ئەویش لەو شوێنە هەڵکەوتووە، بەڵام تۆزێک دوورتر لەو پەرستگەیە کە گۆڕی ئاپریس و خانەدانەکەی لێیە. لە حەساری پیرۆزدا بینایەکی گەورە هەیە و لە بەرد دروست کراوە و خاوەن کۆمەڵێک کۆڵەکە بە هێمای دارخورما و نەخشی‌ترە. لە ناوەوەی ئەو بینایەدا دوو درگا هەیە و گۆڕی ئاماسیس لەنێوان درگاکاندا جێی‌گرتووە.

---

١- ١ منیس بەرابەری نیو کیلۆگرەم.

٢- بەرابەری یەک قوتیل یانی ٢٧ سانتی‌لیتر.

[١٧٠] له شاری سایی و له نێوەندی ئایینی ئاتینا، قەبری ئەو کەسەی لێیە کە شەرم دەکەم ناوی بێنم. ئەو ئارامگەیە لە پشت شوێنی عیبادەت و بە درێژایی دیوارەکەیەتی. لە حەساری پیرۆز، کۆمەڵێک ستوونی یادوەری بەردینەی گەورە چەقێندراون. حەوزێکی گەورە لەنێو حەساردا هەڵکەوتووە و دیوار و لێوارەکانی لە بەردی تاشراو دروستکراون و تەواو نەخشێندراون و کۆڵێک کاری هونەرییان لەسەر کراوە، ئەو حەوزە ئەوەندە گەورە وەبەر چاوم کەوت، پێموابوو چی لە گۆلی زیلو[١] کەمتر نەبوو، مەبەستم ئەو گۆلەیە کە دەیانگووت گێژاو دەخولقێنێ.

[١٧١] میسرییەکان بەشەو لەقەراخ ئەو گۆلە، ئیشتیا و حەزی خواوەند ئۆسیریس بەجێدەگەیێنن و دەڵێن نهێنییە. سەبارەت بەو دابە هەرچەند دەزانم چ دەقەومێ، بەڵام ناخوازم لەسەری بنووسم. لەمەر بەڕێوەچوونی مەراسیمی دیمیترا[٢] کە یۆنانییەکان ناویان لێناوە تێسمۆفۆرییا[٣]، هیچ شتێک ناڵێم، تەنیا ئەوەندە نەبێ کە ئایینەکەیان ئیزنی پێداوم. کچانی تاقانەی دانائۆس[٤] ئەو نەریتەیان لە میسرەوە هێناوە و ژنانی ناوچەی پێلاسغی[٥]

---

١- دورگەیەکی یۆنانی کە لە سەردەمی ئەنتیکدا مەوتەنی خواوەند ئاپۆلۆن و دیانا بووە و وەک نێوەندێکی هاتووچۆ لە کەنارئاوەکانی دەریای مەدیترانە سەیری کراوە.

٢- دیمیترا، ئیلاهەی کشتوکاڵ و وەرزێری لە یۆنانی باستان.

٣- تێسمۆفۆرییا، ناوی ڕێورەسمێکی یۆنانییە کە بە ماوەی سێ ڕۆژ لە شارەکانی ئاتێن و بەندەری ئێلێفسینا بەڕێوەدەچوو. ئەو جێژنە بەبۆنەی ئیلاهە دیمیترا، خوای کشتوکاڵ و وەرزێری بووە. لەو جێژنەدا تەنیا ژنان بەشدارییان کردوە و بەرلە جێژن، بۆ ماوەی نۆ ڕۆژ ناچاربوونە گۆشەگیر بن و لە پیاوەکان دوور بکەونەوە. لە ڕۆژی هەوەڵی جێژن، ژنان لە ئاتێنەوە بەرەو ئێلێفسینا چوونە و ڕۆژی دووهەم مەشخەڵی ئاگریان هەڵگرتوە و بەدوای کچی ونبووی دیمیترادا گەڕاون.

٤- دانائۆس، برای ئێجیپتوس یا ئێژیپتوس بووە. بەپێی چیرۆکە ئەفسانەییەکانی کۆن، ناوبراو پاشایەتی بەشێک لە خاکی میسری کردوە. زاواکەی هەڕەشەی لێکردوە و ناچاربووە لە میسر ڕابکا و بچێتە هەرێمی ئارغۆس لە یۆنان. ئارغۆسییەکان ناوبراویان وەک پاشای خۆیان دیاریکردوە. سەبارەت بەو پاشایە لە سەردەمی ئەنتیکدا کۆمەڵێک چیرۆک هەن و ئۆمیرۆس یا هۆمێر لە شێعرەکانیدا باسی دەکا.

٥- پێلاسغی ناوی هۆزێکی گەلێک کۆنی سەردەمی پێش مێژوویە. ئەوانە لە وڵاتی یۆنان، ئاسیای بچووک، دورگەکانی ئیتالیا و خاکی ئیتالیادا ژیاون و خاوەن شارستانییەتی گەڕۆکی بوونە و

فێری بوونە. دواتر کاتێک ناوچەی پێلۆپۆنیسۆس لەلایەن دووری‌یەکانەوە داگیرکرا و گشت دانیشتووانی ئەو دەڤەرە ئاوارە بوون، ئەو بۆنەیەش کۆتایی پێهات. لە خەڵکانی دەڤەری پێلۆپۆنیسۆس، تەنیا ئارکادی‌یەکان[1] مانەوە و کۆچیان‌نەکرد و هەر ئەوانیش ئەو نەریتەیان پاراستووە.

[١٧٢] کاتێک ئاپریس دەسەڵاتی لەدەست چوو، ئاماسیس جێگای گرتەوە. ناوبراو خەڵکی شاری سیووف، سەر بە پارێزگای سای بوو. لە سەرەتای کاردا، میسرییەکان لێی دوورکەوتبوونەوە و هیچ حورمەتێکیان بۆ دانەدەنا، لەبەر ئەوەی پێشتر شارۆمەندێکی ئاسایی بوو و سەر بە بنەماڵەیەکی ناسراو نەبوو. ناوبراو دواتر بە رەفتاری نەرم هێدی‌هێدی جێگای خۆی لەنێو کۆمەڵگادا کردەوە. ئاماسیس خاوەن هەزاران ئەشیا بوو و یەکێک لەوانە تەشتێکی زێر بۆ قاچ شوشتن. ئاماسیس خۆی و میوانەکانی لەو تەشتەدا قاچەکانیان دەشوشت. رۆژێک ئەو تەشتەی تواندەوە و بە زێڕەکەی پەیکەرەی خوایەکی دروست کرد و لە باشترین شوێنی شار دایمەزراند. میسرییەکان بەردەوام لەو شوێنە کۆدەبوونەوە کە پەیکەرەکەی لێبوو و رێزیان دەگرت. وەختێک ئاماسیس ئاگادار بۆوە کە خەڵک چۆن لەگەڵ ئەو پەیکەرەیە هەڵسوکەوت دەکەن، بانگی میسرییەکانی کرد و پێی‌گووتن: "ئەو پەیکەرەیە لە تەشتی قاچ شوشتنی من دروستکراوە و بەر لەوەی بکرێتە پەیکەرە، ئێوە میسرییەکان خۆتان بەردەوام تێیدا رشاونەتەوە و میزتان تێکردوە، ئێستا چۆنە ئەوەندە قەدری چۆتە سەر! ". ناوبراو درێژەی بە قسەکانی‌دا و گووتی کە ژیان و رەوشی ئەویش وەک چارەنووسی ئەو تەشتە دەچێ. پێشتر شارۆمەندێکی ئاسایی بووە، بەڵام ئێستا پاشای وڵاتە.

---

هیچکات وەک نەتەوەیەکی یەکدەست ،یەکتریان نەگرتووە و یۆنانییەکان لە خاکی یۆنان دەریان‌کردون و بەشێکیان یەخسیرکراون. ئەو هۆزانەی لەوانەوە وەپاشکەوتوون بریتین لە تراکی، فریژی، لیدی، کاری، ئەتروسکی، ئاڵبانی و ئیتالیاییەکانی دانیشتووی دورگەکان.

١- ئارکادی، هەرێمێک لە یۆنانی باستان و لە نێوەندی نیمچە دورگەی پێلۆپۆنیسۆس و لەنێوان دەڤەری ئاخایی و ئارغۆس هەڵکەوتبوو. ئارکادییەکان پاشماوەی هۆزی پێلاسغی‌ین و لە کاتی هێرشی دووری یا دەرییەکان جوامێریان نواند و وڵاتی خۆیان بەجێ نەهێشت.

داوای لێکردن قەدری بزانن و حورمەتی بگرن. ئاماسیس بەو چەشنە میسرییەکانی قانیع کرد، بۆوەی دەسەڵاتداری ئەو پەسند بکەن.

[١٧٣] شێوازی حوکمڕانی ئاماسیس بەو چەشنە بوو: لە بەیانی سەحەرییەوە تا کاتی شلۆوقی بازاڕ، خەریکی کاروباری وڵاتداری خۆی دەبوو. دوای ئەوە بەڵام، مەی دەنۆشی و گاڵتەی بە کەسایەتییەکانی دەوروبەری خۆی دەکرد و خەریکی کایە و گەمە دەبوو. دۆستانی لێی قەڵس دەبوون و وەک مرۆڤێکی بێئاقڵ سەیریان دەکرد. پیاوانی دەوروبەری پێیان دەگوت: "پاشا، تۆ ئاگات لەخۆت نییە و کەوتوویەتە بارودۆخێکی پڕ لە ڕەزالەت، تۆ پێویستە بە ڕێز و حورمەتەوە لەسەر تەخت دانیشی و کات بەو چەشنە بەفیڕۆ نەدەی و خەریکی حوکمڕانی خۆت بی. ئەو کاتە میسرییەکان هەست دەکەن کە جەنابت پاشایەتیان دەکەی و وەک مرۆڤێکی بەوەج و پڕ قەدر ڕێزت لێدەگرن. ئێستا تۆ بە هیچ شێوەیەک وەک پاشا هەڵسوکەوت ناکەیت ". ئاماسیس وڵامی دانەوە: "مرۆڤ وەختێک پێویستی بە بەکار هێنانی کەوانە، زێیەکەی ڕادەکێشێ و کاتێک تیرەکەی هاویشت، ئەوسا شلی دەکاتەوە، چوونکە ئەگەر زێیەکە بەردەوام ڕاکێشراو بێت، ڕۆژێک دەپسێ و بۆ وەختی تەنگانە کەڵکی نامێنێ. مرۆڤیش بەو شێوەیەیە. ئەگەر قەرار بێ بەردەوام خەریکی کارکردن بێ و پشوودانی نەبێ و ژیان بەخۆشی ڕانەبوێرێ، لە کۆتاییدا یا شێت دەبێ یا تووشی وێرانی و ڕووخان دێت. من خۆم باشتر لە ئێوە ژیان هەڵدەسەنگێنم، بۆیە ڕۆژ و ڕۆژگارم بەسەر دوو شتدا دابەشکردوە ". ئەوە وڵامی ناوبراو بۆ خەڵکانی دەوروبەری بوو.

[١٧٤] دەگێڕنەوە کە ئاماسیس زۆری حەز لە مەینۆشی بوو و گاڵتەی بە کەسانی دەوروبەری خۆی کردوە و ئازاری داون و خاوەن هیچ کەسایەتییەکی جێگای ڕێز و حورمەت نەبووە. هەر کات شەڕابی لێبڕاوە، بێروبەوێدا خولاوەتەوە و دزی کردوە. بەردەوام بەوە تاوانبار کراوە کە کەلوپەل و ئەشیایتریشی دزیوە. ناوبراو قبوڵی تاوانەکانی نەکردوە و بۆیە بردویانەتە نێوەندەکانی پێشگۆیی. جاروبار پێشگۆییەکان ئاماسیسیان بە تاوانبار زانیوە و هێندێک کەڕەتیش

بەپێچەوانەوە بێ تاوان بووە. سەردەمی پاشایەتییەکەی بەو چەشنە هەڵسوکەوتی کردوە: ئەو کاهێنانەی ناوبراویان بەبێ تاوان زانیبوو، هیچ ڕێز و حورمەتێکی بۆ دانەناون و مەعبەدی ئەوانی بەلاوە گرینگ نەبووە و پارەی پێراگەیشتن و مەرەمەتی بۆ تەرخان نەکردون و تەنانەت قوربانیشی پێشکەش نەکردون، چونکە پێیوابووە ئەوانە هیچ نرخێکیان نییە و تەنیا خەریکی درۆکردن بوونە. بەڵام بە پێچەوانەوە، ئەو کۆمەڵە نێوەندەی ناوبراویان بە تاوانبار زانیوە، تەواو ئاگای لێیان‌بووە و باوەڕی پێکردون و پێیوابووە ئەوانە مەعبەدی خواکانی ڕاستەقینەن و پێشگۆیی و قەزاوەتیان درووستە.

[١٧٥] ئاماسیس بەرهەیوانی پەرستگەی ئاتینای چەشنی شاکارێک دروست کرد، هەم لەباری نما و ڕوخسارەوە، هەم لەمەڕ بەرزی بینایەکە. چوونکە لە گشت بیناکانی‌تر بەرزتر بوو. چۆنایەتیی گاشەبەردەکانی دەکارکراو، سرنج‌ڕاکێش بوو. کۆمەڵێک پەیکەرەی زەلام و زەبەلاحیان[١] بۆ بنیات‌نانی ئەو بەرهەیوانە هێنا کە شکل و ڕوخساری مرۆڤیان نیشان دەدا. بەشێک لە بەردەکان ڕاستەوخۆ لە کانزاکانەوە هێنرابوون کە لە دەڤەری مێمفیس هەڵکەوتوون. گاشەبەردەکانیش لە هەرێمی ئێلێ‌فاندینی‌را[٢] کە بیست ڕۆژە ڕێگا دەبوو و بە یارمەتی گەمییەکان بۆ شاری سای ڕاگوێزرابوون.

ئەوەی پتر سرنجی منی ڕاکێشا، ئەوە بوو کە ئاماسیس خانوویەکی داتاشراوی یەکپارچەی لە ناوچەی ئێلێ‌فاندینی‌ڕا گواستبۆوە ئێرە. ئەو کارە سێ ساڵی ڕێکی خایاندبوو و بە هەزاران کەس کاریان تێدا کرد و گشت کرێکارەکان سەر بە چینی کەشتیوانەکان بوون. ڕوخساری دەرەوەی ئەو

---

١- پەیکەرەی زەبەلاح یا ئەبولهۆل، بەو پەیکەرانە گووتراوە کە بەشێک لە لەشیان مرۆڤ و بەشی‌تریان ئاژەڵ بووە. ئەو پەیکەرانە لە یۆنان ناسراون بە سفینگا. ژمارەیەکی زۆر لەوانە لە وڵاتی میسر ماون و زۆربەیان بە ڕوخساری پیاو دروست کراون و کەم وابووە ژنانە بن. گەورەترینیان ئەو چەند پەیکەرەیەن کە لە تەنیشت ئەهرامی سێیانە و لە نیزیک قاهیرە بەرچاو دەکەون.

٢- ئێلێفاندین، ئاخر نوختەی سنووری میسر و سودان، ئەمڕۆ بە دورگەی ئەسوان ناسراوە و خاوەن کۆمەڵێک تاقگەیە.

خانوویه بیست و یەک پیخیس درێژایی و چوارده پیخیس بەرینایی و بەرزاییەکەشی هەشت پیخیسە. ئەوە ئەندازەی قەوارەی دەرەوەی ئەو خانووە بەردینە و یەکپارچەیە بوو. بەدیوی ژووریدا، درێژایی هۆدەکە هەژدە پیخیس و دوازدە قامک[1]، بەرینابیەکەی دە پیخیس و بەرزاییەکەشی دەگاتە پێنج پیخیس. ئەو بینا بەردینەیە لە نیزیک درگای ئەسڵی بەرهەیوانی پیرۆز داندراوە. بۆچی رانەکێشراوەتە نێو پەرستگە، دەگەڕێتەوە سەر ئەو هۆیە: کاتێک بەرەو ئەوێ رایان‌دەکێشا، ئەو کەسەی دروستی کردبوو و تاشیبووی، هەناسەیەکی هەڵکێشا و گووتی پاش ئەو هەموو زەحمەت و کوێرەوەریە، هەرهەمووی بەخۆڕایی چوو. ئەو قسەیە لە دڵی ئاماسیس گران هات و پێیوابوو نیشانەی خێری بەدواوە نایە، بۆیە لەجێوە فەرمانی‌دا، خانوەکە لەوە زیادتر رانەکێشن. کەسانی‌تر دەڵێن کە بۆیە لەوێ مایەوە، چونکە کاتی راگواستن یەکێک لە کرێکارەکان وەژێری کەوت و کوژرا.

[١٧٦] ئاماسیس کۆمەڵێکی زۆر بەرهەم و شاکاری بە نرخی پێشکەشی پەرستگەکان کرد. لەنێو ئەوانەدا پەیکەرەیەکی فیلەتەنی خەوتوو لە روبەرووی پەرستگەی ئیفێستیۆس[2] پتر سرنجڕاکێشە. درێژایی ئەو شاکارە دەگاتە حەفتاوپێنج پێ[3]. لەسەر هەمان بناخە، دوو پەیکەرەی زلی‌تر داتاشراو لە بەردی ئەتیۆپیایی بەبەژنی بیست پێ هەرکامیان، لەڕاستی درگای چوونەژووری پەرستگە داندراون. پەیکەرەیەکی قەبەی‌تری لەو چەشنە، لە شاری سای هەیە کە راکشاوە و چەشنی ئەوەی شاری مێمفیسە. ئاماسیس هەمان ئەو کەسە بوو کە پەرستگەی ئیسیدۆس لە شاری مێمفیس بە دروست کردن‌دا و شاکارێکی گەلێک جوانە.

[١٧٧] دەڵێن لە ماوەی فەرمانڕەوایی ئاماسیس‌دا، وڵاتی میسر رۆژانی پڕ لە بەختەوەرێ و خۆشی بەخۆوە بینی. رووباری نیل، ئەویش بەنۆرەی خۆی

---

١- قامک یا پەنجە، لە یۆنانی باستاندا بەرابەری ١٨ میلیمیتر بووە.

٢- ئیفێستیۆس، خوای ئاگر و ئاسن لە یۆنانی باستان.

٣- پێ، پێوانەی مەودا و بەرابەری ٢٦٩ میلیمیتر.

گەلێک رووحی بە خاک بەخشی و خاکیش مرۆڤەکانی زیندوو کردەوە و ژمارەی شارە ئاوەدانەکان گەیشتەنە بیست هەزار دانە. لە سەردەمی ئاماسیس‌دا ئەو یاسایە بەڕێوەچوو: هەر تاکێکی میسری لەسەری واجب کرابوو کە گشت ساڵێک وردەکاری ژیان و داهاتی خۆی بە پارێزگا رابگەیێنێ. ئەگەر ئەو کەسە پیلانی راستەقینەی داهاتی خۆی ئاشکرا نەکردبا، نەیتوانیبا سەرچاوەی داهاتەکەی روونبکاتەوە، سزای مەرگی بۆ دیاری‌دەکرا. سۆلۆن[1] ئەو قانوونەی میسرییەکانی فرە بەلاوە گرینگ بوو و بۆیە لە شاری ئاتێن هێنایە گۆڕێ و بەردەوام بەڕێوە چوو.

[١٧٨] ئاماسیس یۆنانییەکانی زۆر خۆش دەویست. خزمەتێکی زۆری پێکردن و شاری ناڤکراتیس[2] پێبەخشین و هەر یۆنانییەک گەرەکی بوایە لە وڵاتی میسر و لەو شوێنە دیاریکراوە نیشتەجێ بێ، هاسانکاری بۆ دەکرا. بۆ خەڵکی کەشتیوان کە گەرەکیان نەبوو ژیانی نیشتەجێی‌یان هەبێ، شوێنی تایبەتی بۆ دیاری‌کردن تا قوربانگا و پەرستگا دروست بکەن. ناسراوترین و گەورەترین پەرستگا کە خەڵک بە پڕانی هاتووچۆیان دەکرد، ناوی ئێلینۆ بوو. ئەو پەرستگەیە بە خەرجی هاوبەشی یۆنانییەکانی دانیشتووی ئەو جێگایانە بنیات‌نرا: دورگەی خییۆس، خەڵکی دەڤەرەکانی تێئۆ، فۆکێئا، کلازۆمینی، دووریەکانی نیشتەجێ لە دورگەکانی رۆدۆس، کیندۆس، ئالیکارناسۆ و فاسیلیدا، ئێئۆلی‌یەکان و میتیلینی‌یەکان. هەروەک گووتم ئەو پەرستگەیە لەلایەن ئەو خەڵکەوە دروست کراوە و هەر ئەوانیش بۆیان هەیە فەرمانبەرانی نێوەندی بازرگانی سەر بەو شوێنە دیاری‌بکەن. هەڵبەت کۆمەڵگای‌تریش هەن کە هەمان کاریان کردوە، بەڵام خاوەن مافی لەو چەشنە نین. خەڵکی ناوچەی ئێیێ‌نیتی بەتەنیا پەرستگەی دیا، دانیشتووانی

---

١- سۆلۆن، یاسانووسی ئاتێنی و یەک لە حەوت پیاوانی ماقوڵ و زانای یۆنانی باستان کە ٦ سەدە بەر لە میلاد ژیاوە، واتە لەنێوان ساڵەکانی ٦٤٠ تا ٥٥٨ی پێش زایین. ناوبراو دنیا بە مەبەستی گەڕان و سیاحەت گەڕا.

٢- ناڤکراتیس، شارێک لە رۆژئاوای لکێکی روباری نیل کە بە شاری کانوپدا دەرباز دەبوو و لەنیزیک تەلنەبیرە هەڵکەوتووە.

دورگەی سامۆس پەرستگەی ئیراس، میلیسی‌یەکان پەرستگەی ئاپۆلۆن‌یان بیناکردوە.

[١٧٩] زەمانی زوو شاری ناڤکراتیس تەنیا نێوەندی بازرگانی وڵاتی میسر بوو. ئەگەر کەسێک گەیشتبایە یەکێک لە سەرچاوەکانی رووباری نیل، دەبوایە سوێند بخوا کە دڵخواز نەچووەتە ئەوێ. دوای ئەو سوێندە بۆی هەبوو روو لە گەڵی کانۆڤیکۆ بکا، ئەگەر ئەو کارەشی بۆ نەکرابا و لەبەر با و تۆفان رێگای بۆ نەبڕابا، ناچار بوو بارەکەی بە قایقان بگوێزێتەوە و دەوری هەرێمی دێلتا بدا تا دەگەیشتە ناوچەی ناڤکراتیس. ئەوە لەجێی خۆیدا ئیمتیاز و مافێکی تایبەت بوو کە بەو شارە درابوو.

[١٨٠] وەختێک پەرستگەی قەدیمی دێلفوس ئاگری تێکەوت و وێران بوو، ئامفیکتیۆنەکان[1] بڕیاریاندا دووبارە دروستی بکەنەوە. ئەو پەرستگەیە ئێستاش لە دێلفوس ماوە، خەرجێکی نیزیک بە سێسەد تالاندی تێچووە. هەڵبەت دانیشتووانی دەڤەری دێلفوس لەسەریان بوو کە یەک لە سێی ئەو مەخاریجە دابین بکەن. خەڵک لەڕووی ناچاری شار بە شار دەگەڕان بۆوەی ئەو پارەیە کۆبکەنەوە و بەشی هەرە زۆریان لە وڵاتی میسر دەستکەوت. ئاماسیس بەتەنیا هەزار تالاندی[2] خەڵات کردن و یۆنانییەکانی دانیشتووی میسریش بیست (منا)یان[3] دا.

[١٨١] ئاماسیس پەیمانی دۆستایەتی و هاوکاری لەگەڵ خەڵکی کیرینێئا[4] مۆرکرد. ناوبراو گەرەکی بوو ژنێک لەو هۆزە بێنێ. لەبەر ئەوەی حەزی لە ئافرەتی یۆنانی

---

١- ئامفیکتیۆن، پەیمانی ئایینی لەنێوان یۆنانییەکانی باستان، پێکهاتوو لە چەند شاری دراوسێ. ناسراوترین ئامفیکتیۆن کە شێوەی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانی ئایینی دەدا، بەهۆی شارەکانی ئاتێن و ئارغۆس و مێغارۆس دامەزرابوو. لەوە ناسراوتر، ئامفیکتیۆنی نوێنەرانی ئایینی دوازدە شار لە نێوەندی ئایینی دێلفوس بوو کە چەشنێک پارلەمانی ئایینی پێکهێنابوو.

٢- تالاندی یۆنانی ٢٦ کیلۆگرەم، میسری ٢٧ کیلۆگرەم، بابیلی ٣٠.٣ کیلۆگرەم و رۆمی ٣٢.٣٠ کیلۆگرەم بووە.

٣- منا، پێوانەی قورسایی و بەرابەری یەک لە شەشی تالاند.

٤- کیرینێئا، موهاجیرنشینێک کە پێتەختی کیرینی‌یەکان بووە لە ساڵی ٦٣٠ پێش میلاد بەدەست یۆنانییەکان لە کەنارئاوەکانی دەریای مەدیترانە دروستکرا و نێوەندی بازرگانی و بەحرەوانی و

بوو، یا رەنگە بە مەبەستی پتەوکردنی دۆستایەتی لەگەڵ کیرینیییەکان بووە، کچێکی بەناوی لادیکی لەخۆ مارەکردووە. هێندێک کەس دەڵێن ئەو خاتوونە کچی ڤاتۆس[1] بوو و خەڵکانێکیش لەو باوەڕەدان کە کچی ئارکێسیلا و بەبۆچوونی جەماوەریتر دەبێ کچی کریتۆڤولۆس بووبێ. کریتۆڤولۆس کابرایەکی ناوبەدەرەوە و ناسراو بوو. هەرکات ئاماسیس تخوونی خاتوو لادیکی کەوتووە، نەیتوانیوە کارێکی ئەوتۆی لەگەڵدا بکا و بەناچاری ڕووی لە ژنەکانیتر کردوە. لەبەر ئەوەی ئەو بارودۆخە زۆری خایاند، ئاماسیس بە لادیکی گووت: "ئافرەت، تۆ جادووت لە من کردوە و دڵنیا بە ڕۆژێک دادێ و تۆ زۆر بە خەراپی تێدادەچی، بەچەشنێک کە هیچ ژنێکیتر تووشی ئەوها چارەنووسێک نەهاتبێ". لادیکی لە وڵامدا گوتوویەتی کە ئەو خەتابار نییە و ئاماسیس باوەڕی پێنەدەکرد. ڕۆژێکیان لادیکی چووەتە لای خواوەند ئەفرۆدیت و پاڕاوەتەوە و نەزری کردوە، بۆوەی ئەو شەوە بتوانێ تێکەڵاوی جینسی لەگەڵ ئاماسیس بکات و بەدەست جادوو و دێخوون بەستن ڕزگاری بێ. ئەو هەروەها بەڵێنیداوە پەیکەرەیەک پێشکەش بە پەرستگەی کیرینی بکا. پاڕانەوە و نەزرەکە کاری خۆیان کرد و ئاماسیس لەو شەوەدا بەردەوام نیزیکایەتی لەگەڵ خاتوو لادیکی کرد و حەز و ئەوینی گەشەی سەند. لادیکی بەڵێنەکەی بردە سەر و پەیکەرەیەکی پێشکەش بە خواوەند ئەفرۆدیت کرد. ناوبراو ئەو پەیکەرەیەی ناردە پەرستگەی کیرینی و تا ئێستاش لەوێ ماوە و لە دەرەوەی شاری کیرینی هەڵکەوتووە. کاتێک کامبیز وڵاتی میسری داگیرکرد، لە چارەنووس و بەسەرهاتی لادیکی ئاگادار بۆوە، ئەو خاتوونەی ئازاد کرد و ناردیەوە شاری کیرینی.

[۱۸۲] ئاماسیس گەلێک بەرهەم و شاکاری بە وڵاتی یۆنان بەخشی. لە کیرینی پەیکەرەیەکی زێڕکراوی خواوەند ئاتینا[2] کە وێنە و ژیاننامەی ئەوی

---

حەریفی کارتاژ لە دەریای مەدیترانە بوو. ئەمڕۆ وێرانەکانی پاشماوەی ئەو شارە لە پازدە کیلۆمیتری دەریای مەدیترانە بەرچاو دەکەون.

١- ڤاتۆس، دەبێ ئەو پاشایە بووبێ کە لە ساڵی ٥٧٤ی پێش زایین لە کیرینیێدا بەدەسەڵات گەیشتووە و هەمان کەسە کە لەشکری ئاپریسی شکستدا و ڕێگای بۆ گۆڕینی خانەدانی پاشایەتی میسر خۆشکرد.

٢- ئاتینا، ئیلاهەی بیر و ئەندیشە لە یۆنانی باستان و پارێزەری شاری ئاتێن بووە.

لەسەرهەڵکەندراوە، بەرچاو دەکەوێ. هەروەها لە شاری ليندۆس[1] و لە پەرستگەی ئاتينا، دوو پەيکەرەی بەردينەی ئەو خوايە، هەروەها زرێيەکی کەتانی دەبيندرێن. لە دورگەی سامۆس[2] و لە مەعبەدی ئيراس[3]، دوو کەتيبەی دار هەن کە ژياننامە و وێنەی ئاماسيس‌يان لەسەر هەڵکەندراوە. ئاماسيس بۆيە خەڵاتی زۆری پێشکەش بە دورگەی سامۆس کردوە، چونکە دۆستايەتی گەرمی لەگەڵ پۆليکراتيس[4]، کوڕی ئاياکيس هەبووە. خەڵاتەکانی کە بە مەعبەدەکانی ليندۆس کراون، لەبەر دۆستايەتی نەبوونە. بەپێی نەريت، پەرستگەی ئاتينا لەو شوێنە بەدەست کچانی دانۆس دروستکرا، راست ئەوکاتەی پێيان گەيشتە سەر خاکی دورگەکە. کچانی دانۆس، لەدەست کوڕەکانی ميسر (ئێجيپتۆس يا ئێژيپتۆس) رايانکردبوو.

ئەوە باسی خەڵاتەکانی ئاماسيس بوو. ناوبراو يەکەم پاشای ميسری بوو کە دورگەی قيبريسی گرت و خەڵکەکەی ناچار بە دانی ماڵيات کرد.

---

١- ليندۆس، يەک لە شارەکانی يۆنانی باستان، هەڵکەوتوو لە باشووری رۆژهەڵاتی دورگەی رۆدۆس.

٢- سامۆس دورگەيەکی يۆنانی لە دەريای ئێژە و لە بەرامبەری چيای ميکالی لە کەنارئاوەکانی رۆژئاوای ئاسيای بچووکە.

٣- ئيرا، ئيراس ژنی ژوپيتێر و ئيلاهەی زەماوەند و زەوجين لە يۆنانی باستان بووە.

٤- پۆليکراتيس، حاکمی سەربەخۆی دورگەی سامۆس کە ساڵی ٥٣٢ بەدەسەڵات گەيشت. ماوەيەک لەگەڵ ئاماسيسی پاشای ميسری رێککەوت. کاتێک کەمبوجييە يا کامبيز شەڕی ئاماسيسی کرد، ئەويش لەگەڵ کامبيز پێکهات و ٤٠ گەمی جەنگی بۆ نارد. ساڵی ٥٢٢ی پێش زايين بەدەستی يەکێک لە ساتراپەکان کوژرا.

# کتێبی سێهەم

## تالیا، خواوەندی کۆمێدیا

### لەشکرکێشی کامبیز (کەمبوجییە) دژی وڵاتی میسر

[١] کامبیزی کوڕی کوروش دژی فەرمانڕەوایی ئاماسیس[١] لەشکرکێشی کرد و جیا لە گەلانی ژێردەستی خۆی کۆمەڵێک شەڕکەری یۆنانی، یوونی[٢] و ئێئۆلیشی[٣] هێنابوو. قەومانی ئەو شەڕە دەگەڕایەوە بۆسەر ئەو کۆمەڵە هۆیە: کامبیز راسپاردەی ناردە لای ئاماسیس و داوای کچی ناوبراوی کرد. دیارە کامبیز ئەو کارەی لەسەر پێشنیاری کابرایەکی میسری هێناگۆڕێ. ئەو کابرایە دوژمنایەتی لەگەڵ ئاماسیس هەبوو و گەرەکی بوو بەو شێوەیە تۆڵەی لێبستێنێتەوە. کاتێک کوروش داوای لە ئاماسیس کردبوو، باشترین دوکتوری چاوی وڵاتی میسری بۆ بنێرێ، ئاماسیس ئەو کابرایەی لە ژن و

---

١- ئاماسیس، پاشای میسر لە ساڵی ٥٧٠وە تا ساڵی ٥٢٦ی پێش‌زایین و هاوسەردەمی کوروش و کەمبوجییە.

٢- یوونی، هەرێمێک لە ئاسیای بچووکی سەردەمی باستان، لەنێوان کەنداوی ئەزمیری ئەمڕۆ و کەنداوی مێندێلیا هەڵکەوتبوو و لە سەراسەری خاکەکەیدا کۆچبەرانی یۆنانی نیشتەجێ بوونە. شارەکانی گەورەی ئەو هەرێمە بریتی بوونە لە میلیتۆس، ئێفێسۆس، کۆلۆفۆن، فۆسێ و خییۆ.

٣- ئێئۆلی، ناوی یەکێک لە هەرێمە کۆنەکانی ئاسیای بچووکە و لە دراوسێیەتی هەرێمی یوونی بووە. دانیشتووانی ئێرە بە هەمان ناو واتە ئێئۆلی دەناسران. سەرەتا لە وڵاتی یۆنان ژیاون، بەڵام دواتر بەهۆی هێرشی دووری‌یەکان، بەرەو ئاسیای بچووک کۆچیان کردوە و لەو شوێنە نیشتەجێ بوونە کە ناوی نراوە ئێئۆلی.

منالّی جیا کردەوە و دایە دەست راسپاردەکانی پارس. هەر بە هۆی ئەو کردەوەیەی ئاماسیس، کابرای دوکتوری چاو بە کامبیزی گووت کە کچی ئاماسیس داوا بکا. ئەو بەو لێکدانەوەیە کە ئەگەر ئاماسیس کچەکەی بداتە کامبیز ئابڕو و حەیای خۆی دەبا، ئەگەریش ئەو خواستە جێبەجێ نەکا، پاشا رقوکین لە ئاماسیس هەڵدەگرێ. ئاماسیس دوژمنایەتی پارسەکانی دەکرد، بەڵام لێیان دەترسا. ناوبراو بڕیاریدا نە کچەی بدا و نە وڵامی نەرێنی بداتەوە. ئەو دەیزانی کە کامبیز کچەکەی ئەوی بۆ هاوسەرێتی ناوێ، بەڵکوو گەرەکییەتی چەشنی مەعشوقە کەڵکی لێوەرگرێ. هەر بەپێی ئەو لێکدانەوەیە، بەو شێوەیە جوڵایەوە: کچی پاشای پێش خۆی واتە کچی ئاپریس مابوو، تەنیا کچی ئەو بنەماڵەیە بوو، باڵابەژن و جوان و ناسراو بە نیتیتیس. ئاماسیس ئەو ئافرەتەی وەک کچی خۆی بە زێڕ و جلوبەرگی جوان رازاندەوە و بۆ پاشای پارسی نارد. ماوەیەکی کورت دوای ئەو کارە، کامبیز ئەو کیژەی بەنێوی کچی ئاماسیس بەخێرهاتن کرد. کچە لە وڵامدا گووتی: "پاشاکەم، وادیارە نازانی کە ئاماسیس دەسخەرۆی کردووی، منی رازاندوەتەوە و بۆ تۆی ناردوم، وەک ئەوەی کچە تاقانەی ئەو بم، لە حاڵێکدا من کچی ئاپریسم[١]، ئەو کەسەی پاشای ئاماسیس بوو، بەڵام ناوبراو بە پشتیوانی میسرییەکان سەرهەڵدانی سازکرد و باوکمی لەسەر تەخت لابرد و دواتر کوشتی ".

دوای ئەو قسانە دوژمنایەتی و رقوکین دڵی کامبیزیان داگرت و گەلێک تامەزرۆی داگیرکردنی وڵاتی میسر بوو. هەڵبەت ئەوە قسەی پارسەکانە.

**[٢]** میسرییەکان بەپێچەوانەوە، کامبیز بە میسری دەزانن. ئەوان دەڵێن ناوبراو کوڕی ئەو کچە تاقانەیەی ئاپریس بووە و لەڕاستیدا کوروش داوای کچی ئاماسیسی کردوە، نەک کامبیز. هەڵبەت ئەو زانیارییانە راست نین و میسرییەکان خۆیشیان ئەوە دەزانن، چونکە ئەگەر خەڵکانێک هەبن و بە دابونەریتی پارسەکان ئاشنابن، میسرییەکانیش یەک لەوانن. میسرییەکان دەزانن

---

١- ئاپریس کوڕی پسامیتیخۆسی دووهەم و پاشای میسر لەنێوان ساڵەکانی ٥٩٣ تا ٥٦٩ی پێش میلاد. ئەو پاشایە لە ساڵی ٥٦٩دا بەدەست ئاماسیس لەسەر دەسەلات لاچوو.

که لەنێو پارسەکاندا ڕێگا بە منالّی حەرامزادە نادرێ ببێتە پاشا، هەڵبەت ئەگەر باس لە نژاد و ڕەگەزی ئەسڵ لەگۆڕێدا بێ، دووهەم: کامبیز کوڕی خاتوو کساندان[1] و فارناسپی[2] هیخامەنیشی‌یە، نەک کوڕی ژنێکی میسری.

شێواندنی ڕەوتی ڕووداوەکان بەو چەشنە، تەنیا بەمەبەستی دروست کردنی خزمایەتی میسرییەکان لەگەڵ بنەماڵەی کوروشە. ئەوە چەند زانیارییەکی من لەمەر ڕووداوەکان بوو.

[٣] دیارە بۆچوونێکی‌تریش لەو بارەوە هەیە کە بەلای منەوە، ئیمکانی نییە ڕاست بێ: ئافرەتێکی پارس بە مەبەستی دیدار چووەتە لای ژنەکانی کوروش. لەوێ چاوی بە کۆمەڵێک منالّی جوان و بالاّبەرز و بەخۆوە لە دەوری کساندان کەوتووە. ئەو ژنە لەجێوە دەستی بە تاریف کردن لەو منالاّنە کردوە و پێی هەلاّگوتوون. ئەو کاتە کساندان ژنی کوروش بووە و لە وەلاّمدا گوتوویەتی: "لە حالێکدا کە من دایکی ئەو منالە جوانانەم، کوروش لەجیاتی من، پتر ڕێز لە ژنە میسرییەکەی دەگرێ کە تازە هێناویەتی ". کساندان لێرە دژایەتی خۆی بەو چەشنە لەهەمبەر خاتوو نیتیتیسی میسری دەردەبڕێ. گۆیا کامبیز کوڕە گەورەی کساندان وەجواب هاتووە و بە دایکی خۆی گوتووە: "هەرکە گەورە بم و ببم بە پیاو، بەلێن بێ ولاّتی میسر وێران بکەم ". کامبیز دەبێ پازدە سالاّن بووبێ کە ئەو قسانەی کردوە و ژنەکانیش خەریکی قسەوقسەلۆک بوونە. بەهەرحاڵ کامبیز بەلێنی خۆی لەبیر مابوو و کاتێک گەورە بوو و لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت، لەشکری بۆسەر ولاّتی میسر ئامادەکرد.

[٤] هۆیەکی‌تریش بووەتە مایەی بە ئەنجام گەیشتنی ئەو لەشکرکێشی‌یە. لەنێو شەڕکەرانی بەکرێگیراوی ئاماسیس‌دا کابرایەک بەناوی فانیس- خەڵکی دەڤەری ئالیکارناسۆس هەبوو کە لەشەڕدا گەلێک جوامێر و بەغیرەت بوو. ئەو کابرایە دوژمنایەتی ئاماسیسی دەکرد. لە ولاّتی میسر بەڕێگای دەریادا هەلاّت و دەیەویست خۆی بگەیێنێتە لای کامبیز و لەگەڵی ڕێک کەوێ. لەبەر

---

١- کساندان، ژنی کوروش و دایکی کەمبوجیە.

٢- فارناسپ باوکی کساندان و خەزووری کوروش.

ئەوەی یەکێک لە باشترین و بەوەجترین فەرماندەرانی نیزامی بەکرێگیراوی ئاماسیس بوو، زانیاری زۆری لەمەر وڵاتی میسر هەبوو. ئاماسیس فەرمانیدا خێرا وەدوای بکەون و بیگرن و بۆ ئەو کارەش باوەڕپێکراوترین پیاوی خۆی کە خواجەی حەرەمسراکەی بوو، بە گەمی وەدوای فانیس خست. ئەو کابرایە و پیاوانی ژێردەستی، فانیسی راکردوویان لە دەڤەری کیلیکیا[1] دۆزییەوە و گرتیان. بەڵام نەیانتوانی بیهێنێتەوە وڵاتی میسر، چونکە فانیس وریا و زیرەک بوو و پاسەوانەکانی سەرخۆش و مەست کرد و خێرا بۆی دەرچوو و گەیشتە پێرسیا (وڵاتی پارسەکان). لەو کاتەدا کامبیز لەشکری بۆ هێرشبردنەسەر وڵاتی میسر ئامادە دەکرد و بیری لەوە دەکردەوە کە چۆن بە بیابانی بێ ئاودا دەرباز بێ. فانیس گەیشتە جێ و لەو بارەوە زانیاری پێویستی دایە دەست کامبیز. رێنوێنی کردن کە چۆن رێگا ببڕن و پێشنیاری کرد کە کامبیز داوا لە پاشای عەرەبەکان بکا، ئیزنی پێبدەن بە خاکی ئەواندا، بەبێ گیروگرفت دەرباز بێ.

[٥] کامبیز تەنیا بەوێدا دەیتوانی راستەوخۆ پەلاماری وڵاتی میسر بدا. چونکە بە رێگای فینیقییەدا تا سنوورەکانی شاری کادیتی[2]، خاکەکەی سەر بە سوری‌یەکان بوو و پێیدەگووترا فەلەستین. شاری کادیتی بەباوەڕی من بچووکتر لە شاری سارد نییە. لەوێرا کەنار دەریا و نێوەندەکانی بازرگانی، تا دەگەیشتنە شاری ئی‌ئینیسۆ، گشتی بەدەست عەرەبەکانەوە بوو. دوای شاری ئی‌ئینیسۆ، دووبارە دەبێتەوە خاکی سوری‌یەکان تا گۆلی سێرڤۆنیدا[3]. لەو شوێنەوە ریزە چیاکانی کاسیۆ[4] دەست پێدەکەن و دەگەنە سەر دەریا.

---

١- کیلیکیا یا لیسی یەکێک لە هەرێمەکانی کۆنی ئاسیای بچووک لە باشووری رۆژئاوای ئەو نیمچە دورگەیە و لە کەنارەکانی مەدیترانە و دەریای ئێژە، هەڵکەوتوو لەنێوان دەڤەری کاری و پامفیلی.

٢- کادیتی یا غەزە، شارێکی یەهوودی لە کەنارئاوەکانی فەلەستین و لە ٩٠ کیلۆمیتری بەیتولموقەدەس.

٣- ناوی ئەو گۆلە لە زۆربەی سەرچاوەکاندا هاتووە، بەڵام دواتر ویشک هەڵگەڕاوە و ئاسەواری نەماوە.

٤- چیای کاسیۆ لە نیزیک شاری قەدیمی پلوز هەڵکەوتووە. هەڵبەت کێوێکیش هەر بەو ناوە لە سووریە هەیە بە ریزەچیای لوبنان لکاوە. حدودی کۆنی میسر و سەحرای سینا و ئەمڕۆ ناسراوە بە رەئسولقسرون.

لە گۆلی (سێرڤۆنیدا)وە، ئەو جێگایەی بەپێی هێندێک ڕەوایەت، خواوەند تیفۆن[1] خۆی لێ شاردۆتەوە، خاکی وڵاتی میسر دەست پێدەکات. پانتایی نێوان شاری ئیئینیسۆ و چیای کاسیۆ و گۆلی سێرڤۆنیدا، قەیاسێک زۆرە و سێ ڕۆژ ڕێگایە و شوێنێکی گەلێک ویشک و بێ ئاوە.

[٦] لێرەدا بە پێویستی دەزانم باسی ئەو زانیارییانەش بکەم کە ئەو چەند کەسەی بە ڕێگای دەریادا چوونەتە وڵاتی میسر و بۆیان گێڕاومەتەوە. لە سەراسەری خاکی یۆنان و هەروەها لە وڵاتی فینیقییەوە، هەرچەند ساڵێ دوو جار، خومرە و گۆزەی زلی پڕ لە شەڕاب دەهێنرێنە وڵاتی میسر، بەڵام لەو وڵاتە، بەپێی یاسا، گۆزە و خومرەی بەتاڵ بەرچاو ناکەوێ. پیاو بەڕاستی بۆی جێگای پرسیارە کە ئەو گشتە گۆزە و خومرەیە چیان بەسەر دێ. هەڵبەت وڵامی ئەو پرسیارە دەدەمەوە. لە هەر شارێک، شارەدار تەواوی گۆزە و خومرە بەتاڵەکان کۆدەکاتەوە و دەیاننێرێتە شاری مێمفیس. دانیشتووانی ئەو شارە، قازانجیان لەوەدایە کە گۆزەکان پڕ لەو ئاو بکەن و بیانبەنە ناوچە بێئاوەکانی وڵاتی سوریا. بەو چەشنە ئەو گۆزە و خومرە بەتاڵانە بە پڕئاوی بۆلای گۆزەکانی قەدیمی برادەریان بەڕێدەکرێنە وڵاتی سوریا.

[٧] لەڕاستیدا پارسەکان ئەو ڕێگایەیان بەرەو میسر کردەوە. میسرییەکان بە ڕێکخستنی بازرگانی گۆزەی پڕئاو، حوکمڕانی جاددەکەیان خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیان. لەبەر ئەوەی ئەو سەردەمە دابینکردنی ئاو بە چەشنێکی سازماندراو لەگۆڕێدا نەبوو، کامبیز پێشنیاری کابرای خەڵکی ئالیکارناسۆی پەسند کرد و وەفدێکی ناردە لای پاشای عەرەبەکان و داوای دەربازبوون بە خاکی ناوبراویدا کرد و لەو کارەشدا سەرکەوتوو بوو. کامبیز و پاشای عەرەبەکان لە کۆتاییدا سوێندیان بۆ یەکتر خوارد.

[٨] لەنێو تەواوی گەلاندا، عەرەبەکان پتر ڕێز بۆ سوێند و بەڵێنەکانیان دادەنێن و بەو شێوەیە سوێند دەخۆن: لە مابەینی ئەو دوو کەسەی قەرارە سوێند بخۆن، کەسی سێهەم ڕادەوەستێ. ئەو کەسە بە بەردی تیژ بەری

---

١- تیفۆناس، خوای تاریکی و ناشرینییەکان، خوای کێشە و ناحەزییەکان.

دەستی هەردوو لایەن، لە نیزیک قامکی گەورە، بریندار دەکا. ئەوجار نەختێک خوری جلوبەرگی هەرکامیان لێدەکاتەوە و لە خوێنی ئەوانەی وەردەدات و حەوت بەردی دامەزراو لەبەر پێی سوێندخۆرەکان سوورهەڵدەگێڕێ و هاوکات ناوی خواوەندەکان، دیۆنیسۆس[1] و ئورانییا[2] دێنێ و دەپاڕێتەوە و دوعا دەکا. دوای تەواو بوونی دوعاکان، ئەوجار ئەو کەسەی سوێندی خواردوە، دۆستەکانی خۆی وەک زامن بە لایەنی بەرامبەر دەناسێنێ. گرینگ نییە ئەو لایەنە هاوڵاتی یا بێگانە بێ. ناوبراو باوەڕی تەواوی بە دۆستانی نیزیکی خۆی هەیە کە بەڵێنەکان جێبەجێ دەکەن و وەک ئەو بەرعۆدەی سوێندەکە دەبن. لەو نێوەدا دۆستانی کابرای سوێند خواردووش بە هەمان شێوە هەست بە بەرپرسایەتی لەمەر بەڵێن و سوێندەکە دەکەن.

عەرەبەکان لەو باوەڕەدان کە تەنیا دیۆنیسۆس و ئورانییا خوای راستەقینەن و بۆیە قژی سەریان چەشنی خواوەند دیۆنیسۆس کورت دەکەنەوە. ئەوانە لاجایینگ و پشت سەریان بەتەواوی دەتاشن. عەرەبەکان خواوەند دیۆنیسۆس وەک ئۆرۆتاڵت[3]، خواوەند ئورانییا وەک ئالیلات[4] ناو دەبەن (دیۆنیسۆس و ئورانییا، ناوی یۆنانین).

**[٩]** پاش ئەوەی پاشای عەرەبەکان بەڵێنی بە وەفدی کامبیزدا، بەو چەشنە جوڵایەوە: مەشکە چەرمیە دروستکراوەکان لە پێستی وشتری پڕ لە ئاو کردن و بە سواری کاروانی وشتران هێنانی بۆ ناوچە ویشکارۆیەکە و لەوێ چاوەڕوانی لەشکی کامبیز بوو. ئەوە تەنیا شتێک بوو کە ئیمکانی جێبەجێ بوونی هەبوو، بەڵام من باسی ئەوەش دەکەم کە ئەگەری کەمتری بووە، چونکە دەگێڕنەوە: لە

---

١- دیۆنیسۆس یا ڤاکخۆس، خوای شەراب و عەشق لە یۆنانی باستاندا.

٢- ئورانییا، یەکێک لە حەوت نیوە خواکان و وێنای زانستی ئەستێرە ناسی لە سەردەمی باستاندا. ئەو ئیلاهەیە فیستانی رەنگ ئاسمانی پۆشیوە و تاجێکی پڕ ئەستێرەی لەسەرناوە و بەچەشنێک خۆی دەنوێنێ کە بیچمی زەوی لە دەستێکیدا و کەرستە و ئامرازی ماتماتیک و حیسابیش لە دەستی‌تردا.

٣- ئۆرۆتاڵت، مانای خۆر و روناکی دەدا.

٤- ئالیلات، وێنا و مەزهەری نوور و روناکی بووە.

عەرەبستان چۆمێکی گەورە هەیە و پێیدەگووترێ کریس. ئەو چۆمە دەڕژێتە نێو دەریای ئێریترە[1]. دەڵێن پاشای عەرەبەکان لە کەوڵی نەتاشراو و خاوێن نەکراوی کەڵ و گا، بۆری ئاوی سازکرد و گشت کەوڵەکان لێک دوورابوون. ناوبراو بەو چەشنە ئاوی لە چۆمەوە راکێشا شوێنی مەبەست کە ویشکارۆ بوو. لەو شوێنە ویشکە، حەمبارێکی دروست کرد و ئاوی تێکرد. لە چۆمی گۆرینەوە تا جێگای حەمبارئاوەکان، دوازدە رۆژی سەفەرییە. ناوبراو بە سێ بۆری چەرم، ئاوی بۆ سێ شوێنی جیاواز راکێشا.

[١٠] پسامینیتۆس،[2] کوڕی ئاماسیس[3]، لە شوێنێک بەناوی پیلۆسیۆ کە سەرچاوەی ئاویی رووباری نیلە، مۆڵگەی دامەزراند و چاوەڕوانی هاتنی لەشکری کامبیزی کرد. ئەو کاتەی کامبیز لەشکری کێشایە سەر وڵاتی میسر، ئاماسیس لە ژیاندا نەمابوو. ئاماسیس دوای چل و چوار ساڵ پاشایەتی کردن، مرد. لەو ماوەیەدا هیچ رووداوێکی ئەوتۆ نەقەوما و خۆیشی کردەیەکی جێگای باسی بەئەنجام نەگەیاند. دوای مەرگی ناوبراو، جەنازەکەی مۆمیایی کرا و بەپێی وەسییەت لە حەساری پیرۆزی پەرستگەی ئاتینادا[4] نێژرا.

---

١- ئێریترە، ناوێکە کە یۆنانییەکانی سەردەمی باستان بۆ ئەقیانووسی هیندیان داناوە. ئەوان دواتر لەجیات ئەو ئەقیانووسە بە دەریای ئەحمەریان گوتووە دەریای ئێریترە. دیارە ئەوەش بگووترێ کە ئێستا هیچ روبارێک لە عەرەبستانەوە نارژێتە نێو دەریای ئێریترە.

٢- پسامینیتۆس، پاشای میسر لەنێوان ساڵەکانی ٥٢٦ تا ٥٢٦ی پێش میلاد، لە شەڕی پیلۆسیۆ شکستی خوارد و بەدەست پارسەکانەوە یەخسیر کرا و کەمبوجیە بردیە شاری شووش و دواتر بەتاوانی پیلانگێڕی کوشتی.

٣- ئاماسیس، پاشای میسر لە ساڵی ٥٧٠وە تا ساڵی ٥٢٦ی پێش‌زایین و هاوسەردەمی کوروش و کەمبوجییە.

٤- ئاتینا، ئیلاهەی یۆنانی کۆن، لە زمانی رۆمیدا پێیدەگووترێ مینێروا، کچی خواوەند دیا و خوای هزر و هونەرە جوانەکان.

له سەردەمی حوکمڕانی پسامینیتۆس، واتە کوڕی ئاماسیس‌دا، ڕووداوێک قەوما کە بەباوەڕی میسرییەکان موعجیزە بوو. لە ناوچەی تیڤا[1] باران باری، لەو شوێنە قەت باران نەباریبوو، دیارە تا زەمانی منیش، بارانێک لەگۆڕێدا نەبوو. وەک دانیشتووانی تیڤایی بۆیان باسکردم، لەڕاستیدا، هیچکات لە میسری ژوروو باران نەباریوە، بەڵام ئەو وەختە لە دەڤەری تیڤا نمەنمەی باران وڵاتی تەڕکردبوو.

[١١] کاتێک پارسییەکان ناوچەی ویشکارۆیان دەربازکرد، لەنیزیک مۆڵگەی میسرییەکان بە مەبەستی دەسپێکردنی شەڕ ئۆردویان لێدا. لەشکری شەڕکەرە بەکرێگیراوەکانی پاشای میسر لە یۆنانی و کاریەکان[2] پێکهاتبوو. ئەوانە لە داخی فانیس کە ببووە هۆی هەڵگیرسانی ئەو شەڕە و هێنانی لەشکری بێگانە بۆسەر وڵاتی میسر، خێرا وەخۆکەوتن. فانیس کاتی هەڵاتن، منداڵەکانی خۆی لە میسر بەجێ هێشتبوو. شەڕکەرانی میسری ئەو کۆشە منداڵانەیان هێنا بەرەی شەڕ و لەو شوێنەیان دانان کە لە باوکیانەوە دیار بوون. لەنێوان دوو لەشکردا دەفرێکی گڵێنەی گەورەیان دانا. ئەوجار یەکیەک منداڵەکانیان هێنا و لەبەر چاوی باوکیان، سەریان بڕین. خوێنی ئەو منداڵانە دەچۆڕایەوە نێو دەفرەکە و پاشان ئاو و شارابیشیان لەباڵ کرد. لەشکری میسری لەو خوێناوەیان خواردەوە و پەلاماریان دەست پێکرد. شەڕێکی قورس و خوێناوی بوو. ژمارەیەکی زۆر لە هەردوو لایەن کوژران. لە کۆتاییدا میسرییەکان تووشی شکست هاتن.

[١٢] من لە گۆڕەپانی شەڕەکەدا چاوم بە شتێکی سرنج ڕاکێش کەوت و خەڵکی ناوچەکە بۆیان باسکردم. ئێسک و پروسکی ئەو کەسانەی لەو

---

١- تیڤا، شارێکی میسری باستان، بەهۆی کادمۆس بنیات‌نرا، گەورەترین شاری ئەو سەردەمە و بە سەد دەروازە ناوی دەرکردبوو. ئەمڕۆ گوندەکانی کارناک و لۆکسور لەسەر وێرانەکانی ئەو شارە دروست کراون.

٢- کاری ناوی هۆزێکی سەردەمی ئەنتیک و نیشتەجێ لە باشووری ڕۆژئاوای ئاسیای بچووک و لە هەرێمی نێوان وڵاتی لیدیا و فریژی و لیکیا و دەریای ئێژە بوونە. بەرەگەز یۆنانی و دواتر کەوتنە بەر پەلاماری هۆزەکانی دووری یا دەری و ناچاربوون بەرەو ئاسیای بچووک کۆچ بکەن.

شەڕەدا کوژران، بەجیا داندراون. بە واتایەک، هی پارسییەکان لەلایەک و هی میسرییەکانیش لەلایەکی‌تر. کەللەسەری پارسییەکان نەرم و تەنک بوو کە پیاو دەیتوانی بە خڕکە بەردێک بیشکێنێ و کونیی تێبکا، بەڵام هی میسرییەکان بەڕادەیەک ڕەق و ئەستوور بوو کە دەبوایە بەردێکی گەورەی پێدابدەی بۆوەی بشکێ. من خۆم ئەو دیاردەیەم دیت و باوەڕم بە قسەی میسرییەکان کرد. میسرییەکان لە سەردەمی منالّییەوە سەریان بەتەواوی دەتاشن و لەبەر خۆرەتاوی بەحوکم، ئێسقانی سەریان ڕەق و ئەستوور دەبێ. هەربۆیە قژیان ناوەرێ و سەرتاسیان کەمە. لە وڵاتی میسر کەم کەس وایە سەرتاس بێ و لە هیچ وڵاتێکی‌تر بەو چەشنە نییە. بۆیە دەگووترێ کە میسرییەکان کەللە ڕەق و پارسەکان کەللە نەرمن. پارسەکان بەردەوام لەژێر سێبەردان و کڵاویش لەسەر دەنێن. من خۆم ئەو جیاوازییەم بەچاوی خۆم دیت. لە شوێنی‌تریش، لە ناوچەی پاپریمی، واتە لەو جێگایەی پارسەکان لەگەڵ کوڕی داریوشی هیخامەنیشی بەدەست ئینارۆی[1] لیبیایی کوژران، ئەو جیاوازییەم بەرچاو کەوت.

**[١٣]** میسرییەکان لەو شەڕەدا تووشی شکست هاتن و ئەوەی مابۆوە رایکرد و گۆڕەپانی شەڕی بەجێ‌هێشت. راکردوەکان گەیشتنە هەرێمی مێمفیس. کامبیز وەفدێکی لە پیاوانی پارس بە گەمی شەڕکەرانی میتیلینی[2] نارده لای میسرییەکان لە شاری مێمفیس و داوای لێکردن پەیمانی ئاشتی مۆربکەن. وەختێک میسرییەکان چاویان بە گەمی پارسەکان کەوت کە نیزیکی شار دەبۆوە، بەسەر دیوارەکانی شاردا خۆیان فڕێ دایەخوار و پەلاماریان‌دا و تێکیان‌شکاند و جەماوەری نێو گەمی‌یەکەیان هێنایە نێو

---

١- ئینارۆ یا ئینارۆس، سەرۆک هۆزێکی ئەفریقایی (لیبی)، ساڵی ٦٤٣ی پێش میلاد لەلایەن میسرییەکانەوە وەک پاشا دیاریکرا و بە یارمەتی یۆنانییەکان دژی ئەردەشیری قۆڵدرێژی پاشای هیخامەنیشی راپەڕی. شۆڕشی ناوبراو پازدە ساڵی خایاند. ساڵی ٤٥٦ی پێش میلاد بەدەست مێغاڤازۆس یا مێگابیزی حوکمڕانی پارس کوژرا.

٢- میتیلین دورگەیەکی یۆنانی و پێتەختی کۆنی دورگەی لێسڤۆس.

حەساری شار. دواتر شار لە گەمارۆ کەوت و سالانێکی زۆری کێشا و لە کۆتاییدا ناچاربوون خۆیان بەدەستەوە بدەن.

خەڵکی ولاتی لیبی (ئەفریقا)، ئەوانیش کە چاویان بە بارودۆخی میسر کەوت، مەترسییان ڕێنیشت و بەبێ هیچ شەڕ و بەرگرییەک تەسلیم بوون و دیاری و خەلاتیان بۆ کامبیز نارد و بەڵێنیاندا مالیات بەناوبراو بدەن. لەو نێوەدا کرینییەکان[1] و ڤارکێییەکانیش[2] هەر بەو چەشنە جولانەوە. دانیشتووانی لیبیایی دیارییان پێشکەش بە کامبیز کرد و ناوبراویش بە نۆرەی خۆی خۆشحالی دەربڕی، بەلام ئەو خەلات و دیارییانەی خەڵکی کیرینێئی ناردبوویان، گشتی وەلانا و پێیکەم بوو.(ئەوەندەی من بزانم ئەوان پێنسەد منای[3] زێویان بۆ کامبیز ناردبوو). کامبیز ئەو پارەیەی وەرگرت و هەر بەدەستی خۆی سکە زیویەکانی بەسەر لەشکردا پرژاند.

[١٤] دە رۆژ دوای ئەوەی کامبیز دیواری شاری مێمفیس[4] بڕی و شارەکەی داگیرکرد، پاشای میسرییەکان واتە پسامینیتۆس کە تەنیا شەش مانگ حوکمڕانی کردبوو، ناردە دەرەوەی شار، بەو مەبەستەی کە ڕەزیل و خوێڕی بکا.

کامبیز، پسامینیتۆس و جەماوەرێک لە میسرییەکانی بۆ تاقیکردنەوەی ڕێژەی خۆڕاگری تووشی ئەو چارەنووسە کرد: کامبیز سەرەتا دەستووریدا کە کچی پسامینیتۆس بێنن و جلوبەرگی کۆیلایەتی لەبەر بکەن. ئەو کچە دەبوایە لەگەڵ کۆمەڵێک کیژیتر کە سەر بە بنەماڵەکانی دەوڵەمەندی میسری بوون و کامبیز هەڵیبژاردبوون، گۆزەی ئاو هەڵگرن و ئاو بێنن. کاتێک ئەو کۆڕە کیژە عەزەبانە بە گریان و ناڵەوە بەبەر چاوی باوکەکانیاندا ڕادەبردن – دیارە باوکەکانیش بە هاوار و گریانەوە چاویان لە کیژەکانیان بوو کە تووشی چ ڕۆژێکی ڕەش

١- کیرینێئا، ناوی موهاجیرنشینێک کە یۆنانییەکان لە ڕۆژئاوای میسر و لە خاکی ئەفریقیادا دروستیانکرد و پێتەختی ولاتی کیرینییەکان بووە.

٢- ڤارکێ، یەکێک لە شارەکانی سیرنائیگ و لیبی، ئەمڕۆ ناسراوە بە بورقە.

٣- پێوانەی بەها و پارە لە یۆنانی باستان و بەرابەری ٦٨ تا ٩٢ فرانک زێڕ بووە.

٤- هەمان ئەو قەلایەی کە دواتر بەشی هەرزۆری سپای پارسی تێدا جێگیربوو.

هاتوون – پسامینیتۆس چاوی بە کچەکەی خۆی کەوت، ناسییەوە و خێرا سەری کڕنۆشی بۆ دانەواند. دوای تێپەڕینی کچەکان، کامبیز فەرمانیدا کە کوڕی پسامینیتۆس، ئەویش لەگەڵ دوو هەزار کوڕگەلیتری میسری و هاوتەمەنی خۆی، تەناف لە ملّ و هەوسارکراو، بەبەر چاوی باوکەکانیاندا دەربازبن. بڕیاربوو بیانکوژن، بۆوەی تۆڵەی پیاوانی کوژراوی میتیلینی بستێندرێتەوە. شەرکەرانی میتیلینی، ئەوانەی لەناو گەمییەکەی نیزیک شاری مێمفیس‌دا کوژرابوون. بۆ هەر کەسێکی میتیلینی کە کوژرابوو، دەبوایە دە کەسی میسری سەری لێدرابا[1] و هەرهەمووشیان لە خانەدانی ئاغاوەتی میسری دەستنیشان کرابوون. پسامینیتۆس گشت ئەو کوڕگەلەی بەچاوی خۆی دیت. ئەو ئاگاداری ئەوەش بوو کە کوڕەکەشی بە قەستی سەرلێدان بەوێدا دەبەن. هەرچەند میسرییەکانی دەوروبەری ئەو لەخۆیاندەدا و دەگریان، ناوبراو بە هەمان شێوە هەڵسوکەوتی کرد کە بۆ کچەکەی کردبووی. دوای تێپەڕینی لاوەکان، بەهەڵکەوت کابرایەکی پیری دۆستی پسامینیتۆس کە بەر لەو شکست و شەڕە، ساماندار و دەوڵەمەند بوو. بەوپەڕی هەژاری و برسییەتییەوە سواڵی دەکرد و لەبەر سەربازانی کەمبوجییە دەپاڕایەوە. ئەو کابرایە بەتەنیشت پسامینیتۆس و میسرییەکانی دەوروبەردا دەرباز بوو. پسامینیتۆس هەرکە چاوی بەو دۆستە کەوت، لە پرمەی گریانیدا، بەناو بانگی کرد و وەرگەڕا سەر و گوێلاکی خۆی. کۆمەڵێک پاسەوان دەوری پسامینیتۆس‌یان گرتبوو. ئەوانە خەبەری ئەو هەڵسوکەوتەی نابراویان بۆ کامبیز بردەوە و رەوتی گشت رووداوەکەیان گێڕایەوە. کامبیز لەهەمبەر ئەو کارەی پسامینیتۆس سەری سوڕما و ڕاسپاردەی ناردە لای ناوبراو، بۆوەی پێی بڵێ: "ئەی پسامینیتۆس، پاشاکەت دەپرسێ بۆچی کاتێک دیتت کە کچەکەت لە بارودۆخێکی ئەوتۆ رەزیل و پەستدا دەژی، یا کوڕەکەت بە قەستی کوژران و سەرلێدان دەرباز دەبێ، هیچ دەنگێکت لێوە نەهات و نەگریای، لە حاڵێکدا بۆ ئەو کابرا سواڵکەرە بەخۆت

---

١- کەوابوو دوو سەد کەس پیاوی شەڕکەر بۆ هەڵسوڕان و ئاژۆتنی گەمییەکی جەنگی لەو سەردەمەدا پێویست بووە.

نەوەستای و هاوارت لێ هەستا؟ کامبیز هەواڵی ئەو رەفتارەی تۆی لە زمانی خەڵکەوە پێگەیشتوە ". ئەوە پرسیاری کامبیز لە زمان راسپاردەکەی بوو و پسامینیتۆس بەو شێوەیە وڵامی داوە: "پێی بڵێ، ئەی کورە گەنجەکەی کوروش، هەرچەند چارەڕەشی من لەڕادەبەدەرە و بۆ گریان دەبێ، بەڵام نەهامەتی دۆست زۆر لەوە پترە، چونکە ئەو کابرایە لەسەر ئەو گشتە سامان و بەختەوەرییەوە، ئێستا کەوتۆتە سواڵکردن، ئەویش لە سەرەتای دەستپێکی تەمەنی پیری و سەرەمەرگدا. پێموایە ئەوەیان بۆ گریان دەبێ ". وەختێک کابرای راسپاردە ئەو وڵامەی بۆ کامبیز بردەوە، ناوبراو جوابەکەی بەلاوە دروست بوو. هەڵبەت ئەوەش دەڵێن، کریسۆس، ئەویش گریا (کریسۆس لەو شەڕەدا لەگەڵ کامبیز هاتبووە وڵاتی میسر). پارسەکانی لەوێ بوون و تەنانەت کامبیز خۆیشی دڵی پڕ بوو. کامبیز لەجێوە فەرمانیدا کوڕەکەی پسامینیتۆس ئازاد بکەن و سەری لێنەدەن و لەگەڵ باوکی بیهێننە خزمەت ئەو.

[١٥] پیاوانی کامبیز پێڕانەگەیشتن کوڕی پسامینیتۆس لە مەرگ رزگار بکەن. بەر لە گەیشتنی فەرمانی کامبیز، کوڕە سەری لێدرابوو و یەکەم کەس بوو کە کوشتبوویان. پاسەوانەکان پسامینیتۆس‌یان بردە لای کامبیز و لەلای ئەو بەبێ گیروگرفت درێژەی بە ژیان‌دا. ناوبراو ئەگەر دواتر خەڵکی دنەنەدابایە، دەیتوانی دووبارە حوکمڕانی وڵاتی میسر وەرگرێتەوە و وەک نوێنەری کامبیز پاشا لەوێ فەرمانڕەوایی بکات. پارسەکان عادەتیان بوو کە پاشازادەکانیان لە جێگای باوکیان دادەنان، تەنانەت ئەگەر ئەو پاشایانە دژی دەسەڵاتداری پارس سەرهەڵدانیشیان سازکردبا. ئەو سەردەمە دەسەڵات لە باوکەوە بۆ کوڕ دەگوێزرایەوە. هەڵکەوتی لەو چەشنە فرە هەن کە ئەو شێوە سیاسەتە ئاشکرا دەکەن. بەتایبەت و بۆ وێنە، تانیراس، کوڕی ئینارۆسی[١] پاشای لیبی، ئەو کوڕە لەجیات باوکی حوکمڕانی وڵاتی پێسپێردرا.

---

١- ئینارۆ یا ئینارۆس، سەرۆک هۆزێکی ئەفریقایی (لیبی)، ساڵی ٦٤٣ی پێش میلاد لەلایەن میسرییەکانەوە وەک پاشا دیاریکرا و بە یارمەتی یۆنانییەکان دژی ئەردەشیری قوڵدرێژی پاشای هیخامەنیشی راپەڕی. شۆڕشی ناوبراو پازدە ساڵی خایاند. ساڵی ٤٥٦ی پێش میلاد بەدەست مێغاڤازۆس یا مێگابیزی حوکمڕانی پارس کوژرا.

پاڤسیریس،[1] کوڕی ئەمیرتیئۆس،[2] ئەویش و خەڵکەکەی هەرچەند بەقەدەر باوکی خۆی یا ئینارۆسی لیبییایی پێشوازی لە پارسەکان نەکردبوو، بەڵام بەو حاڵەش دەسەڵاتی پاشایەتی لەژێر سەیتەرەی کامبیزدا پاراست.

پسامینیتۆس، ناوبراو لەبەر ئەوەی خەریکی تێکۆشانی وەدەست خستنەوەی تاج و تەختی پاشایەتی خۆی بوو، تووشی ئەو چارەنووسە هات کە هەقی بوو: ئەو هەوڵیدا کە خەڵکی میسر ڕاپەڕێ. کاتێک کامبیز بە هەڵسوکەوتی ناوبراوی زانی، پسامینیتۆس خێرا خوێنی گاکێوی خواردەوە و لەجێوە مرد و بەو چەشنە کۆتایی بە ژیانی خۆی هێنا.[3]

[١٦] کامبیز لە شاری مێمفیسەوە چوو بۆ شاری سای و گەرەکی بوو درێژە بە داگیرکارییەکەی بدا. وەختێک لە ماڵی ئاماسیس وەژوور کەوت، فەرمانیدا خێرا جەنازەی ناوبراو لە قەبر دەرهێنن و بیهێننە لای ئەو. ئەوجار حوکمی کرد کە ئەو جەنازەیە وەبەر قەمچییان بدەن و سەری بتاشن و تێیهەڵدەن و بێحورمەتی پێبکەن و ئابڕووی پێوە نەهێڵن. پارسەکان کە خەریکی ئەو کارە ناشایستە بوون (جەنازەکە مۆمیاییکرابوو و لەتوپەت نەدەکرا)، کامبیز دەستووری دا هەرچۆنێک دەکرێ لەتلەتی بکەن. فەرمانێکی دوور لە عەقڵ بوو. پارسەکان لەو باوەڕەدان کە ئاگر دیارییەکی خودایە. سوتاندنی جەنازەی مردوو بەلای پارسەکان و میسرییەکانەوە جێگای پەسند و عادەت نییە. لەمەڕ پارسەکان، هەروەک گووتم، لەبەر ئەوەی ئاگر وەک خۆاوەند چاوی لێدەکرێ، نابێ جەنازەی مردووی پێبسووتێندرێ. سەبارەت بە میسرییەکانیش، ئەوان لەو باوەڕەدان کە ئاگر وەک ئاژەڵی دڕندە وایە، هەرچی بیدەیە دەستی دەیخوا. کاتێک لە خواردنی نێچیر تەواو

---

١- پاڤسیریس لەو کەسانە بوو کە کاتێک ئینارۆس شۆڕشی دژی پارسەکان وەڕێخست، ئەویش لە ناوچەکانی ڕێژاوگەی (مەسەب) ڕوباری نیل تاساڵی ٤٤٩ی پێش میلاد خۆڕاگری نیشاندا.

٢- ئەمیرتیئۆس، هەمان ئەو کەسەیە کە لەگەڵ ئینارۆس بوونە هاوپەیمان و ساڵی ٤٦٠ی پێش میلاد دژی پارسەکان ڕاپەڕین و تا ساڵی ٤٤٩ی پێش زایین درێژەیان بەو بەرگرییەدا.

٣- لە شوێنیتریش باسی ئەو چەشنە خۆکوژییە کراوە. وێدەچێ خوێنی گاکێوی خێرا ببەستێ و کابرا پێی بخنکێ.

بوو، لەگەڵ ئەو شتەی خواردوویەتی پێکەوە دەمرن. یاسا رێگا بە میسرییەکان نادا تەرمی مردووەکانیان بهاوێنە بەردەم ئاژەڵان، بۆیە مۆمیاییان دەکەن بۆوەی لەنێو گۆڕدا کرمی تێنەکەوێ. کامبیز دژی ئەو نەریتەش بوو. میسرییەکان خۆیان دەگێڕنەوە کە ئەو تەرمەی سوتێندرا هی ئاماسیس نەبوو. بەڵکوو جەنازەی میسرییەکی‌تری هاوتەمەنی ئاماسیس تووشی ئەو بێڕێزییە هاتووە و پارسەکان پێیانوابوو کە تەرمی ناوبراویان دەرهێناوە. میسرییەکان ئەوەش دەگێڕنەوە کە ئاماسیس کاتی خۆی پێشگۆیی پێگەیشتووە دوای مەرگی تووشی چ چارەنووسێک دێت. بۆوەی لەدەست نەهامەتییەکی ئەوتۆ رزگاری بێت، دەستووری‌دا کەسێکی‌تری میسری لەجیاتی ئەو لەنێو قەبردا بنێژن. واتە ئەوەی، لەنیزیک درگای ئەسڵی بەخاک ئەسپێردرابوو و قەمچی‌باران کرا. ئاماسیس هەروەها وەسییەتی بۆ کوڕەکەی خۆی کردبوو کە جەنازەی باوکی لە قوڵایی ژێرەوەی گۆڕدا بشارنەوە. هەڵبەت من لەو باوەڕەدا نیم کە چیرۆکی ناشتنی کەسێکی‌تری میسری لەجیات جەنازەی ئاماسیس و حەشاردانی تەرمی ڕاستەقینەی ئەو لە قوڵایی ژێرەوەی قەبردا راست بێ. بەڵام میسرییەکان بۆ رزگارکردنی گەورەیی و کەسایەتی خۆیان رەوتی رووداوەکە بەو جۆرە باس‌دەکەن.

### لەشکرکێشی کامبیز بەرەو باکوور و رۆژئاوا

**[١٧]** دوای ئەو شەڕانە، کامبیز گەرەکی بوو سێ لەشکرکێشی‌تر بە ئەنجام بگەیێنێ: دژی کارخیدۆنی[١]، ئامۆنی[٢] و ماکرۆڤی‌یەکانی[١] ئەتیۆپیایی کە

---

١- کارخیدۆنی‌یەکان موهاجیری فینیقی بوونە و هەشت سەدە پێش میلاد هاتوونە رۆژئاوای دەریای مەدیترانە و لە کەنارەکانی ئەفریقیا بەندەریان دروست کردوە.

٢- ئیلاهە ئامۆنۆس یا ئامۆن، مەزهەر و سیمبۆلی خۆر، خاوەن روخساری کەل و دوو شاخی گەورە بووە و لە شاری تیڤا و شارەکانی‌تری میسری کۆندا کەڵکی لێوەرگیراوە. ئەوانە لە شاری تیڤا ژیاون و گوندێکیش بەو ناوە ناودێرکراوە.

لە قەراخ بەحری باشوور[2] دەژیان. ناوبراو لە فکری ئەوەدا بوو کە هێزی دەریایی بنێرێتە سەر کارخیدۆنی‌یەکان، هێزی پیادە بۆسەر ئامۆنی‌یەکان و بۆ ئەتیۆپیاییەکانیش سەرەتا کۆمەڵێک سیخوڕ بنێرێ، بۆوەی دڵنیا بێ ئاخۆ بەڕاستی خاوەن بانکی خۆر هەن و لەو نێوەشدا چی زانیاری‌تریان دەسکەوت بیدەنەوە کامبیز. بۆ ئەو مەبەستە پیاوانی کامبیز کۆڵێک دیاری و خەڵاتیان بۆ پاشای ئەتیۆپی‌یەکان برد.

[١٨] بانکی خۆر بەو شێوەیە باسی لێوەکراوە: لە نیزیک پێتەختی ئەو خەڵکە ئەتیۆپیاییە، گەڵییەک هەیە کە گۆشتی برژاوی گشت ئاژەڵێکی چوارپێی لێ‌دەست دەکەوێ. خەڵکانێک بۆ ئەو کارە دیاری‌کراون. ئەوانە بەشەو گۆشتی برژاو دەبەنە ئەو شوێنە و رۆژی دوایی، هەرکەس گەرەکی بێ، دەچێ و دەخوا. خەڵکی دەڤەرەکە لەو باوەڕەدان کە ئەو کۆڵە گۆشتە برژاوە، لە عەرز هەڵدەقوڵێن. بەهەرحاڵ ئەوە نەقڵی بانکی خۆر بوو.

[١٩] وەختێک کامبیز بڕیاریدا سیخوڕەکانی بۆ ئەو هەرێمە بنێرێ، خێرا جەماوەرێکی ماسیخۆری خەڵکی شاری ئێلێفاندینی[3] بانگهێشت کرد و ئەرکی سیخوڕی پێ‌ئەسپاردن، چونکە ئەوانە زمانی ئەتیۆپیاییان بەباشی دەزانی. کاتێک ئەو تاقمە بەرەو شوێنی خوانی خۆر وەڕێکەوتن، کامبیز فەرمانی‌دا هێزی دەریایی پەلاماری خۆی دژی کارخیدۆنی‌یەکان دەسپێبکا. فینیقی‌یەکان بەو فەرمانەیان نەکرد و گووتیان کە سوێندیان خواردوە هیچ چەشنە شەڕ و پێکدادانێک دژی هاوڕەگەزەکانی خۆیان بەڕێوە نەبەن چونکە تووشی گوناهێکی گەورە دێن. دوای ئەو خۆپاراستنەی فینیقی‌یەکان لەمەر دەسپێنەکردنی پەلاماری دەریایی، باقی هێزە دەریاییەکان کارایی و تواناییان

---

١- ماکرۆڤی، کۆمەڵێک هۆزی نیشتەجێ لە ناوچەکانی نێوەندی ئەفریقیا بوونە. بە گووتەی زۆربەی مێژووناسان، ئەوانە نیزیک بە هەزار ساڵ تەمەن درێژ بوونە. هەڵبەت شوێنی دروستی نیشتەجێییان دیاری نەکراوە.

٢- بەباوەڕی هێرۆدۆت، شوێنی ئەو بەحرە لە باشووری لیبی یا ئەفریقیا بووە.

٣- ئێلێفاندینی، ناوچەی سنووری نێوان میسر و ئەتیۆپیا و شوێنی تاڤگەکانی روباری نیل، ئەمڕۆ بەناوی ئەسوان ناسراوە.

لەدەستدا. کارخیدۆنی‌یەکان بەو شێوەیە ڕزگارییان هات و نەچوونە ژێر نیری دەسەڵاتی پارسەکان. کامبیز، ئەویش لەلای خۆیەوە بە مەسڵەحەتی نەزانی فینیقی‌یەکان ناچار بەو پەلامارە بکا. فینیقی‌یەکان داوخوازانە خزمەتی لەشکریی کامبیزیان دەکرد و بەشی بنەڕەتی و گرینگی هێزە دەریاییەکانی ناوبراویان پێکدەهێنا. هەر ئەوانە بە خواستی خۆیان لەگەڵ خەڵکی قیبریسی کە ئەوانیش کەوتبوونە ژێر فەرمانی کامبیز، پێکەوە پەلاماری وڵاتی میسریان‌دا.

[۲۰] کاتێک جەماوەری ئیختیۆفاغۆس[1] دانیشتووی شاری ئێلیفاندینی گەیشتنە بارەگای کامبیز، ناوبراو گشتیانی بۆ لای ئەتیۆپییەکان بەڕێکرد، ڕێنمایی پێویستی کردن بۆوەی چ بڵێن و چ دیارییەک پێشکەش بکەن. دیارییەکان بریتی بوون لە دەستێک جلوبەرگی ئەرخەوانی، ملوانکە و بازنەی زێڕ و زەرفێکی مەڕمەڕی سپی پڕ لە عەتر و گۆزەیەکی زلی پڕ لە شەڕابی خورما. دەگێڕنەوە کە ئەتیۆپییەکان، ئەوانەی وەفدی کامبیز چوونە لایان، زۆر جوان و باڵابەرز بوون. ئەتیۆپییەکان یاسای تایبەت بە خۆیان هەیە و جیاواز لە خەڵکانی‌ترن. یاسای پێوەندیدار بە پاشاکان لەلای ئەوانەوە بەو چەشنەیە: پاشا پێویستە مرۆڤێکی جوان و بەقەلافەت و باڵابەرز بێ و ئەو تایبەتمەندییانە چەشنێک ڕێزگرتن و گەورەیی و ویقاریی پاشایەتییە.

[۲۱] ماسیخۆرەکان بەهەرحاڵ گەیشتنە لای ئەتیۆپییەکان و بە پاشایان گووت: "پاشای پارسەکان، کامبیز، خوازیاری دۆستایەتی لەگەڵ ئێوەیە و ئێمەشی ناردوە لەگەڵتان ڕێک کەوین و دیاری و خەڵاتیشمان هێناوە. کامبیز پاشا خۆی خەڵاتەکانی هەڵبژاردوە و بەردەوام کەڵکیان لێوەردەگرێ ". پاشای ئەتیۆپییەکان هەستی بەوە کردبوو کە ئەوانە بۆ سیخوڕی هاتوون و لە وڵامیاندا گووتی: "نە پاشای پارسەکان ئێوەی بە کۆڵێک دیاری و بە مەبەستی دۆستایەتی ناردۆتە لای من، نە ئەوەی ئێوەش دەیڵێن ڕاستە. هەرهەمووتان درۆدەکەن و بۆ سیخوڕی کردن هاتوونە ئێرە. کامبیزیش

---

١- ئیختیۆفاغۆس، هۆزێکی نیشتەجێ لە کەنارئاوەکان کە خواردنیان تەنیا ماسی بووە.

مرۆڤێکی حەقناس و راستگۆ نییە. ئەگەر ئەو ئینسانێکی دروستکار بوایە، پەلاماری وڵاتێکی بێگانەی نەدەدا و خەڵکی تووشی کۆیلەتی نەدەکرد، ئەویش خەڵکێک کە هیچ ئازارێکیان بەو نەگەیاندبێ. بەهەرحال ئێستا بڕۆنەوە و ئەو تیر و کەوانەی بەدیاری بۆ بەرن و پێی‌بڵێن: پاشای وڵاتی ئەتیۆپیا، ئەو پەند و ئامۆژگارییەی بۆ پاشای پارس ناردوە، هەرکات پارسەکان توانیان زێی کەمانێکی گەورەی لەو چەشنە بکێشنەوە، ئەو وەختە پەلامار دژی ماکرۆڤی‌یەکانی ئەتیۆپیایی دەست‌پێبکەن و بە لەشکرێکی گەورە بێن. تا ئەو کاتەش، کامبیز دەبێ شوکری خواکان بکات کە ئەتیۆپییەکان جارێ بەو قەناعەتە نەگەیشتوون پەلاماری خاکی وڵاتانی‌تر بدەن و داگیریان بکەن ".

[٢٢] پاشای ئەتیۆپیایی دوای ئەوەی قسەکانی تەواو بوو، کەوانەکەی دایە دەست ماسیخۆرەکان. جلە رەنگ ئەرخەوانییەکەی هەڵگرت و پرسیاری لەمەر شێوەی دروستکردنی کرد. ماسیخۆرەکان زانیاری تەواویان سەبارەت بە جلوبەرگەکە و رەنگی ئەرخەوانی و چۆنییەتی رەنگ کردنی لە خمخانەدا پێشکەش کرد. ئەوان هەروەها گووتیان کە وەستاکارانی ئەو جلوبەرگە، کەسانی پسپۆر و تەواوێکیش حیللەگەرن و بەرهەمەکەشیان مرۆڤ هەڵدەخەڵەتێنێ. پاشا ئەوجار چاوێکی لە ملوانکە و بازنەکە کرد. ئەوانە لە زێڕ دروستکرابوون. ماسیخۆرەکان بە ناوبراویان نیشاندا کە چۆن بەکاردەهێندرێن. پاشا قاقایەکی لێدا و پێیوابوو کە زنجیرن و گووتی کە ئەتیۆپی‌یەکان زنجیری زۆر لەو مەحکەمتریان هەیە. ناوبراو دوایە لەمەر عەترەکان پرسیاری کرد. دوای ئەوەی کە ماسیخۆرەکان سەبارەت بەو کەرستانەش زانیاری پێویستیان بە پاشادا و بۆیان روون کردەوە کە چۆن دروست دەکرێن و سوودیان لێ‌وەردگیرێ. لەکۆتاییدا پاشا چاوێکی لە گۆزە شەڕابەکە کرد و سەبارەت بە ئەویش وڵامی تەواوی وەرگرتەوە و سپاسی راسپاردەکانی ماسیخۆری کرد. دوای ئەو باسوخواسە، پرسیاری لە وەفدەکە کرد کە پاشای پارسەکان چ دەخوا و بەگشتی پاشاکانی پارس چەند ساڵ

دەژین. وڵامیان داوە کە پاشا نان دەخوا و بۆیان روون کردەوە کە دانەوێڵە چۆن دەچێندرێ و بەرهەم دێت. ئەوان هەروەها گووتیان کە درێژترین تەمەن بۆ هەر پاشایەکی پارس هەشتا ساڵ دەبێ. پاشای ئەتیۆپیایی لە درێژەی باسەکەیدا گووتی، بەباوەڕی من ژیانی پاشا پارسەکان هیچ نرخێکی نییە و بۆوەی نابێ باسی لێوە بکەین. ئەوەش کە هەشتا ساڵ دەژین، تەنیا بە یارمەتی ئەو شەڕابەیە کە دەینۆشن. ناوبراو هاوکات گۆزە شەڕابی نیشانی ماسیخۆرەکاندا و بۆچوونی پارسەکانی پێ هەڵە بوو.

[٢٣] ئەوجار نۆرەی ماسیخۆرەکان بوو و پرسیاریان لە پاشا کرد، ئاخۆ ئەوان چەندە عومر دەکەن و چۆن دەژین. پاشا وڵامی دانەوە کە زۆربەیان سەدوبیست ساڵ دەژین و رەنگە هی ئاواش هەبێ کە پتر ژیابێ. سەبارەت بە خواردنی پاشاکان، ناوبراو وڵامی داوە کە گۆشتی کوڵاو دەخۆن و شیر دەنۆشن. سیخوڕە ماسیخۆرەکان سەریان لە تەمەنْدرێژی پاشاکانی ئەتیۆپیایی سوڕمابوو. پاشا ئەوانەی لەگەڵ خۆی بردە سەر بیرێک کە ئاوەکەی پێستی دەستی چەور دەکرد و بۆنی وەنەوشەی لێدەهات. ئاوەکە ئەوەندە سووک بوو، وەک ماسیخۆرەکان گووتیان، هیچ شتێک خۆی لەسەر نەدەگرت، نەدار و نە بابەتی سووکتر لە دار و گشتیان خێرا تێیدا قوم دەبوون. ئەگەر بەراستی ئاوەکە ئەوەندە سووک بووە، وەک ئەوانە باسی دەکەن، دەبێ هۆیەک بۆ تەمەنْدرێژی ئەتیۆپییەکان بووبێ و بۆیە بەردەوام دەیخۆنەوە. لە سەرچاوەی ئاوەکەوە ئەوجار چوونە سەردانی زیندان، لەوێ گشت زیندانییەکان بە زنجیری زێڕ بەسترابوونەوە. ئاسنەواڵەی مس بەلای ئەتیۆپییەکانەوە بەنرخترە و زۆر کەم وەگیردەکەوێ. ئەو وەفدە دوای ئەوەی چاویان بە زیندان کەوت، ئەوسا بەرەو بانکی خۆر وەڕێکەوتن.

[٢٤] لە کۆتاییدا وەفدی سیخوڕەکانیان بردنە گۆرستانی ئەتیۆپییەکان. هەڵبەت دەگێڕنەوە کە ئەو قەبرانە لە شوشەی دەستکرد، بەچەشنی خوارەوە دروست کراون: کاتێک جەنازە مۆمیایی دەکرێ، چ بە شێوازی میسرییەکان و چ بە جۆرێکیتر، تەرمەکە بە کەتانی گێچاوی دەپێچن و نەخش و نیگاری

لەش و روخساری مردوو دەکێشرێتەوە و پاشان لەنێو کۆڵەکەی شوشەدا جێدەگرێ. شوشە لەو وڵاتە بە فراوانی دەست دەکەوێ و کار لەسەر کردنی گەلێک هاسانە. جەنازەی قالبکراو لەنێو شوشەدا بە روونی دەبیندرێ و بۆنی خۆش و ناخۆشی لێنایە و شێوەی راستەقینەی مردووەکە دیارە. خاوەن مردوو ئەو جەنازە شوشەکراوە بۆ ماوەی یەکساڵ لە ماڵی خۆی رادەگرێ و کۆڵێک قوربانی بۆ دەکا و بە دەغڵی فەریکی ساڵ خەڵاتی دەکا. لەدرێژەدا ئەو جەنازە لە شوشەگیراوە، هەڵدەگرن و لە شوێنێکی دەرەوەی شار دەیچەقێنێ.

[٢٥] کوڕی سیخوڕەکان پاش ئەوەی چاوی بە گشت ئەو شوێنانە کەوت، گەڕانەوە دواوە. بەسەرهاتی سەفەرەکەیان بەوردی بۆ کامبیز پاشا گێڕایەوە. ناوبراو گەلێک قەڵس بوو و لەجێوە بڕیاری‌دا، هێرش بکاتە سەر وڵاتی ئەتیۆپیا، بەبێ ئەوەی ئامادەکاری کردبێ و پێداویستیەکانی لەشکری لەبەرچاو گرتبێ. ئەو تەنانەت بیری لەوەش نەکردەوە کە قەرارە بەرەو دوورترین شوێنی بیچمی زەوی سەفەر بکا. هەروەک دێوانەیەکی تامەزرۆ، ئاقڵی لەسەردا نەما و بە گوێ‌گرتن لە ماسیخۆرەکان، هێزی پیادەنیزامی وەرێخست و یۆنانییە بەکرێگیراوەکانی لە وڵات بەجێ‌هێشت و داوای لێکردن لە چاوەڕوانیدا بمێننەوە.

کامبیز پاش ماوەیەک گەیشتە شاری تیڤا[١]، پەنجاهەزار کەس لە شەڕکەرانی ژێردەستی خۆی هەڵبژارد و فەرمانی‌دا بە زەبری شەڕ ئامۆنی‌یەکان[٢] بێننە ژێر نیری دەسەڵاتی ئەو و نێوەندی تاڵەبینی خواوەند دیا وێرانبکەن و ئاگری تێبەردەن. کامبیز لەگەڵ باقی لەشکرەکەی بۆ شەڕ دژی ئەتیۆپییەکان وەڕێکەوت.

---

١- تیڤا، شارێکی میسری باستان، بەهۆی کادمۆس بنیات‌نرا، گەورەترین شاری ئەو سەردەمە و بە سەد دەروازە ناوی دەرکردبوو. ئەمڕۆ گوندەکانی کارناک و لۆکسور لەسەر وێرانەکانی ئەو شارە دروست کراون.

٢- ئیلاهە ئامۆنۆس یا ئامۆن، مەزهەر و سیمبۆلی خۆر، خاوەن روخساری کەڵ و دوو شاخی گەورە بووە و لە شاری تیڤا و شارەکانی‌تری میسری کۆندا کەڵکی لێوەرگیراوە. ئەوانە لە شاری تیڤا ژیاون و گوندێکیش بەو ناوە ناودێرکراوە.

هێشتا یەک لە پێنجی مەودای ڕێگای نەپێوابوو، ئەرزاق و تفاق کۆتایی هات. دواتر ماڵاتی باربەریش لە کەمییاندا، چونکە پیاوانی لەشکر ناچاربوون بیانکوژنەوە و خواردنی خۆیان دابینبکەن. کامبیز بەو بارودۆخەی زانی. ناوبراو ئەگەر پەشیمان ببایەوە و گەڕاباوە، دوای بڕیاری هەڵە و بەپەلەی، ئەوجار کارێکی ئاقڵانەی دەکرد، بەڵام گوێی بە هیچ نەبزووت و درێژەی بە ڕێگادا. سەربازەکانی ناوبراو، چی لە عەرز وەگیریان بکەوتایە، بەتایبەتی گژوگیا، لەجیێوە دەیانخوارد. وەختێک لەشکر گەیشتە بیابان، کایەیەکی سەیریان ڕەچاوکرد. پشکی شێر و خەتیان دامەزراند و لە هەر دە کەس یەکیان دەکوشت و دەیانخوارد. کامبیز خەبەری ئەو کارەساتەشی پێگەیی، ئەوجار گەلێک ترسی ڕێنیشت. نیگەرانی ئەوە بوو کە سەربازەکانی پتر خەریکی یەکتر خواردن بن. هەربۆیە دەستی لە پەلامارەکەی هەڵگرت و پاشەکشەی کرد. وەختێک گەیشتەوە شاری تیڤا، بەشی هەرەزۆری لەشکرەکەی تێداچوبوو. لەو شارەوە چووە شاری مێمفیس و یۆنانییەکانی ئازاد کرد و بەڕێگای دەریادا بەڕێیکردنەوە وڵاتی خۆیان.

**[٢٦]** ئەوە ئاکامی لەشکرکێشی دژی ئەتیۆپییەکان بوو. ئەو لەشکرەش کە فەرمانی پێدرابوو هێرش بکاتە سەر ئامۆنییەکان، لە شاری تیڤاوە وەڕێکەوت و کۆمەڵێک چاوساغیان وەپێش خۆیان خست. ئەوەی ئاشکرا و ڕوونە، لەشکر گەیشتۆتە شاری "ئۆئاسی "[١]. دانیشتووانی ئەو شارە بەڕەگەز سامیین و ئەوجۆرەی دەگووترێ، سەر بە هۆزێکن کە بە ناوی ئێسخریۆنیا ناسراون. ئەو هەرێمە حەوت ڕۆژ ڕێگا لە شاری تیڤاوە دوورە و پیاو دەبێ بە بیابان دا دەربازبێ. یۆنانییەکان ئەو ناوچەیە بەناوی دورگەی (مەکاری)یەکان دەناسن.

دەگێڕنەوە کە لەشکری گۆڕین گەیشتووەتە ئەو دەڤەرە، بەڵام لەدرێژەدا چی بەسەر هاتووە، جیا لە خەڵکی ئامۆنی و ئەوانەی لەڕێگای ئەوانەوە بۆرە زانیارییەکیان دەسکەوتووە، کەسیتر ئاگای لە چارەنووسیان نییە. دەکرێ

---

١- ئۆئاسی، ئاوایییەکی بچووک لە سەر سنووری میسری باستان و لە سەحرای بورقە. پەرستگەیەکی گەورەی خواوەند ئامۆن لەو ئاوایییە هەبووە.

بلێین لەشکر نەگەیشتە سەر دانیشتووانی ئامۆنی و نەشگەڕاوەتەوە. ئامۆنییەکان خۆیان بەوجۆرە باسی رووداوەکەە دەکەن: وەختێک لەشکر لە شاری ئۆئاسی‌یەوە دژی ئەوان وەڕێکەوت، بە بیاباندا دەرباز بوو، پاش ئەوەی نیوەی ڕێگای بڕی، کاتی زیافەت، بای شەماڵ هەڵیکردێ و تۆفانی سازکرد و تەپۆڵکە خیزی رامالّی و تەواوی سەربازانی لەشکری وەژێر خاک و خۆڵدا. ئەو لەشکرە بەو چەشنە لەنێو چوو. هەڵبەت ئەوە قسەی ئامۆنییەکان لەمەر تێداچوونی لەشکری گۆرینە.

[٢٧] کاتێک کامبیز گەڕایەوە شاری مێمفیس، خواوەند ئاپیس[١] خۆی بە میسرییەکان نیشان‌دا. یۆنانییەکان بەو خوایە دەڵێن ئێپافۆس[٢]. ئەو خوایە هەرکە خۆی دەرخست، میسرییەکان خێرا جلوبەرگی جێژنیان لەبەر خۆیان کرد و کۆڕی شایی و بەزمیان دامەزراند. کامبیز، ئەویش بەسەر ئەو شایی و لۆغانەدا کەوت. ناوبراو سەرەتا پێیوابوو لە خۆشی و شایی شکست خواردنی لەشکری ئەو لەو شەڕەدا، خەڵک خۆی رازاندوەتەوە و هەڵدەپەڕن، هەربۆیە بەدوای گەورە پیاوانی شاری مێمفیسی‌دا نارد. کاتێک ئەو پیاوانە گەیشتنە لای کامبیز، ناوبراو لێی‌پرسین بۆچی جاری یەکەم کە ئەو هاتووەتە ئەو شارە میسرییەکان هیچ هەڵسوکەوتێکیان نەبووە و جێژنیان نەگرتووە و ئێستاش کە تووشی شکست هاتووە و بەشی هەرە زۆری لەشکری لەدەست‌داوە، گشتیان خۆشحاڵ و شادن و ئەو بەزمەیان وەڕێخستووە. گەورە پیاوانی میسری وڵامی ناوبراویان داوە و گووتیان کە ئەمرۆ خوایەک خۆی بە خەڵک نیشان داوە و تەنیا لەکاتی قەومانی ڕووداوی گەورەدا

---

١- ئێپیس، ئاپیس، ئیلاهەی میسری، وێنای زیندوی خواوەند ئوسیریس بە روخساری گایەکی رەش کە خاوەن لەکە یا خاڵێکی چوارگۆشەی سپی لە نێوچاوان و لەکەیەکی سپی‌تری هیلالی لەلای راستی سەری بووە. ئەو گایە لە شاری مێمفیس پارێزگاری لێکراوە و کاهێنەکان خزمەتیان کردوە و پاش ٢٥ ساڵ لە چۆمی نیل‌یان هاویشتووە و پرسە و سەرەخۆشی بەشکۆیان رێکخستووە. هەرکات گایەکی بە هەمان شێوە و روخسار لەدایکبووە، لەجێگای ئاپیس‌یان داناوە.

٢- ئێپافۆ یا ئێپافۆس، کوڕی خواوەند ژوپیتێر و ئیلاهە یوو و دامەزرێنەری شاری مێمفیس.

دەردەکەوێ، بۆیە میسرییەکان خۆشحاڵن. کامبیز وەختێک گوێی لەو قسانە بوو، پێی‌گووتن کە درۆدەکەن و سزای پیاوی درۆزنیش تەنیا مەرگە.

[۲۸] کامبیز دوای ئەوەی گەورە پیاوانی میسری شاری مێمفیس کوشت، ئەوجار بەدوای کاهێنانی پەرستگەی‌دا نارد. ئەوانیش هەمان وڵامیان بە ناوبراو داوە. کامبیز بە کاهێنەکانی گووت کە حەزدەکا چاوی بەو خواوەندە میسرییە بکەوێ. فەرمانی‌دا ئاپیس بێننە لای ئەو. کاهێنەکان ئەو خواستەشیان بەجێ‌گەیاند. ئاپیس یا بەقەولی یۆنانییەکان ئێپاخۆس، جوانەگایەکە و لە مانگایەک بووە کە ناتوانێ دووبارە ئاوس بێتەوە. میسرییەکان دەڵێن کە بروسکەیەکی ئاسمانی لە پشتی ئەو مانگایەی داوە و بۆیە ئاوس بووە و بووەتە هۆی لەدایکبوونی ئاپیس. ئەو جوانەگایە، واتە ئاپیس خاوەن هێندێک نیشانەیە: رەشە و نێوچاوانی قەشانە، خاڵێکی چوارگۆشەی سپی لە سەر پشتە و وەک هێمای هەڵۆ دەچێ. مووی کلکی جوانەگاکە دوو ریزە و لەژێر چەناگەی وێنەی قالۆچک بەرچاو دەکەوێ.

[۲۹] وەختێک کاهێنەکانی پەرستگە، خواوەند ئاپیس‌یان هێنا بەردەم کامبیز، ناوبراو وەک شێت و دێوانە هەڵیکێشایە خەنجەر و گەرەکی بوو لە خاڵیگەی جوانەگای رۆبکات، بەڵام بەهەڵە لە رانی‌دا. لەجێوە قاقایەکی لێدا و بە پێکەنینەوە گووتی: "ئەی بێ‌ئاقڵینە، نەمدەزانی خوای خاوەن لەش و خوێن وجوودی هەیە و بە ئاسن بریندار دەبێ. خوای ئاوا تەنیا قابیلی میسرییەکانە. دیارە ئەوەشتان لەبیر نەچێ کە لەمەر ئەو دەستخەرۆ کردنەی من، بە سزای تاوانی خۆتان دەگەن ". ناوبراو خێرا فەرمانی بە پیاوەکانی خۆی‌دا گشت کاهێنەکان وەبەر قەمچی‌یان بدەن و هەرکەسێکی میسری خەریکی شایی و خۆشی بێ، لەجێوە بیکوژن. بەو چەشنە گشت جێژن و شاییەک لە وڵاتی میسر قەدەغە کرا. کاهێنان وەبەر قەمچی‌یان کەوتن، ئاپیس بە رانی بریندارەوە لە پەرستگە رووی لە کزی کرد و بەهۆی کاریبوونی زامەکەی مرد، کاهێنەکان بەدزییەوە و دوور لە چاوی کامبیز و پاسەوانەکانی ناشتیان.

[۳۰] وەک میسرییەکان خۆیان دەگێڕنەوە، کامبیز لەمەر ئەو ناهەقییەی کردی، تووشی سزا هات. ئەو دێوانە بوو، هەرچەند پێشتریش مێشکی تەواو نەبوو. یەکەم جینایەتی بە ئەنجامی گەیاند، کوشتنی برای دایک و بابی خۆی بەناوی سمێردی (بردیا). کامبیز سەرەتا ئەو برایەی لە میسر دەرکرد و ناردییەوە پێرسیا. زۆری لێدەترسا و لەڕاستیدا سمێردی لەنێو پارسەکاندا، یەکەم کەس بوو توانیبووی دوو پەنجە زێی ئەو کەمانە ئەتیۆپیاییە راکێشێ کە ماسیخۆرەکان لەگەڵ خۆیان هێنابوویانەوە. تا ئەو کاتە هیچکەسێکیتر نەیتوانیبوو ئەو کارە بکات. وەختێک سمێردی گەڕایەوە پێرسیا، کامبیز خەونی دیت. ئەو لە خەونەکەیدا دیتی کە تەتەرێک لە پێرسیاوە هاتووە بۆوەی بە کامبیز بڵێ کە سمێردی لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشتووە و سەری گەیشتووەتە بەر تاقی ئاسمان. ئەو خەونە ترسی وەبەر کامبیز نا. ناوبراو لەوە ترسا کە سمێرنی رەنگە ئەو بکوژێ و ببێتە خاوەن تاج و تەختی پاشایەتی. کامبیز خێرا یەکێک لە پیاوانی باوەڕپێکراوی پارسی بەناوی پریکساسپ[1] نارد بۆ کوشتنی سمێردی. پریکساسپ چووە شاری شووش (سووسا) و سمێردی کوشت. هێندێک دەڵێن کە ناوبراو لە کاتی راودا کوژراوە و کەسانێکیش دەگێڕنەوە کە سمێردی لە دەریای ئێریترە هاوێژراوە.

[۳۱] هەروەک گووترا، ئەوە یەکەم جینایەتی کامبیز بوو. دووهەم جینایەتی ناوبراو کوشتنی خوشکی خۆی بوو. ئەو خوشکەی لەگەڵی هاتبوە وڵاتی میسر، لەڕاستیدا هەم خوشکی دایکوبابی و هەم ژنی بوو.

کامبیز بەو شێوەیە لەگەڵ ئەو خوشکەی زەماوەندی کرد: بەر لە ناوبراو لەنێو پارسەکان‌دا عادەت نەبوو خوشک و برا پێکەوە ژیانی هاوسەری دامەزرێنن. کامبیز عاشقی یەکێک لە خوشکەکانی خۆی ببوو و حەزی دەکرد

---

۱- پریکساسپ، نەجیبزادەی پارسی بە فەرمانی کەمبوجیە، بردیای کوشت. چەند سەرچاوەیەکیتر دەڵێن کە کەمبوجیە بۆوەی پیاوانی دەوروبەری خۆی دڵنیا بکا کە تووشی مەستی و سەرخۆشی نەهاتووە، دڵی کوڕی پریکساسپی بە تیرێک ئەنگاوت و کوشتی. دوای مردنی کەمبوجیە، پریکساسپ رازی کوشتنی بردیا یا سمێردی برای کەمبوجیەی لای خەڵک ئاشکراکرد و لەسەر بورجێکی بەرزەوە خۆی فرێدایە خوار و مرد.

که له داهاتوودا شووی پێبکا. ئەو دەیزانی کارەکەی بەپێچەوانەی دابونەریتی کۆمەڵگای پارسەکانە، قازییەکانی بارەگای پاشایەتی بانگکردە قەسر و لێیپرسین ئەگەر قانوون و یاسایەک هەیە کە ڕێگا بدا خوشک و برا ژیانی هاوسەریتی پێکبێنن. قازییەکانی دەرباری پاشایەتی گشتیان لە خەڵکی پارس هەڵدەبژێردران و تا ڕۆژی مردن لەسەر کارەکەیان دەمانەوە، مەگەر بڕیارێکی دژ بەوان هاتبا گۆڕێ و بەرپرسایەتییەکەیان لێ وەرگیراباوە. ئەوانە خەڵکانی پارسیان دادگایی دەکرد و یاساکانی باب و باپیرانی خۆیان لێکدەداوە و لە کۆتایی‌دا بڕیارییەکجاریان دەدا.

وەختێک کامبیز پرسی بەو قازییانە کرد، ئەوان وڵامێکیان بە ناوبراو داوە کە نە یاسایان وەژێر پێ نا و نە گیانی خۆیان خستە مەترسی. گووتیان لە هیچ جێگایەکی قانووندا نەنووسراوە کە برا بۆی هەیە لەگەڵ خوشکی خۆی ژیانی هاوسەری پێکبێنێ، بەڵام ئەوە نووسراوە کە پاشا چی حەزی لێیەتی، بیکا. قازییەکان بەو شێوەیە یاساشکێنی‌یان نەکرد و ڕێگایەکی قانوونی‌یان گرتەبەر کە هەم مەبەستی پاشای لەمەر مارەکردنی خوشکی خۆی جێبەجێ دەکرد و هەمیش خۆیان سەریان تێدا نەچوو. کامبیز لەگەڵ ئەو خوشکەی حەزی لێدەکرد ژیانی هاوسەری پێکهێنا. ئەو کیژە لە دوو خوشکەکانی‌تر بچووکتر بوو. ئەوەی دوایی لە کاتی لەشکرکێشی بۆ سەر وڵاتی میسر لەگەڵ کامبیز بوو و ناوبراو لەوێ کوشتی.

**[٣٢]** سەبارەت بە کوژرانی ئەو کچە دوو بۆچوون لەگۆڕێدا هەن، هەروەک بۆ سمێردیس بە هەمان شێوە بوو. یۆنانییەکان دەڵێن کامبیز توڵەشێرێک و سەگێکی تێکبەردابوو. ژنەکەی سەیری شەڕی ئەو ئاژەڵانەی دەکرد. کاتێک توڵە شێرەکە خەریک بوو سەگە بخنکێنێ، سەگێکی‌تر لەنەکاو ڕۆبووە توڵە.شێر. ئەو سەگەش هاتە نێو شەڕ و بە دوو سەگان شێرەیان ڕاونا. کامبیز حەزی لەو کێبەرکێ و شەڕە بوو، بەڵام خوشکی واتە ژنەکەی بەردەوام دەگریا. ناوبراو چاوی بە فرمێسکەکانی خوشکی[١] کەوت و

---

١- مەبەست لە ئاتووسا کچی کوروشی گەورە و خوشکی کەمبوجیەیە.

لێیپرسی کە بۆچی دەگری. خوشکە وڵامی داوە: "لەو کاتەدا کە سەگی دووهەم برای خۆی لە مەترسیدا بینی، لە فریای کەوت، بەڵام داخەکەم کەس نییە تۆڵەی سمێردی بستێنێتەوە.

دیارە میسرییەکان لەو باوەڕەدان کە کامبیز و خوشکەکەی لە دەوری مێزێک دانیشتبوون. خوشکەکەی کاهوویەکی دەست دایە و گەڵاچنی کرد و دوایە لە مێردەکەی پرسی ئاخۆ ئەو کاهوویە بە گەڵاوە جوانترە یا بێ گەڵا. کامبیز جوابی داوە کە بە گەڵاوە جوانترە. خوشکە ئەوجار گووتی: "تۆش ئەو کارەت کرد کە من لەگەڵ کاهوویەکەم کرد، تۆ بنەماڵەی کوروشت گەڵاچن کرد و بێ پەڕ و باڵ مایەوە ". کامبیز قەڵس بوو، پاڵی بە خوشکی وەنا و فڕێیدا خوارێ و بە شەقتێهەڵدان کەوتە سەری. ئەو ژنە لە کامبیز ئاوس بوو، مناڵەکەی لەبەر چوو و خۆیشی مرد.

**[٣٣]** کامبیز بەو چەشنە لەگەڵ کەسوکاری خۆی هەڵسوکەوتی کرد، بەتایبەت ئەو کاتەی شێت ببوو، جا لەبەر کوشتنی ئاپیس بووبێ، یا هەر هۆیەکیتر، بەهەرحاڵ فرە تیر و پەیکان هەن کە مرۆڤ دەدۆزنەوە. ئەوەش دەگێڕنەوە کە کامبیز لە سەردەمی مناڵییەوە نەخۆشییەکی چارەسەر نەکراوی هەبووە و پێیگووتراوە بێری (فێگرتن). دیاردەیەکی سەیر نییە ئەگەر لەنێو لەشێکی نەخۆشدا، عەقڵیش بێ خەوش و سلامەت نەبێ.

**[٣٤]** ئەو دێوانە بوونەی کامبیز گەلیک کردەوەی ناحەزی دژی خەڵکی لێکەوتەوە. باسدەکەن کە بە پریکساسپی گوتووە - زۆری ڕێز و حورمەت بۆ ناوبراو هەبووە - خەبەر و زانیاری کۆبکاتەوە و بەوی بگەیێنێ. کوڕی پریکساسپ کە لە ڕاستیدا زڕکوڕی کامبیزیش بووە، خۆی لەخۆیدا بووەتە مایەی قەدر و ڕێزدانانی کامبیز بۆ باوکی کوڕە. کامبیز لە پریکساسپی پرسیوە: "پریکساسپ، پارسەکانْ چۆن سەیری من دەکەن و سەبارەت بە من چ دەڵێن؟ ". پریکساسپ وڵامی داوەتەوە: "گەورەم، تاریف هەر تاریفی تۆیە، بەڵام جاروبار دەڵێن کە جەنابت زۆر حەز لە مەینۆشی دەکەی ". ئەوە دەقی وڵامی پریکساسپ سەبارەت بە بۆچوونی پارسەکان بوو. کامبیز ئەو

قسەیەی بە کەیفێ نەبووە و لە جوابدا گوتوویەتی: "باشە، تەنیا لەبەر ئەوەی حەزم لە مەینۆشییە، گلەییم لێدەکەن، ئەگەر وایە راوبۆچوونی پێشووتریان راست نەبووە ".

بەڕاستی ماوەیەک لەوە پێش، کامبیز لە راوێژکارێکی پارسی تەنیشت خۆی پرسیارێک دەکات، دیارە لەو کاتەدا کریسۆسی لیدیاییش لەوێ بووە. کامبیز پرسیویەتی: "خەڵک کامبیز لەگەڵ باوکی خۆی واتە کوروش چۆن هەڵدەسەنگێنن ". راوێژکارەکە لە وڵامدا پێیگوتووە کە ئەو لە باوکی بەوەجترە، چونکە چی دەسەڵاتی کوروش هەبووە، گشتی پاراستووە و وڵاتی میسریشی خستووەتە سەر ئەو مڵک و ماڵە و دەستی بەسەر دەریاکانیش داگرتووە. ئەوە وڵامی راوێژکارە پارسەکە بووە، بەڵام کریسۆس وەجواب هاتووە و قسەی کابرای پەسند نەکردوە و بە کامبیزی گوتووە: "ئەی کوڕی کوروش، بەلای منەوە جەنابت لە باوکتان خاوەن شکۆتر نین، چونکە ئەو ساحێبی کوڕی وەک ئێوە بووە، جەنابت جارێ ئەو کارەت بە ئەنجام نەگەیاندووە ". کامبیز تەواوێک حەزی لەو وڵامەی کریسۆس بووە و پەسنی ئەوی کردوە.

[۳۵] کامبیز ئەو قسانەی وەبیرهاتەوە و بە قەڵسی رووی لە پریکساسپ کرد: "بزانە و لێم روون بکەوە کە پارسەکان ئەوەی دەیڵێن راستە یا عەقڵیان لە دەست داوە، ئەگەر ئێستا سێرە لە کوڕەکەت بگرم کە لەبەر درگا راوەستاوە و تیرێکی لە دڵی بدەم، بەو مانایەیە کە پارسەکان نازانن دەڵێن چی، بەڵام ئەگەر تیرەکەم لە خاڵ نەدەم، ئەوە دەگەیێنێ کە راست دەکەن و منم کە مێشکم لە دەست داوە ". کامبیز ئەو قسانەی کرد، زێی کەوانی کێشاوە و تیرێکی هاویشتە کوڕە، کاتێک کوڕە کەوتە سەر عەرز، فەرمانیدا جەندەکەکە بقەڵێشن، بۆوەی بزانن تیرەکە چ شوێنێکی نێو هەناوی نیچیری ئەنگاوتووە. دوای پشکنین دەرکەوت تیرەکە لە دڵی کوڕە رۆچووە. کامبیز گەلێک خۆشحاڵ بوو و رووی لە باوکی کوڕە کرد و بە پێکەنینەوە گووتی: "پریکساسپ ئێستا هەموو شتێک روون بۆوە. تۆ، تا ئەمڕۆ کەست شک بردووە باشتر لە من تیر لە خاڵ بدا! ".

پریکساسپ حاڵی بوو کە لەگەڵ چ مرۆڤێکی دێوانە تێکەوتووە و گەلێک ترسا و بەناچاری وڵامی داوە: "گەورەم، بەباوەڕی من، خواش نەیدەتوانی بەو چەشنە سێرە بگرێت ". ئەوە باسی کردەوەکانی کامبیز بوو. کەڕەتێکیتر بەبێ هیچ تاوانێک، دوازدە کەس لە گەورە پیاوانی پارسی گرت و فەرمانیدا هەرهەموویان زیندە بە چاڵ بکرێن.

[٣٦] کریسۆسی لیدیایی بەردەوام دەیدیت کە ئەو کابرایە بە چ شێوەیە رەفتار دەکا. رۆژێک ویستی تۆزێک ئامۆژگاری ئەو بکا و برێکی عەقڵ وەبەر بێنێتەوە: "پاشاکەم، ئیزن مەدە گەنجێتی و حەزەکانت تووشی هەڵەت بکەن. پێویستە لە هەمبەریاندا خۆڕاگر بی و بەسەر خۆتدا زاڵبی. دیاردەیەکی گەلێک جوانە کە پیاو بەر لە ئەنجامی هەر کارێک ژیرانە بیری لێبکاتەوە، ئەوجار جێبەجێی بکا. تۆ خەڵکانێک دەکوژی کە هاوڵاتی خۆتن، بەبێ ئەوەی هیچ تاوانێکیان هەبێ و کارێکیان کردبێ. تۆ تەنانەت منالێش دەکوژی. ئەگەر هەر بەو چەشنە درێژە بە حوکمڕانی بدەی، ئەوە بزانە کە پارسەکان دژی تۆ سەرهەڵدان سازدەکەن. سەبارەت بە خۆیشم، باوکی تۆ واتە کورووش حوکمی لەسەر کردوم کە ئاگام لە تۆ بێ و رێنوێنیت بکەم و چی بە بەرژەوەندی بزانم، پێتبڵێم ". کریسۆس لەڕووی دڵسۆزییەوە بەو چەشنە دوا و کامبیزیش لە وڵامدا پێیگووت: "تۆ لە خۆت رادەبینی کە ئامۆژگاری من بکەی، تۆیەکی کە حکوومەتی خۆت پێبەڕێوە نەچوو! چۆن رێنوێنی و ئامۆژگاری بەنرخت دەدا بە باوکی من، پێت دەگووت لە چۆمی ئاراکس بپەڕێتەوە و شەڕ دژی ماساغێتییەکان بکا، ئەویش راست لەو کاتەدا کە ئەوان گەرەکیان بوو هێرش بکەنە سەر ئێمە. تۆ لە یەکەم شەڕدا وڵاتەکەت لەدەستدا و نەتتوانی حوکمڕانی باشی بکەی. لەبیرت نەچێ ئەوە تۆ بووی کە باوکی منت بەکوشتدا، ئەو باوکەی کە گوێی بۆ قسەکانی تۆ رادەگرت. ئێستاش بەخۆت مەنازە و دڵت خۆش مەکە، من لەمێژ بوو لە فرسەتێک دەگەڕام تۆڵەت لێ بستێنمەوە و بە سزای خۆتت بگەیێنم ". هەرکە قسەکانی تەواو بوو، دەستیدایە تیروکەوان، بۆوەی کریسۆس بکووژێ. کریسۆس بەپەلە هەڵات بۆ دەرێ. کامبیز نەیتوانی

به تیر بیئەنگێوێ و خێرا دەستووری بە پاسەوانانی بارەگادا کە ناوبراو بگرن و بیکوژن. پاسەوانەکان کەسایەتی کامبیزیان باش دەناسی، کریسۆس‌یان شاردەوە، بەو حیسابەی ئەگەر کامبیز پەشیمان بێتەوە و داوای کریسۆس بکا، ئەوکاتە دەیبەنەوە لای ئەو و دیاری و خەڵات لە کریسۆس وەردەگرن، چونکە لە کوشتن رزگاریان کردوە. بەڵام ئەگەر کامبیز نە پەژیوان بۆوە و نە داوای کریسۆس بکا، ئیتر بۆخۆیان دەتوانن بیکوژن. بەڕاستیش، پاش ماوەیەکی کورت، کامبیز داوای کریسۆسی کردەوە و کاتێک پیاوانی بارەگا خەبەریان پێگەیشت کە زیندوویە، خێرا کامبیزیان تێگەیاند. کامبیز زۆر خۆشحاڵ بوو، بەڵام ئەوانەی کریسۆس‌یان لە کوشتن رزگار کردبوو، بێ سزا نەمانەوە و کامبیز گشتیانی کوشت.

[۳۷] ئەوانەی باسم لێوەکردن، لەگەڵ زۆر کاری شێتانەیتر، کردەوەکانی کامبیزیان دەرهەق بە پارسەکان و هاوپەیمانان نیشان دا. ناوبراو تەنانەت ئەو ماوەیەی لە شاری مێمفیس بوو، قەبرەکانی هەڵدایەوە و بێڕێزی بە جەنازەکان کرد. کامبیز چوو بۆ نێوەندی ئایینی ئێفێستۆس[1] و گەلێک بە پەیکەرەکانی ئەوێ پێکەنی، چونکە وەک پاتاییەکان دەچوون کە فینیقی‌یەکان بەپڕانی لەسەر لووتی پێشەوەی گەمییەکانیان دەچەقاند. هەرکەس ئەو پاتاییانەی نەدیتبێ، دەبێ بڵێم کە تەواو شێوەی مرۆڤی کورتەباڵا و کودەڵە دەدەن. کامبیز لە حەرەم و خەلوەتگای کاڤیریەکان‌یش[2] وەژوور کەوت، شوێنێک کە جیا لە کاهێنی مەزن، کەس بۆی نەبوو بچێتە نێوەوەی. کامبیز لەوێش بە پەیکەرەکان پێکەنی و فەرمانی‌دا لەبەر چاوی ئەو ئاگر لە گشتیان بەردەن. پەیکەرەکانی ئەو شوێنە، شێوەی ئەوانەی مەعبەدی ئێفێستۆس‌یان دەدا. دەگووتری کە ئەوانە منداڵانی خواکانی ئێفێستۆسن.

---

۱- خوای ئاگر و ئاسن.

۲- کاڤیری یا کاڤیر، نێوی کۆمەڵێک خوای ئەفسانەیی و لە زۆربەی شوێنەکانی یۆنان، بەتایبەت لە دەڤەری سامۆتراکی و تیڤا (مەبەست شاری تیڤای یۆنانە نەک هی میسر) پرستش کراون. واتا خواوەندەکانی بەتوانا یا خواکانی هاوبەش دەدا. ژمارەیان روون نەکراونەوە و وێدەچێ سەرچاوەی فینیقی‌یان هەبووبێ.

[۳۸] بە باوەڕی من، دوای ئەو گشت کردارە ناحەزە، دەکرێ بڵێم کە کامبیز مرۆڤێکی تەواو شێت و دێوانە بوو، چونکە ئەگەر ئاوا نەبوایە، ئەو هەموو ئازارەی بە پیاوانی ئایینی و باوەڕ و دابونەریتەکانیان نەدەگەیاند و نێوەندەکانی وێران نەدەکرد. ئەگەر پیاو پێشنیار بە هەرکەسێک بکا کە باشترین یاسا و قانوون بۆخۆی هەڵبژێرێ، بە دڵنیاییەوە هی وڵات و دەڤەری خۆی هەڵدەبژێرێ، چونکە ئەوی بەلاوە پەسندترە. کەوابوو بۆ هیچکەس دیاردەیەکی سروشتی نییە، مەگەر ئەو کەسە شێت بێ و خەڵکیتری پێ سووک بێ. ئەوەی کە گشت مرۆڤەکانی سەر گۆی زەوی لەو باوەڕەدان کە قانوون و یاسای خۆیان لە هی خەڵکانیتر بەلاوە باشتر و مەقبووڵترە، بەیارمەتی کۆمەڵێک بەڵگە و بەچەشنی خوارەوە دەردەکەوێ: "وەختێک داریوش فەرمانڕەوایی دەکرد، هێندێک لە یۆنانییەکانی بانگهێشت کرد کە ئەوکاتە لەلای ئەو دەژیان. ناوبراو لە یۆنانییەکانی پرسی، چەندە پارە دەخوازن بۆوەی پاش مردنی باوکەکانتان گۆشتی لەشیان بخۆن؟ یۆنانییەکان جوابیان داوە کە بەهیچ شێوەیەک ئەو کارە ناکەن. داریوش ئەوجار کۆمەڵێک خەڵکی هیندی بانگکرد، ئەوانە پێیاندەگووترا کەلاتی (قەلاتی). خواردنیان گۆشتی دایک و باوکیان دوای مردن بوو. دیلمانجێک لەوێ حزووری بوو و لەبەر چاوی یۆنانییەکان کاری وەرگێڕی دەکرد. داریوش لە هیندییەکانی پرسی چەندە پارە دەخوازن بۆوەی تەرمی مردووی دایک و باوکتان بسووتێنن و نەیخۆن. هیندییەکان دەنگیان لێ بەرز بۆوە و داوایان لە داریوش کرد بەو چەشنە لەگەڵ ئەوان نەدوێ. بەهەرحاڵ خەڵک بەو جۆرە بیردەکاتەوە و بە باوەڕی من پیندارۆس[1] قسەیەکی راست دەکا کە دەڵێ: "باوەڕ و نەریت پاشای جیهانن".

---

١- پیندارۆس شاعیری غەزەلنووسی یۆنانی باستان، ساڵی ٥٢٠ی پێش میلاد لە شاری تیڤای یۆنان لەدایکبوو و ساڵی ٤٤٠ی پێش زایین لە سیراکوس مردوە.

## مێژووی دورگەی سامۆس[1]

[٣٩] لەو سەردەمەدا کە کامبیز هێرشی کردەسەر وڵاتی میسر، ڕاست لەو کاتەدا لاکیدیمۆنییەکان[2] پەلاماری دورگەی سامۆسیاندا. ئەو دورگەیە لەژێر دەسەڵاتی پۆلیکراتیس[3]، کوڕی ئایئاکیسدا بوو. پۆلیکراتیس بە یارمەتی سەرهەڵدانی دانیشتووانی دورگە، ئەو حوکمڕانییەی دەستکەوتبوو. ناوبراو سەرەتا شاری سامۆسی لەنێوان خۆی و براکانی، واتە (سیلۆسۆندا و پانداغنۆتۆس)دا بەشکرد. پۆلیکراتیس، دواتر پانداغنۆتۆسی کوشت و سیلۆسۆندای دوور خستەوە و فەرمانڕەوایی تەواوی دورگەی بۆخۆی مسۆگەر کرد.

وەختێک بەو دەسەڵاتە گەیشت، دۆستایەتی و پێوەندی لەگەڵ ئاماسیس، پاشای میسر دامەزراند. کۆڵێکی دیاری بۆ ئاماسیس نارد و قەیاسێک خەڵاتی وەرگرتەوە. زۆری نەکێشا هێزی پۆلیکراتیس گەشەی سەند و بەرەبەرە لە سەراسەری هەرێمی یوونی و باقی وڵاتی یۆنان، ناو و ناوبانگی دەرکرد، چونکە پەلاماری هەر جێگایەکی دابایە، خێرا دەیگرت. ناوبراو ناوگانێکی دەریایی هەبوو کە لە سەد گەمی جەنگیی پەنجا بێڵژەنی و هەزار شەڕکەری تیرهاوێژ پێکهاتبوو. ئاماسیس گشت هەرێمەکەی تووشی شەڕ و وێرانی کرد و بەزەیی بە کەسدا نەهات و لەو باوەڕەدا بوو کە تەنانەت بە زاڵبوون باشتر دەتوانێ خێر بە دۆستەکانیشی بگەیێنێ.

---

١- سامۆس، دورگەی یۆنانی و مەوتەنی فیساغۆراس، لە دەریای ئێژە و لە بەرامبەری چیای میکالی، لە کەنارئاوەکانی ڕۆژئاوای ئاسیای بچووک هەڵکەوتووە.

٢- لاکیدیمۆن: ناوی دوهەم شاری ناسراوی سپارت و پێتەختی لاکونییەکان بووە و هەروەها ناوی دووهەمی سپارتییەکان بووە.

٣- پۆلیکراتیس، حاکمی سەربەخۆی دورگەی سامۆس کە ساڵی ٥٣٢ بەدەسەلات گەیشت. ماوەیەک لەگەڵ ئاماسیسی پاشای میسری ڕێککەوت. کاتێک کەمبوجییە یا کامبیز شەڕی ئاماسیسی کرد، ئەویش لەگەڵ کامبیز پێکهات و ٤٠ گەمی جەنگی بۆ نارد. ساڵی ٥٢٢ی پێش زایین بەدەستی یەکێک لە ساتراپەکان کوژرا.

پۆلیکراتیس دەستی بەسەر کۆمەڵێک شار و دورگە داگرت و لە شەڕی دەریاییدا لێسڤۆسی‌یەکانی[1] شکستدا. لێسڤۆسی‌یەکان بەتەواوی هێزەوە پشتیوانییان لە دانیشتووانی دورگەی میلیتۆس[2] کردبوو. پۆلیکراتیس بەخسیرەکانی لێسڤۆسی ناچارکرد خەندەکی دەوری دورگەی سامۆس هەڵکەنن.

[٤٠] ئاماسیس، پاشای میسر سرنجی تەواوی دابووە هەڵسوکەوتەکانی پۆلیکراتیس و دەیزانی هیچ فرسەتێک لەدەست نادا. کاتێک پۆلیکراتیس سەرکەوتنی پتری وەدەست هێنا، ئاماسیس پەیامێکی نووسی و ناردییە دورگەی سامۆس. ئاماسیس ئەو بابەتانەی وەبیر پۆلیکراتیس خستەوە: "بەختەوەری و پێشکەوتنی دۆست جێگای خۆشحاڵیی هەرکەسێکە، بەڵام سەرکەوتنەکانی تۆ بە دڵی من نین، چونکە دەزانم خواوەند ئێرەیی بە مرۆڤ دەبا و بۆیە هەم بۆخۆم و هەم بۆ ئەو کەسانەی بەلامەوە گرینگن، ئاواتەخوازم لە شکست و سەرکەوتندا بێبەش نەبین. دەخوازم ژیان تێکەڵاوێک لەو دووانە بێ، نەک تەنیا بە سەرکەوتنەوە کۆتایی بێ. ئەوانەی ژیانیان سەراسەر سەرکەوتن بوو، لە ئاخردا بە چارەڕەشی مردوون. باش گوێ لە ئامۆژگارییەکانم بگرە، بۆوەی لە ژیانی سەرکەوتووتدا هاوسەنگی پێکبێ. بیر لەوە بکەوە کە چ بابەتێک بەلاتەوە بایخی هەیە و بۆ چ شتێک، ئەگەر هاتوو لەدەستتدا، پتر بەپەرۆشی. ئەوەی پەرۆشی دێنێ، فڕێی‌بدە، بۆوەی جارێکی‌تر ئازارت نەدا. دوای ئەوەی ئەگەر دیسان شانس و بەخت هەروا بەردەوام و بەبێ هیچ گۆڕانێک میوانت بوو، شڵوێ مەبە و ئەو ئامۆژگارییەی من هەمیشە لەبەرچاو بگرە".

---

١- لێسڤۆس، دورگەیەکی گەورەی یۆنانی باستان، هەڵکەوتوو لە ٢٠ کیلۆمیتری کەنارئاوەکانی ئاسیای بچووک، ئەمڕۆ ناسراوە بە میتیلینی.

٢- میلیتۆس، شارێکی ناسراوی یوونی لە سەردەمی باستاندا و هەڵکەوتوو لە کەنارئاوەکانی رۆژئاوای ئاسیای بچووک و لە ١٥ کیلۆمیتری روباری مێئاندرۆ. تالیس، ماتماتیکزانی یۆنانی خەڵکی ئەو شارە بووە.

[٤١] پۆلیکراتیس پەیامی ئاماسیسی خوێندەوە، تێگەیی کە ناوبراو بەختەوەری ئەوی دەوێ و بیری لەوە کردەوە چ شتێکی لە ژیانیدا هەیە کە ئەگەر لە دەستی بدا، پتر بۆی بە پەرۆش دەبێ. لە ئاکامدا دۆزییەوە. ئەنگوستیلەی مۆرکردنی خۆی، دروستکراو لە ئاڵتوون و زەمرووتی سەوزی کاڵ، دەسکردی تیئۆدۆرس[١]، کوڕی تیلیکلی بوو. کاتێک بڕیاریدا ئەو ئەشیا بەنرخە لەخۆی دوور بخاتەوە، بەو چەشنە هەڵسوکەوتی کرد: گەمییەکی پەنجا هۆدەیی ئامادەکرد و وێڕای خەڵکی هاوڕێی سواربوو و لەجێوە فەرمانیدا شەو لەسەر ئاوی دەریابمێننەوە. تەواوێک لە دورگە دوورکەوتبوونەوە، ئەنگوستیلەی قامکی دەرهێنا و لەبەر چاوی خەڵکی نێو گەمی، فڕێیدایە نێو قوڵایی دەریا.

[٤٢] پێنج شەش رۆژ دوای ئەو رووداوە کابرایەکی ماسیگر ماسییەکی جوان و گەورەی راوکرد و بڕیاریدا وەک دیاری بۆ پۆلیکراتیسی بەرێ. کابرا ماسییەکەی هەڵگرت و بەرەو بارەگای پاشا چوو. داوای چاوپێکەوتنی لەگەڵ پاشا کرد و چووە ژوورێ و ماسییەکەی لەبەردەم پۆلیکراتیس دانا و گووتی: "پاشاکەم، ئەو ماسییەم راوکردوە و پێم حەیف بوو لە بازاڕدا بیفرۆشم، هەرچەند داهاتی جیا لەو کاسبییەم نییە. بڕیارمدا پێشکەش بە جەنابتی بکەم ". پۆلیکراتیس سپاسێکی فراوانی کابرای ماسیگری کرد و پێیگووت: "کارێکی زۆر باشت کردوە، سپاس بۆتۆ و گووتە بە نرخەکان و دیارییە بەوەجەکەت. من داوات لێدەکەم بۆ زیافەتی شەو میوانی من بی". کابرای ماسیگر هەستی بە گەورەیی خۆی کرد و گەڕاوە ماڵ. وەختێک خزمەتکارانی پاشا ماسییەکەیان خاوێنکردەوە، ئەنگوستیلەی پۆلیکراتیس‌یان لەنێو زگیدا دۆزییەوە. خزمەتکاران بە دیتنەوەی ئەنگوستیلەکە گەلێک شاد بوون و خێرا رایانکردە لای پۆلیکراتیس و لەپێشیاندانا و رەوتی دۆزینەوەیان بۆ ناوبراو باسکرد. پۆلیکراتیس باوەڕی بەوە هێنا کە هێزێکی

---

١- تیئۆدۆرۆس، خەڵکی دورگەی سامۆس و هونەرمەندی ناسراوی سەردەمی باستان، دەگووترێ کە دۆزینەوەی گۆنیا و قفڵ و کلیل کاری ناوبراو بووە.

خوایی دەستی لەو کارەدا هەیە. لەجێوە نووسراوێکی ئامادەکرد و گشت بەسەرهاتەکەی بۆ ئاماسیسی پاشای میسر نووسی.

[٤٣] وەختێک ئاماسیس چاوی بەو نامەیەی پۆلیکراتیس کەوت، لێیحاڵی بوو کە ناکرێ ئینسان پێش بە رەوتی چارەنووسی کەسانیتر بگرێ. ئەویش پۆلیکراتیس کە لە گشت بوارێکدا بەختەوەر بوو، تا ئەو جێگایەی کە بەدەستی خۆی ئەنگوستیلەی فڕێدابوو، دووبارە دۆزیبوویەوە. ئاماسیس ئەوجار وەفدی رەوانەی دورگەی سامۆس کرد و پەیمانی دۆستایەتی لەگەڵ پۆلیکراتیس هەڵوەشاندەوە. ناوبراو بۆیە ئەو کارەی کرد، چونکە لەو باوەڕەدا بوو ئەگەر رۆژێک پۆلیکراتیس تووشی چارەنووسی ناخۆش بێ، روحی ئەو وەک دۆست، ئازار دەچێژێ.

[٤٤] لاکێدێمۆنییەکان دژی پۆلیکراتیسی بەختەوەر هێرشیان دەست پێکرد. ئەو پەلامارە لەسەر خواستی کۆمەڵێک لە دانیشتووانی دورگەی سامۆس بوو. هەر ئەو جەماوەرە سامۆسییە، دواتر لە دورگەی کرێت، شاری (کیدۆنیا)یان[١] دروستکرد. پۆلیکراتیس بەبێ ئاگاداری سامۆسییەکان پیاوی ناردە لای کامبیزی کوڕی کوروش، ئەویش لە کاتێکدا کە ناوبراو خەریکی کۆکردنەوەی هێز بە مەبەستی پەلاماردانی وڵاتی میسر بوو. پۆلیکراتیس خەبەری نارد کە کامبیز بەهەر شێوەیەک بۆی بلوێ، داوای هێزی یارمەتیدەر لەو بکات. کامبیز وەختێک ئەو خەبەرەی پێگەیی، پێشنیارەکەی گرینگ نرخاند و داوای لە پۆلیکراتیس کرد کە لەشکر و هێزی دەریایی بۆ بنێرێ تا لە شەڕ دژی میسرییەکاندا کەڵکیان لێوەرگرێ. پۆلیکراتیسی سەرەڕۆ فرسەتی وەگیرکەوت و ئەو کەسانەی لەنێو شارۆمەندانی خۆیدا هەڵبژارد کە لێیان بە شک و گومان بوو و دژایەتییان دەکرد. گشتیانی بە چل[٢] گەمییەوە ناردە لای کامبیز. ئەو هەروەها لەژێرەوە

---

١- کیدۆنیا یا سیدۆنیا یەکێک لە شارەکانی دورگەی کرێت لە سەردەمی ئەنتیکدا و ئەمڕۆ ناسراوە بە خانیا.

٢- مەبەست لەو گەمییانەیە کە خاوەن سێ ریز بێڵژەن بوون و خێراتر لە گەمیتر بوون.

داوای له کامبیز کرد که به هیچ شێوەیەک ڕێگای گەڕانەوە بۆ دورگەی سامۆس بەو لەشکرە نێردراوە نەدا.

[٤٥] کەسانێک دەگێڕنەوە که ئەو کۆمەڵە خەڵکە سامۆسی‌یەی پۆلیکراتیس ناردبوونی، قەت نەگەیشتنە وڵاتی میسر، له هەرێمی کارپاسۆ[١] گیرسانەوە و دوای ڕاوێژ، بەو قەناعەتە گەیشتن لەوێ نیشتەجێ بن و واوەتر نەڕۆن.

خەڵکانێکی‌تر دەڵێن، ئەوانە گەیشتنە میسر و لەوێ کامبیز گشتیانی خستە ژێر چاوەدێری خۆی، بەڵام دواتر توانیویانە لەدەست کامبیز ڕابکەن. هەڵبەت له کاتی سەفەری سەر دەریا بەرەو دواوە، واتە بۆ دورگەی سامۆس، پۆلیکراتیس پێشی‌پێگرتن و شەڕ لەنێوانیاندا سازبوو. ئەو کۆمەڵە خەڵکەی له گەڕانەوەدا بوون، سەرکەوتن و له خاکی دورگەی سامۆس دابەزین. ئەوجار شەڕی ویشکایی دەستی پێکرد و لەوێدا تووشی شکست هاتن و ناچاربوون پەنا بۆ لای لاکێدێمۆنی‌یەکان بەرن.

جەماوەرێکی‌تر لەو باوەڕەدان که ئەوانە هێزەکانی پۆلیکراتیس‌یان تێک‌شکاند، که لێرەدا من پێموایە ڕاست نییە، چونکە ئەوانە ئەگەر هێندە خاوەن هێز بوونە که به تەنیا پۆلیکراتیس ببەزێنن، پێویستی نەدەکرد داوای یارمەتی له لاکێدێمۆنی‌یەکان بکەن. جیا لەوەش، پۆلیکراتیس هێزێکی لەشکری بەکرێگیراو و کەمانداری گەورەی هەبوو و دوور له ئاقڵە، لەبەرامبەر لەشکری بچووکی گەڕاوەکانی سامۆسی‌دا شکستی خواردبێ. هەروەها، سەبارەت بەو بەشە له سامۆسی‌یەکانی ژێر فەرمانی پۆلیکراتیس‌دا، دەگووترێ که ناوبراو ژن و منداڵی ئەوانەی وەک بارمتە لەنێو ئۆردوگایەکدا دەستبەسەرکرد بوو و دەیویست که هەرکات پیاوەکان بخوازن لەگەڵ گەڕاوەکان ڕێکبکەون و یەک بگرن، ئەو به هاسانی ئاگر له گشت ژن و منداڵەکە بەربدا.

[٤٦] وەختێک سامۆسی‌یەکانی دەرکراو بەهۆی ناهەقی پۆلیکراتیس گەیشتنە هەرێمی سپارت، لەگەڵ سەرۆک هۆزەکانی ئەوێ دیداریان کرد.

---

١- کارپاسۆ یا کارپاتۆس، دورگەیەک له باشووری ڕۆژئاوای دورگەی ڕۆدۆس.

بەوردی سەبارەت بە رەوشی ژیان و بەسەرهاتی خۆیان بۆ ئەو سەرۆک هۆزانە قسەیان کرد و چاوەڕوانی یارمەتی بوون. سپارتی‌یەکان وڵامیان داوە کە ئەو بابەتانەی لە سەرەتای دیداردا باسیان کراوە، گشتیان لەبیر چووەتەوە و ئێستاش لەگەڵ پێشنیارەکانی ئەو دیدارەی دوایی نین. سامۆسی‌یەکان بۆ جاری دووهەمیش چاویان بە سپارتی‌یەکان کەوتەوە. ئەوجار هەر سامۆسی‌یەکت بدیبایە، تورەکێکی لە شان کردبوو. ئەوانە لەو چاوپێکەوتنەدا قسەیان نەکرد و ئەو کارەشیان مانای تایبەتی خۆی هەبوو کە: "تورەکە پێویستی بە ئاردە ". سپارتی‌یەکان تێگەیین و لە وڵامدا گووتیان کە زۆر قسە و باسمان سەبارەت بە تورەکە بیستووە، ئێستا دەزانین چیتان گەرەکە و لەجێوە یارمەتی سامۆسی‌یەکانیان‌دا.

**[٤٧]** سپارتی‌یەکان خۆیان سازکرد و دژی پۆلیکراتیس کەوتنە شەڕ،[١] هەڵبەت لەڕووی قەدرزانینەوە، وەک سامۆسی‌یەکان خۆیان دەگێڕنەوە. ئەوەش لەبەرامبەر ئەو چاکەیە کە کاتی خۆی سامۆسی‌یەکان لە سەردەمی شەڕ دژی مێسینی‌یەکان،[٢] هێزی دەریاییەکەیان، یارمەتی سپارتی‌یەکانی دابوو.[٣]

لاکیدێمۆنی‌یەکان، ئەوان خۆیان دەڵێن، مەبەستیان یارمەتیدانی سامۆسی‌یەکان نەبووە، بەڵکوو ویستوویانە تۆڵەی دزینی خومرەیەکی خۆیان و قەڵغانێکی ئاماسیس پاشای میسر بکەنەوە کە پێشتر وەک دیاری بۆ کریسۆس ناردرابوون.[٤] سامۆسی‌یەکان ساڵێک بەر لە ونبوونی خومرەکە، قەڵغانەکەیان دزیبوو. ئەو قەڵغانە لە کەتانی چندراو و بە کوڵێک نەخش و نیگاری ئاژەڵان رازابۆوە و بە بەڵمی گیا و ئاڵتوون روکێش کرابوو. وەک شاکارێکی هونەری بەنرخ سەیر دەکرا، چونکە لە لۆکەی رستراو سازکرابوو و خاوەن سێسەدوشێست داوی تایبەت بوو. قەڵغانی لەو چەشنە کە شێوەی

---

١- ٥٢٥ی پێش زایین.

٢- مێسین، شارێکی مەحکەمی یۆنانی باستان، هەڵکەوتوو لە باشووری نیمچە دوورگەی پێلۆپۆنیسۆس کە لە شەڕ دەگەڵ سپارتی‌یەکان وێران بوو.

٣- لە دووهەمین شەڕی مەدیترانەیی (٦٦٧ – ٦٨٥ی پێش زایین).

٤- تاڵانی دەریایی دوورگەی سامۆس.

ئەوەیان بدا، ئاماسیس لە سەردەمی فەرمانڕەوایی خۆیدا، لە هەرێمی لیندۆس[1] پێشکەش بە خواوەند ئاتینای[2] کردبوو.

[٤٨] کۆرینتی‌یەکان[3] یارمەتییەکی فرەیان‌دا، بۆوەی لەشکرکێشی دژی سامۆسی‌یەکان جێبەجێ بێ، چونکە سامۆسی‌یەکان وەچەیەک بەر لەو پەلامارە هێرشیان کردبووە سەر کۆرینتی‌یەکان (تەقریبەن لەو سەردەمەدا کە سامۆسی‌یەکان خومرەی گۆرینیان دزیبوو). ئەو کاتە پێری‌ئاندرۆس،[4] کوڕی کیپسیلی[5]، سێسەد مێرمناڵی ناردبووە لای ئالی‌ئاتیس[6] بۆوەی بیان‌خەسێنێ. ئەو مێرمناڵانە گشتیان سەر بە بنەماڵە ناسراوەکانی دورگەی کێرکیرا[7] بوون. وەختێک کۆرینتی‌یەکان مێرمناڵەکانیان هێنایە دورگەی سامۆس، دانیشتووانی دورگەکە لە مەبەستیان حاڵی بوون و زانیان کە ئەوانە بۆ شاری سارد[8] دەبەن. خەڵک خێرا چوونە پەرستگەی ئارتێمیس[9] و

---

١- لیندۆس، یەک لە شارەکانی یۆنانی باستان، هەڵکەوتوو لە باشووری ڕۆژهەڵاتی دورگەی ڕۆدۆس.

٢- ئاتینا، ئیلاهەی بیر و ئەندیشە لە یۆنانی باستان و پارێزەری شاری ئاتین بووە.

٣- کۆرینتوس، شارێکی ئارغۆسی لە یۆنانی باستان ، هەڵکەوتوو لەنێوان کەنداوەکانی ئێیینا (سارۆنیکۆ) و کۆرینتیاکۆ.

٤- پێری‌ئاندرۆس، حوکمڕانی سەرەڕۆی کۆرینتۆ لەنێوان ساڵەکانی ٦٢٥ تا ٥٨٥ی پێش میلاد لەو شارە دەسەڵاتی هەبووە.

٥- کیپسێلی، باوکی پێری‌ئاندرۆس و عوکمڕانی کۆرینتۆ لە سەدەی حەوتی پێش زایین. ناوبراو پتر پارێزەری چینی خواروو و دژبەری ئەشرافییەت بوو. کوڕەکەشی هەمان ڕێوشوێنی ڕەچاوکرد.

٦- ئالی‌ئاتیس پاشای ناسراوی لیدیایی لە بنەماڵەی ئیراکلیس، لەنێوان ساڵەکانی ٧٦١ تا ٧٤٧ پێش زایین دەسەڵاتدار بووە. جێنشینی ئەو کریسۆس بوو کە لە شەڕ لەگەڵ کوروش یەخسیرکرا.

٧- کێرکیرا، یەکێک لە دورگە مەزنەکانی یۆنانی لە سەر حدودی وڵاتی ئاڵبانی، ئەمڕۆ ناسراوە بە کۆرفوو.

٨- سارد، پێتەختی وڵاتی لیدی هەڵکەوتوو لە نێوەندی باکووریی ئاسیای بچووک و لە سەردەمی کریسۆس‌دا تەواوێک ناوبانگی دەرکرد.

٩- ئارتێمیس، خوای ڕاو وشکار لە یۆنانی باستان. لە نێوەندەکانی ئایینی دێلفوس و ئێفێسۆس خاوەن مەعبەد بووە. مەعبەدی دووهەم ٢٠٠ ساڵی خایاندوە تا تەواو دروستکراوە. ئەو خوایە بە ڕوخسار پیاوە و نیشانەی هیلالی لەسەر نێوچاوانییەتی و کەمان و خەنجەری پێیە.

پرسیان بە کاهێنی ئەو شوێنە ئایینییە کرد و ئامۆژگارییان وەرگرت و کۆرینتی‌یەکانیان ناچارکرد کە مێرمناڵەکان دوورنەخەنەوە. کۆرینتی‌یەکان ئیزنیان بە هیچکەس لە سامۆسی‌یەکان نەدا خواردن بۆ مێرمناڵەکان بەرن. بەپێی ئامۆژگاری سامۆسی‌یەکان، مێرمناڵەکان پەنایان بردە پەرستگەی ئارتیمیس. سامۆسی‌یەکان جێژنێکیان وڕێخست و تا ئەمڕۆش وەک بۆنە ماوە. شەو کە داهات، شایی و هەڵپەڕکێی کچان و کوڕانی سامۆسی دەستی‌پێکرد. خواردەمەنی و کونجی و هەنگوین ئامادەکرا و دەبوایە بۆ خواوەند ئاتینا بەڕێکرێنە ژووری مەعبەد. گەنجانی سامۆسی بەچەشنێک خواردەمەنییەکانیان دەبردە ژوور کە مێرمناڵەکان بتوانن بیانڕفێنن. بەزم و شایی و خواردەمەنی بردن و رفاندن چەند جارێک دووپات بۆوە، تا ئەو وەختەی کە کۆرینتی‌یەکان پێیانزانی و لە داخان رۆیشتن. سامۆسی‌یەکان گشت مێرمناڵەکانیان رزگارکرد و بەرەو کێرکیرا ناردیاننەوە.

[٤٩] ئەگەر دوای مەرگی پێری‌ئاندرۆس، دانیشتووانی دورگەی کۆرینتۆ پێوەندی دۆستانەیان لەگەڵ خەڵکی کێرکیرا پاراستبا، ئیتر پێویست نەبوو لەو لەشکرکێشییەی دژی سامۆسی‌یەکان‌دا بەشداری بکەن، ئەویش تەنیا لەبەر ئەو بێ‌ڕێزییەی کە پێیان‌کرا. هەر بەڕاستی، لەو کاتەوە کە کۆرینتی‌یەکان موهاجیرنشینی دورگەی کێرکیرایان بنیات‌نا، بەردەوام کێشەیان لەنێواندا هەیە، هەرچەند خاوەنی یەک رەگەزی هاوبەشن. هەڵبەت ئەوە کۆرینتی‌یەکان بوون کە قەڵسەیان لە کێرکیری‌یەکان دەگێڕا. دەبێ ئەوەش بڵێم، پێری‌ئاندرۆس سێسەد منالی ناردە شاری سارد کە وەک پێشتر باسم لێوە کرد، گشتیان سەر بە بنەماڵە مەزنەکای کێرکیرایی بوون و مەبەستیش تۆڵەسەندنەوە نەبوو، چونکە لە سەرەتای کاردا، کێرکیری‌یەکان خەراپەکاری گەورەیان دەرهەق بە پێری‌ئاندرۆس کردبوو.

[٥٠] پاش ئەوەی پێری‌ئاندرۆس، مێلیسای ژنی خۆی کوشت، بەڵایەکی سەیری بەسەر هات. ناوبراو لە خاتوو مێلیسا[١] دوو کوڕی هەبوو، یەکیان

١- مێلیسا، ژنی پێری‌ئاندرۆس و کچی پاشای ئێپیداڤرۆس.

هەڤدە و ئەوەی‌تریش هەژدە ساڵان. باپیری ئەو کوڕانە لە دایکەوە،[1] حوکمڕانی هەرێمی ئێپیداڤرۆس[2] بوو. ناوبراو ئەو منداڵانەی بانگهێشت کرد و میوانداری لێکردن و گەلێک لەگەڵیان مێهرەبان جوڵایەوە، چونکە منداڵی کچەکەی بوون. کاتی بەڕێ‌کردنەوەیان بۆلای باوکیان، لە چرکەی ئاخردا، پێیگووتن: "منداڵەکانم، پێموایە دەزانن کە کێ دایکی ئێوەی کوشت". کوڕە گەورەکە سرنجی بەو قسەیە نەدا، بەڵام ئەوەی بچووک کە ناوی لیکۆفرۆن[3] بوو، تەواوێک بەو گووتەیە ناراحەت بوو و هەر کە گەڕایەوە کۆرینتۆ، حەزی نەکرد لەگەڵ باوکی، واتە بکوژی دایکی قسە بکات. هەرکات باوکی لەگەڵی دەدوا، کوڕە وڵامی نەدەدایەوە و ئەگەر لەمەر هەڵسوکەوتەکەشی دەکەوتە بەر پرسیار، هیچ وشەیەکی لە زاری نەدەهاتەدەر. پێری‌ئاندرۆس تەواوێک بەو وەزعە قەڵس بوو و کوڕەکەی لە بارەگای پاشایەتی دوور خستەوە.

**[٥١]** پێری‌ئاندرۆس پاش ئەوەی کوڕەکەی دەرکرد، لە کوڕە گەورەکەی پرسی کە باپیریان چی پێگوتوون. ئەو کوڕە وڵامی داوە کە باپیریان بە حورمەتێکی فرەوە وەری‌گرتوون، بەڵام لەبەر ئەوەی دوایین گووتەی باپیری حاڵی نەبوو، ئێستا ناتوانێ وەبیری بێتەوە کە مەبەستی چی بووە.

پێری‌ئاندرۆس لەسەر ئەو بابەتە پێداگر بوو کە بزانی باپیری منداڵەکان چی پێگوتوون. ناوبراو پتر زەختی لە کوڕە گەورە کرد. ئەو کوڕە لە کۆتاییدا قسەی باپیری وەبیر هاتەوە و بۆ باوکی گێڕاوە. پێری‌ئاندرۆس ئەوجار لێی‌حاڵی بوو کە گرفتەکە زۆر لەوە گەورەترە. بڕیاری‌دا توندوتیژی پتر لە هەمبەر کوڕە بچوکەکەی رەچاو بکا. فەرمانی بەو کەسانەدا کە میواندارییان لە کوڕە دەکرد، لەمەو بەدوا بۆیان نییە درگای ماڵی خۆیان لە کوڕە بکەنەوە.

---

١- مەبەست لە پرۆکلیس، پاشای ئارغۆسی و حوکمڕانی ئێپیداڤرۆسە.

٢- ئێپیداڤرۆس، یەکێک لە شارەکانی یۆنانی باستان لە هەرێمی ئارغۆس.

٣- لیکۆفرۆن، کوڕە بچووکی پێری‌ئاندرۆسی حوکمڕانی کۆرینتۆ، دوای کوژرانی دایکی بەدەست باوکییەوە، رووی لە باوکی وەرگێڕا و بووە کەسایەتییەکی ئەفسانەیی لە مێژوودا.

لیکی‌فۆرۆن ماڵبەماڵ دەگەڕا و لە هیچ کوێ رایاننەدەگرت، چونکە پێری‌ئاندرۆسی باوکی هەڕەشەی کردبوو کە هەرکەس خۆی لە فەرمانی ئەو ببوێرێ، تووشی سزای مەرگ دەبێ. لیکی‌فۆرۆن دۆستەکانیشی بەتاقی کردەوە، ئەوانیش لەترسی باوکی ناوبراو، بەدزییەوە چاویان بەسەرییەوە بوو.

[٥٢] لەکۆتاییدا، پێری ئاندرۆس بڕیاریدا، هەرکەس کوڕەکەی راگرێ یا قسەی لەگەڵدا بکات، دەبێ تاوان بدا بە پەرستگەی ئاپۆلۆن[١] و رێژەکەشی بۆخۆی دیاری‌کرد. هەربۆیە، هیچکەس لەمەوبەدوا ئامادە نەبوو نە کوڕە راگرێ و نە قسەی لەگەڵدا بکا. کوڕە ناچاربوو بۆ خەوتن پەنابەرێتە بەر هەیوانەکان. رۆژی چوارەمی ئەو رەوشە بوو، وەختێک پێری‌ئاندرۆس کوڕەکەی خۆی لە بارودۆخێکی ئەوتۆدا بینی و بۆیە یەکڕاست چووە لای و پێیگووت: "کوڕم کامیانت پێ باشترە، بارودۆخی ئێستا یا حوکمڕانی وڵات و بەساحێب کردنی ئەو گشتە سامانە کە تۆ دەبییە میراتگری، هەڵبەت ئەگەر بەدڵی من بجوڵێیەوە. تۆ کوڕی منی، من پاشای وڵاتی کۆرینتۆم. تۆ وەک دێوانە و بێعەقڵێک دژایەتی من دەکەی کە نەدەبوایە قەت بەو شێوەیە هەڵسوکەوتت بکردایە. گرفتێک لە بنەماڵەدا هاتوەتەگۆڕێ و تۆ لەمن وەشک کەوتووی، من لەو بارەوە نیگەران و ناڕاحەتم، چونکە ئەوە منم کە ئەو خانەدانەم پاراستووە. ئێستا دەبێ تێگەیشتبی کە باشتر وایە تەکانێک بەخۆت بدەی، نەک خانەدانەکە هەڵتەکێنی.[٢] تۆ دەزانی قەڵس‌بوون لە دایک و باوک چ مانایەکی هەیە و بەتایبەت لەگەڵ ئەو کەسانەی لە تۆ بەهێزترن. ئێستا باشترە بگەڕێیەوە ماڵی خۆت ".

پێری‌ئاندرۆس بەو شێوەیە لەگەڵ کوڕە بچووکەکەی ئاخاوت. کوڕە وڵامی هیچ پرسیارێکی نەداوە، لەسەر بڕیاری پێشوو پێری‌ئاندرۆس دەبوایە

---

١- ئاپۆلۆن، خواوەندی رۆشنایی و نوور لە یۆنانی باستان و سەکەوتوو و ناسراو لە پێشگۆیی و ئامۆژگاریدا.

٢- پیندارۆس، شاعیری یۆنانی سەردەمی باستان لە دیوانە شیعرەکەی بەناوی پیتیکودا دەڵێ: ئێرەیی لە بەزەیی پێداهاتن بەجێترە.

سزای قسەکردن لەگەڵ کوڕەکەی بداتە پەرستگەی ئاپۆلۆن. حاکمی سەرەڕۆ لەوە تێگەیی کە کوڕەکەی قەرار نییە بەقسەی بکا، بۆوەی لەبەرچاوان ونبێ، بە گەمی ناردییە کێرکیرا. ئەو دورگەیە لەژێر دەسەڵاتی خۆیدابوو. وەختێک کوڕەکەی ناردە کێرکیرا، ئەوجار لەشکری ئامادەکرد بۆ هێرشکردنە سەر پرۆکلیس خەزووری خۆی و باپیری منداڵەکان. لەڕاستیدا پرۆکلیس ئەو گرفتەی بۆ پێریئاندرۆس سازکردبوو. پرۆکلیس حوکمڕانی هەرێمی ئێپیداڤرۆس بوو. پێریئاندرۆس لە کۆتاییدا ناوبراوی بەدیل گرت.

**[٥٣]** چەند ساڵێک تێپەڕی، پێریئاندرۆس پیر ببوو، هەستی بەوە کرد کە ئیتر هێزی جارانی نەماوە و ناتوانێ لەوە زیادتر حوکمڕانی وڵات بکات و بۆیە ڕاسپاردەی ناردە لای کوڕەکەی لە کێرکیرا و داوای لە لیکۆفرۆن کرد بێتەوە و دەسەڵات بەدەستەوە بگرێ. پێریئاندرۆس زۆری حەز لە کوڕە گەورەکەی نەبوو و بەلایەوە منداڵێکی گێژ و حۆل بوو. لیکۆفرۆن ئامادە نەبوو وڵامی هیچ داخوازییەکی کابرای ڕاسپاردە بداتەوە. پێریئاندرۆس بەو حاڵەش ئەو کوڕەی خۆشدەویست، بۆ جاری دووهەم ڕاسپاردەی ناردەوە لای. ڕاسپاردەی ئەو کەڕەتە، خوشکە تاقانەی کوڕە و کچی پێریئاندرۆس بوو. کاتێک ئەو خوشکە گەیشتەجێ، بە کوڕەی گووت:"براڵە، پێتوایە باشترە کە دەسەڵات بکەوێتە دەستی خەڵکیتر و مڵک و سامانی باوکمان لەنێو بچێ و وێران بێ، یا ئەوە کە تۆ بگەڕێیەوە و حوکمڕانییەکە بەدەستەوە بگری؟ بگەڕێوە و چیتر زیان بەخۆت مەگەیێنە. کەللەڕەقی خووخدەیەکی باش نییە و گەلێک بێ ئاقڵییە پیاو خەراپە بە خەراپە وڵام بداتەوە".[١] زۆرکەس ڕێگای مامنێوەندی پێ مەسلەحەتترە لە تۆڵەسەندنەوەی توندئاژۆیانە. خەڵکێکی زۆر بۆ تۆڵە ئەستاندنەوەی دایکیان، مڵک و سامان و باوکیشیان لەدەست چووە. حوکمڕانی زاڵمانە، ئاییندەی بۆ نییە. خوازیاری ئەو دەسەڵاتە فرەن، چونکە باوکمان پیر و بێهێز بووە. ئەو میراتە مافی تۆیە و داوات لێدەکەم بە خەڵکی لاوەکی مەبەخشە". خوشکە تەواو

---

١- سۆفۆکلیس، لە کتێبی ئێئاسدا دەڵێ: مرۆڤەکان ئەو کاتە نەخۆش دەکەون کە خەراپە بە خەراپە چارەسەربکەن.

راشکاوانه قسەی لەگەڵ براکەی کرد، وەک چۆن باوکی پێی‌گوتبوو. لیکۆفرۆن وڵامی داوە، تا ئەو کاتەی باوکی لە ژیاندابێ، گەرەکی نییە بگەڕێتەوە کۆرینتۆ. کاتێک کچە ئەو وڵامەی گەیاندەوە باوکی، پێری‌ئاندرۆس بۆ سێهەم جار راسپاردەی ناردەوە لای کوڕەکەی خۆی و ئامادەیی دەربڕی کە لە کۆرینتۆ نەمێنێ و بچێتە کێرکیرا بۆوەی لیکۆفرۆن بێتەوە کۆرینتۆ و لە جێی ئەو دانیشێ و حوکمڕانی بەدەستەوە بگرێ.

لیکۆفرۆن ئەو پێشنیارەی پەسند کرد و کاتێک خۆی ئامادەکرد کە سەفەر بۆ کۆرینتۆ بکا و لەولاشەوە پێری‌ئاندرۆس خەریکی خۆسازکردن بوو کە لە کێرکیرا دامەزرێ، خەڵکی ئەو دورگەیە خێرا بە خەبەرەکەیان زانی. ئەو خەڵکە بە هاتنی پێری‌ئاندرۆس تەواوێک قەڵس بوون و بۆوەی پێشی پێبگرن کە ناوبراو نەیێتە دورگەکەیان، خێرا کوڕەیان کوشت. پێری‌ئاندرۆس دوای ئەو رووداوە بڕیاری‌دا تۆڵە لە دانیشتووانی کێرکیرا بستێنێتەوە.

[٥٤] لاکێدیمۆنی‌یەکان هێرشی دەریاییان بە ژمارەیەکی زۆر کەشتی جەنگی دەست پێکرد و دورگەی سامۆس‌یان گەمارۆدا. کەلێنیان لە دیواری شار خست و بورجی پاسەوانیان داگیرکرد. ئەو بورجە ڕوو لە دەریا و لە دەرەوەی شار هەڵکەوتبوو. پۆلیکراتیس توانی بە لەشکرێکی زۆرەوە، پەلاماردەران پاشەکشە پێبکات. لە سەرەوەی قەڵا کە لە داوێنی چیا هەڵکەوتبوو، هێرشکەران رێگای دەربازبوونیان دۆزییەوە. ئەوانە پتر خەڵکانی سامۆسی و هێزی بەکرێگیراو بوون. هەڵبەت ماوەیک لە بەرامبەر هێزەکانی لاکێدیمۆنی‌دا شەڕیان کرد، بەڵام دواتر گشتیان هەڵاتن. لاکێدیمۆنی‌یەکان هەرکام لەوانەیان دەست بکەوتایە، لەجێوە دەیان‌کوشت.

[٥٥] ئەگەر لاکێدیمۆنی‌یەکانی ئەو رۆژە، لە شەڕدا وەک ئارخیاس و لیکۆپیس شەڕیان کردبا، دورگەی‌سامۆس تەواو داگیردەکرا. تەنیا ئەو دوو کەسە راوی سامۆسی‌یەکانیان کردبوو و دیواری شاریان بڕیبوو و هەربۆیەش لە گەمارۆ کەوتبوون و کوژرابوون.

من خۆم چاوم بە وەچەی سێهەمی ئارخیاس لە شاری پیتانی[1] کەوت. ئەو شارە شوێنی لەدایکبوونی ئارخیاس بوو.[2] خەڵکی بیانی پتر لە سامۆسی‌یەکان ڕێز لەو بنەماڵەیە دەگرن. باوکی ئەو نەوەیەی کە من چاوم پێیکەوت، ناوی سامیۆس بوو چونکە باپیرە گەورەی قارەمانانە لە دورگەی سامۆس کوژرابوو، ئەو نەوەیە بە منی گووت کە حورمەتێکی زۆر بۆ خەڵکی سامۆسی دادەنێ، لەبەر ئەوەی دانیشتووانی دورگە جەنازەی باپیرە گەورەیان بەحورمەتەوە ناشتبوو.

[٥٦] لاکێدیمۆنی‌یەکان کاتێک گەمارۆی دورگەی سامۆس‌یان‌دا، چل ڕۆژی کێشا و هیچ سەرکەوتنێکی بەدواوە نەهات، بۆیە ناچار بوون بگەڕێنەوە هەرێمی پێلۆپۆنیسۆ. بەپێی بۆچوونێک کە نابێ ڕاست بێ، پۆلیکراتیس قەیاسێکی فرە پارەی سکەی لە مزی ئاوزێر دروستکرد و دایە لاکێدیمۆنی‌یەکان، بۆیە ئەوانیش دەستیان لە گەمارۆدانی دورگەی سامۆس هەڵگرت. دەبێ بڵێم ئەوە یەکەم لەشکرکێشی دووری‌یەکانی لاکێدیمۆنی بۆ سەر ئاسیا بوو.

[٥٧] سامۆسی‌یەکان هێرشیان کردەسەر پۆلیکراتیس، ڕاست لەو سەردەمەدا کە قەرار بوو لاکێدیمۆنی‌یەکان دورگەی سامۆس جێبهێڵن. ئەو سامۆسی‌یانە بە گەمییەکی جەنگی گەورە بەرەو دورگەی سیفنۆس وەڕێکەوتن. ئەوانە پێویستیان بە پارە هەبوو و دانیشتووانی سیفنۆس‌یش گەلێک دەوڵەمەند، پتر لە گشت دورگەنشینانی ئەو هەرێمە خاوەن کانزای زێڕ و زێو بوون. ئەوەندە ساماندار کە بە دە لە سەدی داهاتیان، توانیان بەتەنیا گەنجێک بەرابەری تەواوی کەرستەکانی بەوەجی دەولەمەندانی‌تر بە نێوەندی ئایینی دێلفوس ببەخشن. دانیشتووانی سیفنۆس گشت ساڵێک قازانج و دەسکەوتەکانیان لەنێوان خۆیاندا بەش‌دەکرد. جارێکیان لە کاتی بردنی

---

١- پیتانی، یەک لە دوازدە شارەکانی ئێئۆلی لە ولاتی لیدیا و لە کەنار دەریای ئێژە.

٢- پێویستە بگووترێ کە ئەو سەردەمە کومەڵگای سپارت بەشێوازی کومۆنی بەڕێوە چووە، نەک بەشێوەی کومۆنی.

گەنج بۆ پەرستگەی دیلفوس پرسیاریان لە پیتیا (کاهینی مەزن) کرد ئاخۆ ئەو سامان و داراییە تاکەی دەوامی دەبێ؟ پیتیای ئەوانە (خاتوو کاهینی مەزن) ئەو وڵامەی داوە: "وەختێک روخساری بینای پریتانی[1] و بازاڕی شار تەواو سپی هەڵگەڕا، ئەوکاتە پرسیاری ئەوتۆمان لێبکەن، پرسیار لە خەڵکێکی نەرم و نیان، بۆوەی ئێوە لە بەرامبەر ئازاری جەنجەڕی دار و نەقیزەی سور بپارێزرێن".

ئەو سەردەمە بازاڕ و بینای نێوەندی دەسەڵاتی دورگەی سیفنۆس لە بەردی مەرمەڕی دورگەی پارۆس[2] دروستکرابوو.

[٥٨] سیفنۆسی‌یەکان نە ئەو کاتە و نە وەختێک سامۆسی‌یەکان هاتنە دورگەکەیان، لەو ئامۆژگارییە حاڵی نەبوون. سامۆسی‌یەکان هەرکە نیزیکی دورگەی سیفنۆس کەوتنەوە، خێرا یەکێک لە گەمییەکانیان بە راسپاردەوە نارده ئەوێ. زەمانی زوو تەواوی گەمییەکان بە رەنگی سوور بۆیاخ دەکران. ئەوە مانای تایبەت بەخۆی هەبوو. خواوەند پیتیا بە دانیشتووانی سیفنۆسی گوتبوو کە خۆیان لە جەنجەڕی دار و نەقیزەی سوور بپارێزن. راسپاردەکان گەیشتنە نێوەندی دورگە و داوای دە تاڵاند پارەی قەرزیان کرد. سیفنۆسیەکان رازی نەبوون و سامۆسی‌یەکان دەستیان بە تاڵانی شارەکە کرد. سیفنۆسی‌یەکان وەخۆکەوتن و روویان لە بەرگری کردنی دورگەکەیان کرد. شەڕ سازبوو و شکستیان خوارد و ژمارەیەکی زۆریان لە پشت دەروازەکانی شار مانەوە. دوای ئەو شەڕە سامۆسی‌یەکان سەد تاڵاندیان لەگەڵ خۆیانبرد.

[٥٩] دواتر سامۆسی‌یەکان دورگەی (ئیدرا)یان[3] لە دانیشتووانی ئێرمیۆنی[4] کڕی. ئەو دورگەیە لە نیزیک پێلۆپۆنیسۆ هەڵکەوتووە و بە ئەمانەتەوە

١- پریتانی، نێوەندی حکوومی و ئیداری لە شارەکانی یۆنان.

٢- مەرمەڕی پارۆس، بەردێک بوو کە لە یۆنانی باستان گشت رووداوە مێژوویيەکانیان لەنێوان ساڵەکانی ١٥٨٢ تا ٥٣٤ لەسەر هەڵکەندبوو.

٣- ئیدرا، دورگەیەکی یۆنانی لە ١٠ کیلۆمیتری کەنارئاوەکانی ئارغۆس.

٤- ئێرمیۆنی، شارێکی یۆنانی باستان لە هەرێمی ئارغۆس.

درابوو به تریزینی‌یه‌کان[1]. ساموٚسی‌یه‌کان پاشان چوونه دورگه‌ی کریت و له‌وێ شاری (کیدۆنیا)یان[2] بیناکرد. ئه‌وان بۆ ئه‌و مه‌به‌سته وه‌رێنه‌که‌وتبوون، به‌ڵکوو مه‌به‌ستیان ته‌نیا وه‌ده‌رنانی دانیشتووانی زاکینتی له دورگه‌ی زاکینتۆ[3] بوو و به‌س. ساموٚسی‌یه‌کان له کیدۆنیا مانه‌وه و بۆ ماوه‌ی پێنج ساڵ ژیانێکی پڕ له خۆشییان رابوارد. ئه‌و کۆمه‌ڵه په‌رستگانه‌ی له کیدۆنیا هه‌ن، به‌ده‌ست ساموٚسی‌یه‌کان دروست کراون، به‌تایبه‌تی په‌رستگه‌ی دیکتینیس[4]. ساڵی شه‌شه‌می مانه‌وه‌یان، دانیشتووانی ئێیینی به یارمه‌تی کریتی‌یه‌کان، له شه‌ڕێکی ده‌ریایی سه‌ختدا، ساموٚسی‌یه‌کانیان شکستدا و یه‌خسیریان کردن و لووتی پێشه‌وه‌ی گه‌مییه‌کانی ئه‌وانیان بڕی، چونکه به‌وێنه‌ی سه‌ری په‌یکه‌ره‌ی کاپرۆ (که‌متیار) دروست کرابوون و گشت ئه‌و لووتانه‌یان وه‌ک خه‌ڵات به په‌رستگه‌ی ئاتینا له ئێیینا به‌خشی.

ئێیینی‌یه‌کان خۆیان به‌شێوه‌یه‌کی زۆر خه‌راپ جوڵانه‌وه، چونکه له کاتی خۆیدا، واته ئه‌و سه‌رده‌مه‌ی ئامفیکراتیس پاشایه‌تی ده‌کردن، ساموٚسی‌یه‌کان په‌لاماری دورگه‌ی (ئێیینا)یان دابوو و زیان و زه‌ره‌رێکی فره‌یان به دانیشتووانی ئه‌و شوێنه گه‌یاندبوو. ئه‌وه هۆی سه‌ره‌کی دژکرده‌وه‌کانی دانیشتووانی ئێیینی بوو.

[٦٠] پێموایه به تێروته‌سه‌لی باسی ساموٚسی‌یه‌کانم کرد، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ئه‌وان سێ به‌رهه‌می شاکاریان بینا کرد که له هی خه‌ڵکانی ده‌وروبه‌ری خۆیان به‌وه‌جتر بوون. له داوێنی چیایه‌ک به به‌رزایی سه‌دوپه‌نجا ئۆرغیس، تونێلێکیان بۆ ئه‌وبه‌ری چیا لێدا. مه‌ودای ئه‌و تونێله ده‌گاته حه‌وت ستادیۆ و به‌رزایی و به‌رینایی هه‌شت پێ. له‌نێو تونێله‌که‌دا خه‌نده‌کێک به قوڵایی بیست پیخیس و به‌رینایی سێ پێ هه‌ڵکه‌ندرا. له سه‌رچاوه‌یه‌کی گه‌وره‌را، به بۆڕی و گورینگ ئاویان راکیشا نێو خه‌نده‌ک و به‌و چه‌شنه گه‌یاندیانه نێو شار. میعمار و

---

١- تریزینی، شارێکی کۆنی یۆنان له هه‌رێمی ئارغۆس.

٢- کیدۆنیا، شارێک له کریت، ئه‌مڕۆ ناسراو به خانیا.

٣- زاکینتۆس، دورگه‌ی یۆنانی و مه‌وته‌نی ئۆدیسه.

٤- دیکتینیس، ئیلاهه‌ی پارێزه‌ری راوچیانی ماسی واته ماسیگران.

وەستاکاری ئەو شاکارە کەسێک بەناوی ئێڤپالینۆس، کوڕی ناڤستراسۆس و خەڵکی مێغارا[1] بوو. ئەوەیان یەکێک لە سێ بەرهەمەکان بوو.[2] دووهەم کاریان، سەکۆی بەندەر کە دەچووە نێو بەحرەوە. درێژایی ئەو سەکۆیە دوو ستادیۆ دەبوو و دەگەیشتە شوێنێکی بەحر کە قوڵاییەکەی بیست ئۆرغیس بوو. سێهەم بەرهەمی سامۆسی‌یەکان، بیناکردنی پەرستگە بوو،[3] مەعبەدێک گەورەتر لەوانەی تا ئێستا من چاوم پێیان‌کەوتووە. یەکەم ئەندازیاری ئەو بینایە لە سەرەتادا پیکۆس، کوڕی فیلێئاس بوو. راستییەکەی پتر سەبارەت بەو شاکارە بە نرخانە بوو، بۆیە هێندە باسی سامۆسی‌یەکانم کرد.

## سەرهەڵدانی مۆغەکان و چۆنییەتی وەدەست خستەوەی فەرمانڕەوایی بەهۆی داریوشەوە

[٦١] لەو کاتەدا کە کامبیزی کوڕی کوروش لە وڵاتی میسر بوو و حەزی لە گەڕانەوە نەدەکرد و تەواو دێوانە ببوو، دژی ناوبراو دوو برای مۆغ سەریان هەڵدا. یەک لەو برایانە لەلایەن کامبیزەوە وەک چاوەدێری سامان و دارایی پاشا دیاری‌کرابوو. ئەو مۆغە وەختێک زانی مەرگی سمێردیس (بردیا) بێدەنگی لێکراوە و تەنیا چەند کەسێکی پارس بە قەومانی رووداوەکە دەزانن، لەجێوە راپەڕی. جیا لەو چەند کەسە پارسە، خەڵکی ئاسایی پێیانوابوو، سمێردیسی کوڕی کوروش زیندووە. کابرای مۆغ بڕیاری‌دا دانیشتووانی نێو بارەگا رێکبخا. دەگووترێ کە: کامبیز کوڕی کورش، بەدەستی خۆی براکەی بەناوی سمێردیسی کوشت. کابرای مۆغ واتە پاتیزیتیس بەمەبەستی لابردنی

---

١- مێغارا، پێتەختی هەرێمی مێغاری لە یۆنانی باستان. ئەو شارە لە باکووری تەنگەبەرایی کۆرینتۆ و لە نیزیک کەنداوی ئاتێن کە ئەوە سەردەمە بە کەنداوی سارۆنیک ناسراوبوو، هەڵکەوتبوو.
٢- خەندەکی ئێڤپالینی.
٣- واتە مەعبەدی ئیرێئۆ

کامبیز لەسەر دەسەلات، برایەکی هەبوو کە ئەویش ناوی سمێردیس بووە و ئامادەی پاشایەتی کردوە. ئەو برایە جیا لەوەی ناوی سمێردیس بووە، گەلێکیش شێوەی سمێردیسی کوڕی کوروشی داوە. پاتیزیتیس، سمێردیسی برای خۆی رازی کردوە کە جێگای کامبیز بگرێتەوە. بۆ ئەو مەبەستەش، پاتیزیتیس خۆی گشت کاروباری ئەو ئالوگۆڕەی وەستۆ گرتووە. پاتیزیتیس دوای قەناعەت پێهێنانی سمێردیس خێرا ئەوی بردۆتە بارەگای پاشایەتی و لەسەر تەختی داناوە. راسپاردەی ناردووەتە گشت لایەک و لەو نێوەدا تەتەرێکیشی بەڕێکردوە بۆ وڵاتی میسر و داوای کردوە کە لەشکری نیزامی روو لە کامبیز وەرگێڕن و لەجیاتی ناوبراو، گوێ لە فەرمانەکانی سمێردیس بگرن.

[٦٢] راسپاردەکانیتر ئەو فەرمانە دەگەیێننە جێ و ئەوەشیان کە قەرار بوو بچێتە میسر، لە هەرێمی ئێکباتانی وڵاتی سوریا چاوی بە کامبیز دەکەوێ. کابرای راسپاردە لە نێوەڕاستی مۆڵگەی هێزەکانی لەشکری کامبیزدا بەدەنگی بەرز پەیامی پاتیزیتیسی مۆغ رادەگەیەنێ. کامبیز گوێی لەو قسانە دەبێ و ترس دایدەگرێ. لەوە دەترسێ کە قەومانەکە راست بێ و پریکساسپیس خەیانەتی پێکردبێ (کامبیز کە ئەو کابرایەی ناردبوو بۆوەی سمێردیس بکوژێ، رەنگە حوکمەکەی بەجێ نەگەیاندبێ). کامبیز لەجێوە روو لە پریکساسپیس دەکا و پێیدەڵێ: "پریکساسپ، فەرمانی منت ئاوا بەجێگەیاند؟ ". پریکساسپیس وڵام دەداتەوە: "گەورەم، ئەوەی دەگووترێ هیچی فڕی بەسەر راستییەوە نییە. سمێردیسی براتان چۆن دەتوانێ راپەڕێ و دژی جەنابت یارمەتی دوژمن بدا، جا خاوەن هێز بێ یاننا، ئاخر من خۆم ئەمری جەنابتم بەجێگەیاند و بەو دەستانەم جەنازەکەم ناشت. ئەگەر ئێستا، مردوو سەر هەڵدێننەوە، دەبێ چاوەڕوانی زیندوو بوونەوەی ئاستیاگی میدیاییش بکەین. بەڵام ئەگەر رەوتی ژیان وەک قەدیم لەسەر بواری خۆی مابێ، ئیتر نابێ لەوە بترسین کە بۆخاتری سمێردیس چی خەراپە هەیە سەر هەڵدەن و بڕوێنەوە. بە باوەڕی من ئەوەی کە دەبێ خێرا بیکەین، پێویستە

هەرچی زووتر کابرای تەتەر بگرین و لێیبپێچینەوە تا بزانین کێ فەرمانی پێداوە بێتە لامان و ناچارمان بکات گوێ بۆ فەرمانی سمێردیس راگرین ".

[٦٣] ئەو پێشنیارەی پریکساسپیس بەدڵی کامبیز بوو بۆیە بەپەلە وەدوای تەتەر کەوتن و گەڕاندیانەوە دواوە. کاتێک راسپاردەکە گەیشتە جێ، پریکساسپیس لێیپرسی: "بابزانین کابرا، تۆ دەڵێی راسپاردەی سمێردیسی کوڕی کوروشی! درۆ مەکە و راستیمان پێبڵێ و ئەوجار بێگرفت لێرەوە برۆ، ئایا سمێردیس خۆی تۆی بانگکرد و فەرمانی پێدای، یا کەسێکی خزمەتکاری ئەو؟ ". کابرای تەتەر وڵامی داوە: "لەو کاتەوە کە کامبیز بەرەو وڵاتی میسر وەڕێکەوتووە، من چ جارێک چاوم بە سمێردیس نەکەوتووە، ئەو حوکمە لەلایەن مۆغی مەزنەوە بە من ئەسپێردرا، ئەو مۆغەی کە کامبیز خۆی وەک چاوەدێری ماڵی دیاری کردبوو. ئەو بە منی گووت ئەوە فەرمانی سمێردی کوڕی کوروشە و دەبێ خێرا بە ئێوەی رابگەیێنم ". کابرای تەتەر چی راستی بوو گووتی. کامبیز رووی لە پریکساسپیس کرد و گووتی: "پریکساسپ، وەک مرۆڤێکی باوەڕپێکراو ئیتاعەتی دەستووراتی منت کرد و لەو بارەوە تاوانبار نی، ئەی باشە ئەو کەسەی دژی من راپەڕیوە و دەڵێن پارسە و برای منە، دەبێ کێ بێ؟". پریکساسپیس لە وڵامدا گووتی: "پاشاکەم، من پێموایە لەو گرفتە حاڵی بوومە. ئەوە مۆغەکانن کە سەرهەڵدانیان وەڕێخستووە، دەبێ پاتیزیتیس، ئەوەی چاوەدێری ملک و سامانی جەنابتان دەکات، لەگەڵ براکەی خۆی بەناوی سمێردیس رێککەوتبێ و ئەو ئاژاوەیەیان نابێتەوە ".

[٦٤] وەختێک کامبیز گوێی لە ناوی سمێردیس بوو، راستی قسەی پریکساسپ و ئەو خەونەی دیتبووی، بۆی دەرکەوت. لەو خەونەدا کەسێک بە کامبیزی گوتبوو کە سمێردیسێک لەسەر تەختی پاشایەتی دادەنیشێ و سەری دەگاتە بەر میچی ئاسمان. کامبیز تێگەیی کە براکەی خۆی بەبێ تاوان کوشتووە و بۆیە دەستی بە گریان کرد. پاش شینگێڕانێکی فرە و کۆڵێک خەم خواردن، ئەسپەکەی خۆی راکێشا و بەغار بەرەو شاری شوش

رۆیی. تامەزرۆی بەربەرەکانی لەگەڵ کابرای مۆغ بوو. لە کاتی سواربوونی ئەسپەکەی، قوببەی قوڵفی کالان ترازا و لێبۆوە. شمشێر خزییە خوار و نووکی لە سەری کالان هاتەدەر و دە رانی رۆچوو. راست ئەو شوێنەی لەشی بریندار بوو کە کاتی خۆی ئاپیسی خوای میسرییەکانی (مانگاکە) بریندار کردبوو. کامبیز خێرا لە پیاوەکانی خۆی پرسی کە ناوی ئەو ناوچەیەی لێی دامەزراون چییە. وڵامیان داوە کە ئێکباتانە. ساڵانێک لەوە پێش، یەک لە تاڵەبینەکان لە نێوەندی ڤوتۆس[1] پێشگۆیی کردبوو کە کامبیز لە شاری ئێکباتان دەمرێ. کامبیز بە چەشنێک لەو پێشگۆییە حاڵی ببوو کە لە سەردەمی پیریدا و لە شاری ئێکباتانی وڵاتی میدیا دەمرێ، واتە لەو شوێنەی کە فەرمانڕەوایی وڵاتەکەی دەکرد. بەڵام لە پێشگۆییەکەدا مەبەست ئێکباتانی وڵاتی سوریا بوو. بەهەر حاڵ کاتێک ناوی شوێنەکەی زانی، زۆر ناڕاحەت لەمەر سەرهەڵدانی مۆغەکان و برینی رانی، ئەوجار لە پێشگۆییەکە تێگەیی و گووتی: "دیاریکراوە کە کامبیز کوڕی کوروش دەبێ لێرە بمرێ ".

**[٦٥]** کامبیز لەو کاتەدا تەنیا ئەوەندە قسەیەی کرد و بەس. بیست رۆژ دواتر، کۆمەڵێک لە گەورە پیاوانی پارسی بانگکرد کە لەگەڵی بوون و پێیگووتن: "ناچارم باسی گرینگترین نهێنی خۆم بۆ ئێوە بکەم. ئەو کاتەی لە میسر بووم، خەونێکم دیت، خۆزیا قەتم نەدیبا. کەسێک لە بارەگاکەمڕا هات و پێیگووتم کە سمێردیس لەسەر تەختی پاشایەتی لە جێگای تۆ دانیشتووە و سەری ئەوەندە بەرزە کە گەیشتۆتە بەری ئاسمان. لەوە ترسام مەبادا براکەم بێ و بۆیە خێرا لێی وەخۆ کەوتم و هێمنایەتی خۆم نەپاراست، چونکە سروشت و زاتی مرۆڤ خاوەن ئەو هێزە نییە کە بتوانێ چارەنووس بگۆڕێ. من وەک دێوانەیەک پریکساسپم ناردەوە شاری شوش بۆوەی سمێردیس بکوژێ. پاش ئەوەی ئەو جینایەتە بە ئەنجام گەیشت، خاترجەم بووم کە دوای مەرگی سمێردیس هیچ کەسێکیتر غیرەت ناکا دژی من سەربەرزکاتەوە. من هەڵەم کرد، چونکە نەمدەزانی چارەنووسم بەکوێ دەگا و بەبێ دەلیل بووم بە بکوژی براکەم و لە

---

١- ڤوتۆس، یەک لە خواکانی میسری باستان، ئیلاهەی مەزهەر و ویناى بارەوەری و زاوزێ.

کۆتاییشدا تاج و تەختم لەدەست چوو. ئەو کەسەی لە خەودا منی هوشیار کردەوە، مەبەستی ئەوە بوو کە مۆغێک دژی من رادەپەڕێ و ناوی سمێردیسە، بەڵام من هەرچی لە توانامدا هەبوو، نەمهێشت سمێردیسی کوڕی کوروش زیندوو بمێنێ. مۆغەکان ئێستا دەسەڵاتیان بەدەستەوە گرتووە، واتە ئەو کەسەی خۆم دیاریم کردبوو لەگەڵ براکەی بەناوی سمێردیس بەسەر سامان و دارایی وڵاتەکەم رابگەن. ئەو کەسەش کە پتر لە هەمووومان گونجاوتر بوو، بۆ تۆڵە ئەستاندنەوە لە مۆغەکان لەمەر ئەو خەیانەتەی پێیان‌کردوم، من بە دەستی خۆم کوشتم و ئێستا لە ژیاندا نەماوە. داخوازیم لە ئێوە پارسەکان ئەوەیە کە خواستەکان لە سەرەمەرگمدا بە ئەنجام بگەیێنن. داوام لە ئێوە و هیخامەنیشی‌یەکانی لەگەڵ منن، هاوڕێ لەگەڵ خواکانی پارێزەری تاج و تەخت، رێگا بە میدیاکان مەدەن جارێکی‌تر دەسەڵات بە دەستەوە بگرن. ئەگەر ئەوان بەفریودان ئەو حوکمڕانییەیان دەستکەوێتەوە، ئێوەش پێویستە بە هەمان شێوە لێیان بستێننەوە. ئەگەر بەشەڕ بوو، ئێوەش شەڕ بکەن و بە گشت هێزتانەوە بجەنگێن و دەریان بکەن. ئەگەر ئامۆژگارییەکانم وەبەر چاو بگرن، مەزراکانتان پڕبەروبووم و ژنەکانتان خاوەن مناڵ و مێگەلەکانتان پڕ زاوزێ و خۆتان هەمیشە سەربەست و ئازاد دەژین. ئەگەر نەتوانن دوبارە فەرمانڕەوایی بەدەستەوە بگرنەوە، یاخوا وەبەر نەفرەتی من بکەون، ژیانتان دوور لە بەختەوەری بێ و هەر پارسێکی ئەو وڵاتە تووشی چارەنووسی من بێ ". دوای ئەو قسانە، کامبیز لەمەر کردەوەکانی خۆی، دەستی بە گریان کرد.

[٦٦] کاتێک پارسەکان چاویان بە گریانی پاشاکەیان کەوت، تەواوی جلوبەرگی خۆیان دادڕی. ناڵەناڵ و شینگێڕان دەستی پێکرد. ئێسقانی رانی کامبیز تووشی قانقاریا هات و رزی و بووە هۆی مەرگی کامبیزی کوڕی کوروش. ناوبراو حەوت ساڵ و پێنج مانگ فەرمانڕەوایی کرد. خاوەن منداڵ نەبوو، نە کوڕ و نە کچ. ئەو پارسانەی دەوری پاشایان گرتبوو، باوەڕیان بەوە نەدەکرد کە مۆغەکان دەسەڵاتیان گرتبێتە دەست، بەڵکوو بە پێچەوانەوە لەو بڕوایەدا بوون کە کامبیز بۆ هەڵفریواندی ئەوان سەبارەت بە مەرگی

سمێردیسی براکەی دواوە، ئەگینا ئەو خەڵکە راپەڕیوە لەڕاستیدا خودی پارسەکانن کە دژی ئەو سەرهەڵدانیان وەڕێخستووە.

[٦٧] ئەو کەسەی قەرار بووە فەرمانڕەوایی وڵات بەدەستەوە بگرێ، دەبوایە سمێردیسی کوڕی کوروش بوایە. لەلایەکی‌تریشەوە، پریکساسپ، ئەویش کوشتنی سمێردیسی وەستۆ نەگرت و گەرەکی نەبوو ژیانی خۆی دوای مەرگی کامبیز لە مەترسی بخا و بڵێ بە دەستەکانی خۆی کوڕی کوروشی کوشتووە. دوای مردنی کامبیز، مۆغی گۆرین بەبێ ترس حوکمڕانی بەڕێوە برد و ناوی سمێردیسی کوڕی کوروشی زەوت کردبوو. کابرای مۆغ حەوت مانگ پاشایەتی کرد، واتە ئەوەندە ماوەیەی کە پێویست بوو هەشت ساڵ تەمەنی فەرمانڕەوایی کامبیز پاشا کامڵ بێ. لەو حەوت مانگەدا گەلێک کاری بەجێی بۆ دانیشتووانی وڵات بە ئەنجام گەیاند و کاتێک مرد، گشت نەتەوەکانی ئاسیا پرسەیان بۆ دانا و پارسەکان خۆیان لێ‌بوارد. ئەو مۆغە راسپاردەی ناردە سەراسەری وڵات و بە خەڵکی راگەیاند کە ماوەی سێ ساڵان لە دانیماڵیات و خزمەتی لەشکری مەعاف دەبن.

[٦٨] مۆغی ناوبراو خێرا بەڵێنی بە خەڵکدا کە ئەگەر دوای هەشت مانگ دەسەڵات بەدەستەوە بگرێ، ئەوە ماڵیات و خزمەتی لەشکری بۆ سێ ساڵ هەڵدەگرێ، بەڵام لە مانگی هەشتەمدا تووشی ئەو رووداوە هات: ئۆتانیس کوڕی فارناسپ بوو. رەگەز و سامانی ناوبراو بووە هۆی ئەوە کە لەنێو پارسەکاندا ناسراوبێ. ئۆتانیس یەکەم کەس بوو شک و گومان هەڵیگرت کە فەرمانڕەوای تازە کوڕی کوروش بێ. ئەو لەو باوەڕەدا بوو کە سمێردیسی مۆغە دەسەڵاتی بەدەستەوە گرتووە. ئۆتانیس بەلایەوە سەیر بوو کە سمێردیسی مۆغ بۆچی هیچکات لە قەڵا نایەتە دەر و کەسی راوێژکاری پارس نەچووەتە لای. وەختێک ئۆتانیس لەو بارەوە وەشک کەوت، بەو چەشنە جوڵایەوە: یەکێک لە کچەکانی خۆی بە ناوی فیدیمی (فەدیمە) بەمێرد دابوو. ئەو کچە ژنی سمێردیسی کوڕی کوروش و لەنێو حەرەمسەرای کامبیزدا دەژیا. ئۆتانیس وڵامی لەو خاتوونە، واتە کچی خۆی نارد و

پرسیاری لێکرد ئاخۆ شەوانە لە کاتی خەوتندا لەگەڵ سمێردیسی کوڕی کورووش دەخەوێ یا لەگەڵ کەسێکیتر. فەدیمە جوابی ناردەوە کە نازانێ لەگەڵ کێ دەخەوێ، چونکە لە ژیانی خۆیدا قەت سمێردیسی کوڕی کورووشی نەبینیوە، ئەوەش کە لەگەڵی رادەزێ، نازانێ کێیە. ئۆتانیس دوبارە پەیامی بۆ فەدیمە ناردەوە و پرسی: "ئەگەر سمێردیسی کوڕی کورووش ناناسی، لە خاتوو ئاتووسا بپرسە کە تۆ و ئەو شەوانە لەگەڵ کام پیاو دەژین. چونکە ئاتووسا بە دڵنیاییەوە برای خۆی دەناسێتەوە". کچی ئۆتانیس وڵامی ناردەوە کە: "ناتوانم نە لەگەڵ ئاتووسا[1] قسە بکەم و نە لەگەڵ هیچ ژنێکیتر کە لەگەڵ مندا دەژی، چونکە ئەو کابرایە هەرکەس بێ، لەو رۆژەوە دەسەڵاتی گرتۆتە دەست، ئێمە ژنەکانی لێک هەڵاواردوە و جیا لەیەکتر دەژین ".

**[٦٩]** وەختێک ئۆتانیس ئەو وڵامەی پێگەیی، شک و گومانی بەهێزتر بوو. بۆ جاری سێهەم پەیامی بۆ کچەکەی نارد و لێی پرسی: "کچم، تۆ لە نژاد و رەگەزێکی گەورەی و دەبێ لە بەرامبەر مەترسیدا خۆڕاگر بی و ئەوە داوای باوکتە، ئەگەر ئەو کابرایەی لەگەڵ تۆ دەخەوێ سمێردیسی کوڕی کورووش نەبێ، رەنگە کەسێک بێ کە من لێی بە شک و گومانم، نابێ لەوە زیادتر رێگەی پێبدرێ تخوونت بکەوێ و فەرمانڕەوایی پارسەکان بکات. هەر بۆیە داوات لێدەکەم ئەو کارە بکە: هەرکات ئەو کابرایە هاتە لات و دڵنیابووی خەوی لێکەوتووە و گوێیەکانی بەدەرەوەن، بزانە ئەگەر گوێی هەبن ئەوە سمێردیسی کوڕی کورووشە، ئەگەر نا، ئەوە هەمان سمێردیسی مۆغە". فەدیمە وڵامی ناردەوە کە ئەگەر ئەو کارە بکات تووشی مەترسییەکی گەورە دێت، چونکە کابرا لێیحاڵی بێ کە ژنەکەی بە گوێی براوی ئەوی زانیوە، ناهێڵێ رووحی بە سلامەتی بەرێتە دەر و لەجێوە دەیکوژێ. هەڵبەت بەو حاڵەش بە قسەی باوکی خۆی کرد: کامبیزی کوڕی کورووش، بە مەبەستی سزادان، کاتی خۆی هەردوو گوێی ئەو مۆغەی بڕیبوو. فەدیمە راست ئەو جۆرەی باوکی داوای کردبوو، جوڵایەوە. وەختێک کاتی خەوتن لە گەڵ

---

[1] - ئاتوسا، کچی کورووشی مەزن کە مێردی بە کەمبوجیەی برای خۆی کرد.

مۆغەکە هات (ژنانی پارس بە نۆرە لەگەڵ پیاوەکان دەخەوتن)، چووە لای مێردە و لە تەنیشتی راکشا. خەوێکی قوڵ کابرای مۆغی داگرت و فەدیمە دەستی بە گوێیەکانی ئەودا گێڕا. بێ گیروگرفت لێی حاڵی بوو کە ئەو کابرایە گوێبڕاوە، هەرکە رۆژ بۆوە وڵامی بۆ باوکی ناردەوە.

[٧٠] ئۆتانیس دیدارێکی لەگەڵ ئاسپاتینی و غۆڤرییاس سازدا. ئەوانە لە گەورە پیاوانی ناسراوی پارس و دۆستی نیزیکی ئۆتانیس بوون و ناوبراو رەوتی رووداوەکەی بۆ گێڕانەوە. ئەوانیش بە هەمان شێوە شک و گومانیان هەبوو و بۆیە بەتەواوی باوەڕیان بە قسەکانی ئۆتانیس کرد. هەر سێکیان لەجێوە بڕیاریاندا خەڵکی پارس یەکبەیەک لەو گرفتە ئاگادار بکەنەوە، بەتایبەتی ئەوانەی جێگای باوەڕپێکردن بوون.

ئۆتانیس، ئیدافێرنی تێگەیاند. غۆڤرییاس بە میغافیزۆی گووت و ئاسپاتێنیس قسەی لەگەڵ ئیدارن کرد. گشتیان بوونە شەش کەس. وەختێک داریوشی کوڕی گشتاسپ گەیشتە شاری شوش – ئەو لە وڵاتی پارسڕا دەهات، واتە لەو شوێنەی کە باوکی حوکمڕان بوو – ئەو شەش کەسە بە مەبەستی دامەزراندنی هاوپەیمانی، ئەویشیان بانگکرد.

[٧١] بە هاتنی داریوش کۆڕەکە بوو بە حەوت کەس. ئاڵوگۆڕی بیروڕایان کرد و سوێندیان خوارد. وەختێک نۆرەی داریوش هات بۆوەی رای خۆی دەربڕێ، بەو چەشنە ئاخاوت: "پێموابوو تەنیا کەسێکم کە دەمزانی ئەو کەسەی لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشتووە، کابرایەکی مۆغە، نەک سمیردیسی کوڕی کوروش کە مردووە. هەربۆیە بە پەلە هاتم، بۆوەی رێگایەک بۆ کوشتنی ئەو مۆغە بدۆزمەوە. ئێستا کە ئێوەش لەو بارەوە ئاگادارن و هەر من تەنیا نیم، بەباوەڕی من دەبێ هەرچی زووتر وەخۆ کەوین و چاوەڕوانیی هیچ مانایەکی نییە و بارودۆخەکە مەترسیدارە ". سەبارەت بەو قسانەی داریوش، ئۆتانیس بۆچوونی‌تری هەبوو: "کوڕی گشتاسپ، تۆ خاوەن باوکێکی جوامێر و وێدەچێت لەو کەمتر نەبی. لەو کارەدا پەلە مەکە، پێویستە بیری لێبکەینەوە و گرفتەکە بە هێمنی چارەسەر

بکەین". داریوش لە وڵامدا گووتی: "ئەی گەورە پیاوانی پارس! ئێوە کە لێرە کۆبوونەتەوە، ئەگەر وەدوای ئامۆژگارییەکانی ئۆتانیس بکەون، مەرگێکی پڕ لە بێ ئابڕوویی چاوەڕوانتانە، چونکە یەکێک پەیدا دەبێ کە بۆ بەرژەوەندی خۆی ئێمە بکاتە قوربانی. دەبێ هەرچی زووتر وەخۆکەوین و هەر خۆمان بین. هەڵبەت بڕیارتان داوە جیا لە من خەڵکانیتریش ئاگادار بکەنەوە، یا دەبێ هەر ئەمڕۆ دەست بەکار بین، یا دەبێ ئەوە بزانن ئەگەر ئەمڕۆ کارەکە تەواو نەکەین، ئیزن بە هیچکەسێکیتر نادەم وەپێش من بکەوێ. من خۆم خێرا دەچمە لای کابرای مۆغ و گشت زانیارییەکی دەدەمێ".

**[٧٢]** ئۆتانیس کاتێک چاوی بە گڕژی داریوش کەوت، پێیگووت: "ئێستا کە تۆ ناچارمان دەکەی پەلە لە کارەکەدا بکەین و هیچ ڕێگایەکیترت ئاوەڵا نەهێشتۆتەوە، تکایە پێمان بڵێ کە چۆن بچینە نێو بارەگا و پەلاماری مۆغ و پاسەوانەکان بدەین. ئاگادار هەی کە لە گشت لایەک پاسەوانی داناوە، ئەگەر بە چاوی خۆت نەتبینیون، بە دڵنیاییەوە بیستووتە، باشە ئێمە چۆن لەدەست ئەوانەوە ڕزگاریمان دێت ". داریوش وەجواب هات: "ئۆتانیس، هێندێک گرفت هەیە کە پیاو زەحمەتە لەبارەیەوە بدوێ، بەڵام زۆر هاسان جێبەجێ دەبن. پێویستە بزانی کە هیچ دژوار نییە بەنێو پاسەوانەکاندا دەرباز بین، خەڵکی وەک ئێمەی خاوەن پلەی بەرزی کۆمەڵایەتی، لەکاتی چوونە ژوور بۆ بارەگا پێشمان پێناگیردرێ، جا ئەوە لە رووی ترسەوە بێ یا ڕێزدانان. جیا لەوەش، من ڕێگایەکی فرە زیرەکانەم پێشک دێ. وەختێک لە پاسەوانانی پارس دەرباز بووم، ئەوجار دەڵێم هەڵگری پەیامێکی گرینگ لەلایەن باوکمەوە بۆ پاشام. ئەو جێگایەی پێویستی بە درۆکردنە، با بیکەم. هەموومان بەو ڕۆژگارە ڕاستیش دەڵێین و درۆش دەکەین. ئەو کەسانەی درۆدەکەن، گەرەکیانە خێرێکیان دەستکەوێ، ئەوانەش درۆ ناکەن، دەخوازن خەڵکانیتر پتر باوەڕیان پێبکەن. هەر دوو لایەن چاویان لە قازانج و بەرژەوەندی خۆیانە. ئەگەر ئەو دوو لایەنە لە فکری قازانجی خۆیاندا نەبن، ئەوجار ئەوەی ڕاستیش دەڵێ، ڕوو لە درۆ دەکا و درۆزنیش ناچارە ڕاستی

بەسەر زاریدا بێ. هەر پاسەوانێک کە ڕێگا بە دەربازبوونی ئێمە بدات، دواتر قازانجی دەست دەکەوێ. هەر کەسیش پێشمان پێبگرێ، وەک دوژمن چاوی لێدەکەین. ئێستا، با بۆ یەک جاریش بێ یاسا لەژێر پێ بنێین و لە دەروازەکان دەرباز بین و بچینە ژوورەوە و کارەکەمان جێبەجێ بکەین".

[٧٣] دوای قسەکانی داریوش، ئەوجار غۆفرییاس وەقسە هات: "دۆستان، کەنگێ فرسەتی ئەوتۆ هەڵدەکەوێ کە ئێمە بتوانین دەسەڵات بە دەستەوە بگرینەوە؟ باشە ئەگەر سەرنەکەوتین، با بمرین! بۆ ئێمەی سەرکردە جێی سەرسوڕمانە ئەمڕۆ مۆغێکی میدیایی حوکمڕانیمان بکا کە دوو گوێی بڕاون! ئێوە کە لە دەوری کامبیزی نەخۆش بوون، لەبیرتانە کاتی سەرەمەرگ چەندە تووک و دوعای لێکردن ئەگەر پارسەکان نەتوانن دەسەڵات دوبارە بەدەستەوە بگرن. ئەو کاتە باوەڕمان بە کامبیز نەکرد، پێمانوابوو ناوبراو گەرەکی بووە کەسایەتی سمێردیس خەوشدار بکات. ئێستا من لەگەڵ قسەکانی داریوشم. با ئێمە لە یەکتر هەڵنەبڕێین، ئەو چەند کەسەی لێرە هەین، بچین و کابرای مۆغ بکوژین".

[٧٤] لە حاڵێکدا کە ئەوانە خەریکی بیرکردنەوە بوون، کۆمەڵە ڕووداوێک لە دەرەوە قەومان: مۆغەکان ڕێککەوتبوون و بڕیاریان دابوو بە ئەنقەست لەگەڵ پریکساسپ پێکبێن، چونکە ناوبراو ئازارێکی زۆری لەلایەن کامبیزەوە پێگەیبوو. کامبیز کوڕی پریکساسپی بە تیر کوشتبوو. پریکساسپ تەنیا کەس بوو کە بە کوژرانی سمێردیسی کوڕی کوروشی دەزانی، چونکە بە دەستەکانی خۆی ئەو کوڕەی کوشتبوو. لەلایەکیتریشەوە گشت پارسەکان ڕێز و حورمەتیان بۆ دادەنا.

مۆغەکان لەمەر ئەو هۆکارانە پریکساسپیان بینی و کردیانە هاوپەیمانی خۆیان و بەڵێنیان لێوەرگرت و سوێندیاندا، ئەوەی دەیزانێ لەلای هیچکەسەوە باسی لێوە نەکا، واتە حیللەی مۆغەکان سەبارەت بە پارسەکان ئاشکرا نەکات. هەڵبەت چەند ڕووداویتریش بەپێی ڕەوتی چارەنووسەوە هاتنە ئاراوە. بەهەر حاڵ پریکساسپ بەڵێنی بە مۆغەکاندا. لەو نێوەدا

داوایەکیتریشی لێکرا. بڕیاردرا جەماوەری پارس بانگ بکرێنە ژێر دیواری قەڵا و پریکساسپ قسەیان بۆ بکا و بڵێ کە پاشاکەیان سمێردیسی کوڕی کوروشە و خەڵک لەو بارەوە دڵنیا بکات. ئەو داوایە بۆیە لە ناوبراو کرا، چونکە تەنیا کەسێک بوو کە گشت پارسەکان باوەڕیان پێبوو و بەردەوام گوتبووی کە سمێردیسی کوڕی کوروش دەژی. ئەوە بۆیە بوو کە تاوانی کوشتنی ئەو کوڕە لەسەر خۆی لابەرێ.

[۷۵] وەختێک پریکساسپ رایگەیاند کە ئامادەیە ئەو کارە بکا. مۆغەکان خەڵکی پارسیان بە پانەوە بانگهێشت کرد. پریکساسپیان وەسەر یەک لە بورجەکان خست و فەرمانیان پێدا قسە بکا. ناوبراو بەبێ ئەوەی ئەنقەستێک لەگۆڕێدا بێ، فەرامۆشی کرد کە مۆغەکان چ داوایەکیان بۆ گووتن لێکردوە. سەرەتا تاریفی غیرەت و جوامێری کوروش و باسی هیخامەنیشییەکانی کرد، دواتر کە گەڕایەوە سەر کوروش، گووتی کە ئەو چۆنی حوکمڕانی کردوە. کاتێک قسەکانی بەرەو کۆتایی دەچوون، لە پڕێکا دەستی بە ئاشکراکردنی راستییەکان کرد و گووتی تا ئەو کاتە ئەو نهێنییەی پاراستووە، چونکە مەترسی کوشتنی لەسەر بووە، بەڵام ئەمڕۆ دەخوازێ پەردە لەسەر ئەو رازە شاراوەیە هەڵداتەوە و راستییەکە بڵێ. پریکساسپ بە خەڵکی گووت کە چۆن سمێردیسی کوڕی کوروشی کوشتووە، جینایەتێک کە کامبیز ناچار بە ئەنجامدانی کردوە. دوای ئەو ئاشکراکردنە، رایگەیاند کە ئێستا مۆغەکان حوکمڕانیان بەدەستەوە گرتووە. راست لەو کاتەدا کە پارسەکانی وشیارکردەوە و گووتی، ئەگەر مۆغەکان نەکوژن و پارسەکان دەسەڵات بەدەستەوە نەگرن، خێرا بەسەرەوە لە بورجەکەڕا کەوتەخوارەوە. پریکساسپ بەو چەشنە مرد و بەردەوام وەک کەسایەتییەکی ناسراو جێیخۆی کردەوە.

[۷٦] لەو نێوەدا ئەو حەوت کەسە کە پێشتر رێککەوتبوون، پەلاماری مۆغەکان بدەن، لەبەر خوا پاڕانەوە و بەبێ ئەوەی بزانن کە چ بەسەر پریکساسپ هاتووە، لەجێوە وەخۆکەوتن. وەختێک لە نیوەی رێگادا بوون،

ئەوجار زانیان چارەنووسی پریکساسپ بەکوێ گەیشتووە، بۆیە لایاندا و کەوتنە راوێژ. چەندێک رەگەڵ ئۆتانیس کەوتن و گەرەکیان بوو لە بەرێوەچوونی پلانەکەدا پەلە نەکەن و پێیانوابوو بارودۆخەکە تەواو شێواوە، هێندێکیش لەگەڵ داریوش بوون و پێداگریان دەکرد کە بەبێ راوەستان کارەکە جێبەجێبکەن. لەو کاتەدا کە شەرە قسەیان بوو، حەوت باڵندەی سەقر وەدیارکەوتن و جوتێک هەڵۆیان راودەنا. بە دەنووک لێدان و شەقەی باڵەکانیان ئەو جووتەیان رووتاندەوە.

ئەو کۆرە حەوت کەسییە وەختێک چاویان بەو رووداوە کەوت، لەجێوە پێشنیاری داریوش‌یان پەسندکرد و بەرەو بارەگای پاشایەتی وەرێکەوتن و بە دیتنی باڵندەکان غیرەتیان وەبەرهات.

[۷۷] هەرکە گەیشتنە بەر دەروازەی بارەگا، راست ئەوە قەوما کە داریوش چاوەڕوانی دەکرد. پاسەوانەکان بە حورمەتێکی کە بۆ گەورە پیاوانی پارسیان هەبوو، بەبێ هیچ بیرکردنەوەیەک لەوە کە ئەو حەوت کەسە خەریکی چ پیلانێکن، رێگایان پێدان بچنە ژوورەوە. وەک ئەوەی کە هێزێکی خوایی لە پشت ئەو حەوت کەسە بێ. هیچکەس لێی نەپرسین. کاتێک گەیشتنە حەساری ناوەوە، یەکڕاست وەژوور کەوتن. چاویان بە کۆمەڵێک خواجەی حەرەمسەرا کەوت. کاری خواجەکان هێنان و بردنی ئەمری پاشا بوو. خواجەکان لەو حەوت کەسەیان پرسی کە چیان گەرەکە و هەڕەشەیان لە پاسەوانەکان کرد، بۆچی رێگایان بەو جەماوەرە داوە بێنە ژوورەوە. پێشیان بە پێشرەوەی کۆڕەکە گرت. ئەندامانی کۆڕ بە ئیشارەتی چاو رێککەوتن، شیرەکانیان لە کالان دەرکێشا و خواجەکانیان لەرێوە کوشت و بەغار بەرەو هۆدەی پیاوانەی نێو بارەگا چوونە ژوورەوە.

[۷۸] بەپەڵەکەوت هەردوو مۆغەکە لە ژوورەوە بوون و بیریان لە چۆنییەتی قەومانی رووداوی پریکساسپ دەکردەوە. کاتێک چاویان بە خواجەکان کەوت کە ئاوا بە پەشۆکاوی هاواردەکەن، ئەوجار بە جووتە دەرپەڕینە دەرێ، بۆوەی بزانن چ قەوماوە. وەزعەکەیان بینی و حەولیاندا، بەرگری لە خۆیان بکەن.

یەکیان دەستی دایە تیروکەوان و ئەوەی‌تریش رۆبووە نێزەیەک و شەڕ سازبوو. ئەوەیان کە تیروکەوانەکەی پێبوو نەیتوانی کەڵکی لێوەرگرێ و حەوت کەسەکە تەواوێک لێی‌نیزیک کەوتنەوە. مۆغی دووهەم بەرگری لە خۆی کرد و توانی رانی ئاسپاتین بریندار بکات و نێزەیەکیش لە چاوی ئیدافێرن رۆبکات. ئیدافێرن چاوەکەی لەدەستدا، بەڵام نەمرد.

بەهەرحاڵ ئەو مۆغە دوو کەسی بریندار کرد، بەڵام ئەوەی‌تر کە تیروکەوانی پێبوو هیچی لەدەست نەهات و رایکردە ژووری تەنیشتەوە و گەرەکی بوو درگا لەسەر خۆی دابخا. دوو کەس لە پەلامارده‌ران گەیشتنە سەری. غۆفرییاس و داریوش بوون. کاتێک غۆفرییاس لەگەڵ ئەو مۆغە کەوتە شەڕ، داریوش لەبەر تاریکی نێو ژوورەکە خۆی دایە گۆشەیەک و هیچی پێنەکرا. ئەو لەوە دەترسا مەبادا بە هەڵە لە غۆفرییاس بدا. غۆفرییاس وەختێک هەستی پێکرد کە داریوش شەڕ ناکات و یارمەتی ئەو نادات، تێیخوڕی. داریوش وڵامی داوە: "دەترسم لە تۆ بدەم". داریوش ئەوجار شیری راوەشاند و بە هەڵکەوت لە کابرای مۆغی‌دا.

**[٧٩]** کاتێک مۆغەکانیان کوشتن، لەجێوە سەریان بڕین و دوو برینداره‌کەی خۆیان واتە ئاسپاتین و ئیدافێرن‌یان بەجێ‌هێشت. بۆوەی بارەگاشیان پاراستبێ، بە دوو سەری بڕاوەوە رایانکردە دەرەوە و هاواریان کرد کە چۆن مۆغەکانیان کوشتووە و سەرەکانیان نیشانی خەڵکدا.

ئەوان هەروەها، لە رێگادا تووشی هەر مۆغێک ببان، لەجێوە دەیانکوشت. وەختێک پارسەکان بەو خەبەرەیان زانی کە ئەو حەوت کەسە چیان کردوە و مۆغەکان چ جینایەتێکیان خوڵقاندووە، خێرا فرسەتیان قۆستەوە و بە هەمان شێوە لەگەڵ باقی مۆغەکان هەڵسوکەوتیان کرد. شیرەکانیان لە کالان دەرکێشا و هەر مۆغێکیان دەست کەوت، کوشتیان.[1] ئەگەر شەو دانەهاتبا،

---

١- بەوەڕا دەردەکەوێ کە وەدەست خستنەوەی دەسەلات بەهۆی دوو مۆغەوە، لەخۆڕا نەبووە. بەپێی هێندێک سەرچاوەی‌تر، میدیاکان خەریکی شۆڕش بوونە و بەبۆچوونی کەسانی‌تریش، مریدانی ئایینی زەردوشت ویستوویانە خۆیان لەدەست حوکمڕانیی دەسەلاتی ئاریستۆکراتی فارسەکان رزگاربکەن.

هیچ مۆغێک بە زیندوویی دەرباز نەدەبوو. ئەو رۆژە لەلایەن پارسەکانەوە بە شکۆیەکی فراوانەوە پیرۆزکرا و جێژنێکی گەورە سازدرا و لەو سەردەمەوە پێیدەگووترێ: مۆغقڕان. لەو رۆژەدا هیچ مۆغێک غیرەت ناکات دەرکەوێ و گشتیان لەماڵەوە دەمێننەوە.

[٨٠] پاش ئەو رووداوە وڵات هێوربۆوە و پێنج رۆژ تێپەڕی. راپەڕیوان سەبارەت بە بارودۆخی حازر کۆبوونەوەیەکی گەورەیان پێکهێنا و لەسەر چەند بابەتێک راوێژیان کرد. ئەو باسانەی کردوویانە بۆ خەڵکی توێژەری یۆنانی جێگای باوەڕ نین، هەرچەند لە ڕاستیدا گووتراون.

وەختێک ئۆتانیس گووتی کە پارسەکان پێویستە خۆیان لەسەر خواستە سیاسییەکان بڕیاربدەن، بەو چەشنە ئاخاوت: "بە باوەڕی من نابێ لەمەو بەدوا رێگە بدرێ کە شێوەی دەسەڵاتداری تاکەکەسی بێتە سەر حوکم، نە جێگای رەزامەندییە و نە کارێکی دروستە. ئێوە بە چاوی خۆتان دیتتان، شێتایەتی کامبیز چی بەسەر ئەو وڵاتە هێنا و چۆن تووشی ئازارکێشان هاتین، کەوابوو فەرمانڕەوایی تاکەکەسی و پاشایەتی ناتوانێ چارەیەکی گونجاو بێ. فەرمانڕەوا ئیزن بە خۆی دەدا چی گەرەکییەتی بیکا، بەبێ ئەوەی کەس بتوانێ لێیبپێچێتەوە. ئەگەر باشترین مرۆڤیش ببێتە خاوەن دەسەڵاتی لەو چەشنە، خێرا رەفتار و هەڵسوکەوتی دەگۆڕێ. سوڵتە و دەسەڵات ملهوڕی بەدوادا دێ و حەسادەتیش هەستێکە، و مازە پشتی ئادەمیزاد پێکدێنێ. هەرکەس خاوەن ئەو دوو خوو و خەسلەتە واتە تینووی دەسەڵات بێ و ئێرەیی بە خەڵک ببا، بێگومان دەروونی پڕ لە خەراپە دەبێ، بۆیە جار سەرمەستی لەخۆ بایی بوون و جار خنکاو لەنێو گۆلی جینایەت و ناهەقیدا. دیارە پیاو لە هەلومەرجی ئەوتۆدا، نەدەبوایە حەسادەت دایبگرێ، چونکە خاوەن گشت ئیمکاناتێکە و لە هیچی کەم نییە، بەڵام بەو حاڵەش بەپێچەوانەی خواستی هاوڵاتییانی خۆی رەفتار دەکا. کەسێکی ئەوتۆ ئێرەیی بە مرۆڤە باشەکان دەبا کە لە دەوروبەری دەژین، پتر لەگەڵ خەراپەکاران هەست بە خۆشی و شادی دەکات و خۆیشی ئامادەگی وەرگرتنی دابە

ناحەزەکانە و تامەزرۆی گوێگرتن لە درۆ و بوختانە. لەوانە ناشایستەتر ئەوەیە کە ئەگەر کەسێک پێی هەڵا بڵێ، ئەویش بە ئەندازە، لەجێوە قەڵس دەبێ، چونکە تاریفی زۆر نەکراوە، ئەگەر زۆریشی تاریف بکەی دیسانیش هەر تورەیە، لەبەر ئەوەی پێیوایە زێدەرۆیی تێدایە. ئێستا باسی دیاردەیەکی ناحەزتر دەکەم: ئەو چەشنە فەرمانڕەواییە، دابونەریتی باب و باپیرانمان دەگۆڕێ، دەستڕێژی دەکاتە سەر ژنەکان و خەڵک بەبێ دادگایی کردن دەکوژێ. بۆیە بەباوەڕی من ئەگەر خەڵک خۆی دەسەڵاتدار و فەرمانڕەوا بێ، بەر لە هەر شتێک حکوومەتەکەی خاوەن جوانترین ناو دەبێ. هەروەها، ئەو حکوومەتە ناتوانێ هیچکام لەو خەراپەکارییانە بە ئەنجام بگەیێنێ، وەک ئەوەی کەسێکی سەرەڕۆ دەیکا و پێشتر باسم کرد. سەرکردەکان بە هەڵبژاردن و دەنگ دیاریدەکرێن. ئەوانە ناچارن بەڵێن بدەن و گشت بڕیارەکانیشیان پێویستە لەلایەن خەڵکەوە پەسند بکرێن. بۆیە دیسانیش دەیڵێمەوە، من باوەڕم بە شێوە دەسەڵاتدارییەتی پاشایەتی و تاکە کەسی نییە و دەبێ وەلای بنێین و بڕیار و حوکمڕانی بدەینە دەست خەڵک. ئەوە فەرمانڕەوایی زۆرینەیە.

ئەوە بیروبۆچوونی ئۆتانیس بوو.

[٨١] مێغافیزۆس شێوازی پاشایەتی بەدڵ بوو. ناوبراو قسەکانی خۆی بەو چەشنە دەست پێکرد: "ئەو بابەتانەی ئۆتانیس باسی کردن، منیش دەیانزانم. ئەو لەوەدا بە هەڵە چووە کە پێشنیار دەکا دەسەڵات بدرێتە دەست خەڵک. ئەوە بەلای منەوە باشترین ڕێگە چارە نییە. هیچ بێموبالاتییەک و خۆویستییەک ناگاتە خەراپەکاری خەڵکی نەفام و جاهیل. ئەو بۆچوونە ناماقوڵە، تەنیا لەبەر ئەوەی تووشی لەخۆبایی بوونی ملهوڕێک نەبین، دەبێ بەسەر خۆویستی و دەسەڵاتدارێیەتی ناشایستی خەڵکدا بکەوین. کەسێکی فەرمانڕەوا هەرچی بیکا، لەڕووی زانیارییەوەیە، بەڵام هی خەڵک لەبەر نەزانییەوە بە ئەنجام دەگا، چونکە قەت هیچ فێر نەبووە، تەنانەت سەبارەت بە خۆیشی نازانێ چاکە و خەراپە لێک جیا بکاتەوە. ئەگەر خەڵکێکی ئەوتۆ

تێکەڵاوی فەرمانڕەوایی بێ، تەنیا ئەوەندە دەزانێ کە بەبێ پاراستنی هیچ سنوورێک بەکەیفی خۆی چەشنی لافاوی خوڕێن رایدا.
ئێستا ئەوانەی چارەڕەشی پارسەکانیان گەرەکە، با دیموکراتی هەڵبژێرن. ئێمە دەتوانین کۆمەڵێک لە باشترین هاولاتیانمان دەست نیشان بکەین و حوکمڕانییەکەیان بدەینە دەست و خۆیشمان لەگەڵیان بین. بەباوەڕی من ئەوەش رێگە چارەیەکە و زۆر سروشتییە کە هاولاتییانی باش، بەجێترین بڕیاریش دەدەن ".
ئەوە بیروبۆچوونی مێغافیزۆس بوو. سێهەم کەس کە قسەی کرد، داریوش بوو.
[۸۲] "بۆچوونەکانی مێغافیزۆس لەمەر دیموکراتی بەلای منەوە دروستن، بەڵام ئەو بەشەی نا کە پێوەندی بە دەسەڵاتدارییەتی سامانداران و ئەشرافەوە هەیە. ئێمە سێ چەشنە شێوازی فەرمانڕەواییمان لەبەرە و با یەکێک لەوانە هەڵبژێرین کە لە گشتیان باشتر بێ، دیموکراتی، ئۆلیگارشی(ئەشرافسالاری) و مۆنارشی(پاشایەتی). هەڵبەت پاشایەتی لە گشت بوارێکدا گونجاوترە. ئەگەر کەسێک خاوەن دەسەڵاتی تەواو بێ، لێزان و تێگەیشتوو بێ، پتر بە قازانجی گەلەکەمانە و هەر نەخشە و پلانێک دژی دوژمن دارێژێ، نهێنییەکانی لای خۆی دەمێنێتەوە و دەپارێزرێن. لە سیستەمی ئەشرافسالاریدا، کاتێک خەڵکانێکی فرە خزمەتەکانیان بە کۆمەڵگا پێشکەش دەکەن، زۆر جار هەڵدەکەوێ کە کێشەیان لەنێوانیاندا سازبێ و دوژمنایەتی هەڤدوو بکەن. هەر ساماندار و ئەشرافێک گەرەکییەتی خۆی ببێتە رێبەر و قسەی خۆی بسەلمێنێ. بەو شێوەیە دژایەتی لەنێوانیاندا دێتەگۆڕێ و کێبەرکێ و ململانێ سازدەبێ و جینایەت دەخوڵقێ و لە کۆتاییدا دەبێتە سەرچاوەی هاتنە مەیدانی پاشا. بۆیە دیسان دەڵێم کە پاشایەتی باشترین بەدیل بۆ حوکمڕانییە.
ئەگەر خەڵک دەسەڵاتدار بێ، بە دڵنیاییەوە تووشی گەندەڵی دێت. ئەو گەندەڵییە لە حوکمڕانی دیموکراتیکدا نابێتە هۆی دروست بوونی

دوژمنایەتی، بەڵام دۆستایەتی لەنێو هاوڵاتییانی قرێژ و خەراپەکاردا بەهێز دەکات، چونکە ئەوان دەبێ رێکبکەون بۆوەی بتوانن بە ئامانجەکانیان بگەن. ئەو دیاردەیەش درێژەی دەبێ، تا ئەو رۆژەی کەسێکی سەرکردە لەنێو جەماوەردا رادەپەڕێ و گشت خەراپەکاران وەلادەنێ. بۆ سەرکەوتنی ئەو رێبەرە، خەڵک ناچارە پێشوازی و پشتیوانی لێبکات، هەرکەسێکیش پشتیوانی و پێشوازی لێکرا، لەخۆڕا دەبێتە سەرکردە. ئەوەش خۆی چەشنێک پاشایەتی لێ سازدەبێ. کەوابوو ئەوجاریش دەبێ بڵێم دەسەڵاتی تاکەکەسی و پاشایەتی بەلای منەوە مەقبوڵترین شێوازی فەرمانڕەواییە. بۆوەی پیاو بتوانێ گشت ئەو بابەتانە کۆبەندی بکات، ئاخۆ چۆن ئازادیمان دەست کەوت، کێ ئەو مافەی بە ئێمە بەخشی، جەماوەر؟ ئەشراف؟ یا پاشا؟ دەبێ بڵێم پاشا بوو ئەو ئازادییەی پێبەخشین، واتە یەک کەس بوو و ئێمەش پێویستە ئەو قەوارەیە بپارێزین و جیا لەوە یاساکانی باب و باپیرانمان فەرامۆش نەکەین کە چەندە بەرێوجێ بوونە[1]. ئەوەم لە هەموو شێوەکانیتر پێ باشترە.

[۸۳] ئەو سێ بۆچوونە هاتنەگۆڕێ و چوار کەسەکەیتر لەگەڵ داریوش هاوبیر بوون. وەختێک ئۆتانیس، کە داوای شێوەی حوکمڕانی دیموکراتی بۆ پارسەکان دەکرد، هەرکە دیتی پێشنیارەکەی پەسند ناکرێ، دووبارە دەستی بە ئاخاوتن کرد و گووتی: "هاوڕێیان، ئاشکرایە کە یەکێک لە کۆڕی ئێمە پێویستە وەک پاشا دیاری بکرێ، جا چ بە تەروویشک هەڵخستن بێ یا بە دەنگدانی خەڵکی پارس، یا رەنگە بە شێوازێکیتر. سەبارەت بە خۆم، دەبێ بڵێم کە حەز ناکەم لەگەڵ ئێوە ململانێ بکەم و نە حوکمڕانیشم بەسەردا بکرێ. بەو شەرتە خۆم دەکێشمەوە دواوە کە ئەو کەسەی ئێوە وەک پاشا دیاری دەکەن، هیچکات کوێخایەتی بەسەر خۆم و خانەدانەکەمدا نەکات". ناوبراو قسەی خۆی کرد و شەش کەسەکەیتر قبوڵیان کرد و ناوبراو لەجێوە کێشەی دەسەڵاتی بەجێهێشت و رۆیی. بنەماڵەی ئۆتانیس وەک تاقە خانەدان، هەتا ئێستاش لە وڵاتی پارس ئازادن و تەنیا ئەو بڕیاراتە قبوڵ

---

۱- مەبەستی لە کوروشە.

دەکەن کە خۆیان حەزیان لێیەتی، بەبێ ئەوەی یاسای پارسەکان لەژێر پێ بنێن.

[٨٤] باقی ئەندامانی کۆڕ بیریان لەوە دەکردەوە کە کێ لە گشتیان بەرهەقترە بۆوەی پاشایەتی پێبسپێرن. لەسەر ئەوە ساغ بوونەوە جیا لەو حەوتە، هەرکەسێکیتر ببێتە پاشای وڵات، بەڵێنەکانی پێشتر بە ئۆتانیس‌یان دابوو، جێبەجێ‌یان بکا. بەواتایەک گشت ساڵێک، یەک دەست جلوبەرگی میدیایی لەگەڵ کۆمەڵێک لە بەنرخترین دیارییەکان[1] وەک نەریتی پارسەکان چەشنی خەڵات بە ناوبراو ببەخشرێ. بۆیەش ئەو بڕیارەیان‌دا، لەبەر ئەوەی ناوبراو یەکەم کەس بوو دەستی بە جموجۆڵ کردبوو و خەڵکی لە دەوری خۆی کۆکردبۆوە. بەو پێیە سروشتی بوو کە ڕێزی لێبگیرێ. لەمەر خۆیشیان، ئاوا ساغ بوونەوە کە مافی ئەوەیان هەبێ، بەبێ لێپرسینەوە هاتووچۆی نێو بارەگای پاشایەتی بکەن و پێویست بە ئاگادارکردنەوەی پێشوو نەبێ، مەگەر جەنابی پاشا لەگەڵ هاوسەرەکەیدا خەوتبێ. هەروەها، پاشای نوێ بۆی نەبوو هاوسەر لەنێو خەڵکیتر جیا لە بنەماڵەی ئەو ڕاپەڕیوانە هەڵبژێرێ. سەبارەت بە هەڵبژاردنی پاشا کە بڕیاردرا لەنێو شەش کەسەکەدا یەکیان دیاریبکرێ، ئاوا ساغ بوونەوە: سپێدەی بەیانی بەر لە گزینگدانی خۆر، هەرکام لەبەر خۆیەوە و بە سواری ئەسپ بچنە دەرەوەی شار. ڕاست لە کاتی گزینگدان، ئەسپی هەرکام لەوانە زووتر بحیلێنێ، خاوەنی ئەسپ دەبێتە پاشای وڵاتی پارس.

[٨٥] داریوش مەیتەرێکی گەلێک لێزانی هەبوو. پێیدەگووترا ئیڤاریس. وەختێک ئەو شەش کەسە لێک جیا بوونەوە، داریوش بە مەیتەری خۆی گووت: "ئیڤاریس! لەمەر دیاریکردنی پاشا بەو قەناعەتە گەیشتووین کە بەیانی زوو بەر لە خۆرهەڵات، ئەسپسواری بکەین. ئەسپی هەر کام لە ئێمە بەر لە گزینگدان وەحیلە کەوێ، خاوەنی ئەو ئەسپە دەبێتە پاشای وڵات. ئێستا پێم بڵێ

[1] ١- بەپێی زانیارییەکانی گزنفۆن، شێوەی ژیانی میدیاکان گەلێک ئەشرافی و دەوڵەمەندانە بووە و بەپێچەوانەوە، فارسەکان تەواوێک نەدار و فەقیرانە ژیاون.

چیت لە دەست دێت. لێزانی خۆت بەکاربێنە بۆوەی ئێمە ئەو خەڵاتە بەرینەوە، نەک کەسێکیتر ". ئیڤاریس لە وڵامدا گووتی: "گەورەم! ئەگەر پاشایەتی وڵات بەوە بەستراوەتەوە، غیرەت وەبەر خۆت بێنە و باوەڕت بەخۆت هەبێ، چونکە دڵنیام تۆ دیاریدەکرێی. ئەوەی بۆ ئەو کارە پێویستە، لەلای من دەست دەکەوێ ". داریوش ئەوجار پێیگووت: "ئەگەر شێوازێکت پێ شک دێ، ئێستا کاتی ئەوە هاتووە بەکاری بێنی و پێویستە خێرا لێی وەخۆکەوی، لەبەر ئەوەی سبەی بەیانی کێبەرکێکە بە ئەنجام دەگات ". کاتێک ئیڤاریس ئەو قسەیەی گوێ لێبوو، بەو چەشنە جوڵایەوە: هەرکە شەو داهات جوانووماینێکی هێنا کە ئەسپی داریوش گەلێک حەزی لێبوو. ئەو جوانوو ماینەی بردە دەرەوەی شار و بۆ شوێنی قەراری کێبەرکێ. ماینی گۆرینی لەوێ بەستەوە. ئەوجار ئەسپی داریوشی برد و بەدەوری جوانووەکەدا گێڕای. ئەوەندە نیزیک کە ئەسپەکە بتوانێ بۆنی پێوە بکات و خۆی ڕێخشێنێ. پاش فەترەیەک لێگەڕا ئەسپەکە سواری جوانوو مایین بێ.

[٨٦] بەر لە خۆرهەڵات، هەر شەش کەس لەسەر قەراری پێشوو بە سواری ئەسپ گەیشتنە شوێنی دیاریکراو. واتە ئەو جێگایەی شەوی پێشتر جوانوو ماینی لێ بەسترابۆوە. ئەسپی داریوش، وەختێک خۆر گزینگی دا و چاوی بەو شوێنە کەوت، یەکجێ حیلاندی. جیا لەوەش و هاوکات لەگەڵ گشت پلانە داڕێژراوەکان، ڕووداوێکیتریش قەوما. ئەو شەوە ئاسمان ساف و بێگەرد و پڕ لە ئەستێرە بوو. ئەوە نیشانەی خۆش شانسی داریوشی دەگەیاند. وێدەچوو گشت دیاردەکان دەستیان وێکدابوو کە ناوبراو بە خۆزگەکانی بگات. پاش حیلاندنی ئەسپی داریوش، ئەوانیتر لە ئەسپەکانیان دابەزین و لەبەردەم داریوش سەری کڕنۆشیان دانەواند.

[٨٧] جیا لەو بەسەرهاتە، خەڵکانێکیتر دەگێڕنەوە کە ئیڤاریس شێوازێکیتری بەکار هێناوە. هەڵبەت ئەو کۆمەڵە خەڵکە بۆچوونی پارسەکان دەگێڕنەوە. دەڵێن ئیڤاریس دەستی لەنێو مێیینەی جوانوو مایین وەرداوە و لەنێو دەرپێی خۆیدا شاردویەتەوە. کاتێک گشت لایەک بە سواری ئەسپ، بەر

له خۆرهەڵات گەیشتوونە جێ، دەستی دەرهێناوە و لەبەر لووتی ئەسپی داریوش ڕایگرتووە بۆوەی بۆنی پێوە بکات. بۆیە ئەسپەکە کەفی وەسەر زار گەڕاوە و حیلاندوویە.

[٨٨] بەهەرحاڵ، داریوش وەک پاشای پارسەکان دیاریکرا. جیا لە عەرەبەکان گشت نەتەوەکانی ئاسیا ژێر دەستەی ئەو بوون. کورۆش لە سەردەمی خۆیدا ئەو وڵات و هەرێمانەی داگیرکردبوو و دواتریش کامبیزی کوڕی پەرەیپێدان. عەرەبەکان هیچکات نەهاتنە ژێر نیری دەسەڵاتی پارسەکان، بەڵام بوونە دۆست و هاوپەیمان بەتایبەت ئەو کاتەی کامبیز بەوێدا تێپەڕی و چووە وڵاتی میسر. ئەگەر ئەو عەرەبانە ڕێگایان بە کامبیز نەدابا، ناوبراو نەیدەتوانی پەلاماری میسر بدات.

داریوش لەگەڵ ژنانی سەر بە بنەماڵەکانی ناسراو زەماوەندی کرد. سەرەتا دوو کەس لە کچەکانی کورۆش بە ناوەکانی ئاتووسا و ئارتیستۆنی هێنا. ئاتووسا پێشتر ژنی برای کامبیز واتە سمێردیس بوو و دواتر کابرای مۆغ لەخۆی مارەکرد. ئارتیستۆنیس قەیرە کچ بوو. داریوش لە درێژەدا لەگەڵ کچی سمێردیسی کوڕی کورۆش بەناوی پارمیس زەماوەندی کرد. هاوکات کچی ئۆتانیس، ئەوەی کابرای مۆغی ئاشکرا کردبوو، ئەویشی بە هاوسەری قبوڵ کرد. بەو شێوەیە پێگەی حکوومەتی خۆی سەقامگیر کرد. یەکەم یادگاری هونەری داریوش، نیمچە پەیکەرە بەردینەیەکە کە هێمای ئەسپێکی لەسەر هەڵکەندراوە و لە خوارەوەش بەو شێوەیە نووسراوە: "داریوش کوڕی گشتاسپ بە یارمەتی ئەسپەکەی(ناوی ئەسپ هاتووە) و ئیڤاریسی مەیتەر پاشایەتی پارسەکانی بەدەست هێناوە ".

[٨٩] داریوش فەرمانڕەوای بیست هەرێم بوو و پێیان‌دەگووترا ساتراپی. ناوبراو بەڕێوەبەری بۆ ساتراپی‌یەکان وماڵیاتی ساڵانەی بۆ گشت نەتەوەکان دیاری‌کرد. ئەو یاسایە گەلانی دراوسێشی دەگرتەوە و لەڕاستیدا ماڵیاتی جیرانێتی لێ دەستاندن. داریوش هەروەها بڕیاری‌دا ئەو گەلانەی کە دراوسێی هەڤدوو نین، لە یەک تاقم و دەستەدا دابندرێن. ناوبراو ناوچەکان و

شێوازی ماڵیات دانی ئەوانەی بەو چەشنە دیاریکرد. ئەو گەلانەی ماڵیات بەشێوەی زیو بدەن، پێویستە پێوانە تەنیا تالاّندی بابیلۆنی بێ. ئەوانەی زێڕیان دەدا، لەسەریان بوو تالاّندی ئێڤۆیی بەکاربێنن. تالاّندی بابیلۆنی بەرابەری حەفتا منای ئێڤۆیی بوو. لە سەردەمی کورووش و دواتریش لە کاتی فەرمانڕەوایی کامبیزدا، سیستەمی ماڵیاتی لەگۆڕێدا نەبوو. گەلانی ناوچە تەنیا خەڵات و دیارییان پێشکەش بە پاشا دەکرد. دامەزرانی ئەو سیستەمە ماڵیاتییە و کۆمەڵێک یاسایتر، پارسەکانیان بەو قەناعەتە گەیاند کە بڵێن داریوش کابرایەکی بازرگان و ملهوڕ و سەرەڕۆ بووە، بەڵام کورووش لەگەڵ خەڵک وەک باوک هەڵسوکەوتی کردوە. داریوش گشت کەرستەیەکی بەلاوە گرینگ بوو. کامبیز مرۆڤێکی دڵڕەق و بێ موبالات، لەحاڵێکدا کورووش مێهرەبان و گەلێک بەخشەندە و دڵفراوان جولایەوە.

**[٩٠]** یونییەکان[1] و ماغنیسییەکانی[2] ئاسیا، ئێئۆلی[3]، کاری[4]، لیکی[5]، میلی[6] و پامفیلی[7]، گشتیان پێکەوە ماڵیاتیان دەدا. ئەوان پێویست بوو چوارسەد

---

١- وڵاتی نێوان کەنداوی ئەزمیری ئەمڕۆ و مەندەلییە لە ئاسیای بچووکی سەردەمی باستان و شوێنی نیشتەجێیی یۆنانیانی کۆچبەر، کە بە وڵاتی یوونی ناسراوبوو.

٢- ماغنیسی، نیشتەجێی سێ شوێن، تیسالی و وڵاتی لیدی و لە قەراخ چۆمی مێئاندرۆس.

٣- ئێئۆلی، ناوی یەکێک لە هەرێمە کۆنەکانی ئاسیای بچووکە و لە دراوسێیەتی هەرێمی یوونی بووە. دانیشتووانی ئێرە بە هەمان ناو واتە ئێئۆلی دەناسران. سەرەتا لە وڵاتی یۆنان ژیاون، بەڵام دواتر بەهۆی هێرشی دووریی‌یەکان، بەرەو ئاسیای بچووک کۆچیان کردوە و لەو شوێنە نیشتەجێ بوونە کە ناوی نراوە ئێئۆلی.

٤- کاری ناوی هۆزێکی سەردەمی ئەنتیک و نیشتەجێ لە باشووری رۆژئاوای ئاسیای بچووک و لە هەرێمی نێوان وڵاتی لیدیا و فریژی و لیکیا و دەریای ئێژە بوونە. بەرەگەز یۆنانی و دواتر کەوتنە بەر پەلاماری هۆزەکانی دووری یا دەری و ناچاربوون بەرەو ئاسیای بچووک کۆچ بکەن.

٥- لیکی یا لیسی بە دانیشتووانی یەکێک لە هەرێمەکانی کۆنی ئاسیای بچووک دەگووترێ. هەرێمەکەیان لەنێوان دەڤەری کاری و پامفیلی هەڵکەوتووە.

٦- میلی، هۆزێک لە باکووری رۆژئاوای لیکی نیشتەجێ بوونە.

٧- پامفیلی، دانیشتووانی کۆنی ئاسیای بچووک، لەلای رۆژئاوا دراوسێی لیکی و کارییەکان و لە رۆژهەڵات دراوسێی کیلیکیا و دەریای مەدیترانە بوونە.

تالاندی زێو[1] بە حکوومەت بدەن. ئەوەیان یەکەم ساتراپی بوو. میسی[2]، لیدی[3]، لاسۆنی[4]، کاڤالی[5] و ئیتینییەکان[6] پێنسەد تالاندیان لەسەر بوو و دووهەم ساتراپی‌یان پێکدەهێنا. ئێلیس‌پۆندی‌یەکانی[7] نیشتەجێ لە قۆڵی راستی راستی گەرووی ستێنۆ (قەراخ ئاوەکانی لای یۆنان) نیشتەجێن، فریژی[8]، تراکی‌یەکانی ئاسیا،[9] پاڤلاغۆنی[10]، ماریاندینی[11] و سووری‌یەکان بەرعۆدە بوون کە سێسەدو شێست تالاند مالیات بەرێ‌بکەن. ئەوەیان سێهەم ساتراپی بوو. کیلیکی‌یەکان سێسەد و شێست ئەسپی سپی، واتە رۆژێ یەکدانە، لەگەڵ پێنسەد تالاندی زێویان بۆ دیاری کرابوو. لەو پارە زێوە، سەد و چل سکەیان دەدرا بە پاسەوانانی سوارە نیزام کە پارێزگاریان لە وڵاتی کیلیکیا دەکرد. پاشماوەی پارەکە، واتە سێسەد و شێست تالاندی زێویش بۆ داریوش بەرێ‌دەکرا. ئەوەیان ساتراپی چوارەم بوو.

---

١- تالاندی یۆنانی ٢٦ کیلۆگرەم، میسری ٢٧ کیلۆگرەم، بابێلی ٣٠.٣ کیلۆگرەم و رۆمی ٣٢.٣٠ کیلۆگرەم بووە.

٢- میسی، لە باکووری رۆژئاوای ئاسیای بچووک، لەنێوان تەنگەبەراییەکانی ئاوی و دەریای ئێژە هەڵکەوتووە. شارەکانی ناسراوی ئەو هەرێمە بریتین لە ترۆئا، لامپساکی.

٣- لیدی یا لیدیا، هەرێمێکی سەردەمی ئاسن لە ئاسیای بچووک و هەڵکەوتوو لە رۆژئاوای ئاناتولی، ئەمرۆ دەکەوێتە پارێزگاکانی مانیسا و ئەزمیر لە تورکیا.

٤- لاسۆنی، وێدەچێ لازەکانی ئەمرۆ بن کە لە کەنارئاوەکانی دەریای رەش نیشتەجێ بوونە. ئەمرۆ پتر لە پارێزگاکانی رۆژهەڵاتی تورکیا، وەک ریزە و ئارتوین دەژین، زبانیان شێوەی گەرجییە. بەشی زۆری ئەوانە لە روسیا دەژین.

٥- کاڤالی، لە هەرێمێک بە هەمان ناو، لە باکووری لیکی‌یەکان نیشتەجێ بوونە.

٦- سەبارەت بەو هۆزە هیچ زانیارییەک دەستنەکەوتووە.

٧- دەڤەری تەنگەبەرایی داردانێلی ئەمرۆ لەنێوان دەریای ئێژە و دەریای رەش.

٨- وڵاتی فریژی لە نێوەندی ئاسیا بچووک و خاوەن شاری ناسراو و باستانی ترۆئا.

٩- تراکی، هەرێمی باکووری یۆنانی باستان، ئەمرۆ بەشێکی وەبەر وڵاتی بولغارستان کەوتووە.

١٠- پاڤلاغۆنی، هەرێمێک لەنێوان دەریای رەش و ڤیتینی. شاری ناسراوی ئەو هەرێمە سینۆپی‌یە.

١١- ماریاندینی، هۆزێک کە لە کەنارئاوەکانی دەریای رەش نیشتەجێ بوونە.

[٩١] پۆسیدیۆن،[١] ئەو شارەی ئامفیلۆخۆس، کوڕی ئامفیارۆس لەسەر سنوورەکانی کیلیکیا[٢] لەگەڵ سووریا بنیاتی نا، لەوێرا هەتا وڵاتی میسر، جیا لەو بەشەی وڵاتی عەرەبستان کە وێران ببوو،ماڵیاتی ساڵانەی دەگەیشتە سێسەد و پەنجا تالاند. ئەو ساتراپی‌یە سەراسەری وڵاتانی فینیقی، سووریا، فەلەستین و قیبریسی لەخۆوە دەگرت. ئەوەیان پێنجەمین ساتراپی بوو. میسر و وڵاتانی دراوسێی وەک لیبی، کیرینی[٣]، ڤاریکی[٤] (ئەو دوو وڵاتەی دوایی لەگەڵ ساتراپی میسر بوون)، حەوتسەد تالاند ماڵیاتیان دەدا، هەڵبەت جیا لەو داهاتەی کە لە گۆلی میری (موریس)، بە فرۆشتنی ماسی دەستیان‌دەکەوت. گووتمان حەوت سەد تالاند ماڵیات لەلایەک و ناردنی گەنمیش لەلایەکی‌تر، چونکە وڵاتی میسر ناچارکرابوو سەدوبیست هەزار مێدیمنۆ[٥] گەنم بداتە پاسەوانەکانی پارس لە ناوچەی لێفکۆتیخۆس (دیواری سپی). ئەو شوێنە سەربە دەڤەری مێمفیس بوو. ئەوەیان شەشەمین ساتراپی پێکدەهێنا. ساتاغیدی[٦]، غانداری،[٧] دادیکی[٨]، ئاپاری[٩]، گشتیان پێکەوە سەد و و حەفتا تالاندیان ماڵیات لەئەستۆ بوو و حەوتەمین ساتراپی بوون. شاری

---

١- پۆسیدیۆن، هەڵکەوتوو لە دەڤەری ئۆرۆنت و لە داوێنی چیای کاسیۆس لە ئاسیای بچووک.

٢- کیلیکیا یا لیسی یەکێک لە هەرێمەکانی کۆنی ئاسیای بچووک لە باشووری رۆژئاوای ئەو نیمچە نیمچە دورگەیە و لە کەنارەکانی مەدیترانە و دەریای ئێژە، هەڵکەوتوو لەنێوان دەڤەری کاری و پامفیلی.

٣- کیرینێ‌ئا، ناوی موهاجیرنشینێک کە یۆنانییەکان لە رۆژئاوای میسر و لە خاکی ئەفریقیادا دروستیان‌کرد و پێتەختی وڵاتی کیرینی‌یەکان بووە.

٤- ڤاریکی، بارکە یا بارقە، شارێکی دەڤەوی کیرینی‌یەکان و لیبی کۆن.

٥- مێدیمنۆ، پێوانە بۆ کەرستەی ئاوەکی لە شاری ئاتێن و بەرابەری ٥٢ لیتر بووە.

٦- هۆزێکی کۆنی نیشتەجێ لە قەراغ روباری سیند لە پاکستان.

٧- غانداری، بەشی ژورووی قەندهاری ئەمڕۆ.

٨- دادیکی، بەپێی زانیارییەکان دەبێ تاجیک بووبن.

٩- ئاپاری، زانیارییەک لەگۆڕێدا نییە.

شوش و باقی وڵاتی کاسی‌یەکان[1]، سێسەد تاڵاندیان دەدا و وەک هەشتەمین ساترپی چاویان لێدەکرا.

[٩٢] بابیلۆن و باقی وڵاتی ئاسیریا، قەیاسی هەزار تاڵاند زیو ماڵیاتیان لەسەر بوو و جیا لەوەش پێنجسەد منالیان پێشکەش دەکرد. ئەوەیان نۆهەمین ساتراپی بوو. ئێکباتان و باقی وڵاتی میدیا، ئۆرتوکۆریڤاندی[2] و پاریکانی‌یەکان[3] سەرجەم چوارسەد و پەنجا تاڵاند ماڵیاتیان بۆ دیاریکرابوو و دەهەمین ساتراپی‌یان پێکدەهێنا.

کاسپی[4]، پاڤسیکی[5]، پادیماتی[6] و داریتی‌یەکان[7]، گشتیان پێکەوە دوو سەد سەد و پەنجا تاڵاند ماڵیاتیان دەدا و یازدەهەمین ساتراپی بوون. لەدوای باکتریانی‌یەکان[8] تا ئێغلی‌یەکان[9]، رادەی سێسەد و شێست تاڵاند ماڵیات دەگەیشتە دەستی حکوومەت و دوازدەهەمین ساتراپی بوون.

[٩٣] پاکتی[10]، ئەرمەنی و دراوسێکانیان تا دەگەیشتە دەریای رەش، چوار سەد تاڵاند ماڵیاتیان بە حکوومەت دەدا و وەک سێزدەهەمین ساتراپی چاوی

---

١- کاسی‌یەکان، سەرەتا لە چیاکانی قەفقاز ژیاون، دواتر هاتوونەتە قەراخ ئاوەکانی کاسپییەن و بەرەبەرە بەرەو شووش و هەمەدان و کرماشان داگەڕوانە خوار.

٢- ئۆرتوکۆریڤاندی، هۆزێک لە باکووری دەوڵتی ماد کە وێدەچێ سکیتی بووبن.

٣- پاریکانی، رەنگە هەمان هۆز بن کە لە کتێبی ١ و بەندی ١٠١ ناویان هاتووە: پاریتاکینی‌یەکان و بوودی‌یەکان لە رەگەزی ئاری نەبوونە کە لەگەڵ میدیاکان ژیاون.

٤- کاسپی، کۆمەڵێک لە سکیتی یا سکاییەکانی دەڤەری بەحری کاسپییەن.

٥- پاڤسیکی، هۆزێکی کاسپی بووە.

٦- پادیماتی یا پاتیماتی، هۆزێکی کاسپی بووە.

٧- داری یا داریتی، پادیماتی یا پاتیماتی، پاڤسیکی و کاسپی گشتیان لە هەرێمی هیرکانی، واتە باشووری داغستان و ناوچەی رۆژهەڵاتی مازەندەرانی ئەمڕۆ ژیاون.

٨- باکتریێ یا باختریەکان، هەرێمێکی گەورە لە ئاسیا کە لە باکوور دەگاتە روباری سەیحون و لە رۆژهەڵات تا چیاکانی ئیمۆس راکشاوە و بەشێکی ئەو هەرێمە، ئەمڕۆ خاکی ترکستانە.

٩- ئیغلی یا ئیگلی‌یەکان، لە کەنارئاوەکانی کاسپییەن و دەڤەری گیلانی ئەمڕۆ ژیاون.

١٠- پاکتی، شێوەی باختریەکان ژیاون و لە کەنارئاوەکانی روباری سەند لە پاکستان و خاوەن شاری کاسپاتیرۆس بوونە و وێدەچێ بەرەگەز هیندی بووبن. بۆچی لەگەڵ ئەرمەنییەکان لە یەک ساتراپیدا بوونە خۆی جێگای پرسیار و گومانە.

لێدەکرا. ساغارتی[1]، سارانگی[2]، تامانی[3]، ئووتی[4]، میکی[5]، و دانیشتووانی دورگەکانی دەریای ئێریترە، واتە ئەو شوێنەی کە پاشا دورخراوەکانی خۆی دەنارده ئەوێ، سەرجەم شەش سەد تالاند ماڵیاتیان لەسەر بوو و چواردەهەمین ساتراپی‌یان پێکدەهێنا. ساکی[6]، کاسپی[7]، دوو سەد و پەنجا تالاند و پانزدەهەمین ساتراپی بوون. پارتی[8]، خۆراسمی[9]، سوغدی[10] و ئاری[11]، گشتیان سێسەد تالاندیان بۆ دیاری کرابوو و شانزدەهەمین ساتراپی بوون.

**[٩٤]** پاریکانی و ئەتیۆپی‌یەکانی ئاسیا[12] چوارسەد تالاندیان وەبەر کەوتبوو و حەڤدەهەمین ساتراپی بوون. ماتینی[13]، ساسپیری[14] و

---

١- ساگارتی، هۆزێکی گەڕۆک لە بیابانەکانی نێوەندیی دەوڵەتی میدیا.

٢- سارانگی، هۆزێک لە رۆژئاوای گۆلی هامۆن.

٣- تامانی، هۆزێکی نیشتەجێ لە دەوروبەری گۆلی هامۆن و سیستانی ئەمڕۆ و دراوسێی سارانگی‌یەکان بوونە.

٤- ئووتی، لە دەوروبەری کرمان ژیاون.

٥- میکی، لە قەراخ ئاوەکانی کەنداوی فارس و لە ناوچەی مەکران یا موکران ژیاون.

٦- ساکی یا ساسی‌یەکان، لە هەرێمی سیستان ژیاون و وێدەچێ بە رەگەز سکیتی یا سکایی بووبن و ناوی سیستان لەووە سەرچاوە دەگرێ.

٧- ئەو ناوە لە دوو ساتراپی‌دا هاتووە و جێگای پرسیارە.

٨- پارتی، بەرەگەز سکیتی بوونە و لە رۆژهەلاتی دەریای کاسپییەن ژیاون.

٩- خۆراسمی یا خوارەزمی، هۆزێکی سکیتی لە قەراخ ئاوەکانی گۆلی ئارال و روباری جەیحون یا سەیحون ژیاون.

١٠- سوغدی، ئەو هۆزانەی لە ئاسیای نێوەندی لەنێوان سکیتی و هیندی و باختەری‌یەکان ژیاون و هەرێمەکەیان شارەکانی بوخارا و ترکستان و خوجەندی ئەمڕۆ بووە.

١١- ئاری‌یەکان، دانیشتووانی خۆراسان و خوارەزم و سەمەرقەند و هیرات بوونە.

١٢- رەنگە مەبەستی لە بەلووچەکان یا ژمارەیەک موهاجیری ئەفریقی بووبێ کە لە قەراخ بەحری عەمان ژیاون.

١٣- ماتینی، هۆزێک نیشتەجێ لە کەنارئاوەکانی گۆلی ورمێ.

١٤- ساسپیری، هۆزێک کە لەنێوان وڵاتی کۆلخید و میدیا ژیاون و دراوسێی ماتینی و ئالارودی بوونە.

ئالارودی‌یەکان[1] دووسەد تالآند و وەک هەژدەهەمین ساتراپی سەیر دەکران.[2] دەکران.[2] مۆسخی،[3] تیڤارینی[4]، ماکرۆنی[5] و موسینی و ماری، ئەوانیش سێسەد تالآند و نۆزدەهەمین ساتراپی‌یان پێکهێنابوو. هیندی‌یەکان، ئەوەندەی من بزانم، پڕحەشیمەت‌ترین گەلانی جیهانن. ئەوان بە تەنیا بەقەدەر گشت خەڵکانی‌ترماڵیاتیان بە حکوومەت دەدا. سێسەد و شێست تالآند پارەی زێڕی ورد و ساتراپی بیستەم بوون.

**[٩٥]** ئێستا، ئەگەر کەسێک گەرەکی بێ تالآندی زێوی بابیلۆنی بە تالآندی ئێڤۆبیکی بگۆڕێتەوە، هەر سکەیەکی زێو بەرابەری نۆ هەزار و پێنسەد و چل تالآند، ئەگەر بەراوردی بکەین کە زێڕ سێزدە بەرابەری زێو قیمەت دەکا، ئەوساکە نرخی یەک لەتی بچووک (نخوودێک) دەکاتە چوارهەزار و شەش سەد تالآند. دەکرێ بڵێین لەسەر یەک، داریوش چواردە هەزار و پێنسەد و شێست تالآندی ئێڤۆبیکی ماڵیاتی ساڵانەی وەردەگرت.

**[٩٦]** ئەو ماڵیاتەی کە دەگەیشتە دەست داریوش، لە ئاسیا و هێندێک ناوچەی سەر بە وڵاتی لیبی کۆدەکرایەوە. ئەو هەروەها، ماڵیاتی دورگەکان و ئوروپا تا دەگەیشتە دەریاوە، هەرهەمووی وەردەگرت. پاشا ئەو ماڵیاتەی بەو چەشنە لە خەزێنەدا کۆدەکردەوە و دەیپاراست. سکەکانی دەتواندەوە و لە کوپەی دەکرد. پاش پڕبوونی کوپە و ساردبوونەوەی، ئەوجار دەیانشکاند

---

١- ئالارودی، خالدی‌یەکان (کوردەکان) لە سەدەی نۆی پێش میلاد، لە دەوروبەری وان خاوەن دەوڵەت بوونە کە لەلایەن ئاشوورییەکانەوە بە دەوڵەتی ئورارتو ناسراوە و یۆنانییەکان بە ئالارودی ناویان بردوە و عیبری‌یەکان پێیان گوتووە دەوڵەتی ئارارات. ئەرمەنی‌یەکان دواتر ئەو دەوڵەتەیان روخاندوە و ئالارودییەکان ناچار پەنایان بۆ چیاکان بردوە (خالدی، کوردی، کورتی و گردیا گشتیان یەکن).

٢- ئەو سێ هۆزە، واتە ماتینی، ساسپیری و ئالارودی بەپێی هێندێک سەرچاوە کوردن.

٣- مۆسخی، بەپێی چەند سەرچاوە، لە دەوری چیای قەفقاز ژیاون و رەنگە گرجی بووبن.

٤- تیڤارینی، مۆسخی، ماکرۆنی، موسینی و ماری دراوسێی هەڤدوو لە هەرێمی کۆلخید یا کۆلشید کۆلشید و لە نیزیک دەریای رەش و رۆژهەلاتی تراپیزۆنی ئەمڕۆ نیشتەجێ بوونە.

٥- ماکرۆنی، هۆزێکی کۆنی ئاسیای بچووک، وڵاتەکەیان پێی گووتراوە ماکرۆنیا، لە دەوروبەری چیاکانی قەراخ دەریای رەش، لە شوێنی وڵاتی گرجستانی ئەمڕۆ و لە رۆژهەلات تراپیزۆن هەڵکەوتبوو.

و تەنیا زێڕەکە دەمایەوە و هەڵدەگیرا. هەرکات پاشا پێویستی بە پارە بوایە، لە قەدەر ئیحتیاجی خۆی، لەتێکی دەبڕی و خوردی دەکردەوە.

[٩٧] ئەوە باسی ساتراپی و ماڵیات بوو. تەنیا وڵاتێک کە باسم لێوەنەکرد و ماڵیاتی نەدەدا، وڵاتی پێرسیا (پارس) بوو، چونکە ئەوان لەسەریان نەبوو ماڵیات بدەن. هێندێک لە گەلانی دیاریکراویش چەند ماڵیاتێکی دەست نیشانکراویان نەدەدا و تەنیا دیاری و خەڵاتیان پێشکەش بە پاشا دەکرد، وەک ئەتیۆپی‌یەکانی هاوسنووری وڵاتی میسر، ئەوانەی کامبیز لە کاتی هێرش‌کردنە سەر ماکرۆڤی‌یەکانی[١] ئەتیۆپی‌یاییدا هێنابوونیە ژێر پەیڕەوی خۆیان. ئەو ماکرۆڤی‌یانە لە دەوروبەری شاری موقەدەسی نیسا[٢] نیشتەجێن و جێژن بۆ خواوەند دیۆنیسۆس[٣] دەگرن. (ئەو ئەتیۆپی‌یانە و دراوسێکانیان وەک خەڵکانی کەلاندی کە بە رەگەز هیندین، خاوەن خانووی ژێر عەرد و تۆوی نێرینەی یەکرەنگن). ئەوانە هەر بە سێ ساڵ جارێک، تەنانەت لە سەردەمی منیشدا، دوو خینیک[٤] (شنیس) زێڕی ناخالیس و دووسەد کۆتەداری عەبەنوس و پێنج منالی کوڕی ئەتیۆپی‌یایی و بیست عاجی گەورەی فیل بۆ پاشا بەدیاری دێنن. کۆلخی‌یەکان[٥]، ئەوانەش پاشایان خەڵات خەڵات دەکرد و خۆیان سەربەخۆ لەسەر چەشن و رادەی دیاری‌یەکانیان

---

١- ماکرۆڤی‌یەکانی ئەتیۆپیایی ئەو خەڵکانە بوون کە بۆ تەمەن درێژی ناوبانگیان دەرکردبوو و بەپێی چیرۆکە ئەفسانەیی‌یەکان نیزیک بە دوو هەزار ساڵ دەژیان.

٢- نیسا، شارێکی پیرۆز لەسەر بەرزترین تەپۆڵکەکانی شاری ئاتێن و خەڵاتکراو بە خواوەند ڤاکخۆس واتە خوای شەڕاب بووە. هەڵبەت هەر بەو ناوە لە وڵاتانی لیدی و هیند و ئەفریقیا سێ شار بۆ هەمان مەبەست دروست کراون. لێرەدا مەبەست شاری نیسا لە ئەفریقایە.

٣- دیۆنیسۆس، خوای عەشق و شەڕاب.

٤- خینیک، یەک لیتر و یەک دیسلیتر و هەشت لەدەی سانتیلیتر. مێدیمنۆ پێوانە بۆ کەرستەی ئاوەکی لە شاری ئاتێن و بەرابەری ٥٢ لیتر بووە، هەر یەک خینیکس، یەک چل و هەشتمی مێدیمنۆ حیساب کراوە.

٥- کۆلخید یا کۆلشید، وڵاتی کۆلخیدی‌یەکان، هەرێمێکی کۆنی ئاسیا کە لە باکوور دەگاتە چیاکانی قەفقاز و لە باشوور هاوسنووری ئەرمەنستانە و لە رۆژئاوا دەگاتە سەر بەحری رەش و شوێنێکی گرینگی بازرگانی بۆ وڵاتانی رۆژهەلات لە سەردەمی ئەنتیکدا بووە.

بڕیاریان دەدا. دیارە دراوسێی ئەوانە تا دەگەیشتە ریزە چیاکانی قەفقاز، بە هەمان شێوە هەڵسوکەوتیان دەکرد. (پارسەکان تا ئەو ریزە چیایە حوکمڕانی‌یان بەسەر خەڵکدا کردوە، بەڵام لە ڕۆخەکانی باکووری چیای قەفقاز هیچکەس حیساباتێکی بۆ دەسەڵاتداری ئەوان نەکردوە).

ئەو گەلانە تەنانەت لە سەردەمی منیشدا، کۆڵێک دیاری و خەڵات کە خۆیان هەڵیان‌دەبژارد، هەر بە پێنج ساڵ جارێک، جیا لە کۆمەڵێک کور و کچی عەلاوە بۆ بارەگای پاشا دەنارد. عەرەبەکان ساڵانە بایی هەزار تاڵاند داری بۆنخۆشی کۆندۆریان وەرک دیاری دەنارد. بەهەرحاڵ ئەو دارانە جیا لە مالّیات، وەک خەڵات بە پاشاکانی پارس دەدران.

[۹۸] هیندی‌یەکان خاوەن زێڕێکی زۆرن. ئەوان لەو زێڕە مالّیاتیان بە پاشا دەدا و ئەو زێڕەش بەو شێوەیە دەست دەکەوت: بەشی ڕۆژئاوای وڵاتی هیندوستان تەواو خیزەڵانە. ئەوەندە زانیارییەی سەبارەت بەو گەلانە لەبەر دەستم دایە، دەکرێ بڵێم تەواو دروستن. هیندی‌یەکان یەکەم خەڵکانێکن لە ڕۆژئاوای ئاسیا نیشتەجێ بوونە، چونکە تۆزێک واوەتر لەو خەڵکە و بەرەو خۆرهەڵات، بەتەواوی بیابان و سەحرا و خیزەڵانە. کۆمەڵێک هۆزی هیندی هەن کە بە هەمان زمان قسە دەکەن. بەشێک لەوانە کۆچەرن و قیسمێکیشیان خاوەن ژیانی نیشتەجێیین. چەندێک لەو خەڵکانە لە دەم چۆم و جۆبارەکان دەژین و خواردنیان تەنیا گۆشتی ماسی‌یە. ئەوانە گەمی لە قەڵەمێک قامیش دروست دەکەن و بۆ ماسی گرتن کەڵکی لێوەردەگرن.[1] ئەو هیندی‌یانە جلوبەرگی چندراو لە جەگەن سازدەکەن و دەیپۆشن. ئەو جەگەنە لە قەراخ روبارەکان دەستدەکەوێ و قەڵغان و سینەبەندیشی لێ دەچنن.

[۹۹] ئەو کۆمەڵە هیندی‌یانە لە ناوچەکانی ڕۆژئاواتر نیشتەجێن و خاوەن ژیانی هۆزایەتین. ئەوانە گۆشت بە خاویی دەخۆن و پێیان‌دەگووترێ

---

١- نابێ لەو چەشنە قامیشانە بووبێ کە ئێمە تا ئەمڕۆ ناسیومانە.

پێدێئی[1]. سەبارەت بە دابونەریت و ژیانیان، بەو چەشنە باسکراوە: هەرکەس لەوانە نەخۆش بکەوێ، ژن بێ یا پیاو، خێرا دەیکوژن. ئەگەر پیاو بێ، ئەوە دۆستانی نیزیکی مردوو دەینێژن. هەڵبەت دەگێڕنەوە کە نەخۆشی کابرا دەبێتە هۆی لەنێو بردنی جەستەکەی. دیارە زۆر جار کابرا نەخۆشییەکەی دەشێرێتەوە و باسی ناکا، بەڵام خەڵکی دەوروبەری ئەو، گشتیان هاوڕا، ناوبراو لەجێوە دەکوژن و گۆشتەکەی دەخۆن. ئەگەر نەخۆش ژن بێ، ئەوە کەسانی زۆر نیزیک لەو هەمان ڕەفتاری لەگەڵدا دەکەن.

ئەو مرۆڤەی کە پیر بووە، ئەویش دەکەنە قوربانی و گۆشتەکەی دەخۆن. هەر بۆیە زۆر کەس ناگاتە تەمەنی پیری و بەر لەو تەمەنە نەخۆش کەوتووە و گۆشتەکەی خوراوە.

[١٠٠] خەڵکانێکیتری هیندی هەن کە دابونەریتی جیاوازتریان هەیە. ئەوانە نە بوونەوەری گیاندار دەکوژن، نە دانەوێڵە دەچێنن و نە دەشزانن خانوو دروست بکەن. تەنیا بژیوی ئەوانە خواردنی گژوگیایە. لە ناوچەکەیاندا چەشنە دەغڵێک دەست دەکەوێ کە شێوەی هەرزن دەدا و قەڵچغ و قاپێلکی هەیە و سەربەخۆ شین دەبێ.[2] خەڵک کۆی دەکاتەوە و دانەکەی بەتوێڵکەوە دەخۆن. هەرکەس لەو خەڵکە نەخۆش بکەوێ، دەچێتە سەحرا و لەوێ رادەکشێ و هیچکەس خۆی پێوە ماندوو ناکات، چ ئەو ماوەیەی نەساغە، چ بمرێ.

[١٠١] گشت ئەو کۆمەڵە خەڵکە هیندییەی باسم لێوەکردن، بەئاشکرا و چەشنی ئاژەڵ، پێکەوە تێکەڵاوی جینسی دەکەن و ڕەنگی پێستی لەشیان وەک یەک و شێوەی خەڵکی ئەتیۆپیا دەدەن. تووی نێرینەیان کە دەڕژێتە نێو منداڵدانی ژن، وەک مرۆڤیتر خاوەن ڕەنگی سپی نییە و چەشنی ڕەنگی پێستیان ڕەشە. دەبێ بڵێم کە هی ئەتیۆپییەکانیش هەر بەو شێوەیەیە. ئەو

---

١- پێدێئی، وێدەچێ وشەیەکی سانسکریتی بێ کە مانای پیس و ناپاک دەدا و ڕەنگە ئەو کۆمەڵە هیندییە هەمان ئەو هۆزە بن کە بە خێڵی نەجس و پیسەکان ناوبانگیان دەرکردبوو.

٢- ڕەنگە مەبەستی لە برینج بووبێ.

هیندی‌یانە دوور لە پارسەکان و لە ناوچەکانی بەرەو باکوور دەژین و هیچکات سەری کڕنۆشیان بۆ داریوش دانەنواند.

[۱۰۲] خەڵکانێکی‌تری هیندی هەن کە لە کۆمەڵگاکانی دراوسێی ناوچەکانی کاسپاتیرۆس[١] و پاکتی‌ئیکی[٢]، بەواتایەک باکوورتر لە باقی هیندی‌یەکان دەژین. شێوەی ژیانی ئەوانە وەک هۆزەکانی باکتری[٣] دەچێ. زۆر شەڕکەرن و لەڕاستیدا ئەوانەن کە وەدوای دۆزینەوەی زێڕ دەکەون. لە هەرێمەکەیان، لە سەحرا و خیزەڵان، چەشنە مێرولەیەک بەرچاو دەکەوێ کە تۆزێک بچووکتر لە سەگ و گەورەتر لە ڕێوین. پاشای پارسەکان چەند سەر لەو مێرولانەی هەبوون کە لەو هەرێمە ڕاوکرابوون. ئەو مێرولانە عەرز هەڵدەکۆڵن و سەرپەنا و کونەمێروو دروست دەکەن و بەو شێوەیە کۆڵێک خیز و خۆڵ دەدەنە دەر. هەروەک چۆن مێرولەکان لە یۆنانیش عەرز هەڵدەکۆڵن، ئەوانەش بە هەمان شێوە و زۆریش وێکدەچن. ئەو خیزەی دراوەتەدەر، زێڕی تێدایە و هیندی‌یەکان بەدوای ئەو خیزەدا دەگەڕێن. هەر هیندی‌یەک سێ وشتر لەگەڵ خۆی بۆ ئەو هەرێمە دێنێ. وشترێکی مێ لە نێوەڕاست و دووی نێر لە تەنیشتەکانی ڕاست و چەپ دادەندرێن. هەرسێکیان بە گوریسی درێژ و مەحکەم لە یەکتر دەبەسترێنەوە. کابرای زێڕپشکن سواری وشتری مێ دەبێ کە تازە دەیلاغی دانابێ. وشترەکانیان چەشنی ئەسپ غاردەدەن و باری قورستریش هەڵدەگرن.

[۱۰۳] وەسفی وشترەکان ناکەم، چونکە یۆنانییەکان زانیارییان لەو بارەوە هەیە. ئەوەی نایزانن، باسی ئەو بەشەی دەکەم. وشتر لە پاشووەکانیدا چوار ئێسقانی لە ران و چواریشی لە ئەژنۆدا هەیە و ئەندامانی نێرینەی لەنێوان لینگەکانی پشتەوە و بەرەو کلکی جێیان‌گرتوە.

---

١- کاسپاتیرۆس، دەبێ لە نیزیک هەرێمی سیستان هەڵکەوتبێ.

٢- پاکتیکی، لە داوێنی چیاکانی سولەیمان هۆزێک بەناوی پاکتوم ژیاون و ڕەنگە ئەوانە بن.

٣- باکتری یا باختری، ئەو هۆزە بوونە لە وڵاتی تورکستانی ئەمڕۆ کە پێشتر شوێنی نیشتەجێیی ئارییاییەکان بووە، ژیاون. پێتەختی ئەوانە باکتریا و دواتر ناسراو بووە بە بەلخ.

[١٠٤] بەوجۆرەی باسم کرد، هیندی‌یەکان ئەو وشترانە لێک دەبەستنەوە و بۆ زێڕ کۆکردنەوە وەڕێدەکەون. ئەوان حیساباتی رێگا بە چەشنێک دەکەن کە گەرمترین کاتی رۆژ لە شوێنی مەبەستیان بن. چونکە لەو وەختەدا مێروولەکان لەبەر تەوژمی گەرما دەچنە نێو قولایی خاکەوە. لە ولاتی ئەوانە گەرمترین کات، سپێدەی بەیانییە، نەک کاتی نیوەڕۆ وەک ولاتانی‌تر. خۆر بەیانیان تا وەختی کرانەوەی بازار ئێجگار گەرم و بە شیدەتە. لەو فەترە زەمەنییەدا خۆر پتر لەش دەسووتێنێ تا کاتی نیوەڕۆ لە یۆنان. تەنانەت باسی ئەوەش دەکرێ کە دانیشتووانی ئەو شوێنە، لەو وەختە گەرمەدا دەخزێنە نێو ئاو. خۆرەتاوی نیوەڕۆ پیستی مرۆڤ هەر ئەوەندە دەسووتێنێ کە لە شوێنی‌تر باوە، بەلام بەیانی سەحەری و ئێوارە خۆرەتاو ئێجگار بە حوکمترە. کاتێک رۆژ ئاوا دەبێ، هەوا تەواوێک روو لە ساردی دەکات.

[١٠٥] هیندی‌یەکانی زێڕپشکن هەرکە گەیشتنە شوێنی مەبەست، ئەوە تەلیس و جەوال لەو خیزە پڕدەکەن و خێرا بۆ دواوە دەگەڕێنەوە، چونکە مێروولەکان بە بۆنکردن هەست بە بوونی ئەو مرۆڤانە دەکەن و وەک پارسەکان دەگێڕنەوە، وەدوایان دەکەون. ئەو مێروولانە لە تووند ئاژۆییدا بێ‌وێنەن. ئەگەر هێندێکیان پیرانەگەن کارەکەیان بەر لە دەرکەوتنی مێروولەکان تەواو بکەن و بکەونە بەر پەلاماریان، کەسیان رزگاریان نایە. وشترە نێرەکان چەشنی وشتری مێ لە رۆیشتندا خێرا نین. هەربۆیە لەوەی مێ دەبەسترێنەوە، هەڵبەت نێرەکان نابێ پێکەوە بن. وشترە مێینەکان بیر لە دەیلاخەکانیان دەکەنەوە و بەردەوام غاردەدەن. بە قسەی پارسەکان، هیندی‌یەکان کۆڵێک زێڕ کۆدەکەنەوە. دیارە زێڕی کانزاییش هەیە، بەلام قەیاسێکی ئەوتۆ بەرچاو نییە.

[١٠٦] گۆی زەوی خاوەنی ئەو گشتە کەرستەیەیە و وەک هەڵکەوتەیەک ولاتی یۆنانیش کەشوهەوایەکی سازگاری هەیە. هەروەک پێشتر باسم کرد، خاکی هیند دوایین هەرێمی نیشتەجێیی بەرەو رۆژهەلاتە. لەو ولاتە ئاژەڵ و پەلەوەر، لە هەڵسەنگاندن لەگەڵ شوێنەکانی‌تری جیهان، خاوەن قەوارەی

گەورەترن. هەڵبەت ئەوەش بڵێم کە ئەسپەکانیان ئەوتۆ نین و لە ئەسپی میدیاکان بچووکترن و پێیان دەگووترێ نیسیئا[1].

لەو شوێنەش زێڕێکی زۆر دەست دەکەوێ، بەڵام قاڵبۆوە نییە. ئەو زێڕەی ئاوی چۆم لەگەڵ خۆی دەیهێنێ، جیاوازە لەگەڵ زێڕێکی کە پێشتر باسم لێوەکرد. لەو وڵاتە کۆمەڵێک دار هەن کە میوە و بەرهەمەکەیان کوڵکەدارە و لە خوری مەڕ جوانتر و بەکەڵکترە. هیندییەکان لەو کوڵکەیە بۆ دروست کردنی جلوبەرگ کەڵک وەردەگرن.[2]

[١٠٧] بەرەو باشوور، دوایین وڵاتی ئاوەدان، عەرەبستانە. لەوێ تەنیا دارەکانی کۆندۆر، هەزوا (مۆر)، فلوس (پەرکی هیندی)، دارچین دەچێندرێ و میسک بەرهەم دێ. جیا لە داری مەرمەک، عەرەبەکان بەرهەمەکانیتر زۆر بە زەحمەت و کوێرەوەری وەدەست دەخەن. عەتری داری کۆندۆر بە سووتاندنی غەڵفەکەی دەسدەکەوێ و وەک بووخورد کەڵکی لێوەردەگرن. فینیقییەکان ئەو عەترە دەنێرنە یۆنان. ئەو دارانەی عەتریان لێدەگیرێ، بەهۆی مارەکانی باڵدار دەپارێزرێن. ئەو مارانە رەنگاورەنگن و بەکۆمەڵ لە دەوری دارەکان دەژین. ئەوانە جاروبار پەلاماری وڵاتی میسریش دەدەن. جیا لە دوکەڵی غەڵفی هەمان دار، هیچ کەرستەیەکیتر بۆ دوورخستنەوەی مارەکان لەو شوێنە کاریگەر نییە.

[١٠٨] عەرەبەکان خۆیان دەڵێن ئەگەر مارە ئەفعی(ئەژدیها)ییەکان لێگەڕابان ئەو جۆرە مارانە دەیانتوانی سەراسەری دنیا داگرن. خوای سروشت هەروەک دیاردەیەکی چاوەڕوانکراو، لەو بوارەدا گەلێک زانایە. فرسەتی پێگەیشتوویی و باروەری بە کۆمەڵێک زیندەوەری ترسنۆک داوە بەردەوام زیادبکەن، هەرچەند لێیان بمرێ و بکوژرێن، نەسڵ و رەچەڵەکیان نافەوتێ. لەلایەکیتریشەوە مەجالی زاوزێی کەمتری بە ئاژەڵی دڕندە و وەحشی داوە چونکە زیانەخرۆیی‌دەکەن. بۆوێنە، کەروێشک ئاژەڵێکە لەلایەن

---

١- نیسیئا، ناسراوترین رەگەزی ئەسپی میدیاکان لە سەردەمی باستاندا.

٢- لۆکە لە وڵاتی یۆنان و لە سەردەمی ئەسکەندەریشدا نەناسراو بووە.

گشت گیانداریکەوە راو دەکرێ. مرۆڤ و باڵندە رفێنەرەکان، سەرەڕای زاوزێیان راویش دەکەن. ئەوەی پتر لە هەر ئاژەڵێکیتر راوی بکەن، کەرویشکی مێیە. کەرویشکی مێ لەنێو مناڵدانیدا، هاوکات کە بێچووی موودار و بێ مووی هەیە، بێچوویتر دروست بووە و هێتریش خەریکە گەرا دەگرن. بەڵام، شێری مێ لە گشت ئاژەڵێک درندەترە، بە درێژایی تەمەنی تەنیا یەک بێچووی دەبێ.[1] کاتێک ئەو بێچووە لەدایک دەبێ، مناڵدانی دایکیش لەگەڵ خۆی دێنێتەدەر. هۆیەکەی ئەوەیە کە وەختێک بێچوو لەنێو سکی دایکدا دەست بە جوڵە دەکا، نینۆکی پەنجەکانی گەلێک تیژن، مناڵدان دەدڕێنن. هەرچی بێچووە شێر مەزنتر دەبێ پتر مناڵدان وێراندەکا. هەڵبەت ماوەیەکی زۆر بەر لە دایکبوونی دەست بەو کارە دەکا. دەکرێ بڵێم کاتی لەدایکبوونی، مناڵدانێک نامێنێ.

[١٠٩] لەهەرحاڵدا، ئەگەر مارەکانی ئەفعی و باڵداری وڵاتی عەرەبستان ئەوەندە زیاد بکەن کە سروشتیان بخوازێ، هیچ مرۆڤێک ناتوانێ لەسەر گۆی زەوی بژی. بۆیە رەوتەکە بەو چەشنە دەچێتە پێش: کاتێک ماری مێ لەگەڵ نێر جووت دەبێ و خەریکی وەرگرتنی تۆوی نێرەیە، خێرا ملی ماری نێر دەگرێ و هەتا تەواو قووتی نەدا بەری نادا. بەو شێوەیە ماری نێر دەمرێ کە لە ماری باوکە. بێچووە مارەکانیش ئەوەندەی لەنێو سکی دایکیاندا دەژین، بەردەوام هەناوی دەخۆن و لەڕاستیدا بەو جۆرە دێنەدەر. ماری نێر دەمرێ و ماری مێ بە سزای تاوانی خۆی دەگا و بێچووەکانیش تۆڵەی باوکیان لە دایکیان کردۆتەوە. بێچووەکان گشت ئەو ماوەیەی لەنێو سکی دایکیاندان، خەریکی خواردنی هەناوی ئەو دەبن.

ئەو مارانەی زیان بە مرۆڤ ناگەیێنن و هێلکە دەکەن، کۆمەڵێک بێچوویان لەو هێلکانە دێنەدەر. ماری ئەفعی لە گشت شوێنێکی ئەو جیهانە بەرچاو دەکەوێ، بەڵام ماری باڵدار تەنیا لە ناوچەی عەرەبستان هەیە و بەس. لەبەر ئەوەی بە کۆمەڵ دەژین، ژمارەیان زۆرتر دیارە.

---

١- دێڵەشێر نەک هەر ساڵێ جارێک دەزێ، بەڵکوو زیادتر لە یەک تۆڵە شێریشی دەبێ.

[١١٠] عەتری داری کۆندۆر، هەروەک لەسەرەوە باسم کرد، بەو چەشنە کۆدەکرێتەوە، بەڵام سەبارەت بە داری فلوس (پەرکی هیندی) بەو شێوەیەیە: پیاو دەبێ بە چەرمی کەڵ ئا ئاژەڵی‌تر لەشی خۆی تەواو داپۆشێ و تەنیا چاوەکانی بەدەرەوە بن. ئەوجار بۆ کۆکردنەوەی ئەو دارە وەخۆکەوێ. داری فلوس لەنێو گۆلاواندا شین دەبێ. لەو گۆلاوانەدا کۆمەڵێک ئاژەڵ هەنە کە شێوەی چەکچەکی (شەمشەمە کوێرە) دەدەن و باڵدارن و قیژە و هەرایەکی سەیر سازدەکەن و گەلێک بەهێزن. عەرەبەکان بەدەم پارێزگاری لە چاوەکانیان خەریکی کۆکردنەوەی ئەو دارە دەبن.

[١١١] شێوازی کۆکردنەوەی دارچین لەوەش سەیر و سەمەرەترە. لە چ خاکێکدا شین دەبێ، نەزانراوە. کەسانێکی هێندێک خاوەن باوەڕی ئایینی پێیانوایە کە ئەو دارە لەو شوێنە شین دەبێ کە خواوەند دیۆنیسۆس[١] لێی گەورە بووە. دەڵێن کۆمەڵێک باڵندەی مەزن ئەو دارە کۆدەکەنەوە و دەیبەنە هێلانەکانیان. فینیقی‌یەکان چەند زانیارییەکیان لەمەر ئەو دارە داوەتە دەست و دەڵێن هێلانەی باڵندەکان لە قوڕ دروستکراوە و لە چیا بەرزەکانن و گەلیک دژوارە دەستی مرۆڤیان پێبگا. عەرەبەکان رێگا چارەیەکیان دۆزیوەتەوە: کاتێک کەر، کەڵ یا ئاژەڵێکی لەو چەشنە دەمرێ، کەلاکەکەی دەکەنە چەند پارچەیەکی گەورە و دەیهێننە ئەو شوێنە کە نیزیک لە هێلانەکان بێ. خۆیان تۆزێک دوورتر لە کەلاکەکان چاوەڕوان دەبن. وەختێک باڵندەکان دێن و رۆدەبنە ئەو لەتە کەلاکانە بۆوەی رایانگوێزنە نێو هێلانەکانیان، تاقەتیان پێناشکێ و بەردەوام لێیان بەردەبێتەوە. لەو نێوەدا عەرەبەکان دەچنە لای هێلانەکان و دارچین کۆدەکەنەوە و دواتر بۆ وڵاتانی‌تری عەرەبی دەنێرن.

[١١٢] میسک، عەرەبەکان پێیدەڵێن لادانۆ، ئەویش بە شێوازێکی سەیر کۆدەکرێتەوە. هەرچەند لە شوێنێکی بۆن ناخۆشەوە سەرچاوە دەگرێ، بەڵام

---

١- دیۆنیسۆس خوای یۆنانی، لە وڵاتی لاتینی‌یەکان وەک ڤاکخۆس دەناسرا و بەلای میسرییەکانەوە هەمان ئۆسیریس بووە. ڤاکخۆس خوای شەراب، کوڕی دیا (ژوپیتێر) و لە زۆربەی وڵاتانی سەردەمی کۆن، جێژنی گەورە و بەشکۆی بۆ گیراوە.

خۆی خاوەن بەرامەیەکی گەلێک خۆشە. لەنێو نێوکی کارمامزدا چەشنی جیوەی دار کۆدەبێتەوە. میسک بۆ دروست کردنی کۆمەڵێک عەتر بەکاردێ و عەرەبەکان پتر چەشنی بووخورد کەڵکی لێوەردەگرن.

[١١٣] سەبارەت بە بۆن و عەتر ئەوەندەی باسم کرد، کیفایەت دەکا. دەبێ بڵێم کە لە سەرتاسەری خاکی عەرەبستاندا بۆنێکی خۆش دێ. لەو وڵاتە دوو چەشنە مەڕ هەن و بایخی تاریف کردن هەیە و لە شوێنیتر بەرچاو ناکەون. یەکیان دوونگە درێژە، نیزیک بە سێ پیخیس[١] دەبێ. ئەگەر لێگەڕابان دوونگەی ئەو مەڕانە شۆڕ بنەوە، خێرا بریندار دەبوون، بەڵام هەر شوانێک لەو وڵاتە تۆزێک لە کاری دارتاشی دەزانێ و بۆیە ڕەورەوەیەکی بچووک دروست دەکا و لەژێر دوونگەی مەڕەکەی دەبەستێتەوە. ئەوەیتر مەڕی دوونگە پانە و ڕەنگە یەک پیخیس پان بێ.

[١١٤] بەرەو ڕۆژئاواتر کە دەڕۆین، واتە ئەو شوێنەی خۆر لێی ئاوا دەبێ، وڵاتی ئەتیۆپیای لێ هەڵکەوتووە. ئێرە دوورترین وڵاتی ئاوەدانە. خاوەن زێڕێکی زۆر، فیلی زەبەلاح، دارستانی کێوی و بەتایبەتی داری ئابنووسە و مرۆڤەکان باڵابەرز و جوان و تەمەن درێژن.

[١١٥] ئەوانەی باسم کردن کۆمەڵێک زانیاری سەبارەت بە سنوورەکانی دووری ئاسیا و لیبی (ئەفریقا) بوون. لەمەڕ سنوورەکانی ڕۆژئاوای ئورووپا ناتوانم زانیاری ورد و دروست بێنمەگۆڕێ. چونکە شتێکی ئەوتۆ لەبەردەستدا نییە. منیش ئەوە پەسند ناکەم کە لە زمان بەربەرەکانەوە دەگوترێ. چۆمێک هەیە ناسراو بە ئێریدانۆس و دەڕژێتە دەریای باکوور. ئەو چۆمە بێرەدا واتە بە ناوچەی (ئێلێکترۆ)دا[٢] دێت. ئەوەش بڵێم کە هیچ زانیارییەکم سەبارەت بە دورگەکانی کاسیتێرید[٣] لەدەستدا نییە کە ناوی کاسیتێرۆس لەوەوە سەرچاوە دەگرێ یان نا! ناوی ئێریدانۆس دەبێ تەواو

---

١- پیخیس، پێوانەی درێژایی و بەرابەری ٤٤٤ میلیمیتر.

٢- ئێلێکترۆ لە کەنارئاوەکانی باڵتیک بووە.

٣- دورگەکانی کاسیتیری لەنێوان دورگەکانی بریتانی دا هەڵکەوتوون.

یۆنانی بێ، نەک ناوێکی بەربەری و کەسێکی شاعیر خستبیە سەر زبان. دواتر، سەرەڕای توێژینەوەکانم، نەمتوانی شاهید و بەڵگەیەک بدۆزمەوە کە قەناعەتم پێبێنێ، ئاخۆ دوای خاکی ئوروپا بەحر هەڵکەوتووە یاننا. ناوەکانی کاسیتێرۆس و ئیلێکترۆ لە شوێنگەلی دوردەستەوە گەیشتوونەتە دەست ئێمە.

**[١١٦]** وێدەچێ کە زۆرترین ڕێژەی زێڕ لە باکووری ئوروپا هەیە، بەڵام بەڕاست نازانم بڵێم لەکوێ. دەڵێن کە خەڵکانی ئاریماسپی ئەو زێڕە لە چنگ ئاژەڵانێک دەردێنن کە نیوەی لەشیان شێر و نیوەکەی‌تریش باڵندەیە. خەڵکی ئاریماسپی تەنیا یەک چاویان هەیە. من خۆم نە باوەڕم بەو قسەیە هەیە و نە بەو زانیارییە کە مرۆڤی چەشنی گشت ئینسانەکانی‌تر، لە قەوارەدا وەک یەک بن، بەڵام تەنیا چاوێکیان هەبێ. من پێموایە ئەو وڵاتە دووردەستانە دەوری دنیایان گرتووە و خاوەن جوانترین و کەم وێنەترین تایبەتمەندین.

**[١١٧]** لە ئاسیا، دەشتاییەک هەیە کە بە کۆمەڵێک چیا دەوری گیراوە و تەنیا پێنج ڕێگای دەربازبوون بۆ ئەو شوێنە بەرچاو دەکەوێ. سەردەمێک ئەو دەشتە مڵکی خۆراسمی‌یەکان[١] بوو و سنووری ئەوانی لەگەڵ گرکانی‌یەکان (هیرکانی)[٢]، پارتی‌یەکان[٣]، سەرانگی‌یەکان[٤] و سامانی‌یەکان[٥] پێکدەهێنا. لەو کاتەوە کە پارسەکان هاتوونە سەر حوکم، ئەو دەشتەش وەک مڵکی پاشا سەیردەکرێ. لەو چیایەی کە دەوری دەشتەکەی داوە، ڕووبارێک سەرچاوەی گرتووە کە ناسراو بە ئاکیس. ئەو چۆمە پێشتر پاراوی ئەو وڵاتانەی دەکرد کە ناوم هێنان و بەو پێنج گەڵی‌یەدا دەرباز دەبوو و هەر

---

١- خۆراسمی یا خوارەزمی، هۆزێکی سکایی یا سکیتی نیشتەجێ لە کەنارئاوەکانی گۆلی ئارال و چۆمی سەیحون یا جەیحون بوونە.

٢- هیرکانی، بەشێک لە ئاسیای کۆن و هەڵکەوتوو لە کەنارئاوەکانی باشووری ڕۆژهەڵاتی بەحری کاسپییەن کە ناوچەکانی داغستان و بەشی ڕۆژئاوای مازەندەران و گورگانی ئەمڕۆی دەگرتەوە.

٣- پارتی، بەرەگەز سکیتی بوونە و لە ڕۆژهەڵاتی دەریای کاسپییەن ژیاون.

٤- سەرانگی یا سارانژی، دانیشتووانی ڕۆژئاوای گۆلی هامون.

٥- سامانی، هۆزەکانی دانیشتووی هامون و سیستانی ئەمڕۆ و دراوسێی سەرانگی یا سارانژی‌یەکان بوونە.

لکێکی دەڕژایە یەک لەو وڵاتانە. لەو کاتەوە کە ئەو وڵاتانە کەوتوونەتە ژێر دەسەڵاتی پارسەکان تووشی چارەنووسێکی ئەوتۆ هاتوون: پاشای پارس چەند بەنداوێکی لەسەر ئەو گەڵییانە هەڵبەست و بەو شێوەیە ئاوەکە ڕێگای لێبەسترا و لەو دەشتەدا کۆبۆوە و گۆلی پێکهێنا. ئەو خەڵکانە هەرکات تووشی بێ ئاوی دەهاتن، کەڵکیان لەو ئاوە وەردەگرت. خواوەند لە زستاندا بەفروباران بەسەر مرۆڤەکاندا دەبارێنێ، بەڵام ئەو ئینسانانە لە وەرزی هاویندا پێویستیان بەو ئاوە هەیە بۆوەی ئاودێری هەرزن و کونجی چێندراویان بکەن. لەبەر ئەوەی ئاویان نییە، ڕوو لەلای پارسەکان دەکەن و ژنەکانیان لەگەڵ خۆیان دەبەن و لەبەر دەرگای بارەگای پاشا دەناڵێن و دەکروزێنەوە. ئەوجار پاشا فەرمانی کردنەوەی بەنداوەکان دەدا و ئاو بەو وڵاتانە دەدا کە زۆرترین حەوجەیان پێیە. هەرکات مەزراکانیان پاراو بوون، ئەوجار بەنداوەکان دەبەستنەوە و نۆرە بە وڵاتێکیتر دەدرێ. هەڵبەت ئەوەش بڵێم لەبەرامبەر کردنەوەی کەنداودا، جیا لەماڵیات، کۆڵێک پارەش وەردەگرێ. ئەوە باسی ماڵیات بوو.

**[١١٨]** لەنێو ئەو حەوت کەسەی دژی کابرای مۆغ ڕاپەڕین، یەکیان ئیدافێرنیس زۆری نەکێشا لەبەر سەرەڕۆیی خۆی تیداچوو. ناوبراو گەرەکی بوو بچێتە ژووری بارەگا و چاوی بە داریوش پاشا بکەوێ. بەپێی بڕیار ئەو حەوت کەسە بۆیان هەبوو بەبێ قەراری پێشوو و لێپرسینەوە، بتوانن بچنە نێو بارەگا بۆلای پاشا، هەڵبەت لە وەختێکدا کە پاشا لەگەڵ خێزانی نەخەوتبێ. ئیدافێرنیس کە یەک لەو حەوت کەسە بوو، دەیویست بچێتە ژوورەوە، بەبێ ئەوەی پێشتر ڕایگەیاندبێ. پاسەوانی بەر دەرگا و خزمەتکاری پاشا پێشیانپێگرت و گووتیان لەگەڵ ژنەکەیەتی. ئیدافێرنیس پێیوابوو کە درۆی پێدەڵێن و بۆیە بەو چەشنە ڕەفتاری لەگەڵ پاسەوان و خزمەتکارەکە کرد: شیری ڕاکێشا، کەپۆ و گوێی هەردووکیانی بڕی. بەو کەپۆ و گوێیانە هەوساری ئەسپێکی ڕازاندەوە و لە ملی هەردووکیانی کرد و ناردنیەوە شوێنی خزمەتیان.

[١١٩] پاسەوان و خزمەتکار چوونە لای پاشا و باسی وەزعی خۆیان کرد. داریوش لەوە ترسا کە ئەو رەفتارە رەنگە بە بڕیاری شەش کەسەکەی‌تر دوای رێککەوتنیان دژی ئەو بێ. هەرکام لەو شەش کەسەی بەتەنیا بانگ کرد و گەرەکی بوو بەتاقیان بکاتەوە. پاش ئەوەی دەرکەوت کە ئیدافێرنیس سەربەخۆ ئەو کارەی کردوە، خێرا خۆی و منداڵەکان و گشت خزم و کەسوکاری ناوبراوی گرت - داریوش لەو باوەڕەدا بوو کە ئیدافێرنیس و دەوروبەری خەریکی پیلانگێڕانن - هەر هەموویانی زیندانی کرد و گەرەکی بوو بیانکوژێ.

ژنی ئیدافێرنیس چووە بەر درگای بارەگا و دەستی بە گریان کرد. هەموو رۆژێ ئەوە کاری ژنە بوو. داریوش بەزەیی بەو ژنە داهات و راسپاردەی نارد کە پێیبڵێ: "ژنەکە، داریوش بڕیاری داوە تەنیا یەک کەس لەنێو گشت کەسانی تۆدا ئازاد بکا. هەرکامیان تۆ هەڵیبژێری ". ژنە بیرێکی لەو پێشنیارە کردەوە و لە وڵامدا گووتی: "ئەگەر پاشا تەنیا یەک روحلەبەر ئازاد دەکا، من داوای براکەم دەکەم ". وەختێک ئەو وڵامە گەیشتەوە لای داریوش، بۆی جێگای پرسیار بوو و دووبارە راسپاردەی ناردەوە و پرسیاری کرد: "ژنەکە، پاشا دەپرسێ چۆن بوو بڕیارتدا دەست لە مێردەکەت و منداڵەکانت هەڵگری و تەنیا براکەت هەڵبژێری، مەگەر برا لە منداڵەکانت بەلاتەوە نیزیکترن و لە مێردەکەشت خۆشەویستترن؟ ". ژنە لە وڵامدا گووتی: "پاشاکەم، ئەگەر خواستی خوای لەسەر بێ، مێردی‌تر دەدۆزمەوە و منداڵی‌تر دروست دەکەم، بەڵام برای‌تر ناتوانم وەدەست بێنم، چونکە دایک و باوکم هەردووکیان مردوون. ئەوە بیر و فکر و وڵامی منە ". داریوش تەواوێک کەیفی بەو وڵامە هات و هەربۆیە هەم برای ژنە و هەم کوڕە گەورەکەی ئازاد کرد و باقی ئەوانی‌تریشی کوشت. بەهەرحاڵ لەو حەوت کەسەی دەوروبەری داریوش، ئەوە یەکیان بەو شێوەیەی باسم کرد، تێدا چوو.

[١٢٠] لەو سەردەمەدا کە کامبیز تەواوێک نەخۆش بوو، ئەو رووداوانە قەومان: کوروش بۆ ئیدارەکردنی شاری سارد، کەسێکی پارسی بەناوی

ئۆریتیس دیاریکردبوو. ئەو کابرایە پیلانێکی دوور لە عەقڵی گێڕا، بەبێ ئەوەی لەلایەن پۆلیکراتیس، حاکمی دورگەی سامۆس قسەی سووکی پێگووترابێ و بەبێ ئەوەی ناوبراو ئۆریتیس بناسێ. ئۆریتیس گەرەکی بوو پۆلیکراتیس بەدیلبگرێ و بیکوژێ. بۆچی!

وەک زۆر کەس دەگێڕنەوە: ڕۆژێکیان ئۆریتیس لەگەڵ کەسێکیتری پارس بەناوی میترۆڤاتیس لەبەر دەروازەی بارەگا تووشی هەڤدوو دەبن. میترۆڤاتیس پارێزگاری هەرێمی داسکیلییۆ[1] بوو. قسە، قسەی هێنا و گەیشتە جنێو و بێحورمەتی بە یەکتر کردن. باسەکە لەسەر ئەوە بوو کە کامیان لەوەیتر باشتر و بەغیرەتترە. میترۆڤاتیس ئۆریتیسی تاوانبارکرد و گووتی: "چۆن دەکرێ تۆ وەک پیاو حیسابت بۆ بکرێ، تۆ نەتتوانی دورگەیەک داگیربکەی و بیهێنیە ژێر دەسەلاتی پاشا، ئەویش ئەو دورگەیەی لەبەرامبەر شوێنی حوکمڕانییەکەت هەڵکەوتووە، دورگەی سامۆس دەڵێم، ئەو جێگایەی بەسانایی داگیردەکرێ. وەختێک کەسێکی سامۆسی بە پانزدە پیاوی چەکدارەوە شۆڕشی سازکرد و هاتە سەرحوکم و ئێستاش دەسەلاتداری دورگەکەیە، چۆن تۆ ناتوانی داگیری بکەی! ". دەگێڕنەوە کاتێک ئۆریتیس گوێی لەو قسانە بوو، گەلێک تێکچوو، بۆیە بڕیاریدا کە سەرەتا تۆڵەی خۆی لە میترۆڤاتیس بکاتەوە و پاشان لە پۆلیکراتیس بدا کە ببوە مایەی ئەو کێشەیە.

**[١٢١]** چەند کەسێکیش دەڵێن کە ئۆریتیس راسپاردەی ناردە لای پۆلیکراتیس بۆوەی داوای شتێکی لێبکا (دیار نییە چ بووە). ڕاست لەو کاتەدا پۆلیکراتیس لە ژووری پیاوان لەگەڵ ئەناکرێئۆندا[2]، خەڵکی تییۆ[3] (شاعیر)

---

١- داسکیلییۆ یا داسکیلیۆن، یەکێک لە حوکمڕانییەکانی کۆنی پارسەکان لە ئاسیای بچووک و ڕۆژهەلاتی کیزیک.

٢- ئەناکرێئۆندا، شاعیری کوێری یۆنانی باستان کە لە شاری تییۆ لەدایکبوو و زۆربەی کاتی ژیانی خۆی لە بارەگای پۆلیکراتیس لە دورگەی سامۆس دەربازکرد و دواتر پەنای بۆ شاری ئاتین برد.

٣- تییۆ، بەندەرێکی ناسراوی یوونی لە کەنارئاوەکانی ئاسیای بچووک و مەوتەنی ئەناکرێئۆندا.

مژوڵی قسەکردن بووە. جا چ بە ئەنقەست، بۆوەی بێحورمەتی بە ئۆریتیس بکا یا بە هەڵکەوت، ئەو رووداوە دەقەومێ: کابرای راسپاردەی ئۆریتیس خۆی دەناسێنێ و دەست بە ئاخاوتن دەکات، پۆلیکراتیس بە هەڵکەوت رووی لە دیوار دەبێ و بەرەو راسپاردە وەرناسوورێتەوە و هیچ وڵامێکی کابراش ناداتەوە.

[١٢٢] دوو هۆ باسیان لێوە دەکرێ کە کوژرانی پۆلیکراتیس‌یان لێدەکەوێتەوە و پیاو هەقی خۆیەتی باوەڕ بە یەکێکیان بکات. ئۆریتیس کاتێک لە ماغنیسیا[1] بوو، واتە ئەو شارەی لەسەر چۆمی مێئاندرۆ[2] هەڵکەوتووە، سەبارەت بە پلان و خۆزگەکانی پۆلیکراتیس زانیاری پێدەگا. ناوبراو خێرا میرسۆس، کوڕی غیغیس و خەڵکی سامۆس بە پەیامێکەوە بەڕێ دەکا. پۆلیکراتیس یەکەم یۆنانییە ئەوەندەی من بزانم عاشقی فەرمانڕەوایی دەریاکان بووە، هەڵبەت دوای مینۆئاسی[3] کنۆسۆس، یا هەرکەسێکی‌تر کە خاوەن هەستێکی ئەوتۆ بووبێ و خواستبێتی حوکمڕانی بەسەر ئاوەکاندا بکا. بەهەرحاڵ، پۆلیکراتیس بۆخاتری هەستی جوامێری و مرۆڤایەتی یەکەم کەس بووە کە بە کۆڵێک هیوا و ئاواتەوە گەرەکی بووە فەرمانڕەوایی هەرێمی یوونیا و دورگەکان بکا. ئۆریتیس بەو هەستەی زانیوە و بۆیە راسپاردەی ناردووەتە لای. بەڕاشکاوی پۆلیکراتیسی وشیار کردووەتەوە و بەو چەشنە لەگەڵ ناوبراو دواوە: "دەزانم نەخشە و پلانی گەورەت لە مێشکدا هەیە. لەبیرت نەچێ تواناکانت بەشی خۆزگەکانت ناکات. ئەگەر بە قسەم بکەی، ئەوسا هەم تۆ قازانج دەکەی و هەم منیش رزگاردەبم. کامبیز پاشا قەستی

١- ماغنیسی، نیشتەجێی سێ شوێن، تێسالی و وڵاتی لیدی و لە قەراخ چۆمی مێئاندرۆس.

٢- مێئاندرۆ.-روبارێک لە ئاسیای بچووکی کۆن کە لە وڵاتی فریغی یا فریژییەوە سەرچاوەی دەگرت و هەرێمەکانی کاری و لیدی لەیەکتر جیادەکردەوە و لە باکووری میلێتوس دەڕژایە دەریای ئێژە و ئەمڕۆ ناسراوە بە میندێر.

٣- مینۆئا یا مینۆس، کوڕی ژوپیتێر و ئوروپە، بەپێی چیرۆکە ئەفسانەییەکان لە ساڵی ١٣٠٠ی پێش پێش زایین لە ئاسیای بچووکەوە چووەتە یۆنان و حوکمڕانی تەواوی دەریاکانی ئەو دەڤەرەی کردوە.

کوشتنی منی کردوه و لەوەدا تەواو ئاگادارم. وەرە و من و پارەکەم نەجات بدە. نیوەی ئەو پارەیە بۆخۆت هەڵگرە و نیوەکەیتریش بۆ من دانێ. بەو برە پارەیە دەتوانی حوکمڕانی سەراسەری خاکی یۆنان وەدەسخەی. ئەگەر باوەڕ ناکەی کە پارەم هەیە، کەسێکی جێگای متمانەی تەواو بنێرە، بۆوەی گشت سامان و دارایی خۆمی پێ نیشان بدەم ".

[١٢٣] کاتێک پۆلیکراتیس گوێی لەو قسانە بوو، گەلێک خۆشحاڵ و لەجێوە پێشنیارەکەی پەسند کرد. لەبەر ئەوەی پارە دۆست بوو، سەرەتا مێئاندریۆس کوڕی مێئاندریۆس کە میرزابنووسی خۆی بوو، نارد بۆوەی بارودۆخەکە هەڵسەنگێنێ. مێئاندریۆس، تۆزێک دواتر، گشت ئەو زێڕ و خشڵەی کە تەواوێک بە نرخ بوون و لە ژووری دانیشتنی پۆلیکراتیس جێیانگرتبوو، هەرهەمووی بە پەرستگەی ئێرا بەخشی. ئۆریتیس خەبەری پێگەیی کە کەسێک بۆ سیخوڕی دێتە لای ئەو و بۆیە بەو شێوەیە هەڵسوکەوتی کرد: بە پیاوانی ژێردەستی خۆی گووت هەشت کوپە لە خڕکە بەرد نیوەپڕبکەن و پاشان سەری ئەو بەردانە بە زێڕ داپۆشن. دواتر خۆیشی گشتیانی مۆر کرد و چاوەڕوانی هاتنی کابرای سیخوڕی کرد. مێئاندریۆس هات و چاوی بەو کوپانە کەوت و پاشان گەڕایەوە لای پۆلیکراتیس.

[١٢٤] هەرچەند تاڵەبینەکان بە پۆلیکراتیسیان گووت خۆی لە چوون بۆلای ئۆریتیس بپارێزێ و دۆستەکانیشی دژی ئەو هەنگاوە بوون. بەو حاڵەش پۆلیکراتیس خۆی ئامادەکرد. کچەکەشی لەو نێوەدا خەونی بینی: لە خەونەکەیدا، باوکی ببوو بە باڵندە و دەفڕی و خواوەند دیا دەیشوشت و خواوەند ئێلیۆس مەرهەمی لە لەشی هەڵدەسووت. کچە کە ئەو خەونەی بینی، گەلێک هەوڵیدا پۆلیکراتیسی باوکی نەچێتە لای ئۆریتیس، تەنانەت ئەو کاتەی باوکی سواری گەمی پێنج هۆدەیی دەبوو، کچە زۆر بەتوڕەیی لەگەڵی دوا. پۆلیکراتیس هەڕەشەی لە کچەکەی خۆی کرد، کە هەرکات بە سلامەتی

بگەڕێتەوە، ناهێڵێ کچەکەی ساڵانێکی زۆر شوو بکات. کچە لە وڵامی باوکیدا گووتی کە باشتر قەیرە بمێنێتەوە بەڵام باوکی لەدەست نەدا.

[١٢٥] پۆلیکراتیس، گشت ئامۆژگارییەکانی وەپشت گوێ خست و لەسەر چوونی بۆلای ئۆریتیس پێداگر بوو. کۆمەڵێک دۆستی لەگەڵ خۆی برد. لەنێو ئەوانەدا دیمۆکیدی[1] کوڕی کالیفۆندۆس، خەڵکی کرۆتۆنا[2] برد کە دوکتور و لە کارەکەیدا پسپۆڕێکی کەم وێنە بوو، لەگەڵی چوو. وەختێک پۆلیکراتیس گەیشتە ماغنیسیا، کۆتایی بە گەورەیی و جوامێرییەکانی هات. جیا لە حوکمڕانی سیراکۆس[3]، هیچکام لە دەسەڵاتدارانی یۆنانی هێندەی ئەو، خاوەن جەلال و شەوکەت نەبوون. ئۆریتیس خێرا پۆلیکراتیسی کوشت، ئەویش بەشێوەیەک کە پیاو بێزی نایە باسی بکا. چوارمیخ هەڵیواسی. ئۆریتیس، ئەوانەی لەگەڵ پۆلیکراتیس و خەڵکی ڕەسەنی دورگەی سامۆس بوون، گشتیانی ئازادکرد و پێیگووتن کە نابێ چاکەی ئەو ئازادکرانەیان لەبیر بچێتەوە. ئەوانەش کە بیانی و کۆیلە بوون، هەرهەموویانی وەک کۆیلە لەلای خۆی ڕاگرت. پۆلیکراتیس هەڵواسرا، خەونی کچەکەی وەڕاست گەڕا: کاتێک باران دەباری، خواوەند دیا دەیشووشت و هەرکات دەبووە بە ساماڵ، خواوەند ئیلیۆس (خۆر) تەواوی لەشی ناوبراوی بە ئارەقە چەور دەکرد. بەو چەشنە کۆتایی بە ژیانی پۆلیکراتیس هات، ڕاست ئەو جۆرەی ئاماسیس، پاشای میسر وەک تاڵەبین، پێشگۆیی بۆکردبوو.

[١٢٦] زۆری نەکێشا کەسانی تۆڵە ئەستێن وەک خوێنگرانی پۆلیکراتیس، ئۆریتیس‌یان کوشت. دوای مەرگی کامبیز و ڕفاندنی دەسەڵات لەلایەن مۆغەکانەوە، ئۆریتیس لەو سەردەمەدا لە شاری سارد دەژیا. ناوبراو یارمەتی پارسەکانی نەدا کە کەوتبوونە ژێردەستی میدیاکان. لەو بارودۆخە شێواوەدا، میترۆڤاتیس بەڕێوەبەری داسکیلیۆ بوو و هەر ئەویش کاتی خۆی

---

١- دیمۆکیدیس، پزیشکی ناسراوی یۆنانی کە لە سەدەی ٦ی پێش میلاددا ژیاوە.

٢- کرۆتۆنا، شارێکی کۆنی ئیتالیا کە بەدەست ئاخاییەکان دروستکرا.

٣- سیراکۆس، هەرێمێکی ناسراوی سیسیل یا سیسیلیا لە سەردەمی باستاندا.

ئۆریتیسی بەوە تاوانبار کردبوو کە ناتوانێ پۆلیکراتیس شکست بدا. ئۆریتیس، ئەو کابرایە واتە میترۆڤاتیس و کوڕەکەی بەناوی کراناسپ کە پیاوێکی خاوەن ڕێز لەنێو پارسەکاندا بوو، کوشت. ئۆریتیس کۆمەڵێک کردەوەی نایاسایی‌تریشی بەئەنجام گەیاند. جارێکیان داریوش پۆستەیەکی بۆ ناوبراو نارد، ئۆریتیس لەبەر ئەوەی ناوەڕۆکی نامەکەی بەدڵ نەبوو، هەڵگری پەیامەکەی لە ڕێگای گەڕانەوەدا کوشت. ئەو، پیاوەکانی خۆی نارد و بۆسەیان لەسەر ڕێگای کابرای تەتەر دانا و نامەبەر و ئەسپەکەیان لەنێوبرد.

[١٢٧] داریوش وەختێک هاتەسەر حوکم گەرەکی بوو ئۆریتیس سزابدات لەمەر کۆمەلێک جینایەت کە کردبووی، بەتایبەت سەبارەت بە کوشتنی میترۆڤاتیس و کوڕەکەی. بیری لەوە کردەوە کە لەشکری بە ئاشکرا نەنێرێتە سەر ئۆریتیس، چونکە بارودۆخەکە زۆر ئاڵۆز و شەپڕێو بوو و لەمێژ نەبوو فەرمانڕەوایی گرتبووەدەست. ئەوەشی دەزانی کە ئۆریتیس هێزێکی فرەی لەژێردەستدایە. تەنیا پاسەوانانی تایبەتی ئەو کە گشتیان پارس بوون، ژمارەیان دەگەیشتە هەزارکەس. ئۆریتیس حوکمڕانی هەرێمەکانی فریژیا، لیدیا و یونیای دەکرد. لەبەر ئەو هۆیانە داریوش بەو چەشنە جوڵایەوە: ڕاوێژکارە پارسیەکانی بانگ‌کرد و پێی‌گووتن: "پارسەکان، کام لە ئێوە دەتوانێ ڕاسپاردەیەک وەستۆبگرێ کە پێویستی بە تەڕدەستی هەیە نەک بە هێزی فرە و حەشیمەتی زۆر! کارێک کە زیرەکی و هۆشیاری گەرەکە نەک شەڕ و پێکدادان. کام لە ئێوە دەتوانێ ئۆریتیس بە زیندوویی یا مردویی بێنێتە لای من. ئەو کابرایە بۆ پارسەکان قەت خێری نەداوەتەوە و بەردەوام زیانی گەورەی پێگەیاندوین. دوو کەسی لە پیاوانی ئێمە کوشتووە، میترۆڤاتیس و کوڕەکەی، بەوەش نەوێستاوە و نامەبەری منی کوشتووە کە داوەتنامەم پێداناردبوو. بێشەرەفی ئەو کابرایە چیتر قبوڵ ناکرێ. با بەر لەوەی زەرەدی پتر بە پارسەکان بگەیێنێ، بیکوژین ".

[١٢٨] ئەوە خواستی داریوش بوو و خێرا سی کەس ئامادەیی خۆیان ڕاگەیاند کە ئەو ڕاسپاردەیە بەجێبگەیێنن. لەنێو خۆیاندا شەڕیان بوو کە کامیان بچێ و هەربۆیە داریوش بڕیاریدا هەڵبژاردن بکرێ و هەرکام وەبەر کەوت، ئەرکەکە جێبەجێ بکا. قورعە بەناوی ڤاغایۆس دەرکەوت. ناوبراو کوڕی ئارتۆنت بوو و بەو شێوەیە وەخۆکەوت: ڤاغایۆس کۆڵێک نامەی داخوازی نووسی و مۆری داریوشی لە گشتیاندا. ئەو نامانەی هەڵگرت و چووە شاری سارد. وەختێک گەیشتە ئەوێ و چووە لای ئۆریتیس، نامەکانی لە تۆربە دەرهێنا و چەشنی فەرمانی حکوومی دایەدەست میرزابنووسی ئۆریتیس بۆوەی بیانخوێنێتەوە. هەرکام لە حوکمڕانان خاوەن میرزا بنووسێک بوون. ڤاغایۆس یەکیەکی نامەکانی بە کابرا دا و بەردەوام چاوی لە دەوروبەر دەکرد بۆوەی بزانێ کە هەڵسوکەوتی پاسەوانانی ئۆریتیس چۆنە، ئاخۆ مرچ و مۆنن و ڕووی لێوەردەگێڕن یاننا. پاسەوانەکان بەپێچەوانەوە، گشتیان ڕێزیان بۆ فەرمانەکانی پاشا دانا. لە یەکێک لەو فەرمانانەدا، نووسرابوو: "پارسەکان، داریوش پاشا داواتان لێدەکا لەوە زیادتر گوێ بە فەرمانی ئۆریتیس مەدەن". پاسەوانەکان هەرکە ئەوەیان بیست، شیرکانیان ڕاکێشا و ئۆریتیس‌یان لەجێوە کوشت. بەو شێوەیە هێزەکانی تۆڵەئەستێن لەمەڕ کوژرانی پۆلیکراتیسی سامۆسی تۆڵەیان لە ئۆریتیس کردەوە.

[١٢٩] گشت سامان و مڵک و دارایی ئۆریتیس دەستی بەسەرداگیراو بۆ شاری شوش ڕاگوێزرا. ماوەیەکی کەم دوای ئەو قەومانە، بەهەڵکەوت و لەکاتی ڕاودا، داریوش لە ئەسپەکەی دابەزی و لاقی وەرگەڕا. لاقی لە گوێزینگدا هەڵماسی و تووشی ژانێکی فرە هات. داوای کرد کە دوکتورێکی میسری چاوی پێبکەوێ، چونکە پێیوابوو ئەوان زاناترین دوکتورن. دوکتورەکانی میسری قاچیان وەرسوڕاند و ڕێکیان‌کوشی، ئەوەش ڕەوشەکەی خەراپترکرد. داریوش حەوت شەو و ڕۆژ خەوی لێنەکەوت. ڕۆژی هەشتەم بارودۆخی سلامەتییەکەی پتر تێکچوو. لەو کاتەدا بوو کە

یەک لە پیاوانی دەوروبەری سەبارەت بە دوکتورێک لە شاری سارد و پسپۆری و زانایی دیمۆکیدیس خەڵکی کرۆتونیا لەگەڵ داریوش دوا: پاشا دەستووری‌دا خێرا ئەو کەسە بێنن. وەختێک (دیمۆکیدیس)یان لەنێو کۆیلەکانی ئۆریتیس‌دا بە وەزعێکی شەپرێو دۆزییەوە، یەکڕاست بردیانە لای پاشا، زنجیر لەپێ و جلوبەرگێکی دڕاو لەبەردا.

[١٣٠] لە نێوەڕاستی دیوەخانی پاشادا وێستا. داریوش سەبارەت بە حەکیمایەتی ئەو لێی‌پرسی. دیمۆکیدیس گەرەکی نەبوو خۆی ئاشکرا بکات، لەوە دەترسا جارێکی‌تر چاوی بە وڵاتەکەی نەکەوێتەوە. داریوش تێگەیی کە دیمۆکیدیس درۆدەکا، فەرمانی بەو کەسانەدا کە ناوبراویان هێنابووە لای ئەو، کە خێرا قەمچی و کۆمەڵێک بزمار بێنن. دیمۆکیدیس ترسی ڕێنیشت و خۆی ئاشکرا کرد، هەڵبەت ئەوەشی گووت کە لەو زانستەدا زۆر پسپۆر نییە. زانیارییەکانی خۆی وەسەریەک خستەوە و فکرێکی بۆ سازبوو. داریوش باوەڕی پێکرد و ئیزنی پێدا کە چاوێک لە لاقەکەی بکا. بە هێمنی و لەسەرخۆیی تەواو، بەبێ ئەزییەت کردنی داریوش، لاقی وەرگەڕاوی هێنایەوە جێی خۆی. خەو دووبارە رووی لە چاوەکانی داریوش کردەوە و زۆری نەکێشا قاچەکەی چاکبۆوە. داریوش لەڕاستیدا دەستی لەو قاچە شۆردبۆوە. ناوبراو ئەو جار دوو جووت دەستبەندی زێڕی پێشکەش بە دیمۆکیدیس کرد. دیمۆکیدیس لێی‌پرسی داخوا لەبەر ئەوەی مداوا و چارەسەری قاچی پاشای کردوە، بۆیە چارەڕەشی و ئەشکەنجەکەی دوو بەرابەر دەکرێ! ئەو قسانە بە کەیفی داریوش بوون و هەربۆیە خێرا دیمۆکیدسی ناردە حەرەمی پاشایەتی بۆ لای ژنەکانی خۆی. لەوێ خواجەکانی حەرەم ناوبراویان ناساند و گووتیان کە ئەو کابرایە توانی ژیانی دووبارە بە پاشا ببەخشێ. هەرکام لە ژنەکان بەبیستنی ئەو خەبەرە جامێکی پڕ لە ستاتیری[1] زێڕیان لە خەزێنە هەڵگرت و بە دیمۆکیدس‌یان بەخشی. خەڵاتەکە ئەوەندە زۆر بوو کە هاوڕێی ناوبراویش بەناوی سکیتۆن، ئەویش

---

١- ستاتیر، پارە و پوڵی یۆنانی باستان و بەرابەری دوو تا چوار درهەم.

دەستی بە کۆکردنەوەی لیرەکانی زێڕ کرد کە ڕژابوونە سەر عەرز و بەو شێوەیە توانی قەیاسێکی زۆر پارەی دەسکەوێ.

[١٣١] دیمۆکیدیس دواتر لە شاری کرۆتونا ڕۆیشت و لەلای پۆلیکراتیس گیرسایەوە. هۆی ئەو بڕیارەش ئەوە بوو کە لە کرۆتونا[1] بەردەوام کێشەی لەگەڵ باوکی خۆی هەبوو، ئەویش خۆی مرۆڤێکی دڵناسک بوو و تاقەتی ئەو گشتە خۆخواردنەوەیەی نەهێنا. هەربۆیە باوکی بەجێهێشت و لە ئێیینا (ئێژە) دامەزرا. لەو شارە دەرکەوت کە لە گشت حەکیمەکانیتر زاناترە. هەرچەند خاوەن ئامرازی پێویست بۆ کاروپیشەکەی نەبوو، ساڵێک دواتر دانیشتووانی ئێیینا دیمۆکیدیس‌یان دامەزراند و موچەی ساڵێ یەک تالاندیان بۆ دیاریکرد.

ساڵی سێهەم، خەڵکی ئاتێن ناوبراویان بردە لای خۆیان و سەد منی‌یان پێدا. ساڵی چوارەم ئەوجار پۆلیکراتیس ناوبراوی بە موچەی دوو تالاند لەلای خۆی دامەزراندوە. دیمۆکیدیس لەڕاستیدا بەو شێوەیە گەیشتە دورگەی سامۆس. دوکتورەکانی ناوچەی کرۆتونی بەهرەیەکی زۆریان لە دیمۆکیدیس وەرگرت. (لە وڵاتی یۆنان، دوکتورەکانی کرۆتونی ناسراوترین کەسن. لە پلەی دووهەمدا دوکتورەکانی کیرینێئا هەن. هەر لەو سەردەمەدا دەگووترێ کە ئارغی‌یەکان لە بواری موسیقی‌دا یەکەم کۆڕی یۆنانی بوونە).

[١٣٢] دیمۆکیدیس پاش ئەوەی لە شاری شوش مداوای داریوشی کرد، خانوویەکی گەورەی بۆ سازکرا و هاوسفرەی پاشا بوو و پێکەوە زیافەتیان دەکرد. ئیزنی پێدرابوو کە چی دڵی دەخوازێ بیکا، تەنیا یەک شت نەبێ، ئەویش بۆی نەبوو بگەڕێتەوە وڵاتی یۆنان. دیمۆکیدیس بە پسپۆری خۆی توانی دوکتورەکانی میسریش لە مەرگ نەجات بدا، کە قەراربوو سەریان بە نێزەوە بکەن، چونکە نیشانیان دا لە کاتی مداوای ناساغی داریوش‌دا و لەباری زانشتی پزیشکی، نزمتر لە یۆنانی‌یەکانن. لەو نێوەدا کەسێکی تاڵەبینی پۆلیکراتیس، ئەویش ڕزگاری هات. ئەو کابرایە خەڵکی دەڤەری ئیلیا[2] بوو و

---

١- کرۆتونا، شارێکی کۆنی ئیتالیا کە بەدەست ئاخاییەکان دروستکرا.

٢- ئیلیا، شارێکی کۆنی ئاسیا لە هەرێمی ئێئۆلی‌یەکان و لە قەراخ چۆمی کایکوس.

لەو سەردەمەدا لەگەڵ کۆیلەکان لە شاری شوش دەستبەسەر کرابوو. دیمۆکیدیس کاریگەری زۆری لەسەر داریوش هەبوو.

[١٣٣] هێندێک دواتر، پاش ئەو ڕووداوانە، کۆمەڵێک ڕووداویتر قەومان. ئاتووسا، کچی کوروش و ژنی داریوش، کوانێکی لە مەمکی هەبوو کە تەقییەوە و زیادیکرد. ئەو لە تەمەنی بچووکیدا شاردبووییەوە و شەرمی کردبوو باسی بکا و هیچکەس بەو ئازارەی نەدەزانی. کاتێک هەستی بە ژانی پتر کرد، بەدوای (دیمۆکیدیس)یدا نارد. دیمۆکیدیس بەڵێنی پێدا ئەگەر ئاتووسا قەول‌بدات ڕێوشوێنی پێویست ڕەچاو بکا، دەبێ لەو بارەوە سوێندی بۆ بخوا. ئاتووسا، دیمۆکیدیسی دڵنیاکرد. هەڵبەت دیمۆکیدیس داوایەکی ئەوتۆی نەکردبوو کە زیان بە ناموسی ئەو خاتوونە بگەیێنێ.

[١٣٤] پاش ئەوەی کە دیمۆکیدیس حەکیمایەتی خۆی بەجێگەیاند و ئاتووسا چاک بۆوە، ئەوجار ئەو خاتوونەی هاندا کە وەختێک لەگەڵ داریوش دەخەوێ، ئەو بابەتە بێنێتە بەرباس: "پاشاکەم، تۆ کە خاوەن ئەو گشتە هێزەی، هیچ کارێک ناکەی! نە پەلاماری نەتەوەیەکیتر دەدەی و نە خەریکی بەهێزتر کردنی پارسەکانی. پێویستە، ئێستا کە گەنجی و سامانێکی زۆرت لەبەر دەست دایە، جوڵەیەک بکەی، بۆوەی پارسەکان تێبگەن کە چ پیاوێک فەرمانڕەواییان دەکات. دوو هۆی بنەڕەتی هەن کە ناچارت دەکا کارێک بکەی: یەکەم، پارسەکان لێیان حاڵی دەبێ کە کێ فەرمانڕەوایانە و دووهەم شەر دەبێتە هۆی ڕزین و هەڵوەرینی ئەو خەڵکە و قەت ناتوانن دژی تۆ یەکبگرن. ئێستا بەتەمەن لاوی و دەتوانی بە کردەوەیەکی گرینگ باشتر خۆت بناسێنی. هەرچەندێکی لەش مەزنتر دەبێ، بەو پێیەش ڕووح بەهێزتر دەبێ. هەرکات لەشی مرۆڤ ڕوو لە پیری دەکا، ڕووحیش دادەهێزێ و هەست بە کزی لەمەر ئەنجامی هەر کارێکدا دەکا". ئاتووسا بەو شێوەیە قسەی لەگەڵ داریوش کرد، ڕاست ئەو جۆرەی دیمۆکیدیس ئامۆژگاری کردبوو. داریوش لە وڵامی ئاتووسادا گووتی: "ئەوەی باست کرد، تەواو مەبەستی منیشە کە جێبەجێی بکەم. دەخوازم بە پردێک ئەو دەشتاییەی خۆمان لەگەڵ

دەشتاییەکی‌تر لێک ببەستمەوە و ئەوجار هێرش بکەمە سەر سکیتی‌یەکان. لەو باوەڕەدام کە زۆر نەکێشێ و ئەو خواستەم جێبەجێ بێ ". ئاتووسا لە وڵامی داریوش‌دا گووتی: "بەباوەڕی من ئێستا پێویست ناکا پەلاماری سکیتی‌یەکان بدەی. چونکە هەرکات بخوازی، دەتوانی بیان‌هێنییە ژێر نیری دەسەڵاتی خۆت. ئەمڕۆ گەرەکە شەڕی یۆنانییەکان بکەی. من زۆر شتم بیستووە و دەخوازم خەڵکانی لاکێنی، ئارغی، ئەتیکی و کۆرینتی وەک خزمەتکار رابگرم. جیا لەوەش، بەتواناترین کەسی یۆنانیت لە خزمەت دایە و زانیارییەکی زۆر سەبارەت بە وڵاتی یۆنان لەلای ئەو دەست دەکەوێ و دەتوانێ لە کاتی لەشکرکێشی‌دا رێنوێنیت بکا. مەبەستم ئەو کەسەیە کە قاچی تۆی چاک کردەوە ". داریوش ئەوجار گووتی: "ئێستا کە تۆ پێتوایە دەبێ لە یۆنانەوە دەسپێبکەم، بە مەسڵەحەتی دەزانم کە سەرەتا سیخوڕەکانم لەگەڵ دیمۆکیدیس بنێرمە ئەوێ، هەرکات ئەوان دیتیان بارودۆخ لەبارە، زانیاری پێویستمان بدەنێ و ئەوجار دەکرێ خەریکی لەشکرکێشی بم".

**[١٣٥]** داریوش پێیوابوو، هەر کارێک وەخت و وەرزی خۆی گەرەکە. ناوبراو هەرکە رۆژ بۆوە پازدە کەسی لە پیاوانی ناسراوی پارس هەڵبژارد و فەرمانی پێدان کە رەگەڵ دیمۆکیدیس بکەون و قەراخ ئاوەکانی یۆنان بپشکنن و بەهیچ شێوەیەکیش رێگای هەڵاتن بە دیمۆکیدیس نەدەن و بەتەواوی بیخەنە ژێر چاوەدێری خۆیان، تا ئەو کاتەی دەگەڕێنەوە. دوای ئەوەی ئەو دەستورانەی بە راسپاردە سیخوڕەکان‌دا، ئەوجار دیمۆکیدیسی بانگ‌کرد و داوای لێکرد کە سەرتاسەری خاکی یۆنان بە راسپاردەکانی پارس نیشان بدا و لەکۆتاییدا لەگەڵ ئەوان بگەڕێتەوە. داریوش ئیزنی بە دیمۆکیدیس‌دا کە شتومەکی ماڵ، دیاری بۆ باوک و خوشک و براکانی هەڵگرێ و هەروەها بەڵێنی پێدا کە خەڵاتی پتری بداتێ. جیا لەو دیارییانە، پێیگووت کە کاروانێکی بازرگانی بە کەرستە و کەلوپەلی فرەوە، کە باروبنەی ئەویش هەڵدەگرێ، بۆخاتری ئەو تەرخان دەکرێ. بە باوەڕی من داریوش هیچ مەبەستێکی سەیری نەبووە کاتێک ئەو گشتە بەڵێنانەی بە دیمۆکیدیس

داوه، بەڵام دیمۆکیدیس لەوە ترساوە کە داریوش خەریکە بەتاقی بکاتەوە، بۆیە ئامادە نەبووە خەڵات و دیارییەکان وەربگرێ. گوتوویەتی کە ناخوازێ ناوماڵ لەگەڵ خۆی بەرێ و گشتی بەجێ دەهێڵێ بۆ ئەو کاتەی لە سەفەر دەگەڕێتەوە. هەڵبەت کاروانەکە قبوڵ دەکا کە داریوش بەڵێنی ئامادەکردنی پێدابوو، بۆوەی دیاری و خەڵاتی خوشک و برایانی پێ ڕاگوێزێ. داریوش دوای ئامۆژگاری پێویست، گشتیانی ڕەوانەی وڵاتی یۆنان کرد.

[١٣٦] سەرەتا چوونە وڵاتی فینیقیا و بۆ شاری سیدۆنا. لەوێوە بە دوو کەشتی سێ هۆدەیی و یەک گەمی بارهەڵگری بازرگانی پڕ لە کەرستەی جۆراوجۆر، پاش ئەوەی ئامادەکاری تەواو کرا، بەرەو یۆنان وەڕێکەوتن. کاتێک گەیشتنەجێ، بەردەوام سەیری قەراخ دەریاکانیان دەکرد و نەخشەکەیان دەکێشاوە. ئەوانە چاویان بە زۆر شوێنی ناسراو کەوت. لە شاری (تاراندا)ی ئیتالیا لەنگەریان گرت. لەوێ پاشای تاراندی‌یەکان بەناوی ئاریستۆفیلیدیس، بۆوەی خزمەتێکی بە دیمۆکیدیس کردبێ، فەرمانی‌دا گشت گەمییەکانی میسری تەختەبەند بکرێن و پارسەکانیش بەتاوانی سیخوڕی دەستبەسەر بن. لە کاتێکدا ئەوە چارەنووسی پارسەکان بوو، دیمۆکیدیس چووە شاری کرۆتونا و وەختێک گەیشتەوە ئەوێ، ئاریستوفیلیدیس پارسەکانی ئازادکرد. ناوبراو کەلوپەلی گەمییەکانی داگیرکرد و پارسەکانی تێهاویشت و ناردنیەوە دواوە.

[١٣٧] پارسەکان دیمۆکیدیس‌یان بە تاوانبار زانی و بۆیە بەرەو شاری کرۆتونا وەڕێکەوتن و پاش فەترەیەک گەیشتنە ئەوێ. دیمۆکیدیس‌یان لەنێو بازاڕدا دۆزییەوە و گرتیان. هێندێک خەڵکی کرۆتونی کە لە دەسەڵات و هێزەکانی پارس دەترسان، ئامادە بوون دیمۆکیدیس تەحویل بدەن. هێندێکیش لە دانیشتووان پێشیان بە پارسەکان گرت و بە گۆپاڵ وەریانگەڕانی. پارسەکان هاواریان دەکرد: "ئەی خەڵکی کرۆتونا، بزانن چ کارێک دەکەن، گەرەکتانە کەسێک لە چنگ ئێمە دەرهێنن کە لەدەست پاشای وڵات رایکردوە. ئێوە چۆن دەتوانن بێحورمەتی ئەوتۆ بە داریوش پاشا بکەن. پێتانوایە خزمەت بە خۆتان

دەکەن کە دیمۆکیدیس لە ئێمە دەستێننەوە. لەبیرتان نەچێ کە پەلاماری شارەکەتان دەدەین و یەکەم ناوچە دەبێ تووشی کۆیلەتی دێت ".

بەهەرحاڵ ئەو کۆمەڵە پارسە سیخوڕە بەبێ دیمۆکیدیس و کەشتی بازرگانی، سواری گەمییەکانی‌تر بوون و بەرەو ئاسیا گەڕانەوە و وازیان لە پشکنینی زیاتری خاکی یۆنان هێنا، چونکە ئیتر کەسی شارەزایان لەگەڵ نەمابوو. وەختێک شاری (تاراندا)یان بەجێ‌دەهێشت، دیمۆکیدیس پێی‌گووتن کە وەبیر داریوش پاشا بێننەوە کە من لەگەڵ کچی میلۆنۆس[1] ژیانی هاوبەشم پێکهێناوە. میلۆنۆس، پاڵەوانێک بوو کە داریوش فرە ڕێزی بۆ دادەنا. هەڵبەت من پێموایە کە دیمۆکیدیس لەو زەماوەند کردنەدا پەلەی کرد، پارەیەکی زۆری‌دا، بۆوەی بە داریوش بسەلمێنێ کە ناوبراو لە شاری (کرۆتونا)ش مرۆڤێکی ناسراوە.

### داگیرکرانی دورگەی سامۆس

[١٣٨] پارسەکان لە شاری کرۆتونا ڕۆیشتن و ڕێگای بەحرییان بەرەو یاپیغیا[2] گرتەبەر، لەوێ گشتیان دەست بەسەرکران. غیللۆس، دوورخراوەیەکی شاری تاراندا بەهانایانەوە هات و هەرهەموویانی ئازادکرد و بردنیەوە لای داریوش.

داریوش بەڵێنی پێدا کە چی بخوازێ بۆی جێبەجێ بکا. غیللۆس لەمەر وەزعی نالەباری خۆی دوا و داوای لە داریوش کرد فرسەتێکی بۆ برەخسێنێ بەڵکوو بتوانێ بگەڕێتەوە شاری تاراندا. هەڵبەت بەچەشنێک کە ئەو کارە نەبێتە هۆی سەرهەڵدانی خەڵکی یۆنان. غیللۆس گەرەکی بوو کە تەنیا بە هەبەستی گەڕاندنەوەی ئەو ناوگانێکی گەورە بەرەو ئیتالیا

---

١- میلۆنۆس یا میلۆن، پاڵەوانی ناسراوی کرۆتۆنی لە سەدەی شەشی پێش زاییندا ژیاوە و شەش جار قارەمانی کێبەرکێکانی ئۆلیمپیک بووە.

٢- یاپیغیا، هەرێمێک لە ئیتالیای سەردەمی باستان، هەڵکەوتوو لەنێوان کەنداوی تاراند و دەریای ڕەش.

وەڕێکەوێ. غیللۆس داوای کرد کە داریوش بە خەڵکی کیندی[1] رابگەیێنێ ناوبراو دووبارە لەسەر کورسی پێشووی دامەزرێننەوە و ئەوەش کیفایەت دەکات. غیللۆس کیندییەکانی بە دۆستی تاراندییەکان دەزانی،[2] ئەوەش یارمەتی بە گەڕانەوەی ئەو دەدا. داریوش ئەو پێشنیارەی پەسند کرد و بەڵێنەکەی خۆی بەجێگەیاند. راسپاردەی نارده کیندۆ و ئەمری دەسەر کردن کە دووبارە غیللۆ بگەڕێننەوە تاراندا. کیندییەکان فەرمانی داریوشیان قبوڵ کرد، بەڵام نەیانتوانی تاراندییەکان بە قەناعەت بگەیێنن، ئەوەندەشیان هێز نەبوو کە ناچار بەو کارەیان بکەن. بەو شێوەیە دەکرێ بڵێم ئەو کۆمەڵە سیخوڕە یەکەم کەسانێک بوون لە ئاسیاوە گەیشتنە وڵاتی یۆنان.

**[١٣٩]** لەدرێژەدا داریوش پاشا دورگەی سامۆسی هێنایە ژێر دەسەڵاتی خۆی. یەکەم کۆمەڵگای یۆنانی یا بەربەری بوو کە ناوبراو داگیری کرد. هۆیەکان ئەوانە بوون: وەختێک کامبیز، کوڕی کوروش پەلاماری وڵاتی میسریدا، جەماوەرێکی زۆری یۆنانی روویان لەو وڵاتە کرد. بەشێک لەوانە بۆ کاری بازرگانی، هێندێک چەشنی شەڕکەری بەکرێگیراو و چەندێکیش تەنیا بە مەبەستی نیشتەجێ بوون. یەکێک لە گەڕیدەکان ناوی سیلۆسۆن، کوڕی لیاکی و برای پۆلیکراتیس بوو. سیلۆسۆن دوورخراوە و خەڵکی دورگەی سامۆس، لەوەی کە بەسەری هاتبوو، گەلێک خۆش شانسیش بوو. رۆژێکیان کەوایەکی کورتی رەنگ ئەرغەوانی لەبەردا بوو و بەنێو بازاڕی شاری مێمفیسدا دەخولایەوە. داریوش چاوی بەو کابرایە کەوت. داریوش ئەوکاتە پاسەوانی کامبیز پاشا، خاوەنی هیچ پۆستێکی حکوومی نەبوو. ناوبراو کە چاوی بە کەوا ئەرغەوانییەکەی سیلۆسۆن کەوت، لێی نیزیک کەوتەوە و گەرەکی بوو لێی بکڕێ. سیلۆسۆن وەختێک دیتی کە داریوش ئەوەندە خوازیاری ئەو کەوا ئەرغەوانییەیە، وەک ئیلهامێک، لەخۆوە گووتی:

---

١- کیندی یا کیندۆس، شارێکی هەرێمی کاری لە ئاسیای بچووک و چەشنی تاراند پڕ لە موهاجیرانی سپارتی بووە.

٢- ئەو سەردەمە شارەکانی کیندۆس و تاراس ژێردەستەی لاکیدیمۆنییەکان بوونە.

"من کەواکەم بە هیچ نرخێک نافرۆشم، بەڵام ئەگەر هێندە حەزت لێیە، منیش خەڵاتت دەکەم ". داریوش گەلێک خۆشحاڵ و دیارییەکەی وەرگرت. سیلۆسۆن سەرەتا هەستی بە نەفامی خۆی کرد، لەوە کە جلی خۆی بەبێ هیچ لێکدانەوەیەک بەخشیوە.

[١٤٠] سالانێک تێپەڕین و کامبیز مرد و حەوت کەس دژی مۆغەکان راپەڕین و یەک لەوان، واتە داریوش وەک پاشا دیاریکرا. کاتێک سیلۆسۆن بەو خەبەرەی زانی، وەبیری هاتەوە کە لە وڵاتی میسر کەوا کورتەی خۆی بە داریوش بەخشیوە. سیلۆسۆن رێگای شاری شوشی گرتەبەر. لەبەر درگای بارەگای پاشایەتی هەڵکورما و بە بانگ و سەڵا هاواری کرد کە داریوشی خەڵات کردوە. پاسەوانانی پاشا گوێیان لێبوو و ئاگاداریان کردەوە. "ئەو یۆنانی‌یە کێیە کە منی خەڵات کردوە و ئێستا دەینداری ئەوم، ئەویش لە حاڵێکدا کە هێندە لەمێژ نییە بوومەتە پاشا! هیچ یۆنانی‌یەک تا ئێستا نەهاتووەتە ئێرە، بۆیە بە کەس قەرزدار نیم. سەیرە! گرفت نییە و بیهێنن بزانم کێیە و بۆچی ئاوا دەدوێ ". پاسەوانی بەر درگا، (سیلۆسۆن)ی بردە ژوورەوە. سیلۆسۆن سەبارەت بە کەوا قوڵە دوا و گووتی کە کاتی خۆی بە داریوشی بەخشیوە. داریوش وڵامی داوە: "ئەرێ ئەی پیاوی چاک، ئەوە تۆ بووی ئەو سەردەمەی هیچکارە نەبووم تۆ خەڵاتت کردم، هەڵبەت خەڵاتێکی بچووک بوو، بەڵام لەبیرت نەچێ کە منیش پێت قەرزدارم و پێویستە دیارییەکی بەوەج پێشکەش بە تۆ بکەم. وەک ئەوەی کە ئەمڕۆ دەبوایە دیارییەکی گەورەم پێ‌بەخشرابا. ئێستا هەرچەند زێڕ و زیو بخوازی، دەتدەمێ، بۆوەی لە ژیانتدا قەت هەست بە پەشیمانی نەکەی کە رۆژێک داریوشی کوڕی گشتاسپت خەڵات کردوە ". سیلۆسۆن وڵامی داوە: "پاشاکەم، منێ نە زێڕم گەرەکە و نە زیو. لەو کاتەوە کە براکەم، پۆلیکراتیس بە دەست ئۆریتیس کوژراوە، کەسێکی کۆیلەی ئێمە حوکمڕانی وڵاتەکەمان دەکا. ئەو وڵاتەم بدەوە دەست، بەبێ ئەوەی هیچ خوێنێک رژابێ و کەسیش کۆیلە کرابێ ".

[١٤١] داریوش وەختێک گوێی لەو قسانە بوو، لەشکری بە فەرماندەری ئۆتانیس، یەکێک لە حەوت کەسەکە ئامادەکرد و فەرمانیپێدا بەو شێوەیەی سیلۆسۆن دەخوازێ هەڵسوکەوت بکا. ئۆتانیس چووە کەنار دەریا و لەشکری ئامادەکرد.

[١٤٢] حوکمڕانی ئەو کاتەی دورگەی سامۆس، مێئاندریۆس کوڕی مێئاندریۆس بوو. ئەو کابرایە لەلایەن پۆلیکراتیس وەک بەڕێوەبەری دورگەکە دیاریکرابوو. مێئاندریۆس نیشانیدا لە گشت خەڵکەکە دادوەرترە، بەڵام تاسەر نەیتوانی، چونکە پاش کوژرانی پۆلیکراتیس بەو چەشنە جوڵاوە: سەرەتا یەک سەکۆی قوربانی لە پەرستگەی دیا ئێلێفترۆتی دروست کرد و ئەو قوربانگایەی وەسڵی مەکانی پیرۆز کرد و ئێستاش لە دەرەوەی شار وەک خۆی ماوە. دواتر گشت دانیشتووانی دورگەی بۆ وتاردان بانگهێشت کرد و گووتی: "هەروەک ئێوەش دەزانن، دەسەڵات و حوکمڕانی پۆلیکراتیس لە دەست من دایە و تەنیا منم کە دەتوانم بەڕێوەی ببەم. ئەگەر بتوانم، کارێکی ئەوتۆ ناحەز ناکەم کە خەڵکیتری پێ بە تاوانبار دەزانم. من نە کەیفم بە پۆلیکراتیس دەهات کە سەرەڕۆیانە حوکمی بەسەر هاوڵاتییانی خۆیدا دەکرد و نە حەزم لەوەشە کەسێکیتر ئەو کارە بکات. ئێستا پۆلیکراتیس نەماوە و دەسەڵاتەکەی بە دەست منەوە. دەبێ بڵێم کە لە هەمبەر یاسادا گشتتان مافی وەک یەکتان هەیە. من تەنیا یەک شتم وەک خەڵات گەرەکە، لەو پارەیەی پۆلیکراتیس تەنیا شەش تاڵانم پێبدەن. هەروەها ڕێبەرایەتی ئایینی پەرستگەی دیا ئێلێفترۆتی بۆ من و خانەدانەکەم بە فەرمی بناسێندرێ، چونکە خۆم قوربانگای ئەو نێوەندەم بنیات ناوە و ئێستاش ئازادی و سەربەستی چەشنی خەڵات پێشکەشی ئێوەی دەکەم ". مێئاندریۆس ئەو بەڵێنانەی بە دانیشتووانی دورگەی سامۆسدا. لەو کاتەدا کەسێک لەنێو جەماوەر هەستایە سەرپێ و گووتی: "تۆ شایانی ئەوە نی کە حوکمڕانی ئێمە بکەی، تۆ کەسێکی کۆیلە و مرۆڤێکی تێکدەری. ئەو کۆڵە پارەیەی خەرجت کردوە ئاشکرای بکە ".

[١٤٣] ئەوە قسەی یەکێک لە شارۆمەندانی ناسراو بە ناوی تێلیسارخۆس بوو. مێئاندریۆس دوای ئاخاوتنی ئەو کابرایە لێی‌حاڵی بوو کە ئەگەر دەست لە حوکمڕانی هەڵگرێ، کەسێکی‌تر جێگای ئەو دەگرێتەوە و بۆیە لە خواستەکەی پەشیمان بۆوە. ناوبراو یەکڕاست چۆوە نێو قەڵا، لەوێ بە بیانووی ئەوە کە لەسەر تەحویل‌دانی خەزێنەی ماڵی قسە لەگەڵ دانیشتووان دەکا، یەکیەک بانگهێشتی کردن و لەجێوە خستنیە زیندان. ئەو خەڵکە ناڕازییە دەسبەسەربوو و مێئاندریۆس نەخۆش کەوت. برای مێئاندریۆس بەناوی لیکاریتۆس، لە ترسی ئەوەی مەبادا براکەی بمرێ و ئەو زیندانیانە سەبارەت بە جێگۆڕکێی دەسەڵات گرفتی بۆ بخوڵقێنن، لەجێوە هەرهەموویانی کوشت. وێدەچێ حەپس‌کراوەکانیش نەیان‌ویستووە ئازاد بکرێن.

[١٤٤] وەختێک پارسەکان گەیشتنە دوورگەی سامۆس، سیلۆسۆندیان لەگەڵ خۆیان هێنایەوە ئەو دورگەیە. هیچکەس دژایەتی نەکردن و لاینگرانی مێئاندریۆس و تەنانەت خۆیشی گووتیان کە دەخوازن بەسلامەتی و هەست بە ئەمنییەت کردن دەسەڵات جێهێڵن و لە دورگە وەدەرکەون. ئۆتانیس ئەو پێشنیارەی پەسندکرد و پەیمانی لەگەڵ مۆرکردن و دوای ئەو، کۆمەڵێک لە پیاوانی ناسراوی پارس لەسەر کورسیلە و بەرامبەر بە قەڵا دانیشتن و مەجلیسیان بۆگرت.

[١٤٥] مێئاندریۆس برایەکی هەبوو، زۆر تەواو نەبوو. ئەوەیان پێی دەگووترا خاریلائۆس. لەبەر ناهەقییەک، ئەو کابرایەیان لە یەکێک لە زیندانەکانی ژێر عەرددا دەستبەسەر کردبوو. کاتێک گوێی لە هەراوهوریای دەرەوە بوو، لێی‌حاڵی بوو چی قەوماوە. لە کونێکی زیندانەوە سەری هێنابووە دەر، وەختێک چاوی بە پارسەکان کەوت کە ئاوا بەبێ دەنگی دانیشتوون، هاواری‌کرد کە گەرەکییەتی لەگەڵ براکەی قسەبکا. مێئاندریۆس گوێی لەو دەنگە بوو و فەرمانی‌دا خاریلائۆس ئازاد بکەن و بیهێننە لای ئەو. ناوبراویان خێرا هێنا. خاریلائۆس، مێئاندریۆسی پڕجنێو و تاوانبارکرد و بەدەم هەڕەشەوە داوای لێکرد کە پەلاماری پارسەکان بدات: "ئەی پیسی

چەپەڵ، ئەمن لە زیندانی ژێر زەوی داوێی، بەڵام ئێستا کە پارسەکان دەسەڵاتت لێدەستێننەوە، ماڵ و مڵکت لێ زەوت دەکەن، ناوێری بەرگری لە خۆت بکەی، هەرچەند گەلێک هاسانە بەسەریاندا زاڵبی. ئەگەر لێیان دەترسی، لەشکرەکەت بدە من، ئەوسا دەبینی بە تاوانی هاتنە دەڤەرەکەمان چۆنیان تەمبێدەکەم. هیچ نیگەرانی ئەوە نیم کە تۆش لەگەڵ ئەوان لەو دورگەیە وەدەر بنێم ".

[١٤٦] ئەوە قسەی خاریلائۆس بوو و مێئاندریۆس بەهەقی دانا. هەرچەند من لەو باوەڕەدام کە مێئاندریۆس ئەوەندە نەفام نەبووە کە نەزانێ ئاخۆ لەشکرەکەی دەرەقەتی هێزەکانی پاشا دێن یاننا. ئەو پتر حەسادەت و ئێرەیی بە سیلۆسۆندا دەبرد. نەیویستوە دورگەی سامۆس بە سڵامەتی بکەوێتە دەست ناوبراو. مەبەستی مێئاندریۆس پتر قەڵسەگێڕان لە پارسەکان بوو و لەلایەکیشەوە شێواندن و تێکدان و پاشان تەحویلدانی دورگەکە بوو. ئەو دەیزانی ئەگەر پارسەکان تووشی کێشە و ئەزییەت بێن، خێرا تۆڵە لە دانیشتووانی سامۆسی دەکەنەوە. ئەوەشی دەزانی کە لە کاتی حاستەم و تەنگانەدا، چۆن و بەبێ هیچ مەترسییەک بۆی دەرچێ، واتە راست لەو کاتەدا کە بڕیاری کۆتایی داوە. مێئاندریۆس دالانی ژێر زەوی نهێنی لێدابوو و لە قەلاوە دەگەیشتە سەر دەریا. مێئاندریۆس لە دورگەی سامۆس رایکرد و خاریلائۆسی برای، سەربازانی لەشکری ئامادەکرد و دەروازەکانی شاری کردەوە و پەلاماری پارسەکانیدا. پارسەکان چاوەڕوانی قەومانی ئەوتۆیان نەدەکرد و لەو باوەڕەدا بوون کە بارودۆخەکە تەواو ئارام بۆتەوە. خەڵکانی سامۆسی سەرەتا هێرشیان بردە سەر پیاوانی ناسراوی پارس و بەتایبەت ئەوانەی لەسەر کورسیلەکان دانیشتبوون و مەجلیسیان گرتبوو. لەوانە بەشی هەرەزۆریان کوژران. لەشکری پارس بەهانای خەڵکی خۆیەوە هات. ئەوسا هێزەکانی سامۆسی زەختیان پێکەیی و ناچار بەرەو قەلا پاشەکشەیان کرد و لەوێدا حاسێبوۆن.

[١٤٧] وەختێک سەرکردەی نیزامی، ئۆتانیس، ئاگاداری رادەی کوژراوانی پارس بۆوە، هەرچەند داریوش دەستووری پێدابوو هیچکەسی سامۆسی نەکوژرێ و بەدیل نەگیرێ، تەنیا حکومڕانی دورگەی سامۆس بداتە دەست

سیلۆسۆندا و زەرەر و زیان نەگەیێنێ، ناوبراو خۆی پێرانەگیرا و نەیتوانی ئامۆژگارییەکانی پاشا وەبەرچاوبگرێ. گشت خواستەکانی وەپشت گوێدا و لەجێوە فەرمانی دەسەر هێزەکانی خۆی کرد، هەرکەس، چ پیاو، چ مناڵ، لەجێوە بیانکوژن. بەشێک لەو لەشکرەی گەمارۆی قەڵای دابوو، لەگەڵ بەشەکەیتر کە خزابوونە نێو قەڵا، تووشی هەرکەس هاتبان، چ لە دەرەوەی قەڵا و چ لەنێو شوێنە ئایینی و پیرۆزەکان، لەجێوە دەیانکوشت.

[١٤٨] مێئاندریۆس لە دورگە رایکرد و بەرەو ناوچەی لاکێدیمۆنی چوو. کاتێک گەیشتە ئەوێ، گشت ئەو شتانەی گەرەکی بوو، رایگواستنە شوێنی تازە. تەواوی جام و دەفر و حەوجۆشە زێڕ و زیوەکانی دەرهێنا و دایە دەست خزمەتکارەکانی خۆی بۆوەی خاوێنیان بکەنەوە. مێئاندریۆس لەو نێوەدا چاوی بە کلێئۆمین[1] کەوت. کلێئۆمین کوڕی ئەناکساندریت، پاشای سپارت بوو. مێئاندریۆس ناوبراوی بانگهێشتی ماڵی خۆی کرد. کلێئۆمین وەختێک چاوی بەو دەفر و حەوجۆشە زێڕانە کەوت، تووشی سەرسوڕمان هات. مێئاندریۆس داوای لێکرد چەندی حەز دەکا، بۆی هەیە لەو کەرستانە هەڵگرێ. دووسێ جار لێی دووپات کردەوە، بۆوەی شەرم و خەجاڵەتی داینەگرێ، بەڵام کلێئۆمین پیاوێکی گەلێک بە ویقار بوو، پێیعار بوو تاکە پارچەیەکیش لەو کەرستە زێڕانە هەڵگرێ. ئەو ئاوا تێگەیی کە مێئاندریۆس بۆیە ئەو کەرستانە دەبەخشێتەوە، بۆوەی سپارتییەکان لەمەر دووبارەگرتنەوەی دورگەی سامۆس یارمەتی بدەن. کلێئۆمین خێرا بە کاربەدەستانی حکووی خۆی راگەیاند کە مێئاندریۆس هەرچی خێراتر لە ناوچەی پێلۆپۆنیسۆ دەرکەن. ئەوەش بۆیە بوو کە مێئاندریۆس دەرفەتی نەبێ نە کلێئۆمێنیس و نە هیچ کەسیتر لەمەر خۆزگەکانی بە قەناعەت بگەیێنێ و دواتریش کەس لەو بارەوە بە تاوانبار بزانرێ. کاربەدەستە حکوومیەکان بە قسەی کلێئۆمین، مێئاندریۆسیان وەدەرنا.

---

١- کلێئۆمین، ناسراو بە کلێئۆمینی یەکەم، شازدەهەمین پاشای سپارتی لەنێوان ساڵەکانی ٥١٠ تا ٩٤٠ی پێش زایین.

[١٤٩] لەشکری پارس، دورگەی سامۆسی ویرانکرد و پاشان دایە دەست سیلۆسۆندا. دواتر ئۆتانیسی سەرکردەی لەشکری پارس خەونێکی بینی. لە خەونیدا، ئەندامی نێرینەی ئەو تووشی نەخۆشییەکی چارەسەرنەکراو هات و ناچار بوو ویڕای سەربازانی لەشکری، بۆ هەمیشە لەو دورگەیە نیشتەجێ بی.

## سەرهەڵدانی شاری بابل

[١٥٠] لەو کاتەدا کە پەلاماری ناوگانی دەریایی بۆسەر دورگەی سامۆس ئامادەدەکرا، خەڵکی بابل (بابیلۆنا) دوای ئەوەی تەواو خۆیان ڕێکخست، ڕاپەڕینێکیان سازکرد. ئەوەندە ماوەیەی کە کابرای مۆغ خەریکی حوکمڕانی بوو و حەوت کەسی گۆرین دژی ئەو وەخۆکەوتن، دانیشتووانی بابیلی هەلەکەیان قۆستەوە، بۆوەی کۆتایی بە ژێردەستەیی خۆیان بێنن. گشت ئامادەکارییەک دوور لە چاوی پارسەکان بە ئەنجام گەیشت. هەر دانیشتوویەک سەرەتا دایک و یەکێک لە ژنەکانی خۆی کە حەزی لێبوو، جیاکردەوە. پیاوەکان باقی ژنانی شاریان کۆکردەوە و هەرهەموویانیان خنکاندن. هەر بابیلییەک بۆی هەبوو تەنیا یەک ژن بۆ خزمەت کردن ڕاگرێ و ئەوانیتر بکوژێ. ئەوەش بۆیە بوو کە ئەرزاق و بژیو بەشی گشتیانی نەدەکرد و دەبوایە پێخۆر بە خواردەمەنی بکەن.

[١٥١] وەختێک داریوش ئەو خەبەرەی پێگەیی، تەواوی هێزەکانی لەشکری خۆی کۆکردەوە و پەلاماری شاری بابیلۆنیدا و لە گەمارۆی خست. لەولاشەوە، خەڵکی بابلی بەبێ هیچ نیگەرانییەک بەربەرەکانی خۆیان دەستپێکرد. ڕۆژانە دەچوونە نێو سەنگەر و شوێنە مەحکەم و بەرزەکان و لەوێوە بە خۆبادان و ڕەفتاری سەیروسەمەرە، سووکایەتییان بە داریوش و هێزەکانی دەکرد. یەکێک لەو بابلیانە لەپڕێکا هاواریکرد: "ئەی پارسەکان، چاوەڕوانی چی دەکەن، بۆچی ناڕۆنەوە وڵاتی خۆتان! تەنیا ئەو کاتە شاری بابیلتان پێداگیردەکرێ کە هێستر بزێن! ". کابرای بابلی بۆیە ئەو قسەیەی کرد، چونکە قەت پێیوانەبوو کە هێستر بتوانێ بزێ.

[١٥٢] ساڵێک و حەوت مانگ تێپەڕی. داریوش و لەشکرەکەی تەواو توڕە و قەڵس ببوون، لەوە کە نەیاندەتوانی شاری بابێل داگیربکەن. هەرچەند گشت ڕێکارەکانی پێویستیان ڕەچاوکردبوو، بەتایبەت ئەو شێوازانە کە کاتی خۆی کوروش بەکاری هێنابوو. بەو حاڵەش شار داگیرنەکرا و خەڵکەکەی بەرگرییەکی چاکیان لە شارەکەیان کرد و وێدەچوو هومێدی بەدەستەوەدانی لەگۆڕێدا نەمێنێ.

[١٥٣] ئەو سەردەمە، مانگی بیستەمی گەمارۆ بوو. زۆپیرۆس، کوڕی مێغافێزۆس تووشی ڕووداوێکی سەیر هات. مێغافێزۆس ئەو کەسە بوو کە بەشداری لە کۆڕی حەوت کەسیدا کرد تا کابرای مۆغ بکوژن. بەهەرحاڵ، ڕووداوە سەیرەکە ئەوە بوو کە یەکێک لە هێسترەکانی زۆپیرۆس زا. کاتێک ئەو خەبەرەی پێگەیی، باوەڕی نەکرد تا بە چاوی خۆی بینی.

دەستووری بە کۆیلەکان‌دا لای هیچکەس باسی ئەو قەومانە نەکەن و خۆیشی لە فکرەوە ڕۆچوو. بەپێی ئەو قسانەی کابرای بابێلی لە سەرەتای گەمارۆدانی شاردا گوتبووی، ئەگەر هێستر بزێ، شارێک داگیردەکرێ، هەستی بەوە کرد کە کاتی داگیرکردنی بابێل هاتووە. بەخۆی گووت ئەوە خواستی پەروەردگاری لەسەرە و بۆیە کابرای بابل‌یش گوتوویەتی دەبێ هێستر بزێ. بەو قەناعەتە گەیشت، داهاتوو و چارەنووسی دانیشتووانی بابێل بە داگیرکرانی شارەکە کۆتایی پێدێ و بۆیە یەکسەر چوو بۆ لای داریوش تا بزانێ ناوبراو هیچ بایخێک بە خواستی گرتنی شاری بابێل دەدا و مەیلی جارانی ماوە یانا. داریوش بە هەمان حەسرەتەوە دەژیا. زۆپیرۆس بەو خەیاڵە کە ئەو سەرکەوتنە پێویستە بەناوی خۆی تۆماربکا، خەریکی دۆزینەوەی ڕێگاچارەیەک بوو.

ئەو سەردەمە پارسەکان لە بەرامبەر ئەنجامی کاری گەورە و گرینگدا، قەدر و حورمەتێکی زۆریان لەلایەن پاشا و خەڵکەوە هەبوو. زۆپیرۆس هیچ ڕێگە چارەیەکی بە مێشکی‌دا نەهات. تەنیا ئەوە کە بە شێوەیەکی ترسناک لەشی خۆی وەبەر تیغدا. کەپۆ و هەردوو گوێیەکانی خشت بڕی و سەری خۆی تاشی و داوای کرد بە قەمچی سەر و گوێلاکی ڕەش و شین هەڵگێڕن. ئەوجار بەو حاڵەوە چووە لای داریوش.

[١٥٥] داریوش گەلێک ناڕاحەت بوو، وەختێک دیتی پیاوێکی پایەبەرزی ئەو بەو چەشنە خۆی وەبەر تیغ و قەمچی داوە. لەسەر تەختی پاشایەتییەوە دابەزییە خوارەوە و هاواری کرد و لە زۆپیرۆسی پرسی کە کێ ئەو بەڵایەی بەسەر تۆ هێناوە و مەبەست چی بووە.

زۆپیرۆس لە وڵامدا گووتی: "هیچکەس، جیا لە جەنابت ناتوانێ لەگەڵ من بەو چەشنە بجووڵێتەوە. هیچکەس پاشاکەم، ئەو کارەی نەکردوە، من تەنیا، بە دەستی خۆم کەپۆ و گوێیەکانی خۆمم بڕیوە، چونکە چیتر ناتوانم قبوڵ بکەم ئاشووریەکان بە پارسەکان پێبکەنن". داریوش ئەوجار پێیگووت: "بێبەخت، تۆ جوانترین وشە بۆ ناحەزترین کردەوە بەکار دێنی. کاتێک دەڵێی بۆخاتری سەرکەوتنی گەمارۆ ئەو بەڵایەت بەسەر خۆت هێناوە، کە قەت تیماری نایە، هەی نەفام، چۆن سەر و گوێلاکی خۆت ئاوا بڕیوە، پێتوایە بەو کارەت دوژمن خێرا شاری بابل چۆل دەکا! ئاقڵت بۆ کوێ باری کردبوو، لەو کاتەدا کە خەریکی بڕینی کەپۆ و گوێیەکانت بووی؟". زۆپیرۆس وەجواب هات و گووتی: "ئەگەر پێشتر پێمگووتبای کە دەخوازم ئەو کارە بکەم، ئیزنت پێ نەدەدام، بۆیە خێرا خۆم وەخۆ کەوتم. ئێستا، بەهەر حاڵ کارە و کردوومە. داخوازییەکم هەیە، ئەگەر بۆم بەجێ بگەیێنی، دڵنیام شاری بابل داگیر دەکەین.

من بەو وەزعەی بەسەر خۆمم هێناوە و ئاوا عەیبدار بوومە، دەچمە لای هێزەکانی دوژمن و دەڵێم پاشا ئەو بەڵایەی بەسەر هێناوم. پێموایە باوەڕم پێدەکەن و پۆستێکی نیزامی گرینگم پێدەسپێرن. تۆ بەڵام، دە ڕۆژ دوای ڕۆیشتنی من، واتە ئەو کاتەی چوومەتە نێو شار، لەشکر بنێرە بەر دەرگای سمیرامیدۆس. هەزار کەسێک لەوانە کە ئەگەر بە کوشتن چوون، بەلاتەوە زۆر گرینگ نەبێ. پاش حەوت ڕۆژیتر دوای ئەو ڕۆژە، دوو هەزار کەسیتر بنێرە لای دەروازەی نینیێۆ. دواتر، پاش ئەو وەجبە حەوت ڕۆژییە، بیست ڕۆژێک دەست ڕاگرە، دیسان بە چوار هەزار کەس وەرە لای دەروازەی خالدییەکان. لەبیرت نەچێ، لە وەجبەی یەکەم و دووهەمدا پێویست ناکا سەربازەکانت چەکێکی ئەوتۆیان پێبێ. ئەوان نابێ توانای شەڕکردنیان هەبێ، تەنیا نێزەی کورتیان بدەیێ و بەس. بە

واتایەک لێیان‌گەڕێ با تێدابچن. دوای بیست ڕۆژ، ئەوجار فەرمانی رووخانی دیواری شار بدە، بەڵام هێزەکانت لەبەر دەروازەکانی ڤیلیدا[1] و کیسیاس دابنێ. من دوای ئەو هەموو سەرکەوتنە بەسەر هێزەکانی تۆدا، خەڵکی بابلی باوەڕی تەواوم پێدەکەن و کلیلداری دەروازەکانیش هەر خۆم دەبم. ئەو کاتە من و لەشکری پارس دەزانین چ پێویستە بە ئەنجامی بگەیێنین".

[١٥٦] زۆپیرۆس وەختێک لە قسەکانی بۆوە، خێرا بەرەو دەروازەکانی شار وەڕێکەوت و بەئەنقەست جاروبار ئاوڕێکی دواوەی دەداوە، وەک بەڕاستی گەرەکی بێ خۆی بەدەستەوە بدا. پاسەوانەکان لە بورجەکانەوە ناوبراویان دیت، بۆی هاتنە خوارەوە و لینگە درگایەکی بچووکیان لەسەر دەروازەی شار بۆ ئەو کردەوە و لێیان پرسی کێیە و چی گەرەکە.

زۆپیرۆس خۆی ناساند و تەسلیمیان بوو. پاسەوانەکان گوێیان لە زۆپیرۆس گرت و بردیانە لای گەورە پیاوانی شار. زۆپیرۆس لە حزوریان‌دا وێستا و بەهاوار و گریان گووتی کە داریوش سەر و گوێلاکی ئەوی بڕیوە و ئەو بەڵایەی بەسەر هێناوە، ئەوەش لەبەر ئەوە بوو کە پێشنیاری بە پاشا کردوە پاشەکشە بە هێزەکانی خۆی بکا و کۆتایی بە گەمارۆی شاری بابل بێنێ، چونکە هیچ ڕێگا چارەیەکی‌تر نەماوە لەمەر داگیرکردنی بابێل بەتاقێ نەکردبێتەوە.

زۆپیرۆس درێژەی بە قسەکانی‌دا: "من ئەو بەڵایەم بۆخاتری ئێوە بەسەر هاتووە، بۆخاتری شاری بابل، ئەو شارەی بۆتە مایەی بەڵا و موسیبەت بۆ داریوش و لەشکرەکەی و گشت پارسەکان. دەزانم کە خێر و خۆشی لە خۆی نابینێ، چونکە ئەو وەزعەی بەسەر من هێناوە. ئەو نابێ خەیاڵی بحەسێتەوە، من بە گشت فکر و پیلانەکانی دەزانم ".

[١٥٧] زۆپیرۆس بەو چەشنە قسەی کرد و بابلی‌یەکانیش بە دیتنی کەسێکی پارسی پایەبەرز کە ئاوا کەپۆ و گوێی بڕاوە و سەروگوێلاکی لەبەر قەمچی لێدان

---

١- ڤیلیدا یا ڤێلۆس، خوای خواکان (بێل- مەردوک) لە بابێلی سەردەمی باستان. هاوشانی خواوەند دیای یۆنانی.

هەڵمساون، باوەڕیان پێکرد و وەک هاوپەیمانی خۆیان وەریانگرت. بابیلییەکان ئامادەیی خۆیان لەمەر بەجێهێنانی گشت خواستەکانی زۆپیرۆس دەربڕی.

زۆپیرۆس سەرەتا داوای هێزی لەشکری کرد. کاتێک داواکەی جێبەجێکرا، راست ئەوجۆرەی لەگەڵ داریوش پێکهاتبوو، نەخشەی داڕێژراوی بەڕێوەبرد. رۆژی دەهەم، هێزەکانی ژێردەستی خۆی هەڵگرت و گەمارۆی لەشکری داریوشیدا، واتە ئەو هەزار کەسەی قەرار بوو قەڵتوبڕ بکرێن. بابیلییەکان کاتێک دیتیان کردەوەکانی زۆپیرۆس لەگەڵ بەڵێنەکانی یەک دەگرنەوە، تەواوێک خۆشحاڵ و ئامادەی ئیتاعەت کردن لە ناوبراو بوون. زۆپیرۆس دیسان لێگەڕا وەجبەی دە رۆژەکە تێپەڕێ و ئەوجاریش هێزێکی گەورەی بابیلی هەڵگرت و لە شار دەرکەوت و دوو هەزار سەربازی داریوشی تێکشکاند. بابیلییەکان بە بینینی ئەو سەرکەوتنەش، تەنیا ناوی زۆپیرۆسیان لەسەر زار بوو و بەردەوام ستایشی ئەویان دەکرد. نۆرەی وەجبەی سێهەم و کات و رۆژی بڕیاردراو هات. زۆپیرۆس دیسان سەربازەکانی بابیلی بردە دەر و چوار هەزار کەسەکەی داریوشی گەمارۆدا و شەڕێکی قورسی کرد و هەرهەموویانی لەنێوبرد. دوای بەئەنجام گەیاندنی ئەو راسپاردەیە و سەرکەوتنە مەزنە، گشت کاروبار و دەسەڵات کەوتە دەست زۆپیرۆس. ئەوجار وەک سەرکردەی هێزەکانی پاسەوانی شوورەی مەحکەمی شار دیاریکرا.

[١٥٨] وەختێک بەپێی قەراری پێشوو، داریوش فەرمانی دامەزرانی هێزەکانی لەشکری لە نیزیک دیوارەکانی شاری دەرکرد، ئەو کاتە بوو کە حیللە و درۆی زۆپیرۆس ئاشکرا بوو. لەو وەختەدا، گشت هێزەکانی بابیلی وەسەر دیوارەکانی شار کەوتبوون بۆوەی نەکەونە بەر تیرڕەسی هێزەکانی داریوش لە کاتی پەلاماردا، زۆپیرۆس دەروازەکانی فیلیدا و کیسیاسی کردەوە و پارسەکانی هێنایە نێو شار.

ئەو بابلیانەی چاویان بەو رووداوە کەوت خێرا پەنایان بۆ پەرستگەکانی دیا و ڤیلۆس برد، بەڵام باقی دانیشتووانی شار لە شوێنەکانی خۆیان مانەوە، تا ئەو کاتەی خەبەریان پێگەیی کە خەیانەتیان پێکراوە.

[١٥٩] شاری بابیل بۆ جاری دووهەم بەو چەشنە داگیرکرا. داریوش پاش ئەوەی ئەو شارەی گرت، دیوارەکانی بەتەواوی رووخاند و دەروازەکانی لە بناغەوە دەرهێنا. (کاتی خۆی کوروش شاری بابیلی گرت. ئەو هیچکام لەو کارانەی نەکرد.) داریوش، نیزیک بە سێ هەزار لە گەورە پیاوانی شاری سەر بڕی، ئەوجار ئیزنی بە خەڵکەکە دا لە شاردا بمێننەوە. پیاوانی بابیلی بۆوەی ببنە خاوەن ژن و منداڵ، داریوش بەو چەشنە یارمەتی دان. (هەڵبەت پێشتر گووتم کە پیاوانی بابیلی ژنەکانی خۆیان خنکاندبوو بۆوەی ئەرزاق و دەغڵودان بەشی پاشماوەی جەماوەر بکا). داریوش فەرمانی دەسەر گەلانی دراوسێ کرد کۆمەڵێک ژن بۆ بابیلییەکان رەوانە بکەن. دیارە خۆیشی ژمارەی ئەو ژنانەی دیاری کردبوو. هەربۆیە پاش فەترەیەک پەنجا هەزار ژن گەیشتەنە شار. خەڵکی بابیلی ئەمڕۆ، لەو ژنانە وەپاش کەوتوون.

[١٦٠] ئێستا لە بابەت زۆپیرۆس، داریوش لەو باوەڕەدا بوو کە هیچ کەسێکی پارس بەقەدەر ئەو کابرایە لەخۆبردوو نەبووە، نە لە جیلی نوێ و نە لە نەسڵەکانی پێشووتردا، هەڵبەت جیا لە کوروش، چونکە سەبارەت بەو کەس لەخۆی رانابینێ هەڵسەنگاندن بکا. دەگێڕنەوە کە داریوش گەلێک جار گوتوویەتی حەزم نەدەکرد شاری بابیل و بیست کۆمەڵگای‌تر داگیربکەم بۆخاتری خۆسەقەت کردنی زۆپیرۆس. داریوش رێز و حورمەتێکی تایبەتی بۆ ناوبراو هەبوو. داریوش گشت ساڵێک کۆمەڵێک لە بەنرخترین دیاری بەلای پارسەکانەوە، پێشکەش بە زۆپیرۆس دەکرد. پاشا هەروەها حوکمڕانی شاری بابیلی تا رۆژی مردن دایەدەست زۆپیرۆس، بەبێ ئەوەی هیچ چەشنەماڵیاتێک بە حکوومەت بدا. دیارە زۆر شتی‌تری خەڵاتی زۆپیرۆس کرد.

لە زۆپیرۆس، مێغافیزۆس وەپاش‌کەوت، ئەوەیان لە وڵاتی میسر دژی یۆنانی‌یەکان.و هاوپەیمانەکانیان بەشداری شەڕبوو. لە مێغافیزۆس، زۆپیرۆس وەپاش کەوت کە ئەوەشیان لە وڵاتی پێرسیا(پارس) رۆیی و چووە شاری ئاتێن.

# کتێبی چوارەم

## مێلپۆمێنی، خواوەندی تراژیدیا

### مێژووی سکیتیا

[١] دوای داگیرکرانی شاری بابل، لەشکرکێشی دژی سکیتیەکان بە فەرماندەری داریوش دەستیپێکرد. لەبەر ئەوەی ئاسیا هەرێمێکی پڕ حەشیمەت و دەوڵەمەند بوو، داریوش گەرەکی بوو تۆڵە لە سکیتیەکان بستێنێتەوە. سکیتیەکان پێشتر پەلاماری وڵاتی (میدیا)یان دابوو و ئەو لەشکرە بۆ بەرگریکردن ناردرابووە بەرەی شەڕ، تووشی شکست هاتبوو. هەروەک پێشتر باسم کرد، سکیتیەکان بۆ ماوەی بیست و حەوت ساڵ فەرمانڕەوایی ئاسیای ژووروویان بەدەستەوە بوو. ئەوان، کاتی راونانی کیمێریەکان هاتنە نێو خاکی ئاسیا و دەسەڵاتدارییەتی میدیایان روخاند کە بەر لە هاتنی سکیتیەکان وڵاتیان ئیدارە دەکرد. ئەوانە دوای بیست و حەوت ساڵ دووری لە شوێنی ژیانی خۆیان، وەختێک گەڕانەوە وڵاتەکەیان، بەسەر بارودۆخێکی ناخۆشی وەک وڵاتی میدیادا کەوتن.

بەهۆی لەشکرێکی گەورەوە پێشیانپێگیرا. ژنانی سکیتی لەبەر ئەوەی پیاوەکانیان ساڵانێکی زۆر وەدیار نەکەوتبوون، گشتیان لەگەڵ کۆیلەکانی خۆیان جووت ببوون.

[٢] سکیتی‌یەکان عادەتیان بوو کۆیلەکانی خۆیان کوێر بکەن، بۆوەی شیرخواردنەوەیان بە دڵنیاییەوە مسۆگەر کردبێ. ئەوانە لوولەیەکی ئێسقان، چەشنی شمشاڵ دەست دەدەنێ، سەرێکی لە ئەندامی مێینەی ماین رۆدەکەن و لەو سەریش بە زار فووی تێدەکەن. کەسێکی‌تریش هاوکات خەریکی دۆشینی ماین دەبێ. ئەوانە لەو باوەڕەدان کە بەو شێوە فوودانە، رەگەکانی لەشی ماین هەڵدەمسێن و دەبێتە هۆی شیردانی پتر. کاتێک شیر دۆشرا، ئەوجار لەنێو کاسەی دەکەن و کۆیلە کوێرە ناچار دەکەن بەردەوام شیرەکە لێکبدا. کابرای سکیتی دوای ماوەیەک سەر شیرەکە دەخوا و پێیوایە هەر ئەو بەشەی شیر بە قازانجییەتی. سکیتی‌یەکان هەرکەس بەدیل بگرن، بۆوەی ئەو کارەیان بۆ بکا، خێرا هەردوو چاوی کوێر دەکەن. ئەوانە حەزیان لە کشتوکاڵ و ژیانی نیشتەجێیی نییە و پتر خێڵەکی دەژین و کۆچەرن.

[٣] لەو کۆیلانە و لە ژنانی سکیتی، کۆمەڵێک منال وەپاش کەوتن. ئەو منالانە وەختێک بە بنەچەکە و رەگەزی خۆیان زانی، دژی ئەو سکیتی‌یانە یەکتریان گرت کە لە ولاتی میدیاوە گەڕابوونەوە. سەرەتا خەندەکێکی بەرین و قوڵیان لە چیاکانی تاڤرۆسەوە[١] تا گۆلی مێئۆتیدا[٢] هەڵکەند و بەو شێوەیە ولاتی خۆیان تەریکخستەوە. ئەو خەندەکە لە نیزیک گۆل بەرینتر لە شوێنەکانی‌ترە. ئەو لەشکرەی پێکهاتبوو، لە کاتی پەلاماری سکیتی‌یەکانی گەڕاوەدا، بەرگری دەست پێکرد و لە ئاکامدا هەردوو لایەن تووشی شەڕێکی قورس هاتن.

دوای چەند جار شەڕ و پێکدادان، سکیتی‌یەکانی گەڕاوە نەیانتوانی هیچ دەسکەوتێک مسۆگەر بکەن، بۆیە یەک لەوانە بە دەنگی بەرز هاواری کرد: "ئەی خەڵکی سکیتی ئەوە خەریکی چین! هیچ دەزانن ئێمە شەڕ دژی

---

١- تاڤرۆس یا خێرسۆنیسۆس، هەرێمێک لە کەنارئاوەکانی باکووری دەریای رەش کە لە باشوور دەگاتە دەریای ئازۆف و ئەمڕۆ ناوچەی کەریمە یا کریمێئا و ساحیلەکانی باکووری دەریای ناوبراو دەگرێتەوە.

٢- مێئۆتیدا، ناوی باستانی دەریای ئازۆف.

کۆیلەکانی خۆمان دەکەین و لەخۆڕا ئەوان و خۆمان بەکوشتن دەدەین و بەردەوام ژمارەمان کەم دەبێتەوە. من لەو باوەڕەدام نێزە و تیر و کەوانەکانمان فڕێ بدەین، بلوێری شیر دۆشین و قەمچییەکانمان دەستدەینێ و بچینە بەرزاییەکانی ژوور سەری ئەو کۆیلانە و مژۆڵی شیرخواردنەوە بین باشترە. ئەوانە تا ئێستا ئێمەیان هەر بە چەکەوە دیتووە، بۆیە شەڕمان لەگەڵ دەکەن، ئەگەر بلوێر و قەمچیمان بە دەستەوە ببینن، ئەوجار دەزانن کە ئێمەش لە ڕەگەزی خۆیانین و پێشتر کۆیلەی ئێمە بوونە و خێرا غیرەت بەردەدەن و لەوە زیادتر بەرگری ناکەن".

[٤] سکیتییەکان گوێیان لەو قسانە بوو و هەڵسوکەوتیان گۆڕی، کۆیلەکان بە دیتنی ئەو دیمەنە ترسیان ڕێنیشت و دەستیان لە شەڕ هەڵگرت و رایانکرد. بەو چەشنە سکیتییەکان فەرمانڕەوایی ئاسیایان گرتەوە دەست، هەڵبەت دوای ئەوەی میدیاکان ئەوانەیان راونا و لە وڵاتی خۆیان کردنەوە. داریوش لەبەر ئەو پەلامارە، گەرەکی بوو سزایان بدا و لەشکری بۆ ئامادەکرد.

[٥] بەپێی سەرچاوەکانی سکیتی، ئەوان وەک نەتەوە گەنجتر لە خەڵکانی دراوسێن و باسی سەرچاوەی رەگەزی خۆیان بەو چەشنە دەکەن: یەکەم سکیتی لە بیابانی وڵاتێک ناسراو بە تارغیتائۆس لەدایک بوو. خۆیان دەڵێن و من باوەڕم پێنییە کە باوکی تارغیتائۆس خواوەند دیا و دایکیان کچی رووباری ڤۆریستێنیس بووە. بەهەرحاڵ لە دایک و باوکێکی ئەوتۆ، تارغیتائۆس وەپاشکەوتووە و خۆیشی سێ منالی کوڕی هەبووە: لیپۆکسای، ئارپۆکسای و لە گشتیان بچووکتر کۆلاکسای. لەو سەردەمەدا کە ئەو سێ کەسە فەرمانڕەواییان کردوە، کۆڵێک زێڕ لە ئاسمانەوە ڕژاوەتە سەر خاکی سکیتییەکان. ئەو پارچە زێڕانە بریتی بوونە لە: گاسن، تەرازوو و دەفر و تەور. یەکەم کەس کە ئەو کەرستانەی دۆزیوەتەوە، کوڕی گەورە بووە و خێرا بۆیان چووە کە هەڵیان بگرێتەوە، بەڵام وەختێک لێیان نیزیک بووەتەوە، زێڕەکان گشتیان دەستیان بە درەوشانەوە کردوە. کوڕە لێیان دوور

کەوتوەتەوە، ئەوجار کوڕی نێونجی چووەتە پێش و هەمان درەوشانەوەی بینیوە. بەواتایەک ئەوان لە درەوشانەوەی زێڕ ڕەویونەوە. نۆرەی کوڕە بچووکەکە هاتووە و ئەویش بەنۆرەی خۆی دەستی بۆ زێڕەکان بردوە. لەبەرامبەر ئەو کوڕە، گشت کەرستەکان خامۆش بوونە. کۆلاکسای هەڵیگرتنەوە و بردنیەوە ماڵ. دوو براکەیتر ڕێککەوتن کە بەشە دەسەڵاتی خۆیشیان بە برای بچووک ببەخشن.

[٦] وەک دەگێڕنەوە، دەستەیەک لە سکیتییەکان، ئەوانەی لە لیپۆکسای وەپاش کەوتوون، ناسراون بە لیخاتی. لە برای نێونجی واتە ئارپۆکسای هۆزی کاتیاری و تراسپی و لە بچوکیش، پاشاکانی پەرالاتی وەپاش کەوتن. ناوی هاوبەشی ئەوانە سکۆلۆت بووە. یۆنانییەکانیش بۆیە بە سکیتی بانگیان دەکەن، چونکە یەکێک لە پاشاکانیان بەو ناوە ناسراوە.

[٧] ئەوە سەرچاوەی ڕەگەزیی سکیتییەکان بوو، وەک بۆخۆیان باسی دەکەن. ئەوان مێژووی خۆیان لە سەردەمی هاتنەسەرکاری یەکەم پاشایان واتە تارغیتائۆس تا کاتی هێرشی داریوش حیسابکردوە و نیزیک بە هەزار ساڵێک دەبێ.

پاشاکانی سکیتی بەباشی پارێزگاری لەو کۆمەڵە کەرستە زێڕە پیرۆزە دەکەن و گشت ساڵێک قوربانی بەبۆنەی پاراستن و خەزنەکردنیان پێشکەش دەکەن. سکیتییەکان هەڵبەت ئەوەش دەڵێن، هەرکەس لە کاتی ڕۆژانی جەژندا ئەرکی پاراستنی ئەو کەرستانەی لە ئەستۆ بێ، ئەگەر لە دەرەوە خەویلێبکەوێ، ئەو ساڵە دەمرێ. پاداشی پاسەوانییەتی ئەو کەرستانە، پارچە زەوییەکە. پانتایی ئەو زەوییە بەرابەری یەک ڕۆژ ڕێپێوان بە ئەسپە.

لەبەر ئەوەی ئەو وڵاتە گەورەیە، کۆلاکسای خاکەکەی دابەش کردوە. کەرستە زێڕەکان لەو بەشەدا دەپارێزرێن کە لەوانیتر فرە گەورەترە. لەو هەرێمانەی کە دوور لە خاکی ئەوانەیە و لەلای باکوور هەڵکەوتوون، دەڵێن هیچکەس ناتوانێ ڕێگە بڕبدا و لەبەر پەڕبارینی زۆر چاو نابینێ. ئەو پەڕانە

له ئاسمانەوە دێنەخوار و عەرز و هەوا پڕ لەو پەڕانەیە و هەر ئەوانەش بەربە بینایی چاو دەگرن.

[٨] ئەوە قسەی سکیتی‌یەکانە لەمەڕ سەرچاوەی رەگەزی و ئەو وڵاتانەی لە باکوور هەڵکەوتوون. ئێستا با بزانین ئەو یۆنانییانەی لە هەرێمی پۆندۆس[١] نیشتەجێن، چدەڵێن: خواوەند ئیراکلیس گایەکانی غیری‌ئۆنیس بەرەو ئەو خاکە بیابانە وەپێش خۆی دەدا، واتە بۆ هەرێمی نیشتەجێیی سکیتی‌یەکان. ییری‌ئۆنیس لە دەرەوەی وڵاتی پۆندۆس دەژیا. لە دورگەیەک دەمایەوە کە یۆنانییەکان بەناوی ئێریتیا دەیناسن. ئەو دورگەیە لە نیزیک غادیرا[٢] دوور لە ناوچەی ئیراکلیس‌ستیلێس (کۆڵەکەکانی ئیراکلیس)[٣] هەڵکەوتووە، واتە لەو شوێنەی ئەقیانووس دەستپێدەکات.

سەبارەت بە سەرچاوەی ئەقیانووسیش دەڵێن، لەو نوختەیەوە دەسپێدەکا کە خۆر هەڵدێ و دەوری بیچمی زەوی دەدا. هەڵبەت لەمەڕ راستی ئەو بۆچوونە، پشت بە هیچ سەرچاوەیەکی زانیاریی نابەستن. بەهەرحاڵ ئیراکلیس لەو دورگەیەوە وەڕێکەوت و گەیشتە وڵاتی سکیتی. لە رێگادا تووشی زستان و سەهۆڵبەندان هات و خۆی لە کەوڵە شێر وەرپێچا و خەوی لێکەوت. جوانوو ئەسپەکانی فایتوونەکەی بەردا بۆوەی بلەوەڕێن. جوانووەکان بەئیزنی خوای ونبوون.

[٩] وەختێک ئیراکلیس وەخەبەر هات، بەدوای جوانوو ئەسپەکانیدا گەڕا. سەراسەری وڵاتی پشکنی و لە کۆتاییدا گەیشتە خاکی ئیلی‌ئا، لەنێو ئەشکەوتێکدا چاوی بە شتێکی سەیر کەوت، مارێک بە دوو سروشتەوە: لە

---

١- پۆندۆس، بەشێک لە کەنارئاوەکانی ئاسیای بچووک لە قەراخ دەریای رەش کە لە باکوورەوە دەگاتە ئەو دەریایە و لە باشوور دەگاتە وڵاتی فریژی و چیاکانی کاپادۆکی و ماوەیەک هەرێمی کاپادۆکی گەورەی پێکهێناوە. ژمارەیەکی زۆر کۆچبەرنشینی یۆنانی لە قەراخەکانی ئەو هەرێمە دروستکراون و بەتایبەت ترابزۆن و سەیدە بەرچاون.

٢- کادیکس

٣- کۆڵەکەکانی ئیراکلیس، ئەمڕۆ ناسراوە بە جەبەل ئەلتاریق.

سمت بەرەو ژوور ژن بوو و لەوێ بۆ ژێرەوە مار.[1] ئیراکلیس کە چاوی بەو بوونەوەرە کەوت، هەڵبەزییەوە. خێرا لەو مارەی پرسی ئاخۆ جوانوو ئەسپەکانی ئەوی نەدیوە لەو دەڤەرە بخولێنەوە. بوونەوەری گۆرین وڵامی داوە کە ئەو خۆی ئەسپەکانی داگیرکردوە و نایانداتەوە. مەگەر لەگەڵی رازێ و تێکەڵاوی جینسی لەگەڵدا بکا. ئیراکلیس قبوڵی کرد و لەگەڵ نیوە ژن و نیوە مار جووت بوو و بەڵێنی خۆی بردەسەر. ژنە ئەوجار ئامادە نەبوو ئەسپەکان بداتەوە بە ئیراکلیس و بەو شێوەیە دەیویست ئەو پتر لەلای خۆی راگرێ. ئیراکلیس بەپێچەوانەوە گەرەکی بوو لەدەست ئەو بوونەوەرە رابکا. ژنە هەرچۆنێک بوو ئەسپەکانی داوە بە ئیراکلیس، بەڵام پێیگووت: "من ئەسپەکانی تۆم رزگارکرد و هاتبوونە دەڤەری من، تۆش ناچار بووی نرخەکەی بدەی. لە تۆوە دەبمە خاوەن سێ مناڵ، پاش ئەوەی گەورەم کردن، پێم بڵێ چییان لێبکەم. لێرەیان راگرم کە خۆم فەرمانڕەوایی دەکەم یا بیان نێرمە لای تۆ؟ ". ئەوانە چەند پرسیارێکی بوونەوەرەکە بوون. دەڵێن ئیراکلیس لە وڵامدا گوتوویەتی: "هەروەخت هەستت بەوە کرد کە مناڵەکان بوونەتە پیاو، بەو چەشنە رەفتاریان لەگەڵدا بکە و نەکەی تووشی هەڵە بی: هەرکام لەو کوڕانە توانی زێی ئەو کەمانەی من رابکێشی و کەمبەرەکەم لەنێو قەدی خۆی ببەستێ، وەک ئەوجۆرەی من بەستوومە، لێگەڕێ ئەویان لێرە بمێنێتەوە، هەرکام لەوانیتریش کە دەرەقەتی ئەو کارە نەهات، خێرا وەپشت درگای بنێ و دەریبکە. ئەگەر تۆ بەو شێوەیە رەفتار بکەی، بەختەوەر دەبی و فەرمانەکانی منیشت بەجێگەیاندووە ".

[١٠] ئیراکلیس زێی کەوانێکی مەحکەم راکێشا و نیشانی ژنەی دا و پاشان فێری کەمبەرە بوستنیشی کرد و هەردوکیانی رادەسکرد. قوڵفی کەمبەرەکە خاوەن زەنگوڵەیەکی بچووکی زێڕ بوو. ئیراکلیس دوای دانانی ئەو رێوشوێنانە، وەڕێکەوتوو و رۆیشت.

---

١- میکسۆپارتێنۆس، وێژەیەکی تایبەتی هێرۆدۆتە کە لێرەدا بەکاری هێنابوو. هەڵبەت کیمێرییەکان خاوەن خوایەک بەو رەنگ و روخسارە بوونە.

کاتێک مناڵەکانی ژنە گەورە و باڵغ بوون، ژنە ناوی لەسەر دانان. یەکەمیان ئاغاتیرسۆس، دووهەمیان پێلۆنۆس و ئەوی بچووکیش سکیتیس. ژنە وەبیر داخوازییەکانی ئیراکلیس کەوتەوە و داوای جێبەجێکردنیانی لە کوڕەکان کرد. دوو کەس لە مناڵەکان واتە ئاغاتیرسۆس و پێلۆنۆس نەیانتوانی لە تاقیکاریەکاندا سەرکەوتوو بن، بۆیە لە وڵات ڕۆیشتن، هەڵبەت دایکیان دەریکردن. سکیتیس بەڵام، هەرچەند بچووک بوو، لە تاقیکاریەکاندا سەرکەوت و لەوێ مایەوە. لە سکیتیس کە کوڕی ئیراکلیسە، شاهانی سکیتی وەپاش کەوتن و بۆیە ئێستاش زنگوڵە بە کەمبەرەوە هەڵداوەسن. دەگێڕنەوە کە هۆی قەومانی گشت ڕووداوەکان، دایکی سکیتی بووە. بەهەرحاڵ ئەوە بۆچوونی یۆنانییەکانی دانیشتووی هەرێمی پۆندۆس لەمەڕ سەرچاوەی ڕەگەزی سکیتیەکان بوو.

[١١] لەو بارەوە بۆچوونێکیتریش هەیە کە پتر جێگای باوەڕی منە. خێڵەکانی سکیتی، ئەوانەی ئەمڕۆ لە ئاسیا نیشتەجێن، زەختی ماساغێتیەکانیان[١] لەسەر بووە و بەردەوام لە شەڕدا بوون. سکیتیەکان لە چۆمی ئاراکس[٢] پەڕیونەوە و هاتوونەتە وڵاتی کیمێری (ئەو خاکەی ئێستا سکیتیەکان لێی دانیشتوون، دەگووترێ کە پێشتر مڵکی کیمێریەکان بووە). کیمێریەکان وەختێک دیتیان سکیتیەکان بە لەشکرێکی زۆرەوە هاتوون و لەشەڕن، سەرۆک هۆزەکانیان کۆبوونەوە و گرفتەکەیان تاووتوێکرد.

دوو بۆچوون پتر سرنجڕاکێش بوون، بەڵام مێرانەترین هەڵوێست پاشاکان گرتیان. جەماوەر بەو قەناعەتە گەیشتبوون کە دەبێ بڕۆن و وڵات جێبهێڵن و خۆیان تووشی شەڕ لەگەڵ لەشکری ئەو دوژمنە گەورەیە نەکەن. بەپێچەوانەوە، پاشاکان لەو باوەڕەدا بوون کە خەڵک لەجێی خۆی نەبزوێ و وڵاتەکەیان بپارێزن. هیچ لایەنێک لە بۆچوونی خۆی پاشگەز نەبۆوە. نە خەڵک ڕای پاشاکانیان قبوڵ کرد و نە پاشاکان هەڵوێستی خەڵکیان بەلاوە

---

١- ماساغێتی، هۆزێکی سکیتی یا سکایی دانیشتووی قەراخ ڕووباری ئێکسۆس (ئامور دەریا).

٢- چۆمی ئاراکس، یا ڕووباری ئەرەس.

پەسند بوو. خەڵک بڕیاریدا وڵات چۆڵ بکات، بەبێ ئەوەی بەرگری لەخۆی نیشان‌بدا و خاکەکەی بۆ سکیتی‌یەکان جێهێڵێ. پاشاکان لەسەر ئەوە ساغ بوونەوە وەدوای خواستی جەماوەر نەکەون، بەڵکوو لەسەر خاکی خۆیان بکوژرێن و بنێژرێن. ئەوان بە مانەوە و کوژرانیان لە وڵاتەکەیاندا هەستیان بە بەختەوەری دەکرد و رەوکردنیش بە شەرمەزاری. پاشاکان کاتێک بڕیاری کۆتاییان دا، بەسەر دوو دەستەی هاوشاندا بەش بوون و لەنێو خۆیاندا، یەکتریان کوشت. خەڵکی کیمێری جەنازەکانیان کۆکردنەوە و هەرهەموویان لە قەراخ چۆمی تیری[1] ناشت (ئێستاش گۆڕەکانیان ماون). خەڵک پاش بەخاکسپاردنی پاشاکان رێگای کۆچبەرییان گرتەبەر. وەختێک ئەو سکیتی‌یانە گەیشتنە ئەو دەڤەرە، بەسەر وڵاتێکی وێراندا کەوتن.

[١٢] تاکوو ئەمڕۆش دیوار و کاناڵی کیمێری[2] و ناوچەیەک ناسراو بە کیمێریا وەک خۆیان ماون. کیمێریەکان بەو شێوەیە لەدەست سکیتی‌یەکان رایان‌کرد و چوونە ئاسیا و لە نیمچەدورگەیەک دامەزران، واتە لەو جێگایەی ئەمڕۆ شاری سینۆپی لێهەڵکەوتووە. ئەوەش هەروەها بەتەواوی روون‌بووەتەوە کە سکیتی‌یەکان ئەوکاتەی خەریکی دەرکردنی کیمێری‌یەکان بوونە، بەهەڵە پەلاماری وڵاتی (میدیا)یان داوە. هەڵبەت لەڕووی نەزانینەوە ئەو رێگایەیان گرتووەتەبەر. کیمێری‌یەکان بەقەراخ دەریاکاندا رۆیشتوون، لەحاڵێکدا سکیتی‌یەکان راست لە کاتی دەرکردنی کیمێری‌یەکان، کەوتوونەتە ناوچەیەک کە هەرێمی قەفقاز لەقۆڵی راستیان جێیگرتووە. ئەو لەشکرە سکیتی‌یە پاش دەربازبوون بە رێگای ویشکاییدا، هاتوونەتە نێو خاکی وڵاتی میدیا. دەبێ بڵێم کە ئەوە بۆچوونی یۆنانی‌یەکان و بەربەرەکانە.

[١٣] ئاریستێ‌ئاس، کوڕی کائیسترۆڤیۆس و خەڵکی پرۆکۆنیسۆ لە نووسینێکێ خۆیدا باس‌دەکا وەختێک هەستی بە مەترسی کردوە، چووەتە

---

١- چۆمی تیری یا تیراس، وێدەچێ روباری دنیستێری یا دنیسترۆی ئەمڕۆ لە روسیا بێ. ئەو روبارە لە چیاکانی کارپاتیا، لە رۆژهەلاتی ئوروپاوە سەرچاوە دەگرێ و دەرژێتە ئێڤکسینۆپۆندۆ(دەریای رەش).

٢- کاناڵی کیمێریا، ئەورۆ ناسراوە بە یەنی‌کالە.

لای خەڵکی ئیسیدۆنی. دوور لە خاکی ئیسیدۆنی‌یەکان، خەڵکی ئاریماسپۆسی ژیاون. ئاریماسپۆسی‌یەکان تەنیا یەک چاویان هەبووە. واوەتر لەوانە غریپی‌یەکان (بوونەوەرێکی نیوە شێر و نیوە باڵندە) هەن کە کاریان پاراستنی زێڕە. وەختێک لەوانە دوورتر دەکەوینەوە، تووشی خەڵکانی ئیپێرڤۆری (هۆزەکانی باکوور) لە نیزیک دەریا دەبین. ئەوانە نیشتەجێ لە قەراخ ئەقیانووسی سەهۆڵاوی باکوورن (بەواتایەک خەڵکێکی قوتبی‌ین).[1] جیا لە ئیپێرڤۆری‌یەکان گشت گەلانی‌تر، بە دەستپێکی ئاریماسپۆسی‌یەکان، بەردەوام شەڕیان لەگەڵ دراوسێکانی خۆیان کردوە. بە چەشنێک کە ئاریماسپۆسی‌یەکان سەرەتا ئیسیدۆنی‌یەکانیان لە وڵاتی خۆیان دەرکردوە، ئەوجار ئیسیدۆنی‌یەکان پەلاماری سکیتی‌یەکانیان داوە، پاشان سکیتی‌یەکان هێرشیان کردووەتە سەر کیمێریەکان و ئەوانیان ڕاوناوە. کیمێریەکان لە نیزیک دەریای باشوور ژیاون و ناچاربوونە وڵاتەکەیان چۆڵبکەن. بەو شێوەیە ئاریستێ‌ئاس لەگەڵ ئەو بۆچوونە نییە کە سەبارەت بەو وڵاتە لەلایەن خۆیانەوە باسکراوە.

[١٤] سەبارەت بە ڕەچەڵەکی ئاریستێ‌ئاس قسەم کرد. ئەو کابرایە شاعیری سەردەمی خۆی بووە. ئێستا لەسەر ئەو بەشە دەدوێم کە لە ناوچەکانی پرۆکۆنیسۆ و کیزیکۆ، چۆن باسی ناوبراو دەکرێ. دەگێڕنەوە کە ئاریستێ‌ئاس سەر بە بنەماڵەیەکی فرە ناسراوی پرۆکۆنیسۆ، ڕۆژێکیان لە جۆلایەک وەژوور دەکەوێ و هەر لەجێوە دەمرێ. جۆلاکە کارگەی تەونچنی دادەخا و بەرەو ماڵی ئاریستێ‌ئاس غاردەدا و خەبەری مردنی ئەویان بۆدەبا. ئەو خەبەرە هاوکات لەنێو ئاواییشدا بڵاودەبێتەوە. کەسێکی خەڵکی کیزیکۆ ئەو هەواڵە وەدرۆ دەخاتەوە و دەڵێ وەختێک لە شاری (تارتاکی)یەوە بەرەو ئێرە واتە شاری کیزیکۆ[2] هاتووە، لە ڕێگادا چاوی بە ئاریستێ‌ئاس کەوتووە.

---

١- هێرۆدۆت لە شوێنی‌تریش دەریای ڕەشی بەناوی دەریای باکوور ناوبردوە.

٢- شارێکی ئاسیای بچووک لە سەردەمی باستاندا و گرینگ لە باری نیزامییەوە لە کەنارئاوەکانی دەریای مەدیترانە.

تەنانەت قسەشی لەگەڵ کردوە. کابرای کیزیکی بەهێمنی و متمانەوە باسی ئەو تووش هاتنەی کردوە، لەحاڵێکدا کەسوکاری ئاریستیئاس بەپەلە بەرەو کارگەی کابرای جۆلا چوونە و وەک دەگێڕنەوە، دارەمەیتیشیان پێبووە. درگای کارگەیان کردوەتەوە و ئاریستیئاس نە بە مردوویی و نە بە زیندوویی لەوێ نەبووە. پاش حەوت ساڵان، ئاریستیئاس دوبارە گەڕاوەتەوە شاری پرۆکسێنیۆ و لەوێ دیوانە شێعرێکی نووسیوە و یۆنانییەکان ناویان لێناوە: "ئاریماسپیا ". هەرکە ئەو دیوانە شێعرەی نووسیوە، جارێکی دیکەش بێسەر و شوێن چووە.

[١٥] زانیارییەکان لە دوو شاردا سەبارەت بە ناوبراو هاتوونەبەرباس. هەڵبەت من خۆم دەزانم کە لە مێتاپۆندیۆ[١]، سەر بە وڵاتی ئیتالی کۆمەڵێک رووداو قەوماون، ئەویش دووسەد و چل ساڵ دوای دوهەمین ونبوونی ئاریستیئاس. من بە هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوەی ئەو زانیارییانەی لە هەرێمەکانی پرۆکۆنیسۆ و مێتاپۆندیۆ بیستبووم، دەمتوانی مەزەندەیەک بکەم. دانیشتووانی مێتاپۆندی دەڵێن کە ئاریستیئاس لە سەردەمی خۆیدا هاتووەتە لایان و داوای لێکردون قوربانگە بۆ پەرستگەی ئاپۆلۆنا[٢] دروستبکەن و هەروەها لە تەنیشت پەیکەرەی خواوەند ئاپۆلۆن، پەیکەرەی ئەویش دانێن و ئیمزای خۆی واتە ئاریستیئاسی پرۆکۆنیسۆیی لەسەر هەڵکەنن. ئاریستیئاس پێیگوتوون کە یەکەم جەماوەری یۆنانی دانیشتووی ئیتالی بوونە و خواوەند ئاپۆلۆن هاتووەتەلایان و خۆی لەگەڵ ئەو خوایە پێکەوە هاتوون.

ئەو کەسەی ئێستا وەک ئاریستیئاس دەیناسن و ئەو سەردەمە لەگەڵ خواوەند ئاپۆلۆن دەخولایەوە، تەنیا یەک خەرتەل بووە و بەس. بەهەرحاڵ، ئاریستیئاس داوای خۆی بە ئیتالییەکان گوتووە و خێرا ونبووە.

---

١- مێتاپۆندیۆ، یەکێک لە شارەکانی باشووری ئیتالیا لە قەراخ ئاوەکانی کەنداوی تاراند.

٢- ئاپۆلۆنا یا ئاپۆلۆن، کوڕی خواوەند دیا (ژوپیتێر) و ژونون، خوای شێعر و موسیقی و نیشانەی جوانی.

میتاپۆندی‌یەکان دەگێڕنەوە کە کاتی‌خۆی ڕاسپاردەیان ناردوەتە نێوەندی ئایینی دێلفوس[1] و لە کاهێنانی مەزنیان پرسیوە ئاخۆ داواکانی ئاریستی‌ئاس جێبەجی‌بکەن یاننا. کاهێنی مەزن وڵامی داونەتەوە کە بەقسەی بکەن و ئەوەش بە قازانجیان تەواو دەبێ. میتاپۆندی‌یەکان وڵامی راسپاردەیان پەسندکردوە. ئەمڕۆ یەکێک لە پەیکەرەکانی ئاریستی‌ئاس وەک خۆی ماوە و ئیمزای ئەوی لەسەرە و لە تەنیشت پەیکەرەی خواوەند ئاپۆلۆن داندراوە و لە دەوری ئەو پەیکەرانە پۆرێک داری تیرۆ (کەرکوژە) چێندراون. ئەو پەیکەرەیە لە نێوەندی شار واتە لە بازاڕ جێیگرتووە.

ئەوە کۆمەڵە زانیارییەک سەبارەت بە ئاریستی‌ئاس بوون.

**[١٦]** لە پێوەندی لەگەڵ ئەو وڵاتەی دەستم بە لێدوان کردوە، هیچکەس زانیارییەکی ئەوتۆی نییە کە لەو شوێنە چ دەقەومێ. ئاگاداری ئەوەش نیم کە کەسێک سەردانی ناوچەکەی کردبێ. تەنانەت ئاریستی‌ئاس خۆیشی کە پێشتر ناوم‌هێنا. لە شێعرەکانی‌دا ناڵێ بەچاوی خۆی ئەو هەرێمەی هەڵکەوتوو لە واوەتری ئیسیدۆنی‌یەکانی بینیوە. ئەو دەڵێ گشت زانیارییەکانی هەمووی لە زمانی ئیسیدۆنی‌یەکانەوە بیستووە.

بەهەرحاڵ من لێرەدا باسی ئەو کۆمەڵە زانیارییانە دەکەم کە دوای ساڵانێکی زۆری توێژینەوە، دەستم کەوتوون و دەکرێ بڵێم تۆزێک لە ڕاستی نیزیکن.

**[١٧]** لە نێوەندی بازرگانی ڤۆریس‌تێنیتۆ[2] هەڵکەوتوو لە نێوەڕاستی بەشی کەناری وڵاتی سکیتی‌یەکان بەولاوە، سەرەتا چاوت بە خەڵکی کالیپیدی دەکەوێ کە سکیتی یۆنانی‌ین. دوورتر لەوانە خەڵکانێکی‌تر هەن، پێیان‌دەگووترێ ئالیزۆنی. کالیپیدی‌یەکان و ئالیزۆنی‌یەکان، هاوشێوەی سکیتی‌یەکان دەژین، بەو جیاوازییەی ئەوانە بە کشتوکاڵەوە مژۆڵن و

---

١- دێلفوس، یەک لە شارەکانی ناسراوی یۆنانی باستان، لە داوێنی چیای پارناسۆس یا پارنیسۆس هەڵکەوتووە.

٢- ئەو نێوەندە لە قەراخ چۆمی نیپری دروستکرابوو.

دەغڵودان دەخۆن و پتر پیواز و سیر و هەرزن دەچێنن. دوورتر لە ئالیزۆنییەکان، خەڵکی وەرزێڕی سکیتی نیشتەجێن. ئەوانە گەنم جیا لە پێویستی خۆیان، بۆ فرۆشتنیش دەچێنن. لە ناوچەکەی سەرووی ئەوانە، هۆزی نیڤری[1] دەژین. لە نیڤرییەکان کە دوور دەکەوینەوە و بەرەو باکوور دەچین، ئەوەندەی من بزانم وڵاتەکە پتر چۆلەوارە. تا ئێرە باسی ئەو کۆمەڵە خەڵکانە بوو کە لە قەراخەکانی رووباری ئیپانیس دەژین و دەکەونە رۆژئاوای دەڤەری ڤۆریستێنیس.

[١٨] هەرکەس بە ناوچەی ڤۆریس‌تێنیس‌دا تێپەڕێ و لە دەریاوە وەڕێکەوێ، لەپێشدا چاوی بە دەڤەری بیلیئا دەکەوێ و دوورتر لەو هەرێمە، دەگەینە ناوچەی نیشتەجێیی وەرزێڕانی سکیتی. یۆنانییەکان ئەو وەرزێڕانەی لە قەراخ چۆمی ئیپانیس[2] دەژین، بەناوی ڤۆریس‌تێنیسی دەناسن. وەرزێڕانی سکیتی لە ناوچەیەکدا دەژین کە لەلای رۆژهەڵاتەوە سێ رۆژ رێگایە و دەگاتە چۆمی پاندیکاپیس[3]. بەلای باکوردا یازدە رۆژ رێگا و بەرەو ژوور دەبێتە هەرێمی ڤۆریس‌تێنیس. دوورتر لەو شوێنە دەگەینە چۆلەوارێک و پاشان بەسەر خەڵکانی ئاندرۆفاغییەکاندا دەکەوین و لەباری رەگەزییەوە، نەتەوەیەکی جیاواز لە سکیتییەکانن. لە واوەتری ئەو خەڵکەی دواییش، ئەوەندەی من بزانم، بیابان و چۆلەوارە و هیچکەسێکی لێ‌ناژی.

[١٩] لەوبەری چۆمی پاندیکاپیس، بەرەو رۆژهەڵات و دوای وڵاتی وەرزێڕانی سکیتی، کۆمەڵێک خێڵی سکیتی هەن. ئەوانە کشتوکاڵ ناکەن و بە زەوی کێڵانەوە مژوڵ نابن. ناوچەکەیان داری لێدەست ناکەوێ و تەنیا چەشنە دەوەنێکی کێوی بەناوی ئیلیئا هەیە. شوێنی نیشتەجێیی ئەو خێڵانە وڵاتێکە بەرەو رۆژئاوا راکشاوە و بە قەیاس چواردە رۆژ رێگا دەبێ، تا دەگاتە رووباری یێرو.

---

١- نیڤری، خەڵکانی سارماتی یا سارۆماتی، لە بەشێکی لیتوانی ئەمڕۆ دەژیان.

٢- وێدەچێ ناوی کۆنی روباری بووکی ئەمڕۆ بێ.

٣- چۆمی پاندیکاپیس، وێدەچی لکێکی روباری ڤۆریس‌تێنیس بێ.

[۲۰] دوورتر لە ڕووباری بێرو، ناوچەیەک بەرچاو دەکەوێ کە دەگووترێ ملکی پاشایە و لەوێش پتر سکیتییەکانی سەر بە چینی بالادەست دەژین و ئەوانە سکیتییەکانیتر وەک کۆیلەی خۆیان سەیردەکەن و هەم حەشیمەتیان زۆرترە و هەمیش جوامێر و شەڕکەرترن. شوێنی ژیانی ئەوانە بەلای باشووردا دەگاتە دەڤەری تاڤرۆ. لەلای ڕۆژهەلاتیش تا ئەو خەندەکە ڕاکشاوە کە بەدەست کوڕانی کۆیلە کوێرەکان هەلکەندراوە. لەوێشەوە بۆ نێوەندی بازرگانی بەردەوامە و سەر بە گۆلی مێئۆتیدا و ناسراوە بە کریمنی. ولاتی ئەوانە تا چۆمی تانائیس[1] بەربلاوە. جیا لە هەرێمی سکیتییەکانی شازادە لە باکوور، خەلکی مێلانخلێنی دەژین. ئەوانەش ڕەگەز و هۆزی جیاوازن و سکیتی نین. دوورتر لە مێلانخلێنییەکان ئەوەندەی ئێمە ئاگادار بین، خەلکانێک هەن کە خاوەن کۆمەلێک گۆلیئاون.

[۲۱] وەختێک پیاو لە چۆمی تانائیس پەڕییەوە، لەوبەر چۆم چاوی بە ولاتی سکیتی ناکەوێ. یەکەم شوێن کە تووشی دێت، ولاتی ساڤرۆماتەکانە. ئەو دەڤەرە لە کۆتایی گۆلی (مێئۆتیدا)وە دەستپێدەکات، بەرەو باکوور ڕادەکشی و مەوداکەی پازدە ڕۆژ ڕێگا دەگرێ. لەوێ دارستان و باغات بەرچاو ناکەوێ. دوورتر لەو هەرێمە، ئەوجار دەگەینە ولاتی بوودینەکان و خاکەکەی بە دارستانی چڕ داپۆشراوە.

[۲۲] لە ولاتی بوودینییەکانەوە بەرەو باکوور، سەرەتا دەگەینە بیابانێکی چۆل کە حەوت ڕۆژ ڕێگایە. پاش ئەو چۆلەوارە ئەگەر ڕێگای بەرەو ڕۆژهەلات بگرینەبەر، دەگەینە هەرێمێک کە تیساگێتییەکان لێینیشتەجێن. ئەو خەلکە بە حەشیمەت گەلێک زۆرن و هۆزێکی جیا و گەورە و بە ڕاو و شکار دەژین. دراوسێی ئەوانە خەلکانێکن بەناوی ئیئیرکانی و بژیویان لەڕێگای ڕاوکردنەوە دابیندەبێ. ئەوانە بەو چەشنە ڕاو دەکەن: ڕاوچی وەسەر دارێک دەکەوێ، دیارە ولاتەکەیان بە دارستان داپۆشراوە. ئەسپی ئەو ڕاوچییە گەلێک بەهێزە و بەچەشنێک ڕاهێنراوە کە لەسەر تەنیشت

---

۱- تانائیس، ناوی کۆنی ڕوباری (دۆن)ی ئەمڕۆیە.

رادەکشێ، بۆوەی لەبەر چاوان ونبێ. سەگی کابراش هەر بەو شێوەیە هەڵسوکەوت دەکات. کابرای راوچی لەسەر دارەکەوە، هەرکە چاوی بە نێچیر کەوت، تیرێکی داوێتێ و ئەوسا خێرا سواری ئەسپەکەی دەبێ و وەدوای نێچیر دەکەوێ. جیا لە ناوچەی ئەوانە، رێگای خوار بەرەو رۆژئاوا، پیاو دەگەیێنێتە ئەو هەرێمەی کە سکیتیەکانی لێدەژین. ئەو جەماوەرەی دوایی کاتی خۆی دژی شازادە سکیتییەکان راپەڕین، هەڵبەت دوای قەومانی ئەو رووداوە پەڕیوەی ئەو هەرێمە بوونە و ئێستا لەوێ دەژین.

[٢٣] تا دەگەینە وڵاتی ئەو سکیتییانەی ئێستا باسم کردن، چی دەشتایی کە خاکی پڕبەرووبومی هەبێ، ناوم هێناون. لەوانە بەولاوە، وڵات دەبێتە شاخ و رەوەز. وەختێک پیاو مەودایەکی زۆری لەو شوێنە بەردەڵان و حاستەمە، ئەوسا دەگاتە کۆمەڵێک چیای بەرز. خەڵکانێک لێرە دەژین کە دەگووترێ ژن و پیاویان هەر لە کاتی لەدایکبوونەوە، کەچەڵ و سەرڕووتن. کەپۆیان پانە و چەناگەیان درێژ و گەورەیە. خاوەن زمانی تایبەت بە خۆیانن و جلوبەرگی چەشنی سکیتییەکان دەپۆشن و بە خواردنی میوەی دارستان بەڕێدەچن. دارێک لەو دەڤەرە هەیە کە ناسراوەبە پۆندیکۆ. ئەو دارە لە قەوارەدا زۆر زلە و وەک داری هەنجیر دەچێ. میوەکەی بەقەرا باقلە دەبێ و دەنکی هەیە. کاتێک ئەو میوەیە دەگاتێ، لەنێو پارچەیەک قوماش دەکرێ، وردی دەکەن و دەیشێلن و ئاوەکەی خەست و رەشە و پێیدەڵێن ئاسخی. ئەوانە عادەتیانە ئەو ئاومیوەیە لەخۆیان هەڵسوون، یا لەگەڵ شیر تێکەڵی بکەن و بیخۆنەوە. لە تڵتە و توێڵکی میوەکە کوللێرە دروستدەکەن و دەیخۆن. لە وڵاتی ئەو سکیتییانە ئاژەڵداری باونییە. هەرکەسە بە جیاواز کەپرێکی لەژێر دار هەیە و تێیدا دەژی و لە وەرزی زستاندا بە لبادی سپی دایدەپۆشن و هاوینان دووبارە لای دەبەنەوە. هیچکەس ئازار بەو خەڵکە ناگەیێنێ و وەک مرۆڤی ئایینی سەیریان دەکەن. ئەوانە خاوەن چەکوچۆڵی شەڕ نین و زۆر جاریش نێوبژیوانی شەڕێ دراوسێکان دەکەن. ئەگەر

کەسێک پەنا بۆ ئەوانە بەرێ، ئیتر هیچکەس ناتوانێ ئەو پەنابەرە دادگایی و تاوانبار بکا. ئەوانە پێیان‌دەگووترێ هۆزی ئارغی‌پێیی.

[٢٤] تا هەرێمی ئەو خەڵکە کەچەڵە، ناوچەکە و ئەو گەلانەی تووشیان هاتین، گشتیان تەواوێک ناسراون. لەبەر ئەوەی ژمارەیەک لە سکیتی‌یەکان سەفەری ئەو شوێنانە دەکەن و دژوار نییە زانیاری لەبارەیانەوە دەستکەوێ. هەڵبەت ئەو یۆنانی‌یانەش کە لە بەندەری ڤۆریستینی و ناوچەکانی‌تری پۆندۆ (دەریای رەش) سەفەر بۆلای ئەو گەلانە دەکەن، پیاو بۆی دەلوێ زانیارییان لێوەرگرێ. هەڵبەت ئەوەش بڵێم کە ئەو سکیتی‌یانەی بەرەو ئەو دەڤەرانە سەفەر دەکەن، ناچارن حەوت کەسی دیلمانج لەگەڵ خۆیان بەرن، چونکە بە حەوت زمانی جیاواز قسەدەکەن.

[٢٥] تا ئەو ناوچانە زانیاریمان لەبەر دەستدا هەیە، بەڵام دوورتر لەوانە واتە لە هەرێمی کەچەڵەکان بەو لاوە، کەس ناتوانێ شتێک بڵێ ئاخۆ چی لەگۆڕێدایە، چونکە کۆمەڵێک چیای بەرز هەن و کەس پێیاندا دەرباز نەبووە و بۆ پێهەڵگەڕان گەلێک دژوارن و مرۆڤ ناتوانێ رێگە ببڕێ. ئەو خەڵکە کەچەڵە خۆیان دەڵێن و من باوەڕم بە قسەکانیان نییە، واتە خەڵکانێک لە واوەتری ئەوان و لەو شاخانە دەژین و خاوەن لاق و سمی بزنن و دوورتر لەوانیش، ئەو مرۆڤانە نیشتەجێن کە ساڵێ شەش مانگ لە خەودان. من ناتوانم باوەڕ بەو زانیارییانە بکەم. ئێمە هەروەها دەزانین کە دوورتر و بەلای رۆژهەڵاتی کەچەڵەکاندا، خەڵکی ئیسیدۆنی دەژین، بەڵام لەمەر چیاکان کەس زانیارییەکی ئەوتۆ دروستی لادەسناکەوێ، تەنانەت لەمەر کەچەڵەکان و ئیسیدۆنی‌یەکانیش زۆر ئاگادار نین، تەنیا ئەوەندە نەبێ کە خۆیان باسی دەکەن.

[٢٦] دەڵێن کە خەڵکی ئیسیدۆنی خاوەن ئەو دابونەریتەن: کاتێک باوکێک دەمرێ، هەرکەس لە خزمانی مردو، ئاژەڵێک دێنێ. ئەو ئاژەڵانە دەکەنە قوربانی و کوتکوتی دەکەن. کەلاکی کابرای مردووش هەربەو چەشنە لەتوپەت دەکەن. پارچە گۆشتەکان تێکەڵ‌دەکرێن و خوادنیان لێ‌سازدەکرێ و

لە نێوەڕاستی مەیدانی ئاوایی، میوانداری لەسەر دەکرێ. سەری کابرای مردوو پاک و خاوێن دەتاشن و نێوەکەی خاوێن دەکەنەوە. ئەو سەرە ئاوزێڕ دەکەن و چەشنی پەیکەرە دایدەنێن و ساڵێ جارێک قوربانی بۆ دەکەن. منداڵ بەو چەشنە قەدری باوکیان دەگرن، هەروەک یۆنانی‌یەکان کە ساڵڕۆژی مەرگی ئازیزانیان دەکەنەوە.

خەڵکی ئیسیدۆنی لەنێو خۆیاندا تەواو دادپەروەرن و ژن و پیاویان خاوەن مافی یەکسانن.

**[۲۷]** بەهەرحاڵ ئێمە ئەوانە بەو چەشنە دەناسین. واوەتر لە ئیسیدۆنی‌یەکان و بەرەو باکوور، دەگووترێ کۆمەڵێک مرۆڤی لێدەژین کە گشتیان خاوەن یەک چاون و ناویان گریپی و کاریان پاراستنی زێڕە. سکیتی‌یەکان لەوانەوە زانیارییان دەسکەوتووە و ئێمەش و خەڵکانی‌تریش لە سکیتی‌یەکانەوە پێمانگەیشتووە. سکیتی‌یەکان بەو کۆمەڵە خەڵکە دەڵێن ئاریماسپی و ئەوەش وشەیەکی سکیتی‌یە. ئاریما لە زمانی سکیتیدا واتای یەک و سپۆ مانای چاو دەدا.

**[۲۸]** لە سەراسەری ئەو وڵاتەی باسم کرد، زستان گەلێک سارد و سەختە. هەشت مانگ لە ساڵدا سارد و تاقەت پروکێنە و تەنانەت ئەگەر ئاویش بڕژێتە سەر عەرز، وڵات نابێتە قوڕ و چلپاو و گشتی بەستوویەتی. پیاو بۆوەی قوڕ بگرێتەوە، پێویستە ئاگرداگیرسێنێ. ئاوی بەحر تەواو دەیبەستێ، تەنانەت بۆسفۆری کیمێری‌یەکانیش دەبێتە یەکپارچە سەهۆڵ. سکیتی‌یەکانی لە دەرەوەی خەندەکەکان دەژین، بە فایتوون و عەرەبانە بەسەر سەهۆڵدا دەچنە وڵاتی سیندی‌یەکان[۱]. بەگشتی هەشت مانگ زستان و چوار مانگی دواییش هەوا هێندیک ساردە. لەو هەرێمانە زستان وەک هیچ شوێنێکی‌تر نییە و تەواوێک جیاوازی لەگەڵ وڵاتانی‌تر هەیە. لە زستاندا باران ناباری و لە هاویندا راوەستانی بۆ نییە. لە وەرزێکدا کە لە جێگای‌تر رێژنە و هەورەتریشقە دەبینین، لەو ناوچەیە دیاردەی ئەوتۆ بەدیناکرێ، بەڵام لە

۱- نیمچە دورگەی سیند و هەرێمی ئاناپا بووە.

هاویندا گەلێک زۆره. ئەگەر لە زستاندا بارانی بە خوڕین بباری، ئەوە وەک نیشانەیەکی خوایی سەیردەکری. لەمەر بومەلەرزەش هەر بەو چەشنەیە، جا چ لە زستاندا بێ یا لە هاویندا، بەلای سکیتی‌یەکانەوە ئیزنی خوای لەسەره. ئەسپەکانیان بەرگەی سەرما دەگرن، بەلام کەر و هێستر نا. لە ولاتانی‌تر، ئەسپەکان لەبەر سەرما رەقهەلدێن، بەپێچەوانەوە کەر و هێستر دەرەقەتی سەرمای ولاتەکە دێن.

**[۲۹]** من پێموایە هەر لەبەر ئەو سەرمایە گای بێ‌شاخ لەو ولاتە زۆره. یەک لە شێعرەکانی ئۆمیرۆس لە دیوانی ئۆدیسەدا ئاوا دەلێ:

لە لیبی، لەو ولاتەی بەرخۆلەی شاخدار لەدایکدەبن.

ئەو راستدەکا. لە ولاتی گەرم شاخەکانی ئاژەل پتر گەورە دەبن و بەپێچەوانەی شوێنی سارد کە شاخ ناروێنن یا گەلێک بچووکن.

**[۳۰]** لەبەر گەرما، ئەو کۆمەلە ئالوگۆرە دەخولقێن، هەلبەت شتێک بەلای منەوە فرە جێگای تێرامانە ( لە سەرەتای توێژینەوەکەمدا لەبیرم چوو بیلێم)، لە سەراسەری ولاتی ئیلیادا[1] هەرچەند هەوا سارد نییە و هۆیەکی روون و ئاشکراش بەرچاو ناکەوێ، بەوحالەش دەبینین کە هێستر لەدایک نابن. خەلکی ئەوێ خۆیان لەو باوەڕەدان کە خواوەند ئەوانی بە لەعنەت کردوە. خەلک لەڕووی ناچاری ماینەکانیان لەکاتی بەفالبووندا دەبەنە ولاتانی دراوسێ و کەریان لێدەکێشن بۆوەی ئاووس‌بن. دوایە ماینی سکپڕ دێننەوە ولاتی ئیلیا.

**[۳۱]** سەبارەت بە پەڕ کە سکیتی‌یەکان باسی دەکەن و دەلێن هەوا تژی لە پەڕ دەبێ و پیاو چاوی نابینێ و ناتوانێ رێگا ببڕێ، من خۆم لەو باوەڕەدام: لەو ولاتە بەردەوام بەفر دەبارێ، دیارە لە وەرزی هاویندا، لە هەلسەنگاندن لەگەل زستاندا تۆزێک کەمترە و ئەوەش دیاردەیەکی سروشتی‌یە. هەرکەس لە نیزیکەوە چاو لە بارینی بەفر بکا، لە مەبەستی من

---

۱- ئیلیا، شارێکی کۆنی یۆنانی باستان لە هەرێمی ئێئۆلی. هەلبەت شارێکی‌تریش بەو ناوە لە ئیتالیا هەیە کە بەهۆی موهاجیرەکانی فۆکی دروستکرابوو.

حاڵی دەبێ. بەفر چەشنی پەڕی باڵدارەکانە و لەبەر ئەوەی زستان گەلێک ساردە، خەڵک ناتوانن لە ناوچەکانی باکووریی ئەو وڵاتە بژین. بەو هۆیە، سکیتی‌یەکان و دراوسێکانیان باس لە بارینی پەڕ دەکەن، لەڕاستیدا مەبەستیان هەمان بەفربارینە. ئەوەش کۆمەڵێک زانیاری لەمەر ئەو وڵاتە دووردەستانە.

**[٣٢]** سەبارەت بە وڵاتانی باکوورتر، نە سکیتی‌یەکان و نە خەڵکانی ناوچە شتێکی تایبەتییان لەبارەیانەوە نییە بیڵێن، تەنیا ئیسیدۆنی‌یەکان نەبێ. دیارە ئەوانیش بەباوەڕی من زانیارییەکانیان ئەوەندە جێگای سرنج نییە. چونکە ئەگەر ئەوان شتێکی ئەوتۆیان هەبوایە، بەدڵنیاییەوە سکیتی‌یەکان باسیان دەکرد، وەک چۆن باسی مرۆڤە یەکچاوەکان دەکەن. تەنیا کەسێک کە لەمەر باکوورییەکانی دووردەست شتێکی هێنابێتە گۆڕێ، هەر ئەو ئیسیدۆنی‌یانە بوونە. ئۆمیرۆس، ئەویش لە کتێبی ئێپیغۆنۆس باسێک دەکات، دیارە ئەگەر راست بێ کە خۆی ئەو کتێبەی نووسیوە.

**[٣٣]** زانیاری پتر سەبارەت بە خەڵکانی دانیشتووی باکووری دوردەست لەلایەن خەڵکی نیشتەجێ لە هەرێمی دیلۆس[1] دەست دەکەوێ. ئەوانە دەڵێن کە کەرستەی پیرۆز و موقەدەس لە خەڵکانی باکووری دووردەست چەشنی دیاری و دروستکراو لە کا و قەسەڵ وەردەگرن و پاشان دەیدەنە سکیتی‌یەکان. سکیتی‌یەکانیش بەنۆرەی خۆیان ئەو کەرستە پیرۆزانە بۆ دراوسێکانیان بەڕێدەکەن و بەهۆی ئەوانیشەوە دەگاتە رۆژئاوای دەریای ئادریاتیک و لەوێوە بۆ باشوور بەڕێدەکرێن. یەکەم خەڵکانێکی یۆنانی کە ئەو کەرستانە وەردەگرن، دۆدۆنی‌یەکانن[2]. ئەوانەش هەروەها گشتی دەنێرنە کەنداوی مالیاکۆ و لەوێوە بەرەو هەرێمی ئێڤیا دەچن. لە ئێڤیاوە شارە و

---

١- دیلۆس، یەکێک لە کۆمەڵە دورگەکانی یۆنانی و بەپێی چیرۆکە ئەفسانەییەکان مەوتەنی خواوەند ئاپۆلۆن و دیانا بووە و وەک نێوەندی هاتووچۆ لە قەراخ ئاوەکانی دەریای مەدیترانە ناوبانگی دەرکردوە.

٢- دۆدۆنیس لە هەرێمی ئێپیر هەڵکەوتووە و شوێنی مانەوەی یەکێک لە کاهێنانی مەزنی خواوەند دیا (ژوپیتێر) بووە.

شار و دەستاودەست بەڕێدەکرێن تا دەگەنە شاری کاریستۆ، بەبێ ئەوەی بەرەو دەڤەری ئاندرۆ بنێردرێن، چونکە کاریستی‌یەکان ڕاستەوخۆ ئەو کەرستانە دەبەنە تینۆ و بەهۆی دانیشتووانی ئەوێشەوە دەگەنە دەست خەڵکی دیلۆس.

خەڵکی دیلۆس بەو چەشنە باسی گەیشتنی کەرستەکانی ئایینی دەکەن کە چۆن دەگەنە دورگەکەیان و یەکەم جاریش بە چ شێوەیەک خەڵکانی دانیشتووی باکووری دووردەست ئەو شتانەیان ناردوە. ئەوان دەڵێن جاری یەکەم ئەو کەرستانە بە دوو قەیرە کچدا، بە ناوەکانی (ئیپێرۆخی و لائۆدیکی)دا بەڕێکراون و لەبەر باری ئەمنی و پاراستنی گیانی ئەو دوو ئافرەتە، دانیشتووانی باکوور ناچار بوونە پێنج کەس لە پیاوانی خۆیان لەگەڵ ئەوانەدا بنێرن. ئەو پێنج کەسە ئەمڕۆ ناسراون بە پێریفێریس و لە دورگەی دیلۆس تەواوێک جێگای ڕێز و حورمەتن. لەبەر ئەوەی ئەو کەسانەی بەوشێوەیە بەڕێدەکران، ئیتر نەدەگەڕانەوە وڵاتی خۆیان، ئەوەش نیگەرانییەکی فرەی سازکردبوو، بۆیە باکوورییەکان کا و قەسەڵی گەنمیان لە کەرستە و دیارییەکانیان وەرپێچاوە و پاشان ڕادەستی دراوسێکانی خۆیان کردوە تا ئەوانیش بیدەنە دەست دراوسێی دورتر و لە کۆتاییدا بگەنە دیلۆس. من خۆم نەریتێکم بینیوە و دەکرێ پێوەندی بەو باسانەوە هەبێ. ڕێورەسمێک بەو بۆنەوە لە ناوچەکانی تراکی و پێئۆنییا بەڕێوەدەچێ. هەرکات ژنانی ئەو ناوچانە دیاری بۆ شازادە خاتوو ئارتێمیس دەنێرن، کۆڵێک کا و قەسەڵ دێنن و لەپاڵ خەڵاتەکانیان دەپەستێون. من باش دەزانم کە ئەو ژنانە بۆچی ئەو کارە دەکەن.

[٣٤] بەیادی ئەو جووتە قەیرە کچە کە لە وڵاتی باکووری دووردەستەوە گەیشتنە دورگەی دیلۆس و لەوێ مردن، کچان و کوڕانی دورگە قژیان کورت دەکەنەوە. کیژەکان پێش ئەوەی مێردیان کردبێ، کەزییەک دەبڕن و لە تەشی دەهاڵێنن و بە پەیکەرەی یادوارەی جووتە قەیرەکچەکانی هەڵداوسن (لە مەعبەدی ئارتێمیدۆس، لە دەستی چەپ کە دەچیە ژووری و ڕاست لەو

شوێنەی دارێکی زەیتوون شینبووە). کوڕەکان، ئەوانیش قژی براوی خۆیان لە گیای شین دەهاڵێنن و بە پەیکەرەکانی هەڵداوەسن. دانیشتووانی دورگەی دیلۆس بەپڕانی، بەو شێوەیە ڕێز بۆ ئەو دوو قەیرە کچە دادەنێن.

[٣٥] خەڵکی دورگەی دیلۆس ئەوەش دەڵێن کە بەر لە هاتنی کچەکان واتە ئیپێرۆخی و لائۆدیکی بۆ دورگەکەیان، ڕاست بە هەمان ڕێگا و وڵاتاندا، دوو ژنیتری عەلاوەی خەڵکی ئیپێرڤۆری (باکووری دوردەست) بە ناوەکانی ئارغی و ئۆپیس هاتوونەتە ئەوێ. ئەوانە بۆیە هاتوونە دیلۆس تا خواوەند ئیلیتییا[1] خەڵات بکەن، چونکە پێشتر نەزریان کردبوو. نەزرەکەیان بەو مەبەستە بوو کە خواوەند ئیلیتیـیا یارمەتی ژنەکان بدا لە کاتی زاییندا، ژانی کەمتریان هەبێ. هەروەها، ئەوە کە ئارغی و ئۆپیس لەگەڵ خواکانیتر (خوای مێیینە) واتە لیتۆ و ئیلیتییا گەیشتوونە ئەو دورگەیە خۆیلەخۆیدا بووەتە مایەی ئیحتیرام و ڕێزی پتری ئەو دوو ئافرەتە عەلاوەیە. ژنانی دورگەی دیلۆس کۆڕ سازدەکەن و لەودا سروود دەخوێننەوە و ناوی ئارغی و ئۆپیس دێنن. ئەو سروودانە لەلایەن ئۆلین نووسراون.

ئۆلین خەڵکی لیکیا بوو. دانیشتووانی دورگەکانیتر لە خەڵکی دیلۆس فێری ئەو شێعرانە بوونە و یۆنانییەکانیش بە سروود و کۆڕسازدان ڕێز لە ئۆپیس و ئارغی دەگرن. (ئۆلین لە ناوچەی کیلیکیاوە هات و کۆمەڵێک سروودی کۆنیشی نووسییەوە و خەڵکی دیلۆس دەیانخوێننەوە). هەرکات لەسەر سەکۆکانی پیرۆز ئەندامانی ئاژەڵی قوربانیکراو بەتەواوی سووتا، خۆڵەمێشەکەی هەڵدەگرن و بەسەر قەبری ئۆپیس و ئارغی دەیپرژێنن. گۆڕی ئەوانە لەپشت مەعبەدی ئارتێمیدۆس، لەلای ڕۆژهەڵات و لە نیزیک هۆڵی میوانداری کییۆکان هەڵکەوتوون.

[٣٦] ئەوە کۆمەڵە زانیارییەک سەبارەت بە ئیپێرڤۆرییەکان (خەڵکی باکوور) بوو. ئێستا تۆزێک لەمەر ئاباریس دەدوێم. دەگێڕنەوە کە ناوبراو خەڵکی هەرێمی باکووری دوردەست بووە. ئەو کابرایە جارێک بە چەکەوە و

---

١- ئەو ئیلاهەیەی یارمەتی ژنانی لە کاتی زاییندا دەدا.

به زگی برسی دەوری دنیا گەڕاوە. دیارە من لەو بارەوە هیچ ناڵێم. ئەگەر قەراربێ خەڵکی ئیپێرڤۆری (باکووری دوردەست) بوونی هەبووبێ، بەدڵنیاییەوە خەڵکی ئیپێرنۆتی (باشووری دوردەست)یش وجوودیان هەبووە. من پێکەنینم بەوەدێ کە خەڵکانێک نەخشەی جیهانیان کێشاوەتەوە، بەبێ ئەوەی هیچ زانیاریی و بەیانێکی ماقوڵ بدەنە دەست ئێمە. ئەوانە نەخشەی ئەقیانووس‌یان کێشاوەتەوە کە بەدەوری بیچمی زەویدا راکشاوە و چەشنی بازنەیەک دەچێ. ئەوانە هەروەها بیچمی زەوی‌یان وێنەی تۆپی گۆی زەوی دروستکردوە و لەودا پانتایی قارەکانی ئاسیا و ئوروپا بەقەرا یەکن.

من بەکورتی لەسەر قەیاس و قەوارەی هەرکام لەو قارانە دەدوێم و سنوورەکانیان دەسنیشان دەکەم.

[۳۷] ئەو ناوچەیەی پارسەکانی لێدەژین، تا دەریای باشوور، ناسراو بە ئێریترە[۱]، راکشاوە. لە سەرووی پارسەکان، میدیاکان نیشتەجێن. لە ژوور میدیاکانیش، خەڵکی ساسپیری هەن. دوای ساسپیری‌یەکان، کۆلخی‌یەکان جێیان‌گرتووە و خاکەکەیان دەگاتە دەریای باکوور، واتە ئەو بەحرەی ئاوی چۆمی (فاسیس)ی دەڕژێتە نێو. بەواتایەک چوار نەتەوەن کە لەو هەرێمە و لەنێوان دوو بەحردا دەژین.

[۳۸] لە رۆژئاوای ئەو نەتەوانە، دوو پارچە خاک واتە نیمچە دورگە هەن و دەقولایی دەریاوە رۆچوونە، باسیان دەکەم. یەک لەو نیمچەدورگانە، بەلای باکووردا، لە چۆمی فاسی‌یەوە دەست پێدەکا، دەچێتە نێو بەحر و بە قەراخ پۆندۆ (دەریای رەش) و ئێلیس‌پۆندۆدا[۲] تا دەگاتە دوندی سێغیۆ لە هەرێمی ترووادا راکشاوە. بەلای باشوورەوە، ئەو ویشکاییە لە کەنداوی میریاندی[۳] لە نیزیک فینیقییەوە تا بەرزایی دوندی تریۆپی درێژە و لە هەناوی دەریاوە رۆچووە. لەو نیمچەدورگەیەدا سێ نەتەوەی جیاواز دەژین.

---

۱- مەبەست بەحری عەمانە.

۲- ناوی کۆنی تەنگەبەرایی ئاویی بۆسفۆر و داردانێل. دەریای رەشی لە دەریای مەدیترانە گرێداوە و سنووری نێوان قارەکانی ئوروپا و ئاسیایە.

۳- کەنداوی ئەلێکساندرێتا.

[٣٩] ئەوە پانتایی یەکەم نیمچەدورگە بوو. دووهەم نیمچەدورگە لە وڵاتی پارسەوە دەستپێدەکات و دەچێتە نێو دەریای ئێریترە. پێکهاتووە لە پێرسی‌یا، ئاسیریا(وڵاتی ئاشوور) و دوای ئاسیریاش دەبێتە کەنداوی عەرەبستان. داریوش لە کەنداوی عەرەبستانەوە کاناڵێکی لێدا و پەیوەستی رووباری نیلی کرد. لەڕاستیدا ئەو نیمچە دورگەیە بەوەندە کۆتایی نایە، بەڵام بۆتە باو و ئاوا دەڵێن. لە وڵاتی پارسەوە تا فینیقییە، ناوچەکە پانوپۆڕ و دەشتە. بەڵام لە فینیقییە بەولاوە، ئەو نیمچەدورگەیە بە قەراخ ئاوەکانی دەریای ئێمەدا[1]، واتە بە وڵاتانی سوریا، فەلەستین و میسردا، پێشڕەوی بۆ نێو دەریا دەکا و بە وڵاتی میسر کۆتایی پێدێ. ئەوانە دووهەم وەجبەی ئەو نیمچە دورگەیە پێکدێنن و کاملّی‌دەکەن و تەنیا سێ نەتەوەشی لێدەژین.

[٤٠] ئەوە قەوارە و سیمای ئاسیا بوو، لە پێرسیاوە دەست پێدەکا و بەرەو رۆژئاوا دەچێتە پێش. دوورتر لە پارسەکان، میدیاکان و ساسپیری و کۆلخی‌یەکان دەژین. بەرەو رۆژهەڵات دەریای ئێریترە و بەرەو باکوور دەریای کاسپی‌یا و چۆمی ئاراکس کە بەرەو رۆژهەڵات دەچێ، هەڵکەوتوون. تا وڵاتی هیندوستان، ئاسیا تەواو ئاوەدانە، لە هیندوستان بەولاوە و بەرەو رۆژهەڵات چۆلەوارە و هیچ کەس زانیارییەکی ئەوتۆی لەلا دەست ناکەوێ.

[٤١] ئاسیا، بەو چەشنەی دیتمان گەورە و خاوەن سنووری دیارە. لیبی (ئەفریقا) لە نیمچە دورگەی دووهەم و لەدوای وڵاتی میسرەوە دەسپێدەکات. لە دوای میسر، ئەو نیمچە دورگەیە بەرتەسک دەبێتەوە، چونکە لە دەریای ئێمەوە (دەریای مەدیترانە) تا دەگاتە دەریای ئێریترە، مەودایەکی سەدهەزار ئۆرغی دەبێ، واتە نیزیک بە هەزار ستادیۆ. کەوابوو لەوێ بەدواوە نیمچە دورگە بەربەرین دەبێتەوە و پێیدەگووترێ لیبی (قارەی ئەفریقا).

[٤٢] بەلای منەوە جێگای دەسخۆشی پێگووتنە کە زاناکان چۆن توانیویانە سنووری نێوان ئەو نیمچە دورگانە دیاری‌بکەن، واتە لیبی لە ئاسیا و ئوروپا جیا بکەنەوە، چونکە جیاوازی نێوانیان ئێجگار زۆرە و درێژایی

---

١- دەریای مەدیترانە.

ئورووپا بەقەدەر ئەوانیتره، بەڵام لەمەر بەرینایی، هێندە بەرچاو نییە. نیمچە دورگەی لیبی لە گشت لایەکەوە بەهۆی دەریاوە دەوری گیراو، تەنیا لە سنوورەکانی لەگەڵ ئاسیا نەبێ.

ئەوەندەی من بزانم یەکەم کەس کە روونی کردەوە لیبی بەهۆی دەریاوە گەمارۆدراوە، پاشای میسر بەناوی نێکۆس بوو. ناوبراو دوای ئەوەی دەستی لە هەڵکەندنی کاناڵێک هەڵگرت کە رووباری نیلی تێکەڵ بە کەنداوی عەرەبستان[1] دەکردەوە، کۆمەڵێک لە فینیقییەکانی بە سواری قایقان خستە رێگا و حوکمی دەسەرکردن لە وڵاتی میسرەوە بە رێگای گەرووی ستوونەکانی ئیراکلیسدا[2] بێنە نێو بەحری باکوور[3] و بەوێدا بگەڕێنەوە.

فینیقییەکان لە دەریای ئێریترەوە وەڕێکەوتن و سەفەریان بەرەو دەریای باشوور[4] کرد. وەختێک پاییزیان بەسەردا هات، لە لیبی مانەوە. ئەوانە لە هەر شوێنێک لایاندابا، خەریکی کشتوکاڵ دەبوون و چاوەڕوانی خەرمان دەمانەوە و ئەوسا دووبارە رێگایان دەگرتەوەبەر. دوو ساڵ بەو چەشنە دەربازبوو و ساڵی سێهەم بە گەرووی ئیراکلیسدا تێپەڕین و گەڕانەوە وڵاتی میسر. ئەوانە باسی شتێکیان کردوە کە بۆ من جێگای باوەڕ نییە و باشترە خەڵکیتر دڵی پێخۆش بکەن. ئەوانە گوتوویانە لە کاتی دەوردانی نیمچە دورگەی لیبی، خۆر لەلای راستیان بووە.

[٤٢] بەو شێوەیە دەرکەوت کە دەریا گەمارۆی نیمچە دورگەی لیبی داوە. دواتر کارخیدۆنییەکان کۆمەڵێک زانیارییان دایەدەست. ساتاسپی هیخامەنیشی، کوڕی تێئاسپییۆ فەرمانی دەسەر کرا دەوری خاکی لیبی بدات. ناوبراو لە درێژ ماوە بوونی سەفەر و تەنیایی ترسا و ناچار بوو بگەڕێتەوە، بەبێ ئەوەی داواکاری دایکی خۆی جێبەجێ کردبێ. ساتاسپ دەستدرێژی کردبووە سەر کچی زۆپیرۆسی کوڕی مێغافیزۆس و هەربۆیە

---

١- لە سەردەمی کۆندا بە دەریای سووری ئەمڕۆ گووتراوە.

٢- جەبەلولتاریق.

٣- مەدیترانە.

٤- مەبەست ئەقیانووسی هیندە.

قەراردرا بە حوکمی خەشایارشا چوارمیخ بکرێ. دایکی ساتاسپ کە خوشکی داریوش بوو، لەبەر پاشا پاڕایەوە و داوای لێخۆش بوونی کرد و گووتی کە ئەو خۆی سزای توووندتر بۆ کوڕەکەی دیاریدەکات. ساتاسپ حوکمی دەسەرکرا بە دەوری وڵاتی لیبیدا سەفەر بکا و ئەوەندە بەسەر ئاوەکاندا بڕوا تا دەگاتە کەنداوی عەرەبستان. خەشایارشا ئەو پێشنیارەی پەسندکرد. ساتاسپ سەرەتا چوو بۆ وڵاتی میسر. فەرماندەری گەمی وەستۆگرت و کۆمەڵێک دەریاوانی ڕەگەڵ خۆیدا و بەرەو گەرووی کۆڵەکەکانی ئیراکلیس کەوتنە بەحرەوانی. ناوبراو بەو گەرووییەدا دەرباز بوو و لووتی نیمچە دورگەی لیبی بەجێهێشت کە ناسراو بە سولۆئیس[1] و بەرەو باشوور پێشڕەوەی کرد. چەند مانگێک لە سەفەردا بوو و مەودایەکی دوور و درێژی لە دەریای پان و بەرین بڕی و لەبەر ئەوەی بەردەوام دەبوایە پێشڕەوی بکا، لەپڕێکا بەرەو وڵاتی میسر ورسوڕایەوە. لە میسر چووە خزمەت خەشایارشا، گووتی کاتێک گەیشتووەتە دوایین قۆناخی سەفەر، چاوی بە خەڵکی کورتە باڵا کەوتووە کە بە گەڵای خورما خۆیان داپۆشیوە. وەختێک گەمییەکەیان لەو ئاوەدانییە نیزیک کەوتووەتەوە، گشت ئەو خەڵکە بەرەو بەرزاییەکان ڕایانکردوە و ئاواییەکەیان چۆڵکردوە. ساتاسپ و پیاوەکانی هیچ شتێکیان دەست لێنەداوە و ئاوەدانییەکەیان وێران نەکردوە، تەنیا چەند سەر ئاژەڵیان لەگەڵ خۆیان بردوە. سەبارەت بە سەفەر و دەورلێدانی نیمچەدورگەی لیبی، گووتی کە بۆی تەواو نەکراوە، چونکە گەمییەکەیان نەیتوانیوە لەوە زیادتر پێشڕەوی بکا و لەعەرز چەقیوە. خەشایارشا باوەڕی بە قسەکانی ساتاسپ نەکرد و لەبەر ئەوەی خواست و ئەمری پاشای بەجێ نەهێنابوو، لەجێوە چوارمیخکرا. یەکێک لە کۆسەکانی خزمەتکاری ساتاسپ کاتێک ئاگادار بۆوە کە ئاغاکەی چوارمیخ کراوە، خێرا ڕایکرد و چوو بۆ دورگەی سامۆس و پارەیەکی زۆری لەگەڵ خۆی برد. ئەو کۆسەیە کاتێک

---

١- ئەمڕۆ ناسراوە بە کانتین.

گەیشتە دورگە، کەسێکی خەڵکی ئەوێ دەستی بەسەر پارە و گەنجەکەدا گرت. من ناوی ئەو کابرایە دەزانم و بەپێویستی نازانم بیدرکێنم.

[٤٤] داریوش زۆربەی ناوچەکانی ئاسیای دۆزیوەتەوە. ئەو گەرەکی بوو بزانێ رووباری ئیندوو (چۆمی سند) دەڕژێتە کام دەریا، چونکە دووهەمین رووبار لەنێو گشت زێیەکاندایە و ئاژەڵی تیمساحی تێدا دەژێ. داریوش پیاوانی جێگای باوەڕی خۆی بە سواری گەمی و بە مەبەستی لێکۆڵینەوە خستەڕێ. لەنێو ئەواندا سکیلاکاس خەڵکی کاریئاندێئا[1] ناسراوبوو. ئەوانە لە شاری کاسپاتیرۆس و دەڤەری پاکتی‌یەکان[2]، بەرێگای چۆمدا بەرەو رۆژهەڵات وەرێکەوتن و پێشڕەویان کرد و گەیشتنە دەریا. لەوێوە بەسەر ئاوەکانی بەحردا، روو لە رۆژئاو چوونە پێش و دوای سێ مانگ گەیشتنە ئەو جێگایە کە پێشتر باسم کردبوو، واتە ئەو شوێنەی پاشای میسر فینیقی‌یەکانی ناردبوو بۆوەی دەوری نیمچەدورگەی لیبی بدەن. دوای ئەو خولانەوەیە بوو کە داریوش پەلاماری هیندووەکانی‌دا و دەستی بەسەر ئەو دەریایەدا گرت. بەو چەشنە قارەی ئاسیا جیا لە ناوچەکانی رۆژئاوایی خۆی، دەرکەوت کە شێوەی خاکی نیمچەدورگەی لیبی (ئەفریقا) دەدا.

[٤٥] لەمەر ئوروپا، هیچکەس نازانێ ئاخۆ بەلای رۆژهەڵات یا بەلای باکووردا، ئاوی دەریا دەوری تەنیبێ. هەڵبەت ئەوەمان لێ‌روونە کە مەودای درێژایی ئەو قارەیە بەقەدەر دووانەکەی‌ترە. ئەوەی بەلای منەوە جێگای تێڕامانە، ئەوەیە کە خاکی ئوروپا یەکپارچەیە، بەڵام سێ ناوی ژنانەیان لەسەر داناوە، هەروەها سنوورەکانی ئەو نیمچە دورگەیەیان بە رووباری نیلی وڵاتی میسر و چۆمی فاسیی لە وڵاتی کولخیدۆنی‌یەکان دیاریکردوە (هەڵبەت خەڵکانێکی‌تر ئەو کۆمەڵە سنوورانە دەگەڕێننەوە بۆ زێی تانائیس سەربە گۆلی مێئۆتیدا و گەرووی کیمێری)؛ من نە ناوی ئەو کەسانەم بۆ روون بووەتەوە کە سنوورەکانیان دیاریکردوە و نە ئەوەش کە ناوی قارەکان لەکوێرا

---

١- کاریئاندێئا، سارێکی کاری‌یەکان و مەوتەنی سکیلاکاسی جوغرافیزانی ناسراوی یۆنانی.

٢- پاکتی، هۆزێک لە داوێنەکانی چیای سولەیمان. هێرۆدۆت ئەوانەی بە هیندی زانیوە.

هاتوون. دیارە زۆربەی یۆنانییەکان لەو باوەڕەدان ناوی قارە یا نیمچەدورگەی لیبی (ئەفریقیا)[1] لە ژنێکی خەڵکی ئەو هەرێمە کە پێی‌گوتراوە لیبی‌یا، وەرگیراوە. لەمەر ئاسیا، ئەویش لە ژنێکی‌تر بەناوی (پرۆمیتیئا)وە هاتووە. لیدی‌یەکان بەنۆرەی خۆیان دەڵێن ئەو ناوەی دوایی ملکی ئەوانە و ئاسیا بەهۆی ئاسیای کوڕی کۆتیئۆس و نەوەی مانی‌یەوە لەسەر ئەو خاکە داندراوە، نەک لە ئاسیای ژنی پرۆمیتیئاوە هاتبێ. خێڵێکی دەڤەری سارد، ئەوانیش ناوی ئاسیای کوڕی کۆتیئۆس‌یان لەسەر خۆیان داناوە.

سەبارەت بە ئوروپا، هیچکەس نازانێ ئاخۆ بەهۆی دەریاوە گەمارۆدرابێ، تەنانەت نازانن ناوەکەشی لەکوێوە هاتووە و کێ ئەو ناوەی پێداوە، مەگەر ئاوای دابنێین کە ئەو پارچە خاکە ناوی خاتوو ئێڤرۆپی[2] خەڵکی هەرێمی تیرۆسی[3] وەرگرتبێ و لە کۆتاییدا بەو ئاکامە دەگەین کە پێشتر چەشنی قارەکانی‌تر هیچ ناویتری نەبووە. دیارە دەبێ ئەوە بڵێم کە خاتوو ئێڤرۆپی خەڵکی ئاسیا بووە و قەت لە ژیانیدا پێی لەنێو خاکی ئوروپا نەناوە، واتە ئەو سەرزەوینەی کە یۆنانییەکان پێیدەڵێن ئوروپا. ئەو خاتوونە لە وڵاتی فینیقی‌یەوە سەفەری کردوە بۆ دورگەی کرێت و لەوێشەوە بۆ هەرێمی لیکیا چووە. ئەوە کۆمەڵە باسێک سەبارەت بەو بابەتەوە بوو. ئێمە لەوە بەدواوە ئەو ناوانە بەکار دێنین.

**[٤٦]** هەرێمی ئێڤکسینۆپۆندۆ (ناوچەی دەریای ڕەش) کە داریوش هێرشی کردووەتەسەر، جیا لە هەرێمی سکیتی‌یەکان، ئەوانیتر بەگشتی لەلایەن خەڵکانێکی دواکەوتوو بوونەتە شوێنی نیشتەجێبوون. هیچکام لە گەلانی کەنار دەریای ڕەش ناتوانین باسی پلەی شارستانییەتەکەیان بکەین، تەنانەت

---

١- هێرۆدۆت لە تەواوی بەرهەمەکەیدا، لەجیات وشەی ئەفریقا، لیبی دەکارکردوە. کاتێک باسی لیبی دەکا، مەبەست قارەی ئەفریقایە.

٢- ئێڤرۆپی کچی ئاینێنۆر بە روخساری گامێش وەدیارکەوت و خواوەند ژوپیتێر (دیا) رفاندی و بردییە وڵاتێک کە دواتر نێوی نرا ئەوروپا. ئێڤرۆپی وەک دایکی مینۆس دەناسرا.

٣- تیرۆس، گەورەترین بەندەری دنیای باستان لە کەنارئاوەکانی رۆژهەڵاتی مەدیترانە و لە شوێنی بەندەری بەیروتی ئەمرۆ.

نازانین ئاخۆ کەسانی زانا و فەیلەسوف لەوێ لەدایکبوونە یان نا! دیارە لەو نێوەدا پێویستە گەلی سکیتی و ئاناخارسی جیابکرێنەوە. ئەوانی‌تر بەلای منەوە زۆر سرنجڕاکێش نین، بەڵام سکیتی‌یەکان توانیویانە هێمنانە گرفتێکی سرنجڕاکێش بۆ مرۆڤ چارەسەر بکەن. هیچکەسێکی هێرشبەر ناتوانێ لەبەردەستیان رابکا، دوژمنیش ناتوانێ ئەوانە بدۆزێتەوە، ئەگەر خۆیان، خۆیان ئاشکرا نەکەن. ئەو سکیتی‌یانە گشتیان خێڵەکی دەژین و سوارەی تیرهاوێژن. بە کشتوکاڵەوە مژوڵ نین و بژیویان لە رێگای ئاژەڵدارییەوە دابین‌دەکرێ. لەجیات خانوو بۆ حاوانەوە کەڵک لە عارەبانە و داشقەکانیان وەردەگرن. کەوابوو چۆن دەکرێ بەرچاو بکەون و مرۆڤ بیاندۆزێتەوە.

[٤٧] هۆی ئەوە کە سکیتی‌یەکان ئەو شێوە ژیانەیان هەڵبژاردوە دەگەڕێتەوە بۆ لەباربوونی سروشتی وڵاتەکەیان. چۆم و رووبارەکان یارمەتی ئەو دیاردەیە دەدەن. ئەو وڵاتە دەشت و سەرسەوز و پڕئاوە و بەقەرا وڵاتی میسر چۆم و جۆیباری هەیە. من ناوی ئەو رووبارانە دێنم کە پتر ناسراون و لە دەریاوە سەرچاوە دەگرن و بۆ کەشتیرانی دەستدەدەن. ئەوانە بریتین لە: ئیسترۆس[١] کە خاوەن پێنج زارکی سەرەکییە، تیریس[٢]، ئیپانیس[٣]، ڤۆریستێنیس[٤]، پانتیکاپیس، ئیپاکیریس، یێرۆس و تانایس[٥]. لە درێژەدا بەوردی باسی ئەو رووبارانە دەکەم.[٦]

[٤٨] ئیسترۆس، ئەوەندەی من بزانم لە گشت چۆمەکانی‌تر گەورەترە و پلەی ئاوەکەی لە هاوین و زستاندا نەگۆڕە. ئەو زێیە لە رۆژئاواوە سەرچاوە دەگرێ و سکیتی‌یەکان یەکەمجار لە رۆخەکانی ئەو چۆمە نیشتەجێ بوونە.

---

١- ئیسترۆس، ئەمرۆ ناسراوە بە دانوب.

٢- تیرۆس یا تیراس، ئەمرۆ روباری دنیستێر.

٣- ئیپانیس، لکێک لە چۆمی روباری دۆن، ئەمرۆ ناسراوە بە بووگ.

٤- ڤۆریستێنیس، ناوی کۆنی روباری دنیپێرۆ.

٥- تانایس، ناوی کۆنی روباری دۆنی ئەمرۆیە.

٦- لە سەرچاوەی‌ترەوە ناوەکانی ئەمرۆی ئەو چۆمانە بەڕیز بەو شێوەیەن: دوناڤیس، دنیستێرۆس، کوبان، دنیپێرۆس، سەمارا، کالانجاک، ملۆزنیا – ڤۆدا، دۆن.

هۆی ناسراوی و گەورەیی رووباری ئیسترۆس لەوەدایە کە کۆمەڵێک چۆمی‌تری نێو خاکی سکیتیا[1] تێکەڵ بەو دەبنەوە. ئەو چۆمانە ئەوانەن: پۆراتاس وەک سکیتی‌یەکان دەڵێن و یۆنانی‌یەکان بە ناوێکی‌تر واتە پیرێتۆ دەیناسن. هەروەها چۆمەکانی تیاراندۆس[2]، ئارارۆس، ناپاریس و ئۆردیسۆس.[3] پۆراتاس چۆمێکی گەورەیە و بەرەو رۆژئاوا دەچێ و دواتر تێکەڵ بە زێی ئیسترۆس دەبێتەوە. رووباری دووهەم تیاراندۆس، ئەویش بەرەو رۆژئاوایە و لەهەمان کاتدا بچووکتریشە. سێ چۆمەکەیتر، واتە ئارارۆس، ناپاریس و ئۆردیسۆس، ئەوانە لە ناوچەکانی نێوان دوو زێدا، واتە پۆراتاس و تیاراندۆس هەڵکەوتوون. پاش مەودایەک دەڕژێنە نێو رووباری ئیسترۆس. ئەوە باسێک سەبارەت بەو چۆمانە بوو کە سکیتی‌ین و دەڕژێنە نێو ئیسترۆس. لەمەر ئەو وڵاتەی کە (ئاغاتیرسی)یەکان[4] لێی‌نیشتەجێن، تەنیا چۆمی ماریس هەیە کە لەگەڵ ئیسترۆس دەبنەوە یەک.

[٤٩] لە دووندی چیاکانی ئایمۆس[5]، کۆمەڵێک رووباری گەورەتر سەرچاوە دەگرن و لە باشوورەوە بەرەو باکوور دەچن و پاشان تێکەڵ بە زێی ئیسترۆس دەبنەوە. بۆوێنە: ئەتڵەس، ئاڤراس و تیڤیسیس. لە ناوچەی تراکی و کرۆبیزی[6] سەر بەو هەرێمە، چۆمەکانی ئاتریس[7]، نۆئیس[8] و

---

١- سکیتی، کۆمەڵێک هۆزی بەربەری سەردەمی باستان کە بادیەنشین بوونە و بەردەوام لە باکووری رۆژهەڵاتی ئەورووپا و باکووری رۆژئاوای ئاسیا ماونەوە. شوێنی نیشتەجێیی ئەوانە پتر لە باکووری دەریای رەش بووە.

٢- تیاراندۆس، وێدەچێ روباری سێرت بێ.

٣- ئەو سێ چۆمەی دوایی بە دەشتی والاشی‌دا تێدەپەڕن و هێرۆدۆت وێدەچێ بەهەڵە ئەوانەی بەرەو رۆژهەڵات و لە هەرێمی مولداوی داناوە، واتە ئەوانە لە باکوورەوە بەرەو بەشێکی روباری دانوب دەچن و تێکەڵ بەو دەبن، ئەویش ئەو بەشەی لە رۆژئاواوە بەرەو رۆژهەڵات دەڕوا.

٤- ئاغاتیرسی، هۆزێک کە لە ناوچەکانی داوێنی چیاکانی کارپات ژیاون.

٥- ئایمۆس، ناوی کۆنی چیاکانی بالکان.

٦- کرۆبیزی، ناوچەیەک لە وڵاتی میسی‌یەکانی باستان کە تراکی بوونە.

٧- ئاتریس، ئەمڕۆ ناسراوە بە ژانترا.

٨- نۆئیس، ئەمڕۆ ناسراوە بە ئۆسێم. شارێک بەناوی نۆبڤا لە قەراغ ئەو چۆمە هەبووە.

ئارتانیس، ئەوانەش تێکەڵ بە رووباری ئیسترۆس دەبن. لە وڵاتی پیئانی[1] و رۆدۆپییەکان[2]، چۆمی سکیۆس[3]، پاش ئەوەی بە کوێستانەکانی ئایمۆدا تێپەڕی ئەوجار دەڕژێتە نێو رووباری ئیسترۆس. لە وڵاتی ئیلیریەکان،[4] چۆمی ئانگرۆس[5] روو لە باکوور، دەشتی تریڤالۆسییەکان[6] دەبڕێ و تێکەڵ تێکەڵ بە زێی ڤرۆنگۆس دەبێ و پاشان لەگەڵ رووباری ئیسترۆس دەبنەوە یەک. بەو شێوەیە رووباری ئیسترۆس ئاوی ئەو دوو چۆمە گەورەیە وەردەگرێ. لە هەرێمی سەرووی (ئۆمڤری)یەکان[7]، دوو زێیتر بە ناوەکانی کارپیس[8] و ئالپیس[9] بەرەو باکوور دەچن و تێکەڵ بە ئیسترۆس دەبنەوە. رووباری ئیسترۆس بە سەراسەری خاکی ئورووپادا دەڕوا. ئەو رووبارە لە وڵاتی کێلتییەکان[10] کە دوای کینیتییەکانی نیشتەجێ لە رۆژئاوا، باکووریترین خەڵکانن، دەسپێدەکا و تەواوی خاکی ئورووپا دەبڕێ و دەگاتە تەنیشت وڵاتی سکیتییەکان.

[٥٠] هۆی گەورە بوونی رووباری ئیسترۆس لەوەدایە کە کۆڵێک زێی مەزن و ژمارەیەک لکیتر، ئاوەکەیان دەڕژێتە نێو ئەو چۆمە. ئەگەر

---

١- پیئۆنی یا پیئانی، ناوی کۆنی بەشێک لە مەقدونییەی باکووری کە لە زەمانی فیلیپی مەقدونیدا خرایەوە سەر وڵاتی مەقدونی.

٢- رۆدۆپی، بەشێک لە ریزە چیاکانی تراکی، ئەو ریزە شاخە لە شوێنێک لە چیاکانی باڵکان جیا دەبنەوە و بەرەو باشووری رۆژئاوا تا دەریا راکشاون.

٣- سکیۆس، دەبێ چۆمی ئیسکێری ئەمڕۆ بێ.

٤- ئیلیری، هەڵکەوتوو لە باکووری یۆنان و هەرێمەکانی داڵماسی، بۆسنی و کرۆئاتی دەگرێتەوە.

٥- ئانگرۆس، زۆر وێدەچێ روباری مۆراڤا یا ئیبار لە سربستان بێ.

٦- تریڤالۆسی، بەشێک لە وڵاتی تراکی کە سەرسەوز بووە و لە زەمانی فیلیپدا خراوەتە سەر وڵاتی مەقدونی.

٧- ئۆمڤری، دانیشتووانی باکووری ئیتالیا و ئێترووریا.

٨- کارپیس، روبارێک کە لە ئورووپای نێوەندی و لە چیای کارپات سەرچاوەی گرتووە.

٩- ئالپیس، روبارێک لە ئورووپای نێوەندی و لە چیاکانی ئالپەوە سەرچاوەی گرتووە.

١٠- کێلتی یا سیلتی، دەگووترێ هۆزێکی بە رەگەز ئارییایی کە دوو هەزار ساڵ بەرلە میلاد، لە رۆژهەڵاتی ئورووپاوە بەرەو رۆژئاوای ئەو قارەیە کۆچیان کردوە و لە ماوەی دە سەدەدا سەراسەری خاکی ئەو قارەیەیان داگرتووە.

هەڵسەنگاندێک لەنێوان رووباری ئیسترۆس و نیلدا بکەین و رێژەی ئاوەکەیان لەبەرچاو بگرین، رووباری نیل لەمەر پڕئاوی گەورەترە، چونکە هیچ چۆم و جۆبیارێکی ئەوتۆ تێکەڵی نابنەوە تا دەوڵەمەندی بکەن.

پلەی ئاویی رووباری ئیسترۆس لە هاوین و زستاندا نەگۆڕە، ئەوەش بە باوەڕی من دەگەڕێتەوە بۆ: لە وەرزی زستاندا وەک خۆی دەمێنێتەوە، دیارە رەنگە تۆزێک زیاد بکا یاننا. چونکە لەو ناوچە و هەرێمانەی ئەو رووبارە پێیاندا دەربازدەبێ، لە زستاندا باران کەمتر دەبارێ و بەپێچەوانەوە بەفرێکی زۆر دەکەوێ. لە وەرزی هاویندا، ئەو بەفرە زۆرە دەتوێتەوە و ئاوەکەی دەڕژێتە نێو رووباری ئیسترۆس. دەبێ بڵێم کە کۆی ئاوی ئەو بەفر و بارانانەن کە رووباری ئیسترۆس دەوڵەمەند دەکەن، ئەوەش بگووترێ کە لە وەرزی هاویندا بارانێکی زۆر دەبارێ. هەر ئەندازە ئاو فرە بێ و خۆرەتاوی هاوین بیکات بە هەڵم، بەو قەیاسەش باران پتر دەبارێ و رووباری گوڕین خوڕێن دەکاتەوە. ئەو دیاردەیە زیادتر لە هاویندا بەرچاو دەکەوێ. هۆی سەرەکی یەکسانی پلەی ئاو و دەوڵەمەندی ئەو رووبارە لە زستان و هاویندا، راست دەگەڕێتەوە بۆ بەفری زستان و بارانی هاوین و مرۆڤ هەست بە کەم و زیادی ئاوی ئەو چۆمە لەو دوو وەرزەدا ناکا.

[٥١] یەکێک لە رووبارەکانی وڵاتی سکیتی، ئیسترۆس و دوای ئەو نۆرەی تیریس[1] دێت. ئەو چۆمەی دوایی لە باکوورەوە دێت و سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ گۆلێکی مەزن کە سنووری نێوان خاکی سکیتیا و نێڤریدۆ[2] دیاریدەکا. لەو گەرووە، خەڵکانی یۆنانی دەژین و ناسراون بە تیریتی.

[٥٢] سێهەمین چۆم، ئیپانیس لە وڵاتی سکیتی و لە گۆلێکی مەزنەوە سەرچاوە دەگرێ. لە قەراخ ئەو گۆلە ژمارەیەک ئەسپی کێوی رەنگ سپی نەحاملاو هەن. ئەو گۆلە ناوی خۆی بەخۆیەوە، پێیدەگووترێ دایکی ئیپانی. ئاوی چۆمی ئیپانی لەو گۆلەوە دابین دەبێ و پێنج رۆژی سەفەری

---

١- تیریس، تیراس، ئەمڕۆ ناسراوە بە رووباری دینیستێر.

٢- نێڤریدۆ، هۆزێکی سامارتی لە لیتوانی ئەمڕۆ.

مەودایەتی. چۆمێکی قووڵ نییە و ئاوەکەشی شیرینە. لەو شوێنە بەولاوە، بە مەودای چوار رۆژ رێگا بەرەو دەریا، روو لە تاڵی دەکا و بۆ خواردنەوە نابێ. هۆیەکەی بوونی کانیاوێکە، کە ئاوەکەی بەڕادەیەک تاڵە، هەرچەند قەباسێکی زۆر نییە، بەڵام چۆمی ئیپانیس[1] بەو گەورەییە تاڵ دەکا. ئەو کانیاوە لەسەر سنووری سکیتییەکانی وەرزێڕ و ئالیزۆنییەکان هەڵکەوتووە. ناوی ئەو کانیاوە لە زمانی سکیتیدا دەگەڕێتەوە بۆ شوێنی سەرچاوەگرتنی و ناسراوە بە ئێکسابێئۆس. لە زمانی یۆنانیدا مانای رێگا پیرۆزەکان دەدا. لە هەرێمی ئالیزۆنییەکاندا، چەمەکانی تیریس و ئیپانیس نیزیک هەڤدوو دەکەونەوە و پاشان دوبارە لەیەکتر هەڵدەبڕێن.

[٥٣] چوارەمین چەم پێیدەگووترێ ڤۆریستێنیس. ئەو زێیە دوای رووباری ئیسترۆس گەورەترین چەمە. بە باوەڕی من لە گشت رووبارەکانیتر جیا لە چۆمی نیلی وڵاتی میسر پڕ خێروبێرترە، چونکە پیاو ناتوانێ هیچ رووبارێک لەگەڵ نیل هەڵسەنگێنێ.

لە هەڵسەنگاندن لەگەڵ ئەوانیتر، پتر خێری داوەتەوە. کۆمەڵێک لەوەرگە و مێشەی بۆ ئاژەڵان خوڵقاندووە و خاوەن ماسییەکی فرەیە. ئاوەکەی روون و خاوێن و بۆ خواردنەوە دەستدەدا، لەحاڵێکدا رووبارەکانیتر لێڵ و قوڕاوین. دەغڵ و دان لە لێوارەکانی ئەو رووبارە خێرا پێدەگەن و لە هەر جێگایەکیش دانەچێندرێ، گژ و گیا و لەوەڕگە وڵاتی سەوزهەڵدەگرێ. لە رێژاوگەی (مەصب) ئەو چۆمەدا، بەشێوەیەکی سەربەخۆ، رێژەیەکی زۆر خوێ کۆدەبێتەوە. ماسییەکانی ئەو چۆمە ئێجگار گەورە و بێ ئێسقانن و ناسراون بە ئەنتاکێئۆس و بە خوێی چۆم سوێردەکرێن و پاش هاڕین، هەویریان لێدروست دەکرێ. دیارە خاوەن زۆر بەرهەمی بەنرخیتریشە. ئەو رووبارە تا دەگاتە دەڤەری یێرۆس، واتە ئەو شوێنەی دوای چل رۆژی سەفەری پیاو دەیگاتێ، لە باکوورەوە بەرەو باشوور دەچێ. لەوێوە بەولاوە کەس نازانێ بە چەند وڵاتدا تێدەپەڕێ. ئەوەندەشمان لێڕوون بووەتەوە کە بەر لەوەی بگاتە

---

[1]- ئیپانیس، لکێک لە چۆمی روباری دۆن، ئەمڕۆ ناسراوە بە بووگ.

هەرێمی وەرزێرانی سکیتی، بە بیابانێکدا تێدەپەڕێ. خەڵکانێکی فرەی سکیتی، بە مەودای دە ڕۆژ ڕێگا لە ڕۆخ ئەو چۆمە نیشتەجێن. تەنیا سەبارەت بە سەرچاوەی ئاوی ئەو چۆمە و ڕووباری نیل لە وڵاتی میسر هیچ زانیارییەکی ئەوتۆم لەبەردەستدا نییە و پێموانییە یۆنانی‌یەکانیش بابەتێکی گرینگیان لەو بارەوە هەبێ. ڕووباری ڤۆریستێنیس کاتی نیزیک بوونەوەی لە دەریا، لەگەڵ چۆمی ئیپانیس یەکتر دەگرنەوە و پێکەوە لە یەک دێلتا دەڕژێنە نێو دەریا. لەو شوێنەی کە ئەو دوو چۆمە خەریکی تێکەڵبوونەوەن، بەرزاییەک پێکهاتووە کە ناویان ناوە ئیپۆلائۆس. لەسەر تەپۆڵکەی گۆرین زیارەتگایەک (چاکێک) بنیات نراوە بەناوی دیمیتراس[1]. لە سەرووی دیمیتراس و تۆزێک دوورتر و لە قەراخ چۆمی ئیپانیس، خەڵکی ڤۆریس‌تێنیس نیشتەجێن. ئەوە سەبارەت بەو چۆمەش باسمکرد.

**[٥٤]** دوای ئەو کۆمەڵە ڕووبارە، پێنجەمین چۆم دەبێتە پاندیکاپیس. ئەو چۆمەش لە باکوور و لە گۆلێکەوە سەرچاوە دەگرێ. لە هەرێمی نێوان ئەو چۆمە و زێی ڤۆریستێنیس‌دا، وەرزێرانی سکیتی دەژین. چۆمی پاندیکاپیس بە دەڤەری (ئیلی‌ئا)دا[2] دەرباز دەبێ و پاشان تێکەڵ بە ڕووباری ڤۆریستێنیس دەبێ.

**[٥٥]** شەشەمین چۆم پێیدەگووترێ ئیپاکیریس و لە گۆلێکەوە سەرچاوەدەگرێ و بە وڵاتی خێڵە بیابان نشینەکانی سکیتی‌دا تێدەپەڕێ و لەلای ڕاستی خۆی هەرێمی غلی‌ئا و کانزاکانی ناوچەی ئاخیلیۆ جێدەهێڵێ و لە نیزیک شاری کارکینیتیس[3] دەڕژێتە نێو دەریا.

**[٥٦]** حەوتەمین چۆم کە پێیدەگووترێ یێرۆس، لەو دەڤەرە و لە ڕووباری ڤۆریستێنیس جیادەبێتەوە. ڕووباری ڤۆریستێنیس، ئەویش هەر هەتا ئێرە بەو ناوە ناسراوە. ئەو شوێنەی چۆمی یێرۆس لە ڤۆریس‌تێنیس دوردەکەوێتەوە،

---

١- دیمیترا، یا سێرێس، کچی خواوەند ساتورنۆس (کەیوان یا زوحەیل)، ئیلاهەی خەرمان و زەوی و زار و کشتوکاڵ.

٢- ئیلی‌ئا یا ئیلیا، شارێکی کۆنی یۆنانی باستان لە هەرێمی ئی‌ئۆلی. هەڵبەت شارێکی‌تریش بەو ناوە لە ئیتالیا هەیە کە بەهۆی موهاجیرەکانی فۆکی دروستکرابوو.

٣- کارکینیتیس، ئەو شارە لەنێو کەنداو و لە بەشی ڕۆژئاوای تەنگەبەرایی پێرێکۆپ هەڵکەوتووە.

ناوی پێرۆسی بەخۆوەگرتووە. چۆمی پێرۆس بەرەو دەریا دەڕوا و دەبێتە سنووری نێوان هەرێمی خێڵە بیابان نشینەکانی سکیتی لەگەڵ دەڤەری شازادەکانی سکیتی و دواتر تێکەڵ بە ئیپاکیریس دەبێتەوە.

[٥٧] هەشتەمین رووبار، تانائیس[١]، ئەویش لە گۆلێکی مەزنەوە سەرچاوە دەگرێ و دواتر دەڕژێتە نێو گۆلێکی گەورەتر بەناوی مێئۆتیدا. ئەو گۆلەی دوایی سنووری نێوان هەرێمی شازادەکانی سکیتی و ناوچەی ساڤرۆمات پێکدێنێ. چۆمێکیتریش بەناوی ئیرغیس تێکەل بە زێی تانائیس دەبێ.

[٥٨] ئەوە کورتە باسێک سەبارەت بە رووبارەکانی ناسراوی وڵاتی سکیتی بوو. لەوەڕی وڵاتی سکیتی لە هەڵسەنگاندن لەگەڵ شوێنیتر، کاریگەری پتری لەسەر گەورەبوونی جەرگی مەڕومالات هەیە، بۆدڵنیابوون لەو بارەوە، دەکرێ سەیری نێو هەناوی ئەو ئاژەڵانە بکەین.

[٥٩] وڵاتی سکیتییەکان خاوەن سامانێکی فرەی مادیی و مەعنەوییە. لەمەر کەلتور و داب و نەریتی ئەوانە ئێستا باسێک دێنمەگۆڕێ. ئەو خوایانەی سکیتییەکان دەیانپەرستن بریتین لە: لە گشتیان گرینگتر، خواوەند ئێستیا و دوای ئەویش خواوەند دیا(ژوپیتێر) [٢] و خواوەند یی(زەوین). ئەوان لەو باوەڕەدان کە خواوەند یی(عەرز)، ژنی خواوەند دیایە. ئاپۆلۆن[٣]، ئورانییائەفرۆدیت[٤]، ئیراکلیس[٥] و ئاریس[٦]، ئەوانەش باقی ئەو خوایانەن کە سکیتییەکان باوەڕیان پێیانە. سکیتییەکان بە گشتی ئەو خوایانە دەپەرستن، بەڵام پاشازادەکانی سکیتی، قوربانی پێشکەش بە خواوەند (پۆسیدۆن)یش دەکەن.

---

١- تانابیس، ناوی کۆنی روباری دۆنی ئەمرۆیە.

٢- دیا، دیۆس یا ژوپیتێر، خوای خواکان، باوکی خواکان.

٣- ئاپۆلۆنا یا ئاپۆلۆن، کوڕی خواوەند دیا (ژوپیتێر) و ژونون، خوای شێعر و موسیقی و نیشانەی جوانی.

٤- ئەفرۆدیت، خوای جوانی لە یۆنانی کۆندا.

٥- ئیراکلیس، پاڵەوانی ئەفسانەیی لە یۆنانی سەردەمی کۆندا و خوای هێز و دەسەڵات.

٦- ئاری، ئاریس یا مارس، کوڕی خواوەند ژوپیتێر و ژونون، خوای شەڕ لە یۆنان و رۆمی باستان.

لە زمانی سکیتیدا، خواوەند ئێستیا[1] پێیدەگووترێ تابیتی، بۆ خواوەند دیا ناوی پاپیئۆس بەکاردێنن و بەباوەڕی من زۆر دروستە. بە خواوەند یی (عەرز) دەڵێن ئاپی. خواوەند ئاپۆلۆن بووە بە یتۆسیرۆ، ئۆرانیا ئەفرۆدیت وەک ئارغیباسا و پۆسیدۆن[2] بەناوی تاغیماساداس ناسراوە. لەلای خەڵکی سکیتی بنیاتنانی دێر و زیارەتگا و قوربانگا باونییە، جیالە خواوەند ئاریس، تەنانەت پەیکەرەش بۆ خواکان دروست ناکەن.

[٦٠] ڕێورەسمی قوربانی بۆ گشت خواکان و لە تەواوی بۆنەکاندا بە یەک شێوە بەڕێوەدەچێ. ئاژەڵی قوربانی بەپێوە دەوێستێ و تەنیا دوو قاچی پێشەوە بە گوریس دەبەستن. کابرای خاوەن قوربانی لەپشت ئاژەڵ دەوێستێ و بەبەر دوعا بۆ ئەو خوایەی قوربانی پێشکەش دەکرێ، لەپڕێکا گوریسی بەستراو لە قاچەکانی پێشەوە ڕادەکێشێ و ئاژەڵ دەکەوێتە سەر عەرز. ئەوجار گوریسێک لە ملی ئاژەڵ دەبەستن. پللارێک (قوڵەدار) دەنێوان گوریس و ملی ئاژەڵ ڕۆدەکەن. ئەوەندە ئەو پللارە بادەدەن تا ئاژەڵ دەخنکێ. پاشان کەوڵی دەکەن و پارچەپارچە دەکرێ. دوای کەوڵکران و لەتوپەتکردن، لە مەنجەڵی دەکەن و وەسەر ئاگری دەنێن و دەیکوڵێنن.

[٦١] لەبەر ئەوەی لە وڵاتی سکیتی دار بەدەگمەن وەگیردەکەوێ، گۆشتی قوربانی بەو شێوەیە دەکوڵێنن: دوای کەوڵکردنی ئاژەڵی قوربانی، گۆشتی لەشی بەتەواوی جیادەکەنەوە و تەنیا ئێسقان بەجێدەمێنێ. گۆشت لەنێو مەنجەڵی دەستکردی هەرێمەکە دەکرێ. ئەو مەنجەڵانە وەک خومرە و کوپەکانی دەڤەری لێسڤۆ دەچن، بەو جیاوازییەی کە مەنجەڵەکانی ئێرە تۆزێک زلترن و گۆشتی زیاتری تێدا دەبن. بەهەرحاڵ، گۆشتی پاککراو لەو مەنجەڵانە دەکرێن و لەجیاتی دار بۆ سووتەمەنی، کەڵک لە ئێسقان وەردەگرن و گۆشتەکە دەکوڵێنن. ئەگەر مەنجەڵ دەستنەکەوێ، هەناوی ئاژەڵی سەربڕاو پڕ لە گۆشتی نەرمە دەکەن، ئاوی لەپاڵ دەکرێ و ئاگریش

---

١- ئیستیا، ئیلاهەی کۆڕی گەرمی بنەماڵە لە یۆنانی باستاندا.

٢- پۆسیدون یا نیپتون، خواوەندی دەریاکان لە یۆنانی باستان.

به ئیسقان هه‌ڵده‌کرێ و زۆر چاکیش ده‌سووتێن. به‌و چه‌شنه هه‌م که‌ڵی قوربانی‌کراو و هه‌م گۆشته‌کانی نێو هه‌ناوی وه‌ک یه‌ک ده‌کوڵن. وه‌ختێک گۆشت کوڵی، خاوه‌ن قوربانی هێندێک له‌و گۆشته‌ی نێو هه‌ناوی ئاژه‌ڵه‌که هه‌ڵده‌گرێ و له‌پێش خۆی داده‌نێ. سکیتی‌یه‌کان به ئاژه‌ڵی‌تریش و به‌تایبه‌تی به ئه‌سپه‌کانیان قوربانی ده‌که‌ن.

**[٦٢]** نه‌ریتی قوربانی سکیتی‌یه‌کان بۆ خواکانی‌تر، به‌تایبه‌ت بۆ خواوه‌ند ئاریس به‌و چه‌شنه‌یه: له نێوه‌ندی ئیداری هه‌ر پارێزگایه‌ک(پریتانی)، جێگایه‌ک به باقه گیای ویشک دروست‌ده‌که‌ن. ئه‌و شوێنه چوارگۆشه‌یه و درێژی و پانی ده‌گاته سێ ستادیۆ[1]. به‌رزی ئه‌و شوێنه له سێ ستادیۆ که‌متره. له‌سه‌رئه‌و جێگایه، سه‌کۆیه‌کی چوارگۆشه و بچووکتر سازده‌کرێ و ته‌نیا لایه‌کی سکۆی گۆرین به‌مه‌به‌ستی وه‌سه‌رکه‌وتن لێژی پێدراوه و ناسراوه به سکۆی پیرۆز. ساڵێ جارێک ئه‌و شوێنه پیرۆزه دروست ده‌کرێ و سه‌د و په‌نجا باقه گیای تێده‌چێ. سکیتی‌یه‌کان بۆیه له گیای ویشک که‌ڵک وه‌رده‌گرن، چونکه وڵات له‌سه‌رمان به‌ستوویه‌تی و مه‌ترسی هه‌ڵخلیسکان زۆره. له‌سه‌ر ئه‌و سکۆیه، شمشێرێکی ئاسنی کۆن داده‌ندرێ. ئه‌و شمشێره نیشانه و سیمبۆلی خواوه‌ند ئاری‌یه. گشت ساڵێک ئاژه‌ڵی جۆراوجۆر و به‌تایبه‌ت ئه‌سپ، وه‌ک قوربانی پێشکه‌ش به‌و خوایه ده‌کرێن (و: ڕه‌نگه به‌و شمشێره سه‌ریان ببڕن). خه‌ڵک بۆ خواوه‌ند ئاری پتر له خواکانی‌تر قوربانی ده‌که‌ن. له‌و یه‌خسیر و دیلانه‌ی له دوژمن گرتوویانه، له هه‌ر سه‌د که‌س، یه‌کێک هه‌ڵده‌بژێرن و سه‌ری ئه‌ویش لێده‌ده‌ن و ده‌یکه‌نه نێچیری قوربانی. دیاره نه به‌و شێوازه‌ی که بۆ قوربانی‌کردنی ئاژه‌ڵ به‌ڕێوه‌ده‌چێ، به‌ڵکوو هێندێک جیاوازتره. له‌سه‌ر سه‌کۆی پیرۆز، سه‌ره‌تا سه‌ری کابرای دیل به شه‌ڕاب ده‌شۆن، گه‌رووی ئه‌و دیله له‌سه‌ر ده‌فرێک ده‌بڕن. شمشێری خواوه‌ند ئاری ئه‌وسا له‌نێو ده‌فری خوێن ده‌نێن. ئه‌وه کۆمه‌ڵه کردارێکن که له‌سه‌ر سکۆ به‌ئه‌نجام ده‌گه‌ن. له خواره‌وه‌ی ئه‌و سه‌کۆیه، قۆڵی ڕاستی کابرای

---

١- ستادیۆ، پێوانه‌ی مه‌ودا له یۆنانی باستاندا و به‌رابه‌ری ١٧٧ میتر و ٦ سانتیمیتر بووه.

قوربانیکراو لەراستی شانییەوە لێدەکەنەوە و حەوایدەدەن. دوای ئەوەی ئاژەڵەکانیتریشیان قوربانی کرد، ئەوجار خەڵک دەچێتەوە سەر ماڵ و حاڵی خۆی. ئەو قۆڵە براوی حەوادراو لە هەر شوێنێک کەوتە سەر عەرز، لەوێ دەمێنێتەوە. پاشماوەی لەشی کابرای قوربانیکراویش لە شوێنێکیتر بەجێدەهێڵن.

**[٦٣]** ئەوە کۆمەڵە باسێک سەبارەت بە شێوازی قوربانی کردنی ئەو خەڵکە بوو. سکیتییەکان عادەتیان نییە بەراز رابگرن، تەنانەت حەز بە بوونی ئەو ئاژەڵە لە وڵاتەکەشیان ناکەن.

**[٦٤]** نەریتی جەنگاوەریی سکیتییەکان بەو چەشنەیە: وەختێک سکیتییەک یەکەم کەسی لە دوژمن کوشت، خێرا خوێنی کوژراوەکە دەخواتەوە. هەر چەند کەسی لە هێزەکانی دوژمن کوشتبێ، سەریان دەبڕێ و بۆ پاشایان دەبا. ئەگەر تەنیا یەک سەریشی بڕیبێ، دەتوانێ لەگەڵ خۆی بیهێنێ و لە دابەشکرانی دەستکەوتەکاندا پشکداربێ. بەڵام بەپێچەوانەوە، ئەگەر کەسی نەکوشتبێ و سەری براوی پێنەبێ، هیچ پێنابڕێ. سکیتییەکان کەلاک و سەرە براوەکان بەو چەشنە کەوڵدەکەن. کابرای سکیتی دەوری کەللە سەرەکە لە سەرووی گوێیەکان بە تیغ خشت دەبڕێ، ئەوجار قژی ئەو کەللەیە لەپڕێکا رادەکێشی و کەوڵیدەکا. دوای ئەوکارە بەیارمەتی ئێسقانی پەراسووی کەڵ، گۆشت و قەڵەوایی ئەو کەوڵە لێدەکەنەوە. کەوڵەکە ماوەیەک بەدەست نەرم و شلی دەکەن و کاتێک تەواو ئامادە بوو، وەک دەسماڵ بە هەوساری ئەسپەوە هەڵیداوەسن و لەمەر ئەوکارەیان گەلێک شانازی بەخۆیان دەکەن، چونکە هەرکەس لەو دەسماڵە چەرمییانەی کەللەسەری دوژمنی پتر هەڵواسیبێ، زیادتر وەک شەڕکەری بەغیرەت سەیری دەکرێت.

زۆرکەس لە سکیتییەکان لەو کەوڵانە جلوبەرگ سازدەکەن. کڵاوی شوانەکانیان، لە دوورینی چەند پارچەیەک لەو کەوڵانە پێکهاتووە. هەروەها ئەو کڵاو و جلوبەرگە دەپۆشن. خەڵکانێکی سکیتی پێستی دەستی راست کەلاکی دوژمن کە نینۆکەکانیشی پێوەن، دەکەنە سەرپۆشی کالانی

تیرەکانیان. من خۆم دیتوومە کە پێستی مرۆڤ ئەستوور و رووناکە، دەکرێ بڵێم لە گشت کەوڵێکیتر رەنگ کراوەتر و سپیترە. هێندێک لە سکیتییەکان مرۆڤەکە بەتەواوی کەوڵدەکەن و چەرمەکە لە چوارچێوەی دار دەبەستن بۆوەی لێکبکێشرێتەوە، دواتر ئەو کەوڵانە بە ئەسپەکانیان دادەدەن.

[٦٥] ئەوە باسێک لەسەر دابونەریتی سکیتییەکان بوو. سکیتییەکان کەللە سەرەکانی دوژمن و نەیارانی خۆیان بەو چەشنە بەکاردەهێنا: کابرای سکیتی بە مشار کەللە سەری لە ژێرەوەی برۆکانەوە دەبڕییەوە و نێوەکەی خاوێن دەکردەوە. خەڵکی نەدار و هەژار کەوڵی کەڵیان بە دەباغی نەکراوی لەو کەللەیە وەردەپێچا و چەشنی کڵاو کەڵکیان لێوەردەگرت، بەپێچەوانەوە سکیتییەکانی دەوڵەمەند، جیا لەوەی کەوڵیان بەسەر کەللە براوەکە هەڵدەکێشا، دیوی نێوەوەیان ئاوزێڕ دەکرد و چەشنی دەفری ئاوخۆری دایاندەنا. ئەو خەڵکە ئەگەر لەگەڵ خزمەکانی نیزیکی خۆشیان تووشی کێشە هاتبان، هەمان رەفتاریان دەکرد، بەتایبەتی لەو کاتەدا کە لە حزووری پاشا پێویستە ململانێ بکەن و هەرکامیان تووشی شکست هاتبا، کەللەسەری کابرای تێکشکاو چاوەڕوانی هەمان چارەنووس دەبوو.

سکیتییەکان هەرکات کەسێکی بەقەدر و رێزیان لێ میوان بێ، ئەو کەللە سەرانەیان پێنیشان دەدەن و ئەوەش دەڵێن کە کەللەسەری هاوڕەگەزەکانی خۆیانە و دوژمنایەتیان پێکەوە هەبووە و بەسەریاندا زاڵبوونە. کاتێک ئەو سکیتییانە لەو بارەوە قسە دەکەن، گەلێک شاییان بەخۆیە و دەڵێی قارەمانەتییەکی گەورەیان نواندووە.

[٦٦] گشت ساڵێ جارێک، پارێزەری ئیداری ناوچە، خومرە شەڕابێک دێنێ و ئاوی لەباڵدەکا و ئەو سکیتییانە بۆیان هەیە لێی بخۆنەوە کە ژمارەیەک لە دوژمنانیان کوشتبێ. ئەوانەی هیچکەسیان نەکوشتبێ، بەبێ حورمەتی چاویان لێدەکرێ و دەبێ بەشەرمەوە سەری خۆیان داخەن و بۆیان نییە لە شەڕابەکە بخۆنەوە. بۆ ئەوانە دوژمن نەکوشتن خەجاڵەتی زۆری بەدواوەیە.

ئەو کەسانەی ژمارەیەکی زۆریان کوشتبێ، دوو دەفری پڕ لە شەرابیان پێدەدرێ و بەدوای یەکتردا دەیانخۆنەوە.

[٦٧] سکیتی‌یەکان خاوەن ژمارەیەکی زۆر فاڵگر و تاڵەبینن. ئەوانە بۆ کارەکەیان کەڵک لە غەڵفی شەنگەبی وەردەگرن و شێوازی فاڵگرتنەوەکە بەو چەشنەیە: کابرای فاڵگیر کۆپلەیەک لەو غەڵفانە لەسەر عەرز دادەنێ، گشت‌یان دەقەڵێشێ و پاشان یەکیەک هەڵیاندەگرێ و بەدەم دوعاکردنەوە، دەیانخوێنێتەوە و پێشگۆیی خۆی دەکا و ئەوجار لەسەر عەرز دایاندەنێتەوە. ئەوان دەڵێن کە ئەو شێوە فاڵگیرییە لە باب و باپیرانیانەوە پێیان‌گەیشتووە. خەڵکی ئیناری[١]، گشتیان نێرەمۆکن و لەو باوەڕەدان کە خواوەند ئەفرۆدیت ئەو شێوە فاڵگیری و پێشگۆییەی خەڵات کردون. نێرەمۆکەکان بەشێوازی جیاوازی خۆیان فاڵ‌دەگرنەوە و کەڵک لە توێڵکی داری زیرفون (چەشنی سنجو، بەڵام بێبەر) وەردەگرن.[٢] توێڵکی غەڵفی ئەو دارە بە سێ جێ ریشۆڵ‌دەکەن، لە دەوری قامکەکانیان دەهاڵێنن و پاشان وردەوردە ریشۆڵەکان شلدەکەنەوە و هاوکاتیش دوعا دەخوێنن و پێشگۆیی خۆیان دەڵێن.

[٦٨] کاتێک پاشای سکیتی‌یەکان نەخۆش بکەوێ، بەدوای سێ کەس لە فاڵگیرە لێزانەکاندا دەنێرێ و ئەوانە بەو شێوەیەی باسم کرد، فاڵ دەگرنەوە. فاڵگیرەکان بەردەوام گوتەیەک یا شتێکی لەوبابەتە دەڵێن و دووپاتی دەکەنەوە: "فڵان کەس یا فڵانی". ئەوانە لەڕاستیدا ناوی ئەو کەسانە دێنن کە بەفاڵگرتنەوە پێیگەیشتوون. ئەو کەسە دەبێ سوێندی بەدرۆی بە خانەدانی پاشایەتی خواردبێ. پیاوانی پاشا هەرکە ناوی ئەو کەسە لە زمان فاڵگیرەکانەوە دەبیسن، خێرا بەدوای کابرادا دەگەڕێن و دەیگرن. لەنێو سکیتی‌یەکاندا باوە کە پتر سوێند بە خانەدانی پاشایەتی دەخۆن و بە شاهیدی دەگرن. بەهەرحاڵ کابرا دەگرن و دەیهێنن. کاتێک گەیشتە بەردەم

١- ئەوانە گشتیان فاڵگیر و جادوگەر بوونە.

٢- زیرفون، ئەو دارە و گوڵەکەی پێشکەش‌کراو بە ئیلاهە ئەفرۆدیت.

فاڵگیرەکان، ئەوان تاوانباری دەکەن کە سوێندی بەدرۆی بە خانەدانی پاشایەتی خواردوە و بە شاهیدی گرتوون، بۆیە پاشا نەخۆش کەوتووە. کابرا تاوانەکە ڕەد دەکاتەوە و بە قەڵسی و توڕەیی تەواو سوێند خواردنەکە وەدرۆ دەخاتەوە. کاتێک ئەو کابرایە بوختانەکە قبوڵ ناکا، پاشا ئەمر دەکا کە کۆمەڵێک فاڵگیریتر بێنن. ژمارەی ئەو کۆڕەی دوایی دووبەرابەری ئەوانەی پێشوو دەبێ. ئەگەر ئەوانە بتوانن بە فاڵگرتنەوە، کابرا وەدرۆ بخەنەوە، تاوانبار خێرا سەری لێدەدرێ و ماڵوملکی بەسەر فاڵگیرەکانی دەستەی یەکەمدا دابەش دەکرێ. بەڵام ئەگەر ئەو کۆڕەی دوایی فاڵگیرەکان، کابرا بەبێ تاوان بزانن، ئەوسا کۆمەڵێکیتر بانگهێشت دەکرێن. هەروەختێک زۆربەی فاڵگیرەکان، کابرا بە بێتاوان بزانن، ئەوجار نۆرەی سەربڕینی دەستەی یەکەمی فاڵگیرەکان دێ.

[٦٩] فاڵگیرە تاوانبارەکان بەو شێوەیە سزا دەدرێن: سکیتییەکان گالێشێک (گیشە گیا) لە گیای ویشک، لە عارەبانەی کەڵان باردەکەن. دەست و لاقی تاڵەبینەکان دەبەستن و لەنێو گالێشکەدا دایاندەنێن و زاریان بە پەڕۆ دەئاخنن. ئەوجار ئاگر لە گالێش بەردەدەن و کەڵەکان دەنگ دەدەن. ئەو عارەبانەیە بەدەوری بازنەیەکدا وەک گێرەکردن، دەخولێتەوە. زۆرجار کەڵەکانیش وێڕای فاڵگیرەکان دەسووتێن و دەبنە خەڵووز. جاری ئاواش هەیە، تەنیا نیری سەر ملیان دەسووتێ و کەڵەکان رادەکەن و لە ئاگری گیشەگیا دووردەکەونەوە و تەنیا تۆزێک ملیان دەسووتێ.

ئەوەش بڵێم کە فاڵگیرە درۆزنەکان بە تاوانیتریش هەربەو چەشنە سزادەدرێن و دەخرێنە نێو مەنجەنیقی ئاگرەوە. پاشای سکیتی وەختێک کەسێک بکوژێ، تەواوی ئەندامانی نێرینەی بنەماڵەی کابرای کوژراو سەردەبڕێ، بەڵام هیچ ئازارێک بە کچەکان ناگەیێنێ.

[٧٠] سکیتییەکان بەو شێوەیە سوێند دەخۆن: ئەوان سەرەتا دەفرێکی گڵێنە پڕ لە شەراب دەکەن. ئەو کەسانەی قەرارە سوێند بخۆن، بە چەقۆ، دەرزی یا هەرشتێکی تیژ بریندار دەکرێن و تۆزێک لە خوێنیان تێکەڵ بە

شەڕابەکە دەکرێ. پاشان هێندێک لەو شەڕابە لە شمشێر، تیر و کەوان، نێزە و تەورەکەنیان هەڵدەسوون. دوای ئەنجامی ئەو بەشە، کۆڵێک دوعا دەکەن و لە خواکانیان دەپاڕێنەوە. لە کۆتاییدا، گشت ئەو کەسانەی پێویستە سوێند بخۆن، تەنانەت شاهید و دۆستە نیزیکەکانیش، لەو شەڕابە خوێناوییە دەخۆنەوە.

**[۷۱]** گۆڕستانی پاشاکانی سکیتی لە ناوچەی ێێرۆس، ڕاست لەو شوێنە هەڵکەوتووە کە ڕووباری ڤۆریستێنیس بۆ گەمیئاژۆتن دەست دەدا. کاتێک پاشای سکیتی دەمرێ، گۆڕێکی چوارگۆشەی گەورە هەڵدەکەنن. هەرکە گۆڕ ئامادەبوو، ئەوجار جەنازەکە دێنن. هەڵبەت بەر لە هێنانی جەنازەکە، پێشتر مۆمی تواوەی تێهەڵدەسوون. ورگی هەڵدەدڕن و هەناوی دەردێنن و خاوێنی دەکەنەوە و کۆڵێکی میسکی کوتراو و کەرستەی بۆنخۆشی چەشنی کوندۆر و تۆوی جەعفەری و نەعنای تێدەکەن و دووبارە دەیدورنەوە. ئەوجار جەنازە لەسەر عارەبانە دادەنێن و بۆ خێڵێکیتری دەنێرن. ئەو خێڵە جەنازە وەردەگرێ. ئەندامانی ئەو هۆزەش وەک سکیتییەکانی پاشازادە لەگەڵ جەنازەی گۆرین هەڵسوکەوت دەکەن، واتە ئەوانیش پارچەیەک لە گوێی خۆیان دەبڕن و دەوراندەوری سەریان دەتاشن و قۆڵی خۆیان دەقەڵێشن و نێوچاوانییان بریندار دەکەن و شیش لە دەستی چەپی خۆیان ڕۆدەکەن. ئەو کۆمەڵە سکیتییەش بەنۆرەی خۆیان جەنازە لەسەر عارەبانە دادەنێن و بەرێیدەکەنە هەرێمێکیتر کە خەڵکێکیتری ژێردەستەی پاشا وەریدەگرن. هەر هۆز یا نەتەوەیەک جەنازەی پاشای بەر لە خەڵکانیتر پێبگا، کاتی بەرێکردنی تەرمی پاشا، لەگەڵ جەنازەکە دەچن. بەهەرحاڵ تەرمی پاشا سەردانی گشت نەتەوەکانی ژێردەستی سکیتییەکان دەکا. دوای گەڕانی جەنازەی گۆرین بەو چەشنەی باسم کرد، ئەوجار دەگاتە دەست خەڵکی هەرێمی ێێرۆس. ئەوانە لەگشت خەڵکانیتر دورەدەستترن و گۆڕی پاشا لای ئەوانە. وەختێک تەرمی پاشا گەیشتە قەبرستان، لەنێو قەبر لەسەر فەرشێکی گەڵا وسەوزەگیا دادەندرێ. لەدەوری ئەو گۆڕە کۆمەڵێک قوڵەدار

دەچەقێندرێن و ئاڵوداریان بەسەردا ڕەیاڵدەکرێ و سەری دارەکان مەحکەم دەبەسترێن و پاشان بە ئالآشی حەسیر و قامیش دادەپۆشرێن. بە واتایەک کەپرێک لەسەر قەبرەکە دروستدەکرێت. لە بەشێکیتری ئەو قەبرە چوارگۆشە زلەدا، کەسانیتر دەنێژرێن. ئەو کەسانە بریتین لە مەعشوقە، ئاودەستچی، ئاشپەز، میرئاخور، مەیتەر، تەتەر و خزمەتکاری پاشا. جەنازەی ئەوانە پێکەوە دەنێژرێن. ئەسپەکانی پاشا، کۆڵێک کەرستە و کەلوپەل و دەفر و جامی زێڕ، خڕیان لەو قەبرەدا ژێرخاک دەکرێن. داوی ناشتنی تەرمی پاشا و هەموو کەرستە و ئەو کەسانەی قەرارە لەگەڵی بەخاک بسپێردرێن، ئیدی نۆرەی پڕکردنەوەی گۆڕی چوارگۆشە دێت. گلکەی قەیاسێکە و خەڵکەکە لەمەر پڕکردنەوەی دەکەونە ڕکەبەرایەتی. گشت هەوڵەکەش بۆوەیە کە خاکی سەر گۆڕی پاشا، پتر و بەرزتر و بەرچاوتر بێ.

**[۷۲]** پاش ئەوەی ساڵێک تێپەڕی، ئەوجار سکیتییەکان ئەو ڕێورەسمە بەڕێوەدەبەن: باشترین خزمەتکارانی پاشای مردوو کۆدەکەنەوە. ئەوانە هەر هەموویان بەڕەچەڵەک سکیتیین و پاشا خۆی بۆ خزمەتکردن هەڵیبژاردوون. پەنجا کەسیان لێدەست نیشان دەکرێن و لەگەڵ پەنجا سەر ئەسپی چاک، گشتیان دەخنکێندرێن. سکیتییەکان دوای ئەوەی مرۆڤەکان و ئەسپەکانیان خنکاند، ئەوجار زگیان دەدڕن و پاش خاوێنکردنەوەیان، پڕ لە کا دەکرێن و دەدوورێنەوە.

سکیتییەکان دوو کۆڵەکە لە پێشەوە و دوو لە پاشەوە دەچەقێنن. چەرخی داشقە لەنێوڕاستەوە دوولەت دەکەن و تەنیا نیو بازنەکان دەهێڵنەوە. هەر نیمچە بازنەیەک دەکەوێتە نێوان دوو کۆڵەکەی چەقاو. سەری ئەو نیمچە بازنانە لە سەری کۆڵەکە چەقاوەکان مەحکەم دەبەسترێن. نیمچە بازنە بەچەشنێک هەڵدەکەوێ کە٠ سکی بەرەو خوار و بۆشایی هەناوی بەرەو ئاسمان بێ. لەو کۆڵەکە و نیمچە بازنانە ژمارەیەکی زۆر لەو دەوری گۆڕی پاشا دەچەقێندرێن. دوای تەواو بوونی چەقاندنی کۆڵەکەکان و بەستنی بازنەکان، نۆرەی سوارکردنی ئەسپەکان دێ. بازنەی پێشەوە دەکەوێتە ژێر

سینگی ئەسپ و بازنەی پشتەوەش دەکەوێتە شوێنی تەنگەی قایش لەبەر زگ و بەلای پاشوەکاندا. واتە لینگ و دەستەکانی ئەسپ شۆڕ دەبنەوە.

پێشتر دارشەقڵەیەکی مەحکەم لە پاشەوەڕا لە لەشی ئەسپ دەبڕن، بۆوەی کەلاکی ئەسپ لەنێو قەدەوە نەشکێتەوە. ئەو شەقڵەیە تا نێوشانی ئەسپەکە دێت. دوای سوارکردنی ئەسپەکان لەسەر نیوبازنەکان، ئەوجار نۆرەی جەنازەی خزمەتکاران دێت. ئەوانیش لە پاشەوەڕا چەشنی ئەسپەکان، شەقڵەی درێژیان تێبڕیون. بەرزیان دەکەنەوە و لەسەر ئەسپەکان سواریان دەکەن. ئەو بەشە زیادییەی شەقڵەی خزمەتکارەکە لە نێوەڕاستی مازەی پشتی ئەسپ دێتە ژوورەوە و لە شەقڵەی نێو زگی ئەسپەکە دەبەسترێ. لەڕاستیدا داوەڵ و شەمایلی سوارکارەکان دروست دەکرێن و بەواتایەک پەنجا کەسی سوارکار لە دەوری گۆڕی پاشا خەریکی خزمەت و پاسەوانین. سکیتی‌یەکان دوای ئەو ڕێورەسمە، گشتیان بەرەو ماڵ دەگەڕێنەوە.

[۷۳] ئەوە شێوەی ناشتن و پاراستنی پاشای سکیتی‌یەکان بوو. لەمەر ئەو کەسانەی خزمی نیزیکن و دەمرن، بەو چەشنەیە: جەنازەی مردوو لەسەر عارەبانە دادەنێن و بە ماڵی خزم و دۆست و ئاشنادا دەیگێڕن. هەرکام لەوانە بە حورمەتەوە کۆڕی مردووگێڕان وەردەگرن و بە میوانداری پێشوازیان لێدەکەن. خواردن بۆ مردووش، چەشنی زیندووان دادەنێن. بنەماڵەی مردوو چل ڕۆژی تەواو تەرمی کابرا بەو چەشنە دەگێڕن و پاشان دەینێژن. سکیتی‌یەکان دوای بەخاکسپاردنی مردوو، ئەوجار لەسەریانە خۆیان پاک بکەنەوە (غوسڵ دەربکەن). مەرهەمێکی بۆنخۆش لە سەریان هەڵدەسوون و دواتر خاوێن دەیشۆن. سەبارەت بە لەشیان جۆرێکی‌ترە. سێ داری شەقڵە دەچەقێنن و سەریان وێکدێننەوە و لباد یا ڕەشماڵی پێدادەدەن. هەوڵدەدەن لێواری ڕەشماڵ یا لباد تەواوێک جووت بن و هیچ درزێک نەمێنێ. لەژێر ئەو خێوەتەدا تەشتێک دادەنێن پڕی دەکەن لە بەردی گەرمی سووربۆوە (جۆرێک حەمامی سۆنا).

[٧٤] له وڵاتی سکیتی‌یەکان چەشنە دەغڵێکی شەدانە دەڕوێ کە ئەگەر بەژن و درشتی ئەو گیایە لەبەر چاو نەگرین، پتر وەک پنچکی لۆکە دەچێ. هەڵبەت گیای پنچکی شەدانە لە هی لۆکە بەرزتر و ئەستورترە. رووەکێکی کێوی‌یە و دەکرێ تۆوەکەشی بچێندرێ. خەڵکی تراکی لە قەسەڵی ئەو گیایە جلوبەرگ دەچنن و شێوەی بەرگی کەتانی دەدا. پیاو ئەگەر ئەزموونی باشی نەبێ و پێشتر کەتانی نەدیبێ، ناتوانێ ئەو دووانە لێک جیا بکاتەوە و هەرکە چاوی بە جلوبەرگی چنراو لە شەدانە کەوت، پێیوایە کەتانی‌یە.

[٧٥] سکیتی‌یەکان تۆوی شەدانە لەگەڵ خۆیان دەبەنە ژێر خێوەتی دروستکراو و بەسەر بەردەکانی سورەوەبوودا دەیپڕژێنن. کاتێک ئەو تۆوە بەرەبەرە بەسەر بەردەکاندا دەکەن، هەڵم و دوکەڵێکی بۆنخۆش سازدەبێ. هەڵمی ژێر خێوەت ئەوەندە زۆرە کە لە توانایی هیچ حەمامێکی یۆنانیدا نییە. سکیتی‌یەکان بەو چەشنە حەمام کردنە شاد دەبن و لە خۆشیان هاواریان لێ هەڵدەستێ.

ئەو کردەوەیە لەڕاستیدا بۆ سکیتی‌یەکان جۆرێک حەمام کردنە. چونکە ئەوان هیچکات لەشی خۆیان بە ئاو ناشۆن. ژنەکانیشیان داری سەولە و سەدر و عود بە بەردی گڕنی و زوور دەهاڕن و دەیکەنە هەویر. پاشان ئەو هەویرە لە روخساریان هەڵدەسوون. هەویرەکە بۆیەکی دڵنشینی هەیە و لە لەشیان دەنیشێ. ئەو ژنانە رۆژی دوایی هەویرەکە لێدەکەنەوە و پێستی روومەتیان ساف و بریقەدارە.

[٧٦] سکیتی‌یەکان نەفرەتیان لە دابونەریتی بێگانەیە و بەتایبەت نەریتی یۆنانی‌یەکان بەهیچ شێوەیەک پەسند ناکەن. ئەوان ئەو نەفرەتەیان لەکاتی کوشتنی ئەناخارسیس[١] و دواتریش سەبارەت بە سکیلیس دەربڕی. ئەناخارسیس زۆربەی وڵاتان گەڕا و زانستێکی فرەی وەسەریەکنا و ئەوجار گەڕاوە وڵاتی خۆی واتە سکیتیا. ناوبراو بە کاناڵی ئاویی

١- ئەناخارسیس، یەک لە حەوت زانا و ماقوڵانی سەردەمی باستان و دەگووترێ کە گەلێک دۆزینەوە و توێژینەوەی کردوە.

ئێلیسپۆندۆس‌دا[1] تێپەڕی و گەیشتە کیزیکۆ[2]. لەو کاتەدا بوو کە دیتی خەڵک جێژنێکی پڕشکۆیان بەبۆنەی دایکی خواکان[3] سازکردوە. ئەناخارسیس نەزری کرد و بەڵێنی بە دایکی خواکان‌دا هەرکات بە سلامەتی بگەڕێتەوە وڵاتی خۆی، قوربانی بەو شێوازە پیشکەش بکات کە دانیشتووانی شاری کیزیکۆ دەیکەن و شەوێکیش تا بەیانی عیبادەتی دایکی خواکان بکا.

ئەناخارسیس کاتێک گەیشتەوە وڵاتی سکیتیا، چوو بۆ ناوچەی یێلیئا (لە نیزیک ڕێگای ئاخیلیئۆس هەڵکەوتووە و بە دارستانی چڕ داپۆشراوە). ناوبراو لەو ناوچەیە ڕێورەسمی قوربانی و جێژن‌گرتن بۆ دایکی خواکانی بە وردەکاری تەواوەوە بەڕێوەبرد. ئەناخارسیس دەهۆڵێکی دەسدایە و چەند هێمایەکی ئەو خوایەی بە خۆیەوە هەڵواسی. کەسێکی سکیتی چاوی بە ناوبراو کەوت و خێرا شای لێ ئاگادار کردەوە. ساڤلیۆس پاشا خۆی چوو و چاوی بە ئەناخارسیس لەکاتی بەڕێوەبردنی ڕێورەسمەکەدا کەوت و لەجێوە کەمانی دەست دایە و تیرێکی لە ئەناخارسیس‌دا و کوشتی.

ئەگەر ئەمڕۆ پیاو بخوازێ سەبارەت بە ئەناخارسیس پرسیارێک لە سکیتی‌یەکان بکات، لە وڵامدا دەڵێن ئەو کابرایە ناناسین. هۆیەکەشی ئەوەیە کە ناوبراو سەفەری یۆنانی کردبوو و فێری دابونەریتی ئەوان ببوو. بەپێی ئەو گووتانەی کە خۆم لە زمانی تیمنیس بیستوومە، واتە ئەو کەسەی جێگای باوەڕی ئاریاپیتیس بووە، ئەناخارسیس مامی ئیدانتیرسۆس و کوڕی غنوروس بووە. غنوروس، ئەویش کوڕی لیکۆس و نەوەی سپارغاپیتیس بووە. کەوابوو، ئەگەر ئەناخارسیس سەر بەو بنەماڵەیە بووبێ، دەبێ بڵێین کە ناوبراو بەدەستی برای خۆی کوژراوە. چونکە ئیدانتیرۆس کوڕی ساڤلیۆس بووە. ساڤلیۆس هەمان ئەو کەسە بوو کە ئەناخارسیسی کوشت.

---

١- ئەمڕۆ ناسراوە بە داردانێل.

٢- شارێکی ئاسیای بچووک لە سەردەمی باستاندا و گرینگ لە باری نیزامییەوە لە کەنارئاوەکانی دەریای مەدیترانە.

٣- دایکی خواکان لێرەدا مەبەست لە ئیلاهە کیڤێلی یا سیبێلە و بەو بۆنەوە مەعبەدێکی گەورە لەسەر چیای دیندیمۆن دروست کراوە و خوای سروشتی نەشەمزاوە.

[٧٧] دیاره من ئەو ڕووداوەم بە شێوەیەکیتریش لە زمانی دانیشتووانی دەڤەری پێلۆپۆنیسۆ بیستووە. ئەوان دەڵێن ئەناخارسیس لەلایەن پاشای سکیتییەکانەوە نێردراوەتە یۆنان، بۆوەی دەرس بخوێنێ. کاتێک ئەناخارسیس گەڕاوەتەوە لای پاشا گوتوویەتی، یۆنانییەکان جیا لە هۆزی لاکیدێمۆنی، هەر هەموویان گەلێک تامەزرۆی فێربوونن، هەرچەند لاکیدێمۆنییەکان تەنیا هۆزێکن کە دەزانن قسە بکەن و گوێبگرن و دورئەندێش و بەتەگبیرن. دیارە ئەو قسەیە بێمانایە و دەستکردی یۆنانییەکان خۆیانە.

ئەناخارسیس تەنیا بەو شێوەیە کوژرا کە پێشتر باسم کرد. ئەوە چارەنووسی ناوبراو بوو. ئەو بۆیە تووشی ئەو نەهامەتییە هات، چونکە فێری دابونەریتی بێگانە ببوو و پێوەندی دۆستانەی لەگەڵ یۆنانییەکان دامەزراندبوو.

[٧٨] ساڵانێک دواتر، سکیلیس کوڕی ئاریاپیتیس، ئەویش بە هەمان شێوە تیداچوو. پاشای سکیتی واتە ئاریاپیتیس لەو سەردەمەدا، جیا لە سکیلیس چەند منداڵێکیتری هەبوو. دایکی سکیلیس خەڵکی ئیسترياس[1] و بەڕەگەز سکیتی نەبوو. ئەو دایکە سکیلیسیە کوڕەکەی خۆی فێری خوێندن و نووسین بە زمانی یۆنانی کرد.

ساڵانێک دواتر، سپارگاپیتیس، پاشای ئاغاتیرسییەکان، ئاریاپیتیسی کوشت و سکیلیس لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت و ژنی باوکی خۆی بەناوی ئۆپیئیی بە هاوسەری هەڵبژارد. ئۆپیئیی خەڵکی خودی دەڤەرەکە بوو و لە ئاریاپیتیس کوڕێکی هەبوو، پێیدەگووترا ئۆریکۆ. سکیلیس بەنابەدڵی لەسەر تەختی پاشایەتی وڵاتی سکیتیا دانیشت و هیچ حەزی لە شێوە ژیانی سکیتییەکان نەبوو. ناوبراو گەلێک خوازیار و تامەزرۆی نەریتی یۆنانی بوو و خووی پێگرتبوو و لەگەڵی گەورە ببوو. هەربۆیە بەو شێوەیە هەڵسوکەوتی کرد:

---

١- ئیسترياس، موهاجیرنشینێکی یۆنانی لە نیزیک روباری ئیستروس یا دانوبی ئەمڕۆ.

هەرجارێ کە لەشکری بۆ شاری ڤۆریستێنیس دەبرد (دانیشتووانی ئەو شارە دەڵێن کە بە رەگەز خەڵکی ناوچەی میلیتۆسن)، ئۆردووی لە دەرەوەی شار لێدەدا و خۆی دەچوو بۆ نێو شار و دەروازەکانی دادەخست و جلەکانی سکیتی دادەکەند و بەرگی یۆنانی دەپۆشی و بەبێ پاسەوان بەنێو شاردا دەگەڕا و هیچکەسی‌تری لەگەڵ خۆی نەدەبرد. (هەڵبەت پاسەوانەکان چاوەدێری دەروازەکانیان دەکرد، بۆوەی کەسی سکیتی ناوبراو بەو جلوبەرگەوە نەبینێ. سکیلیس ئەو یەک مانگە بەشێوازی یۆنانی دەژیا و چەشنی یۆنانییەکان قوربانی پێشکەش بە خواکان دەکرد. وەختێک مانگ تێپەڕ دەبوو، رەنگە پتریش، جلوبەرگی یۆنانی دادەکەند و بە بەرگی سکیتییەوە دەگەڕاوە لای لەشکر. سکیلیس بەردەوام هاتووچۆی ئەو شارەی دەکرد. لەوێ قەسری دروست کردبوو و لەگەڵ ژنێکی خۆجێیی ژیانی هاوسەری پێکهێنابوو.

[٧٩] لەهەرحاڵدا ئەوە چارەنووسی ناوبراو بوو کە تووشی نەهامەتییەکی ئەوتۆبێ: ناوبراو گەرەکی بوو بچێتە سەر رێبازی ئایینی ڤاکخۆس[١]. سکیلیس لەو کاتەدا کە دەستیان گرتبوو و بەرەو شوێنی رێورەسمەکەیان دەبرد، رووداوێکی سەرسوڕهێنەر قەوما. هەروەک پێشتر باسم لێوە کرد، ئەو قەسرێکی گەورەی لە شاری ڤۆریستێنیس‌یەکان هەبوو. قەسرێکی رازاوە بە کۆمەڵێک پەیکەرەی شێرداڵ (لەش شێر و سەرهەڵۆ) و سیسارکە کەچەڵەی دروستکراو لە بەردی مەڕمەڕی سپی.

خواوەند بە هەورە تریشقە ئاگری لەو قەسرە بەردا. گشتی ئاگری گرت، بەڵام ئەو ئاگرکەوتنەوەیە پێشی بە سکیلیس نەگرت و ناوبراو رێورەسمی وەرگەڕان بۆ سەر رێبازی ئایینی ڤاکخۆسی درێژەپێدا و تەواوی کرد.

---

١- ڤاکخۆس، دیۆنیسۆس خوای یۆنانی، لە وڵاتی لاتینی‌یەکان وەک ڤاکخۆس دەناسرا و بەلای میسرییەکانەوە هەمان ئۆسیریس بووە. ڤاکخۆس خوای شەراب، کوڕی دیا (ژوپیتێر) و لە زۆربەی وڵاتانی سەردەمی کۆن، جێژنی گەورە و بەشکۆی بۆ گێراوە.

سکیتی‌یەکان لۆمەی یۆنانی‌یەکان دەکەن لەمەر بەڕێوەبردنی ڕێورەسمی ئایینی ڤاکخۆس و پێیانوایە خوایەک مرۆڤەکان بۆ جەزم بوون و مەستی هانبدا، بۆیە نابێ پیاو بیپەرستێ. لەوکاتەدا کە سکیلیس وەرگەڕا سەر ڕێبازی ئایینی ڤاکخۆس، کەسێکی خەڵکی ڤۆریستێنیس بەدزییەوە چوو بۆ لای سکیتی‌یەکان و پێی‌گووتن: "ئەی سکیتی‌یەکان، ئێوە کاتێک دەبینن کە ئێمە ڤاکخۆس دەپەرستین و دەسەڵاتی ئەو بەسەرماندا زاڵە، لۆمەمان دەکەن، ئێستا واباشە بزانن کە هەر ئەو خوایە، گەورە و سەروەری پاشای ئێوەیە، چونکە سکیلیس خۆی تەسلیمی مەستیی ڤاکخۆس کردوە و لەژێر کاریگەری ئەودا قسەدەپەڕێنێ. ئەگەر باوەڕ بە من ناکەن، وەدووام کەون تا ناوبراوتان پێ‌نیشان بدەم ". سەرکردەکانی سکیتی وەدوای کابرا کەوتن و ئەویش بە نهێنی گشتیانی بردە سەر بورجێک و لەوێ دایمەزراندن.

وەختێک سکیلیس بەدوای مریدانی ڤاکخۆس‌دا هات و لە سەرکردەکانی سکیتی وەدیارکەوت، ئەو سەرکردانە ناوبراویان لە حاڵی بەڕێوەبردنی ڕێورەسمەکەدا دیت و بە قەڵسی و خێرا لە شار دەرکەوتن و چی دیتبوویان بۆ نیزامی‌یەکانیان باس‌کرد.

[٨٠] سکیلیس دوای ئەو ڕووداوە گەڕاوە وڵاتی خۆی، سکیتی‌یەکان بۆ پاشایەتی وڵات، برای ناوبراویان بەناوی ئۆکتاماسادیس دیاریکرد. ئۆکتاماسادیس نەوەی تیرس، لەلایەنی کچەکەی بوو. سکیلیس بە ئاڵوگۆڕەکانی زانی و رایکرد و پەنای بۆ وڵاتی تراکی برد. ئۆکتاماسادیس خەبەری پێگەیی و لەشکرێکی بەمەبەستی پەلاماردان بۆ سەر وڵاتی تراکی ئامادەکرد. ئەو لەشکرە ناردراوە و تراکی‌یەکان لەسەر چۆمی ئیسترۆس کەوتنە بەر یەک. ڕاست لەو وەختەدا کە خەریکبوون پێکهەڵپرژێن، سیتالکیس[1] ڕاسپاردەی نارذە لای ئۆکتاماسادیس و پێی‌گووت: "بۆچی شەڕی هەڤدوو بکەین؟ تۆ کوڕی خوشکی منی و برای منت لای خۆت

١- سیتالکیس، پاشای تراکی.

راگرتووە، براکەم بدەوە و منیش سکیلیس رادەستی تۆ دەکەم. بەوجۆرە نە تۆ و نە من پێویست ناکا لەشکرەکانمان تووشی مەترسی تێداچوون بکەین ".

سیتالکیس ئەو قسانەی بە تەتەردا بۆ ئۆکتاماسادیس بەڕێکرد. پێشنیارەکەی پەسند کرا و براکەی وەرگرتەوە. ستالکیس دوای وەرگرتنەوەی سکیلیس، ئەوجار پاشەکشەی کرد. هەڵبەت لەجێوە سەری براکەی خۆی بە شمشێر پەڕاند. سکیتی‌یەکان بەو چەشنە دابونەریتی خۆیان دەپارێزن و سزای لەو جۆرە بۆ ئەو کەسانە دیاری‌دەکەن کە وەدوای نەریتی بێگانە بکەون.

[۸۱] ئێستاشی لەگەڵ بێ ژمارەی دانیشتووانی سکیتی بۆمن روون نەبووەتەوە. هەڵبەت لەو بارەوە بۆچوون و زانیاری جۆراوجۆرم دەسکەوتووە. دەگووترێ کە حەشیمەتێکی زۆرن، بەڵام ئەوانەی سکیتی رەسەنن، ژمارەیان کەمە. ئەو سەرچاوانە هێندێک بابەتیان بۆ من روونکردەوە.

لەنێوان رووباری ڤۆریستێنیس و چۆمی ئیپانیس ناوچەیەک هەڵکەوتووە کە پێیدەگووترێ ئێکسامپیئۆس. سەبارەت بەو ناوچەیە تۆزێک لەوە پێشتر باسم کرد کە کانیاوێکی ئاوی تاڵ هەیە و دەڕژێتە نێو چۆمی ئیپانیس[1] و وای لەو ئاوە کردوە بۆ خواردنەوە نەبێ. لەو شوێنە خومرەیەک هەیە شەش جار گەورەتر لەو خومرەیەی کە پاڤسانیاس[2] کوڕی کلیئۆمڤرۆتۆس[3] لە دۆڵی پۆندۆ (دەریای رەش) دایناوە. من بۆ ئەو کەسانەی چاویان بەو خومرەیە نەکەوتووە، پێویستە بڵێم کە بەو شێوەیەیە: ئەو زەرفە شەش پەنجە ئەستوورە و بەئاسانی جێگای شەش سەد ئامفور[4] ئاو دەبێ. خەڵکی خۆجێیی دەڵێن گشتی لە تواندنەوەی نووکە ڕمبی ئاسن دروستکراوە. دەگووترێ کە پاشای هەرێمی

---

١- ئیپانیس، لکێک لە چۆمی روباری دۆن، ئەمڕۆ ناسراوە بە بووگ.

٢- پاڤسانیاس، پاشای سپارتی و براوەی شەڕ دژی پاشماوەی هێزەکانی فارس لە ٤٧٩ی پێش میلاد.

٣- کلیئۆمڤرۆتۆس، پاشای سپارتی لە سەدەی پێنجی پێش میلاددا.

٤- ئامفور، پێوانە بۆ بابەتی ئاوەکی و بەرابەر ١٨ لیتر و ١ دیسیلیتر.

ئاریانتاس گەرەکی بوو ژمارەی دانیشتوانی سکیتی‌یەکانی لێ‌ڕوون بێتەوە. ئاریانتاس دەستووری‌دا هەر سکیتی‌یەک لەسەریەتی یەک نووکە ڕمب بۆ پاشا وەک خەڵات بێنێ و هەرکەس خۆی لە جێبەجێ کردنی ئەو فەرمانە ببوێرێ، سزای کوشتنی بەسەردا دەسەپێ. بەو بۆنەوە کۆمەڵێکی زۆر نووکە ڕمب کۆبۆوە، بۆیە پاشا بیری لە دروستکردنی پەیکەرەیەکی یادوەری کردەوە تا ناوی خۆی لەسەر بنووسێ. بە تواندنەوەی نووکە رمبەکان ئەو خومرەیە دروستکرا و پاشا پێشکەش بە ئێکسامبێ‌ئۆسی کرد. ئەوەش کۆمەڵێک زانیاری من سەبارەت بە سکیتی‌یەکان بوو.

[۸۲] وڵاتی سکیتی‌یەکان جیا لە ژمارەیەک چۆم و پانتایی وڵاتەکە، خاوەن شتێکی سرنج‌ڕاکێش نییە. پێویستە باسی ئەو دیاردانە بکرێن: شوێن‌پێی خواوەند ئیراکلیس لەسەر بەرد نیشان دەدەن. وەک شوێن پێی مرۆڤ دەچێ، بەو جیاوازییەی دوو پیخیس درێژە. ئەو شوێن پێیە لە قەراخ چۆمی تیریس هەڵکەوتووە. تا ئێرە باسی وڵاتی سکیتیام کرد و ئێستاش دەگەڕێمەوە سەر ئەو بابەتە کە پێشتر دەستم پێکردبوو.

## لەشکرکێشی دژی سکیتییەکان

[٨٣] داریوش گەرەکی بوو لەشکر ئامادەبکا بۆوەی پەلاماری سکیتی‌یەکان بدا. ناوبراو کۆمەڵێک راسپاردە و نوێنەری ناردە لای وڵاتانی ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆری، چونکە پێویستی بە هێزی پیادە و گەمی و پاپۆر و دروست کردنی پرد لەسەر ئاوی گەرووی ڤۆسپۆر لە وڵاتی تراکی هەبوو.

برای داریوش بەناوی ئارتاڤانۆس، کوڕی گشتاسپ داوای لە پاشا کرد، خۆی لە شەڕێکی ئەوتۆ نەدا. ئارتاڤانۆس باسی گیرگرفتەکانی کرد کە لە وڵاتی سکیتیا تووشی لەشکر دێن. ناوبراو بە ئامۆژگارییەکانی نەیتوانی داریوش رازی بکا و وازی لەو کارە هێنا. داریوش وەختێک زانی گشت ئامادەکارییەک کراوە، فەرمانی وەڕێکەوتنی لەشکری لە شاری شووش‌دا.

[٨٤] هەر لەو کاتەدا کابرایەکی پارس بەناوی ئیئۆڤازۆس داوای لە داریوش کرد یەکێک لە کوڕەکانی ئازاد بکرێ تا لەلای بمێنێتەوە. ئەو کابرایە سێ کوڕی هەبوو و گشتیان لەنێو لەشکری داریوش‌دا بوون. داریوش لە وڵامدا گووتی، چون ئیئۆڤازۆس دۆستی خۆیەتی، دەخوازێ چاکەیەکی لەگەڵدا بکات و هەرسێ کوڕەکانی بۆ جێهێڵێ.

ئیئۆڤازۆس گەلێک شاد بوو، پێیوابوو سێ کوڕەکەی نەجاتیان هاتووە، بەڵام داریوش دەستووری بە پیاوانی خۆیدا، هەرسێ گەنجەکە بکوژن. هەرسێک سەریان لێدرا و جەنازەکانیان بەجێما.

[٨٥] داریوش لەشکری لە شاری شووشەوە وەڕێخست و گەیشتە گەرووی ڤۆسپۆرۆس لە ناوچەی خالکیدۆنیا[1]. لەو شوێنە پرد

---

١- کالخیدۆنی یا کالسیدۆنی، ناوچەیەکی کۆنی ئاسیای بچووک، هەڵکەوتوو لە قەراخ ئاوەکانی بۆسفۆر.

دروستکرابوو. لەوێوە سەفەری بۆ دورگەکانی کیئانی[1] کرد. یۆنانییەکان لەو سەردەمەدا پێیانوابوو ئەو کۆمەڵە دورگەیە دەجوڵێنەوە. داریوش لەسەر لووتی گەمی دانیشت و سەیری دیمەنەکانی سروشتی دەریای رەشی کرد. دەریای رەش خاوەن جوانییەکی بەشکۆ و کەموێنەیە ولە گشت دەریاکان جوانترە، درێژاییەکەی یازدە هەزاروسەد ستادیۆ و بەرینایییەکەشی لە پانترین شوێن، پتر لە سێهەزاروسێسەد ستادیۆ دەبێ. زارکەکەی چوار ستادیۆ پانە و درێژایی ئەو گەرووەی ناسراو بە ڤۆسپۆرۆس و پردی لەسەر دروستکراوە، سەدوبیست ستادیۆ بەرینە.

ڤۆسپۆرۆس بەرەو پرۆپۆندیدا (دەریای مەرمەڕ) چووەتە پێش و خاوەن پێنجسەد ستادیۆ بەرینایی و هەزاروچوارسەد ستادیۆ درێژایی و دەگاتە ئێلیسپۆندۆس (داردانێل) کە شوێنێکی تەنگەبەرە. ئەو تەنگەبەراییە حەوتسەد ستادیۆ بەرین و چوارسەد ستادیۆ درێژە. ئاوی تەنگەبەرایی ئێلیسپۆندۆس لەگەڵ دەریایەک تێکەڵدەبێتەوە کە بە ئیێیئۆس (ئێژە) ناسراوە.

**[٨٦]** ئەو مەودایانەیان بەو شێوەیە پێواوە:

مەودایەک کە گەمی لە رۆژێکدا دەتوانێ بیپێوێ، هەڵبەت ئەگەر رۆژ درێژ بێ، حەفتاهەزار ئۆرغیا و شەویش شێست هەزار ئۆرغیایە.

لە گەرووی دەریای رەش تا رووباری فاسی (واتە لە پانترین شوێن) گەمییەک پێویستی بە نۆ رۆژ و هەشت شەو کاتە، یا دەتوانین بڵێین سەرجەم یەک میلیۆن و یەک سەد و دە هەزار ئۆرغیا رێگای دەریای دەپێوێ کە ئەوەش دەکاتە یازدە هەزار و سەد ستادیۆ. بۆوەی گەمییەک لە سیندیکڕا بگاتە تێمیسکیرا[2] کە لەسەر چۆمی تێرمۆدۆندا[3] هەڵکەوتووە

---

١- کیئانی، سیانە یا سیمپلگارد، دورگەیەکی بچووک و بەردەڵان لەنێو دەریای رەش و لەنێو تەنگەبەرایی بۆسفۆردا.

٢- تێمیسکیرا، شارێکی کۆنی ئاسیای بچووک لە نیزیک روباری تێرمۆدۆن یا تێرمۆدۆندا. ئەو شارە ئەمرۆ ناسراوە بە تێرمە.

٣- تێرمۆدۆندا، روبارێکی ئاسیای بچووک کە دەرژێتە دەریای رەش.

[بەرینترین شوێنی پۆندۆ (دەریای ڕەش)] سێ رۆژ و دوو شەوی گەرەکە، واتە مەودایەک بەرابەری سێسەد و سێ هەزار ئۆرغیا یا سێ هەزار و سێ سەد ستادیۆ. بەو شێوازە مەوداکانی ئێڤکسینۆپۆندۆس (بەحری رەش)، ڤۆسپۆرۆس و ئێلیسپۆندۆس (داردانێل)یان پێواوە. هەروەها، گۆلێک بە ئێڤکسینۆپۆندۆس (دەریای رەش) وەنووساوە کە تۆزێک لەو بچووکترە و ناسراوە بە مێئۆتیس یا دایکی پۆندۆ.

[۸۷] داریوش پاش سەیرکردنی دەریای رەش بە گەمی گەڕاوە لای ئەو پردە کە وەستاکارێک بەناوی ماندرۆکلیس و خەڵکی دورگەی سامۆس دروستیکردبوو. پاشا دوای ئەوەی چاوی بە ڤۆسپۆرۆس کەوت، فەرمانیدا دوو بەردەنووسی مەڕمەڕ لە قەراخ ئەو ئاوە بچەقێنن و لەسەر یەکیان بە رێنووسی ئاشووری و ئەوەیتریش بە یۆنانی، ناوی گشت هۆز و نەتەوە و هۆزەکانی بەشدار لەو لەشکرکێشییەدا لەسەریان هەڵکەنن. داریوش خەڵکی لە تەواوی هۆز و نەتەوەکانی ژێردەسەڵاتی خۆی هێنابوو و لەشکری لێسازکردبوون و ژمارەی سەربازەکانی ئەو سپایە، ئەگەر هێزە دەریاییەکانی لێدەراوێژین و سوارەنیزامی لەگەڵدا بێ، دەگەیشتنە حەوسەد هەزار کەس. ئەو هەروەها شەش سەد گەمی جەنگی لە خزمەت سپاکەیدا هەبوو.

ساڵانێک دواتر، دانیشتووانی بیزانسی ئەو بەردەنووسەیان بۆ شاری خۆیان راگواست و دەسکاریان کردن و بۆ دروستکردنی سەکۆی قوربانی و دێری ئۆرتۆسیاس ئارتێمیدۆس کەڵکیان لێوەرگرتن. هەڵبەت یەک لەو بەردانە لە پەرستگەی دیۆنیسۆس داندراوە و بە رێنووسی ئاشووریيە.

ئەو شوێنەی ڤۆسپۆرۆس کە داریوش پردی لەسەر دامەزراند، پێموایە کەوتووەتە نێوەڕاستی رێگای نێوان شاری بیزانس و ئەو پەرستگەیەی لە زارکی پۆندۆس (دەریای رەش) بنیاتنراوە.

[۸۸] داریوش ئێجگار رازی بوو، هەربۆیە کۆمەڵێک دیاری پێشکەش بە ماندرۆکلیس کرد. ماندرۆکلیس بەشێک لەو خەڵاتانەی بۆ کێشانەوەی

نەققاشییەک تەرخان کرد. لەو نەققاشییەدا پردی فۆسپۆرۆس، داریوشی دانیشتوو لەسەر تەخت و لەشکری لە کاتی پەڕینەوە بەبەردەم ئەودا نیشاندەدا. ماندرۆکلیس ئەو بەرهەمەی پێشکەش بە پەرستگەی ئیرێئۆ[1] کرد و ئەو بابەتەی لەسەر نووسی:

*"ماندرۆکلیس، دوای ئەوەی هەردوو کەناری ئاوی فۆسپۆری لەیەکتر بەستەوە، یادوارەیەکی ئەو پردەی کە لە کۆمەڵێک گەمی دروستکرابوو، پێشکەش بە دێری ئیرایۆ کرد. ماندرۆکلیس بە جێبەجێکردنی خواستی داریوش پاشا، بۆ خۆی و دانیشتووانی دورگەی سامۆس شانازی خوڵقاند".*

ئەوە ئەو بەرهەمە هونەرییە بوو کە ماندرۆکلیس لەدوای خۆی جێیهێشت.

**[۸۹]** داریوش پاش ئەوەی ماندرۆکلیسی خەڵات کرد، ئەوجار پێی لەسەر خاکی ئورووپا دانا. بەر لەو کارە، فەرمانی بە یوونییەکاندا کە بە گەمی بچنە پۆندۆ (دەریای رەش) و تا چۆمی ئیسترۆس پێشڕەوەی بکەن، هەرکە گەیشتنە ئەوێ پردێک بنیات بنێن. فەرماندەکانی هێزی دەریایی، بەپرانی خەڵکانی ئێئۆلی و یوونی و ئێلیسپۆندی بوون. هێزە دەریاییەکان بە دورگەکانی کیئانیدا تێپەڕین و بەرەو چۆمی ئیسترۆس پێشڕەوییان کرد و دوای ئەو سەفەرە، دوو رۆژی تێچوو تا پردێکیتر لە شوێنێکی بەرتەسکی چۆمەکە دروسکرا. واتە لەو جێگایەی کە چۆم بەسەر کۆمەڵێک دۆڵدا بەشدەبوو.

داریوش کاتێک بەسەر پردی فۆسپۆرۆسدا پەڕییەوە و پێی لەسەر خاکی تراکی دانا، ئەوجار بەرەو سەرچاوە ئاوییەکانی چۆمی تێئارۆس چوو و لەوێ ئۆردووی لێدا و سێ رۆژ مایەوە.

**[۹۰]** خەڵکی ناوچەکە دەڵێن کە ئاوی رووباری تێئارۆس بۆ چارەسەری نەخۆشی جەڕەبی مرۆڤ و ئەسپ باشترین دەرمانە. ئەو چۆمە خاوەن سی و هەشت کانیاوە و گشتیان لە داوێنی چیایەک هەڵکەوتوون. ئاوی هێندێک

---

۱- مەبەست ئەو مەعبەدەی لە دورگەی سامۆسە.

لەو کانیاوانە سارد و چەندێکیشیان گەرمن. ئەو شوێنە لە نێوەڕاستی ڕێگای نێوان شاری (ئیریئۆس)ی نیزیک پێرینتۆ[1] و شاری ئاپۆلۆنیای سەر دەریای ڕەش جێیگرتووە و پیاو لەهەر سەرێکی ئەو ڕێگایە وەڕێبکەوێ، دوو ڕۆژی سەفەری پێدەچێ. ڕووباری تێئارۆس لەگەڵ چۆمی کۆنتادیسدۆ یەک دەگرنەوە، ئەو چۆمەی دووهەم بەنۆرەی خۆی زێی ئاغریانیس دەوڵەمەند دەکا. ئەوەی دوایی پاش مەودایەک تێکەڵ بە ئێبرۆس دەبێ. لە کۆتاییدا، چۆمی ئێبرۆس لە نیزیک ئاوایی ئاینوس[2] دەڕژێتە نێو دەریا.

**[٩١]** کاتێک داریوش گەیشتە ئەو چۆمە، واتە تێئارۆس، خێرا ئۆردووی لێدا. ناوبراو ئاوی ئەو چۆمەی گەلێک بەدڵ بوو و هەر لەوێ بەردەنووسێکی یادوەری چەقاند کە ئەو بابەتەی لەسەر نووسرابوو: "ئاوی سەرچاوەکانی چۆمی تێئارۆس ڕوونتر و خۆشتر لە ئاوی گشت ڕووبارەکانی جیهانە، داریوش کوڕی گشتاسپ و پاشای پارسەکان و تەواوی ئاسیا، جوانتر و باشتر لە گشت مرۆڤەکانی سەرزەوین، لەشکری بە مەبەستی شەڕ دژی سکیتییەکان هێنایە سەر ئەو کانیاوانە". ئەو بابەتە لەسەر بەردەنووسەکە هەڵکەندرا.

**[٩٢]** داریوش لەو شوێنەوە وەڕێکەوت و گەیشتە ڕووبارێکیتر بەناوی ئارتیسکۆس. ئەو ڕووبارە وڵاتی ئۆدریسییەکان دوولەت دەکا. داریوش لەو ناوچەیە بەو چەشنە هەڵسوکەوتی کرد: سەرەتا جێگایەکی دەسنیشانکرد و ئەوجار داوای لە پیاوانی لەشکر کرد، هەرکەس بەوێدا دەرباز بێ، خڕکە بەردێک لەوێ دانێ. وەختێک تەواوی سەربازانی لەشکری ئەو فەرمانەیان بەجێگەیاند، گردێک لە بەرد دروست بوو. داریوش دوای ئەو کارە گردەبەردی جێهێشت و بە لەشکرەوە درێژەی بە پێشڕەوی‌دا.

---

١- پێرینتۆ، موهاجیرنشینی دانیشتووانی میلیتۆسی لە کەنارئاوەکانی باکووری ئاسیای بچووک.

٢- ئاینوس، ئەمڕۆش هەر بەو ناوە ناسراوە. لە ڕێژاوگەی ڕوباری ماریتزا هەڵکەوتووە.

[٩٣] داریوش بەر لەوەی بگاتە چۆمی ئیستروس، وڵاتی غیتییەکانی[١] داگیرکرد. غیتییەکان خەڵکانێکن کە پێیانوایە نەمرن. تراکییەکانی نیشتەجێ لە هەرێمی سالمیدیسۆ[٢] و ئەوانەش کە لە سەرەوەتر و لە ناوچەکانی ئاپۆلۆنیا[٣] و مێسیمڤریا[٤] دەژین و ناسراون بە سکیرمیادی و نیپسۆسی، گشتیان بەبێ بەرگری خۆیان تەسلیمی لەشکری داریوش کرد. غیتییەکان بەڵام، سەرەڕای بڕیاری بەرگری تەسلیم بوون ، هەڵبەت دەبێ ئەوەش بڵێم کە غیتییەکان جوامێرترین خەڵکی وڵاتی تراکیین.

[٩٤] غیتییەکان بەو هۆیانە، پێیانوایە نەمرن: ئەوان دەڵێن کاتێک جەستەیان دەمرێ، لەڕاستیدا روحیان لەگەڵ روحی خواکەیان بەناوی سالمۆکسیس یەک دەگرن. خەڵکانیتر ئەو خوایە بە ناوی غیڤێلیێزین دەناسن.

غیتییەکان هەر پێنج ساڵ جارێک کەسێک هەڵدەبژێرن و وەک راسپاردەی خۆیان دەینێرنە لای خواوەند سالمۆکسیس و داوای جێبەجێبوونی خۆزگەکانیان لەو دەکەن.

شێوازی ناردنی ئەو راسپاردە هەڵبژێردراوە بەو چەشنەیە: ژمارەیەک بەڕیز و بەپێوە رادەوەستن و سێ نێزە، مەحکەم رادەگرن. کۆمەڵێکیتر دەست و قاچی کابرای راسپاردە کە قەرارە بچێتە لای خواوەند سالمۆکسیس دەگرن و بەشێوەیەک حەوایدەدەن کە لەکاتی بەربوونەوە بەسەر نێزەکاندا بکەوێ. ئەگەر راسپاردە بەهۆی نێزەکانی کە لە هەناوی رۆچوونە بمرێ، ئەوسا دەڵێن کە رەزای خوای لەسەر بووە. ئەگەر نەمرێ، وەک پیاوخەراپ سەیریدەکەن و یەکێکیتر هەڵدەبژێرن و بەر لە مردنی ئەویش، خواست و راسپاردەکەی بۆ بەیان دەکەن.

هەر ئەو خەڵکە تراکییە کاتێک گرمەی هەور دەبیسن و بروسک بە ئاسمانەوە دەبینن، کەوان (تیرهاوێژ) دەست دەدەنێ و چەند تیرێک بە

١- غیتی، هۆزێکی کۆن، دانیشتوو لە نێوان نیمچە دورگەی باڵکان و روباری دانوب.

٢- سالمیدیسۆ، ئەمڕۆ ناسراوە بە میدیا.

٣- ئاپۆلۆنی، ئەمڕۆ ناسراوە بە سیزێبولی.

٤- مێسیمڤریا، ئەمڕۆ ناسراوە بە میسیڤری.

ئاسمانەوە دەنێن و هەڕەشە لە خوا دەکەن. ئەوانە لەو باوەڕەدان جیا لە خوای ئەوان هیچ خوایەکی‌تر بوونی نییە.

[٩٥] ئەوجۆرەی من لە زمان یۆنانییەکانی نیشتەجێی ناوچەکانی ئێلیس‌پۆند و قەراخ پۆندۆس (دەریای رەش) بیستوومە، دەڵێن سالمۆکسیس کۆیلەی پیتاغۆراسی کوڕی منیسارخۆس بووە. کاتێک سالمۆکسیس ئازادکراوە و سامانێکی زۆری وەسەریەک ناوە، گەڕاوەتەوە وڵاتی خۆی. بارودۆخی ژیانی تراکی‌یەکان لەو سەردەمەدا شپرزە و خۆشیان گەلێک خۆش‌باوەڕ و ساکار بوونە. سالمۆکسیس لەنێو یوونی‌یەکاندا ژیابوو و دەیزانی ئەوانە پتر لە تراکی‌یەکان خاوەن هزر و تەگبیرن و بۆیە زۆر شت لەوان و بەتایبەت لە کەسێکی فەیلەسوفی وەک پیتاغۆراس فێرببوو.

سالمۆکسیس تەلارێکی دروست کرد و میواندارییەکی بۆ گەورە پیاوانی شار و هاوڵاتییانی خۆی پێکهێنا. وەختێک ئەو میوانانە خەریکی خواردن و خواردنەوە بوون، فێری‌کردن کە نە ئەو خۆی و نە خەڵکەکە قەت نامرن، بەڵکوو بەپێچەوانەوە گشتیان بۆ شوێنێک کۆچ‌دەکەن و ژیانی داهاتوویان پڕ لە بەختەوەری دەبێ.

ناوبراو لەژێر تەلاری میوانەکان، ژێرزەوینێکی سازکردبوو. لەبەر چاوی تراکی‌یەکان ونبوو. داگەڕا خوارێ بۆ ئەو هۆدەیە و سێ ساڵی رێک لەوێدا ژیا. تراکی‌یەکان بەدوایدا گەڕان و نەیاندۆزییەوە و خەمی لەدەست چوونی سالمۆکسیس گەلێک ئازاری دان و لەو باوەڕەدا بوون کە ئەو مردوە. ساڵی چوارەم سالمۆکسیس وەدەرکەوت و دوبارە خۆی نیشانی تراکی‌یەکان‌دا و بەو شێوەیە خەڵک باوەڕیان پێهێنا. تراکی‌یەکان خۆیان ئاوا باسی رەفتاری سالمۆکسیس‌یان کرد.

[٩٦] سەبارەت بەخۆم، دەبێ بڵێم نە باوەڕێکی ئەوتۆم بەو قسانە هەیە و نە بەسەرهاتی ئەو کابرایە و ژێرعەردەکە وەدرۆ دەخەمەوە. من پێموایە سالمۆکسیس ساڵانێک بەر لە پیتاغۆراس ژیاوە. جیا لەوە، سالمۆکسیس چ وەک مرۆڤ ژیابێ، چ وەک خوای غیتی‌یەکان، هیچیان بەلامانەوە گرینگ نین.

غیتی‌یەکان بەو نەریتانە، دوای ئەوەی بەدەست پارسەکانەوە تووشی شکست هاتن، ئەوانەی زیندوو مابوون، بەدوای لەشکردا ڕێگایان گرتەبەر.

[٩٧] کاتێک داریوش بە لەشکری پیادەوە گەیشتە قەراخ چۆمی ئیسترۆس، هەرکە لە پرد پەڕییەوە فەرمانی بە یوونی‌یەکان‌دا ئەو پردە کە لە کۆمەڵێک قایق دروستکرابوو، بڕوخێنن و هێزە دەریاییەکان لەگەڵ لەشکری پیادە بەڕێگای ویشکاییدا پێشڕەوی بکەن.

یوونی‌یەکان خەریکی ئامادەکاری بۆ روخاندنی پردەکە لەسەر ئەمری پاشا بوون، بەڵام راست لەو کاتەدا کوئیس کوڕی ئێرکساندرۆس کە فەرماندەی هێزەکانی میتیلینی[1] بوو، سەرەتا لە داریوشی پرسی ئاخۆ دەتوانێ بۆچوونی خۆی لەمەر رووخاندنی پردەکە دەربڕێ یاننا، وەختێک ئیزنی وەرگرت، گووتی: "پاشاکەم، ئێوە گەرەکتانە پەلاماری وڵاتێک بدەن کە نە مووچە و مەزرای لێیە و نە خاوەن شار و ئاوەدانییە. بەباوەڕی من باشترە دەست لەو پردە نەدەین. با هەر ئەو کەسانەی دروستیان کردوە، ئەوانیش پارێزگاری لێبکەن و پێیڕابگەن. ئەگەر هاتوو سکیتی‌یەکانمان دۆزییەوە و نەخشەکانمان جێبەجێ بوون، ئەو وەختە ڕێگای گەڕانەوەمان ئاواڵەیە. ئەگەریش دەرەقەتی سکیتی‌یەکان نەهاتین، دووبارە ڕێگای پاشەکشەمان مسۆگەر کردوە. من چ جارێک نیگەرانی ئەوە نیم کە نەتوانین سکیتی‌یەکان لە شەڕدا شکست بدەین، بەڵام نیگەرانی ئەوەم نەیاندۆزینەوە و سەرگەردان بین و تووشی کۆڵێک نەهامەتی بێین. رەنگە بفەرموون کە من بۆخاتری بەرژەوەندی تایبەتی خۆم بەو شێوەیە قسە دەکەم و دەخوازم لێرە بمێنمەوە. بەڵام نا پاشاکەم، ئەو ڕێگایە بە قازانجی ئێوە دەزانم و پێشنیار دەکەم و خۆیشم لەگەڵ ئێوە دەبم و ئامادە نیم وەپاش لەشکریش بکەوم ".

داریوش ئەو بۆچوونەی گەلێک بە دڵ بوو و لە وڵامدا گووتی: "کابرای بیانی خەڵکی لێسڤۆس، هەرکات بە ساغ و سلامەتی گەیشتمەوە وڵاتی خۆم، وەرە بارەگاکەم، دەخوازم لەمەر ئەو بۆچوونە راستە، خەلاتت بکەم".

---

١- میتیلینی، پێتەختی کۆنی دورگەی لێسڤۆسی یۆنانی. ئەمرۆش هەر بەو ناوە ناسراوە.

[٩٨] داریوش دوای ئەو قسانە گوریسێکی هێنا و شێست گرێی لێدا و ئەوجار گەورە پیاوانی یوونی بانگهێشت کرد و پێیگووتن: "یوونییەکان، ئەوەی پێشتر لەمەر رووخاندنی پرد پێمگووتبوون، لەبیر خۆتانی بەرنەوە. ئەوەی ئێستا داواتان لێدەکەم بە ئەنجامی بگەیێنن. لەو کاتەوە کە من بەرەو وڵاتی سکیتییەکان دەڕۆم، هەر رۆژێک کە تێدەپەڕێ، ئێوە گرێیەک لەو گوریسە بکەنەوە. ئەگەر لە ماوەی شێست رۆژدا من وەدیار نەکەوتم و گشت گرێکانتان کردەوە، ئیتر پێویست ناکات لێرە بمێننەوە و بەرەو وڵاتی خۆتان بگەڕێنەوە. تا ئەو کاتە دێ ئێوە لەسەرتانە پارێزگاری لەو پردە بکەن. ئێستا ئەوە بۆچوونی منە و ئەوەندەی دەکرێ بەباشی پردەکە بپارێزن. ئێوە بەو کارەتان من مننەتباری خۆتان دەکەن ".

[٩٩] وڵاتی تراکی لە قەراخ دەریا و بەر لە خاکی سکیتییەکان هەڵکەوتووە. لەو شوێنەی کە کەنداو جێیگرتووە، وڵاتی سکیتیا دەسپێدەکات. هەر لێرەوە رووباری ئیسترۆس (دانوب)، بە گەروویەکدا بەرەو رۆژهەڵات دەچێ و دەڕژێتە نێو دەریا. من ئێستا باسی سکیتیای کەنار دەریا دەکەم کە لە چۆمی ئیسترۆس بەولاوە هەڵکەوتووە و دەخوازم رێژەی پانتایی ئەو وڵاتە بەراورد بکەم. دوای رووباری ئیسترۆس، سکیتیای قەدیم دەسپێدەکا کە بەرەو باشوور راکشاوە و دەگاتە شاری کارکینیتیدا. لەو شارە واوەتر، خاکەکە ئیتر هەر بە ئاوی دەریاوە پاراو دەکرێ، بەڵام پتر دەبێتە کوێستانی[1] و چەشنی نیمچە دوورگە دەچێتە نێو جەرگەی ئێفکسینۆ پۆندۆس (دەریای رەش). هۆزەکانی تاڤری لێرە دەژین و هەرێمەکەیان دەگاتە نیمچە دورگەیەک کە ناسراوە بە تراخییا[2] و بەرەو رۆژهەڵات لە دەریاوە رۆچووە. سنوورەکانی سکیتیا لە دوو لاوە لە دەریا پێکهاتووە، واتە لە باشوور و رۆژهەڵات، راست وەک هەرێمی ئەتیکی[3] لە یۆنان دەچێ. تاڤرییەکان تەنیا

١- شاخەکانی کریمێئا.

٢- ئەمرۆ ناسراوە بە کرچ.

٣- ئەتیکی، هەرێمێکی بەربەرین و گەورەی یۆنانی باستان کە لەلای باکوور دەگەیشتە ڤیۆتیا و لە رۆژهەڵات تا دەریای ئێژە دەچوو و لە باشوور پاڵی بە دەریای میرتۆس و کەنداوی سارۆنیکەوە

له بەشێکی وڵاتی سکیتیا نیشتەجێن. با ئاوای دابنێین کە ئەو دیاردەیە لە هەرێمی ئەتیکی بەرچاوکەوتووە. واتە ئەگەر لە هەرێمی نێوان کوێستانەکانی سونیۆ[1] لە ناوچەی تۆریکۆس تا ناوچەی ئانافلیستۆس[2]، خەڵکێکی جیا لە ئاتێنییەکان نیشتەجێ بن و ئەوەش کاتێک دەسبدا کە پیاو بتوانێ هەڵسەنگاندن لەنێوان بابەتی گەورە و بچووکدا بکا. ئەوکاتە دەتوانێ بەسانایی بارودۆخی جۆغرافیایی هەرێمی تاڤرییەکان روونبکاتەوە. بۆ ئەو کەسانەی سەفەری کەنار ئاوەکانی ئەتیکییان نەکردوە، من روونکردنەوەیەکیترم هەیە: واتە بەو چەشنە دەبێ کە لە وڵاتی یاپیغییا[3]، گەلێکی جیاواز لە یاپیغییەکان، لە خاکی نێوان تاراندا[4] و بەندەری ڤرێدێسیۆسدا[5] بژین. من باسی ئەو دوو نموونەیەم کرد و پێموایە کە زۆر ناوچەیتریش هەن و شێوەی هەرێمی تاڤرییەکان دەدەن.

[١٠٠] لە هەرێمی تاڤرییەکانەوە بەرەو ژوور، چ لەلای سەرەوە و چ بەرەو دەریای رۆژهەڵات، سکیتییەکان نیشتەجێن. هۆزەکانی سکیتی لە ناوچەیەکی نێوان رۆژئاوای ڤۆسپۆری کیمێرییەکان و گۆلی مێئۆتیدا[6] تا چۆمی تانائیس کە دەرژێتە نێو زارکی ئەو گۆلە، جێیانگرتووە.

لە چۆمی ئیسترۆس بەرەو قوڵایی خاک، وڵاتی سکیتیا سەرەتا لەگەڵ ئاغاتیرسییەکان، پاشان نێڤرۆییەکان و دواتر ئاندرۆفانییەکان و لە کۆتاییدا مێلانخلێنییەکان هاوسنوورە.

---

دەدا و لە رۆژئاواش دەبووە هاوسنووری ناوچەی مێغارییەکان. شارەکانی ئاتێن و ماراتۆن لەو هەرێمە گەلێک ناسراو بوون.

١- سونیۆ، بەرزایی باشووری نیمچە دورگەی هەرێمی ئەتیکی. ئەمرۆ بەو بەرزاییە دەگووترێ کۆلۆنا. ناوچە وەک سەردەمی کۆن بە سونیۆ ناسراوە.

٢- ئانافلیستۆس، یەکێک لە کۆمەڵە دورگەکانی یۆنانی باستان.

٣- یاپیغییا، هەرێمێکی ئیتالیای کۆن هەڵکەوتوو لەنێوان کەنداوی تاراندۆ یا تارانت و دەریای یوونی. لوتکەی یاپیغییا دوایین بەشی نیمچە دورگەی ئیتالیا بەرەو باشوورە.

٤- تاراندا شارێکی کۆنی ئیتالی هەڵکەوتوو لەنێو کەنداوێک بە هەمان ناو.

٥- بەندەری بریدیزی.

٦- مێئۆتیدا، ناوی باستانی دەریای ئازۆف.

[١٠١] ئەگەر قبوڵی بکەین کە قەوارەی خاکی وڵاتی سکیتیا چوارگۆشەیە و دوو لای ئەو خاکەدەریایە، ئەوکاتە مەودای سنوورەکانی خاکی و ئاوی یەکسانن. لە چۆمی ئیسترۆس تا دەگاتە ڤۆریس‌تێنیس دە ڕۆژ ڕێگا و لەوێشەوە تا گۆلی مێئۆتیدا دە ڕۆژی‌تر. ئێستا ئەگەر لە کەناردەریاوە بەرەو قوڵایی خاکی ئەو وڵاتە بڕۆین، بیست ڕۆژی سەفەری پێویستە، بۆوەی بگاتە وڵاتی مێلانخلێنی‌یەکان کە لەلای ژوورووی سکیتی‌یەکان دەژین. بەباوەڕی من کەسێکی تووندئاژۆ لە یەک ڕۆژدا نیزیک بە دووسەد ستادیۆ ڕێگادەڕوا. وەختێک پیاو ئەو پێوانەیە پەسند بکا، ئەو کاتە سکیتیا دەبێ چوار هەزار ستادیۆ سنووری ئاوی و چوار هەزاریش سنووری خاکی هەبێ.

ئەوە شێوەی بەراوردی پانتایی خاکی سکیتیا بوو.

[١٠٢] سکیتی‌یەکان دەیانزانی بە تەنیا ناتوانن شەڕی لەشکری داریوش بکەن، بۆیە ڕاسپاردەیان بۆ لای خەڵکانی دراوسێ نارد. پاشا و گەورەی ئەو هۆزانە ڕاست لەو سەردەمەدا کۆببوونەوە و سەبارەت بە پەلاماری لەشکری داریوش خەریکی ڕاوێژ بوون. ئەوانە بریتی بوون لە گەورە پیاوانی تاڤرۆیی، ئاغاتیرسی[١]، نیڤرۆیی[٢]، ئاندرۆفاغی، مێلانخلێنی، بیلۆنی[٣]، ڤودینی(بودینی) و ساڤرۆماتی.

[١٠٣] لەنێو ئەو هۆزانەدا، تاڤرۆماتی‌یەکان خاوەن ئەو نەریتانەن: ئەوانە هەرکەسێکی دەریاوان و مەلەوانی یۆنانییان لە قەراخ ئاوەکانی خۆیان دەست کەوتبێ، وەک ئاژەڵی قوربانی پێشکەش بە خواوەند (پارتینۆ)یان کردوە. شێوەی قوربانی کردنەکەش بەو جۆرە بووە: سەرەتا بە گۆپاڵ تێرپڕ لە سەری کابرایان داوە. هەڵبەت خەڵکانی‌تر دەگێڕنەوە کە جەستەی کابرای قوربانیکراو لە دووندی چیایەک هەڵداشتراوەتە خوارەوە (چونکە

---

١- هۆزێکی سامارتی نیشتەجێ لە داوێنی چیاکانی کارپات.

٢- هۆزێکی سامارتی نیشتەجێ لە بەشێکی وڵاتی لیتوانی ئەمڕۆ.

٣- بیلۆنی، هۆزێکی سامارتی نیشتەجێ لە قەراخ ڕوباری ڤۆریس‌تێنیس و شارێک بە هەمان ناو.

پەرستگەکەیان لەسەر بەرزاییەکی داوێنی چیاکە بنیاتنراوە). ئەوجار سەری کابرایان بڕیوە و شەقڵەیەکیان تێچەقاندوە.

گشت لایەک لەمەر سەربڕینی نێچیری قوربانی هاوڕان، بەڵام سەبارەت بە جەنازەی مردوو، کەسانێک دەڵێن کە هەڵیان نەداشتووەتە خوارەوە بەڵکوو چاڵیان کردوە. تاڤری‌یەکان دەگێڕنەوە کە ئەو خوایەی لەو چەشنە قوربانییەی پێشکەش دەکەن، ناسراو بە ئیفی‌یێنیا[1]، کچی ئاغامێمنۆنۆسە[2]. وەختێک کەسێک لە دوژمن بەدیل دەگرن، بەو چەشنە هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکەن: هەرکەسە دیلی بەردەستی خۆی سەر دەبڕێ و سەرەکە لەگەڵ خۆی دەباتەوە ماڵ. سەری بڕاوە بە شەقڵەوە دەکا و لە سەربانی ماڵی خۆی دەیچەقێنێ. دیارە بەپێی نەریت، لە بەرزترین شوێنی بان و لەسەر کولانەی ماڵ دەبێ. ئەوانە لەو باوەڕەدان ئەو کەللە سەرە بڕاوانە پارێزگاری لە ماڵ و ئەندامانی بنەماڵەکە دەکەن.

بژیوی تاڤرۆماتی‌یەکان لە ڕێگای شەڕ و تالانەوە دابین دەبێ.

[١٠٤] ئاغاتیرسی‌یەکان لەباری جەستەییەوە نێرەمووکن و قەیاسێک ئاڵتوون بەخۆیانەوە هەڵداوەسن. ژن لەنێو ئەوانەدا هی گشت لایەکە، بۆیە هەرهەموویان پێکەوە خوشک و برای یەکترن و لەنێو خۆیاندا دوژمنایەتی و ڕق و کین بوونی نییە. سەبارەت بە نەریتی‌تریش، وەک تراکی‌یەکان دەچن.

[١٠٥] نێڤرۆییەکان خاوەن نەریتی چەشنی سکیتی‌یەکانن. وەچەیەک بەر لە پەلاماری لەشکری داریوش، ناچاربوون وڵاتی خۆیان جێبهێڵن، چونکە مارەکانی ئەو دەڤەرە هێرشیان هێنابوو. ژمارەی ئەو مارانە لە هەرێمەکەیان خێرا چەند بەرابەر ببوو. هەڵبەت بەشی هەرە زۆری ئەو مارانە لە ناوچە بیابانییەکانی دوور لە وڵاتی نێڤرۆیی هاتبوون و ئەوەندەش زۆر بوون کە

---

١- یۆنانییەکان وەک ئیلاهە ئارتێمیدۆس ناسیویانە، بەڵام ئیڤریپیدیس لە کتێبەکەی خۆیدا بەناوی ئیڤتاڤریس ناوی دێنێ.

٢- ئاغامێمنۆن، پاشای وڵاتی میسی و ئارغۆس و یەکێک لە سەردارانی ناسراوی شەڕی ترۆئا.

دانیشتووان باشاریان نەکردن و ناچار کۆچیان کرد و پەنایان بۆ ڤودینییەکان برد.

نیڤرۆییەکان ویدەچێ گشتیان فالگیر بووبن. سکیتی و یۆنانییەکانی لە ولاتی سکیتیا دەژین، دەڵێن هەر نیڤرۆییەک ساڵێ جارێک روخساری دەگۆڕێ و وەک گورگی لێدێ و پاشان دوبارە رەنگی مرۆڤ بەخۆوە دەگریتەوە. من خۆم باوەڕم بەو قسانە نییە، ئەوانەی کە ئەو قسەیە دەکەن، بە تامەزرۆییەوە سوێندیشی لەسەر دەخۆن.

[١٠٦] ئاندرۆفاغییەکان لە هەڵسەنگاندن لەگەڵ خەڵکانیتر، خاوەن وەحشیترین نەریتن. ئەوانە نازانن دادپەروەری مانای چییە و هیچ یاسا و قانوونێکیان نییە. خێڵەکی دەژین و چەشنی سکیتییەکان جلوبەرگ دەپۆشن و بە زمانی سکیتی قسە دەکەن. لەنێو گشت خێڵەکانی ئەو ولاتەدا، تەنیا ئەوانە ئینسانخۆرن.

[١٠٧] میلانخلێنییەکان تەنیا جلوبەرگی رەش لەبەر دەکەن و هەربۆیە ئەو ناوەیان بەسەردا براوە. ئەوانەش لەگەڵ سکیتییەکان خاوەن نەریتی هاوشێوەن.

[١٠٨] بودینییەکان، خێڵێکی گەورە و حەشیمەتێکی زۆرن. چاوی هەرهەموویان شین و قژیان سوورە. شاری نێوەندیی واتە پێتەختەکەیان لە دار دروستکراوە و پێیدەگووترێ پێلۆنۆس. دیواری حەساری ئەو شارە لە هەر لایەک سێ ستادیۆ مەودای هەیە، بەرزە و لە دار سازکراوە. ماڵەکان و شوێنە ئایینییەکان، گشتیان لە دارن. لەو هەرێمە ژمارەیەک نێوەندی ئایینی خواکانی یۆنانی بەرچاودەکەون. هەرهەموویان بە شێوازی یۆنانی و خاوەن پەیکەرە، سەکۆی قوربانی و پەرستگەن و لە دار دروستکراون. هەرسێ ساڵ جارێک جەژنێک بۆ خواوەند دیۆنیسۆس دەگرن. پێلۆنییەکان، هەمان ئەو کۆمەڵە یۆنانییەن کە لە نێوەندەکانی بازرگانی دوور لە دەریاکان کۆچیان کردوە و هاتوونەتە ولاتی بودینییەکان و لێی نیشتەجێ بوونە. ئەوانە بە زمانی بودینی و یۆنانی قسەدەکەن.

[١٠٩] بودینی‌یەکان، نە خاوەن زمانی چەشنی بیلۆنی‌یەکانن و نە شێوەی ژیانیان وەک ئەوان دەچێ. بودینی‌یەکان خەڵکی خۆجێیی و خێڵ و عەشیرەتن. تەنیا هۆزێکی ئەو هەرێمەن بە خواردنی قونچکەی داری سنەوبەر دەژین. بەپێچەوانەی ئەوانە، بیلۆنی‌یەکان وەرزێڕن، خواردنیان گەنمە، باغاتیان هەیە و نە لەباری ڕەنگی پێستەوە و نە لەباری روخسارەوە لەگەڵ بودینی‌یەکان ویکچوونیان نییە. هەڵبەت سەرەڕای ئەو جیاوازییانەش، یۆنانییەکان بەهەڵە بودینی‌یەکان بە بیلۆنی دەناسن.

سەرتاسەری وڵاتی بودینی‌یەکان بە دارستانی چڕ داپۆشراوە. لە گەورەترین پانتایی ئەو دارستانە، گۆلێکی گەورە و قوڵ هەیە. دەوری گۆل بە قۆپی و قامیشەلان گەمارۆدراوە. لەنێو ئاوی گۆلدا سەگاو و مشکی ئاوی و کۆمەڵێک ئاژەڵی خاوەن سیمای چوارگۆشە دەژین. دانیشتووانی دەڤەرەکە ئەو ئاژەڵانە ڕاودەکەن و پاشان تیزماڵێک لە کەوڵەکەیان لە بەرۆکی کەواکانیان دەدروون و هەروەها دەڵێن گوونی ئەو زیندەوەرانە بۆ چارەسەری نەخۆشی مناڵدانی ژنان بەوەجە.

[١١٠] بەڵام سەبارەت بە ساڤرۆماتی‌یەکان، بابەتێک دەگێڕنەوە کە بەو چەشنەیە: لە شەڕی هەرێمی تێرمۆدۆندا کە یۆنانی‌یەکان بەسەر ئامازۆنی‌یەکاندا زاڵبوون (سکیتی‌یەکان ئامازۆنی‌یەکان بەناوی ئی‌ئۆرپاتا دەناسن. ئی‌ئۆرپاتا بە زمانی یۆنانی ڕەنگە وەک پیاوکوژ مانا بکرێتەوە - چونکە ئی‌ئۆر بە زمانی سکیتی دەبێتە پیاو و پاتا واتای کوشتن دەدا)، یۆنانییەکان توانیان سێ پاپۆڕی پڕ لە ژنانی ئامازۆنی یەخسیربکەن. ئەوانەیان سواری پاپۆڕەکان کرد. وەختێک پاپۆڕەکان گەیشتنە نێوەڕاستی ئاوەکان، ژنانی ئامازۆنی دەستیان‌کردەوە و گشت کەشتیوان و مەلوانەکانی یۆنانییان کوشت. ژنەکان نەیاندەزانی پاپۆر چییە و نەیانتوانی نە بایەوانەکان و نە فەرمانی گەمی‌یەکان بەکاربێنن. ئەوان یۆنانییەکانیان کوشتبوو و خۆیان لەسەر ئاوەکان سەرگەردان مابوونەوە. تۆفانێک پاپۆرەکانی خستە بە شەپۆلەکانی ئاو و هەرهەموویان گەیشتنە گۆلی می‌ئۆتیدا لە هەرێمی

کریمنی. هەرێمی کریمنی لەڕاستیدا وڵاتی سکیتی‌یەکانی ئازادە. ژنانی ئامازۆنی لە قەراخ ئەو گۆلە دابەزین، بۆوەی ئاوەدانییەک بدۆزنەوە. لەڕێگادا تووشی ڕەوەیەک ئەسپ هاتن. ئەسپەکانیان راکێشا و سواریان بوون و دەستیان بە تالآنی ملک و ماڵی سکیتی‌یەکان کرد.

[١١١] سکیتی‌یەکان نەیاندەزانی چ قەوماوە. نە زمانی ئەو ژنانە حاڵی دەبوون و نە جلوبەرگی لەو چەشنەیان دیتبوو و نە قەتیش هۆزی ئامازۆنی‌یان ناسیبوو. ئەوان بۆیان ببوو بە پرسیار کە ئەوانە لەکوێوە هاتوون. سکیتی‌یەکان پێیانوابوو ئەوانە گشتیان پیاو و گەنجن و بۆیە لەجێوە پەلاماریان دان. دوای شەڕێکی قورس سکیتی‌یەکان سەرکەوتن. لەکاتی پشکنینی تەرمەکان دەرکەوت گشتیان ژنن. سکیتی‌یەکان دوای راوێژ، بڕیاریان‌دا چیتر ئەو ئامازۆنی‌یانە نەکوژن، لەجیات شەڕ باشترە کۆمەڵێک کوڕە لاوی سکیتی بنێرنە لایان. هەڵبەت بەراوردی ژمارەی ئەو ژنە ئامازۆنی‌یانەیان کرد. گەنجەکانی سکیتی لە نیزیک ئامازۆنی‌یەکان ئۆردویان لێدا و هاوشێوەی ژنەکان هەڵسوکەوتیان دەکرد. هەرکات ژنەکانی ئامازۆنی پەلاماری گەنجەکانیان دەدا، کوڕەکان بەبێ بەرگری، پاشەکشەیان دەکرد و ئەوجار لە شوێنێکی نیزیکتر لە ژنەکان مۆڵگەیان دادەمەزراندەوە. سکیتی‌یەکان بۆیە ئەو بڕیارەیان‌دا، چونکە گەرەکیان بوو لەو ژنە ئامازۆنیانە ببنە خاوە مناڵ.

[١١٢] گەنجە سکیتیەکان بە مەبەستی جێبەجێ‌کردنی ئەو بڕیارە وەڕێکەوتن. ژنانی ئامازۆنی، ئەوانیش تێگەیشتن کە ئەو گەنجانە بۆ شەڕ و ئازاری ئەوان نەهاتوون، بۆیە دەستیان لە راونانی کوڕەکان هەڵگرت. لاوەکان هەرڕۆژە تۆزێک نیزیکتر دەکەوتنەوە و ئۆردوگای خۆیان بۆ لای مۆڵگەی ژنەکان دەگواستەوە. گەنجانی سکیتی چەشنی ژنانی ئامازۆنی هیچ کەلوپەلی‌تر جیا لە چەکەکانیان پێنەبوو. کوڕەکان وەک ژنەکان دەژیان، راو و شکار و تالآن کاریان بوو.

[١١٣] ژنانی ئامازۆنی گشت رۆژێک، لای نیوەڕۆ بەو چەشنە هەڵسوکەوتیان دەکرد: ئەوانە بەمەبەستی دەست بە ئاو گەیاندن یەک یەک و دوودوو بەنێو دارستاندا بڵاوەیان دەکرد و لەیەکتر جیادەبوونەوە. گەنجانی سکیتی بەو کارەی ژنەکانیان زانی و ئەوانیش بەهەمان شێوە جولانەوە. رۆژێکیان یەکێک لەو گەنجانە. لە ژنێکی ئامازۆنی نیزیک بۆوە. ژنە پێی ناخۆش نەبوو و مەجالی بە کوڕەدا لە باوەشی بگرێ و تێکەڵاوی جینسی لێکەوتەوە. ئەوانە زمانی هەڤدوویان نەدەزانی و تەنیا بە ئیشارەی دەست و پەنجە یەکتریان حاڵیکرد. ژنە بە کوڕەی گووت کە رۆژی دواتر بێتەوە هەمان شوێن و گەنجێکیتریش لەگەڵ خۆی بێنێ و ئەویش دەستەخوشکێکی خۆی دێنێ. کوڕە سکیتییەکە کاتێک گەڕاوە مۆڵگە، رووداوەکەی بۆ گەنجانیتر باسکرد. رۆژی دواتر خۆی و گەنجێکیتر بەرەو ژوانگە چوون. گەنجەکانیتریش وەختێک بەو سەرکەوتنەیان زانی و ترسیان شکا، لەگەڵ ژنانیتری ئامازۆنی رێککەوتن.

[١١٤] پاش فەترەیەک مۆڵگەی هاوبەشیان دامەزراند و هەرکەسە لەگەڵ ژنێکی ئامازۆنی کە یەکەمجار هەڵیبژاردبوو، ژیانی هاوسەری پێکهێنا. پیاوانی سکیتی نەیانتوانی زمانی ژنانی ئامازۆنی فێربن، بەڵام ژنەکان فێری زمانی سکیتی بوون. وەختێک ئەوانە توانیان پێکەوە قسەبکەن و لە یەکتر حاڵی بن، پیاوەکان بە ژنانی ئامازۆنییان گووت: "ئێمە خاوەن بنەماڵە و مڵک و ماڵین، با لەوە زیادتر بەو شێوەیە درێژە بەو ژیانە نەدەین، باشترە بگەڕێینەوە لای کەسوکارمان. بەڵێنتان پێدەدەین جیا لە ئێوە، ژیانی هاوسەری لەگەڵ هیچ ژنێکیتر دانەمەزرێنین. ژنانی ئامازۆنی بەو چەشنە وڵامیان داوە: "ئێمە ناتوانین لەگەڵ ژنانی سکیتی هەڵکەین، چونکە خاوەن نەریتی هاوشێوە نین. ئێمە کەوانداریین، نێزە هاوێژین، سوارکارین و لەمەر ئەرکی ژنانە زانیارییەکمان نییە. ژنانی ئێوە هیچکام لەو کارانەی باسمان کرد، نازانن، ئەوان تەنیا مژوولی کاری ژنانەن و لەنێو فایتوونەکاندا دەژین، تەنانەت بۆ راو و شکاریش ناچنە هیچ شوێنێک. کەوابوو، ئیمکانی نییە ئێمە

وەک ئەوان هەڵسوکەوت بکەین. ئەگەر ئێوە دەخوازن، حەقوایە بچنەوە لای کەسوکارتان و بەشە ماڵ و دارایی خۆتان وەربگرن و پاشان بگەڕێنەوە لای ئێمە با خۆمان جیا لە خەڵکانی‌تر پێکەوە بژین".

[١١٥] گەنجەکانی سکیتی بەو قسانە بە قەناعەت گەیشتن. بەشەماڵی خۆیان وەرگرت و گەڕانەوە لای ژنانی ئامازۆنی. ژنەکان ئەوجار بە گەنجەکانیان گووت: "ئێمە لێرە هەست بە مەترسی دەکەین، چونکە تالانی دەڤەرەکەمان کردوە و هەروەها ئێوەشمان لە کەسوکارتان دوور خستووەتەوە، ئەگەر دەخوازن ئێمە هاوسەریتان بکەین، پێویستە لەو وڵاتە بڕۆین و کاتێک لە ڕووباری تانائیس پەڕینەوە، لەوبەری چۆم نیشتەجێ دەبین ".

[١١٦] سکیتی‌یەکان ئەو خواستەی ژنەکانی ئامازۆنیشیان بەجێ‌گەیاند و لە چۆمی تانائیس پەڕینەوە و مەودای سێ ڕۆژ ڕێگا بەلای ڕۆژهەڵاتدا و سێ ڕۆژی‌تر دوور لە گۆلی مێئۆتیدا، بەرەو باکوور ڕۆیشتن. وەختێک گەیشتنە ئەو شوێنەی ئێستا لێی‌نیشتەجێن، لەوێ مانەوە.

ژنانی ساڤرۆماتی خاوەن شێوازی ژیانی هاوشێوەی ئەو کۆمەڵە ژنە ئامازۆنییەن کە یەکەمجار هاتوونەتە ئەو دەڤەرە. ژنانی ساڤرۆماتی بەمەبەستی ڕاوکردن بە سواری ئەسپ وەدەردەکەون، جا یا لەگەڵ پیاوەکان یا بە تەنیا خۆیان. ئەوانە لە شەڕیشدا بەشداری دەکەن و چەشنی پیاوان جلوبەرگ دەپۆشن.

[١١٧] ساڤرۆماتی‌یەکان هەر لە ساڵانی کۆنەوە زمانی سکیتی پڕ لە هەڵە دەدوێن. لەبەرئەوەی ئامازۆنی‌یەکان نەیانتوانی زمانی سکیتی بەدروستی فێربن. ساڤرۆماتی‌یەکان کاتی زەماوەند نەریتێکی تایبەت بەخۆیان هەیە: هیچ کیژێکی ساڤرۆماتی مێرد ناکات، تا کەسێکی لە دوژمن نەکوشتبێ. زۆربەی ئەو کچانە بەرلەوەی مێردبکەن، بە قەیرەیی دەمرن، چونکە نەیانتوانیوە ئەو مەرجە بەرنەسەر.

[١١٨] پاشا و فەرمانڕەوای ئەو نەتەوانەی پێشتر ناوم هێنان، لە دەوری یەکتر کۆببوونەوە و گوێیان لە قسەی راسپاردەکانی سکیتی ڕاگرتبوو. سکیتی‌یەکان دەیانگووت کە داریوشی پارس پاش ئەوەی وڵاتانی سەر ڕێگای داگیرکرد، پردی لەسەر ئاوی تەنگەبەرایی ڤۆسپۆریس لێداوە و پێی لەنێو خاکی وڵاتی ئەوان ناوە. پەلاماری وڵاتی تراکی داوە و گەیشتووەتە چۆمی ئیسترۆس، بەو مەبەستە کە تەواوی وڵاتەکانی ئەو سەرزەوینە بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی.

"ئێوە، بەهیچ شێوەیەک نابێ بێ‌هەڵوێست بن و ڕێگا بدەن ئێمە تێدابچین. پێویستە یەکبگرین و گشتمان پێکەوە لەهەمبەر پەلاماردەر بەرگری لە خۆمان بکەین. ئەگەر ئەو کارەی نەکەن، ئەوکاتە ئێمە لەبەر زەختی دوژمن وڵاتی خۆمان چۆڵدەکەین یا ناچارین پەلاماری پارسەکان بدەین. ئەگەر ئێوە بە هانامانەوە نەیێن، ڕێگا چارەی‌ترمان نییە. هەڵبەت بارودۆخی ئێوە لە هی ئێمە باشتر نابێ. پاشای پارس شەڕی تەنیا دژی ئێمە نییە، بەڵکوو مەبەستی ژێردەستە کردنی ئێوەشە. ئەو هەر بەوەندە رازی نابێ، ئەگەر ئێمە لەنێوبەرێ، زیان بە ئێوەش دەگەیێنێ. ئێستا لەوبارەوە روونکردنەوەی‌ترمان هەیە. ئەگەر پاشای پارس گەرەکی بوایە تەنیا پەلاماری ئێمە بدا و تۆڵەی ئەو کاتە بکاتەوە کە کۆیلەی ئێمە بوونە، دەبوایە خۆی لە خەڵکانی‌تر نەگەیاندە و تەنیا شەڕی دژی ئێمەی کردبا و بە ئاشکرا گووتبای دژی سکیتی‌یەکان لەشکرکێشی دەکەم، نەک گەلانی‌تر. ئێستا، هەرکە گەیشتووەتە سەر خاکی ئێمە، خێرا گشت تراکی‌یەکانی هێناوەتە ژێر دەستی خۆی و وڵاتی دراوسێی ئەوانیش، واتە خاکی غیتی‌یەکانیشی داگیرکردوە".

[١١٩] راسپاردەکانی سکیتی بەو شێوەیە قسەی خۆیان کرد، پاشا و سەرکردەی نەتەوەکانی‌تر، خۆیان پێکەوە کۆبوونەوە و دوای تاوتوێی بارودۆخەکە، تووشی دووبەرەکی هاتن.

بیلۆنی، بودینی و ساڤرۆماتی‌یەکان لەو بڕوایەدا بوون کە یارمەتی سکیتی‌یەکان بدەن. ئاغاتیرسی، نیڤرۆیی، ئاندرۆفاغی، میلانخلێنی و

تاڤرۆیەکان بەو چەشنە وڵامی ڕاسپاردەکانی سکیتی‌یان داوە: "ئەگەر ئێوە پێشتر ناهەقیتان دەرحەق بە پارسەکان نەکردبا و شەڕتان دژی ئەوانە نەکردبا، ئێستا هەرچی داواتان کردبا بەلای ئێمەوە دروست بوو. دەتانتوانی ئێمە بە قەناعەت بگەیێنن و پێکەوە هاوپەیمانیمان دامەزراندبا. بەڵام ئێوە کاتی خۆی بەبێ ئەوەی پرس بە ئێمە بکەن، یا ئێمە بەشداری شەڕەکە بین، هێرشتان کردە سەر وڵاتی پارسەکان و ئەوانتان کردە کۆیلەی خۆتان. ئێستا هەر ئەو خوایە ئەوانی هانداوە بۆوەی هەمان ڕەفتار لەگەڵ ئێوە بکەن. ئێمە نە ئەوکات ناهەقیمان کردوە و نە ئێستاش دەخوازین زیانیان پێبگەیێنین. هەرکات لەشکری پارس هات و گەیشتە وڵاتی ئێمە و گەرەکی بێ زەرەرمان پێبگەیێنێ، ئەو وەختە لێی ڕادەسێین، بەڵام تا ئەو کاتە چاوەڕوان دەبین. ئێمە دەسپێشخەری ناکەین، چونکە لەو باوەڕەداین کە پارسەکان لەشکر ناهێننە سەر ئێمە، بەڵکوو مەبەستیان ئەو کەسانەیە کە تاوانباری ڕاستەقینەن سەبارەت بە ناحەقییەک کە پێشتر کردویانە ".

[١٢٠] کاتێک سکیتی‌یەکان ئەو وڵامەیان پێگەیی، خۆیان کۆبوونەوە و بڕیاریان‌دا هیچ شەڕێک نەکەن، لەبەر ئەوەی دراوسێ‌کانیان ناخوازن یارمەتییان بدەن، بەڵکوو تەنیا پاشەکشە بکەن و سەرچاوە ئاوییەکان بگرن و ویشکیان هەڵگێڕن و موچە و مەزراکان وێران‌بکەن و هەروەها بەسەر دوو دەستەدا بەشبن. خەڵکی ساڤرۆماتی، ئەوانیش بە پاشایەتی سکۆپاسی ڕەگەڵ دەستەی یەکەم کەون.

قەرار بەو شێوەیە بوو کە ئەگەر پارسەکان بەرەو دەستەی یەکەم لەشکرکێشی بکەن، ئەوکاتە خەڵکەکە دەبێ بۆ سەر چۆمی تانائیس پاشەکشە بکەن و قەراخ ئاوەکانی گۆلی مێئۆتیدا بگرنەبەر. ئەگەریش پارسەکان پاشەکشە بکەن، سکیتی‌یەکانی دەستەی دووهەم پێویستە پەلاماریان بدەن و ڕاویان‌بکەن و لە وڵات وەدەریان‌بنێن. ئەرکی دەستەی یەکەم بە پاشایەتی سکۆپاسی و چۆنییەتی کۆچکردنیان دیاریکرا.

دەستەی دووهەم، واتە دوو کۆمەڵە حەشیمەتەکەی‌تر، یەکیان بە پاشایەتی ئیدانتیرسۆ و ئەوەی‌تریش بە سەرکردایەتی تاکساکی، ئەوانە لەگەڵ یێلۆنی و بودینی‌یەکان یەکیان‌گرت. بڕیاردرا سەرەتا پاشەکشە بکەن و مەودای نێوانیان لەگەڵ لەشکری پارس، یەک ڕۆژی سەفەری دوور بێ و کاریان جێبەجێ‌کردنی ئەو ئەرکانە بێ کە بۆیان دیاری‌کرابوو.

بەر لە هەر کارێک، پێویست بوو بەرەو وڵاتی ئەو خەڵکانە پاشەکشە بکەن کە حەزیان لە یارمەتی‌دان نەبوو و هاوپەیمانی‌یان قبوڵ نەکردبوو. بەو شێوەیە ئەوانە ناچار دەبوون کە لە شەڕدا بەشداربن (ئەو خەڵکانە هەرچەند بڕیاریان دابوو دوورەپەرێز بن، بەڵام ئێستا سەرەڕای مەیلی خۆیان دەبوایە دژی پارسەکان شەڕبکەن). جیا لەوەش، دەستەی دووهەم قەرار بوو بگەڕێنەوە وڵاتی خۆیان و هەرکە بارودۆخیان بە قازانج بینی، پەلاماری پارسەکان بدەن.

[١٢١] وەختێک سکیتی‌یەکان ئەو بڕیارانەیان‌دا، کۆمەڵێک لەوانە بە مەبەستی شەڕ دژی لەشکری داریوش وەڕێکەوتن. سەرەتا باشترین سوارکارەکانیان ناردە مەیدان. فایتوون و داشقەکانی کە ژن و منالی سکیتی تێدا دەژیان، لە ناوچەکە دوور خرانەوە. هەڵبەت چی مەڕ و مالاتی هەیانبوو، ژمارەیەکی کەم نەبێ کە بۆ بژیو هێشتیاننەوە، ئەوەی‌تریان بەپانەوە ڕاگواست. بڕیاربوو بەرەو باکوور کۆچ بکەن.

[١٢٢] سەرەتا داشقە و فایتوونەکان وەڕێکەوتن. وەختێک هێزەکانی پێش لەشکری سکیتی تووشی پارسەکان هاتن، دەستەی داشقە و فایتوونان مەودای سێ ڕۆژ ڕێگا لە چۆمی ئیسترۆس بەرەو نێوەندی خاکی سکیتیا دوور کەوتبوونەوە. هێزەکانی سکیتی خێرا بە مەودای یەک ڕۆژ ڕێگا پاشەکشەیان کرد و چی کشتوکاڵی هەیانبوو، بە موچە و مەزراوە وێرانیان‌کردن. پارسەکان کاتێک چاویان بە هێزی سوارەی سکیتی کەوت، وەدوایان کەوتن و سوارەکانیش پاشەکشەیان کرد. بەو چەشنە پارسەکان بەلای ڕۆژهەلاتدا و بەرەو چۆمی تانائیس ڕۆیشتن. دوای ئەوەی

سکیتی‌یەکان لە چۆمی تانائیس پەڕینەوە، ئەوجار پارسەکانیش دەرباز بوون و سکیتی‌یەکانیان پتر راونا تا گەیشتنە ولاتی ساڤرۆماتی‌یەکان، پاشان لەوێوە بەرەو هەرێمی بودینی‌یەکان چوون.

[١٢٣] لە تەواوی ئەو ماوەیەدا کە لەشکری پارس بە ولاتی سکیتیا و ساڤرۆماتی‌دا دەرباز بوو، تووشی هیچ مەزرا و موچە و ئاوەدانی‌یەک نەهات، چونکە هەم ولاتەکە کشتوکالی نەبوو و هەم گشتی ویرانکرابوو. لەشکری پارس وەختێک گەیشتە هەرێمی بودینی‌یەکان، بەسەر شارێکی دروستکراو لە داردا کەوت. دانیشتووانی بودینی ئاواییەکەیان ویران کردبوو و ئاگریان تێبەردا بوو.

پارسەکان بەردەوام درێژەیان بە داگیرکەری خۆیان‌دا و لە کۆتاییدا گەیشتنە بیابانێک. هیچکەس لەو بیابانە نەدەژیا و لەبەری ولاتی بودینی‌یەکان هەلکەوتووە و بۆوەی کەسێک پێیدا دەربازبێ، حەوت رۆژ رێپێوانی گەرەکە. دوورتر لەو بیابانە، تیساغێتی‌یەکان نیشتەجێن و هەر لەو هەرێمە چوار رووبار سەرچاوە دەگرن و بە ولاتی مێئۆتی‌یەکان‌دا شۆڕ دەبنەوە و لە کۆتاییدا دەرژێنە نێو گۆلی مێئۆتیدا. ناوی ئەو رووبارانە بریتین لە: لیکۆس، ئۆئارۆس، تانائیس و سیرغیس.

[١٢٤] وەختێک داریوش گەیشتە ئەو بیابانە، پێشڕەوی هێزەکانی خۆی راگرت و لە قەراخ چۆمی ئۆئارۆس مۆلگەی دامەزراند. لەدرێژەدا هەشت بورجی پاسەوانی دروستکرد و مەودای نێوان ئەو بورجانە لەگەل یەکتر شێست ستادیۆ بوو و شوێنەواری ئەو بورجانە تا سەردەمی منیش ماوە. داریوش لەو کاتەدا کە سەرقالی دروستکردنی بورجەکان بوو، سکیتی‌یەکان، ئەوانەی لەشکری پارس راوی‌نابوون، رێگای چەپەکیان گرتەبەر و بەلای باکووردا دووبارە هاتنەوە نێو ولاتی سکیتیا.

لەبەر ئەوەی سکیتی‌یەکان تەواو لەبەرچاو ونبوون و لەشکری پارس لە هیچ شوێنێک تووشیان نەهات، داریوش بورجەکانیشی بەنیوەچلی جێهێشت

و دووباره بەلای رۆژئاوادا پاشەکشەی کرد. ئەو لەو باوەڕەدا بوو کە ئەو خەڵکەی بەرەو رۆژئاوا چوونە، گشتیان سکیتی‌ین.

[١٢٥] داریوش و سپاکەی خێراتر پێشرەوییان کرد و گەیشتنە سکیتیا و ئەوجار تووشی ئەو دوو دەستەیە لە سکیتی‌یەکان هاتن کە یەکتریان گرتبوو. ناوبراو گەرەکی بوو ئەوانە راوبنێ، بەڵام سکیتی‌یەکان بەر لە پەلاماری داریوش، خۆیان پاشەکشەیان کرد و مەودای یەک رۆژ دوورتر و لە پێشەوەی لەشکری پارس دەرۆیشتن. داریوش لەسەر راونانی ئەوانە بەردەوام بوو و سکیتی‌یەکانیش بەپێی نەخشەی خۆیان بەرەو ئەو وڵاتانە دەچوون کە حازر بە هاوپەیمانی نەبوون.

سکیتی‌یەکان یەکەم شوێن کە روویان‌تێکرد، وڵاتی مێلانخلێنی‌یەکان بوو. سکیتی و پارسەکان بەو پەلامارە مەزنەیان ئاژاوەیەکی گەورەیان هاوکات لەو وڵاتە سازکرد. پاشان بەرەو وڵاتی ئاندرۆفاغی‌یەکان چوون و پاش ئەوەی رەوشی ئەوێشیان تێکدا، ئەوجار چوونە وڵاتی نێڤرۆییەکان.

وڵاتی نێڤرۆییەکانیش تووشی ئاڵۆزی هات. دوای ئێرە، سکیتی‌یەکان بەردەوام پاشەکشەیان کرد و گەیشتنە لای ئاغاتیرسی‌یەکان. وەختێک ئاغاتیرسی‌یەکان دیتیان خەڵکانی دراوسێ بە هەراوهوریا وەپێش سکیتی‌یەکان کەوتوون و بەرەو وڵاتی ئەوان دێن، بەر لەوەی سکیتی‌یەکان بتوانن بێنە نێو خاکی وڵاتەکەیان، سنوورەکانیان داخست و هەڕەشەیان لێکردن کە بە هاتنە ژووریان تووشی دژکردەوەی قورس دەبن.

دوای ئەو راگەیاندنە، ئاغاتیرسی‌یەکان، لەسەر سنوورەکان کۆبوونەوە، بڕیاریاندا خۆیان بۆ بەرپەرچدانەوەی پەلاماری سکیتی و پارسەکان ئامادەبکەن. بەپێچەوانەوە مێلانخلێنی، ئاندرۆفاغی و نێڤرۆیی‌یەکان لەبەرامبەر هێرشی سکیتی و پارسەکان هیچ جوامێری‌یەکیان لەخۆیان نیشان نەدا. ئەوانە سەرەڕای کۆمەڵێک هەڕەشە کە پێشتر کردبوویان، گشتیان لەبیر خۆیان بردەوە و بە شڵەژاوی بەرەو باکوور رایانکرد و تا گەیشتنە سەحرا لە هیچ شوێنێک گیرنەبوون.

سکیتی‌یەکانیش نەیانتوانی بچنە نێو خاکی ئاغاتیرسی‌یەکان چونکە پێشیان پێگیرابوو، بۆیە بە وڵاتی بودینی‌یەکاندا بەرەو وڵاتی خۆیان گەڕانەوە و ئەوجار پارسەکانیان ڕاونا.

[١٢٦] سەرەڕای ئەوە کە داگیرکەری هەروا بەردەوام بوو و وێنەدەچوو تەواو بێ، داریوش ڕاسپاردەی ناردە لای پاشای سکیتی‌یەکان واتە ئیدانتیرسۆ و ئەو پەیامەی بۆ نارد: "ئەی چارەڕش، بۆچی بەردەوام ڕادەکەی، لەجیات ئەو گشتە هەڵاتنە دەتوانی یەک لەو دوو مەرجە جێبەجێ بکەی! ئەگەر پێتوایە لەبەرامبەر هێرشی لەشکری مندا خۆت پێڕادەگیرێ، لەسەر چی ڕاوەستاوی، دەست لە ڕاکردن هەڵگرە و وەرە مەیدانی شەڕ. ئەگەریش قبوڵتە کە لە من بچووکتری، بەس ڕابکە و خاک و ئاوت پێشکەش بە گەورەی خۆت بکە ".

[١٢٧] پاشای سکیتی‌یەکان ئیدانتیرسۆ بەو شێوەیە وڵامی قسەکانی داریوشی داوە: "پارسەکە، دەبێ پێت‌بڵێم کە تا ئێستا قەت لە مرۆڤ نەترساوم و لەبەر کەس هەڵنەهاتووم، تەنانەت لە کاتی ئاشتی و هێمنیشدا. ئێستا دەبێ بزانی کە بۆچی شەڕ لەگەڵ تۆ ناکەم. ئێمە خاوەن شار و ئاوایی نین، مووچە و مەزراشمان نییە، تا لەوە بترسین کە داگیر بکرێن و وێران بن و ناچار بین شەڕیان بۆ بکەین. هەڵبەت ئەگەر قەرارە ئەو شەڕە بکرێ، ئێمە گۆڕی بابوباپیرانمان هەیە. وەرن بیاندۆزنەوە و بوێرن هەڵیان‌بدەنەوە، ئەوکاتە دەزانن کە چ شەڕێکتان لە دژی دەکەین، دیارە بۆ پاراستنی گۆڕەکان نەک بۆ خواستێکی‌تر. بەر لەوەی ئەو ڕووداوە بقەومێ، دڵنیابە شەڕتان لەگەڵ ناکەین، مەگەر خۆمان بڕیارێکی ئەوتۆ بدەین. ئەوە سەبارەت بە کردن و نەکردنی شەڕ. سەبارەت بە گەورەیی و ئاغایەتی، دەبێ بڵێم کە من تەنیا خواوەند دیا بە سەرووەری خۆم دەزانم، ئەویش چوونکە لە ئەژدادی خۆمە، هەروەها خاتوو ئیستی‌یا کە شای گشت سکیتی‌یەکانە. بۆ تۆش، لەجیاتی ئاو و خاک، ئەو کۆمەڵە دیارییە دەنێرم کە قابیلت بێ. داوات کردوە پێت بڵێم گەورەم! باشترە زۆری لێ‌نەڵێی! ".

[١٢٨] تەتەری سکیتی‌یەکان وەرێکەوت، بۆوەی ئەو وڵامە بۆ داریوش بەرێتەوە. پاشاکانی سکیتی کاتێک گوێیان لە وشەی کۆیلایەتی بوو، ئاگریان گرت، بۆیە بەشێک لە هێزەکانیان ناردە پێشەوە. ساڤرۆماتی‌یەکان، ئەوانیش لەگەڵ ئەو بەشە لە هێزەکانی سکیتی ببوونە هاوپەیمان و سەرکردەکەیان ناوی سکۆپاسی بوو. ئەو هێزانە بە مەبەستی پێوەندی‌گرتن چوونە لای یوونی‌یەکانی پاسەوانی پردی ئیستروس.

پاشماوەی هێزەکانی سکیتی بڕیاریاندا خۆیان لەشەڕ دژی پارسەکان بپارێزن، تەنیا جاروبار کە دیتیان پارسەکان لە شوێنێک کۆبوونەتەوە و خەریکی خواردن و حەسانەوەن، پەلاماریان بدەنێ. ئەو بەشە لە سکیتی‌یەکان چاوەڕوانی کۆبوونەوەی لەشکری داریوش بوون و نێوەنێوە گورزێکیان دەوەشاند. هێزی سوارەی سکیتی بەردەوام لە سوارەی داریوش‌یان دەدا و دەستکەوتیان دەبوو. سوارەی پارس گشت جارێ دەبوایە لە فریای هێزی پیادەی خۆیان بکەوێ یا بەپێچەوانەوە، هێزی پیادە خێرا یارمەتی سوارکارەکان بدا. سکیتی‌یەکان هەرکە سەرکەوتنێکیان وەدەست دەهێنا بەپەلە مەیدانیان چۆل دەکرد و تەواوێک لە هێزی پیادەی پارس دەترسان. ئەوان بەو شێوەیە و بەتایبەت شەوانە پەلامارەکانیان درێژەپێدا.

[١٢٩] هەموو جارێ کە سکیتی‌یەکان پەلاماری مۆڵگەی لەشکری داریوش‌یان دەدا، تووشی گرفتێک دەهاتن و بە قازانجی پارسەکان تەواودەبوو. دیاردەیەکی سەیر و سەمەرە کە ئێستا باسی دەکەم: زەڕینی کەر و هێمای هێستر.

لە وڵاتی سکیتیا کەر و هێستر بەرچاو ناکەوێ و پێشتر باسمکردوە. لە سەرتاسەری خاکی ئەو وڵاتە تەنانەت یەک تاقە کەر یا هێستر بوونی نییە، هۆیەکەش دەگەڕێتەوە بۆ سارد و سڕی کەشوهەوای وڵات.

ئەو کەرانە دەیان‌زەڕاند و ترسیان وەبەر ئەسپەکانی هێزی سوارەی سکیتی دەنا. هەرجارێ سکیتی‌یەکان پەلاماریان دەستپێدەکرد، کەرەکانی نێو مۆڵگەی داریوش وەزەڕین دەکەوتن. ئەسپەکانی سکیتی دەسڵەمینەوە و

بەشێکیش لە ترسەکەیان لەبەر ئەوە بوو کە لە گوێی کەرەکان دەترسان، بەتایبەت کاتی زەڕین، قوتدەبوون. ئەو ئەسپانە هیچکات لە ژیانی خۆیاندا کەریان نەدیتبوو و گوێیان لە زەڕەی ئەوان نەببوو. پارسەکان لەو بارەوە شانسێکی بچووکیان لە شەڕدا هەبوو.

[١٣٠] هەرکات سکیتییەکان، پارسەکانیان لە بارودۆخێکی شەپرێو و هەرەس هێناندا دەدیت، هەوڵیان دەدا پارسەکان پتر لە وڵاتی خۆیان رابگرن، بۆوەی زیاتر برسییەتی و بێ بژیوی بچێژن. بۆ ئەو کارەش بەو چەشنە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ پارسەکان دەکرد: ئەوانە چەند سەر وڵاغ و ماڵاتیان بە گاوانەوە لە پشت سەری لەشکر دادەنا. پارسەکان وەختێک پەلاماری هێزەکانی سکیتییان دەدا، سکیتییەکان خێرا رایاندەکرد. پارسەکان دەگەیشتنە سەر گاڕان و دەستیان بەسەردا دەگرت و لە بابەت ئەو دەستکەوتە گەلێک غللور دەبوون.

[١٣١] دوای ئەوەی لەو چەشنە رووداوانە چەند جارێک دووپات بوونەوە، داریوش تەواوێک قەڵس بوو. پاشای سکیتییەکان بە قەڵسی داریوشی زانی و راسپاردەی نارده لای ئەو و یەک مشک و یەک بۆق و باڵندەیەک و پێنج خەدەنگی بەدیاری بۆنارد. پارسەکان سەرەتا لە کابرای راسپاردەیان پرسی کە ئەو دیارییانە چ مانایەکیان هەیە. کابرا لە وڵامدا گووتی: من تەنیا ئەرکی گەیاندنی ئەو خەڵاتانەم بەستووە بووە و هیچیتر و ئێستاش دەبێ خێرا بگەڕێمەوە. کابرا لە کۆتاییدا تەنیا ئەوەندەی بە پارسەکان گووت کە ئێوە خەڵکێکی وشیار و چاوکراوەن، دەتوانن مانای ئەو دیارییانە خۆتان لێکبدەنەوە.

[١٣٢] پارسەکان دوای بیستنی ئەو وڵامە، خۆیان کەوتنە مشوور. داریوش لەو باوەڕەدا بوو کە سکیتییەکان گەرەکیانە خۆیان بەدەستەوە بدەن و ئاو و خاکی وڵات لە خزمەت ئەو بنێن. ئەو دەیگووت، مشک لەژێر عەرز هێلانە دەکا و چەشنی مرۆڤ بە دەغڵ و دان دەژی. بۆق لەنێو ئاودا دەژی و باڵندەش بەتەواوی شێوەی ئەسپ دەدا. خەدەنگ نیشانەی خواستی

سکیتی‌یەکانە و دەخوازن چەکەکانیان دانێن. ئەوە بۆچوونی داریوش بوو. غۆڤری‌ئاس یەک لەو حەوت کەسەی سەردەمی خۆی بەشداریی لە روخاندنی دەسەڵاتی مۆغی میدیایی‌دا کردبوو، بەپێچەوانەی لێکدانەوەی داریوش، خاوەن بۆچوونی جیاواز بوو. بەباوەڕی ناوبراو مانای ئەو کۆمەڵە دیارییە بەو چەشنە بوو: "ئەی پارسەکان، ئەگەر ئێوە چەشنی باڵندە بە ئاسماندا نەفڕن، یا وەک مشک بەژێر خاکدا نەڕۆن، یا شێوەی بۆق لەنێو قۆپی‌یاندا هەڵبەزدابەز نەکەن، دڵنیابن لە کۆتاییدا بەو تیر و خەدەنگانە دەکوژرێن و هیچکات چاوتان بە وڵاتی خۆتان ناکەوێتەوە".

[١٣٣] ئەوە سەرجەم لێکدانەوەی پارسەکان سەبارەت بە دیاری سکیتی‌یەکان بوو. لەو نێوەدا دەستەی یەکەمی سکیتی‌یەکان کە پێشتر ئەرکی پاراستنی ناوچەکانی نیزیک گۆلی می‌ئۆتیدای پی‌ئەسپێردرابوو، ئێستا مەعمورکرابوون پێوەندی لەگەڵ یوونی‌یەکانی پاسەوانی پردی ئیستڕۆس بگرن. ئەوانە گەیشتنە نیزیک ئەو پردە. سکیتی‌یەکان بە یوونی‌یەکانیان گووت: "یوونی‌یەکان، باوەڕ بە قسەی ئێمە بکەن، دڵنیا بن بۆ رزگاری ئێوە هاتووین. ئێمە ئاگاداری ئەو فەرمانەی داریوش هەین کە بە ئێوەی گوتووە تەنیا شێست رۆژ لێرە بمێننەوە و پارێزگاری لەو پردە بکەن و ئەگەر ئەو خۆی نەهاتەوە، ئێوە بۆتان هەیە بگەڕێنەوە وڵاتی خۆتان.

ئێستا ئەگەر بە قسەی ئێمە دەکەن، خۆتان لە سەرکۆنەی ئێمە و داریوش بپارێزن با لە داهاتوودا تووشی تێداچوون نەبن. ئەو ماوەیەی داریوش دیاری کردوە، بمێننەوە و پاشان بەرەو وڵاتی خۆتان بگەڕێنەوە ". یوونی‌یەکان بەڵێنیان‌دا ئەو کارە بکەن و سکیتی‌یەکانیش خێرا بەرەو دواوە گەڕانەوە.

[١٣٤] دوای ئەوەی ئەو کۆمەڵە دیارییە گەیشتنە دەست داریوش، ئەوجار سکیتی‌یەکان وەخۆکەوتن و هاتنە مەیدان و خۆیان بۆ شەڕی سوارە و پیادەی پارس ئامادەکرد. کاتێک دوو لەشکر لەهەمبەر یەکتردا راوەستان و قەرار بوو شەڕ بقەومێ، لەو وەختەدا کەروێشکێک دەرپەڕی و بەنێوان

هەردوو سپادا رایکرد. سکیتی‌یەکان کە چاویان بە کەروێشک کەوت، یەکیەک و دوودوو سەریان لەدوو نا. هەراوهوریایەکی زۆر سازبوو. داریوش وەختێک چاوی بە شڵەژانی هێزەکانی سکیتی کەوت، پرسیاری لە پیاوانی دەوروبەری خۆی کرد. گەورە پیاوانی لەشکری کاتێک داریوش‌یان تێگەیاند کە سکیتی‌یەکان وەدوای کەروێشک کەوتوون، سەری سوڕما و لەجێوە لەگەڵ پیاوەکانی راوێژێکی کرد و گووتی: ئەو سکیتی‌یانە ئێمەیان زۆر پێ کەمە و ئێستاش وێدەچی قسەکانی غۆڤری‌ئاس سەبارەت بە دیارییەکان وەڕاست گەڕێن. لەمەو بەدوا منیش لەگەڵ بۆچوونی غۆڤری‌ئاسم، بۆیە پێویستیمان بە تەگبیر و مەسڵەحەتێکی باشە، بۆوەی بتوانین ساغ و سلامەت بگەڕێینەوە ولاتی خۆمان ".

غۆڤری‌ئاس لەوێ بوو و بەو چەشنە ولامی داریوشی داوە: "پاشاکەم، من پێشتر بیستبووم و دەمزانی کە ناکرێ ئەو خەڵکە راکێشییە مەیدانی شەڕ. لەو کاتەوە کە من هاتوومەتە ئێرە، لەوە کە بۆچی بەو شێوەیە گاڵتەمان پێدەکەن، کۆمەڵێک زانیاریم دەستکەوتووە. هەر بۆیە بەو قەناعەتە گەیشتووم کە هەر ئێمشەو کاتێک تاریکی داهات، بۆ ئەو سەربازانەی دەرەقەتی ماندوویەتی و دژواری ڕێگا نایەن چرا و قەندیلەکانمان داگیرسێنین، بابەتی بەدرۆ و هەڵخەڵەتێنەریان بۆ باس‌بکەین، کەرەکان لێک بەبەستینەوە و خۆمان بۆی‌دەرچین، بەرلەوەی سکیتی‌یەکان بگەنە چۆمی ئیسترۆس و پردەکە بڕوخێنن، یا یوونی‌یەکان بڕیارێک بدەن کە ببێتە مایەی شەرمەزاریمان".

ئەوە بۆچوونی غۆڤری‌ئاس بوو و هەرکە شەو داهات، داریوش فەرمانی جێبەجێ‌کردنی ئەو نەخشەیەی دەرکرد.

[١٣٥] چی خەڵکی ماندوو و پەککەوتە هەبوو، یا ئەو کەسانەی بە کوژران و لەدەست چوونیان زیانێک بە داریوش نەدەگەیی، لە ئۆردوگا جێیان‌هێشتن. کەرەکانیان لەیەکتر بەستنەوە و ئەوانیشیان لەگەڵ خۆیان نەبرد. بۆیەش ئەو جەماوەرەیان لەگەڵ کەرەکان بەجێ‌هێشت، تا زەڕەزەڕی کەرەکان بەردەوام

بێ. ئەوکەسانەی نەخۆش و بریندار بوون، ئەوانیش بەجێمان. بەهانەی ئەو کارە ئەوە بوو کە داریوش دەخوازێ کەسانێک لەنێو لەشکردا هەڵبژێرێ کە بتوانن پەلاماری سکیتی‌یەکان بدەن، ئەوانەی دەمێننەوە، پێویستە ئەرکی پاراستنی ئۆردوگا وەستۆی خۆیان بگرن.

وەختێک ئەو دەستوورە بە خەڵکی جێماو درا و ئاگرەکان داگیرسان، داریوش خێرا بەرەو چۆمی ئیسترۆس وەڕێکەوت. کەرەکان کە لە لەشکر جیاکرابوونەوە، پتر لە جاران دەیانزەڕاند. سکیتی‌یەکان بە بیستنی زەڕەی ئەو کەرانە، دڵنیا بوون کە پارسەکان هەروا لە ئۆردوگادا ماون.

[١٣٦] هەرکە رۆژ بۆوە، ئەوانەی لە مۆڵگەدا مابوونەوە، هەستیان‌کرد داریوش ئەوانی جێهێشتووە. ناچاربوون لەبەر سکیتی‌یەکان بپاڕێنەوە و تێیان‌بگەیێنن کە چییان بەسەر هاتووە. سکیتی‌یەکان وەختێک گوێیان لەو قسانە بوو، خێرا هەردوو دەستەی لەشکرییان کۆکردەوە و لەگەڵ ساڤرۆماتی و بودینی و یێلۆنۆسی‌یەکان یەکیان‌گرت و یەکڕاست ودوای پارسەکان کەوتن و بەرەو چۆمی ئیسترۆس چوون. بەشی هەرەزۆری لەشکری پارس لە هێزی پیادە پێکهاتبوو و رێگای ویشکایی بە باشی بەڵەد نەبوون و رێگایەکی دروستکراو لەگۆڕێدا نەبوو. ئەوە هۆیەک بوو کە ئەو دوو لەشکرە تووشی یەکتر نەهاتن و سکیتی‌یەکان زۆر زووتر گەیشتنە سەر پرد. سکیتی‌یەکان کاتێک دیتیان کە پارسەکان هێشتا وەدیارنەکەوتوون، بە یوونی‌یەکانی پاسەوانی پردیان گووت: "یوونی‌یەکان، ئەو ماوەیەی بۆتان دیاریکرابوو، تەواو بوو، ئیتر مەسڵەحەت نییە لەوە پتر لێرە بمێننەوە. ئەگەر پێشتر لە ترسی داریوش ناچاربوون ئەو پردە بپارێزن، ئێستا ئیتر ئێوە لە سایەی سەری سکیتی‌یەکان و خواکانیان ئازاد و سەربەستن. ئەو کەسانەی پێشتر ئاغایەتییان بەسەر ئێوەدا دەکرد، بەڵایەکیان بەسەر هاتووە کە جارێکی‌تر لەخۆڕانەبینن دژی خەڵک لەشکرکێشی بکەن ".

[١٣٧] یوونی‌یەکان گوێیان لەو ئاخاوتنە بوو و لەجێوە کۆبوونەوەیان پێکهێنا. میلیتیادیس خەڵکی ئاتێن، سەرکردە و حاکمی هەرێمی خێرسۆنیسۆ

لەو باوەڕەدا بوو کە پێویستە بەقسەی سکیتی‌یەکان بکرێ و بچن وڵاتی یوونیا (لەجیات بەکرێگیراوی بۆ داریوش، نیشتمانی خۆیان رزگار بکەن) ئازاد بکەن، بەڵام میلیسیۆس، خەڵکی ئیستی‌ئێ‌ئۆس دژی ئەو بۆچوونە بوو. ئەو پێیوابوو کە لە سایەی سەری داریوش، گشت ئەو سەرکردە نیزامییانە لە ناوچەی ژێر حوکمی خۆیان بوونەتە خاوەن دەسەڵات. ئەگەر فەرمانڕەوایی داریوش بڕووخێ، ئەوکات ئەوانیش، بەتایبەت ئەو خۆی، دەسەڵاتی حوکمڕانی هەرێمی میلیتۆس لەدەست دەدا و بەگشتی کەس لەسەر حوکم نامێنێ، چونکە خەڵکی ئەو ناوچانە بەپانەوە خوازیاری ئازادی خۆیان بوون، نەک دیکتاتۆری و سەرەڕۆیی. وەختێک کابرای خەڵکی ئیستی‌ئێ‌ئۆس قسەکانی تەواوبوو، ئەوانی‌تریش بۆچوونیان گۆڕانی بەسەردا هات، هەرچەند پێشتر لەگەڵ بیروڕای میلیتیادیس بوون.

[١٣٨] ئەوانەی رایانگۆڕی و پاشایان بەلاوە گرینگتر بوو، ئەو کەسانە بوون: حوکمڕانانی هەرێمی ئێلیس‌پۆندۆس بە ناوەکانی، دافنیس خەڵکی ئابیدین[١]، ئیپۆکلۆس خەڵکی لامپساک[٢]، ئیرۆفاندۆس خەڵکی پاری‌ئیی، میترۆدۆرۆس خەڵکی پرۆکۆنیس[٣]، ئاریستاغۆراس خەڵکی کیزکینۆ[٤] و ئاریستۆن خەڵکی بیزانس[٥]. ئەوانە گشتیان خەڵکی دەڤەری ئێلیس‌پۆندۆس بوون. ئەوانەی خەڵکی هەرێمی یوونیا بوون، ستراتیس خەڵکی دورگەی خییۆس[٦]، لیاکیس خەڵکی دورگەی سامۆس، لائۆداماس فۆکائیڤ و ئیستیێ‌ئۆس خەڵکی میلیسیا. بۆچوونی ئەوەی دوایی دژی میلیتیادیس بوو.

---

١- ئابیدین یا ئابیدۆس یەکێک لە شارەکانی کۆنی ئاسیای بچووک، هەڵکەوتوو لە قەراخ ئاوەکانی داردانێل.

٢- لامپساک، شارێکی کۆنی ئاسیای بچووک لە کەنارئاوەکانی داردانێل.

٣- پرۆکۆنیس، دورگەیەکی ناسراوی ئاسیای بچووک لە باکووری رۆژهەلاتی کیزیک و لە ناوچەی تەنگە ئاوییەکان. ماوەیەک موهاجیرنشینی یۆنانی بووە و ئەمرۆ پێیدەگووترێ مەرمەرە.

٤- شارێکی کۆن و گەورەی ئاسیای بچووک بووە و لە نیزیک تەنگە ئاوییەکان بووە. ئەمرۆ تەنیا وێرانەکانی بەجێ‌ماون.

٥- بیزانس، شارێکی باستانی ئاسیای بچووک، هەڵکەوتوو لە قەراخ ئاوەکانی بۆسفۆر.

٦- دورگەیەکی بچووکی یۆنانی لە دەریای مەدیترانە و لە هەشتا کیلۆمیتری ئەزمیر.

لەوانەی کە خەڵکی هەرێمی ئیئۆلی بێ، تەنیا ئاریستاغۆراس، دانیشتووی کیمێئا[1] لەوێ بوو.

[١٣٩] ئەو کەسانەی لەگەڵ بۆچوونی ئیستیێئۆس بوون، بڕیاریاندا بە قسە و کردەوە وەخۆکەون و پردی سەر چۆم بەلای سکیتییەکانەوە بە مەودای کەوانەی تیرێک بڕوخێنن. ئەوەش بۆیە بوو کە نیشانبدەن، خەریکی ڕووخاندنی پردەکەن، بەڵام لەڕاستیدا هیچ کارێکی ئەوتۆیان نەکرد. لەوەش نیگەران بوون کە سکیتییەکان قەڵس بن و حەولبدەن بە زۆرەملی بەسەر پردی چۆمی ئیسترۆسدا بپەڕنەوە. ئەوان هەروەها بڕیاریاندا کە بە سکیتییەکان بڵێن، بۆیە خەراپکردنی پردیان لەلای وڵاتی ئەوانەوە دەستپێکردوە، چونکە پتر بە قازانجی لەشکری سکیتی تەواو دەبێ.

ئەوە کۆمەڵە بڕیاراتێک بوون کە خرانە سەر بۆچوونی ئیستیێئۆس و هەر ئەویشیان کردە نوێنەر بۆوەی لەگەڵ سکیتییەکان قسەبکا. ناوبراو بەو شێوەیە ئاخاوت: "ئەی خەڵکی سکیتی، ئێوە خۆشترین خەبەرتان بۆ ئێمە هێنا. پێشنیارەکانتان لە کاتێکی گونجاودا گەیشتنەجێ. ئێستا کە ئێوە ڕێنمایی دروستی ئێمەتان کردوە، ئێمەش گەرەکمانە لە وەختێکدا کە شایستە و لێوەشاوەی گەورەیی ئێوە بێ، بێینە ژێر دەسەڵاتتان، بەڵام هەروەک دەبینن، ئێستا خەریکی ڕووخاندنی پردین و ئەو کارەشمان زۆر بەلاوە گرینگە، چونکە گەرەکمانە سەربەست و ئازاد بژین. بەباوەڕی ئێمە، هاوکات کە سەرقاڵی ڕووخاندنی پرد دەبین، باشترە ئێوەش بەدوای هێزەکانی دوژمندا بگەڕێن و هەرکە دۆزیتانەوە، تۆڵەی ئێمەشیان لێبکەنەوە و بە سزای تاوانەکانیان بگەیێنن.

[١٤٠] سکیتییەکان بۆ جاری دووهەم باوەڕیان بە یوونییەکان کرد و بەمەبەستی دۆزینەوەی هێزەکانی پارس وەخۆکەوتن. سکیتییەکان لە ڕێگادا تووشی هێزەکانی پارس نەهاتن. ئەوەش دەگەڕاوە بۆ هەڵەی خودی سکیتییەکان، چونکە پێشتر چی مێرگ و لەوەڕگەی بۆ ئەسپەکان بەوەج بوو،

---

١- شارێکی کۆنی ئاسیای بچووک، هەڵکەوتوو لە هەرێمی ئیئۆلی.

ویرانیانکردبوو و کانیاوەکانیان بە قوڕگرتبوو و بیرەکانیان پڕکردبۆوە. ئەگەر ئەو کارەیان نەکردبا، زۆر بە هاسانی پارسەکانیان دەدۆزییەوە. ئەو بڕیارەی پێشوویان، سەبارەت بە ویرانکردنی گشت ئەو شوێنانە کە بە لایانەوە گرینگ بوو، بە زیانی خۆیان تەواو ببوو. سکیتی‌یەکان ناچاربوون هەموو ناوچەکانی خاوەن لەوەڕگە و مێرگ و ئاو بگەڕێن، چونکە لەو باوەڕەدا بوون کە هێزەکانی دوژمن بەرەو ئەو شوێنانە دەچن و بەو چەشنە لەدەست سکیتی‌یەکان رادەکەن، بەڵام بەپێچەوانەوە پارسەکان ڕێگای پێشوویان لەبیر بوو و ڕاست بەوێدا گەڕانەوە. پارسەکان سەرەڕای بەڵەدی ڕێگا، بەو حاڵەش تا بگەنەوە سەر پرد، تووشی کۆڵێک گیروگرفت هاتن. کاتێک گەیشتنە سەر چۆم، دیتیان پرد ڕووخاوە. پێیانوابوو یوونی‌یەکان ئەوانیان جێهێشتووە و ڕۆیشتوون.

[١٤١] لەنێو پیاوانی داریوش‌دا کابرایەکی میسری دەنگزل هەبوو. داریوش دەسەر کابرای کرد کە بچێتە قەراخ چۆمی ئیسترۆس و بانگی ئیستیی‌ئۆسی خەڵکی میلیسیا بکا. کابرا ئەمری داریوشی بەجێ‌گەیاند و ئیستیی‌ئۆس هەرکە گوێی لەو هاوارە بوو، خێرا تەواوی قایقەکانی نارد کە لەشکر بگوازنەوە، واتە دووبارە پردەکەی سازکردەوە.

[١٤٢] پارسەکان بەوچەشنە رزگاریان هات و سکیتی‌یەکانی بەدوایانەوە بوون، بۆ جارێکی‌تریش نەیانتوانی بیاندۆزنەوە. هەربۆیە دەگووترێ کە هەرچەند یوونی‌یەکان مرۆڤی ئازادیخوازن، بەڵام دەبێ بڵێم کە خوێڕیترین و بێ‌غیرەتترین خەڵکن. ئەگەر وەک کۆیلەش سەیریان بکەین، لە سەرشۆڕی و نۆکەریدا هیچ کەم ناهێنن و تەواو لە خزمەتی ئاغاکانیان‌دان و قەت بیر لە ئازادی و رزگاری خۆیان ناکەنەوە. سکیتی‌یەکان بەو شێوەیە یوونی‌یەکان پێناسە دەکەن.

[١٤٣] داریوش بە وڵاتی تراکی‌دا تێپەڕی و گەیشتە سیستۆس لە دەڤەری خێرسۆنیسۆ[1]. ناوبراو لەوێشەوە بە ڕێگای بەحردا بەرەو ئاسیا چوو و سەرکردەیەکی لەشکری پارسی بە ناوی مێغافازۆس وەک حوکمڕانی ئوروپا

---

١- هەرێمێکی وڵاتی تراکی، ماوەیەک خراوەتە سەر خاکی مەقدونییە.

دیاریکرد. داریوش کاتی خۆی لەبەر ئەوەی قسە و بۆچوونەکانی میغاڤازۆسی بەکەیفێ بوو، پتر لە گشت سەرکردەکانیتر قەدری دەگرت. جارێکیان داریوش خەریکی خواردنی هەنار دەبێ، برای داریوش لێی پرسیوە: "پاشا حەزت لە چ شتێک دەکرد کە بە رێژەی دەنکەکانی هەنار هەتبایە! داریوش لە وەڵامدا گوتوویەتی: "پێمخۆش بوو بە رێژەی دەنکەکانی ئەو هەنارە فەرماندەی وەک میغاڤازۆسم هەبوایە بۆوەی وڵاتی یۆنان بێننە ژێر دەسەڵاتی من ". داریوش بەو شێوەیە و لە حزوور پارسەکاندا رێزی بۆ میغاڤازۆس داناوە. هەر ئەو کاتەش بوو کە داریوش ناوبراوی وەک سەرکردەی لەشکرێکی هەشتا هەزار کەسی لەدوای رۆیشتنی خۆی بەجێهێشت.

**[١٤٤]** ناوی میغاڤازۆس بۆ هەمیشە لەبیری دانیشتووانی ئێلیسپۆندۆسدا مایەوە، چونکە ئەو سەردەمەی ناوبراو لە شاری بیزانس بوو[1]، پێیانگووت کە خالکیدۆنییەکان[2] حەڤدە ساڵ بەر لە بیزانسییەکان لەو ناوچەیە نیشتەجێ بوونە. میغاڤازۆس گووتی وادیارە کە خالکیدۆنییەکان کوێربوونە، چونکە ناخۆشترین شوێنیان بۆ ژیان و گوزەران هەڵبژاردوە، لەحاڵێکدا خۆشترین و جوانترین ناوچەیان لەبەر دەستدا هەبووە. بەهەرحاڵ میغاڤازۆس لە دەڤەری ئێلیسپۆندۆس مایەوە، گشت ئەو خەڵکانەی دۆستی میدیاکان نەبوون (هێرۆدۆت لەگەڵ پارسەکانی لێتێکچووە) هێنایە ژێر دەسەڵاتی خۆی.

### مێژووی لیبی (ئەفریقا)

**[١٤٥]** لەو سەردەمەدا کە میغاڤازۆس سەرقاڵی حوکمڕانی لە ناوچەکانی ژێردەسەڵاتیدا بوو، لەشکرکێشییەکی گەورە دژی لیبی ئامادەکرا کە دواتر باسی دەکەم. بەرلەو باسە پێویستە سەرەتا سەبارەت بە هێندێک زانیاری بدوێم:

---

١- شارەکانی بیزانس و خالکیدۆن ژێردەستەی میغارییەکان بوونە و بەتەواوی دوژمنایەتی پارسەکانیان کردوە.

٢- خالکیدۆن، یەک لە شارەکانی کۆنی هەرێمی ڤیتینییەکان لە قەراخ ئاوەکانی بۆسفۆر کە لە ساڵی ٦٨٥ی پێش میلاد بەدەست میغارییەکان دروستکرا.

پێلاسغی‌یەکان وەختی خۆی ژنانی ئاتینی‌یان لە هەرێمی ڤراڤرۆناس دەرکردبوو. هەر ئەو پێلاسغی‌یانە ئەوجار پاشماوەی کەشتیوانەکانی هۆزی ئارغی‌یان لە ناوچەکانی دورگەی لیمنۆس بەرەو دەڤەری لاکیدیمۆنی دەرپەڕاند. پاشان لە ناوچەی تاڤغێتۆ[1] ماوەیەک مانەوە و ئاگرێکی زۆریان داگیرساند. لاکیدیمۆنی‌یەکان چاویان بەو ئاگرانە کەوت و راسپاردەیان نارد، بۆوەی بزانن ئەوانە کێن و لە کوێوە هاتوون. ئەوانە لەوڵامدا گووتیان لە هۆزی مینی[2] و نەوەی ئەو قارەمانانەن کە بە گەمی ئارغۆس روویان لە دەریاکان کردوە و لە ناوچەی لیمنۆس دابەزیون و لەوێ نیشتەجێ بوونە. لاکیدیمۆنی‌یەکان وەختێک زانیان ئەوانە لە هۆزی (مینی)ین[3]، جارێکی‌تر راسپاردەیان ناردەوە لایان بۆوەی بپرسێ کە ئەوانە چیان‌گەرەکە، بۆچی هاتوونەتە وڵاتی ئەوان و ئەو گشتە ئاگرەیان لەبەرچی کردۆتەوە. (مینی)یەکان وڵامیان داوە کە پێلاسغی‌یەکان ئەوانیان دەرکردوە، بۆیە ناچار بوونە روو لە خاکی بابوباپیرانی خۆیان بکەن. ئەوە قسەیەکی راست بوو. (مینی)یەکان داوای نیشتەجێبوونیان کرد و خوازیاری مافی خۆیان بوون و داوایان کرد کە خاکیان بدرێتێ. لاکیدیمۆنی‌یەکان خواستی (مینی)یەکانیان بەجێ‌گەیاند. هەڵبەت ئەوەی پتر لە هەر شتێک لاکیدیمۆنی‌یەکانی ناچارکرد کە ئەو کارە بکەن، بەشداری خانەدانی تینداریۆ[4] لە سەفەری دەریایی گەمی ئارغۆس‌دا بوو. بەهەرحاڵ مینی‌یەکانیان وەرگرت و زەوییان بەسەردا بەش‌کردن و بەنێو هۆزەکانی خۆیاندا بڵاویان‌کردنەوە.

هێندێک لە مینی‌یەکان خێرا ژیانی هاوسەرییان پێکهێنا و ئەو ژنانەش کە لە لیمنۆس لەگەڵ خۆیان هێنابوویان، دایانە خەڵکی ئەو ناوچانە.

---

١- ریزە چیایەک لە پێلۆپۆنیسۆس.

٢- ئارغی‌یەکان لە زۆر جێگا وەک مینی ناویان هاتووە، چونکە لە شاری یولکۆ، پێتەختی مینی‌یەکان، کە لە قەراخ بەحر هەڵکەوتبوو، رۆیشتبوون.

٣- مینی، هۆزێکی کۆنی نیشتەجێ لە هەرێمی تێسالی و شاری ئۆرخۆمێن لە ناوچەی ڤیۆتیا. ئەو هۆزە نەوەی پاشایەک بەناوی مینی‌یاس بوونە. ئەو دوو ناوچەیە لە باشووری یۆنان هەڵکەوتوون.

٤- کاستۆر و پۆلیدێفکیس، منداڵانی تینداریۆی پاشای سپارت بوونە.

[١٤٦] ماوەیەکی زۆری تێنەچوو مینی‌یەکان غەرەبوون و داوای دەسەڵات و مافی حوکمڕانی‌یان کرد و تووشی کۆمەڵێک کردەوەی نایاسایی هاتن و لە ئاکامدا لاکێدیمۆنی‌یەکان بڕیاری لەنێوبردنی ئەوانیان‌دا. هەربۆیە گشت مینی‌یەکانیان گرت و خستیاننە زیندان. لە وڵاتی لاکێدیمۆنی‌یەکان نەریتێک هەیە کە ئەو کەسانەی قەرارە بکوژرێن، دەبێ لە شەودا کاریان بکرێ و هیچکەس لە رۆژی رووناکدا ناکوژن. وەختێک خواستی کوشتنی مینی‌یەکان هاتەگۆڕێ، ژنەکانیان کە خەڵکی سپارت و کچی گەورە پیاوانی شارەکە بوون، داوایان لە لاکێدیمۆنی‌یەکان کرد ئیزنیان پێبدرێ بچنە ژووری زیندانەکان و لەگەڵ مێردەکانیان رازونیاز بکەن. لاکێدیمۆنی‌یەکان پێیان‌وانەبوو کە ئەو ژنانە مەکر و حیللەیان لەبن‌سەردایە و درگایان بۆ کردنەوە. ژنەکان هەرکە چوونە ژوور بەو چەشنە هەڵسوکەوتیان کرد کە ئێستا باسی دەکەم: جلوبەرگیان بە مێردەکانیان‌دا و خۆیان بەرگی پیاوانیان پۆشی. بەو شێوەیە پیاوەکانی مینی بە بەرگی ژنانە بەبەردەم پاسەوانەکاندا لە زیندان هاتنەدەر و کاتێک رزگاریان هات، خێرا لە ناوچەی تاڤگێتۆ ئوردویان لێدا.

[١٤٧] راست لەو سەردەمەدا تیراس کوڕی ئاڤتێسیۆن[١] و نەوەی تیسامێنۆس و نەتیجەی تێرساندرۆس کە ئەوەی دواییش کوڕی پۆلی‌نیکیس بوو، خۆی ئامادە دەکرد کە لە هەرێمی لاکێدیمۆنی بڕوا و لە شوێنێکی‌تر ئاواییەک بنیات‌بنێ. ئەو کابرایە واتە تیراس لە وەچەی کادموس و خاڵی مناڵەکانی ئاریستۆدیمۆس بوو، واتە خاڵی ئێڤریس‌تێنیس و پرۆکلیس. مناڵەکان هێشتا بچووک بوون کە ناوبراو لە شاری سپارت وەک سەرپەرستیان دیاریکرا. بەڵام هەرکە کوڕەکان گەورەبوون و حوکمڕانی وڵاتیان بەدەستەوە گرت، ئیتر بۆ ئەو گەلێک دژوار بوو، دوای ئەو گشتە ساڵە فەرمانڕەوایی و پاشایەتی، ئێستا لەژێر دەسەڵاتی خوارزاکانیدا بێ. بۆیە رایگەیاند کە چیتر لە وڵاتی

---

١- ئاڤتێسیۆن خۆی گەیاندە لای دووریەکان بۆوەی لەدەست ئیدیپۆدۆس و ئێرینی‌یەکانی دەڤەری لایۆس رزگاری بێ.

لاکیدیمۆنی نامێنێتەوە و گەرەکییەتی بەڕێگای دەریادا بچێتە لای خزم و کەسوکاری خۆی.

ئەو سەردەمە لە دورگەیەک کە ئەمڕۆ پێیدەگووترێ تیرا و پێشتر بەناوی کالیستی دەناسرا و خاوەن هەردوو ناو بووە، ژمارەیەک لە نەوەکانی مێمڤلیارۆسی کوڕی پیکیلۆس ژیاون. پیکیلۆس خۆی خەڵکی وڵاتی فینیقی بووە. کادمۆس کوڕی ئاغنیرۆس[1] بەمەبەستی دۆزینەوەی ئێڤرۆپی[2] گەیشتووەتە دورگەی تیرا. پیاو نازانێ ئاخۆ ئەو کاتە کادمۆس ئەو دورگەیەی بەدڵ بووە یا هۆکارێکیتر لەگۆڕێدا بووە، تەنیا هەر ئەوەمان لێڕوون بووەتەوە کە حەشیمەتی فینیقی و کەسوکاری خۆی لەوێ جێهێشتووە. ئەوانە تا هەشت وەچە لە دورگەی کالیستی ماونەوە، واتە تا ئەو سەردەمە کە تیراس بۆ یەکەمجار لە وڵاتی لاکیدیمۆنییەکانەوە هاتووەتە ئەوێ.

[١٤٨] تیراس بەرەو کالیستی وەڕێکەوت و کۆمەڵە خەڵکێکی کە لە هۆزەکان هەڵبژاردبوو، لەگەڵ خۆی برد. ئەو گەرەکی بوو لەگەڵ نەوەکانی مێمڤلیارۆس لەو دورگەیە بژی و هیچکات بیری لەوە نەکردەوە ئەو خەڵکە لە خۆی بڕەنجێنێ و بەپێچەوانەوە بەردەوام وەک کەسوکاری خۆی سەیری کردن. بەڵام لەبەر ئەوەی لەو سەردەمەدا مینییەکان لە زیندان رایانکردبوو و لاکیدیمۆنییەکان بڕیاری کوشتنیان بەسەریاندا سەپاندبوو، تیراس داوایکرد کە هیچکام لەوانە نەکوژرێن، بەڵکوو ئەو ئامادەیە لەگەڵیان بڕوا و دورگەکە جێهێڵێ.

لاکیدیمۆنییەکان ئەو پێشنیارەیان پەسند کرد، تیراس بە سێ گەمییەوە وەڕێکەوت و گەڕاوە لای پاشماوەی هۆزەکانی ئەژدادی مێمڤلیارۆس. دیارە ناوبراو لەو سەفەرەدا ژمارەیەکی کەمی لە مینییەکان لەگەڵ خۆی برد. بەشی هەرزۆریان مانەوە و دژی پاروریئاتییەکان[2] و کافکۆنییەکان[1] کەوتنە شەڕ و

١- پاشای ئەفسانەیی فینیقیە.

٢- ئێڤرۆپی کچی ئاژێنۆر بە روخساری گامێش وەدیارکەوت و خواوەند ژوپیتێر (دیا) رفاندی و بردییە وڵاتێک کە دواتر نێوی نرا ئەورووپا. ئێڤرۆپی وەک دایکی مینۆس دەناسرا.

٣- پاروریئاتی، هۆزێکی کافکۆنی بوونە.

ئەو خەڵکانەیان لە وڵاتی خۆیان دەرکرد و ئەوجار خۆیشیان بەسەر شەش دەستەدا بەشبوون و لەو هەرێمە چەند شارێکیان بە ناوەکانی لێپرێئۆ، ماکیستۆ، فریکس، پیرغۆس، ئێپیۆن و نودیۆن بنیاتنا. زۆربەی ئەو شارانە لە سەردەمی مندا، بەدەست ئێلیەکان داگیرکران. دورگەکەش ناوی لێنرا تیرا کە لە تیراسەوە دەهات.

[١٤٩] کوڕی تیراس گەرەکی نەبوو لەگەڵ باوکی بڕوا و هەربۆیە تیراس گووتی کە مەڕێک لەنێو گورگاندا جێدەهێڵێ. هەر لەبەر ئەو قسەیە ناوی ئەو کوڕە گەنجەش نرا ئیئۆلیکۆس(گورگ لە کەوڵی مەڕدا) و ئاخرەکەش بەسەریدا بڕا. ئیئۆلیکۆس بوو بە خاوەن کوڕێک، واتە ئایئاس و هۆزی ئایئاسی بەو ناوەوە دەناسرێن. ئەوانە خێڵێکی گەورەن لە ناوچەی سپارت. چون منالانی نێرینەی ئەو خێڵە دەمردن، دوای ئامۆژگاری یەکێک لە تاڵەبینەکان، خەڵک پەرستگەیەکیان لە ئێرینێڤی بۆ لایوس[٢] و ئیدیپۆدۆس[٣] دروست کرد. لەو کاتەوە ئیتر منالەکان نەدەمردن. نەهامەتی لەو چەشنە بەسەر خەڵکی هەمان هۆز لە دورگەی تیراسیش هات.

[١٥٠] سەبارەت بەو باسانەی تا ئێستا هێناومەتە گۆڕێ، لاکێدێمۆنییەکان و خەڵکی دورگەی تیراس هاوڕان، بەڵام ئەو کۆمەڵە زانیارییەی لەسەریان دەدوێم، گشتی لە زمان تیراسییەکانەوە گووتراوە. غرینۆس، کوڕی ئایسانیا کە لە نەوەکانی تیراس و پاشای ئەو دورگەیە واتە تیراس بوو، سەفەری نێوەندی ئایینی دێلفوسی کرد و کۆمەڵێک ئاژەڵی بۆ قوربانیکردن لەگەڵ خۆی بۆ ئەو شوێنە برد. ژمارەیەک لە دانیشتووانی شار لەگەڵ ناوبراو وەڕێکەوتن و لەوانە

---

١- کاڤکۆنی، هۆزێکی نیشتەجێ لە ئیلیا یا ئیلیئا، لە شوێنێک بەناوی تریفیلی ژیاون. ئەو شوێنە وەک باریکاییەک لە داوێنی چیاکانی ئارکادی لە باشووری یۆنان هەڵکەوتووە. پاروریئاتییەکانیش هەر لەو شوێنە ژیاون. هەڵبەت دواتر بەو ناوە ناسراون.

٢- لایۆس، باوکی ئیدیپۆدۆس.

٣- ئیدیپۆدیس، پاشای ئەفسانەیی شاری تیڤا، هەڵکەوتوو لە یۆنانی باستان کە ١٥٠٠ ساڵ پێش میلاد پاشایەتی کردوە.

ڤاتۆس[1] کوڕی پۆلیمنیتۆس که ئەوەشیان لە خێڵێکی مینی بەناوی ئێڤفیمۆس بوو، لەگەڵیان چوو.

وەختێک پاشای تیراس واتە غرینۆس سەبارەت بە گەلێک بابەت، راوێژی لەگەڵ تاڵەبین و فالگیریپەرستگەی ئایینی دیلفۆس کرد، تاڵەبین پێی‌گووت واباشترە شارێک لە لیبی (ئەفریقا) دروست‌بکەی. غرینۆس لە وەڵامدا گووتی: "خواوەند ئاپۆلۆن، گەورەم، من ئیتر پیر بوومە و تاقەتی سەفەری ئەوتۆم نییە، باشترە ئەو داوایە لە کەسێکی لەمن گەنجتر بکەی کە لێرەیە ". ئەو لە کاتی قسەکردندا دەستی بۆلای ڤاتۆس راداشت. ئەوە قسەوباسی ئەو کاتە بوو. دوای ئەو دیدارە، گشتیان گەڕانەوە وڵاتی خۆیان و پەند و ئامۆژگاری تاڵەبینیان لەبیر خۆیان بردەوە، چونکە نەیاندەزانی لیبی (ئەفریقا) لەکوێ هەڵکەوتووە و لە خۆیان رانەدی هاوڵاتی‌یان بۆ شوێنێکی ئاوا نەناسراو بنێرن.

[۱٥۱] دوای ئامۆژگاری تاڵەبین، ئیتر لە دورگەی تیراس بۆ ماوەی حەوت ساڵ باران نەباری و تەواوی دارستانەکان ویشکهەڵگەڕان و تەنیا یەک دار مایەوە. دانیشتووانی تیراس دووبارە داوای ئامۆژگارییان لە تاڵەبینەکان کرد. ئەوجاریش کاهینی مەزن، پیتیا ئامۆژگاری کردن کە ژمارەیەکیان بەرەو لیبی کۆچ‌بکەن. وەختێک تیراسی‌یەکان بەو قەناعەتە گەیشتن کە چارەڕەشییان کۆتایی‌نایە، کۆمەڵێک راسپاردەیان ناردە دورگەی کرێت، بۆوەی بپرسن ئاخۆ کەسی کرێتی یا خەڵکی‌تر سەفەری لیبی کردوە. راسپاردەکان، لەو کاتەدا کە بە دورگەی کرێت‌دا دەخولانەوە، گەیشتنە ئاوایی ئیتانۆس. لەو ئاواییە کەسێکیان دۆزییەوە، ئەویش راوچی مروارید بوو و پێیدەگووترا کورۆڤیۆس. ئەو کابرا راوچییە بە تیراسی‌یەکانی گووت کە جارێکیان لەبەر تۆفان رێگای ونکردوە و لە ئاکامدا گەیشتووەتە دورگەیەکی لیبی بەناوی پلاتێ‌ئا.

راسپاردەکانی تیراسی بە پارەیەکی زۆر کابرایان رازی‌کرد تا لەگەڵیان بچێتە تیراس. لە دورگەی تیراسەوە کۆمەڵێک خەڵکی توێژەر بەمەبەستی لێکۆڵینەوەی

---

١- ڤاتۆس، کەسایەتییەکی ئەفسانەیی کە لەلایەن نێوەندی ئایینی دێلفوس راسپێردرا موهاجیرنشینێک لە ئەفریقا دروست بکا. شاری کیرنی لە ئەفریقا بەدەستی ئەو دروستکراوە.

بارودۆخی لیبی سازبوون. کورۆڤیۆس چاوساغیی ئەو توێژەرانەی وەستۆگرت و پێکەوە گەیشتنە دورگەی پلاتیئا. توێژەران، کورۆڤیۆس‌یان لەو دورگەیە جێهێشت و بژیوی چەند مانگیان بۆدانا و خۆیان خێرا بەرەو دورگەی تیراس گەڕانەوە، تا هاوڵاتییانی خۆیان لەمەر دۆزینەوەی ئەو دورگەیە، واتە پلاتیئا ئاگادار بکەنەوە.

**[١٥٢]** لەبەر ئەوەی گەڕانەوەی تیراسی‌یەکان وەدەرەنگی کەوتبوو، کورۆڤیۆس بێ‌بژیو مابۆوە. راست لەو سەردەمەدا گەمییەکی سامۆسی بە سەرکردەیی کولایۆس کە بەرەو وڵاتی میسر دەچوو، وەبەر تۆفان دەکەوێ و سەر لە دورگەی پلاتیئا وەدەردەنێ. کورۆڤیۆس حاڵ و وەزعی خۆی بۆ ئەو کابرا سامۆسی‌یە باسدەکا و ئەویش کۆڵێک ئەرزاقی بۆ جێدەهێڵێ. کولایۆس و هاوسەفەرانی لەو دورگەیە دەڕۆن و هەوڵدەدەن کە بگەنە وڵاتی میسر، بەڵام بای رۆژهەڵات مەجالیان پێنادا. ئەو بایە لێی‌نەکردەوە و ئەوانیش دوای تێپەڕین بە ناوچەی کۆڵەکەکانی ئیراکلیس‌دا، گەیشتنە دەڤەری تارتیسۆ[1]. هەڵبەت یەک لە خواکان بەهانایانەوە دێت.

ئەو نێوەندە بازرگانییە لەو سەردەمەدا تازە دامەزرابوو. هەربۆیە سامۆسی‌یەکان بەشی هەرەزۆری کەرستەکانیان لەو شوێنە خوردکردەوە و قازانجێکی لە رادەبەدەریان کرد. ئەوەندەی من بزانم جیا لە سۆستراتۆسی کوڕی لائۆدامانتۆسی خەڵکی ئێیی‌نیتی، هیچ یۆنانییەکی‌تر تا ئەو کاتە قازانجی بەو قەیاسەی لە مامەڵەی بازرگانیدا نەکردبوو. پیاو ناتوانێ کەس لەگەڵ سۆستراتۆس هەڵسەنگێنێ.

سامۆسی‌یەکان یەک‌لەدەی قازانجی ئەو مامەڵە بازرگانییەیان بەجیا دانا کە دەبوو بە شەش تالاند. بەو پارەیە خومرەیەکی مەفرەغ، راست وێنەی ئەو خومرانەی لە هەرێمی ئارغۆس دروست دەکرێن، بە چاککردن‌درا. دەوری ئەو خومرەیە بە پەیکەرەکانی شێرداڵ رازابۆوە. ئەو خومرەیە پێشکەش بە پەرستگەی ئیراس کرا و لەسەر سێ کۆڵەکەی گەورەی مەفرەغی سوارکرا.

---

١- تارتیسۆ، هەڵکەوتوو لە رێژاوگەی گوادئەلکەبیر.

هەرکام لەو کۆڵەکانە حەوت پیخیس بەرز و بەسەر ئەژنۆکانیاندا شکاونەوە. لەو سەردەمەوە نێوانی کیرینییەکان و تیراسییەکان لەگەڵ سامۆسییەکان گەلێک دۆستانەیە.

[١٥٣] بەڵام ئەو دەستەیە لە خەڵکی دانیشتووی دورگەی تیراس کە کورۆڤیۆس‌یان لە دورگەی پلانتیئاس جێهێشتبوو، کاتێک گەڕانەوە دورگەی تیراس رایانگەیاند کە ئاواییەکیان لە ناوچەیەکی کەنار دەریای لیبی دروست کردوە. خەڵکی دورگەی تیراس بڕیاریان‌دا لە گشت گەڕەکەکانی شار- حەوت گەڕەکی هەبوو – لە هەردوو کوڕی ماڵ یەک کەسیان بەپێی قورعەکێشی هەڵبژێردرێ و ئەوانە گشتیان بە سەرۆکایەتی و پاشایەتی ڤالۆس بەڕێبکرێنە دورگەی پلانتیئاس. هەموویان سواری پاپۆڕ بوون و بەرەو ئەوێ وەڕێکەوتن.

[١٥٤] ئەوەی تا ئێستا گوتراوە لە زمان خەڵکی تیراس بووە. سەبارەت بە پاشماوەی بەسەرهاتی ئەو خەڵکە لەوە بەدوا، بۆچوونی تیراسییەکان و کیرینییەکان وەک یەکن. بەڵام سەبارەت بە ڤاتۆس هەرچی دەگووترێ، بۆچوونەکان وێک ناچن. کیرینییەکان لەو بارەوە بەو چەشنە دەدوێن: لە دورگەی کرێت شارێک هەیە بەناوی ئۆواکسۆس. لەو شارە پاشایەک هەبوو بەناوی ئێتیئارخۆس. پاشا ژنەکەی مرد و کچێکی لەپاش بەجێما کە ناوی فرۆنیمی بوو. پاشا بۆ خاتری ئەو کچەی دوبارە هاوسەرگیری کرد. ژنی دووهەمی هەرکە پێی لەنێو ماڵی پاشا نا، تەواو زڕدایکانە لەگەڵ کچە هەڵسوکەوتی کرد و چی رەفتاری ناحەز و ناپەسەند هەبوو، دەرهەق بەو کچە کردی. لە کۆتاییدا بوختانێکی بۆ کچە هەڵبەست و بە درۆکانی خۆی پاشای بە قەناعەت گەیاند. ئێتیئارخۆس باوەڕی بە قسەکانی ژنە کرد و بیری لە حیلەیەک بەدژی کچەکەی کردەوە. لە شاری ئۆواکسۆس کابرایەکی بازرگانی خەڵکی تیراس بەناوی تێمیسۆن هەبوو. ئێتیئارخۆس میوانداری لەو بازرگانە کرد و سوێندیدا کە چی پاشا دەخوازێ جێبەجێی بکات. کاتێک تێمیسۆن سوێندی خوارد، ئێتیئارخۆس کچەکەی دایە دەست ئەو و پێیگووت کە لەگەڵ خۆی بیبا و لە رێگادا فڕێی بداتە نێو ئاوی دەریا. تێمیسۆن ناڕاحەت لە

میوانداری بۆ خواستی نابەجێ، خۆی لە جێبەجێکردنی کارێکی ئەوتۆ پاراست و سوێندەکەشی لەژێر پێ نەنا و بەپێچەوانەوە بەو چەشنە هەڵسوکەوتی کرد: کچەی هەڵگرت و سواری پاپۆڕ بوو و وەڕێکەوت، کاتێک گەیشتە قوڵایی ئاوەکانی دەریا، بۆوەی سوێندی لێنەکەوێ، گوریسی لەنێو قەدی فرۆنیمی بەست و شۆڕی کردەوە نێو ئاو و ئەوجار هەڵیکێشاوە سەر گۆرەپانی گەمی و پاشان بەرەو دورگەی تیراس رۆیشتن.

[١٥٥] لەوێ یەک لە پیاوانی تیراسی بەناوی پۆلیمنیستۆس، فرۆنیمی وەک حەزی خۆی بردەوە ماڵ. چەند ساڵێک گوزەرا و فرۆنیمی بوو بە خاوەن کوڕێک لەو کابرایە. ئەو مناڵە زمانی دەگیرا و بەزەحمەت قسەی بۆدەکرا. کیرینییەکان و تیراسییەکان دەڵێن ناوی ئەو کوڕە ڤاتۆس بووە. من پێموایە ڕووداوەکە بە شێوەیەکیترە. ئەو کوڕە خاوەن ناوێکیتر بووە، تەنیا ئەو کاتەی گەیشتووەتە لیبی ناویان گۆڕیوە و کردویانەتە ڤاتۆس. گۆڕینی ناوەکەی بەدوای ئامۆژگاری نێوەندی ئایینی دێلفوس بوو. هەڵبەت پێشنیاری گۆڕینی ناو گەڕاوەتەوە بۆ پلەی کۆمەڵایەتی ئەو کوڕە، چونکە نەوەی پاشا بووە. لیبییەکان بە پاشا دەڵێن ڤاتۆس، هەربۆیە منیش لەو باوەڕەدام کە کوڕە سەرەتا ناوێکیتری هەبووە، پاشان خواوەند پیتیا بەدەم ئامۆژگاری و تاڵەبینییەوە ناوی ڤاتۆسی لەسەر داناوە و چاوەڕوانی ئەوە بوونە کە وەک پاشای لیبی لەسەر کورسی دەسەلات دانیشێ. لەڕاستیدا کاتێک ڤاتۆس گەورە و باڵغ بوو، سەفەری نێوەندی دێلفوسی کرد بۆوەی چارەسەری زمان گیرانەکەی خۆی بکا. لە درێژەدا خواوەند پیتیا بەو شێوەیە ئامۆژگاری ڤاتۆسی کردوە: "ڤاتۆس! تۆ زمانت دەگیرێ و بۆیە هاتوویە ئێرە. خواوەندی مەزن، فیڤۆس ئاپۆلۆن تۆی ڕاسپاردوە بچییە وڵاتی لیبی، وڵاتی مەڕوماڵات و لەوێ شارێک بۆ کۆچەران دروست بکەی ".

وەک بە زمانی یۆنانی بیڵێ: "پاشا، تۆ لەبەر گرفتی زمانت هاتووی..."لەو کاتەدا ڤاتۆس وڵامی داوە: "خواوەند، بەڵێ من هاتوومەتە خزمەت تۆ، چونکە زمانم دەگیرێ. بەپێویستم زانی پرس بە ئێوە بکەم، بەڵام جەنابت داوایەکیتر لە

من دەکەی، دەخوازی من بچمە لیبی و ئاوایییەک بنیات بنێم، جێبەجێ‌کردنی ئەو خواستە گەلێک دژوارە، بە کام پارە و کەرستە و لەشکرەوە؟ "ڤاتۆس لەمەر گرفتەکەی پتر پێی‌داگرت، بەڵام وەڵامێکی‌تری لە خواوەند وەرنەگرتەوە و هەمان ئامۆژگاری دووپات بۆوە. ڤاتۆس ڕێورەسمی مشووری بەنیوەچڵی جێهێشت و بەرەو دورگەی تیراس گەڕاوە.

[١٥٦] دوای ئەو ڕووداوە، خواوەند ڤاتۆس و تیراسی‌یەکانی تووشی هێندێک نەهامەتی‌تر کرد. تیراسی‌یەکان خۆشیان نەیاندەزانی هۆی ئەو گشت چارەڕەشییە چییە. هەربۆیە جارێکی‌تریش ڕاسپاردەیان ناردە نێوەندی ئایینی دێلفوس. تاڵەبین پیتیا لە وەڵامی ئەو ڕاسپاردەیەش‌دا گووتی کە هەرکات ڤاتۆس و کۆمەڵێک دانیشتووی دورگەی تیراس بەمەبەستی نیشتەجێ بوون، چوونە لیبی و ئاوایی کیرینی‌تان بنیات‌نا، ئەو وەختە ڕەوشی ئێوەش بەرەو باشی دەچێ.

خەڵکی تیراس سازبوون و بە دوو گەمی وەدوای جێبەجێ کردنی ئەو خواستە کەوتن. ئەوانە دوای ئەوەی سەفەری لیبی‌یان کرد، هیچ کارێکیان لەدەست نەهات و گەڕانەوە دورگەی تیراس. کاتێ لە کەنار دەریا دابەزین لە ، پاشماوەی خەڵکی تیراس دەستیان بە بەردهبارانی ئەوانە کرد، بۆوەی دانەبەزن و پێیان‌گووتن بگەڕێنەوە ئەو شوێنەی کە لێیەوە هاتوون. ئەو خەڵکە ناچار بوون دووبارە بایەوانی کەشتی‌یەکان بکەنەوە و بەرەو قەراخ دەریای لیبی و بۆ دورگەی پلاتنێ‌ئاس بچن و لەوێ ئاوایییەک دروست بکەن. پێشتر لەو بارەوە باسم کردوە. بەپێی هێندێک زانیاری ئەو دورگەیە بەقەرا شاری کیرینی ئەمڕۆ گەورەیە.

[١٥٧] کۆچەر و موهاجیرەکان دوو ساڵ لە دورگەی پلاتنێ‌ئا مانەوە، بەبێ ئەوەی هیچ سەرکەوتنێک وەدەست بێنن. لەکۆتاییدا ناچاربوون یەکێک لەنێو خۆیاندا هەڵبژێرن بۆوەی بمێنێتەوە و ئەوانیتریش بەرەو نێوەندی ئایینی دێلفوس وەڕێکەوتن. ئەوانە هەرکە گەیشتنە دێلفوس لەگەڵ تاڵەبین کەوتنە ڕاوێژ و گووتیان کە لە لیبی (ئەفریقا) دەژین و بەداخەوە ڕەوشی ژیانیان بەرەو باشی

نەچووە. خواوەند پیتیا لە وڵامی قسەکەردا گووتی: "تۆ کە هێشتا نەچوویەتە وڵاتی مەڕوماڵاتداری لیبی، چۆن لەمن باشتری پێناسە دەکەی! دەبێ بڵێم حیکمەتت سرنجڕاکێشە ".

ڤاتۆس و هاوڕێکانی هەرکە گوێیان لەو قسانە بوو، بێ سێودوو لێکردن بەرەو لیبی وەڕێکەوتن، چونکە تێگەیین کە خواوەند پیتیا دامەزراندنی ئاوایییەکی کۆچبەرنشین بەبێ چوونی ئەوان، بە بنەمای جێبەجێکرانی بەڵێنەکان نازانێ.

ڤاتۆس و خەڵکەکەی گەڕانەوە دورگەی پلانتێئاس. خواوەند پیتیا لێیان رازی نەدەبوو، ئەگەر ئاوایییەک لە لیبی دروست نەکەن. کاتێک گەیشتنە پلانتێئاس، ئەوانەی لەوێ جێیان هێشتبوون، گشتیان رەگەڵ خۆیاندا و چوون بۆ کەنار دەریای لیبی و لە روبەڕووی دورگەی پێشوو ئاوایییەکیان دروست کرد. شوێنەکە پێیدەگووترێ، ئازیریس. ئەو ناوچەیە خاوەن دوو دەشتی رازاوەیە و بە رووبارێک لەیەکتر جیا کراونەوە.

**[١٥٨]** ماوەی شەش ساڵ لەو دەڤەرە مانەوە. ساڵی حەوتەم خەڵکی لیبی بەڵێنی بەدرۆیان پێدان کە بۆ جێگایەکی خۆشتریان دەبەن. بەو چەشنە ئەو خەڵکە تیراسییە لەوێ رۆیشتن و فریویان خوارد. لیبییەکان دوای ئەوەی ئەوانەیان لە ئازیریس هەڵکەند، بەرەو رۆژهەڵات بردیانن و لەلایەکیتریشەوە بۆوەی ئەو خەڵکە یۆنانییە (تیراسییە) لەکاتی دەربازبووندا بە شوێنە خۆش و رازاوەکانی وڵاتەکەیان نەزانن، راست وەختی وەڕێکەوتنیان بەچەشنێک دیاری دەکرد کە شەو و تاریکی بێ. هەروەها بە ناوچەیەکیتردا رۆیشتن کە ناسراوبوو بە ئیراسا. دواتر گەیشتنە سەر کانیاوێک بەناوی ئاپۆلۆن و لەوێ پێیان گووتن: "یۆنانییەکان(مەبەست تیراسییەکانە)! تەنیا شوێنێکی بۆ نیشتەجێ بوونی ئێوە گونجاوە، ئێرەیە، چونکە لێرەوە ئاسمان کونکونە ".

**[١٥٩]** ڤاتۆس چل ساڵێک لە تەمەنی خۆیدا پاشایەتی کرد. کوڕی ئەو بەناوی ئارکێسیلائۆس، ئەویش شازدە ساڵێک دوای باوکی درێژەی بە پاشایەتیدا. لەو ماوەیەدا ژمارەی دانیشتووانی کیرینی زیادی نەکرد و وەک خۆی مایەوە، واتە

به هەمان ڕێژە کە کاتی خۆی بۆ ئاوەدان کردنەوەی وڵاتی لیبی کۆچیان کردبوو.

بەڵام لە سەردەمی پاشای سێهەمدا کە خاوەن ناسناوی ڤاتۆسی بەختەوەر بوو، خواوەند پیتیا داوای لە گشت یۆنانییەکان کرد روو لە لیبی بکەن و لەگەڵ کیرینی‌یەکان پێکەوە بژین. ئەوانە بەڵێنیشیان پێدرابوو کە زەوی و خاک لە نێوانیاندا بەشدەکرێ.

ئامۆژگاری خواوەند پیتیا لەو بارەوە بەو چەشنە بوو: "هەرکەس دوای دابەشکرانی زەوی بەپیت، بچێتە وڵاتی لیبی، پەژیوان دەبێتەوە".

کیرینی‌یەکان بەبێ لەبەر چاوگرتنی ئەو پێشگۆییە ژمارەیەکی زۆر لە هەرێمی کیرینی نیشتەجێ بوون. دانیشتووانی لیبی بە پاشایەتی ئادریکران، کاتێک دیتیان کێڵگەکانیان لەکیس دەچێ، روویان لە کیرینی‌یەکانی کۆچەر وەرگێڕا و لەجێوە راسپاردەیان ناردە لای پاشای میسر و ژێردەستەیی خۆیان راگەیاند. ئاپری‌ئیس پاشای میسر لەشکرێکی گەورەی لە میسری‌یەکان ئامادەکرد و دژی کیرینی‌یەکان وەخۆکەوت. کیرینی‌یەکان بەرەو هەرێمی ئیراسا چوون و لە دەڤەری کانیتێستی شەڕیان دژی لەشکری میسری دەست پێکرد و شکستیان‌دان. میسری‌یەکان تا ئەو کاتە چ جارێک تووشی شەڕێکی ئەوتۆ لەگەڵ یۆنانییەکان نەهاتبوون و ئەزموونێکیان لەو بارەوە نەبوو و بە چاوی سووکەوە سەیری یۆنانییەکانیان دەکرد. ئەوانە لەشەڕدا شکستێکی گەلێک قورسیان خوارد و تەنیا ژمارەیەکی کەم لە سەربازانی میسری توانیان بگەڕێنەوە وڵاتی خۆیان. خەڵکی میسری، ئاپری‌ئیس پاشای وڵاتیان بە تاوانبار زانی و دژی ئەو راپەڕین.

[١٦٠] کوڕی ڤاتۆس، ئارکێسیلائۆس، دواتر لەجێگای باوکی دانیشت. ئارکێسیلائۆس لە سەرەتای دەستپێکی فەرمانڕەواییەکەی، لەگەڵ براکانی خۆی کەوتنە ململانێی هەڤدوو. لە ئاکامی ئەو بەربەرەکانییە سەختەدا براکانی ناوبراو پاشەکشەیان کرد و بەرەو بەشێکی‌تری وڵاتی لیبی رایان‌کرد و شارێکیان بەناوی ڤارکی دروست‌کرد. ئەو شارە تا ئەمڕۆ ئەو ناوەی پاراستووە. ئەوانەی

لەو سەردەمەدا خەریکی بنیاتنانی ئەو شارە بوون، لە هەمان کاتدا خەڵکی لیبییان هاندا دژی کیرینیی‌یەکان شۆڕش بکەن. واتە ئەو وەختەی کە ئارکێسیلائۆس لەشکری دەسەر لیبی‌یاییەکان کردبوو، چونکە خەڵکەکە پشتی براکانی ئەویان گرتبوو و راپەڕیبوون.

لیبی‌یەکان لەترسی ئەو لەشکرە پەنایان بۆ رۆژئاوای لیبی برد. ئارکێسیلائۆس ڕاوینان تا گەیشتنە هەرێمی لێڤکونا. لەوێ لیبی‌یەکان بڕیاریان‌دا پەلاماری لەشکری ناوبراو بدەن. شەڕێکی گەورە سازبوو. کیرینی شکستیان خوارد و حەوت هەزار کەسی چەکدا کوژران. دوای ئەو لێقەومانە، ئارکێسیلائۆس نەخۆش کەوت و دەرمانێکی خوارد. لە کۆتاییدا بەدەست برای خۆی بەناوی لی‌ئارخۆس کوژرا. ئێریکسۆ، ژنی ئارکێسیلائۆس بە حیللەیەک لی‌ئارخۆسی کوشت.

**[١٦١]** لە جێگای ئارکێسیلائۆس، کوڕەکەی بەناوی ڤاتۆس لەسەر تەخت دانیشت. ئەو کوڕە هەر لە منالّییەوە شەل و قاچێکی ناتەواو و راوەستان بەپێوەی بۆ دژواربوو. خەڵکی کیرینی لەمەر ئەو گشتە نەهامەتییە، راسپاردەیان ناردە نێوەندی دێلفوس تا بپرسن کە بەکام شێوە دەتوانن بەختەوەرانە بژین. خواوەند پیتیا پێشنیاری پێکردن کە کەسێکی یاسازان لە شاری مانتینیای[1] سەر بە هەرێمی ئارکادیا بانگهێشت بکەن. کیرینی‌یەکان داوای یاسازانیان لە ئارکادی‌یەکان کرد و ئەوانیش کەسێکی بەوەج و ناسراویان بۆ ناردن. ئەو یاساناسە ناوی دیمۆناکس بوو. دیمۆناکس کاتێک گەیشتە شاری کیرینی، سەرەتا گشت تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگای ئەوێی شەنوکەو کرد. ئەوجار کیرینی‌یەکانی بەسەر سێ هۆزدا بەو چەشنە بەش کرد: یەکەم هۆز پێکهاتبوو لە تیراسی‌یەکان و پێری‌ئیکی‌یەکان، دووهەم هۆز پێلۆپۆنیسی و کرێتی و سێهەم هۆزیش دورگەنشینەکان. بۆ ڤاتۆس پاشا هێندێک ماف و مڵک پیرۆزایەتی پێدرا، بەڵام گشت دەسەڵاتەکانی‌تری لێوەرگیرایەوە و بە جەماوەر درا.

---

١- مانتینا، شارێکی کۆنی یۆنانی باستان، هەڵکەوتوو لە نیمچەدورگەی پێلۆپۆنیسۆس، لە هەرێمی ئارکادی، دەگووترێ کە ئەو شارە خاوەن باشترین یاسای دەوڵەتی بووە.

[١٦٢] ئەو دەسەڵاتدارییە تا ئەو کاتەی ڤاتۆس لە ژیاندا بوو، بەڕێوە چوو، بەڵام وەختێک ئارکێسیلائۆس هاتە سەر تەخت، پەشێوی زۆر سەبارەت بە دەسەڵاتی حکوومەت سازبوو. ئارکێسیلائۆس، کوڕی ڤاتۆسە شەلە و خاتوو فێریتیمیس گووتی کە شێوازی فەرمانڕەوایی دیاریکراو بەهۆی دیمۆناکسی خەڵکی مانتینیای قبوڵ نییە و گەرەکییەتی چەشنی باب‌وباپیرانی خۆی هەڵسوکەوت بکا.

ناوبراو لە هەوڵدانەکەیدا سەرکەوتوو نەبوو و لەسەرکار لابرا. ناوبراو بۆ دورگەی سامۆس هەڵات و دایکیشی چوو بۆ سەلامینا[1] لە دورگەی کیپرۆس(قبرس). ئەو کاتە لە سەلامینا، حوکمڕان ئێڤێلتۆن دەسەڵاتدار بوو. ناوبراو یەک زەرفی مەنقەڵی (بۆ عود و ئەسپەندەر سووتاندن) پێشکەش بە نێوەندی ئایینی دێلفوس کرد. ئەو مەنقەڵە ئێستاش لە خەزێنەی کۆرینتی‌یەکاندا پارێزراوە. کاتێک خاتوو فێریتیمیس گەیشتە لای ئەو کابرایە، داوای لەشکری لێکرد، بۆوەی خۆی و کوڕەکەی پەلاماری کیرینی بدەن. بەڵام ئێڤێلتۆن رایگەیاند هەر خواستێکی‌تر دەتوانێ بەجێ‌بگەیێنێ، جیا لە لەشکرکێشی. فێریتیمیس چی پێیان‌دابا وەری‌دەگرت و دەیگووت ئەوانە بەنرخن، بەڵام یارمەتی لەشکری پێویست‌ترە. لەبەر ئەوەی هەر دیارییەکیان بۆ ناردبا، هەمان خواستی دووپات دەکردەوە. ئەوجار ئێڤێلتۆن تەشییەکی زێڕ و هێندێک خوری بۆ نارد. فێریتیمیس ئەوجاریش داوای لەشکری کرد. ئیتر ئێڤێلتۆن وڵامی بۆ نارد کە ئەوەی دەبێ بە ژنێک بدرێ، تەنیا ئەو چەشنە کەرستانەن، نەک لەشکر و شتی‌تر.

[١٦٣] هاوکات لەگەڵ ئەوە، ئارکێسیلائۆس کە لە دورگەی سامۆس هەرکەسێکی دۆزیباوە، سەرەتا بەڵێنی پێدەدا کە زەوی و مڵکی دەداتێ، ئەوجار داوای سازکردنی لەشکری لێدەکرد. ناوبراو لەشکرێکی گەورەی بەو چەشنە پێکهێنا و خۆی تەنیا بەرەو نێوەندی ئایینی دێلفوس وەڕێکەوت، تا سەبارەت بە

---

١- سەلامینا، شارێکی کۆنی قیبریسە و ئەمڕۆ تەنیا وێرانەکانی ماون. خوێنەر نابێ ئەو شارەی لەگەڵ بەندەری سالامینای هەڵکەوتوو لە زارکی کەنداوی ئاتین لێ‌تێکبچێ، لەوەی دوایی شەڕی بەناوبانگی یۆنانییەکان و پارسەکان قەوما.

گەڕانەوەی خۆی پرسێک بە تاڵەبینەکان بکا. خواوەند پیتیا بەو شێوەیە ئامۆژگاری ئارکێسیلائۆسی کرد: "ئەگەر قەرارە چوار ڤاتۆس و چوار ئارکێسیلائۆس، بۆ ماوەی هەشت وەچە فەرمانڕەوایی بکەن، لۆکسیاس ئیزنت پێدەدا پاشایەتی کیرینی بکەی. پاشان پێشنیارت پێدەکا کە هەوڵ مەدە لەوە زیاتر لەسەر دەسەڵات بمێنییەوە. هەرکات تۆ گەڕایەوە، دەبێ هێمنایەتی خۆت بپارێزی. وەختێک دیتت کوورە پڕ لە گۆزەیە، ئاگری تێبەرمەدە و گۆزەکان مەبرژێنە، بەپێچەوانەوە گشتیان دەربێنە و لەبەر بادا هەڵیانخە. ئەگەر دوبارە ئاگر لە کوورەدا داگیرسێنی، مەچوو بۆ شوێنێک کە ئاو دەوری گرتبێ، چونکە هەم تۆ و هەم جوانترین گاکێوی دەمرن ".

[١٦٤] پیتیا بەو چەشنە ئامۆژگاری ئارکێسیلائۆسی کرد. ئارکێسیلائۆس لەگەڵ ئەو کۆمەڵە خەڵکەی لە دورگەی سامۆس کۆیکردبۆوە، گەڕاوە و هەرکە دەسەڵاتی دەسکەوتەوە، گشت ئامۆژگارییەکانی پیتیای فەرامۆشکرد و بڕیاریدا تۆڵەی خۆی لەو کەسانە بسێنێتەوە کە تووشی ئاوارەییان کردبوو. کۆمەڵێک لە دژبەرانی ئارکێسیلائۆس رایانکرد و وڵاتیان بەجێهێشت. لەو نێوەدا هێندێک کەس کەوتنە دەست ناوبراو و ئەویش گشتیانی ناردە دورگەی قبرس بۆوەی لەوێ بیانکوژن. با و تۆفان ڕێگای ئەو جەماوەرەی دوایی گۆڕی و بەرەو کیندۆسی بردن. لەوێ دانیشتووانی کیندۆس ئەوانەیان وەرگرت و یارمەتییان دان و بۆ تیراس بەڕێیانکردن. بەشێکیتر لە خەڵکی کیرینی پەنایان بردە نێو قەڵایەکی گەورە کە مڵکی ئاغلۆماخۆس، یەک لە دانیشتووانی ئەو شارە بوو.

ئارکێسیلائۆس فەرمانیدەرکرد دەوری ئەو قەڵایە بە گیا و سووتەمەنی بگرن و ئاگری تێبەردەن. ناوبراو هەرکە ئەو کارەی کرد، لەپڕێکا وەبیری هاتەوە کە پیتیای تاڵەبین پێی.گوتبوو خۆت لە سوتاندنی گۆزەکانی نێو کورە بپارێزە و مەبەستی ئەو لەڕاستیدا ئەو قەڵایە بووە و هەروەها لێکیداوە کە شوێنی چواردەور گیراو بە ئاو، هەمان شاری کیرینی بووە و ئێستا کاتی

مردنی هاتووە. ئارکێسیلائۆس دوای ئەو لێکدانەوەیە، ترسی ڕێنیشت و خێرا هەڵات و لە شار وەدەرکەوت.

ئارکێسیلائۆس لەگەڵ یەک لە خزمەکانی زەماوەندی کردبوو، هەربۆیە چوو بۆ لای خەزوری خۆی کە پاشای ڤارکی‌یەکان بوو و پێیدەگووترا ئەلازیراس. ئارکێسیلائۆس وەختێک لەلای خەزوری بوو، جەماوەرێکی ڤارکی و هێندێک لە ڕاکردوەکانی شاری کیرینی، ناوبراویان لەنێو بازاردا ناسییەوە و لەگەڵ خەزورەکەی، هەردووکیان کوشتن.

ئارکێسیلائۆس، بەخواستی خۆی بێ یان نا، ئامۆژگاری پیتیای وەپشت گوێ خست و تووشی ئەو ڕووداوە هات کە چارەنووسی بوو.

[١٦٥] ئەو ماوەیە کە ئارکێسیلائۆس لە ڤارکی دەژیا و بەدەستی خۆی فرسەتی کوژران و مردنی خۆی پێکدەهێنا، دایکی ئەو واتە فێرێتیمیس دەسەڵاتی حکوومی لە کیرینی بەدەستەوە گرتبوو و لە کۆبوونەوەکانی مەجلیس‌دا بەشداری دەکرد. کاتێک خەبەری مەرگی کوڕەکەی پێگەیی، لەو وڵاتە ڕۆیی و پەنای بۆ میسر برد. ئارکێسیلائۆسی کوڕی، خزمەتێکی زۆری بە کامبیزی کوڕی کوروش کردبوو. لەڕاستیدا ئارکێسیلائۆس بوو کە هەرێمی کیرینی بە خواستی خۆی و بەبێ شەڕ تەسلیمی کامبیز کردبوو و باج و خەڕاجی بە ناوبراو دەدا. فێرێتیمیس کاتێک گەیشتە وڵاتی میسر، چوو بۆلای ئاری‌ئاندیس و داوای یارمەتی لە ناوبراو کرد و گووتی کە کوڕەکەی واتە ئارکێسیلائۆس لەبەرئەوەی دۆستی میدیاکان بووە، بۆیە کوژراوە.

[١٦٦] ئاری‌ئاندیس حوکمڕانی وڵاتی میسر و دیاریکراو لەلایەن کامبیزەوە بوو. ئەو کابرایە دواتر گەرەکی بوو بەربەرەکانی داریوش بکا و هەربۆیە کوژرا. ئاری‌ئاندیس بیستبووی و دەیزانی کە داریوش حەزی لە پاراستنی یادوەرییەکانی.سەڵتەنەتی خۆیەتی و دەخوازێ چەند کارێک بکا و چەند شتێک لەدوای خۆی جێهێڵێ کە تا ئەو کاتە هیچ پاشایەکی‌تر نەیکردبێ. ئاری‌ئاندیس، ئەویش گەرەکی بوو لاسایی داریوش بکاتەوە و لەونێوەدا سەری تێداچوو. داریوش سکەی لێدا و هەوڵی‌دا سکەی خاوێن بن. ئاری‌ئاندیس، حوکمڕانی

میسر هەمان کاری کرد و سکەی زیوی لێدا. هەربۆیە تا ئێستاش، هەمان سکەی ئاریئاندیس پتر ئیعتیباری هەیە و زیوی خالیسە. داریوش کاتێک ئەو خەبەرەی پێگەیی، بە دژی ئاریئاندیس جۆرێکیتری سکە لێدا و ناوبراویشی تاوانبار بە سەربزێوی کرد و کوشتی.

[١٦٧] ئاریئاندیس بەزەیی بە فێریتیمیس داهات و تەواوی لەشکری میسر، بە هێزی دەریایی و ویشکاییەوە، لەژێر دەستی ئەونا. سەرکردەی ئەو سپایە کەسێک لە هۆزی مارافیۆ[1] بەناوی ئاماسی بوو. فەرماندەی هێزە دەریاییەکان، ڤادری لە بنەماڵەی پاسارگادییەکان هەڵبژێردرا. ئاریئاندیس بەر لەوە فەرمانی وەڕێکەوتن بە لەشکر بدا، راسپاردەی نارده ڤارکی، بۆوەی بزانێ کە چ کەسێک ئارکێسیلائۆسی کوشتووە. ڤارکییەکان لە وڵامدا گوتیان کە هەر هەموویان بەپانەوە لەو کارەدا بەشدار بوونە، چونکە ئازارێکی زۆریان لەدەست ئارکێسیلائۆس پێگەیشتووە.

وەختێک ئاریئاندیس لەو بارەوە ئاگادار کرایەوە، دەستوری بە لەشکردا لەگەڵ فێریتیمیس وەڕێکەوێ. هەڵبەت ئاریئاندیس لە بیانوویەک دەگەڕا و بەباوەڕی من دەیویست بەو شێوەیە پەلاماری لیبییەکان بدا.

خێڵ و عەشیرەی لیبیایی زۆر و جیاواز هەن. لەوانە ژمارەیەکی کەم حوکمڕانی پاشایان قبوڵ کردبوو و زۆربەیان داریوشیان بە هیچ شێوەیەک بە فەرمی نەدەناسی.

[١٦٨] ئەگەر وڵاتی میسر وەلانێین، دانیشتووانی لیبی (قاڕەی ئەفریقا) بەو چەشنە دابەشبوونە: ئادیرماخییەکان، ئەوانە خاوەن دابونەریتی چەشنی میسرییەکانن، بەڵام جلوبەرگیان وەک خەڵکیتری لیبی دەچێ. ژنەکانیان بازنەی مس لە قاچەکانیان دەکەن. قژیان درێژ و کاتێک تووشی زیندەوەری وەک کێچ و رشک و ئەسپێیان تێدەکەوێ، پاش ڕۆنین، بە ددان دەیانکوژن و ئەوجار تف هەڵدەدەن. لەنێو گشت هۆزەکانی لیبیایی تەنیا ئادیرماخییەکان ئەو نەریتە ناحەزەیان هەیە. ئەوانە بەرلە هاوسەرگیری، کچەکانیان بە پاشا

---

١- مارافیۆ یا مارافی، هۆزێکی گەورەی میدیایی.

نیشان‌دەدەن و ئەگەر پاشا حەزی لێبێ، شەو لەگەڵ بووک دەخەوێ. ئادیرماخی‌یەکان لە هەرێمێک دەژین کە سنوورەکانیان لە وڵاتی میسرەوە دەسپێدەکا و دەگاتە بەندەری پلینۆس.

**[١٦٩]** دراوسێی ئادیرماخی‌یەکان، بیلغامی (گیلگامی)یەکانن و دەڤەرەکەیان هێندێک رۆژئاواتر هەڵکەوتووە و دەگاتە ئافرۆدیسیادا[١]. لەو دەڤەرە دورگەی پلاتیئاس جێی‌گرتووە کە کیرینی‌یەکان ئاوەدانیان کردوە و لە کەنار دەریا و بەلای خاکی لیبی‌دا، بەندەرەکانی مێنێلائۆس[٢] و ئازیریس هەن و لەوانیش کیرینی‌یەکان نیشتەجێن. لەو ناوچەیە مەزرای گیای سیلیفیۆ[٣] دەسپێدەکا. ئەو گیایە لە دورگەی پلاتیئاس تا دەگاتە تەنگەبەرایی سیرتیۆس بەپڕانی هەیە. بیلغامی‌یەکان خاوەن دابونەریتی چەشنی گشت لیبی‌یەکانن.

**[١٧٠]** راست دوای بیلغامی‌یەکان، بەرەو رۆژئاوا، ئاسڤێستی‌یەکان لە هەرێمی سەرووی کیرینی‌یەکان دەژین. خاکی ئاسڤێستی‌یەکان ناگاتە سەر دەریا، چونکە لەنێوان ئەوان و دەریادا، خەڵکی کیرینی نیشتەجێن.

ئاسڤێستی‌یەکان پتر لە هۆزەکانی‌تری لیبیایی کەڵک لە فایتوونی چوار ئەسپە وەردەگرن و لەوکارەدا لێزانترن. لەمەر دابونەریتی‌تر لاسایی کیرینی‌یەکان دەکەنەوە.

**[١٧١]** دوای ئاسڤێستی‌یەکان و بەرەو رۆژئاوا، ئاڤسخیسی جێیان‌گرتووە. ئەوانە لە ناوەوەی هەرێمی ڤارکیس دانیشتوون و خاکەکەیان لەنیزیک دەڤەری ئێڤێس‌پێری‌یەکان،[٤] خۆی لە ئاو دەدا. لەنێوەڕاستی خاکی ئێڤێس‌پێری‌یەکان، هۆزێکی بچووک بەناوی ڤاکەلی دەژین و دەڤەرەکەیان لە دەورووبەری تاڤخیرا، سەر بە شاری ڤارکیس، دەستی بە ئاوی دەریا رادەگا.

---

١- ئافرۆدیسیادا، یەکێک لە دورگە و بەندەرەکانی کۆنی ئەفریقا لە کەنارئاوەکانی کیرینێ‌ئا.

٢- مێنێلائۆس، شوێنێک لە نیزیک تەبەڕوقی ئەمڕۆ.

٣- وێنەی ئەو گیایە لەسەر سکەکانی کۆنی وڵاتی کیرینێ‌ئا هەیە. گیایەکی گەلاپانی نیسێدار بووە و پتر وەک دەرمان کەڵکی لێوەرگیراوە.

٤- بنغازی ئەمڕۆ.

ئاڤسخیسی‌یەکان و هۆزی ڤاکەلی خاوەن دابونەریتی چەشنی ئەو لیبیاییانەن کە لە نێوەڕاستی خاکی کیرینی‌دا دەژین.

[۱۷۲] ناسامۆنی‌یەکان، ئەوانە لە رۆژئاوای ئاڤسخیسی‌یەکان دانیشتوون و هۆزێکی مەزنن. مێگەلە مەڕەکانیان هاوینان لە ناوچەکانی کەنار دەریا جێدەهێڵن و خۆیان دەچنەوە نێوەوەی وڵات بۆ ناوچەی ئاڤغیلا[1] و خورما کۆدەکەنەوە. لەو هەرێمە باغاتی خورما و میوەجاتی‌تر بە فراوانی بەرچاو دەکەون. خەڵکی ئێرە راوی کللۆ دەکەن. کللۆکان لەبەر خۆرەتاو ویشک دەکەنەوە و پاش هاڕین، ئاردەکەی تێکەڵ بە شیر دەکەن و دەیخۆنەوە. هەر پیاوێک لەو هۆزە خاوەن چەند ژنە. ژنەکان هاوبەشن و چەشنی ماساغێتی‌یەکانن. پیاو کە گەرەکی بێ لەگەڵ هەر ژنێک بخەوێ، داردەست یا وەکازەکەی لەبەر درگای ئەو ژوورە دادەنێ کە خەریکی تێکەڵاوی جینسییە. هەرکات کەسێکی ناسامۆنی بخوازێ و یەکەم جاری بێ کە زەماوەند بکات، کۆمەڵێک میوان بانگهێشت دەکات. نەریتی ئەوانە لەو شەوەدا بەو چەشنەیە کە گشت میوانەکان دەخوازن لەگەڵ بووک رازێن. هەڵبەت هەرکام لە میوانەکان دەبێ دیاری لەگەڵ خۆی بێنێ و بووک خەڵات بکا.

لەمەر سوێند خواردن و فاڵگرتنەوە، خاوەن ئەو شێوە نەریتەن: سوێند بە گۆڕی باب‌وباپیرانی خۆیان دەخۆن، هەڵبەت ئەوانەی ناسراو و پیاوچاک و دادپەروەر بوونە. کاتی سوێند خواردن دەست لەسەر گۆڕی ئەوانە دادەنێن. بۆ پێشگۆیی و تاڵەبینی دەچنە سەر گۆڕی باب‌وباپیرانیان. پاش دوعا و پاڕانەوە، ئەوجار لەسەر قەبرەکە دەخەون و هەر خەونێک ببینن، وەک ئامۆژگاری فاڵەکەیان مەقبوڵە.

وەختێک بەڵێن بە کەسێک بدەن و بخوازن لایەنی بەرامبەر دڵنیا بکەن، بەو چەشنە دەجوڵێنەوە: هەردوو لایەن ئاوی خواردنەوە بە یەکتر دەدەن. ئەگەر بە هەڵکەوت ئاویان دەسنەکەوێ، ئەوکاتە مستێک خۆڵی ورد هەڵدەگرن و لەنێو دەستی یەکتر دەکەن و دەیلێسنەوە.

---

۱- لە قەراخ تریپۆلی کۆن بووە و ئەمڕۆ ناسراوە بە ئۆئاسی یا ئوجیلە.

[۱۷۳] دراوسێی ناسامۆنی‌یەکان، پسیلی‌یەکانن. ئەوانە بەو هۆیانەی باسی دەکەم، لەنێوچوون. بای گەرمی باشوور بەردەوام سەرچاوە ئاوییەکانی ولاتی ئەوانی ویشککرد. شوێنی نیشتەجێیی ئەوانە بەخڕی لە هەرێمی سیرتی بەبێ ئاو مایەوە. پسیلی‌یەکان راوێژێکیان پێکەوە کرد و تێکڕا بڕیاری پەلاماری بای باشووریاندا (وەک لیبی‌یەکان دەگێڕنەوە). وەختێک ئەو پسیلی‌یانە گەیشتنە ناوچەی خیزەڵان، بای باشوور هەڵیکردێ و گشتیان وەژێر لم کەوتن. دوای نوقم بوونیان، وڵاتەکەیان بەدەست ناسامۆنی‌یەکان داگیرکرا.

[۱۷٤] لە ژوور هەرێمی ناسامۆنی‌یەکان و بەرەو باشوور، لەو ناوچەیەی ئاژەڵی دڕندە زۆرن، غاراماندی‌یەکان دەژین. ئەوانە لە گشت مرۆڤ و کۆمەڵگایەک بێزارن و بەردەوام لێیان دوور دەکەونەوە. خاوەن چەکی شەڕ نین و تەنانەت نازانن چۆن بەرگری لە خۆیشیان بکەن.

[۱۷٥] هەروەک گووتم ئەوانە لە سەرەوەی وڵاتی ناسامۆنی‌یەکان نیشتەجێن. دوای ئەوانە و هاوسووی رۆخی دەریا و بەرەو رۆژئاوا، ماکی‌یەکان جێیانگرتووە. ماکی‌یەکان بەو چەشنە سەریان دەتاشن. کەزییەک لە تۆقی سەریان دەهێڵنەوە و لێی‌دەگەڕێن درێژ بێ و پاشماوەی سەریان پاک دەتاشن. لە کاتی شەڕ، بۆ پاراستنی لەشی خۆیان، کەوڵی وشترمرغ لەبەردەکەن. وڵاتەکەیان بەهۆی چۆمی کینیپس دوو کەرت بووە. ئەو چۆمە لە بەرزایی خاریتی‌یەکانەوە سەرچاوە دەگرێ و دەڕژێتە نێو دەریا. ئەو بەرزاییەی خاریتی‌یەکان بە دارستان داپۆشراوە، لە حاڵێکدا بە پێچەوانەوە باقی خاکی وڵاتی لیبی هەروەک پێشتر باسم کرد، رووتەنە. مەودای نێوان دەریا و ئەو بەرزاییە دەگاتە دووسەد ستادیۆ.

[۱۷٦] دوای ماکی‌یەکان، دەگەینە هەرێمی غیندانی‌یەکان. ژنانی ئەو هۆزە پاوانەی چەرم لەپێ دەکەن و بەو چەشنە باسی گرینگی پاوانەکان دەکەن: ژن لەگەڵ هەر پیاوێک بخەوێ، یەک پاوانە لە قاچی دەکات. هەر ژنێک زۆرترین ژمارەی پاوانەی هەبێ، بەمانای ژن چاکی ئەو کەسەیە، چونکە کۆمەڵە پیاوێکی زۆر ئەوی خۆش ویستووە و حەزی لێکردووە.

[١٧٧] زوانەیەکی خاک کە لە هەرێمی شوێنی نیشتەجێیی غیندانیيەکانەوە بەرەو قوڵایی دەریا رادەکشێ و لەوێ لۆتۆفاغیيەکان (لۆتۆس خۆرەکان) دەژین. خواردنی سەرەکی ئەوانە، میوەی داری لۆتۆسە. میوەی لۆتۆس بە قەرا قەزوان و شیرین چەشنی خورمایە. (لۆتۆس لە قەزوان گەورەترە). لۆتۆفاغیيەکان لەو میوەیە شەڕاب دروست دەکەن.

[١٧٨] دراوسێی لۆتۆفاغیيەکان بەلای دەریاوە دەبنە ماخلیيەکان. ئەوانەش خواردنی سەرەکییان میوەی لۆتۆسە، بەڵام بە حەشیمەت کەمتر لە خەڵکی لۆتۆفاغیین. وڵاتی ماخلیيەکان تا چۆمی گەورەی تریتۆن راکشاوە. ئەو چۆمە دەڕژێتە گۆلێکی مەزن بەناوی تریتۆنیدا[1]. لەنێو گۆل، دورگەی فلا[2] هەڵکەوتووە. دەگێڕنەوە کە بەپێی ئامۆژگارییەکی تاڵەبینەکان، داوا لە لاکێدێمۆنیيەکان کرابوو کە لەو دورگەیە نیشتەجێ بن.

[١٧٩] زانیارییەکیتریش لەو بارەوە هەیە کە دەڵێ: کاتێک یاسۆن گەمی ئارغۆسی لە پیلیۆ سازکرد، سەد جوانەگای قوربانی و یەک سێ پایەی مەفرەغی لێبارکرد و بەدەوری ناوچەی پێلۆپۆنیسۆدا خولایەوە. ئەو گەرەکی بوو بچێتە نێوەندی ئایینی دێلفوس.

یاسۆن لەکاتی سەفەردا گەیشتە مالێئا. لەوێ تۆفان هەستا و گەمی یاسۆنی بەرەو وڵاتی لیبی (ئەفریقا) ڕادا. ناوبراو بەرلەوەی بگاتە ویشکایی خاکی لیبی، سەری لە تریتۆنیدا وەدەرنا. لەبەر ئەوەی نەیتوانی لەوێ خۆی رزگار بکا، دەڵێن کە خواوەند تریتۆن خۆی بە یاسۆن نیشانداوە و داوای لێکردوە سێ پایە مەفرەغیيەکەی بداتێ. لەبەرامبەردا هەم رێگای دەرباز بوون بە یاسۆن نیشانبدا و هەم یارمەتی خۆیشی و باروبنەی بکا کە بە سلامەتی نەجاتیان بێ. یاسۆن بەو مامەڵەیە لەگەڵ خواوەند تریتۆن رازی بووە. خواوەند تریتۆن رێگایەکی بە یاسۆن گوتووە کە بەنێو رەۆەزاندا تێپەڕیوە. خواوەند تریتۆن ئەوجار سێ پایەکەی لە سەر سەکۆی پیرۆز داناوە و خۆی لەسەری دانیشتووە و مژوڵی

---

١- تریتۆنیدا، روبارێک لە هەرێمی سیرت یا کیرتی کۆن، واتە تونیسی ئەمڕۆ.

٢- دورگەی فلا، ئەمڕۆ ناسراوە بە جێربا.

پێشگۆیی بۆ یاسۆن و بارگەکەی بووە و گوتوویەتی: "هەرکەس لە وەرەسەی ئەو مەلەوان و کەشتیوانانەی هاورێی یاسۆنن و لەنێو گەمی ئارغۆس‌دا هەن، ئەگەر بتوانێ سێ پایەکە بۆخۆی بەرێ، چارەنووس حوکم دەکا کە سەد ئاوایی یۆنانی لە دەوری گۆلی تریتۆنیدا بنیاتبنێ".

خەڵکانی لیبی‌یایی نیشتەجێ لەو هەرێمە کاتێک بەو پێشگۆییە دەزانن، خێرا سێ پایەکە دەشێرنەوە.

**[١٨٠]** دوای ماخلی‌یەکان، خەڵکانی ئاڤسیس جێیان‌گرتووە. ئەوانە و ماخلی‌یەکان لە دەوری تریتۆنیدا دەژین و رووباری تریتۆن سنووری نێوانیان پێکدەنێ.

ماخلی‌یەکان قژیان لە پشت سەریان درێژ دەهێڵنەوە. ئاڤسیس‌یەکان قژی پێش سەریان بەو شێوەیە رادەگرن. ئەوانە جەژنێک بۆ خواوەند ئاتینا رێکدەخەن و لەو جەژنەدا کچانی شوو نەکردوو و عەلاوە بەسەر دوو ئۆردوگادا بەشدەبن و بە داروبەرد وەردەگەرێنە یەکتر. ئەوان دەڵێن ئەو شەرە وەک دیاری بۆ خواوەند ئاتینا لە وڵاتی خۆیان دەکەن. ئەو خوایە لە یۆنان‌یش ناوی ئاتینایە. هەرچەند کچی عەلاوە لەو شەرەدا بەهۆی قورسی برینەکانیان بکوژرێن، وەک شوونەکردووی قەڵب چاویان لێدەکرێ.

بەر لەوەی شەری نێوان ئەو دوو کۆمەڵە کچە دەست پێبکا، جوانترین کیژ هەڵدەبژێرن، کڵاوی جەنگی کۆرینتی (ناوچەیەک لە یۆنان) لەسەر دەنێن و جلوبەرگی لەشکریی یۆنانی لەبەر دەکەن و ئەوجار بە سواری فایتوونی شەر دەیهێننە قەراخ گۆل. ئەوە کە کچەکانی شوو نەکردوو لە سەردەمی زوودا چۆن رازێندراونەوە، واتە بەر لەوەی یۆنانییەکان بچنە ئەو دەڤەرە، هیچ زانیارییەکی ئەوتۆم لەبەردەستدا نییە. من پێموایە بە شێوازی میسری رازاونەوە. بە باوەری من یۆنانییەکان کڵاو و مەتاڵی جەنگی لە میسری‌یەکانەوە فێربوون.

بەبۆچوونی ئاڤسیس‌یەکان، ئاتینا کچی پۆسیدۆنا و گۆلی تریتۆنیدا، لە باوکی خۆی قەڵس بووە و تەسلیمی خواوەند دیا بووە و لەلای ئەو ماوەتەوە. ئەوە رای ئاڤسیس‌یەکان بوو. ژنەکانی ئەوانە هاوسەرییەتی گشت لایەک دەکەن.

ئەوانە بنەماڵە پێکناهێنن، بەڵکوو چەشنی ئاژەڵ لەگەڵ یەک جووت دەبن. وەختێک ژنێک مناڵێکی سڵامەتی دەبێ، سێ مانگ دوای لەدایکبوونی مناڵەکە، گشت پیاوانی هۆز کۆدەبنەوە بۆوەی بزانن شێوەی کامیان دەدا، ئیتر لەو رۆژە بەدواوە ئەو پیاوە دەبێتە باوکی مناڵەکە.

[١٨١] تەواوی باسەکان تا ئێستا سەبارەت بە هۆزە لیبیاییە بیابان نشینەکانی کەنار دەریا بوو.

بەلای باشوور و لە نێوەڕاستی ویشکایی خاکی لیبی‌دا، ناوچەی ئاژەڵە دڕندەکان هەیە. دوای ئەو ناوچەیە، بەدرێژایی خاکی لیبی، لە شاری تیڤای[1] وڵاتی میسر تا دەگاتە کۆڵەکەکانی ئیراکلیس، رەگێکی لمی راکشاو بەرچاو دەکەوێ. لە سەرتاسەری مەودای ئەو رەگە لماوییە، دوای هەر دە رۆژ رێگا، پارچەیەکی گەورەی خوێ جێی‌گرتووە. ئەو خوێ وردە لە خوێی درشتی سەر بەرزاییەکانەوە سەرچاوە دەگرێ. لەسەر دوندی هەر گرد و تەپۆڵکەیەک و لەنێوان بەردە خوێیە گەورەکاندا، ئاوێکی فێنک و خۆش هەڵدەقوڵێ. لە دەوری ئەو کانیاوانە خەڵکانێک دەژین و دوای بیابانی ئاژەڵە دڕندەکان، دوایین ناوچەی ئاوەدانی لە بیاباندا پێکدێنن.

ئەو هۆزانەی لە دەوری کانیاوەکان دەژین، ئەوانەن: یەکەم دەستە کە تووشیان دەبین، دوای دە رۆژ رێپێوان لە ئاوایی تیباوە، دەگەینە لای ئامۆنی‌یەکان. ئەوانە خوای پیرۆزیان وەک دیای تیڤاییەکانە. وەک پێشتریش گووتم لە شاری تیڤا، پەیکەرەی خواوەند دیا خاوەن روخساری کەڵە. خەڵکی ئەو هۆزە کانیاوێکی تایبەتی‌تریان هەیە کە ئاوەکەی سپێدەی بەیانی شیرەوتێنە، نیوەڕۆ فێنک و ساردە و راست لەو کاتەدا باغاتی پێ ئاودەدەن. ئێوارە ئاوەکە دوبارە گەرم دەبێتەوە و تا قەیاسێک لە شەو دەگوزەرێ هەروا گەرمە، راست لای نیوەشەو ئەوەندە گەرم دەبێ، وەک ئاوی کوڵیوی لێدێ. نیوەشەو رابرد،

---

١- لە شاری تیڤای میسر تەنیا وێرانەکانی ماون. لەگەڵ شاری تیڤای یۆنان جیاوازە.

ئەوجار دوبارە روو لە ساردی دەکاتەوە و تا لای بەیانی دەخایەنێ. ناوی ئەو کانیاوەیان ناوە، کانی خۆر.[1]

**[١٨٢]** دوای ئامۆنی‌یەکان، بەدرێژایی لمزار و بەمەودای دە رۆژی سەفەری‌تر، گردێکی خوێ هەیە و شێوەی تەپۆلکەکانی هەرێمی ئامۆنی‌یەکان دەدا. لێرەش ئاو و ئاوەدانی بەرچاو دەکەوێ. بەو دەڤەرە دەگووترێ ئاڤیلا. ئێرە هەمان شوێنە کە ناسامۆنی‌یەکان لە وەرزی کۆکردنەوەی خورمادا رووی تێدەکەن.

**[١٨٣]** دوای هەرێمی ئاڤیلا. بە مەودای دە رۆژ ڕێگا، گردێکی‌تر لە خوێ هەیە و خاوەن کانیاوە و راست وەک ئەو شوێنانەی پێشتر ناوم هێنان، پڕە لە دارخورما و میوەیەکی زۆر. لێرەش خەڵکانێک دەژین بەناوی غارامانتی. ئەوانە حەشیمەتێکی زۆرن، خاک لەسەر خوێ ڕۆدەکەن و بۆ کشتوکاڵ کەڵکی لێوەردەگرن. راستەڕێگای دەربازبوون لەو شوێنە بەرەو وڵاتی لۆتۆفاغی‌یەکان، سێ رۆژ مەودایە. کەڵ و گای ئەو دەڤەرە، کاتی لەوەڕین، پاشەوپاش دەکشێنەوە. شاخەکانیان لەڕادەبەدەر بەرەو پێشەوە داشکاون کە ناچار بە پاشەکشەیان دەکا. ئەو کەڵ و گایانە وەختێ مژوڵی لەوەڕ خواردنن، شاخیان لە عەرز هەڵدەچەقێ و ناتوانن بەرەو پێشەوە هەنگاو بنێن.[2] ئەو ئاژەڵانە جیاوازییەکی‌تریشیان هەیە، کەوڵیان ئەستوورتر و چیڕترە. غارامانتی‌یەکان سواری فایتوونی چوار ئەسپە دەبن و لەو حاڵەدا راوی خەڵکی ترۆغلۆدیتی ئەتیۆپیایی دەکەن. ترۆغلۆدیتی‌یەکان لە ئەشکەوتاندا دەژین و لە شارستانییەت بەدوورن. لە وڵاتانی لیبی، ئەتیۆپی و سکیتیا هەن و ئاژەڵ و زیندەوەر دەخۆن. بەپێی نەریت، پیر و نەخۆش و کەم‌ئەندام و دواکەوتوو لەنێو خۆیاندا دەکوژن. ترۆغلۆدیتی خێراترین مرۆڤ لە راکردندا بوونە. بۆیە خواردنیان پتر مار و

---

١- ئەورۆ ناسراوە بە عەینولحەمام. تینەکەی ئاڵوگۆڕی بەسەردا نایە، بەڵکوو هەوای دەورووبەری سارد و گەرم دەبێ.

٢- لە قاپۆڕ و ئێسک و پروسک و تابلۆکانی کە لە باکووری ئەفریقیا دۆزراونەوە، شاخی کەڵەکانیان بەرەو پێشەوە داشکاون.

سوسمار و دەعبای لەو چەشنە بووە. زمانی ئاخاوتنیان وەک هیچ زمانێکیتر ناچێ و شێوەی شەمشەمەکوێرە، تەنیا دەقیژێنن.

[١٨٤] دوای وڵاتی غاراماندیەکان، بە مەودای دە ڕۆژ ڕێگا، تووشی تەپۆلکەیەکیتر لە خوێ و ئاوەدانی دێین. ئەو ناوچەیە ناسراوە بە ئەتارانت. ئەوەندەی من بزانم، ئەوانە تەنیا خەڵکانێکن کە خاوەن هیچ ناوێک نین و هەرهەموویان بانگی یەکتر دەکەن ئەتارانت و کەس ناوی تایبەت بەخۆی نییە.

وەختێک خۆر لە تەشقی ئاسمانە و تەواو گەرمە، ئەوانە چی جنێوی ناحەزە بە خۆری دەدەن، هۆیەکەشی دەگەڕێتەوە سەر گەرمای بێداد کە چۆن خاکەکەیان دەسوتێنێ.

پاش ئەو دەڤەرە و بە مەودای دە ڕۆژیتر ڕێگا، دیسان گردێکی خوێی خاوەن کانیاو و ئاوەدانی دەردەکەوێ. لە دەوروبەری ئەو گردە، چیایەکی خوێ هەیە بەناوی ئەتڵەس. ئەو چیایە بە قەوارە بچووک، بەڵام باریک و خڕ و بەرزە. دەڵێن کەس نەیتوانیوە ترۆپکی ئەو شاخە ببینێ و لە زستان و هاویندا بە هەور داپۆشراوە. خەڵکی ناوچەکە لەو باوەڕەدان کە ئەو چیایە کۆڵەکەیە و ئاسمانی ڕاگرتووە. دانیشتووانی ئەو شوێنە بەناوی چیاکە ناسراون و پێیان‌دەگووترێ ئەتلانتی. باس‌دەکەن کە خەڵکی ئێرە هیچ شتێک بە زیندوویی ناخۆن و قەتیش خەون نابینن.

[١٨٥] بەو حیسابە، من دەتوانم ناوی گشت گەلانی دانیشتوو تا وڵاتی ئەتلانتیەکان بێنم کە لەو باریکە سەحراییەدا دەژین. لەوێ بەولاوە، هیچ زانیارییەکیترم دەست نەکەوتووە. ئەو باریکە لمە سەحراییە دەگاتە کۆڵەکەکانی ئێراکلیس و لەوێش تێدەپەڕێ. پیاو ئەگەر دە ڕۆژیتر بەردەوام بڕوا، دەگاتە تەپۆلکەیەکیتر لە خوێ. ئاو و ئاوەدانی لێیە و خانوەکان بەگشتی لە کریستاڵی(بەردی) خوێ دروست کراون. لەو بەشەی وڵاتی لیبی (ئەفریقا) قەت باران نابارێ. ئەگەر ببارێ، دیوارەکان دەتوێنەوە. ئەو بەردە خوێیانە لە خاک دەردێنن و ڕەنگیان سپی یا سوورە. دورتر لەو باریکەیە، بەرەو باشوور و

باشووری لیبی، تەواو بیابانێکی بێ ئاو و ئاژەڵ و باران و دارە و لە هیچ شوێنێک تەڕایی بەرچاو ناکەوێ.

[١٨٦] لە میسرەوە تا گۆلی تریخۆنیدا، خەڵکانی لیبیایی بەگشتی خێڵەکی و گۆشتخۆرن و شیر دەنۆشن. هەڵبەت ئەوەش بڵێم کە چۆن میسری‌یەکان گۆشتی مانگا ناخۆن، ئەوانەش خۆیان لە خواردنی ئەو گۆشتە دەپارێزن. ئەوانە بەرازیش ڕاناگرن و خۆماڵی ناکەن. دەبێ بڵێم کە ژنانی کیرینی‌یش گۆشتی مانگا ناخۆن، تەنیا بۆخاتری ئیسیدۆس واتە خوای مێینەی میسری ئەو دابەیان پاراستووە. بۆ ئەو خوایە هەم بەڕۆژوو دەبن و هەم جێژنی بۆ دەگرن. ژنانی ڤارکی، ئەوانیش هەر بەو چەشنە نە گۆشتی مانگا دەخۆن و نە بەراز ڕادەگرن. ئەوە کۆمەڵێک زانیاری سەبارەت بەو ناوچانە بوون.

[١٨٧] لە ڕۆژئاوای گۆلی تریتۆنیدا ئیتر هۆزی لیبیایی بەرچاو ناکەون. لەوێ خەڵکانێک دەژین کە خاوەن دابونەریتی تەواو جیاوازن و وەک هۆزە بیابان نشینەکان لەگەڵ مناڵەکانیان هەڵسوکەوت دەکەن.

خەڵکی لیبیایی، هەڵبەت نەک هەموویان، چونکە لەو بارەوە دڵنیا نیم، بەڵکوو زۆربەیان خاوەن ئەو نەریتەن کە ئێستا باسی دەکەم: کاتێک مناڵێک دەگاتە تەمەنی چوار ساڵی، بە سوتاندنی خوری مەڕ، ڕەگەکانی تەپڵی سەری داغ دەکەن. دیارە کەسانی‌تریش هەن کە ڕەگەکانی لاجایینگی مناڵ داغ دەکەن. مەبەستی ئەوانە لەو کارە ئەوەیە تا سەری مناڵ لە ژیانیدا، تووشی چڵک و بەڵغەم نەیە و لەشیان ساغ و سلامەت بێ. ئەوانە بەو کارەیان دڵنیان سلامەتی تەواویان بۆ مناڵەکانیان مسۆگەر کردوە. پێویستە ئەوەش بڵێم کە خەڵکانی لیبیایی (ئەفریقایی) لە گشت گەلانی‌تر ساغ و سلامەتترن.

ئەوە کە ئەو کردەوەیە بووەتە هۆی سلامەتی ئەوان یاننا، باسێکە کە من ناتوانم بە دڵنیاییەوە دروستییەکەی بسەلمێنم. بەهەرحاڵ خەڵکێکی تەندروستن. ئەگەر لەکاتی داغکردندا، ڕەگەکان بەهەڵە تووشی سووتانی زۆر بن، دەرمانێکی ئامادە بەکاردێنن. خێرا هێندێک گمێزی مەڕ بەسەری مناڵدا دەکەن و بەو شێوەیە هەست بە ئارامی دەکا. ئەوە قسەی خەڵکی هەرێمەکەیە.

[١٨٨] سەبارەت بە ڕێوڕەسمی قوربانیکردن لەنێو بیابان نشینان، ئەویش بەو جۆرەیە: سەرەتا گوێی ئاژەڵی قوربانی دەبڕن و بەرز حەوای دەدەن. ئەوجار دەست بە بڕینی پشتملی ئاژەڵ دەکەن و سەرەکەی لێدەکەنەوە. ئەوانە قوربانی تەنیا پێشکەش بە مانگ و ڕۆژ دەکەن. بۆ ئەو جووتە خوایە، گشت لیبیاییەکان قوربانی دەکەن، بەڵام ئەوانەی لە دەوری گۆلی تریتۆنیدا دەژین، سەرەتا قوربانی پێشکەش بە خواوەند ئاتینا دەکەن، پاشان بە تریتۆنا و پۆسیدۆنا.

[١٨٩] یۆنانییەکان نەریتی دروست کردنی جلوبەرگ و قەڵغان بۆ پەیکەرەکانی ئاتینا لە خەڵکی لیبیایی فێربوون. جلوبەرگی ژنانی لیبیایی جیا لەوە کە لە کەوڵ دروست دەکران، قەراخەکانیشیان هێمای مار نەبوونە و تەنیا تیزماڵێکی چەرمییان لێدەدوورا. باقی پارچەکانی ئەو جلوبەرگە لەلای هەردوو نەتەوە هاوشێوەن. ناوی ئەو جلوبەرگانەی لەبەر پەیکەرەی پەلازییەکان[1] دەکرا، لە زمانی لیبیاییەوە وەرگیراوە. ژنانی لیبیایی لەسەر جلەکانیان، کەوڵی کاریلە دەپۆشن. ئەو کەوڵانە خاوێن دەتاشن و لە خمی سووریان دەگرن. قەڵغانیش هەر لە کەوڵی کاریلە دروست دەکەن.

بەباوەڕی من ڕێورەسمی ئایینی پڕ لە هەرا و هوریا، ئەویش لە لیبییەکانەوە وەرگیراوە، چونکە ژنانی لیبیایی بەردەوام ئەو شێوە سترانبێژییە ڕەچاودەکەن. یۆنانییەکان کەڵکوەرگرتن لە چوار ئەسپ بۆ ڕاکێشانی داشقە و فایتوون لە لیبییەکان فێربوونە.

[١٩٠] یابان نشینانی لیبی جیا لە ناسامۆنییەکان، لەکاتی ناشتنی مردووەکانیان، هەمان نەریت ڕەچاودەکەن کە یۆنانییەکان بەڕێوەی دەبەن. ناسامۆنی مردوو بە دانیشتنەوە لە قەبر دەنێن و حەول دەدەن نەهێڵن نەخۆش بە ڕاکشاوی رووحی دەرچێ، بەڵکوو بە دانیشتنەوە[2] بێ. خانووی ناسامۆنییەکان بە چنینی قەسەڵی گەنم و جۆ لە دەوری غەڵف و شەقڵەی

---

١- بەو پەیکەرانە گووتراون کە پێشکەش بە ئیلاهە ئاتینای پەلادی کراون.

٢- دانیشتنی شێوەی یوگا.

دارسریش دروست دەکرێن و بۆ راگواستن دەبن. ئەوە کورتە باسێک لەسەر دابونەریتی ئەو هۆزانە بوو.

[١٩١] تەنیا لە رۆژئاوای چۆمی تریتۆنا و دوای ئاڤسیسیەکان، وەرزێڕانی لیبیایی دەژین و ئەوانە خوویان بە نیشتەجێبوون لە خانوودا گرتووە. ئەو وەرزێڕانە ناسراون بە ماکسی. ماکسییەکان قژی لای راستی سەریان دەهێڵنەوە و لای چەپ دەتاشن. رەنگی سوور لە لەشیان هەڵدەسوون و بۆ ئەو کارەشیان دەڵێن کە پاشماوەی هۆزی ترۆواییەکانن. دەڤەری ئەوانە و باقی بەشەکانی رۆژئاوای لیبی، خاوەن دارستان و شینکایی و پڕ ئاژەڵە. بەشی خۆرهەڵات، واتە ئەو شوێنەی هۆزە بیابان نشینەکانی لێهەن، تا دەگاتە چۆمی تریتۆنا، نزم و خیزەڵانە. لەوێ بەولاوە و بەرەو رۆژئاوا، ئەو هەرێمەی وەرزێڕانی لیبیایی لێنیشتەجێن، گەلێک شاخاوییە و خاوەن دارستانی چڕ و ئاژەڵی دڕندەی زۆرە.

لەو هەرێمە ماری گەورە، ئەفعی ژاردار، فیل، ورچ، کەری شاخداری سەر سەگانە و کۆمەڵێک ئاژەڵیتری بێسەر کە بە گووتەی لیبییەکان، چاوەکانیان لەسەر سینگیانە، بەرچاو دەکەون.

هەروەها کۆمەڵێک ژن و پیاو و ئاژەڵی وەحشی و ئەفسانەیی لەو دەڤەرە دەژین.

[١٩٢] لە وڵاتی بیابان نشینەکان ئاسەوارێک لەو چەشنە ئاژەڵانە بەرچاو ناکەوێ، بەڵام کۆمەڵێک ئاژەڵیتر هەن کە بریتین لە: کارمامز، ئاسکەکێوی، کەر-هەڵبەت نەک لەو کەرانەی ئاو ناخۆنەوە- بزنەکیوی کە فینیقییەکان لە شاخەکانی ئەوانە لاسکەساز دروست دەکەن (ئەو ئاژەڵانە بەقەرا کەڵێک دەبن)، رێوی بچووک، کەمتیار، ژیشک، کەڵە کێوی، دیکتی (رەگەزێکیتری بزنەکێوی)، چەقەڵ، تاژپڵینگ، تیمساح کە درێژاییان سێ پیخیس دەبێ و لە ویشکاییدا دەژین و پتر وەک سوسمار دەچن، وشترمرغ و کۆمەڵێک ماری بچووک کە تەنیا یەک شاخیان هەیە.

ئەوە باسێک لەسەر ئەو کۆمەڵە ئاژەڵانە بوو کە لەو ناوچەیە دەژین. ئاژەڵی‌تر، جیا لە بەراز و گەوەزن(گاکێوی)، هەرهەموویان لەو هەرێمە هەن. بەراز و گەوەزن لە وڵاتی لیبی بەرچاو ناکەون.

سێ جۆر مشک هەیە: دیپۆدی (دووپێ)، زێیێری (ئەوە وشەیەکی لیبیاییە و لە یۆنانیدا مانای چیا و بەرزایی دەدا)، ئێخینی (لەجیات موو، گشت لەشی بە دڕوو داپۆشراوە). لەو هەرێمە چەشنە راسوویەک بەرچاو دەکەوێ کە لەنێو گیای سیلیفیۆدا دەژین و تەواو وەک راسوویەکانی ئارتیسۆس دەچن.

ئەوانەی ناوم‌هێنان کۆمەڵێک ئاژەڵی بیابانی و کێوی بوون کە لە وڵاتی سەحرا نشینەکانی لیبی دەژین. هەڵبەت ماوەیەکی زۆری تێچوو تا من توانیم ئەوەندە زانیارییە سەبارەت بەو ئاژەڵانە کۆبکەمەوە.

[١٩٣] هاوسنوور لەگەڵ ماکسی‌یەکانی لیبیایی، زاڤئی‌یەکانن. ژنانی زاڤئی خۆیان عارەبانەی جەنگی لەکاتی شەڕدا لێدەخوڕن.

[١٩٤] لە دراوسێیەتی زاڤئی‌یەکان، بیزاندی‌یەکان (غیزاندی) نیشتەجێن. لە هەرێمی ئەوانە چەشنێک هەنگ هەیە کە هەنگوینێکی فرە دادەنێ. ئەوەش دەگووترێ کە زۆربەی هەنگوینی ئەو هەرێمە دەسکردە. بیزاندی‌یەکان رەنگی سوور لە لەشیان هەڵدەسوون و خواردنیان گۆشتی مەیموونە کە بەڕێژەیەکی زۆر لە چیاکانی ئەو دەڤەرە دەژین.

[١٩٥] کارخیدۆنی‌یەکان دەڵێن لە روبەڕووی وڵاتی ئەوان، دورگەیەک هەیە بەناوی کیرائیس. درێژایی ئەو دورگەیە دووسەد ستادیۆ دەبێ، بەڵام بەرتەسک و پڕ لە داری زەیتوون و رەزی ترێیە و گۆلێکی تێدایە کە کچانی ئەوێ دەچن و لەنێو قورەکەیدا، بەنووکی پەڕی باڵندەی قیراویکراو بەدوای وردەزێڕدا دەگەڕێن. نازانم ئاخۆ ئەو قسەیە ڕاستە یاننا، من ئەوە دەنووسم کە بیستوومە. رەنگە راستیش بێ، چونکە من بەچاوی خۆم لە دورگەی زاکینتۆس دیتم کە قیر(قیل)یان لە گۆل دەردەهێنا.

لە دورگەی زاکینتۆس کۆمەڵێک گۆل هەن. گەورەترینیان خاوەن درێژایی حەفتا پێیە و بەرینایی و قوڵایی ئەو گۆلە دەگاتە نیزیک بە دوو ئۆرغیس. خەڵکی

ئێره دارشەقڵەیەک دێنن و چەند لکێک لە پنچکی داری مۆرتک لەسەری دەبەستن و بەنێو ئاودا رایدەکێشن. قیر بە لکەکانی مۆرتک وەدەنووسێ. ئەو قیرە چەشنی ئاسفاڵت بۆنی هەیە، بەڵام لەوەی کە لە ناوچەی پی‌یێریاس هەڵیدێنجن خاوێنترە. ئەو قیرە لە قوڵکێکی تەنیشت خۆیانی دەکەن، پاش ئەوەی قەیاسێکی زۆر کۆبۆوە، ئەوجار لەنێو ئامفوری[1] دەکەن.

[١٩٦] خەڵکی کارخیدۆنی باسی ئەوە دەکەن کە لەوبەری کۆڵەکەکانی ئیراکلیس ناوچەیەکی‌تری لیبی هەیە و ئاوەدانە و خەڵکی لێدەژی. وەختێک کارخیدۆنی‌یەکان بە گەمی دەگەنە ئەو شوێنە، بارەکانیان دادەگرن و لە کەنار دەریا بەڕیز دایاندەنێن. خۆیان دەگەڕێنەوە نێو گەمی‌یەکان و چرە دوکەڵ سازدەکەن و بەرەو ئاسمان هەڵدەکشێ. خەڵکی دەڤەرەکە هەرکە چاویان بەو دووکەڵە کەوت، دێنە کەنار ئاو، زێڕ دادەنێن و بەو ڕێژەیە شتومەکی پێویست لە بارەکان هەڵدەگرن و دوور دەکەونەوە. ئەوجار کارخیدۆنی‌یەکان دوبارە دێنەوەو زێڕەکان حیساب دەکەن. ئەگەر زێڕەکە بەهای کاڵاکان بوو، بەبێ راوەستان وەڕێدەکەون، ئەگەر نا، دەگەڕێنەوە نێو گەمی‌یەکان و چاوەڕوان دەمێننەوە. خەڵکی دەڤەر دیسان دێنەوە و هێندێکی‌تر زێڕەکە زیاتر دەکەن، تا ئەو کاتەی کالخیدۆنی رازی‌دەبن. نە کالخیدۆنی دەست لە زێڕ دەدەن، تا ئەو کاتەی دەگاتە ڕێژەی پێویست، نە خەڵکی دەڤەریش کەرستەی‌تر هەڵدەگرن، بەر لەوەی کالخیدۆنی‌یەکان زێڕەکان هەڵگرن و بڕۆن.

[١٩٧] ئەوە باسی ئەو خەڵکە لیبیاییە بوو کە بەناو دەیانناسم. زۆربەیان نە لە رابردوودا دەیانزانی و نە ئێستاش زانیارییەکیان لەمەر پاشای میدی‌یەکان هەیە. سەبارەت بەو وڵاتە دەبێ بڵێم: بەپێی سەرچاوەکان چوار هۆز یا رەگەز لەو وڵاتە هەن، نەک زیاتر. دوو لەو رەگەزانە خەڵکی وڵاتەکەن و دووشیان لە دەرەوەڕا هاتوون و کۆچەرن، واتە لیبی‌یەکان و ئەتیۆپی‌یەکان. لیبی‌یەکان لە باکووری وڵات (قارە) دەژین و ئەتیۆپی‌یەکان لە باشوور نیشتەجێن. هەردووکیان خۆجێیین. بەڵام فینیقی‌یەکان و یۆنانی‌یەکان کۆچەرن.

---

١- خومرەیەک کە تۆزێک پتر لە نۆزدە لیتر ئاودەبا.

[١٩٨] بەباوەڕی من خاکی لیبی، جیا لە هەرێمی کینیپۆس[1]، ئەوەیتر بۆ کشتوکاڵ ئەوەندە بەپیت نییە کە پیاو لەگەڵ ئاسیا و ئوروپا هەڵیسەنگێنێ.

ئەو هەرێمە ناوەکەی لە رووباری کینیپۆس وەرگرتووە. بەروبومێکی زۆر لەو ناوچەیە بەرهەم دێ و خاوەن باشترین خاکە و لەگەڵ باقی بەشەکانیتری لیبی جیاوازی هەیە. خاکەکەی رەشە، بە ئاوی کانیاو و چاڵاو پاراو دەکرێ و لە ویشکەساڵی ناترسێ و نیگەرانی بارانی لە رادەبەدەریش نییە. بەرهەمی کشتوکاڵی ئێرە هاوشانە لەگەڵ بەرهەمی ساڵانەی وڵاتی بابیلۆنا(بابیل). خەڵکی ئێئێسپێریتی خاوەن خاکێکی دەوڵەمەندن. ئەو ساڵانەی حاسڵاتی فرەیان دەبێ، لە باشترین حاڵەتدا دەنکێک دەغڵ سەد دەنکی لێدەکەوێتەوە. لەحاڵێکدا لە کینیپۆس یەک بە سێسەدە.

[١٩٩] هەرێمی کیرینی کە بەرزترین شوێن لە سەرتاسەری خاکی لیبییە و کۆمەڵێک هۆز لێی نیشتەجێن، لە ساڵدا سێ جار بەرەوبوومی لێ بەرهەمدێ و دیاردەیەکی سرنجڕاکێشە. سەرەتا حاسڵات و میوەی کەنار دەریا کۆدەکرێتەوە. هەرکە ئەو کارە تەواو بوو، ئەوجار ئەو شوێنانەی تۆزێک لە کەنار دەریا بەرزترن و بەرپاڵن، نۆرەی کۆکردنەوەی بەروبوومیان دێ. وەختێک حاسڵات کۆکردنەوەی ئێرەش بەرەو تەوابوون چوو، نۆرەی قەدپاڵ و بەرزاییەکان دێ. دەبێ بڵێم، هەرکە وەجبەی یەکەم خورا، بەرهەمی دووهەم دەگاتێ و پاشان سێهەم بەشی بەربوومەکە ئامادە دەبێ. کیرینییەکان هەشت مانگ لە ساڵدا خاوەن دەغڵ و دان و میوە و بەرهەمیترن. ئەوەش کۆمەڵە زانیارییەک لەو بارەوە.

[٢٠٠] پارسەکان، ئەوانەی ئاریئاندیس لە میسرەوە ناردبوونی تا یارمەتی فێرێتیمیس بدەن، گەیشتنە شاری ڤارکی و دەوری ئەو کۆمەڵگایەیاندا و داوایان لە دانیشتووانی شار کرد کە ئەو کەسانەی دەستیان لە کوشتنی ئارکێسیلائۆسدا هەبووە، تەسلیمی ئەوانیان بکەن. خەڵکەکە بە پانەوە خۆیان بە تاوانبار نیشاندا و ئەو خواستەشیان قبوڵ نەکرد. پارسەکان دوای ئەو وڵامە،

---

١- لە دەڤەری تریپۆلی هەڵکەوتووە و ئەمڕۆ پێیدەگووترێ وادیکەنعان.

نۆ مانگی ڕێک شاریان گەمارۆدا، خەندەک و بندڕیان لە ژێر دیواری شار لێدا و کۆمەڵێک شوێنی پەلاماردانیان دروست کرد. ئەو داڵانەی پارسەکان لەژێر زەوی دروستیانکردبوو، بەهۆی کابرایەکی ئاسنگەر دۆزرایەوە، ئەوەش ڕاست لە کاتی مەفرەغکردنی ڕووی مەتاڵێک بوو. کابرای ئاسنگەر تەگبیرێکی بۆ ئەو کارە ڕەچاوکرد: مەتاڵەکەی لە چەند شوێنی شار دانا. لەهەر نوختەیەک ئەگەر کەسێک خەریکی بندڕلێدان نەبوایە، عەرز بێدەنگ و سەدا بوو، بەڵام ئەگەر بەپێچەوانەوە هەڵکەندنێک لەگۆڕێ با، مەتاڵ دەنگی دەداوە. خەڵکی شاری ڤارکی خۆیان داڵانێکیتریان لە بواری پێچەوانەی پارسەکاندا هەڵکەند و هەرکە گەیشتنە سەر کەنکەنەچی پارس، خێرا لەژێر زەویدا کوشتیان. ئەوە ڕێگەچارەی خەڵکی ڤارکی بەمەبەستی پوچەڵکردنەوەی بندڕلێدانی پارسەکان بوو. دیارە ئەو خەڵکە پەلاماری پارسەکانیان بۆسەر شاریش بەرپەرچ داوە.

**[٢٠١]** هەرچی زەمان تێدەپەڕی، هەردوو لایەنی شەڕ هێزەکانیان پتر لە کزی دەدا. لەو نێوەدا خەڵکێکی زۆر لە هەردوو لایەن کوژرا، دیارە پارسەکان کوژراوی زیاتریان هەبوو. سەرکردەی هێزەکانی پیادە ڕێگاچارەیەکیتری گرتەبەر و ئەویش بەو چەشنە بوو: ئەو سەرکردەیە دەیزانی کە بە شەڕ ناتوانێ دانیشتووانی شاری ڤارکی تەسلیم بکا و بۆیە حیللەیەکی بەکارهێنا. دەستووریدا شەو کەنداڵێکی قوڵ و بەربەرین هەڵکەنن و بە چرپی و ئاڵاش سەری داپۆشن خۆڵی لەسەر ڕۆکەن و لەگەڵ عەرز ڕێک و نەدیاربێ. بەیانی سەحەری خەڵکی ڤارکی بۆ وتووێژ بانگهێشت کران. ڤارکییەکان ڕەزامەندیان دەربڕی و لەگەڵ یەکتر پێکهاتن. شێوەی پێکهاتن بەو جۆرە بوو کە باسی دەکەم:

هەردوو لایەن لەسەر خەندەکەکە سوێندیان خوارد تا وەختێک ئەو عەرزە وەک خۆی بمێنێ، پێکەیشتن و پەیمانیان لەجێیخۆیدا بێ. خەڵکی ڤارکی ئامادە بوون خەراجی پەسندکراو بە پاشای پارس بدەن و پارسەکانیش سوێندیان خوارد دەست لە پەلامار و کوشتنی ئەوان هەڵگرن. دوای ئەوەی سوێندخواردن بەجێگەیی، دانیشتووانی شاری ڤارکی لەبەر ئەوەی باوەڕیان بە سوێندەکەیان

بوو، لەشار وەدەر کەوتن و دەروازەکانیان کردەوە و هەرکەس لە دوژمن گەرەکی بوایە، بۆی هەبوو بێتە نێو شار. پارسەکان لەپڕێکا بانی خەندەکی شاراوەیان روخاند و پەلاماری نێو شاریاندا. ئەوان پردەکەیان وێران کردبوو و ئیتر سوێندیان لێنەدەکەوت، چونکە لە کاتی سوێند خواردندا گوتبوویان تا زەمانێکی ئەو عەرزە وەک خۆی بمێنێ، کەس ئازار نادەن و پەیمانەکە بەلایانەوە رێزی لێدەگیرێ. بەڵام هەرکە بانەکە رووخا، عەرز وەک خۆی نەما و بەڵێنی ئەوانیش مانای خۆی لەدەست دابوو.

[۲۰۲] پارسەکان لەنێو خەڵکی ڤارکیدا، ئەوانەی پتر تاوانبار بوون، گشتیان گرتن و دایانە دەست فێرێتیمیس. فێرێتیمیس هەموویانی وەرگرت و لە دەرەوەی شار، چوار میخ، لە دێوار بزمارکووتی کردن و فەرمانیدا مەمکی ژنەکانیش ببڕن و دیوارەکانی شاری پێبڕازێننەوە. باقی خەڵکی شاری ڤارکی جیا لە پاشماوەی خانەدانی ڤاتۆس کە لە کوشتنی ئارکێسیلائۆسدا بەشداریان نەکردبوو، وەک کۆیلە بە پارسەکان بەخشران و شارەکەشی دوبارە داوە دەست وەرەسەی ڤاتۆس.

[۲۰۳] پارسەکان ئەو کۆمەڵە خەڵکە بەدیل گیراوەی شاری ڤارکییان لەگەڵ خۆیان هەڵگرت و ئامادەی گەڕانەوە بەرەو وڵاتی میسر بوون. وەختێک ئەوانە لە شاری کیرینی نیزیک کەوتنەوە، یەکێک لە تاڵەبینەکانی شار بەدوای پێشگۆییەک، ئامۆژگاری خەڵکەکەی کرد کە ئیزن بە دەربازبوونی هێزەکانی پارس بۆ نێو شار بدەن. پارسەکان دوای ئەو ئاسانکارییە چوونە نێو شار. لەکاتێکدا کە هێزەکانی پارس خەریکی تێپەڕین بوون، ڤادریس فەرماندەی هێزەکانی دەریایی گەرەکی بوو دەست بەسەر شاردا بگرێ، بەڵام سەرکردەی هێزەکانی پیادە، واتە ئاماسیس لێی قبوڵ نەکرد، چونکە قەراری ئەوان تەنیا پەلامار بۆسەر شاری یۆنانیٔ ڤارکی بوو و بەس. بەو حاڵەش هەرکە هێزەکانی ڤادریس بە شاردا دەرباز بوون و گەیشتنە گردی لیکۆسدیا، پەژیوانی دایگرتن کە بۆچی شاریان داگیرنەکرد. حەولیاندا دوبارە بۆی بگەڕێنەوە و خۆی تێکێشن، بەڵام کیرینییەکان رێگایان پێنەدان. هەڵبەت پارسەکان سەیر تووشی

ترس و دڵەڕاوکە هاتن، بەبێ ئەوەی کەس هەڕەشەی لێکردبن و شەڕێک قەومابێ، گشتیان رایانکرد و لە شوێنێک بە مەودای شێست ستادیۆ دوور لەو شارە وێستان. وەختێک ئۆردویان لێدا، راسپاردەی ئاریئاندی گەیشتە لایان، بە فەرمانێک کە هەرچی زووتر بگەڕێنەوە وڵاتی خۆیان.

پارسەکان خێرا داوای ئەرزاقیان لە کیرینییەکان کرد. کیرینییەکان یارمەتییاندان و لەشکری پارس بەرەو میسر وەڕێکەوت. ئەو لەشکرە کاتێک بە وڵاتی لیبیدا دەرباز دەبوو، دانیشتووانی ئەوێ، هەرکەس لە لەشکر وەدوا کەوتبا یا هەڵبڕابا، لەجێوە دەیانکوشت، بۆوەی چەک و بژیوی ئەوانەیان دەسکەوێ. ئەوە بارودۆخی لەشکری پارس بوو تا ئەو کاتەی گەیشتەوە میسر.

[٢٠٤] دوورترین شوێنی لیبی کە لەشکری پارس دەستی پێڕاگەیشت، هەرێمی ئێڤێسپێریدییەکان[١] بوو. ئەو کۆمەڵە دیلەی شاری ڤارکی کە هێنابوویانە وڵاتی میسر، گشتیان بۆ داریوش بەڕێکرد. داریوش گوندێکی لە ناوچەی باکتریانی بەوانە بەخشی تا لێی نیشتەجێ بن. گووندی ڤارکی تا زەمانی منیش لە ناوچەی باکتریانی هەرماوە.

[٢٠٥] خاتوو فێرێتیمیس، ئەویش بە نۆرەی خۆی تووشی چارەنووسێکی پڕئازار هات. پاش ئەوەی تۆڵەی لە دانیشتووانی شاری ڤارکی ئەستاندەوە، بەپەلە گەڕایەوە وڵاتی میسر و گەلێک بە ناحەزی مرد. لەشی ئەو خاتوونە کرمی هەڵێنا و تەواوی جەستەیان خوارد. خواکان نەفرەتیان لە مرۆڤی دڵڕەقە، بۆیە فێرێتیمیس کچی ڤاتۆس کە بەو چەشنە دژی ڤارکییەکان جولابۆوە، دەبوایە تووشی ئەو چارەنووسە بێ.

---

١- بەپێی زانیارییەکانی هێرۆدۆت، دەبێ شوێنی ئەوانە لەنیزیک شاری ڤارکی بووبێ.

مێژووی هێرۆدۆت ناسراوە. مێژووی هێرۆدۆت، پڕە لە زانیاری و بەڵگە
ی مێژوویی و هاوولاتیانم دەتوانن وەک سەرچاوەی توێژینەوە کەڵکی
لێوەرگرن. سەرجەمی بەرهەمەکە لە نۆ کتێب پێکهاتووە. هێرۆدۆت
هەرکام لە کتێبەکانی پێشکەش بە خواوەندێکی سەردەمی دێرین
(باستان) کردوە و منیش وەرگێڕاوەکەی خۆم بەتەواوی خەڵاتی شە
هیدانی گەلم دەکەم. ئەگەر بەهەڵە نەچووبم، خوێنەر و توێژەری
کورد تا ئێستا پتر سەیری ئەو مێژووەیان بە زمانەکانی بێگانە
کردوە. وەرگێڕاوی فارسییەکەی بەلای منەوە جێگای متمانە نییە و تە
واو دەسکاری کراوە. فارسەکان پێیانوایە مێژوونووسانی بێگانە دەبێ بە
خواست و حەزی ئەوانەوە بنووسن، ئەگینا ئەوە مێژووی راستەقینە
نییە و بۆ هەر پاراگرافێک کۆڵێک بۆچوونی دەسکردی خۆیان بە کتێبە
کانەوە زیاد کردوە. من خۆم ئەو دەسکارییەی خەڵکانی وەرگێڕی
فارسم پتر لەو کتێبە و لە کتێبی ناباسی گزنفۆن‌دا بەدی‌کرد. گشت
مێژوونووس و توێژەر و خوێنەری‌تر هێرۆدۆت وەک باوکی مێژوو دە
ناسن، لەحاڵێکدا فارسەکان لەو بارەوە گومانیان هەیە، چونکە بەحە
زی ئەوان سەیری رووداوەکانی نەکردوە. سەبارەت بە زمانەکانی‌تر
وەک تورکی و عەرەبی ناتوانم بۆچوونم هەبێ. هەربۆیە، من خۆم هە
ستم بەو پێویستییە کرد کە ئەو سەرچاوە مێژووییە، لەبەر ئەوەی
گەلێک دەوڵەمەندە، راستەوخۆ لە زمانی یۆنانییەوە وەرگێڕمەوە سەر
زمانی کوردی.

وەرگێڕ



خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
MUKIRYANI HOUSE FOR PRINTING AND PUBLISHING
www.Mukiryani.com
2013

بایی (٢٠٠٠٠) دینارە
هەردوو بەرگ